# مەكتووباتی

# كاك ئەحمەدی شێخ

بەرگی یەكەم

مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس

لە فارسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر كوردی

مەحموود حەفید زادە

پێشەكیی بۆ نووسیوە

تێبینی: بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە واتە بەرگی (١ + ٢)ی چاپی یەکەمە

ناوی کتێب: مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ - بەرگی یەکەم
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس
نووسینی پێشەکی: مەحموود حەفید زادە
بڵاوکراوەی ئاراس - ژمارە: ٧٦٧
پیت لێدان: کوردستان کەیفی + لەنجە میرزا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٦٨١ی ساڵی٢٠٠٨ی دراوەتێ

# مەکتووبەکانی کاك ئەحمەدی شێخ

وانەیەك بۆ ڕیفۆرم و لێبووردەیی و شکۆی زانایانی
ئاینی لە کۆمەڵگەدا

بۆ پێشەکیی چاپی دووەمی مەکتووبەکانی کاك ئەحمەدی شێخ، کە وەك ئەوەی حەفید شەرەفی ئەوەم پێ بڕا کە هەوڵ بدەم جارێکی دیکە چاپ بکرێتەوە، حەزم کرد لە پێشەکیی ئەم چاپەدا ئەو ڕێچکە تەقلیدییە بشکێنم کە بۆ پێشەکی دەنووسرێت، واتە لە بری ئەوەی باس لە ناوەڕۆکی ئەو مەکتووبانە بکەم کە کاك ئەحمەدی شێخ نووسیوون، ئەو وشانە دەنووسمەوە کە دوای خوێندنەوەی ئەو مەکتووبانە لای من وەك خوێنەر بەجێ ماون، بۆ ئەوەی بزانین تا چەند دەتوانین بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان سوودی لێ وەربگرین و بەهەمان ئەو شێوازەی حەزرەتی کاك ئەحمەد کە توانی هەم ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکاتە هۆکارێك بۆ ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی و چەسپاندنی عەدالەتی ئیجتیماعی، هەمیش کردیە هۆکارێك بۆ بەزیندوو ڕاگرتنی کولتوور و زمان و بەها پیرۆزەکانی نەتەوەی کورد.

حەزرەتی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ کە هەموو خەڵکی کوردستان و هەوادارانی تەریقەتی قادری بەو ناوە ناوی دەهێنن، یەکەم خەسڵەتی بەرزی ئەوە بووە کە توانی ئاینی ئیسلام بکاتە سیمبول و ڕێنیشاندەر و هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگە بەگشتی، بەجیاوازی هەموو ئەو ئاینانەی کە بێجگە لە ئاینی ئیسلام لە کوردستان بەگشتی و لە ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی هەبوون، ئەم تێگەیشتنە بەرزەی بۆ ئاینی ئیسلام بووبووە هۆکارێك کە ئیسلام وەك ڕووناکی و ڕێگەنیشاندەر و هەوێنی لێبووردەیی و پێکەوە ژیانی پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگە سەیر بکرێت.

پرسیارێك لێرەدا سەرهەڵدەدات، ئایا کاك ئەحمەد فەرمانڕەوا بووە و بەزەبری دەسەڵات توانیویەتی ئەم شێوازە پیادە بکات تا بانگەواز و فەرمان و ڕێنوێنییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە دڵ و دەروون و ڕەفتاری ڕۆڵەکانی موسڵمانی کورددا جێگیر بکات و بسەپێنێ؟

بێگومان دەڵێین نەخێر... کاك ئەحمەدی شێخ نەك هەر فەرمانڕەوا نەبووە، بگرە هەموو کات بۆ داکۆکیکردن لە مافی خەڵکی هەژار و لێقەوماوان و زوڵم و زۆرداری و ئەو

ستەمەی بەهۆکاری نەتەوە و ئاین دژ پیادە کراوە، کەوتووەتە بەرەی دژی دەسەڵات، بەڵام ئەوەی وەك وانە و پەندێك بۆ سەرجەم زانایانی ئاینی ئیسلام لەم سەردەمەدا گرینگە ئەوەیە، کە دەسەڵات نەیتوانیوە ئەم هەڵوێست و ئاکارانەی کاك ئەحمەدی شێخ بەئاشکرا ڕەت بکاتەوە، لە کاتێکدا بێجگە لە عەساکەی دەستی و ئیلهامی قورئان و ئیسلام و خۆشەویستە لە بن نەهاتووەکەی لە ناو کۆمەڵگەدا خاوەنی شتێکی دیکە نەبووە.

ئەم مەکتووبانە پێمان دەڵێت: ئاین و زانایانی ئاینی ئەرکیان ئەوەیە کە فەرمانەکانی خوای گەورە و پێغەمبەری گەورەی ئیسلام بگەیەنن و لە هەمان کات نەهێڵن دەسەڵات بەرەو زوڵم و زۆرداری هەنگاو هەڵبگرێت، هەروەها ڕەهەندێکی دیکەی پڕ حیکمەتی تێگەیشتنی کاك ئەحمەدی شێخمان بەو ئاراستەیە بۆ دەردەکەوێت کە شکۆی ئاین و زانایانی ئاینی ئیسلام لە دەرەوەی دەستەڵات و خۆ بەدوور گرتنیان بۆ گرتنە دەستی دەستەڵات ڕەنگ دەداتەوە و ئەرکی گرینگ و پیرۆزی زانایانی ئاینی بەهەوڵدان بۆ عەدالەتی ئیجتیماعی و لێبووردەیی و پێکەوە ژیان بەرجەستە دەکات... هەر ئەمەش پێگە و مەقامی کاك ئەحمەدی گەیاندبووە ئەو ئاستەی کە مەسیحی و جولەکەکانی ناوچەی سلێمانی ئەویان بەو چەترە دەزانی کە لە ئازاری کەسانێکی نەفام بیانپارێزیت کە بەهۆی تێنەگەیشتنەوە لە گەوهەری ئاین بەچاوێکی کەم سەیریان دەکردن.

تێگەیشتن و تێڕوانینێکی دیکەی کاك ئەحمەدی شێخ بۆ قورئان و ئاینی ئیسلام بەوجۆرە بووە، ئەم قورئانە کە پەیامی پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتی و بەرێگەی فەخری کائینات حەزرەتی محەمەد مستەفا (د.خ) بۆ مرۆڤ نێردراوە، دەبێت هەر بەرەحمەت و ڕووناکی هەمووگەلانی سەر ئەم زەوییە بمێنێتەوە و فرەیی و ئاشتیخوازی و لێبووردەیی و هەمەرەنگی زمان و ڕەنگی پێستەکانی پێ بپارێزرێت کە نیشانەی حیکمەت و گەورەیی یەزدان لەسەر زەوی بەرجەستە دەکات، هەر بۆیە ئەو ڕێچکەیەی شکاند و لە پاڵ ئەرکە ئاینییەکاندا پەرەی بەزوبانی کوردی ڕەسەن دەدا لە وتنەوەی وانە و شرۆڤەکردنی دەقە قورئانییەکان، کە لەو کاتەدا نەك نەتەوە موسڵمانەکانی دژ بەمیللەتی کورد دژی ئەم ڕەفتارە بوون و لە ژێر پەردەی ئاینی ئیسلامدا بەکوفریان لە قەڵەم دەدا، تەنانەت خەڵکانێکی نەفام لە ناو میللەتی خۆماندا ڕەخنەیان لەوە دەگرت کە کاك ئەحمەد چۆن بەم ڕێچکە و ڕێبازەدا هەنگاو هەڵدەگرێت، هەر بۆ نموونەش یەکێك

لەوانەی دژایەتیی ئەم پێڕەوەی کاک ئەحمەدی شێخی کردووە بەم هۆنراوەیە وەڵام بۆ کاک ئەحمەد دەنێرێت:

کەس نەماوە بەغەیری کاک ئەحمەد

شێخی مەعرووف و عالمی ئەرشەد

چاکە ئێستا دەکا لە بۆ کوردان

تەرجەمەی شەرع و ئایەتی قورئان

واقیعەن خزمەتی لە بۆ خوایە

چ دەبوو ئەگەر بەکوردی نەبایە؟

کاک ئەحمەد وەڵامی ئەم کەسە ناداتەوە لەبەرئەوەی دڵنیایە لە خۆی و لە تێگەیشتنی بۆ گەوهەرەکانی ناو قورئان و ئاینەکەی و خۆشەویستی بۆ نەتەوەکەی، بەڵام شاعیری گەورەی کورد حاجی قادری کۆیی بەمجۆرە وەڵامی ئەو کەسە دەداتەوە:

هەرکە وای وت وەها موکەدەر بووم

وام زانی کەوا لە دین دەرچووم

وتم ئێستاش لەسەر کەری ماوی

چاک بوو مستم نەدا لە نێوچاوی

ئەم بەرگریکردنەی حاجی قادری کۆیی لە حەزرەتی کاک ئەحمەد، بۆ ئەمڕۆ ئەوەمان فێر دەکات، چۆن بتوانین ئاین بکەینە هۆکارێك بۆ سەربەرزی و سەرفرازی و خۆشگوزەرانیی میللەتی خۆمان و نەك میللەتی خۆمان بەنەزانی بکەینە هۆکارێك بۆ مەرامێك کە ناحەزانمان بەدرێژاییی مێژوو بۆ مەبەستی خۆیان هەوڵیان داوە لە ژێر پەردەی ئایندا کورد بەکار بێنن بۆ بەرژەوەندییە سیاسییەکانی خۆیان و ملکەچ و گۆشەگیری بکەن.

لە سەردەمی کاك ئەحمەددا کە حوکمڕانی بەدەست خەلیفەکانی عوسمانلییەوە بووە، ترسیان لە گەشەسەندن و فراوانبوونی خوێندنی ئیسلامی لەسەر شێوازی کاك ئەحمەد هەبووە، ئەوان بۆ خۆیان لە هەموو شوێنێك هەوڵیان دەدا قوتابخانەی ئاینی بکەنەوە بەڵام نیگەران بوون لەوەی کە بۆ یەکەم جار حەزرەتی کاك ئەحمەد لە کوردستان خوێندنی ئاینی لە حوجرەکان هێنایە دەرەوە و قوتابخانەی ئاینی دامەزراند و ئامانجی بوو زمان و کولتوور و ڕەسەنایەتی و مێژووی نەتەوەی کورد لە پاڵ ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا

بەزیندوویی و پارێزراوی بمێنێتەوە هەر بۆیە بەرامبەر بەم ڕێبازەی دەستەڵاتدارانی عوسمانییەکان لە دژی ڕاوەستان، بەڵام لەبەرئەوەی کاك ئەحمەد لە تێگەیشتنی فراوانی بۆ ئاین و دروستیی ڕەوت و ئامانجەکەی خۆی دڵنیا بوو هیچیان پێ نەکرا.

یەك لە ئاکارە پیرۆزەکانی کاك ئەحمەدی شێخ ئەوە بوو، کە گرینگییەکی زۆری بەقورئانخوێنەکان دەدا و قوتابخانەی تایبەتی بۆ فێرکردنی قورئان دامەزراندبوو کە بەردەوام سەرپەرشتی دەکردن و هانی دەدان لەسەر باشتر فێربوون و خوێندنی قورئان. ڕێزێکی یەکجار زۆری لە حافزان دەگرت، مەقامی حەزرەتی کاك ئەحمەد هەمیشە لانەی هەژاران و لێقەوماوان بووە، سفرە و خوانی ئەم زاتە هەمیشە بەبەرەکەتی خواوەندی گەورە لە زیادبووندا بووە واڵا بووە بۆ هەموو کەسانی ئەو ڕۆژگارە و هەرگیز لە ژیانی خۆیدا نەچووەتە دیوانی سوڵتانەکەی ئەگەرچی چەندین جار بەفەرمی بانگهێشت دەکرێت بۆ ئەستەمبوڵ بەڵام ڕەتی کردووەتەوە، حەزرەتی کاك ئەحمەد لە سەردەمانی خۆیدا ڕێبەری مەزنی تەریقەتی قادری بووە لەکوردستاندا و لە سەردەمی ئەم زاتەدا بوو کە کۆتاییی هات بەناکۆکییەکانی نێوان تەریقەتی نەقشبەندی و قادری کە بەهۆی تێنەگەیشتن و هاندانی دەستی دەرەکی و ناحەزانی ئیسلام و نەتەوەی کورد بەرەو قارێکی مەترسیدار هەنگاوی دەنا، کاتێك کاك ئەحمەدی شێخ فەرمووی ئەگەر کەسانێکی ناهۆشیار و نەفام دەیانەوێت درێژە بەناکۆکییەك بدەن، کە هەردووکی هەق و جوانن و لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا بێت، دەبێت بۆچی هەردوو ئەم ڕێبازە پاك و پیرۆزە نەگەن بەیەك «لەبەرچی بێت خوای تاك و تەنیا لە خۆمان برەنجێنین و گوناهبار ببین؟» ئەوە بوو ئەم ڕێبەر و زانا مەزنەی کورد ئەو بەریەستەی ڕووخان و لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا و بەرژەوەندی موسڵمانانداندا لەگەڵ زانا و شێخانی بەڕێز و مورشیدانی تەریقەتی نەقشبەندی لە بیارەی مەڵبەندی زانست وئاین کەوتە گفتوگۆ بەمەبەستی قووڵبوونەوەی برایەتیی ئاینی و نەتەوەیی لەو سەردەمەدا و بیرۆکەی لێك نزیکبوونەوە و ئاڵوگۆڕی تەریقەتی پێشکێش کردن و بەهەمان شێوە لە لایەن گەورەمورشیدانی تەریقەتی نەقشبەندییەوە لە مەقامی پیرۆزی بیارە پێشوازییەکی گەرم کرا لە بانگهێشتنەکەی حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ ئەوە بوو لە ئاکامدا ناحەزانی ئیسلام و نەتەوەی کوردیان تووشی سەرسوڕمان و نیگەرانی کرد و بەیەکجاری ئەو ساردی و ناکۆکییانە لە ڕەگوڕیشەوە دەرهات و هەردوو لا تەریقەتیان لەسەر دەستی پیرۆزی یەکتری وەرگرت.

قوتابخانە ئاینییەکەی کاك ئەحمەد قوتابخانەی پەروەردەکردنی سەدان زانای هەڵکەوت و پایە بەرزی ئەم نەتەوەیە بووە و تەنانەت سەرکردە و شەهیدی مەزلوم شێخ سەعیدی حەفید یەك لە قوتابی ئەو قوتابخانەیە بووە. لێرەدا بەپێویستی دەزانم سەبارەت بەشەهیدکردنی شێخ سەعید ڕوونکردنەوەیەك بدەم کە بەداخەوە لە مێژوودا غەدرێکی گەورەی لێ کراوە تا ئەمڕۆش لە دیدی شۆڤێنییەکانی عەرەب و ناحەزانی گەلی کوردەوە ئەو ڕووداوە باس دەکەین و دەگێڕینەوە و پێناس دەکەین، هەمووشمان ئەوە دەزانین کە شێخ سەعیدی حەفید یەك لە نەوەکانی کاك ئەحمەد بووە و باوکی شێخ مەحموودی حەفیدە ئەو زاتە بوو کە بەپیلانێکی داڕێژراوی نەتەوەپەرستەکانی تورك «اتحاد ترقی» لە شاری مووسڵ لەگەڵ ژمارەیەك لە یاوەرانی شەهید کران کە لە نێو قوربانییەکاندا شێخ ئەحمەدی کوڕە گەورەی خۆی بوو... تا ئێرە هیچ کێشە نییە بەڵام پرسیار ئەوەیە تا ئێستا ئەو تۆمەتە ناڕەوایانەی کە لە لایەن دوژمنانی کوردەوە دەخرێتە پاڵ شێخ سەعید و بەلایەنگری سوڵتانی عوسمانلی دەدرێتە قەڵەم کە گوایە لەو سەردەمەدا مەترسی بووە لەسەر بەرژەوەندییەکانی «اتحاد ترقی» چون دۆستێکی نزیکی سوڵتان بووە ،جێگەی مەترسی بووە بۆ ئیتیحاد و تەرەقییەکان بۆیە بەو پیلانە شەهید دەکرێن کە ئەمەش جگە لە بوختان و چەواشەکردن نەبێت هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە و نەبووە، ئەگەر بەڵگە ڕێزگرتنی شێخ بووە لە لایەن سوڵتان عوسمانلییەوە ئەوە ئەو ڕێزە دەگەڕێتەوە ئەمری واقیعی دەستەڵات کە دەبوو ئەو هاوسەنگییە لە ناوچەکەدا ڕابگرێت و ڕێزی لێ بگیرێت بەهۆی ئەو پێگە بەهێزەی کە لە ناوچەکەدا هەیبوو، بەڵام شێخ سەعید لەو کەسانە نەبووە کە ملکەچی قبووڵ بکات و فریوی سەروەت و سامان بخوات و دەستبەرداری ماف و داخوازییەکانی نەتەوەکەی بێت و لە فروفێڵ و دروشمە بریقەدارەکان تێ نەگات، شێخ کاتێك وەك سەرکردەیەکی کورد بەشداری شەڕی گەورەی «ئەردەهان» کرد لە ساڵی ١٨٧٧ زاینی کە لە نێوان ڕووس و دەوڵەتی عوسمانی هەڵگیرسا و لە مێژووشدا بەشەڕی قارس و بایەزید ناسراوە، لەو شەڕەدا شان بەشانی سەرکردەی نەمری شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بەشدارییەکی کارای کرد و ئەو ڕاستییانەی بۆ ڕوون بووەوە کە خەلافەتی ئیسلام ناوێکە و دوورە لە ناوەڕۆك و دوورە لە بەرنامە و عەدالەتی ئیسلام هەر لەگەڵ گەڕانەوەی شێخ سەعید لەو جەنگە سامناکەدا ئەو تێگەیشتنەی لا دروست دەبێت، کە دەبێت لە چاوەڕوانی دەرفەتی هەڵکەوتوو و لەباردا بێت بۆ ڕاپەڕین و بەرپاکردنی شۆڕش بەڕووی داگیرکەرانی کوردستاندا هەر بۆیە دوژمنان زوو بەو

پیلانەی دەزانن و لە پیلانێکی داڕێژراو لە شاری مووسڵ شەهید دەکرێت، کە لە مێژووی کورددا بەکارەساتی مووسڵ ناسراوە لە ئایندەدا بەبەڵگەوە لەسەر ئەم ڕووداو و مێژووە قسە دەکەین.

شێخ مەحموودیش کە پەروەردەی دەستی شێخ سەعیدی باوکی بوو، وەك سەرکردەیەکی سیاسی و ڕێبەری کورد لە قۆناخێکی تایبەتدا هاتە مەیدان و مەملەکەتی کوردستانی دامەزراند وەك دەوڵەتێکی هاوچەرخ «مەبەست لە دەوڵەتی هاوچەرخ بۆ ئەو سەردەمەیە کە زەمەنی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بوو لە هەموو جیهان» کە ڕەنگدانەوەی سیمایبوونی نەتەوەیی بەرجەستە بکات ئەم ڕەفتار و خەسڵەت و هۆشیاری و تێگەیشتنەی شێخ مەحموود کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قوتابخانە و ڕێبازەی کە شێخ مارفی نۆدێ بەفەرهەنگی ئەحمەدی دەستی پێ کرد، بۆ ئەوەی کاك ئەحمەد وەك خۆی لە دەقە پیرۆزەکانی قورئان تێ بگات، هەر بۆیە تێگەیشتنی کاك ئەحمەد لە ئاینی ئیسلام گەیشتە ئەو ئاستەی کە ڕووبەڕووبوونەوەی زوڵم و زۆرداری و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی ئەرکی سەرشانی هەر موسڵمانێکە و دەبێت قبووڵ نەکرێت پێش هەمووانیش شێخ سەعیدی کوڕەزای بەو ئاراستەیە گۆش کرد تا لە دژی زوڵم بجەنگێت لە ژێر هەر ناوێکدا بێت، قوتابخانەکەی کاك ئەحمەدی شێخ هەر چۆن لەو سەردەمەدا مەڵبەندێکی گرینگ بوو بۆ زانست و زانیاری و هۆشیاری و فەلسەفە و مەعریفەت بۆ نەتەوەی موسڵمانی کورد بەهەمان شێوە کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر فیکر و ڕەوشت و ئاکاری شێخ مەحموودی حەفید، مەبەست لەم نموونانە نیشاندانی ئەو ڕاستییانەیە، کە قوتابخانە ئاینییەکانی ئەو سەردەمە و ڕۆڵی زانایانی ئاینی و شێخانی کوردستان ڕۆڵێکی پیرۆز و دیاریان هەبووە لە ئاراستەکردنی کۆمەڵگەی کوردی بەرەو ئاقاری هۆشیاری و زانست و زانستخوازی و پێشکەوتن و ئاینپەروەری، بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونانەی کە دوور لە هەر پێوانەیەکی ڕاست و دروست بەشێوازی بوختان و ئاخافتنی سەرپێییانە دەدرێتە پاڵ زانا پایە بەرز و نەمرەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە کوردستاندا.

زۆرجار کەسانێك لە دژایەتیکردنیان بۆ ئاینی ئیسلام زۆر نارەوایانە ئەو تۆمەتانەیان خستووەتە پاڵ ئاین، کە ڕێگر بووە لەسەر دواکەوتنی گەلی کوردستان و بەلەمپەر و کۆسپی بەردەم ئازادی و دروستبوونی قەوارەیەکی سیاسی و سەربەخۆی کوردی لە قەڵەم دەدەن. کە لە ڕاستیدا ئەم تێگەیشتن و بۆچوونە تا ئەوپەڕی دوورە لە

ڕاستییەوە و ئەم جۆرە ڕاڤە و لێکدانەوانە بەتاوانێکی گەورەی دەزانم، زانایانی ئاینی گەورەترین مێژوویان بۆ گەلەکەیان تۆمار کرد، خوانەخواستە ئەگەر هێڵێکی سوور بەسەر ئەو سەروەرییانەدا بهێنین چی هەیە کە ئێمە بۆ ڕابردوومان شانازی پێوە بکەین.

دەتوام بڵێم قوتابخانە ئاینییەکانی کوردستان و زانا و پێشەوایانی ئاینی بوون کە وەرچەرخانی گەورەیان تۆمار کرد لە مێژووی خەباتی نەتەوەی کورددا زانا و قوتابخانە ئاینییەکان بوون لە تێگەیشتنیان بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەردی بناغەی ئازادی و سەربەخۆیان بۆ نەتەوەکەیان دانا و هەر لە دەروازەی ئەو قوتابخانە ئاینییانەوە بوو بیری هۆشیاریی نەتەوەیی و سەربەستیی کورد سەری هەڵدا بەرجەستە کرا لە هزر و ناخی مرۆڤی کورددا هەر لەسەردە ستی ئەو زانا نەمرانە بوو یەکەمین بانگەواز و گوللەی کورد نرا بەسەر سینگی داگیرکەرانی کوردستانەوە، باوکانی دامەزرێنەری بیری ئازادی و نەتەوەپارێز کێ بوون لە زانایانی ئاینی زیاتر ڕێبەری شۆڕشە پیرۆزەکانی نەتەوەی کورد زۆربەیان «هەر لە زانایانی ئاینی و شێخانی کوردستان» نەبوون؟ کە سینگیان دەنا بەگوللەوە و پەتی سێدارەیان ماچ دەکرد لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوەی کورددا وەك ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە ڕێبەرانی نەمری کورد لە مێژووی نەتەوەماندا تەماشا کەن «شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، شێخ سەعیدی پیران، شێخ عەبدوسەلام بارزان، شێخ سەعیدی حەفید، سەید ڕەزا دەرسیم، شێخ مەحموودی نەمر، مەلا مستەفای بارزانی، قازی محەمەد... هتد» ئەم ڕێبەرە مەزنانە دەرچووی کام قوتابخانەیە بوون، جگە لە قوتابخانە پیرۆزەکەی ئیسلام.

مەبەست لەم نموونانە وەکو باسم کرد تەنیا ئەوەیە کە پێویستە ئەو حەقیقەتە زیندووانە لە بەرچاو بگرین کە لە مێژووی کورددا پانتاییەکی گەورەی داگیر کردووە تا هەتایە شانازی پێوە بکەین. ئاکار و کردەوەکانی حەزرەتی کاك ئەحمەد زۆرن لە پێشەکییەکدا ناکرێت بەتێروتەسەلی قسە لەسەر زۆر لایەنی ئەم زاتە مەزنەی کورد بکرێت، بەنیازین لە ئایندەدا بەهاوکاری چەند زانایەکی بەڕێز پەرتووکێکی تایبەت لەسەر ژیان و زانست و لایەنی تەسەوف و قۆناغەکانی ژیانی بنووسرێتەوە کە ئێستا کاری لەسەر دەکرێت، پاش تەواوبوونیان بڵاو بکەینەوە.

لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ هۆکاری لە چاپدانەوەی مەکتووباتەکانی کاك ئەحمەد لە ڕاستیدا ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی بەڕێزی ئاینی و قوتابیان و خوشك و برایانی موسڵمانی کوردستان لەمێژە چەندین جار ئەو پرسیارەیان ڕووبەڕوو کردوومەتەوە ئایا بۆچی

مەکتووباتەکانی کاك ئەحمەدی شێخ بەچاپ ناگەیەننەوە منیش هەموو جارێك بەڵێنم دەدا کە ئینشائەڵلا هەوڵ دەدەین چاپی بکەینەوە زۆر لەمێژە ئەو ئاواتەم هەبوو کە هەڵسم بەم ئەرکە پیرۆزە و بەڵێنەکەم بەرمە سەر، سوپاس بۆ خوای مەزن ئەوا ئەو ئاواتەم هاتە دی و پێم وایە لە ڕێگەی ئەم مەکتووبانەوە خوێنەری موسڵمانی کورد، زۆر باش لە بەرنامە و ئەرك و ئادابەکانی شەریعەتی ئیسلام تێ دەگات و سوودێکی یەکجار گەورە لێ دەبینێت بۆ ئاشنابوون و تێگەیشتن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ئەو ئەرکانەی لەسەر شانی موسڵماندایە کە زۆر پێویستە بیزانین و بەئەنجامیان بگەیەنین.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم سوپاس و ڕێزی تایبەتی خۆم بنێرم بۆ بەڕێز سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان «کاك نێچیرڤان بارزانی»، کاتێك ئەم بیرۆکەیەم بۆ باس کرد، بەخۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی نیشان دا و فەرمانی دا بەچاپکردنەوەی مەکتووباتەکان هەر چۆنێ کە ئێمە بمانەوێ، سوپاس بۆ بەڕێز کاك بەدران ئەحمەد بەرپرسی دەزگای ئاراس کە زۆر ماندووبوون، هەروەها سوپاسی کاك محەمەدی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەکەم وەك نەوەی مامۆستای بەڕێز مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە بۆ یەکەم جار مامۆستای خوالێخۆشبوو تەحقیقی لە مەکتووباتەکان کردووە و وەری گێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی، کە پێویست بوو ئێمە ڕەزامەندی بنەماڵەی مامۆستای پایە بڵند وەربگرین کاتێك لەگەڵ کاك محەمەدی مەلا کەریم قسەم کرد زۆر بەخۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی نیشان دا و جارێکی تر سوپاسی دەکەم.

بەپێویستی دەزانم خوشك و برایانی خوێنەر ئاگەدار بکەم، بەشێك لە مەکتووباتەکان ماوە کە تا ئێستا وەرنەگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی ئێستا کار بۆ ئەوە دەکەین لە کوردستانی ڕۆژهەلات کەسێکی شارەزا لە زمانی فارسی و دەستنووسەکان بدۆزینەوە تا قسەی لەگەڵدا بکەین بۆ ساغکردنەوەی ئەو بەشەی کە ماوە ئومێدەوارم بتوانین لە ئایندەدا ئەو ئامانجە پیرۆزە بەهەوڵی دڵسۆزان بهێنینە دی خوای گەورە پشتیوانی هەمووان بێت.

السلام وعلیکم

حەفید زادە مەحموود

٢٠٠٨/٧/١٣ مەسیف سەلاحەدین

## سەرەتا

خوا لێ خۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخ، کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدێ زاتێکی هەڵکەوتوو بووە لە چەرخی خۆیدا و یەکێ بووە لە زانا بەرزەکانی ئیسلام لە کوردستاندا. ئەم زاتە لە ١٢٠٨ی هیجریدا لە سلێمانی لەدایك بووە و لە ١٣٠٥دا لە هەمان شار کۆچی دوایی کردووە، واتە ٩٧ ساڵ ژیاوە. خوێندنی عولوومی دینیی لە خزمەتی باوکیدا تەواو کردووە. هەروا لە خزمەتی ئەودا ئادابی تەریقەتی قادریی وەرگرتووە. ئیجازەی دەرس وتنەوەی عولوومی دینی و ئیرشادی تەریقەتیشی هەر لەو وەرگرتووە.

خزمەتەکانی ئەم زاتە بۆ ئیسلام و موسوڵمانان بەکورتی بەم جۆرەیە کە نووسراوە:

١- تەدریسێکی زۆر باشی کردووە و گەلێ خوێندەواری خاوەن بەهرەی پێ گەیاندوون و ئیجازەی تەدریسی پێ داون.

٢- لەسەر مەسلەکی پۆستنشینی ئیرشادێکی موافیقی کیتاب و سوننەتی کردووە و گەلێ کەسی لە ئەهلی مەعریفەت لە تەریقەتدا پێ گەیاندووە، وەکو شێخ حەسەنی قەرەچێواریی بەرزنجی و کەسانی تر.

٣- مزگەوتی گەورەی سلێمانی هەمیشە کۆمەڵێ موسوڵمانی لە مەنسووبەکانی ئەوی تێدا بووە کە خەریکی زیکر و تەهلیلە و تاعەت و عیبادەت و قورئان خوێندن بوون.

٤- سفرە و خوانێکی بێ درێغی بووە بۆ ناندانی مرید و مەنسووب و میوان و خەڵکی وڵات، بەتایبەتی بۆ فەقێیان و حافزانی قورئانی پیرۆز و بۆ سالیکانی ئادابی تەریقەت.

٥- هەمیشە بە گوێرەی توانا ئامادە بووە بۆ ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە و بۆ ناوبەین چاککردنەوەی خەڵکی شار و لادێ و عەشیرەتەکان، بەڵکو بۆ ئاشتکردنەوەی ناوبەینی خێزانیش تێ کۆشاوە.

٦- هەمیشە بە گوێرەی دەسەڵات تیٚ کۆشاوە بۆ چارکردنی کاروباری خەڵك لە دائیرەکانی دەوڵەتدا.

٧- وەك چۆن فەقیٚ و مرید و مەنسووبی ڕاگرتووە لە مزگەوتی گەورەدا، چەند هۆدەشی تەرخان کردووە بۆ ئەوانەی قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەن و مامۆستای بۆ ڕاگرتوون و خزمەتی کردوون و خەرج و مەسرەفی بۆ کردوون. بەم جۆرە ئەم فەرزی کیفایەیەی لە کوردستاندا گرتووەتە ئەستۆ و بەجۆریٚ تەرویجی قورئان خوێندنی داوە، هەموو ماڵێکی موناسبی سلێمانی قورئان خوێنێکی تایبەتییان ڕاگرتووە قورئانیان بۆ بخوێنیٚ.

لە ماوەی ژیانیدا هەموو ڕۆژیٚ مەجلیسی وەعز و ئیرشادی بووە و (مەکتووبات)ی نووسیوە بۆ شار و دێهات و دەوارنشینان بۆ ئەوەی لە ئەسڵ و فەرعی ئاینی ئیسلام حاڵی و شارەزا ببن. لەم ڕووەوە وا مەشهوورە ٩٩(مەکتووبی) نووسیوە و ناردوویە بەم لاو بەولادا و فەرمانی داوە بە مەنسووبەکانی ئەو مەکتووبانە بنووسنەوە و ڕێنموونیی خەڵکیان پیٚ بکەن. ئەم مەکتووبانە ئەوەی پێویستی موسوڵمانان بیٚ تیایاندایە لە ئەسڵ و فەرعی ئاین و ڕەوشت و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە و ڕێگای چارکردنی کەموکورتی و ناتەواوی نەفسی و کۆمەڵایەتی.

حەزرەتی کاك ئەحمەد ئەو مەکتووبانەی بەپێی ئوسووڵی ئەو ڕۆژە بە فارسی نووسیوە. لەبەرئەوە ئەمڕۆ لە کوردستاندا کەڵکێکی ئەوتۆیان لیٚ وەرناگیریٚ .لەبەرئەوە گەلیٚ جار بەدڵمدا هاتووە کۆیان بکەمەوە و وەریان بگێڕمە سەر کوردی، بەڵام بەداخەوە هەموویانم دەستگیر نەئەبوو. بەداخەوە ئەم نەخۆشییە لە کوردستاندا باوە، ئەوانەی نووسراوێکیان لایە ئەدەب بیٚ یا مێژوو یا ئاین یان هەر بابەتێکی تر، دەستی بەسەردا دەگرن و نایدەن بەکەس کەڵکی لیٚ وەربگریٚ، تا بەتێپەڕینی ساڵ دەڕزیٚ و مشك و مۆرانە دەیخوا یا لە کارەساتێکی ڕۆژگاردا لەناو دەچیٚ. بەڵام پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر خوا یارمەتیی دام لای حاجی شێخ ئیبراهیمی قادر کەرەم دوو بەرگ مەکتووباتم دەسگیر بوو جگە لەو چەند مەکتووبەی لەسەر ئەرکی خوا لێخۆشبوو شێخ مەحموودی حەفید لە چاپ دراون. ئەمانە بەتێکڕایی پەنجاو پێنج مەکتووبن و لە ١٩٧٥ی میلادیدا نووسیمنەوە و ڕاستم کردنەوە و پوختەم کردن و وەرم گێڕانە سەر کوردی و ئێستاش بەرێز دەستم کرد بە لە چاپدانیان.

لە خوای گەورە دەپارێمەوە یارمەتیم بدا بۆ بەچاپ گەیاندنی هەموویان و مەبەستم هەر ئەوەیە خزمەتی موسوڵمانانیان پێ بکەم و خوێندەواران ڕێگای ڕاستی خۆیانیان لە دین و دنیایاندا پێ بدۆزنەوە هەمووشتێکیش لەسەر لوتفی خوای گەورە وەستاوە.

عەبدولکەریم محەمەد مودەڕیس
موەڕیسی مەدرەسەی مزگەوتی
حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی (قدس سرە)
١١ی مانگی سەفەری ١٤٠٤ی هیجری
ڕێکەوتی ١١-١١-١٩٨٣ی زاینی

بسم الله الرحمن الرحيم

## نامەی یەكەم

# ئەمر بە چاكەكردن و نەهیكردن لە خراپە

بسم الله الرحمن الرحيم

(الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه الهداة لدين الله).

(وبعد): برایانی ئاینیی خۆم، لە زانایان و فەرمانداران و گەورە پیاوان و پیاو ماقوولان و موسڵمانانی تر، سڵاوتان پێشكەش دەكەم. خۆشەویستەكانم! ئەو نامانەی بۆ ئێوەیان دەنووسم بەنرخترین دیارییەكە كە دۆستان بۆ دۆستانی خۆیانی بنێرن، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر، خوایان لێ ڕازی بێ، لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:

(ما أهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده عن ردى) واتە: لەو دیارییانە كە موسڵمان بینێرێ بۆ برای خۆی دیارییەكی وەها نییە بەنرختر بێ لە وتەیەكی سوودبەخش كە خوا زیاتر ڕێی پێ ڕۆشن بكاتەوە، یا ببێتە هۆی لادان و پاراستنی لە زیان و گومڕایی، ئەگەر زانا ڕێنوماكان نەبن ئادەمیزاد وەك كوێر دەمێنێتەوە و نازانێت بەرەو كوێ مل بنێ. دیارە بوونی زانا ڕێنوماكان یەكێكە لەو نازو نیعمەتەی خودای گەورە بە ئادەمیزادی بەخشیوە، بێگومان نامەكانی ئەم دۆستی خۆتانە لەو جۆرە دیارییانەن، هیوام وایە كە بۆتان خوێنرانەوە بەدڵ وەریان بگرن و بەگەنیان بكەن.

حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: هەر بەندەیەك ئامۆژگارییەكی ئاینی لە لایەنی خوای گەورەوە بۆ بێ ئەوە نیعمەتێكە لە لایەنی خواوە بۆی ڕەوانە كراوە، جا ئەگەر بە سوپاسەوە وەری بگرێ، خودای گەورە چەند نیعمەتی تری بۆ زیاد دەكات و، ئەگەر بە سوپاسەوە وەری نەگرێت ئەوە دبێتە بەهانەی خودای گەورە لە سەری و لە پاداشی ئەوەدا زۆر زۆر لێی زوێر دەبێ.

هەندێ لە نامەكانی من باسی ناشیرینترین شوورەیی برادەرانە، كە گوناهە

گەورەکانیانە، ئەوانەش لەبەرئەوەی ئەو برادەرانە ئاگادار دەکەنەوە لە عەیبەکانیان بە چاکترین دیاری دەژمێررێن بۆیان و لای پیاوی گەورە عەیبە نیشاندانی زۆر بەنرخە؛ حەزرەتی عومەر (ر.خ) فەرموویەتی:(رحم الله أمرء أهدى إلي عيوبي) واتە: ڕەحمەتی خودا لەو بنیادەمە بێ کە عەیبەکانی خۆمم بەدیاری بۆ دەنێرێ، هەروەها دەیفەرموو: ئەم جۆرە دۆستانە زۆر کەم و نایابن. بەڵێ ئەوەندە هەیە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە عەیبی خەڵکی پێشان دەدا بە شێوەی کینەبازی و ئابڕوو بردن نەبێ.

ریوایەت کراوە: دوو ڕەوشت هەن، خەیری هیچ شتێ لەو دووانە بەرزتر نییە:

یەکەم: باوەڕکردن بە خودای هەردوو جیهان، دووەم: قازانج گەیاندن بە بەندەکانی خوای گەورە. باشترین قازانج گەیاندن قازانجی عیلم و زانستە لە بابەتی دین و ئاینەوە، لەپاش ئەوە قازانج گەیاندن بە ئەمر و نەهی و قازانج گەیاندن بە پایە؛ واتە: کەسێ خاوەن پایە و دەسەڵات بێ و، بەهۆی ئەو پایەو دەسەڵاتەیەوە سوود بە خەڵکی بگەیەنێ، هەروەها قازانج گەیاندن بەهۆی دارایی دنیایی، ئەنجا قازانج گەیاندن بەو کەسانەی کە یاسای دین نازانن بە شێوەیەك کە لەوانەوە فێری دینداری ببن، ئەم قازانجە لە هەموو قازانجێ بەنرخترە.

لە فەرموودەی حەزرەتدا (د.خ) هەیە:

(ما عبد الله بشئ أفضل من تفقه في الدين) واتە: هیچ خواپەرستییەك نییە کە لە فێرکردن و تێگەیاندنی ئاینی ئیسلام چاکتر بێ، هەتا فێرکراوەکە بە چاو کراوەیی و دڵ ئەستووری ڕەفتاری پێ بکات و نەفسی بەو ڕەفتارە ڕابێ و سوپاسی خودای گەورەی لەسەر بکا.

جا کاتێ مرۆڤ باش لە ڕەفتاری ناشیرین ئاگادار بوو، زانیی کە ڕق و کینەی خوا زۆر نابارە و، سزای پاشەڕۆژ زۆر گرانە، ئەو کاتە دڵی دەتوێتەوە و، ئارەزووی ڕەفتاری خراپ ناکات..

ئەو کەسانەی کە پایە و پاداشتی فەرمانبەرداری و بە گوێکردنی ئەمری خودا نازانن، ئەوانەی لە پاداش و سزای دنیا و قیامەتی بێ گوێیی بێ خەبەرن، سەرسام و دەماخ وشك و دڵڕەش و بەدحاڵن و بە خودای خۆیان بێ هیوان.

هەر لەبەر سوودو قازانجی زانستی ئاینییە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ:

(من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين) واته: هەرکەس خوا خۆشی بوێت و بەختیاریی بوێت لە بابەتی ئایندا خوێنەوار و زانای دەکات. هەروەها فەرموویەتی : زانایەك کە بە پێی زانستەکەی خۆی ڕەفتار بکا لە هەزار خواپەرستی نەزان گەورەترە. تەماشاکەن لە هیچ جۆرێك لە دروستکراوانی خودادا نییە تاقە یەکێکی لە هەزاری گەورەتر بێ، بەڵام لە ئادەمیزاددا هەیە.

دەگێڕنەوە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) ڕۆژێك خوتبەی دەخوێندەوە و، وتاری ئاینیی بە هاوڕێیەکانی دەدا، لەو وتارەدا گەلێك ستایشی ئەو گەلانەی کرد کە زاناکانیان نەزانەکانیان فێردەکەن و نەزانەکانیان گوێ بۆ زاناکانیان ڕادەگرن و یاسای دین و ئاین و بەختیاریی خۆیانیان لێ وەردەگرن. هەر لەو وتارەدا فەرمووی :ئەوە چ بەدبەختییە کە ڕووی کردووەتە ئەوانەی یاسای ئاین بە دراوسێکانیان ناگەیێنن و نەزانەکانیان لە لای دراوسێ زاناکانی خۆیان فێری ئاین نابن!

خوای گەورە دەفەرموێ و قەسەم دەخوا: یا دەبێ ئەمانە حاڵی خۆیان بگۆڕن و لە یەکترەوە فێری یاسای ئاین ببن، یا هەر لەم جیهانەدا و لە کاتی ژیانیاندا، سزایان دەدەم، دەرد و ئازاریان بۆ دەنێرم. جا لە وتارەکەیدا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە:
(لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ[٧٨] كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ[٧٩])
ئایەتی ٧٨و ٧٩ لە سوورەتی مائیدە. واتە: لەعنەت و نەفرینی خودای گەورە لە کافرەکانی بەنی ئیسرائیل کرا لەسەر زمانی داودو عیسای کوڕی مەریەم، ئەمەیش لەبەر ئەوە کە بێ گوێیی خوایان کردو، لە سنووری ئاین لایان داو، لە خراپەکاری مەنعی یەکتریان نەدەکرد لەو ئیشە خراپانە کە دەیانکرد، چەند ناشیرین و نارەوا بوو ئەو کردەوانەی ئەوان؟!!

جا پاش ئەم فەرموودانە خوا و پێغەمبەر با ئەوانەی کە قاپیی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیان بۆ کراوەتەوە و کەچی گوێ نادەنە جێبەجێکردنی، لە شوومیی نەفرینی خوای گەورە بترسن و خۆیان لە خەشمی خوا بپارێزن، با ئەوانەش کە لە توانایاندا هەیە سوود لە پەند و ئامۆژگاری وەربگرن، کەچی بێ سوود دادەنیشن وئامۆژگاریی زانایانی ئاین وەرناگرن، لە شوومیی نەفرینی خوای گەورە بترسن.

پێغەمبەر (د.خ) گوێدان بە دەرسی ئاینی بەنیشانەی باوەڕ و بەختیاریی موۆف داناوە و لەم بابەتەوە فەرموویەتی:

(بەرزترین خووڕەوشتی باشی موسڵمان ئەوەیە کە لە بیستنی فەرموودەی خوداو پێغەمبەر تێر نەبێ، کەواتە، براکانم! ئاگادار بن کە گوێ پێنەدان و نەخوێندنەوەی ئەم نووسراوانەی دۆستی خۆتان، زۆر زیان بەخشە. حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) ئەگەر چی لەعنەت و نەفرینی لە مرۆڤێکی تایبەتی نەکردووە ، بەڵام لەعنەت و نەفرینی لە کۆمەڵێ کردووە کە خووڕەوشتی خراپیان هەبێ، وەکو ئەو کەسانەی دەستیان دەڕوا، کەچی ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە ناکەن و لەو کەسانە کە سوود دەخۆن. خودای گەورە بنیادەمی بۆ ئاین و خواپەرستی لە دنیادا دروست کردووە و شتێکی ئاشکرایە ئاین بێ دەرس دادان دانامەزرێ و خواپەرستی بەبێ ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە جێبەجێ نابێ.

لە فەرموودەی حەزرەتدا (د.خ) هەیە: ئەگەر دنیا لای خودای گەورە بەقەد باڵی مێشوولەیەك نرخی ببووایە، خوا پیاڵەیەك ئاوی بە کافر و بێ باوەڕ نەدەدا، کەواتە پێویستە بزانن ئاین بەلای خوای گەورەوە زۆر بەنرخ و خۆشەویستە و ئاینیش بەو دوو شتە پایەدار دەبێ کە بۆمان باس کردن.

پوختەی قسە: بەختیاریی هەرکەس بەدوو شتەوە بەستراوە؛ یەکەم، ناسین و بە گەورە تەماشاکردنی خوای پەروەردگار، دووەم، میهرەبانی لەگەڵ دروستکراوانی خوادا، میهرەبانی لەگەڵ هەر کەسێکدا ئەوەیە خێری بۆ پەیدابکەی و شەڕی لێ دوور بخەیتەوە، ئەم دووشتەش بەڕاستی بەستراون بە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەوە، تەنانەت خوای گەورە دەفەرموێ: (وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ[٦] الَّذِينَ لاَ يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ) واتە: وەیل بۆ ئەو کافرە موشریکانەیە کە زەکاتی ماڵ دەرناکەن، هۆی ئەمەش ئەوەیە نەدانی زەکات نامیهرەبانی و بێ بەزەییە لەگەڵ خەڵکدا پێشان دەدا. ئەوانەی مانای قورئانیان لێ داوەتەوە ڕژدی و بەزەیی نەهاتنەوەیان بە گەورەترین خووڕەوشتی خراپ داناوە، هەروەها بەزەیی و میهرەبانییان بە گەورەترین خووڕەوشتی باش داناوە، ئەنجا میهرەبانی و بەزەیی بە ماڵ و دارایی دەبێتە هۆی خۆشحاڵیی خەڵك لە ژیاندا، بەڵام میهرەبانی و بەزەیی بە ئامۆژگاری کردنی خەڵك و بەرچاو ڕوونکردنەوەیان دەبێتە هۆی بەختیارییان، بەتایبەتی میهرەبانی کردنی لە بابەتی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەبێتە، هۆی بەختەوەریی هەتاهەتایی، دیارە جیاوازییەکی زۆریش لە نێوان ئەم دوو بەختیارییەدا هەیە.

تکاتان لێ دەکەم هەر نامەیەك کە بۆ ئێوەی دەنووسم خەڵکی بۆ کۆیکەنەوەو، بەسەریاندا بیخوێننەوە، بەڵکو سوودێکی دینیی لێ وەربگرن.

«علموا الناس سنتي وإن كرهوا» واتە: ڕەفتاری من بە موسڵمانان نیشان بدەن، با پێشیان ناخۆش بێ و، لە ڕووتاندا ڕاوەستن و، وشەی ناشرینیان بەدەمدا بێ و، پێتان بڵێن: ئێوە حەقتان چییە بەسەر ئێمەوە، بڕۆن ئامۆژگاریی خۆتان بکەن!! پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ:

«أن أبغض الكلام إلى الله عزوجل أن يقول الرجل للرجل: أتق الله، فيقول: عليك بنفسك». واتە: ناشیرینترین وتار لای خودای گەورە ئەوەیە یەکێك بە یەکێك بڵێت: لە خوا بترسە، ئەویتر لە وەڵامیدا بڵێ: بڕۆ خەریکی خۆت بە، هەقت چییە بەسەر منەوە؟!

جا لەبەرئەوە، تا وەزعی موسڵمانان باش نەبێ، ئێوە دەسبەرداری ئەمرکردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە مەبن؛ تا بگەنە پاداشتێکی گەورە.

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ: «أذا حمل الرجل كلمة من الله إلى أخيه المسلم كان خيراً له من حجة وعمرة ومن عبادة سنة».

واتە کاتێك مرۆڤ وتارێکی ئاینی لە خودای خۆیەوە برد بۆ برای ئاینی، خێری ئەو کارە لە حەجێك و عەمرەیەك و خواپەرستیی ساڵێك زیاترە..

جا ئەی دۆست و برادەرەکانم! بەم حیسابە گەر برایەکی موسوڵمان نامەیەکم بەتەواوی بخوێنێتەوەو، ئامۆژگاریی موسڵمانی پێ بکا دەبێ چ بەش و بەهرەیەك بۆ ڕۆژی قیامەتی مسۆگەر بکات؟..

چونکە گەلێ ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر لە بابەت ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەوە وارید بووە، ئەم کارە فەرزی کیفایەیە لەسەر موسڵمانان و، هەر گەلێ ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەی لەناودا نەمێنێ هەموویان بە تاوانبار دەناسرێن و، ئەگەر لە نێو گەلێکدا هەر تاقە کەسێك دەیزانی و دەیتوانی ئەوە دەبێتە فەرزی عەین لەسەری، ئەمە تەنیا دەربارەی ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە بەدەست و زمان، بەڵام ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بەدڵ ئەوە لەسەر هەموو کەسێك فەرزی عەینەو، هەر کەس بەدڵ مەیلی چاکەی نەبێ و لە خراپە زویر نەبێ ئەوە تاوانبارە.

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، خوای لێ ڕازی بێ، گونەدان بە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بە کوفری سووك دادەنێ. هەروەها لەلای هەندێ لە زاناکانی ئاین ئەمر بەچاکە

و نەهی لە خراپە بە دەست و زمان و دڵ تێکڕا واجبەو فەرزی عەینە بە قەدەر دەستەڵات، بۆ بەڵگەی رەئیەکەیان دەڵێن: خوای گەورە فەرموویەتی: «وَتَعَاوَنُواْ عَلى الْبرِّ وَالتَّقْوَى». واتە: ئەی موسڵمانان! لەسەر رەفتارو وتاری باش و لەسەر هەرچی دەبێتە هۆی دووری لە گوناه یارمەتیی یەکتر بدەن، دیارە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە، لە جوملەی وتاری باشن، بەڵکو لەگەڵیێ شتی تر قازانجیان زۆرترە.

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالب (کرم الله وجهه) فەرموویەتی: هەر کەسێك ئەمر بکا بەچاکەو، نەهی بکا لە خراپە ئەوە هێز بە موسڵمانان دەدا و، پشتی شەیتان دەشکێنێ. «ولاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ». واتە: یارمەتیی یەکتر مەدەن لەسەر گوناه و دوژمنایەتی موسڵمانان «والتقوا الله» لە خوا بترسن «أن الله شديد العقاب» بە ڕاستی خوای گەورە لە تۆڵەسەندنەوەدا سەختگیرە، واتە سزای خوا بۆ ئەو کەسانەی کە یارمەتیی خەڵك ئەدەن لەسەر تاوان زۆر سەخت و گرانە.

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێ ئەوانەی گوێ نادەن بە ئەمر بەچاکەکردن و نەهی لە خراپەکردن بەر ناوەرۆکی ئایەتەکە دەکەون و، شایستەی ئازارو سزان لە لایەن خوای گەورەوە.

خوای گەورە لەبارەی شاردنەوەی ڕاستییەوە هەڕەشەی سەختی کردووە؛ یەکەم پەیمانی لەگەڵ هەموو بەندەکانی خۆیدا بەستووە کە دان بە پەروەردگاریی ئەودا بنێن و، بە پەروەردگار و ئافەریننەدەی هەموو عالەمی بزانن؛ ئەوەتا دەفەرموێ:

«وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ...» دووەم: پەیمانێکە لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا بەستوویەتی بۆ ئەوەی هەر پەیڕەو و ئەحکامێك خوای گەورە ناردوویەتی بۆیان بە ئۆمەتەکانیان ڕابگەیەنن. سێیەم: پەیمانێکە لەگەڵ زاناکان و خاوەن دەسەڵات و خاوەن تواناکاندا بەستوویەتی کە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بکەن؛ «وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ..» واتە: ئەی پێغەمبەر! باسی ئەوەیان بۆ بکە کە خودا پەیمانی لەو زانایانە وەرگرتووە، کە زانستی کتێبی خودایان پێ دراوە، بەڕاستی و بێ درۆ و دەلەسە بۆ خەڵکی بەیان بکەن و لێیان نەشارنەوە، هەروەها هەمان پەیمانی لەو کەسانەش وەرگرتووە کە دەسەڵاتیان هەیەو، دەتوانن ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن..

هەروەها خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەرامبەر بەو کەسانە کە ڕاستی دەشارنەوەو شایانی نەفرینی خوان، فەرموویەتی:

«إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللاَّعِنُونَ» واتە: ئەو کەسانە کە ئایاتی خوای گەورە دەشارنەوە، پاش ئەوەی ڕوونمان کردنەوە بۆ هەموو خەڵك، خوای گەورە و هەموو کەسێکی باش نەفرینیان لێ دەکەن.

دیسان لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە مەدحی کۆمەڵی حەزرەتی پێغەمبەری بەوە کردوە کە ئەمر دەکەن بە چاکە و نەهی دەکەن لە خراپەو، فەرموویەتی:

«كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ] هەتا دوایی ئایەتەکە...

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) سیفەتی (چاکتری)یان لەوەوە دەست دەکەوێ کە ئەمر بکەن بە چاکە و نەهی بکەن لە خراپە، ئوممەتەکانی پێغەمبەرانی پێشوو لەبەر ئەوەی دەوامیان نەکردووە لەسەر ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە بە ماوەیەکی کەم ئاینەکەیان فەوتاوەو، زەمانی (فەترەت) هاتووەتە پێشەوە، بەڵام ئوممەتی پێغەمبەری خۆمان، لەبەرئەوە کە بەردەوام ئەمرییان کردووە بە چاکە و نەهییان کردووە لە خراپە ئاینەکەی تا زەمانی ئێمەش ماوەتەوە، جا ئێمەش ئەگەر وەکو پێشینان لەسەر ئەمر بە چاکە و نەهی لەخراپە دەوام بکەین، ئەوە ئایینەکەمان دەمێنێتەوە، ئەگەر نا ئێمەش وەك ئوممەتانی پێغەمبەرانی پێشوو دینەکەمان دەفەوتێ..

لە فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەردا (د.خ) هەیە کە زانینی یەك مەسەلەی شەریعەت و فێرکردنی خەڵکی بەو مەسەلەیە خێری هەزار ڕکات نوێژی سوننەتی هەیە. هەروەها لە فەرموودەکانیدا هەیە: هەر کاتێ کۆمەڵێکت چاو پێ کەوت لە موسڵمان، بیست نەفەر، یا کەمتر، یا زیاترو، لە ناویاندا موسڵمانێکی وا نەبوو، کە باقیی خەڵکەکە لێی بترسن و ئەمریان پێ بکا بە چاکە و نەهییان بکا لە خراپە، ئەوە بزانە ئاینی ئەو کۆمەڵە لاوازو زەبوونەو، لە هەر شوێنێکا کەسی پیاو چاك ببێ ئەمر بکا بە چاکە و نەهی بکا لە خراپە و خەڵکی لێی بترسن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە مرۆڤە لە خوا دەترسێ بۆیە خەڵکی لێی دەترسن؛ فەرموودەی پێغەمبەرە(د.خ) «أذا خاف العبد ربه خاف منه كل شئ».

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ» واتە: پێویستە لە نێو ئێوەدا گرۆهی ببن کە ئادەمیزاد بانگ بکەن بۆ ئاینی ئیسلام کە سەراسەر خێرو پیرۆزییە « ويأمرون بالمعروف» واتە: ئەمر بکەن بە هەرچی شتی باشە و، بە هەرچی وتارو ڕەفتاری باشە. ئەو کەسانەی ئەمە خووڕەوشتیانە لە سزای خودا رزگار دەبن. هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە «ما لكم عباد الله لا تتحابون؟» واتە: ئەی بەندەکانی خودا چیتان لێ قەوماوە؟ بۆچی یەکترتان خۆش ناوێ؛ ئێوە هەموو برای ئاینین و، برا پێویستە بۆ برای خۆی باش بێ؛ کەوابێ هیچ شتێك ئێوەی لەیەك جیا نەکردووەتەوە ناپاکیی دڵ نەبێ، ئەگەر دڵتان لەگەڵ یەکتردا باش بووایە یەکترتان خۆش دەویست، ناپاکیی دڵتان لەبەر بێ هێزیی باوەڕتانە، ئەگەر باوەڕتان بەهێز بووایە یەکترتان خۆش دەویست، بێ هێزیی باوەڕیشتان لەبەرئەوەیە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە کردن لە نێوتاندا کەمە.

شێخ ئیسماعیل حەقی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: هەر کەسێ بە هۆی ئیتاعەت و خواپەرستییەوە لە خودای گەورە نزیك بێتەوە، لەسەرتان پێویستە خۆشتان بوێ، مادام ئێوەش خواتان خۆش بوێ، ئەوی خوای خۆش دەوێ، پێویستە ئەو کەسەی خۆش بوێت کە خوای خۆش دەوێ، چونکە هەردوولایان یەك مەحبووب و خۆشەویستیان هەیە.

ئەی برادەرانی ئاینی ئەوە ئەوپەڕی خۆش نەویستنە کە مەنعی براکانی خۆتان نەکەن لە گوناهکردن و، بە قەد دەسەڵات پێویستە بیانگێڕنەوە لە گوناه، هەتا بەهیلاکا نەچن.

لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: برادەرانی ئاینی، لە بەزەیی و میهرەبانی لەگەڵ یەکتردا، وەك ئەندامەکانی لەشی بنیادەمن، هەر موسڵمانێك لە ئازاردا بێ موسڵمانەکانی تریش بۆی دەکەونە ناخۆشی هەروەك چۆن ئەگەر ئەندامێکی لەش ئازار بکات هەموو ئەندامەکانی لەش تووشی ئازار دەبن.

نیشانەی ساغیی ئیمانی موسڵمان، ئەوەیە ئەگەر موسڵمانێکی دی گیرۆدەی گوناهێ بوو، یا تووشی غەم و مەینەتێکی دنیایی بوو، ئەمیش غەم و پەریشانی دڵ و دەروونی داگیر بکا..

ئەی برای خۆشەویست! ئەوانەی کە دەسەڵاتیان هەیە ئەگەر مەنعی مرۆی گوناهکار و تاوانبار نەکەن و، خودایان نەخەنەوە بیر، ئەوانیش بەر سزاو تۆڵەی خوای گەورە

دەکەون و، ئەگەر ئامۆژگارییان بکەن و خوا بخەنەوە یادیان ئەوە بە خۆشەویستی خوا دادەنرێن.

لە حەدیسی قودسیدا هەیە «ما خلقت في السموات والأرض خلقاً أحب إلى ممن ذكرني الناس» واتە: لە ئاسمانەکان و لە زەویدا کەسێکم دروست نەکردووە خۆشەویستر بێ لام لەو کەسەی من دەخاتەوە بیری خەڵکی..

ئاشکرایە لەم سیفەتەدا، کە خوا خستنە یادی خەڵکییە، کەس ناگاتە پایەی پێغەمبەرانی خوا؛ کەواتە ئەوان لای خوای گەورە لە هەموو کەس خۆشەویستترن، پاش پێغەمبەران ئەولیا واتە دۆستانی خوا ئەنجا عولەما، ئەنجا پیاوچاکان، بەتایبەتی ئەوانەیان کە خاوەن دەسەڵاتن و بە زۆر مەنعی خەڵك دەکەن لە گوناه؛ چونکە ئەمانە توانایان لە زانایان و پیاوچاکان زۆرترە، وەکو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: «الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ] الحج٤١».

واتە: بەڕاستی خوا یارمەتیی ئەو کەسانە دەدا کە یارمەتیی ئاینی خوا دەدەن، ئەوانەش ئەو کەسانەن ئەگەر لە زەویدا دامان مەزراندن و دەسەڵاتمان پێ دان بەردەوام نوێژەکان بەجێ دەهێنن و، زەکاتی خۆیان دەدەن و، ئەمر دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خراپە. لەم چوار ڕستەدا دەردەکەوێ کە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە لە کەسانی دەسەڵاتدارو جێگەو ڕێگەدارەوە سوودی هەیە، هەروەها لێیانەوە دەردەکەوێ کە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دوو سیفەتی گەورەن و، لای خوای گەورە زۆر بەڕێزن و، ناگاتە ئەم خووڕەوشتە مرۆیەکی دڵ و دەروون پاك و نوێژکەر و زەکاتدەر نەبێ و، ئەو کەسانە بە هۆی پیرۆزیی نوێژکردن و زەکات سدانەوە شایستەی ئەوە دەبن ئەمر بکەن بە چاکە و نەهی بکەن لە خراپە؛ چونکە مرۆی نوێژ نەکەرو زەکات نەدەرو، کەمتەرخەم لە بابەتی ئاینی، نە ئەمر دەکا بە چاکە و نە نەهی دەکات لە خراپە!، ئەگەر بیشیکات کار لە دڵی خەڵك ناکا و خەڵکی سوودی لێ وەرناگرن!!

بەکورتی ئەم دوو سیفەتە لە مرۆڤی خاوەن دەسەڵاتی پاك دەوەشێتەوە، وەکو ئیمامی عوسمان، خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویەتی: «ما يزع الله بالسلطان أكثر مما يزع بالقرآن» واتە: ئەو مەنع لە خراپەیەو ئەو لە شەڕ دەستبەردار بوونە کە خوا بە هۆی دەسترۆیشتووەوە جێبەجێی دەکا لەوە زۆرترە کە بەهۆی قورئانەوە دەیکا.

له جوملەی «وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ»، که پێش ئایەتەکه کەوتوه، دەردەکەوێ کە بەجێهێنانی نوێژەکان و دەرکرنی زەکاتی ماڵ و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە هەموو ئەمانە یارمەتیدانی ئاینی ئیسلامەو، دەردەکەوێ ئەو کەسانەی یارمەتیی ئاین و ئەحکامی ئیسلام دەدەن خوای گەورە یارمەتییان دەداو بەسەر دوژمنانی خۆیاندا زاڵیان دەکا و، خوای گەورە بەڵێنی خۆی بەجێ دەهێنێ و هەرگیز لە بەجێهێنانی پەیمانەکەی خۆی لانادا.. کەواتە زۆر مایەی شانازییە بۆ سەرۆکانی دەوڵەت و، پیاوانی گەورەی خاوەن دەسەڵات و پایەدار، یارمەتیی ئاینی خوا بدەن و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن و، لە هەمان کاتدا خۆیشیان حسێب بکەن کە لە لایەن خواوە خەڵات دەکرێن و بەسەر دوژمناندا زاڵ دەکرێن..

خوای گەورە فەرموویەتی : «وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ».

واتە: پێویستە لە نێو ئێوەدا، ئەی موسڵمانان، هەمیشە کۆمەڵێك ببن کە باقیی موسڵمانان و باقیی ئادەمیزادەکان بانگ بکەن بۆ خێر کە یاسای ئاینی پیرۆزی ئیسلامەو، ئەمر بکەن بە چاکە و نەهی بکەن لە خراپەو ناشەرعی و ناشایستە، ئەو کەسانەی خاوەنی ئەم سیفەتانەن هەر ئەوانەن لە نارەزایی خواو لە ئازاری رۆژی پاداش رزگار دەبن، ئەگەر موسڵمانێك دەستەڵاتی هەبوو پێویستە بەو دەستەڵاتەی خۆی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکات، ئەگەر دەستەڵاتی نەبوو پێویستە زمان بخاتە کارو، لای خاوەن دەستەڵاتان قسە بکات و هەوڵ بدا هەتا ئەوانە بکەونە ئیش و مەنعی خەڵکی بکەن لە خراپە و هانی چاکەیان بدەن، جا ئەگەر مەیدانی دەست و زمانی نەبوو، ئەوا پێویستە بە دڵ نارازی بێ لە ئیشی ناشەرعی و حەزبکات لە ئیشی شەرعی، ئەگەر بە هیچ کام لەم سێیانە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە نەکا ئەوا لە ئازارو تۆڵەی خوا رزگار نابێ.

ریوایەت کراوە: هەر موسڵمانێك رۆژی لێ بوویەوەو، سەبارەت بە ئیشی موسڵمانان بێ باك و کەمتەرخەم بوو، ئەو کەسە لە موسڵمانانی دیاری نییە؛ چونکە هیچ ئیشێك لە ئاین گرنگتر نییەو، ئەو کەسەی بۆ ئاین کەمتەرخەم بێت ئەوە واتە بێ دینە..

لە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) : «الدين النصيحة، قلنا لمن يارسول الله؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم»...

واتە: ئاینی ئیسلام بریتییە لە دڵسۆزی و خێرخواهی، عەرزمان کرد: دڵسۆزی و خێرخواهی بۆ کێ؟، فەرمووی: یەکەم بۆ خوا، کە بە زاتێکی تاك و پاك و واجیبولوجوود و پەروەردگاری بزان و خەڵك بانگ بکەی بۆ پەرستنی. دووەم: دڵسۆزی بۆ کتێبی خوا، واتە: بەدڵ تێ بکۆشی بۆ فێربوونی و بڵاوکردنەوەی لە جیهاندا، بۆ پەیڕەوکردنی. سێیەم: دڵسۆزی بۆ پێغەمبەری خوا، واتە: هەمیشە ئامادە بی بۆ حورمەت ڕاگرتنی و بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی لە جیهاندا و پاراستنی لە دوژمنانی. چوارەم: دڵسۆزی بۆ پێشەواکانی ئیسلام، واتە: فەرمانیان بەجێ بهێنی و لەسەر چاکە یارمەتییان بدەی و، ماوەی خراپەیان نەدەی و، دوژمنیان لێ دوور بخەیتەوە. پێنجەم: دڵسۆزی بۆ هەموو موسڵمانان بە گشتی، بە جۆرێ خۆت بە یەکێك لەوان بزانی و خێرو شەڕی ئەوان بە خێرو شەڕی خۆت بزانی و بۆ چاکەیان هەوڵ بدەی و خراپەیان لێ دوور بخەیتەوە.

مادام لەم فەرموودە پیرۆزەدا ئاینی تەنیا بە نەسیحەت و دڵسۆزی داناوە، دەردەکەوێ کە ئامۆژگاری و دڵسۆزی لای خوای گەورە زۆر بەڕێزە و بایەخی هەیە. منی دۆستی بێ دەستەڵاتتان مەبەستی هەرە گەورەم لە نووسینی ئەم نامانەدا بۆ ئێوە نەسیحەتی سەرۆکەکان و گەورە پیاوەکان و دەوڵەمەندەکانە، چونکە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لەوانەوە بەسوودەو، دوعای تەوفیقی کردەوەی چاکیش دەکەم بە ڕابەر بەو حوقووقانە کە هەیانە لەسەرمان، چونکە لە حەدیسی شەریفدا هەیە: جەزای دەوڵەمەند لە لایەن هەژارانەوە نەسیحەتەو دوعا. ریوایەت کراوە کە حەزرەتی مووسا (د.خ) عەرزی بارەگای خوای گەورەی کرد: کام لە بەندەکانت لات خۆشەویستترە؟ خوای گەورە لە وەڵامدا فەرمووی: «الذی یتسرع إلی هواي کما یتسرع البشر إلی هواه، والذي یغضب إذا أرتکبت محارمي».

واتە : ئەو کەسە لام خۆشەویسترە لە خەڵکیتر، کە ڕادەکا بۆ بەجێهێنانی لێخۆشبوونی من ، وەك چۆن ئادەمیزاد بە دوای ئارەزووی خۆیدا ڕادەکا و، ئەو کەسەی کە لە کاتێکدا بێ ئەمریی من بکرێ ڕقی هەڵسێ.

ئەی برادەران! تەماشا بکەن هۆی زۆربەی ئەو خراپانەی لە جیهاندا ڕوو دەدەن و، ڕۆژ بەڕۆژ دینداری کەم دەبێتەوە، ئەوەیە کە موسڵمانان موداهەنەو ڕووپامایی لەگەڵ دەستڕۆیشتوان و سەرۆکان و خاوەن دەسەڵاتەکاندا دەکەن و، سەبارەت بە فەرمانی خوا و ئەحکامی ئاین دڵسۆزی بەجێ ناهێنن و، گوێ نادەنە فەرمانی خواو بە گوێی

پێغەمبەری خوا ناکەن و، چاویان لە تەمیَ و تەربیەی موسلّمانانی نەزانەوە نییە. دەگێڕنەوە کە ڕۆژێك شەفیقی بەلخی ئامۆژگاری (هارون الرشید)ی دەکردو پێی دەوت:

ئەی هاروون! خوا خانوویەکی هەیە ناوی دۆزەخەو، تۆی کردووە بە دەرگاوانی ئەو خانووەو، سێ شتی بە تۆ داوە، هەتا بەو سێ شتە موسلّمانان لەو دۆزەخە دوور بخەیتەوە: ماڵ، شمشێر ، قەمچی . بە ماڵ دەفعی داماوی و ئیحتیاجی موسلّمانان بکەی، تا بەهۆی گرانی و نەدارییەوە تووشی دزی و درۆزنی و ڕێگری و ستەمکاری نەبن. بە هۆی شمشێریشەوە ڕێگا لە غەدارو ستەمکار بگری هەتا زوڵم و زۆر لە خەڵکی نەکەن. فاسقەکانیش بە قەمچی ئازار بدەی تا بە ئەدەب بن و فیسق و فجوور نەکەن، جا ئەگەر تۆ بەو جۆرەی پێم وتی موعامەلەت کرد ئەوا خەڵك لە دۆزەخ ڕزگار دەکەی و، تۆیش ڕزگار دەبی، ئەگەر نا تۆ لە پێش ئەواندا دەڕۆیتە دۆزەخ.

ئەی برادەرانی ئاینی! بە هۆی بێ باکی و کەمتەرخەمیی دەستەڵاتدارەکانە بەم جۆرە ئاین و دەستپاکی و پیاوەتی کزو فەوتاون، ئەوانە لە پاشەڕۆژدا لەسەر ئەم کەمتەرخەمی و گوێ پێ نەدانە سزاو ئازار دەدرێن و، مادام ئامۆژگاری کاریان تێ ناکا لە خوای گەورە دەخوازم کە لە دنیاشدا هەر گیرۆدە بن.

ریوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەبدال لە ئوممەتی من، کە دەچنە بەهەشت، لەبەرئەوە نییە کە نوێژو ڕۆژوویان زۆرە، بەڵکو لەبەر سەخاوەتی نەفس و خاوێنی سینەو دڵسۆزییە بۆ موسلّمانان.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: موسلّمان برای موسلّمانەو، پێویستە بەرامبەر بە هیچ کردەوەیەکی ناڕەوا لە ئامۆژگاری کردنی سست نەبێ، ئەگەرنا حەقی برایەتیی بەجێ نەهێناوە. لە هاوڕێی پێغەمبەر (ابو هریرە)وە ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی: دەمانبیست لە حەزرەت (د.خ) کە لە ڕۆژی قیامەتدا مرۆڤێك داوێن گیری مرۆڤێ دەبێ و ڕای دەکێشێ، ئەویش نایناسێ و دەڵێ: تۆ چیت لەسەر منە؟ بۆ بەرۆکم بەرنادەی؟ ئەویش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: تۆ لە دنیادا چاوت لە من بوو کردەوەی خراپم دەکردو، دەستت نەدەهێنایە ڕێگام و مەنعت نەدەکردم... مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە هەرکەس ئاگای لە یەکێك بێ کە کردەوەی خراپ دەکا و، مەنعی نەکا ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەویش وەکو تاوانبارەکە سزا دەدرێ، چونکە دەتوانێ مەنعی بکا لەو کردەوە خراپانە، بەڵام کەمتەرخەمی تیا دەکا و مەنعی ناکا؛ بۆیە ئەویش دەبێتە هاوبەشی تاوانەکە..

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ئیمشەو دوو فریشتە هاتن بردمیان بۆ شوێنێك، لەو شوێنەدا ئەحواڵی بەختیاران و بەدبەختانی ئوممەتی خۆمیان پێشان دام، فەرمووی: «رأيت رجلا من أمتي قد أخذته الزبانية من كل مكان، فجاءه أمره بالمعروف ونهية عن المنكر فاستنقذاه من أيديهم فادخلاه مع ملائكة الرحمة».

ئەی خۆشەویستم! وەکو حەکیمی تیرمیزی فەرموویەتی، حیکمەتی ئەمە ئەوەیە: بەشی زۆری ئەوانەی ئەمر دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خراپە خۆیان ئەم کردەوە خراپانە ناکەن کە نەهییان لێ کردووە، زەبانییەکانی قیامەتیش وەکو مەئموورانی جیهان ئەو کەسە دەگرن کە خراپەی پێوە دەبینن و، هەقیان بەسەر کەسێکەوە نییە کە بە زاهیری خراپەی نەکردبێ، جا خوای گەورە بە پیرۆزی ئەو ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیە کە کردوویانە، هەرچەند فاسق و تاوانباریش بن، مادام تاوانەکەیان ئاشکرا نەبووەو لە بەینی خۆیان و خوای گەورەدا بووە، خوا عەفووی کردوون و تاوانەکەیانی لە فریشتەکان شاردووەتەوە(*).

جا با هەندێ لە دەستەڵاتدارە بێ موبالاتەکان لە خوای خۆیان شەرم بکەن، چونکە نە خۆیان بە ڕاستی خۆیان لە گوناه دەپارێزن و، نە بەرامبەر بە خەڵکیش ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن.. هەروەها لە فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە دەردەکەوێ کە فەرق زۆرە لە بەینی ئەو فاسقانەی تاوانەکانیان دەرناخەن و ئەوانەی بێ شەرمانە گوناه دەکەن و خەڵکی پێیان دەزانێ و، فێری گوناهکردن دەبن لێیانەوە، بێگومان بەشی یەکەم زۆر نزیکە خوا عەفوویان بکا...

ڕیوایەت کراوە دوو برای ئاینی وەکو دوو دەستی ئادەمیزادن، وەکو چۆن دەستەکان یەکتر دەشۆرن، پێویستە برای ئاینی برای خۆی لە گوناه داشۆرێ، واتە: ئامۆژگاریی بکات و ڕێگای گوناهی لێ بگرێ.

هەروەها ڕیوایەت کراوە کە موسڵمان ئاوێنەی موسڵمانە، واتە: چۆن لە نێو ئاوێنەدا

---

(*) ئەمە تەرجەمەی فەرموودەکەی کاك ئەحمەدە، ڕەحمەتی خودای لێ بێ، بەڵام حەقیقەتی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی ئەمر بە چاکە و نەهی لەخراپە دەکەن، هەرچەندە تاوانباریش بن، بەهۆی پیرۆزیی ئەو دوو کارەوە لە عەفوی خودای گەورەوە نزیکن، ئیتر مەسەلە ئەوە نییە کە گوناه لە مەلائیکە بشاردرێتەوە، چونکە مەلائیکەی کردەوە (د.خ)بە هەموو جۆرە گوناهێکی مرۆڤ دەزانن و دەینووسن، ئاشکرا بن یانهێنی، خوا بۆ ئەوەی دیاری کردوون.

وێنه دەردەکەوێ، له لای مرۆڤی موسڵمانیش عەیبە و خەوش و تاوانی موسڵمانی برای دەردەکەوێ، جا بە پێی پێویستیی ئیسلامییەت پێویستە، هەر کاتێ موسڵمان بە عەیبی موسڵمانێکی زانی، تێ بکۆشێ بۆ پاککردنەوەی لەو عەیبە، واتە: مەنعی بکا لە دووبارە کردنەوەی ئەو تاوانەو تێ بکۆشێ بۆ ئەوەی پەشیمان بێتەوە لەو جۆرە گوناهە.. هەڵی شدمگرێ: واتای ڕیوایەتەکە ئەو بێت: کە چۆن مرۆڤ نایەڵێ ئاوێنەی خۆی گەرد بگرێ و، ئەگەر تۆزی لێ نیشت پاکی دەکاتەوە، وەها برای موسڵمانی لە گوناه پاك دەکاتەوەو نایەڵێ گەرد بگرێ.

له حەزرەتی عومەرەوە (ر.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

«أذا رأيتم أخاكم زل فقوموه، وسددوه، ولا تكونوا أعوانا للشيطان عليه».

واتە: ئەگەر برایەکی ئاینیی خۆتان بینی پێی هەڵخزاو کەوتە نێو هەڵەوە فریای کەون و ڕاستی بکەنەوە و بیخەنەوە سەر ڕێیی ڕاست و، مەبنە یارمەتیدەری شەیتان دژی ئەو برادەرەتان، واتە بە ئامۆژگاری یا بەهێز هەوڵ بدەن و مەیدانی ئەوە مەدەن لەو هەڵەدا بمێنێتەوە، ئەگەر مەنعی نەکەن لەو هەڵەیە، یا خۆ بەپێچەوانە یارمەتیی بدەن لەو ئیشە هەڵەیەدا ئەوە دەبنە یارمەتیدەری شەیتان و، ئێوەش دوژمنایەتی لەگەڵ دەکەن. ئەگەر ئەوانەتان پێ نەکرا ئەوا دوعای خێری بۆ بکەن بەڵکو خودا ڕەحمی پێ دەکا و بیخاتە سەر ڕێی ڕاست و لەو تاوان و گوناهە دەستبەدار بێ.

خوای گەورە لە بابەت ئامۆژگارییەکەی لوقمانەوە بۆ کوڕەکەی دەفەرموێ:

«يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ».

واتە: ڕۆڵەکەم! نوێژی خۆت لە کاتی خۆیدا بەجێ بێنەو، ئەمر بە چاکە بکەو، نەهی لە خراپە بکەو، ئەگەر تووشی ئازار و بەڵا بووی خۆت بگرە، چ بە هۆی ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەو ، چ لە ڕێگای ترەوە، دیارە (مەعرووف) ئەوەیە موافقی شەریعەت بێ و (مونکەر) ئەوەیە موافقی عەقڵی ساغ و شەریعەت نەبێ. ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) کە فەرموویەتی «أن الله يكره سفساف الامور» واتە: خوای گەورە حەزناکات لە ئیشی ناشایستە و هیچ و پووچ. نوێژ کردن و ئەمر بە چاکە کردن و نەهی کردن لە خراپەو، لە کاتی ناخۆشیدا خۆڕاگرتن لە کارە گەورە بەجێکانە.

لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: چەندێ دڵی مرۆڤ لە پێناوی ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپەدا ئازاری پێ بگا ئەوەندە پڕ دەبێ لە نووری ئیمان.

لـە عـەبدوڵڵا کوڕی عـەبـاسەوە (ر.خ) دەگێڕنـەوە وتـوویـە: حـەزرەتـی پێغـەمبـەر (د.خ) فەرموویەتی:

«يأتي على الناس زمان يذوب فيه قلب المؤمن كما يذوب الملح في الماء، قيل مم ذلك؟ قال: مما يرى من المنكر ولا يستطيع تغييره!»».

واتە: ڕۆژگارێکی وەها بەسەر خەڵکیدا دێت کە دڵی موسڵمان وەك خوێی نێو ئاو، دەتوێتەوە!، عەرزیان کرد: لە بەرچی؟ فەرمووی: لەبەرئەوە کە کاری مونکەر و ناشایستە و ناباری زۆر دەبینێ و، ناتوانێ مەنعیان بکا.

ئیسماعیل حەقی (ر.خ) لە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی : حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی قیامەت ئەوەیە کە ئەهلی کردەوەی خراب غالب دەبن بەسەر ئەهلی حەقدا.

براکانم! غاڵب بوونی گەلی خراپ و ناحەق کار بەسەر ئەهلی حەقدا، لەبەرئەوەیە لەهەر شوێنێکدا یەکێ ئیشێکی نالەبار بکا، مادام بەپێی ئارەزووی ئادەمیزاد بێ، یارمەتیدەری زۆر زۆرە باوەڕی پێ دەکەن و یارمەتیی دەدەن، بەڵام لەهەر لایە یەکێ ئیشێکی باش بکا لەبەرئەوە کە خیلافی ئارەزووی نەفسی خەڵکە یارمەتیدەری زۆر کەمە، بەڵکو بێ باوەڕیی بەرامبەری دەردەبڕن، جا لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤی پاك بەهۆی ئەو وەزعە نا لەبارەوە نزیکە دڵی ببێ بە ئاو..

براکانم! خوای گەورە فەرموویەتی: «وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ» واتە : لەپێناوی بەرزکردنەوەی حەقدا تێکۆشانێکی ڕاستەقینەی تەواو بکەن.. جیهادو تێکۆشانیش سێ جۆرە: جیهاد بە دەست. جیهاد بە زمان. جیهاد بە دڵ، واتە: کە مرۆڤ بە خراپەیەکی زانی پێویستە، ئەگەر توانیی، بە هێزو دەسەڵات مەنعی بکا، ئەگەر دەستی نەدەڕۆیش بە زمانی خۆی هەوڵ بدا بۆ نەهێشتنی، یا ئەو خراپەیە بگەیێنێتە دەسەڵاتدارێك هەتا مەنعی بکات، ئەمەش بەو شەرتەی نەبێتە مایەی فیتنەو دەستدرێژی کردن. جا ئەگەر ماوەی ئەمەیشی نەبوو ئەوا بەدڵ ئەو کارە خراپەی پێ ناخۆش بێ و لە خاوەنەکەی زویر بێ، هەر کەسێ یەکێك لەم سێ پایەی ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپەیەی نەبوو

ئەوە دڵی وەكو مرۆڤێكە كە سەربەرەو خوار هەڵواسرابێ! واتە: هەر كەس دەستەڵاتی بوو مەنعی خراپە بكا و نەیدەكرد، یا بەزمان توانای هەبوو نەیدەكرد، تەنانەت بە دڵیش بێزار نەدەبوو لێی، ئەوا ئیمان لەدڵییەوە دەرژێتە خوارێ، وەك چۆن ئەگەر گۆزەیەكی پڕ لە ئاو سەرەوخوار بكەی، دڵۆپێكی تێدا نامێنێ.

لە حەزرەتی مووساوە (د.خ) دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: عەرزی بارەگای خوای گەورەم كردو وتم: خوایا كام بەندەت لە هەموو بەندەكانت لا خۆشەویستترە ؟ لە وەڵامدا فەرمووی : ئەو كەسە كە بۆ ڕەزاو خۆشنوودیی من تێ بكۆشێ و پەلەی بۆ بكات، وەك چۆن بۆ بەجێهێنانی ئارەزووی خۆی تێ دەكۆشێ و پەلە دەكا، ئەو كەسەش گوناهـ و تاوانی لە خەڵكەوە دی ڕقی هەستێ و زویر و بێ تاقەت ببێ.

ریوایەت كراوە كە موسڵمانان هەموو لەخێرو چاكیدا دەبن هەتا هەموویان نەبنە یەك ڕەنگ. كە هەموویان بوونە یەك ڕەنگ بەهیلاكدا دەچن!

واتای ئەو فەرموودەیە ئەوەیە: موسڵمانان لە خێرو چاكیدا دەبن ئەگەر دووجۆر بوون و هەندێكیان ئەمر بە چاكە و نەهی لە خراپە بكەن بەو كەسانەی كە ڕێگای چاكە ناگرنەبەرو كرداری خراپیان لێ دەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر هەموو یەك ڕەنگ بوون و كەس مەنعی كەسی نەدەكرد لە خراپەو، ئەمری چاكەیان بەیەكتری نەدەكرد ئەوە نیشانەی ناچاكی و بەد بەختییەو، هەموویان وەك ڕەنگێكی ڕەش یەكسانن.

حەزرەتی ئیمامی عەلی (ر.خ) فەرموویەتی: لە ئاخر زەماندا لە نێو نەوەد كەسدا یەكێكیان ئەمر بە چاكە و نەهی لە خراپە دەكات، واتە: لە نێو نەوەد كەسی دەسەڵاتداردا یەكێكیان واجبی سەرشانی خۆی جێبەجێ دەكا و موسڵمانێكی باش و لە خواترسە، جا پاش ئەوە تەماشای ئەم واتە ڕاستەت كرد تەماشای ئەوەش بكە كە ئەو هەشتاو نۆ كەسەكەی تر ئەوانەیان لەگەڵ دەسەڵاتدا تەركی ئەمر بە چاكە و نەهی لە خراپە دەكەن و، فەرموودەكانی خوا و پێغەمبەر، كە دەیزانن، لە خەڵكی دەشارنەوە بە مەلعوون و نەفرین لێكراو دەردەچن، چونكە خوای گەورە، دەربارەی ئەوانە كە زانیاریی ئاین دەشارنەوە، فەرموویەتی: «أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ».. واتە: ئەوانەی ئایاتی خودا دەشارنەوەو فێری خەڵكییان ناكەن خوا نەفرینیان لێ دەكا و شایانی نەفرینی هەموو نەفرەت كارێكن، لە فریشتەو ئادەمیزاد و پەری...

ئەی برادەران! ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە گەلێ بە نرخن، تەنانەت ئەگەر نابالّغێك خراپەیەکی کرد، هەرچەند ئەو موکەللەف نییە، پێویستە لە سەر ئەو کەسەی پێی دەزانێ و دەستی دەڕوا مەنعی بکا، هەتا فێری ئەو کارە خراپە نەبێ؛ واتە ئەگەر چی نابالّغەکە بە کردنی ئەو کارە خراپە گوناهبار نابێ زەلامە پێزانە دەست ڕۆیشتووەکە بە مەنع نەکردنەکەی گوناهبار دەبێ و، فاسقیش دەبێ!.

ئیمامی غەزالی (ر.خ) فەرموویەتی : لە ئایەتی پیرۆزی «والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولیاء بعض، یأمرون بالمعروف وینهون عن المنکر..»ەوە دەردەکەوێ ئەگەر کەسێك لەنێو خەڵکدا دەستی بڕوا و، ئەمر بە چاکە نەکا و نەهی لە خراپە نەکات، ئەوە بە موسڵمانی تەواو نادرێتە قەڵەم، چونکە هەریەك لە موسڵمانان دۆست و یاریدەری یەکترین، کەواتە دەبێ لە نێویانا ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکات ئەگینا موسڵمانی ساغ نابێ!

هەر لە ئاخری ئەو ئایەتەدا خوای گەورە فەرموویەتی: «أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ » واتە: ئەو موسڵمانانە ئەو سیفاتە پێشوانەیان هەیە خوای گەورە میهرەبانییان لەگەڵ دەکا.. بە کورتی موسڵمانی ئەمر بەچاکە کەری نەهی لە خراپەکەر لە دنیاو قیامەتدا لە ژێر بەزەیی خودای گەورەدایەو، ئەوانەش کە دەستیان دەڕوات و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە ناکەن، بەپێچەوانەی پێشووەکان، لە ژێر باری رق و کینەی خودای گەورەدا دەبن، خوا پەنامان بدا. لە تەفسیری ئایەتی «لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ[٧٨] كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ» دا زاناکان فەرموویانە: وا مەعلوومە کە بەهۆی شوومی و نەگبەتیی تەرك کردنی ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەوە خوا دەرگای دڵی مۆر کردوون و لە کۆمەڵی موناففقانی حسێب کردوون و، بە هۆی ئەوەوە شایانی نەفرینی خودا بوون و، چوونە ڕیزی کافرانەوە.

بەڵام یەکێك لە تابعین لە یەکێك لە هاوڕێیەکانی پێغەمبەری پرسیوە: ئایا (بەنی ئیسرائیل)ەکان، کە مەسخ کران، لە ئیمان دەرچوون؟ ئەویش فەرمووی: نەخەیر، بەڵام نەزانەکانیان خەریکی گوناهـ و تاوان بوون و، زاناکانیشیان هەندێکیان وازیان لە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە هێناو، بەم هۆیەوە خوای گەورە قینی لێ گرتن و، گەلێ لە مرۆڤە خراپەکارەکانی مەسخ کردەوە، واتە: لە شێوەی ئادەمیزاددا نەیهێشتنەوە!

هەندێکیش لە زاناکانیان کە وازیان لە ئامۆژگاری و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە نەهێنا، خۆیان و ئەوانەی دوایان کەوتبوون و بە گوێیان کردبوون تووشی مەسخ نەهاتن و بەسەلامەتی مانەوە.

حەزرەتی عائیشە، خوا لە خۆی و لە سیدقی باوکی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) هاتە ژوورە پیرۆزەکەی و، لە شێوەی موبارەکی وەها دەردەکەوت کە دڵگران و زویرەو ئیشێکی گەورەی بە دەستەوە هەیە، یاخۆ سروشی بۆ هاتووە، تەشریفی لە ژوورەکە دانەنیشت و قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد، هەتا ڕۆیشت دەستنوێژی گرت و، جا ڕۆیشتە مزگەوت و دوو رکات نوێژی (تحیە المسجد)ی کرد، لە پاش ئەم نوێژە هەستاو تەشریفی ڕۆیشتە سەر مینبەرو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو فەرمووی:

«ئەی ئادەمیزادەکان! بەڕاستی و دڵسۆزی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن، پێش ئەوەی وەزعتان وای لێ بێ دەست بەرز بکەنەوەو نزا بکەن و، خوای گەورە ئەو نزاو پاڕانەوەتان لێ قەبووڵ نەکا، داخوازەکانتان داوابکەن تا بە نەوازشی خۆی بەجێی، بهێنێ، پێش ئەوەی وەزعتان وەهای لێ بێ کە یارمەتی لە خوای گەورە داوابکەن و ئەویش بۆتان جێبەجێ نەکات!، لە پێش ئەوەدا داوای لێبووردن لە خوای گەورە بکەن و ئەویش گوێتان پێ نەدا..».

ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەزرەت (د.خ) لەسەر مینبەرەکە لەمە زیاتر قسەی نەکردو هاتە خوارەوە، بە پێچەوانەی جاران کە لەسەر مینبەر دەمایەوەو، لە زۆر بابەتەوە پەندو ئامۆژگاریی دەکرد؛ ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە مەخلووق زۆر گوێ بدەنە ئەمر کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە.

برادەران! لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ پاش ئەوە مرۆڤ تەرکی ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپەی کرد، ئیتر خوای گەورە نزاو پاڕانەوەی قەبووڵ ناکا..

لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە (د.خ) ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی: قەسەم بە خوا پێویستە ئەمر بە چراکە و نەهی لە خراپە بکەن ئەگەرنا خوای گەورە ستەمکارەکان بەسەرتاندا زاڵ دەکا و، ئەو کاتە مرۆڤە باشەکانتان لە خودا دەپاڕێنەوەو خوا نزاو پاڕانەوەیان قبووڵ ناکات!

دەگێڕنەوە کە خوای گەورە پەیامی بۆ یەکێك لە پێغەمبەرەکانی (بنی اسرائیل) نارد کە

بە زەلامێکی خواپەرست بڵێ، کە لە خەڵك کەناری گرتبوو گۆشەگیر بوو: فلان کەس!تۆ ، کە وازت لە دنیاو خەڵکی دنیات هێناوە، بۆ ئاسایش و ئارامیی نەفسی خۆت و پێوەندیت لە جیهان بڕیوەو هاتووی بۆ لای من لە نێو خەڵکدا ڕێزت بۆ خۆت پەیدا کردووە، کەواتە چ کردەوەیەکت بۆ خاتری من کردووە بۆ سوپاسگوزاریی ئەو ئازو نیعمەتانەی پێم داویت ؟ کە پێغەمبەرەکە فەرموودەکەی خوای گەورەی بە خواپەرستەکە گەیاند، ئەو لە وەڵامدا عەرزی کرد: ئەو ئیشانەی بۆ خوای گەورە دەکرێن چین؟ پێغەمبەرەکە لە سەر ئەمری خوا فەرمووی: (هل عاديت في عدوا، وهل واليت في وليا؟ وعزتي لا ينال رحمتي من لم يوال في وليا ولم يعاد في عدوا) واتە: ئایا لەبەر خاتری من دوژمنایەتیت لەگەڵ دوژمنی مندا کردووە؟ ئایا لەبەر خاتری من دۆستایەتیت لەگەڵ دۆستی مندا کردووە؟ بەگەورەیی خۆم قەسەم ئەو کەسەی لەبەر خاتری من دۆستی منی خۆش نەوێ و، لەبەر خاتری من دوژمنی من نە بوغزێنێ، هەرگیز بە ڕەحمەت و بەزەیی من ناگا.

ئەی برایانی ئاینی لە بەرزیی ماناو شێوەی دیاری ئەو فەرموودەیە بکۆڵنەوە، کە چۆن لە پێشدا و لە کاتی تووڕەبووندا باسی دوژمنایەتییەکەی پێش خستووە، کەچی لە کاتی میهرەبانیدا دۆستایەتییەکەی پێش خستووە! پێویستە بزانن مەبەست لە دۆستی خوا موسڵمانێکە فاسق نەبێ؛ چونکە خوا فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ) واتە: بە ڕاستی موسڵمانەکان برای یەکن و، پێویستە مرۆڤی موسڵمان هەموو موسڵمانێك بە برای خۆی بزانێ و خۆشی بوێ، بەو مەرجەی فاسق و خراپکار و تاوانبار نەبێ، ئەگەر تاوانبار و بەدکاریش بوو، نابێ لە خۆشویستن و پیاوەتی لەگەڵ کردنی وازبێنێ، هەتا لە ڕێگای ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەوە بیخاتەوە سەر باری خواپەرستی و گوێڕایەڵی، تا دەگاتە پایەی نائومێدی لە چاکبوونی، ئەوکاتە سوننەتە، بەڵکو پێویستە، ئەو کەسە ببوغزێنێ؛ چونکە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

«تقربوا إلى الله ببغض أهل المعاصي، والقوهم بوجوه مكفهرة، والتمسوا رضا الله بسخطهم، وتقربوا إلى الله بالتباعد منهم» واتە: بە بوغزاندنی تاوانباران لە خوای گەورە نزیك بنەوەو، با ڕووتان گرژ بێ لەگەڵیانداو بە تووڕەبوونتان لەوانە داوای خۆشنوودیی خوا بکەن بۆ خۆتان و بەدووریتان لەوان لە خوا نزیك بنەوە، بەڵام لێ نزیك بوونەوەیان بۆ ئەوەی مەنعیان بکەن لە کردەوەی ناشیرین، دەبێتە هۆی خۆشنوودیی خوای گەورە.

ڕیوایەت کراوە کاتێك کە مرۆڤ مردوو، لە گۆڕدا شاردرایەوە گۆڕەکە دێتە زمان لەگەڵ

ئەو مرۆڤەداو پێی دەڵێ: من شوێنی فیتنەو تەنیایی و کرمم، خۆ تۆ دەتزانی کە دەمری، بۆچی سەربەست و بێ باك بووی لەم ڕۆژە؟ جا ئەگەر مردووەکە مرۆڤێکی باش و کردار چاك بێ خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێ لە باتی ئەو وەڵامی گۆڕەکە دەداتەوەو پێی دەڵێ: ئەی تۆ چاوت لێ نەبوو کە لە ماوەی ژیانیدا خەریکی ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بوو؟ کە گۆڕەکە ئەم وەڵامە دەبیستێ دەڵێ مادام وایە ئیتر من بۆی دەبم بە باخێ لە باخەکانی بەهەشت و، بەسەر لەش و گیانیدا دەبمە بارانی ڕەحمەت..

ڕیوایەت کراوە: (القبر أما روضة من رياض الجنة، أو حفرة من حفر النيران). واتە: گۆڕی مزدوو یا دەبێتە باخێك لە باخەکانی بەهەشت، یا دەبێتە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ!

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێك خراپەیەکی بەرچاو کەوت یا پێی زانی، پێویستە لەسەری مەنعی بکا بە دەستەڵاتی خۆی، ئەگەر دەستی دەڕۆیشت، ئەگەر دەستی نەڕۆیشت پێویستە لەسەری بە زمان مەنعی بکا (واتە: یا بڕوات بە زمان ئامۆژگاری بکات، یا بە یەکێك لە دەستەڵاتدارەکان بڵێ: مەنعی بکا، بەو مەرجانەی کە شەریعەت دای ناون). خۆ ئەگەر ماوەی ئەمەیشی نەبوو ئەوا لەسەری پێویستە بەدڵ ئەو کارە ناشەرعییە ببوغزێنێ و ناڕازی بێ لێی، ئەم پایەی دواییە (أضعف الأيمان)ە، واتە: کەمترین پایەی نیشانەکانی ئیمانە کە لە مرۆڤی موسڵمانەوە دەریکەوێ و، لەم پایە بەولاوە هیچ پایەیەکی ئیمان نامێنێ، واتە: ئەمەش نەبوو ئیتر ئیمان لە دڵا نامێنێ.

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ر.خ) فەرموویەتی: بڕگەی دوایی ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەسێ پێ ناخۆشبوونی دەروونی نەمێنێ کافری خەفیفە، چونکە لای ئیمام ئەحمەد مرۆڤ یا موسڵمانە یا کافرە، بۆ کافریش لای ئەو دوو جۆر کوفر هەیە: یەکەم کوفری قورس کە بریتییە لە باوەڕ نەکردن بەخوا، یا بە پێغەمبەرانی خواو، بە مەلائیکەو، بە کتێبی خوداو، بە پێغەمبەران و، بە ڕۆژی قیامەت و، بە قەزاو قەدەرو باوەڕ نەکردن بە پێنج فەرزەی نوێژو هاوچەشنەکانی. جۆری دووەم کوفری سووکە، وەکو بەدڵ مەنع نەکردنی کاری ناشەرعی و، نەکردنی نوێژو، نەکردنی جیهاد ...هتد..بەدڵ پێ ناخۆشبوونی کاری ناشەرعی فەرزی عەینە لەسەر هەموو تاقە موکەللەفێك، بەڵام ئەمر کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە بە دەست یا بە زمان، ئەوە فەرزی کیفایەیە.

ئەی براکانم! هەر شتێك و هەر کارێك مرۆڤ بەدڵ حەزی لێ نەکا ناچار بە دەست و بە زمان مەنعی ئەو شتە دەکا، ئەگەر بە دەست و زمان نەتوانێ مەنعی بکات، ئەوا بەدڵ ڕقی لێی دەبێتەوە، جا ئەگەر بە دەست و زمان نەتوانێ مەنعی بکا و، بە دڵیش ڕقی لێی نەبێ، ئەوە مەعنای وایە بەدڵ حەزی لێی دەکا، کە بەدڵ حەزی لێی کرد دیارە تاوانبارە؛ چونکە واجبێکی تەرك کردووە کە لە توانایدا هەیە.

ریوایەت کراوە هەرکەسێك ئامۆژگارییەکی باش بکا و، خەڵك ئاگادار بکا لە واجبێك یا لە سوننەتێك، هەر کەس ڕەفتاری پێی بکا هەتا ڕۆژی قیامەت ئەو ئامۆژگاریکەرە هاوبەشی خێری ئەو ڕەفتارەیە هەتا هەتایە، لە کاتی گەیشتن بە خوای گەورە لە قیامەتدا بە تەواوی پاداشەکەی بۆ حسێب دەکا..

لە جوملەی « فوفاه حسابه» لە قورئانی پیرۆزدا وا دەردەکەوێ کە بێجگە لە هاوبەشی لەو پاداشەدا، خوا لە ڕۆژی خۆیدا پاداشی زیاتری پێ دەدا، واتە: هاوبەشی لەو پاداشەدا بۆ ئەو کەمەو، خوای گەورە زیاتری پێی دەبەخشێ.

لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە کە ئەگەر پاداشی هەرچی خواپەرستی هەیە کۆ بکرێتەوە ناگاتە پاداشی جیهادێ لە رێی خواداو، پاداشی هەموو جیهادێ لە ڕێگای خوادا کۆیکرێتەوە ناگاتە پاداشی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە و، وەك پیاڵە ئاوێکە بەرامبەر دەریایەکی گەورەی بێ سنوور، بەڵام پێویستە بزانن ئەم پاداشتە زۆرە بۆ کەسێکە کە لەبەر ڕەزای خوای گەورە هەمیشە بەردەوام بێت لە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە، ئەگەرنا کەمێك ئەمر بە چاکە ونەهی لە خراپە ناگاتە پایەی جیهادێ لە ڕێگای خوادا..

ئەی برادەران! بیر بکەنەوە کە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە چ سامانێکەو چ پایەیەکی بەرزی هەیە لای خوای گەورە، بە ڕادەیەك لە جیهادو غەزای کافران خێری زۆرترە، مرۆڤی هۆشیار و بەختیار ئەو کەسەیە کە بەدوای ئەم پایە بەرزەدا بگەڕێ.

ریوایەت کراوە: ئەو کەسانە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن خەلیفەی خواو خەلیفەی قورئان و خەلیفەی پێغەمبەری خوان و، کەسێك خەلیفەی ئەمانە بێ لە خواوە نزیکەو، بەر بەخشش و لێ خۆشبوونی دەکەوێ.

تەماشاکەن پێغەمبەری خوا (د.خ) فەرموویەتی «لأن يهدي الله بك رجلا خير لك من

الدنيا وما فيها » واته : بێ گومان ئەگەر خوای گەورە بە هۆی تۆوە یەکێك بخاتە سەر ڕێگای ڕاست لە هەرچی دارایی و سامانی جیهانە باشترە بۆ.. بۆ نموونە: ئەگەر ببی بە هۆی نوێژکردنی مرۆڤێکی نوێژنەکەر، یا پەشیمان بوونەوەی مەی خۆرێك، یا وازهێنان و تۆبەکردنی داوێن پیسێك، یا ببیتە هۆی موسڵمان بوونی جوولەکەیەك یا گاورێك ئەوە چاکترە لەوەی کە لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆرنشین موڵکی تۆ بێ و، دەرامەتی ئاڵتوون و زیوی هەمووی بۆ تۆ بێ و سەرفی هەژارانی بکەی.

پێویستە تۆ باوەڕت بەم فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) هەبێ لەبەر چەند دەلیل، یەکەم: چاکە لەگەڵ گەدادا ئازاری برسیەتی لادەبات، بەڵام ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە ئازارو سزای ڕۆژی قیامەت لادەبا. دووەم: ئەوەی بە گەدایانی دەدەی سەرف دەبێ و نامێنێ، بەڵام هیدایەت و ڕاهنموونیی ئاینی ئەنجامی خێری هەتا هەتایە دەمێنێ. سێیەم: خزمەت کردنی دنیایی دەبێتە هۆی ژیانی دنیایی کە پایەدار نییە، بەڵام خزمەت کردنی ئاینی دەبێتە هۆی ژیانی نەبڕاوە، دیارە فەرقی ئەم دووانەش زۆر زۆرە. ریوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: بەو خوایە قەسەم، کە گیانی منی بەدەستە، هەندێ کەس لە ئوممەتی من کاتێك لە گۆڕ دێنە دەرەوە بۆ حەشر شێوەیان دەبێتە شێوەی مەیموون و بەراز؛ لەبەرئەوە کە لە دنیادا بەرامبەر بە فاسقان و تاوانباران ڕووپامایی و ڕیایان کردووەو، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەسەڵاتیان بووە مەنعیان نەکردوون لە گوناهـ...

براکان! حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: نیشانەی هاتنی قیامەت سێ شتەو، لەو فەرموودەدا ئەوەی باس کردوە کە ئیشی باش بە خراپ دەدرێتە قەڵەم و ئیشی خراپ بە ئیشی باش!

مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە، ئەم ڕەوشتە دەبێتە شێوەی یاساو نەریتی خەڵك، کە هەرکەس ئەمر بە چاکە بکا ئەو ئەمر کردنە بە خراپ دەزانن و ئازاری ئەمرکەرەکە دەدەن و، لە بەرچاویان لەکەدار دەبێ! خۆ ئەگەر ئازاریشی نەدەن ئەوا لە پاشەملە باسی بە خراپی دەکەن و غەیبەتی دەکەن! ئەم غەیبەت کردنە لە سەر من رووی دا: لەم بەینە پێشووەدا لە قەراخی شاردا خێوەتێکیان هەڵدابوو بە ئاشکرا شەرابیان تیا دەخواردەوە، منیش هاتم فەقیەکانم کۆکردەوە تا بڕۆم مەنعیان بکەم. هەندێ لە پیاوی ماقووڵ دەستیان هێنایە ڕێگام و نەڕۆیشتم بۆ سەریان، کە ئەهلی خێوەتەکە بەمەیان زانی ڕۆیشتن بۆ لای فەرمانداری شارو، ئەم نیازەی منیان بە ئاشووبێکی گەورەو فیتنەجۆیی

دایە قەڵەم و، فەرمانداریش، لەبەر بەدخوویی، موافقی ڕای ئەوان بوو، مەزبەتەیەکیان ئامادە کردبوو کە کارەکە بخەنە ڕەسمییاتەوە تا ئێمە لە شار دوور بخەنەوە، بەڵام لە ڕەحمی خواوە ئەهلی شار تێکڕا مەنعیان کردن، بەڵام تا ئێستە هەر کینە لە دڵیاندا ماوە.. پەنا بە خوا..

جا با بگەڕێینەوە سەر فەرموودەکەی حەزرەت (د.خ) کە فەرموودەیەکی درێژە: هەندێ لە هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: چۆن دەبێ موسڵمانان چاکە بە خراپەو، خراپە بە چاکە بزانن؟ ئایا ئەمە ڕوودەدا؟ فەرمووی: بەڵێ بەو خودایە کە گیانی منی بەدەستە ئەو وەزعە دێتە جێ و، خوای گەورە سوێندی خواردووە کە ئاشووپێکی وەها دەنێرم بۆ ئەو گەلە تاوانبارە کە مرۆڤی وشیار لێی سەرسام دەبێ لەبەر نابارى و چارەنەکراوی!..

ریوایەت کراوە: هەر کۆمەڵێك تاوان و گوناهە لە نێویاندا باو بێ و دەسترۆیشتووەکانی مەنعی ئەو تاوانە و گوناهانە نەکەن، خوای گەورە هەموو ئەو کۆمەڵە تێکڕا، بە چاك و خراپییەوە گیرۆدەی سزا دەکا.. بە دەلیلی ئەوەی کە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ».

واتە: خۆتان لەو مەینەت و ئاژاوەیە بپارێزن کە تەنیا تاوانبارەکانتان ناگرێتەوە، بیشزانن کە خودا سەختگیرە!

ریوایەت کراوە: کە ئەگەر لە ناو هۆزێکدا یەك کەس خەریکی گوناه و تاوانکاری بێ و، هۆزەکە لەگەڵ دەست ڕۆیشتنیدا تاوانەکە مەنع نەکەن ئەوا هەموو ئەو هۆزە دووچاری سزای خوا دەبن.

ریوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «لا یزال لا اله الا الله تنفع من قالها حتی یستخفوا بها، قالوا: وما الاستخفاف بها؟ قال : الاستخفاف بها ویحقها أن یظهر العمل بالمعاصي فلا ینکرونه ولا یغیرونه». واتە: هەمیشە ڕستەی (لا اله الا الله) سوود بەو کەسە دەدا کە دەیڵێ و دەیخوێنێتەوە، هەتا ڕۆژێ کار دەگاتە ڕادەیەك گاڵتە بەو ڕستەیەو بە مافی ئەو ڕستەیە دەکەن، عەرزیان کرد: چۆن گاڵتەی پێ دەکەن؟ فەرمووی گاڵتە کردنەکە ئەوەیە کە کرداری خراپ و تاوانکاری لە وڵاتەکەیاندا سەر هەڵبدا و، ئەوانیش لەگەڵ تواناشدا مەنعی نەکەن و نەیگۆڕن.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: خوای گەورە شارێك لە ناو دەبات، ئەو

شارە هەژدە هەزار مرۆڤی چاك و خوورەوشت پاکی تێدایە کە بە پێی یاسای پێغەمبەران ڕەفتار دەکەن، عەرزیان کرد هۆی ئەوە چییە کە خودا سزای بێ گوناهەکانیش دەدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەو مرۆڤە باشانە ئەمریان بە چاکەو نەهییان لە خراپە نەدەکرد، بۆیە هەموویانی بە سزا گەیاند.

ریوایەت کراوە کە خوای گەورە سرووشی بۆ حەزرەتی (شوعەیب) نارد: کە چل هەزار کەس لە چاکانی ئوممەتی تۆ لەگەڵ پێنج سەد هەزار فاسق و فاجردا بە هیلاك دەدەم، ئەویش عەرزی بارگای خوای کرد: ئەی خوایا چاکەکان بۆ بەهیلاك دەدەی؟.، خوای گەورە فەرمووی: لەبەرئەوەی لە کاتی هەتکی حورمەتی ئایندا ئەوان ئەمر بە مەعرووف و نەهی لە مونکەریان نەکردووە.

ریوایەت کراوە مرۆڤێکی ڕەفتار باش لەناو کۆمەڵێ لە بەد ڕەفتاران ئەویش بە سزای خوا گیرۆدە بوو، لەبەرئەوە کە دراوسێ و هاوڕێی ئەو خراپانە بووەو ڕووی لێ ترش نەکردوون.

براکان! ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بە دووبەش جێبەجێ دەکرێ، یەکەم زانایانی ئاین، دووەم سەرۆکان و کاربەدەستان، واتە: بە زاناکان بەتەنیا تەواو نابێ، ئیتر هەرەمەی خەڵك و نەخوێندەواران مەعلووماتیان کەمەو، بەکاری ئەوە نایەن ئامۆژگاری ئاینی بکەن، بەڵام لە سەریان پێویستە بە قەدەر فام و زانستی خۆیان تەمێی کەس و کارو خێزانی خۆیان بکەن، ئەگەر خستیانە پشتگوێ و کەمتەرخەمییان کرد ئەوا ئەوانیش بە تاوانبار دەناسرێن. بە پێی فەرموودەی شەریعەتی پاکی ئیسلام زانینی یەك مەسەلەی ئاینی و فێرکردنی بە نەزانان بەقەدەر هەزار ركات نوێژی سوننەت خێرو پاداشتی هەیە؛ چونکە فەرزی علیم لە هەموو فەرزێك گەورەترو سوننەتی علیم لە هەموو سوننەتێ گەورەترە..

ئەی برایان! ئەگەر چی لەبەر پایەو حورمەتی پێغەمبەر (د.خ) سزای مەسخ بوونەوەی سورەتی ئادەمیزاد هەڵگیراوە، بەڵام مەسخی ئەخلاق و خوورەوشت هەر ماوە؛ تەماشاکەن ئەو ئادەمیزادانەی کە لە ئایندا کەمتەرخەمی دەکەن و یاسای ئاین پەیرەوی ناکەن خوورەوشتی بەدو ناشایستە داگیریان دەکا، وەکو حەسوودی و ڕق و کینە و دڵ ڕەقی و نامەردی و درۆو ساختەچییەتی، هەروەها پیت و بەرەکەت لە ڕزق و ڕۆزییان هەڵدەگیرێ و، خاوەن دەسەلاتیش بن، ژیانیان هەر تاڵ و ناخۆش دەبێ..

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی : «جزاء المعصية الوهن في الطاعة والضيق في المعيشة والتعس في اللذة، قالوا: وما التعس في اللذة ؟ قال: لا ينال شهوة حلالا الا جاءه ما ينغصها عليه». واتە: پاداشتی تاوانکردن و لەسەر گوناھ ڕۆیشتن ئەوەیە کە تاوانبارەکە لە خوداپەرستیدا سست دەبێ و، ڕۆزی تەنگ دەبێ و، تەنانەت ئەگەر دڵخوازێکی خۆیشی دەست کەوێ بە حەڵاڵی تەگەرەیەکی لێ تایەن دەبێ کە خۆشییەکەی لێی تاڵ دەکا و دەیکاتە قوزەڵقورتی!.

ریوایەت کراوە کاتێ کە خودای گەورە خەشم و ڕقی لە کۆمەڵێ گرت شەش بەڵایان بەسەردا دەدا: نرخی شت وەمەك گران دەکا لەسەریان، عومریان کورت دەکا، لە مامەڵەو کڕین و فرۆشتندا قازانج کەم دەبێ، لە کاتی پێویستیدا بارانیان بۆ نابارێ، ئاوی سەرچاوەیان کەم دەکا، پیاو خراپ بەسەریاندا زاڵ دەبێ. ئەم بەڵایانە بەلای زۆرەوە لە دەورویەری ئێمەدا هەن. لە هەندێ فەرموودەی پێغەمبەردا دە بەڵا بۆ ئەو کۆمەڵە باس دەکا، ئەو شەشە کە وتمان و چواری تریش کە بریتین لەمانە: یەکەم دەوڵەمەندەکانیان زەکات نادەن، دووەم گەداکانیان نوێژ ناکەن، سێیەم سەرۆکەکانیان داوێن پیس دەبن، چوارەم فەرمانداراکانیان ستەمکار دەبن.

براکان! ئەگەر هەموو عومری خۆتان لە ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپەدا بەخت بکەن و تاقە کەسێك بەهۆی ئێوەوە بکەوێتە سەر ڕێگای ڕاست و بزانن عومرتان بە خەسار نەچووە، چونکە لە حەدیسی پێغەمبەردا هەیە: ئەگەر مرۆڤێك بە هۆی تۆوە ڕێگای ئاین بگرێتەبەر بۆ تۆ لە هەموو سامانی جیهان چاکترە، واتە: ئەگەر هەموو جیهان موڵکی تۆ بێ و بیدەی بە خەڵك بەقەد ئەوە خێری نییە کە گومڕاهێ بخەیتە سەر ڕێگای ڕاست؛ چونکە لە ڕۆژی دواییدا پێغەمبەرەکان (د.خ) لە هەموو کەس نزیکترن لە بارەگای خواوە، پاش پێغەمبەران ئەو کەسانە کە پەیڕەویی ئەوانیان کردووەو، خەڵکیان بۆ خواپەرستی و پیاو چاکی بانگ کردوە، بێگومان ئەم پایەی نزیکییە لە بارەگای خوا لە هەموو جیهان بەنرخترە. لە ڕاستیدا هەر قازانجێك بە هەر کەس بگەیەنرێ لە جیهاندا خزمەتی ژیانی دنیای ناپایەدار دەکا، بەڵام ڕێ بەدێیی و کاری چاك پیشاندان خزمەتی ژیانی پاشەڕۆژی نەبڕاوەی هەتاهەتا دەکا، بێگومان ئەم ڕێ پیشاندانە وەك ئەوەیە ئەو کەسە لە حاڵەتی مردندا بێ و تۆ زیندووی بکەیتەوە؛ خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: «وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً»...

گومڕاهکردنی کەسێکیش وەك کوشتنی ئەو کەسەیە؛ «مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً».

ڕیوایەت کراوە لە (ابو هريره)وە (ر.خ) کە عەرزی حەزرەتی کردووە: ئێمە خۆمان ئیشی چاکە نەکەین و دەسبەرداری ئیشی خراپە نەبووبین چۆن ئەمر بە خەڵکی بکەین کاری چاکە بکەن و نەهیی خراپەیان لێ بکەین؟! حەزرەت(د.خ) لە وەڵامدا فەرمووی: «مروا بالمعروف وإن لم تعملوا به، وأنهوا عن المنكر وإن لم تنتهوا عنه كله» واتە ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە لە سەر موسڵمان واجبە هەرچۆن بێ، واتە : خەڵکەکەی تر گوێ بگرن یان نا، خاوەن ئەمرو نەهییەکان خۆیان ڕەفتاریان باش بێ و، بە پێی ئەمرو نەهییەکە ڕەفتار بکەن یان نا؛ چونکە بەوە کە کابرا خۆی فاسق بێ نابێ تەرکی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکا، بەڵێ ئەم جۆرە مرۆڤە بەهۆی فیسقەکەیەوە سزای خۆی وەردەگرێ، بەڵام بەهۆی ئەمر بە چاکە و، نەهی لە خراپەکیشیەوە خوای گەورە پاداشتی چاکی دەداتەوە، ئەگەرچی سزای ئەوەش دەدرێ کە بە پێی گوفتارەکەی خۆی ڕەفتار ناکا!

دەگێڕنەوە لە پاش وەفاتی (ابو سهل) کە یەکێك بوو لە پیاوچاکان، یەکێك لە خەودا چاوی پێ کەوت و پرسیاری لێ کردو هەر لە خەوەکەدا لێی پرسیبوو: ئایا لە سزای خوای گەورە ڕزگار بووی و، بە چی ڕزگار بووی؟! ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: هەرچی وردەکاریی زانستی بوو هەمووی بوو بە تۆزو بڵاو بوویەوەو هیچ سوودم لێ وەرنەگرت، بەڵام هەندێ ئەحکامی ئاینیم فێری شاگردەکانم کردبوو، ئەوانە بوونە هۆی ڕزگار بوونم لە سزای خوای گەورە. خوای گەورە فەرموویەتی:- «وَإِذَ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْماً اللّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَاباً شَدِيداً قَالُواْ مَعْذِرَةً إِلَى رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ[١٦٤] فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ». واتە: (بەنی ئیسرائیل) لە ڕێگای ئاین لایان داو وازیان لە کاری چاکە هێناو دەستیان دایە تاوان و گوناهکردن، لەو کاتەدا زاناکانیان بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان دەستیان کرد بە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەو، بەشێکیان وازیان لە قەومەکەیان هێناو، بە بەشی یەکەمیان دەوت: ئێوە بۆ چی ئامۆژگاریی قەومێکی وەها دەکەن کە خوای گەورە بێ گومان دەیانفەوتێنێ و لە پاشەڕۆژدا سزایان دەدا؟! بەشی یەکەم لە وەڵامدا وتیان: هەتا ئەم ئامۆژگارییەمان ببێتە عوزرو بەهانە بۆمان لە

بەردەمی بارەگای خواوەندی گەورەداو، بتوانین بڵێین: خودایا! ئێمە ئامۆژگاریمان کردن، بەڵام ئەوان گوێیان لێ نەدەگرتین، هەروەها بۆیە ئامۆژگارییان دەکەین دەڵێین بەڵکو لە تاوان دەستبەردار ببن و لە ترسی سزای خوا واز لە گوناهـ بهێنن.. جا کە (بەنی ئیسراییل)ە تاوانبارەکان ئەو دەرزەو ئامۆژگارییانەیان فەرامۆش کرد، تەنیا زانا پەرۆشەکان، کە ئامۆژگارییان کردبوون، ڕزگارمان کردن و، ئەوانی تر- کە ستەمکارو گوناهبار بوون سزامان دان؛ چونکە لە فەرمانی ئێمە دەرچوون، هەندێ لە زاناکانیان لەبەرئەوە ئەمریان بە چاکەو نەهییان لە خراپە نەدەکرد، ئەوانی تریشیان لەبەر تاوانباری... جا لەو ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێ ئەو کەسانەی واز لە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە دەهێنن، لەگەڵ دەست ڕۆیشتندا، ئەوانەش وەکو فاسقەکان بە نافەرمان و گوناهبار دەدرێنە قەڵەم.

دەگێڕنەوە: کە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، خوایان لێی ڕازی بێ، کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەگریاو دەیفەرموو: ئێمە کاری بەد دەبینین و بێ دەنگ دادەنیشین!...

ئەی برادەران! هاوار بە حاڵی ئەو خاوەن دەسەڵاتە موسڵمانانە، کە دەستیان دەڕوا و بە چاوی خۆیان کاری بەدی جۆراوجۆر دەبینن و دەس ناهێننە ڕێگای ئەو کارە خراپانە!

ئەی برادەران! ئوممەتی (بەنی ئیسراییل) لەسەر گوناهکاری و بێ گوێیی کردنی فەرمانی خوای گەورە، هەندێکیان مەسخ کران، واتە چوونە پێستی مەیموون و بەراز، بەڵام ئەم ئوممەتی ئیسلامە، لەبەر شەرافەت و پایەی حەزرەتی (محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم) لە مەسخ بوون پارێزراون، ئەگەر چی بەهۆی تاوانبارییەوە ئەخلاق و خووڕەوشتیان دەگۆڕێ، ئەی نابینن لەم ڕۆژەدا لە نێو موسڵمانانادا مافەکانی ئیسلامییەت، وەکو غیرەت و وەفاو ڕاستی و میهرەبانی و دڵسۆزی و ڕاگرتنی دڵی دراوسێ و ڕێز لە ئەهلی دین گرتن هەر ناویان ماوە!..

لە کتێبی (کشف الاسرار)دا دەڵێ: ئەی موسڵمانان! لە خەشمی خوای گەورەو تۆڵەسەندنی بێ باك و کەمتەرخەم نەبن، خوای گەورە کە ڕقی لە ئوممەتی پێشوو گرتووە شێوەی ئینسانیی لێ هەڵگرتوون بەڵام غەزەب لەم ئوممەتە بگرێ خووڕەوشت و دەروونیان دەگۆڕێ و، دڵیان ڕەش دەکاتەوە، مەولانا جەلالەدین ڕۆمی لە (مەسنەوی) یەکەیدا دەفەرمووێ:

نقض توبه و عهد آن اصحاب سبت
مـوجب مسخ آمـدو اهـلاك و مـقت
پس خـدا آن قـوم را بـوزيـنـه كـرد
چـونكه عـهد خود شكستن بود بد
انــدريــن امت نــبــود مسخ بــدن
لــيك مسخ دل بــود يــا ذا الـفـطـن
مسخ ظــاهـــر بـــود اهـــل سبت را
تــا بـبـيـنـد خـلـق دل كـبت را
از رهـــى سى صد هـــزاران دگـــر
گشته از توبه شكستن خوگ و خر

واتـاى ئەم شيعرە فارسييانە بە كوردى ئەمەيە:

بـۆ ئـەهلـى شەممـە تێكدانـى پـەيمـان
بوو بە هۆى مەسخى سوورەتى ئەوان
چونكە بێ عەهدى ڕەوشتێكە دوون
شێوەى ئەو گەلەى گۆڕى بە مەيموون
ئـومـمـەتـى ئـيسلام شێوەى نـاگـۆڕێ
بـەڵـێ خـووى چـاكـى دڵـى دەگـۆڕێ
بـۆ چ گۆڕێ شێوەى شەممەگيرەكـان
تـا بـبـن بـە پـەنـد لـە بـۆ ژيـرەكـان
ژمـــارەيـــە زۆر لـــە عـــادەت بـــەدەر
لە تۆبەشكێن بوون بە خووگ و كەر

جا براكان! بزانن ئەمر بە چاكە و نەهى لە خراپە دەوڵەت و سامانێكى بەنرخەو، هـەركـەس بـەشى لـەم دەوڵـەتـە نـەبێ خـاوەن شەقـاوەتـەو، هـەركـەس تـيـايـا بـەشدار بێ بەختيارو خاوەن سەعادەتە. وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه والتابعين. وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين..

## نامەی دووەم

# نامەی گەورەیی بیروباوەڕ -عقائد-ه

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه الهداة إلى دين الله.

وبعد. ئەی برادەران خوا هیدایەتتان بدا، هەندێ لە زاناکانی زانستی (کلام) بیرو باوەڕیان وا بووە کە موسڵمانی نەخوێنەوار، وەکو موسڵمانە خوێندەوارە زاناکان، ئەگەر بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی خوای گەورە نەناسن ئەوە موسڵمان نین. جا لەبەرئەوەی ئەم بیروباوەڕە نارەوایە بە پێویستم زانی ئەم مەسئەلەتان بۆ وردبکەمەوەو لێکی بدەمەوە بۆتان؛ نەوەك هەندێ موسڵمان بەهۆی ئەو بیروباوەڕە نارەوایەوە لە بەزەیی و میهرەبانیی خوا ناهومێد ببێ و خۆی بە موسڵمان نەزانێ، یا هەندێ لە زانایان گومانی خراپ بە موسڵمانە ئومییەکان ببەن و، خوانەخواستە بە موسڵمانیان نەزانن!.

ئیمام محەمەدی غەزالی (ر.خ) فەرموویەتی: دەلیل و بەڵگە هێنانەوە لەسەر بوونی زاتی خوای گەورەو یەکیەتیی ئەو وەکو دەرمانی دوکتۆری زیرەك و زانایە، واتە: هەروەکو دکتۆر تا لە نەخۆشییەکە حاڵی نەبێ دەرمان بە نەخوشەکە نادا و، کە بەنەخۆشییەکەشی زانی، بەقەدەر پێویست دەرمانی بۆ دیاری دەکا، هەر بەو جۆرە زانای زانستی بیروباوەڕ لە سەری پێویستە بەپێی ڕادەی هۆشیاریی موسڵمانان ئامۆژگارییان بکا و، بەقەدەر توانای بیروهۆشیان شتیان فێر کا؛ ئەگەر نا ئیرشادکردنی زیاد لە توانا زیانی لە سوودی زیاتر دەبێ.

ئاشکرایە موسڵمانان تێگەیشتن و زیرەکییان وەکو یەك نییە، جا ئەگەر موسڵمانێك زیهنی تیژ نەبوو، بە بیستن لە زانایان و لە هاوڕێیانی خۆی، یا لە عائیلە و خێزانیەوە بیروباوەڕێکی بتەوی دەست کەوتبێ، نابێ ئێمە ئەو بیروباوەڕی بجووڵێنن و ختووکەی بدەین و تووشی گیروگرفت بەڵگە و بەڵگەکاریی بکەین، یاخود یەکێك بە بەڵگەیەکی سووك بیروباوەڕی دامەزرا پێویست نییە وردەکاریی زانستی (کەلام) بخەینە بەردەمی..

نابینی حەزرەت(د.خ) داوای شایەتومانی لە عەرەبە دەشتەکییەکان دەکردو، تەنیا بە وتنی (شهادتین) قەناعەتی دەکرد؟!

هەمووتان دەزانن کە خوای گەورە ئایەتی «لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا» دەکات بە بەڵگەی تاك و تەنیایی خۆی و هەرِەمەی موسڵمانان بەم بەڵگەیە قەناعەت دەکەن.

بەڵێ ئەگەر مرۆڤێکی موسڵمانی زۆر زیرەك هەبوو کە بە بەڵگەی خەڵکی هەرِەمە قەناعەتی نەکرد، ئەو کاتە پێویستە کە بەڵگەی بەهێزو کاریگەری بۆ بهێنرێتەوە.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێت «ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ».

واتە: ئەو ئادەمیزادانەی کە وشیارو زیرەك و پایە بەرزن بە حیکمەت– واتە: بەڵگەی کاریگەر– بانگیان بکە بۆ فەرمانبەرداریی خواو، ئەوانەش کەلەو پایەدا نین، بەڵکو لە هەرِەمەی خەڵکین، بە وتارێکی نیقناعی و ئامۆژگارییەکی جوان و پەسەند ئامۆژگارییان بکەو، کە جیدالت کرد بە شێوەیەکی جوان بیکە...

وا دەرکەوت کە مەبەست لە (حیکمەت) دەلیلی قەتعی و یەقینییە، کە لەگەڵ ئەوانەی بیریان تیژەو تێگەیشتوون بە کار دەهێنرێ و، مەبەست لە (مەوعیزەی حەسەنە) چەشنە دەلیلێکە کە قەناعەت بە گوێکر بکا، ئیتر، با قەتعییش نەبێ، کە لەگەڵ ڕادەی تێگەیشتنی خەڵکی هەرِەمەدا بگونجێ، مەبەست لە (موجادەلە)ش گفتوگۆیە لەگەڵ ئەوانەدا کە زانیارییان کەمەو، زۆرتر حەزیان لە قسەی بێ سوودە! پێویستە بزانن کە ناسینی ڕاستەقینەی زاتی پەروەردگار لە عەقڵەوە دوورەو ئەستەمە، ئەوانەی لەم بابەتەوە ئاشنایەتییان هەیە فەرموویانە: ئەگەر کەسێ پرسیاری کرد کە ناسینی زاتی پەروەردگار بەچییە؟ لە وەڵامدا بڵێن: خوا مەووجوودە یانی هەیە، واحیدە یانی : تاق و تەنیایە، (قائم بالذات)ە : واتە خۆی بەخۆی هەیەو، وەك (عەرەز) نییە کە بە شتێکی ترەوە ڕاوەستابێ، لە هیچ شتێك ناچێ و، هەرچی بە خەیاڵی ئێمەدا بێ وەهانییە. ناسینی سیفاتی خواش ئەوەیە کە بزانن خوای گەورە عەلیمە، واتە: زانایەو، بەهەموو شت دەزانێ و هیچی لێ ون نابێ. موریدە، واتە: خاوەنی خواستەو هەر شتێ ئەو خواستی لە سەری هەبێ پێویستە ببێ و، هەر شتێ خواستی ئەوی لە سەر نەبێ نابێ. قەدیرە، واتە: خاوەن دەستەڵات و توانایەو ئەوەی بیەوێ دەیکا. سەمیعە، واتە: هەموو شت دەبیسێ و هەر دەنگێ هەبێ، بەرز یا نزم، دوور یا نزیك لە هێزی بیستنی ئەو دەرناچێ. بەسیرە، واتە:

هەموو شت دەبینێ و، گەورەو بچووك و دوورو نزیك لە دەسەڵاتی بینینی ئەو دەرناچێ.
حەییيە، واتە: زیندووەو نامرێ..

پێویستە بزانن کە هەروەکو حەقیقەتی زاتی خوای گەورە پەی پێ نابرێ و کەس پێی ناگا، حەقیقەتی سیفەتەکانیشی نەزانراوەو کەس پەی پێ نەبردوون، چونکە بیرو هۆشی ئێمەو بۆچوونمان سنوورێکی تایبەتی هەیە و، لەو سنوورە تێپەڕ ناکا، حەقیقەتی زات و سیفەتەکانی خواش بێ سنوورەو بە هەست و بیری کورتی کەموکوڕیی ئێمە دەرك ناکرێ، واتە: زات و سیفەتەکانی خوای گەورە دواهاتن و بڕانەوەیان بۆ نییە، بەڵام بیرو هۆش و تێبینینیی ئێمە شتێکی کەموکوڕو بڕاوەیەو، توانای ئەوەی نییە پەی بە کونهی زاتی خودا بەرێ!..

ئەی برایانی ئاینی لەگەڵ ئەمانەدا کە وتمان پێویستە بۆ ئێمە بەگشتی کە بزانین چی پێویستە بۆ خواو، چی مەحاڵەو، چی مومکینە و بوون و نەبوونی ڕەوایە:

بزانن ئەو سیفەتانەی بۆ خوای گەورە پێویستن و دەبێ ببن بیست سیفەتن:

یەکەم: سیفەتی نەفسی کە (وجود)ە، واتە: بوون، یانی: زاتی خودا سیفەتی بوونی هەیەو، پێویستە ببێ.

دووەم: سیفەتی (قدم)ە، واتای (قدم) ئەوەیە کە نەبوون پێش بوونی نەکەوتووەو هەر بووەو کاتێ نەبووە کە خوای گەورە نەبووبێ ئەمەش سیفەتی (ازلیە)ە.

سێیەم: سیفەتی (بقا)یە، واتە کاتێ نابێ کە خوای گەورە نەبێ و، هەمیشە دەبێ، ئەمەش صیفەتی (ابدیە)ە .

چوارەم: موخالەفەی حەوادیثە، واتە: زاتی خودای گەورە لە هیچ ذاتێك ناچێت و، صیفەتی لە صیفەتی کەس ناچێ.

پێنجەم: (قائم بالذات)ە، واتە: خوای گەورە خۆی بە خۆی هەیە و پێویستی بە هیچ کەسێك و هیچ شتێك نییە.

شەشەم: تەنیاییيە، واتە: خوای گەورە یەك زتەو زاتێکی تر نییە لەگەڵیداو، سیفەتەکانی هەر بۆ ئەون و،کەس لەو سیفەتانەدا، هاویەشی نییە.

ئەم پێنج سیفەتە دواییيە بە ناوی (سیفاتی سلبیە)وە مەشهوورن ؛ چونکە لە واتای ئەم

سیفاتانەدا نەفی و سەلب هەیە، بۆ نموونە: کە دەڵێین خوا قەدیمەو قیدەمی هەیە واتە: نەبوونی لێ پێش نەکەوتووە، کە دەڵێین بەقای هەیە واتە: نافەوتێ و نەبوون ناکەوێتە پاش بوونی، کە دەڵێین موخالیفی حەوادیسە واتە: وێنەی نییە «لیس کمثله شئ»، کە دەڵێین (قائیمی بیلزاتە) واتە: ئیحتیاجی بە هیچ شتێ نییە.

حەوتەم صیفەتی حەیاتە، واتە: خوای گەورە زیندووە، بە زیندوویەتییەك کە پەیوەندیی بە مەزاج و لەشەوە نییەو، هەرگیز نابڕێتەوە.

هەشتەم: سیفەتی عیلمە، واتە : زانست، یانی: خوای گەورە لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەرچی بووەو هەرچی هەیەو هەرچی دەبێت بە هەمووی دەزانێ.

نۆیەم: سیفەتی ئیرادەیە، واتە: خواست، یانی: هەر شتێك خواستی خوای لەسەر بێت دەبێ و، هەرچی خواستی ئەوی لەسەر نەبێ نابێ.

دەهەم: سیفەتی قودرەتە، واتە: توانا، یانی، خوای گەورە دەستەڵاتی بەسەر هەموو مومکیناتدا هەیەو، ئەرزو ئاسمان و هەرچی لەواندا هەیە لە ژێر تواناو دەسەڵاتی ئەودایە.

یازدەیەم: سەمعە، واتە بیستن، یانی: خوای گەورە هەموو دەنگێك دەبیسێ، لە دوور یا نزیك و، بۆ خوای گەورە دوورو نزیك نییە.

دوانزەیەم: بەسەرە، واتە بینین، یانی: هەرشتێك لە جیهاندا هەبێ، کەم و زۆر، بچووك و گەورە، خوای گەورە دەیبینێ.

سیانزەیەم: سیفەتی کەلامە، واتە: وتووێژکردن، یانی خوای گەورە قسە لەگەڵ پێغەمبەرانی خۆیدا دەکا، ئەو کتێبانەی بۆ پێغەمبەرەکان نێرراون (د.خ) سەد و چوار کتێبن: دە کتێب بۆ حەزرەتی ئادەم. پەنجا کتێب بۆ حەزرەتی شیت. سی کتێب بۆ حەزرەتی ئیدریس . دە کتێب بۆ حەزرەتی ئیبراهیم. تەورات بۆ حەزرەتی عیسا. قورئان بۆ حەزرەتی -محەمەدی مستەفا- (د.خ).

ئەم حەوت سیفاتە کە باسمان کردن، واتە: حەیات، علیم، ئیرادە، قودرەت، سەمع، بەصەر، کەلام، پێیان دەڵێن صیفاتی مەعانی؛ چونکە چەند صیفەتێکی ثابیتن بۆ زاتی خودای گەورە.

حەوت سیفەتی تر هەن پێیان دەڵێن سیفاتی مەعنەوییە وەکو بوون بە حەی، بوون بە عالم، بوون بە مورید، بوون بە قادر، بوون بە سەمیع، بوون بە بەسیر، بوون بە موتەکەللیم..

ئەو شتانەش کە مەحاڵن بۆ زاتی خواو نارەوان دژی ئەم بیست سیفەتەن، وەکو نەبوون، حدووس، واتە: پەیدابوون لە پاش نەبوون، فەنا، واتە نەمان لە پاش بوون، هاوێنەیی حەوادیس، ئیحتیاجی بە غەیر، زۆریی زات، مردوویی، نەزانین، نەبوونی خواست، ناتەوانایی، نەبیستن، نەبینین، لاڵی و قسەنەکردن.

براکان! پاش ئەوەی کە بە کورتی باسی ئەم سیفەتانەمان کرد، با دەست بکەین بە بەڵگەهێنانەوە لەسەریان هەتا باش لە دڵتاندا دامەزرێن.. بەڵام ئەو بەڵگانە کە لەم شوێنەدا باسیان دەکەین بە شێوەیەکی سادەو ئاسان دەیانخەینە پێش چاوتان تا لەگەڵ عەقڵی گشتیدا بگونجێ.

بەڵگە لەسەر بوونی خوای گەورە ئەوەیە کە ئەم جیهانەو ئەم عەرزو ئاسمانەو، ئەم مانگ و ڕۆژو ئەستێرانە کە دەیانبینین حادسن، واتە: لە پێشدا نەبوون و تازە پەیدابوون و لە پاش نەبوون هاتوون، هەر شتێك حادس بێ دروستکەرو پەروەردگاری دەوێ، کە لە نەبوونەوە دەری بکا و بیخاتە مەیدانی بوون..

ئەم بەڵگەیەمان دوو ڕستەیە: یەکەم ئەوەیە کە « جیهان حادیسە» دووەمیان ئەوەیە «هەرچی حادیس بێ دروستکەری دەوێ». ڕوون کردنەوەی ڕستەی یەکەم ئەوەیە کە ئەگەر جیهان هەمووی حادیس و تازە دروستکراو نەبێ، یا هەموو بەشەکانی قەدیمەو هەر بووە، یا هەندێکی قەدیمەو هەندێکی حادیسە، ئەگەر بڵێین هەمووی قەدیمە ئاشکرایە درۆیەو لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ و، ملیۆنەها بەش دەبینین کە لە پاش نەبوون پەیدابوون، چ لە ئادەمیزادو چ لە گیانلەبەران و گیاو دارو درەخت.

ئەو بارەیش کە گوایا هەندێکیان قەدیم و هەندێکیان حادیسە، ئەویش هەر درۆیە؛ چونکە بەشەکانی ئەم جیهانە هەموو ماددەیە و لە پارچە پارچە تێکەڵ بووەو، ئەم پارچە پارچانە هەموو وەك یەکن، جا ناچێتە عەقڵەوە کۆمەڵە شتێ کە تێکەڵ بن لە چەند پارچەیەکی وەکو یەك، هەندێکیان حادیس بێ و هەندێکیان قەدیم؛ کە واتە هەمووی حادیسە.

هەروەها ڕوونکردنەوەی ڕستەی دووەم ئەوەیە ئەم حادیثە، کە بە ئاشکرا هەیە، یا خۆی کاری لە خۆیدا کردووەو هێناویەتییە مەیدانی بوون، یان شتێکی تر، غەیری خۆی. بەندی یەکەم، کە خۆی کاری لە خۆیدا کردبێ، شتێکی نەگونجاوو ناڕەوایە، چونکە شتێ کە خۆی نەبووبێ چۆن کار لە خۆیدا دەکات و دەیهێنێ؟ کەوابوو دەبێ بوونەکەی لە غەیری خۆیەوە بێ و، ئەو غەیرەش نابێ وەك ئەم حادیس بێ، چونکە فەرقێك لە نێوانیاندا نییەو، هەردووکیان دروستکراوی دەستی زاتێکی بێ سەرەتای لە هەموو لایەنێکەوە تەواو و بێ خەوشە، کە شایانی ئەوەیە کار لە شتی تر بکا و لە نەبوونەوە بیهێنێتە بوون.

شایانی باسە: دەلیلی ئیقناعی بۆ مرۆڤی ژیر لە سەر بوونی خوای گەورە ئەوەندە زۆرە ناژمێررێ و، هەر کەسێ تەماشای حاڵی بکا بۆی دەردەکەوێ کە هیچ ئەسەرێك بێ «موئەسسیر» نابێ و، هیچ شتێك بێ هۆ نابێ، پارووپەك نان نایەتە دەست هەتا بە دەیان کارگەر ئیشی تێدا نەکەن، سەدان کرێکار هەوڵ دەدەن تا ئەو پاروونانە دێتە دەست، یەکێ زەوی دەکێڵێ و یەکێ تۆوی پیدا دەوەشێنێ و، یەکێ ئاوی دەدا و، یەکێ پاسی دەکا، کە وشك بوو، بە دەیان کەس دەیدروونەوەو گێرەی دەکەن و پاشان دەکرێتە نان، بێجگە لە دەیان دەستی تر کە ئیشی تێدا دەکەن!! ئەمانە هەمووی بە سادەترین شێوە ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە هەموو ئەسەرو کارێك ئافەرێنندەو موئەسسیرێکی دەوێ.

ڕیوایەت کراوە کە زندیقێ لە پیاوێکی دەشتەکیی پرسی: بەڵگەت چییە لە سەر بوونی خوای پەروەردگار؟! ئەویش لە وەڵامدا وتی: پشقڵ دەلالەت دەکا لەسەر حەیوانێ کە ئەو پشقلەی کردووە، شوێن پێ دەلیلە لەسەر ڕێرەوێ کە بەو شوێنەدا ڕۆیشتووە، سەرم سووڕ دەمێنێ ئەی چۆن ئەم ئاسمانەو ئەم خۆرو مانگ و ئەستێرانەو، ئەم دەریا پان و بەرین و خاوەن شەپۆلانە دەلالەت لەسەر پەروەردگارێ ناکەن کە زاناو تواناو تەواو بێ و ئەم جیهانەی بەم ڕێکوپێکییە دروست کردبێ؟!

بە ئیشارەت لە کابرایەکی کەڕولاڵی مادەرزادیان پرسی: نوێژ بۆ کێ دەکەی؟ ئەویش هەر بە ئیشارەت تێی گەیاندن کە بۆ ئەو کەسەی دەکات ئەم ئاسمان و عەرزەی دروست کردووە.. دیسان هەر بە ئیشارەت لێیان پرسی: بەچیدا دەزانی یەکێکە یا دووە یا زیاتر؟! تێی گەیاندن کە ئەگەر دووکەس یا سێ کەس یا زیاتر بوونایە کاتی نوێژ کردن لە مزگەوتدا تەنیا ڕوومان لە کەعبە نەدەکردو، هەریەکێ ڕووی دەکردە شوێنێك بە پێی

ژمارەی پەروەردگارەکان!! جا تە ،شا بکەن کەرو لالێکی مادەرزاد ئەوەندە بیری تیژبێ کە باوەڕە تەقلیدییەکەی بکاتە پایەی ئەهلی بیرو ئیستیدلال!..

بەڵگەی ئەهلی زانست لەسەر بوونی خوای گەورە ئەوەیە ئەم جیهانە، چ عەین و (قائم بالذات) بێ، وەکو ئەو مادانەی دەیانبینی، لە کان و گیاو دارو گیانلەبەرو ئادەمیزاد، یا عەرەز و (قائم بالغیر) بێ؛ وەکو ڕەنگ و بۆو زانست، هەموویان حادیسن، واتە: لەپاش نەبوون پەیدا بوون و، مومکینن، واتە: بوون و نەبوونیان وەك یەکە. دیارە شتێك حادیس بێ پێویستی بە موحدیسێ هەیە، ئەو موحدیسەش پێویستە قەدیم بێ نەك حادیس؛ چونکە ئەگەر ئەویش حادیس بێ پێویستی بە موحدیسێکی تر دەبێ و، هەروا بە ڕیز دەڕوا، جا یا ڕیز دەبەستێ و نابڕێتەوە، ئەمەش دەبێتە تەسەلسول، واتە: زنجیرە گرتنی بێ بڕانەوە کە عەقڵ هەرگیز قبووڵی ناکا؛ چونکە زنجیرەی مەوجوودات دەبێ دیاری بێ، شتی نەبڕاوەش دیاری نییە، کەوابێ زنجیرەی نەبڕاوە نییەو، ئەو شتە کە ئەم حادیسەی دروست کردووە، پێویستە زاتێکی قەدیم بێ و هیچ شتێکی لێ پێش نەکەوتبێ ئەوەش زاتی خوای گەورەیە. لەبەر ئەوەش کە ئەو شتە حادیسە مومکینەو لە خۆیا بوون و نەبوونی وەکو یەك وایە، پێویستە زاتێکی خاوەن تەئسیر خواستی بوونەکەی کردبێ و تەرجیحی دابێت بەسەر نەبوونیاو، لە کاتی نەبوونیا ئەو زاتە خاوەن تەئسیرە قەدیمە خواستی نەبوونەکەی کردبێ و تەرجیحی دابێ بەسەر بوونیا؛ چونکە ئەو شتە مومکینە بوون و نەبوونی وەك یەکن و، وەك دووتای ترازووی هاوکێش وەهان و، بێ گومان، شتێك نەخرێتە یەکێ لە دووتای ترازوو یەکێکیان دانانەوێت و ئەوی تریان بەرز نابێتەوە، کەواتە: لە مومکیناتدا دەبێ خالیقە موئەسسیرەکەی، کە تەرجیحی بوونی بەسەر نەبوونیدا دەدا، مەجوود بێ؛ چونکە لە نەبوو هیچ پەیدا نابێ، هەروەها پێویستە ئەو خالیقە لە ڕیزی مومکیناتدا نەبێ و، ئەویش وەك دروستکراوەکان نابێ بوون و نەبوونی وەك یەك بن، ئەگینا ئەویش وەك حادیسە مەخلووقەکە دەبێ، بێ گومان مەوجوودێك کە لە مومکینات بەدەر بێ تەنها (واجب الوجود)ە کە زاتی خودای گەورەیە.

واتە: چ لە ڕووی ئیمکانەوە، یا لە ڕووی حودوسەوە لێکی بدەینەوە بوونی زاتی (واجب الوجود) جێگیر دەبێ.

درێژەی ئەم باسە ئەوەیە هەرشتێ بێتە بەر عەقڵی عاقڵ پێویستە مەوجوودێکی (واجب الوجود) بێ، واتە: مەوجوودێ کە بوونی لە زاتی خۆیەوە بێ و بوونی لە غەیری خۆیەوە

وەرنەگرتبێ، یا دەبێ (ممتنع)و (محال) بێ، واتە: نەبوونی پێویست بێ و، عەقڵ ئەوە قبووڵ نەکات کە ببێت، وەکو یەکسانیی (کل وجزء)، یا کۆبوونەوەی دوو دژ لە یەك شتدا، بۆ نموونە: شتێك هەم رەش بێ هەم سپی، یا کۆبوونەوەی دوو « نقیض» وەك بڵێی: فلان مرۆڤە و مرۆڤ نییە، دیارە ئەمانە کاتێ عەقڵ لێیان ورد بێتەوە دەیانداتە دواوەو وەریان ناگرێ! یاخۆ شتێکە بوون و نەبوونی وەك یەکەو لەوانەیە ببێ و لە وانەشە نەبێ؛ وەکو بوونی شاخێك کە لەوانەیە ببێ و لەوانەیە نەبێ، یا وەك بوونی منداڵێ لە دایکێ لە پاشەڕۆژدا، یا وەك بوونی زەیدو عەمر، یاوەك بوونی هەر بەشێك لە بەشەکانی ئەم جیهانە، ئەم جۆرە شتە پێی دەوترێ (الممکن الخاص) واتە: نە بوونی پێویستە و نە نەبوونی ، دیارە ئەم شتە مومکینە کە بوون و نەبوونی وەك یەکن کەڵکی ئەوەی نییە کە بوونی ببێتە سەرچاوەی بوون، یا نەبوونی ببێتە سەرچاوەی نەبوونی شتی ترو، دەبێ بڵێین ئەم شتە لە پێشدا نەبووەو پەروەردگار دروستی کردووەو لە نەبوونەوە هێناویەتە بوون، جا کە زانێ بوونی بەسەردا هاتووە بێ گومان ئەوەش دەسەلمێنی کە نەبوونی بەسەردا دێ و، هەروەك نەبوونی بەسەردا دێس لەوانەیە پاش نەبوونەکەی دووبارە بوونی بەسەردا بێتەوە، وەکو ئاینی ئیسلام دەڵێ کە ئەم ئادەمیزادانە لە پاش نەمان دووبارە لە کاتی خۆیدا بە پێی خواستی خوای گەورە دروست دەکرێنەوەو لە نەبوونەوە دەگەڕێنەوە بۆ بوون.

پێویستی بوونی شتی (ممکن) بە (فاعل) تەنانەت گیانلەبەرانیش هەستی پێ دەکەن؛ بۆ نموونە: حەیوان کە خشەیەك دەبیستێ یەکسەر دەکەوێتە مەلاس و گوێ قولاغ دەبێ تا بزانێ ئەو خشەیە لە چییەوە بوو؟ لە هاوقەتاری خۆیەوە بوو یا لە شتێکەوەیە لێی دەترسێ؟!.. جا لە جارێك حەیوان هەست بەوە بکات کە خشە بێ خاوەن خشە نابێ، چۆن دەبێ ئادەمیزادی هۆشیار باوەڕ بەوە بکا کە ئەم زەوی و ئاسمانەو ئەم دەشت و کێوانە بێ خاوەنن و خۆیان لە خۆیانەوە بوون و کەس دروستی نەکردوون؟!!

ئەمجارە دێینە سەر باسی ئیسباتی پێنج سیفەتە سەلبییەکان:

یەکەم لەو سیفەتانە قیدەمە، یانی بوونێکی وەها کە نەبوونی لێ پێش نەکەوتبێ.

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە ئەگەر وانەبێت دەبێت حادیس بێ و نەبوونی لێ پێش کەوتبێ و یەکێکی تر دروستی کردبێ ئەمەش لەگەڵ خوایەتی و پەروەردگاریدا ناگونجێ، چونکە پەروەردگار پێویستە لە پێش هەموو مەوجوودێکەوە وجودی هەبێ هەتا عالەم دروست بکات.

بەڵگەیەكی تر ئەوەیە: هەرچی قەدیم نەبێ حادیسەو، حادیسیش موحتاجە بە یەكێكی تر و، شتی موحتاجیش ناتەواوەو، ناتەواویش بۆ پەروەردگاریی دەس نادات..

بەڵگەیەكی تر ئەوەیە مادام حادیس پێویستە دروستكەری هەبێ، ئەو دروستكەرەش یا حادیسە، یاقەدیمە، ئەگەر حادیس بێ، ئەویش پێویستی بە دروستكەری تر هەیە، ئەگەر هەروا ئەم زنجیرەیە بڕوا ئەوە دەبێتە (تسلسل)و ئەمەش، وەك باسمان كرد محاڵەو نابێ، خۆ ئەگەر زنجیرە نەڕوا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر حادیسی یەكەم و دەبێتە (دور) واتە: بوونی پەروەردگاری حادیسی یەكەم لە سەر بوونی خۆی ڕادەوەستێ، چونكە بوونی لە سەر بوونی حادیسە پێشووەكە ڕاوەستاوەو، بوونی ئەویش لە سەر بوونی ئەم ڕاوەستاوە، لە ئەنجامدا بوونی پەروەردگار لە سەر بوونی خۆی ڕادەوەستێ و بەكورتی دەبێ لە یەك ئاندا هەم ببێ و هەم نەبێ، ئەمەش ئاشكرایە پووچە.

پاش ئەم دوو بارە ئەگەر بڕیارت دا كە ئەم زنجیرەی تەسەلسولە دەگاتە قەدیمێك كە لە ڕیزی حوادیسدا نییە ئەوا بڕیارت دا كە موحدیسی ڕاستەقینە و پەروەردگاری جیهان دەبێ قەدیم بێ و نەبوونی لێ پێش نەوكەتبێ و، مەبەستمان هاتەدی. دووەم لەو سیفەتە سەلبیانە « بقا» یە، واتە: مانەوەی هەتا هەتاو نەهاتنی نەبوون بە سەریا.

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە: هەر شتێ بەقای نەبێ و نەبوونی بە سەردا بێشتێكە بوون و نەبوونی وەك یەك دەبێ، پەروەردگاریش پێویستە (واجیب الوجود) بێ.

سێیەم لەو سیفەتە سەلبیانە موخالەفەی حەوادیسە، واتە جیاوازی لە هەموو ئەو شتانەی كە حادیسن، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە ئەگەر پەروەردگار لە شتە حادیسەكان جیاواز نەبێ دەبێ وەك ئەوان بێ، هەرشتێكیش وەك حەوادێ بێ، پێویستە ئەویش حادیس بێت، حادیسیش ناتەواوەو، ناتەواویش بۆ پەروەردگاری ناشێ.. هەر لەبەر ئەمەیە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: « لیس كمثله شئ» واتە : هیچ شتێك لە خودا ناچێ، چونكە گەر خوا وەك شتی حادیس بێت پێویستە موحتاجی غەیر بێ و، هەرچیش موحتاجی غەیر بێ ناتەواوەو، ناتەواویش بۆ خوایی ناشێ. چوارەم لەو سیفەتە سەلبیانە «قیام بالذات»ە واتە: خوای گەورە پێویستی بە غەیری خۆی نییە، یانی وەكو (عرض) نییە كە پێویستی بە مەوسووفێك هەبێ، وەكو ڕەنگی سپیەتی كە عاریزی كاغەزێك دەبێ! بەڵێ سیفاتی زۆری هەیە وەكو ئەو بیست صیفاتانە كە وتمان، هەموو بوونیان بەستراوە بەخوای گەورەوە، بەڵام زاتی پەروەردگار قیامی بە خۆیەوەیەو

موحتاجی غەیری خۆی نییە، هەروەها پێویستی بە جێگەو شوێن نییە، وەك بڵێین: خوا لە عەرزدایە یا لە هەموو شتێکدا هەبووەو ئافەریننەدەی هەموو دروستکراوەکانەو، کاتی کە ئەو بووە مەکان نەبووە.

هەروەها خوای گەورە لە زەماندا نییە، ڕابردوو و ئیستەو ئایندەی بۆ نییە؛ چونکە ئەگەر زەمان بە ماوەی مەوهووم و نەبوو دابنێین ئەوە مەعنای نییە بڵێین خودا موحتاجی شتی وەهمییە! خۆ ئەگەر زەمان بە مەوجوود دابنێین کە جووڵانەوەو سووڕانەوەی ئەرزە بە دەوری ڕۆژدا، یا ئەندازەی ئەم سووڕانەوەیە ئەوا خوای پەروەردگار ئەم ڕۆژەو مانگ و ئەستێرەو عەرزو عاسمانەی دروست کردووەو، ئافەریدگار پێویستە لە پێش هەموو دروستکراوەکاندا بێ و موحتاجیان نەبێ.. کەوابوو هەرگیز نابێ بڵێین: خدا لە زەماندایە، یا لە مەکاندایە و، دەبێ بڵێین: خودا لە پێش ئەمانەدا بووەو، لە پاش دروستکردنی ئەمانەیش لەگەڵ بوونی زەمان و مەکاندا هەیە، وەکو لە پێش زەمان و مەکاندا هەبووە. زانایانی ئاینی بۆ ئیسباتی ئەوەی خوا لە زەماندا نییە دەڵێن: زەمان شتێکە هەمیشە تازە دەبێتەوەو، ئەو شتانەی پێ دیاری دەکرێ کە گۆڕانیان بە سەردا دێ، کە مادام زاتی خوای گەورە گۆڕانی بە سەردا نایەت پەیوەندیی بە زەمانەوە نییە و لە زەماندا نییە..

کە دەڵێن خوا ئەزەلییە مەبەست ئەوەیە کە خوای گەورە بوونێکی خۆیی هەمیشەیی بێ قەید و شەرتی هەیە و، پەیوەندیی بە هیچ زەرفێکەوە نییە، واتە: نە لە زەماندایەو نە لە مەکانداو، بەرامبەرە لەگەڵ هەموو کات و شوێنێکدا، بە کورتی خوا بە هیچ شتێك موحتاج نییەو، خۆی بە خۆیەوە ڕاوەستاوەو، لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد بوونی پێویستی بە هیچ نییە.

پێنجەم سیفەت لە سیفەتە سەلبییەکانی (وحدة)ە، یانی تاق و تەنیایە، بەم مەعنایە پەروەردگاری جیهان یەك زاتەو هاویەشی نییە، چونکە ئەگەر هاویەشی ببێ جیهان وێران دەبێ وەکو وڵاتێ دوو پاشای هەبێ!

بەڵگەیەکی تر ئەوەیە ئەگەر پەروەردگار دوو بن یا هەریەك لەو دووانە بە سەربەخۆیی سەرپەرشتیی جیهانی پێ دەکرێ، یا هیچ کامیان بە تەنیا هیچی پێ ناکرێ و موحتاجی ئەویتریانە، یاخۆ یەکێکیان بە تەنیا سەرپەرشتیی پێ دەکرێ و ئەویتریان پێی ناکرێ. لە باری یەکەمدا یەکێکیان بەسەو ئەویتریان جیهان پێویستی پێ نییە، لە باری دووەمدا

هیچ کامیان کەڵکی خوداییان پێوە نییە، لە باری سێیەمدا تەنها ئەوەیان بە کەڵك دێ کە توانای هەیە و ئەویتریان هیچ!. کەواتە دەرکەوت کە پێویستە پەروەردگار تاك و تەنیا بێ. ئەی برای من! بڵێ بەو عەوامانە بیربکەنەوە: ئایا دوو مرۆی دارتاش دەتوانن هەردووکیان لە یەك کاتدا تەشوێ بدەن لە یەك تەختەو لە یەك شوێنی تایبەتیدا بیتاشن، دیارە ئەمە ناگونجێ و، هەر تەنیا بە یەکێکیان دەکرێ.

بەڵگەی زاناکان لەسەر یەکیەتیی پەروەردگار ئەوەیە ئەگەر پەروەردگار دووان بن یا هەردووکیان حادیسن و لە نەبوونەوە پەیدابوون ئەوە هیچیان بۆ خوایی ناشێن. ئەگەر یەکێکیان حادیسە و ئەویتریان قەدیمە، ئەوە حادیسەکەیان بە کاری پەروەردگاری نایەت، خۆ ئەگەر هەردووکیان قەدیمن ئەوا قودەماکان زۆر دەبن، کە ئەمەش ناشێ..

بێجگە لەمانە.. لەو بارەدا کە هەردووکیان قەدیم و خاوەن هێزو توانا بن گەر یەکێکیان ویستی شتێك بجوولێنێ و، ئەویتریان ویستی نەجوولێ! یا دەبێ ویستی هەردووکیان بێتە جێ، کە دەبێتە کۆبوونەوەی دوو شتی دژ لە یەك کاتداو لە یەك شوێندا، ئەمەش محاڵە، یا ویستی هیچ کامیان نەیەتە دی واتە: هەردووکیان بێ دەسەڵات بن، خوایش نابێ بێ دەسەڵات بێ. خۆ ئەگەر ویستی یەکێکیان هاتەدی ئەوە هەر ئەوەیان خوایە، ئەویتریان هیچ نییە..

خۆ ئەگەر بڵێین با هەردوو قەدیم و تەواو بن و، لە سەر سەرپەرشتیی جیهان یەك بگرن و هیچ زیانێك ڕوو نەدا، ئێمە لەم بارەدا باسی موخالەفەو ناجۆریی (بالفعل) ناکەین و (ئیمکان) دێنیتە پێشەوەو دەڵێین: یا موخالەفەو نەگونجانیان مومکینە یا مومکین نییە، ئەگەر مومکینەو هەرکامیان دەتوانێ ڕێگا لەویتریان بگرێ ئەوا کۆبوونەوەی دووشتی دژ مومکین دەبێ و ئیمکانی محاڵیش محاڵە، خۆ ئەگەر موخالەفەو نەگونجانیان مومکین نییەو کەسیان ناتوانێ بەربەستی ئەویان بکات ئەوا هەردوویان عاجزو بێ دەسەڵات دەبن و، بەکەڵکی خوایی نایەن... ئەگەر ئیمکانی موخالەفەو تەمانوعیان هەیە ئەوە ئیمکانی مەحالاتە پێشووەکە دێتە مەیدانەوەو، ئیمکانی مەحاڵ مەحاڵە، کەوابێ پێویستە خوای جیهان هەر یەك زات بێ. بێجگە لەمانە لە کاتی گونجان و ڕێکەوتنیاندا لە سەر ئەوە کە هەر ئیشێ هەبێ بەیەکەوە بیکەن ، ئەوە (توارد) پەیدا دەبێ، واتە: ئیشێکی تایبەتی لە یەك کاتدا بە دوو فاعیل بکرێ ئەمەیش مەحاڵە، چونکە قودرەت و توانای خالیق وەکو توانا و هێزی ئێمە نییە کە کەموکووری هەڵبگرێ، بەڵکو بە تەنیا

ڕووتێکردنی توانای خالیق بۆ شتێ پێویستە ئەو شتە بێتە جێ، ئیتر ماوەی ئەوە نامێنێ بڵێی: با بە هەردوویان و بەهاوبەش ئەو کارەبکەن و، هەر یەکێکیان کەمێ لە توانای خۆی بخاتە کار... ئەم شێوەیە بۆ خالیق مەحاڵە... پێویستە بزانرێ کە هەروەکو خوای گەورە لە زاتدا تاق و تەنیایەو هەر خۆیەتی، لە سیفاتیشدا هەر تاق و تەنیایە، واتە: ئەو سیفاتانە ئەو هەیەتی کەس نیەتی، هەروەها لە کرداردا تاق و تەنیایە، واتە: هەر کارێ ئەو بیکا هەر بە تەئسیری ئەوەو، تەئسیری کەسی تری تێدا نییە.

شایانی باسە کە یەگانەیی تەواو سیانە، یەکەم: یەگانەیی لە زاتدا، واتە: باوەڕمان ببێ کە خودا زاتێکی تاق و تەنیایە، دووەم : یەگانەیی لە(واجب الوجودی)دا، واتە: هەر تەنیا زاتی یەزدان بە (واجب الوجود) بزانین و، غەیری ئەو هەرچی هەیە (ممکن الوجود)ەو، بوون و نەبوونی چون یەکە. سێیەم یەگانەییە لە پەرستیاریدا، واتە: عیبادەت و پەرستن هەر بۆ خوا دەکرێ و، کەسی تر شایستەی ئەوە نییە بپەرسترێ، لەسەر ئەم سێ بارە بڵێ: (لا اله الا الله).

ئەی برایان! مرۆڤ ئەگەر تۆزێ بە دڵ بیربکاتەوەو، لەم جیهانەو لەم زەوی و عاسمانەو، لەم کردگارە جوانانە تێ فکرێ، چاك تێ دەگات و حاڵی دەبێ کە ئەم وەزعە پەروەردگارێکی زاناو تواناو بێ خەوشی هەیە. ئەوەتا خوای پایەبەرز لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

«إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ[١٩٠] الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ».

واتە : بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی و، گۆڕانی شەوو ڕۆژ بە زیادەو کەمی و بەدوای یەکدا هاتنیان و ڕووداوی نێو ئەواندا گەلێك بەڵگە دەردەکەوێ بۆ وشیاران، بۆ ئەو کەسانەی لە گەورەیی خوا بیردەکەنەوەو، ناوی خوا بە پیرۆزی دەبەن، لە کاتی ڕاوەستان و دانیشتن و پاڵکەوتندا یادی دەکەن، ئەوانەی کە لە وەزعی ئاسمان و زەوی دەکۆڵنەوەو، بە کزی و ملکەچییەوە دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەم جیهانەت بە خۆڕایی و بێ سوود دروست نەکردووەو، تۆ لەوە دووری کە کاری بێ بایەخ بکەیس، خوایا لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە..

دەگێڕنەوە: پیاوێ هەبوو ئیش و کاری ڕاگرتن و پەروەردە کردنی مریشك و پەلەوەر بوو،

لێیان پرسی: بە چیدا خوات ناسیوە؟! ئەویش لە وەڵامدا وتی: بە بیرکردنەوە لە هێلکە خوام ناسی، وتیان چۆن وتی: تەماشا دەکەم هێلکەم وەکو قەڵایەکی داخراوو قایمکراو دێتە پێش چاو، کە پڕکراوە لە جەواهیری تواوەی ئاڵتوون و زیو، زیوەکەی تێکەڵی ئاڵتوونەکەی نابێ، تەنانەت تکێ لەو سپێنە زیوینەی تێکەڵی زەردێنە ئاڵتوونینەکەی نابێ، لە پاش چەند رۆژێك لە نێو ئەم قەڵا بێ دەروازەو بێ کلاّو رۆژنەیەدا پەلەوەرێك دێتە دەرەوە بە پەڕوباڵی ڕەنگاو ڕەنگەوە کە مرۆڤ لە سەیرکردن و تەماشاکردنی تێر نابێ.

لەمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو هێلکەیە پەروەردگارێکی هەیە زاناو تواناو، ئەم گیانلەبەرە دروست دەکا دەیپارێزێ ئەی برادەرینە:! بەڕاستی گێڕانەوە باسکردنی ئەم جۆرە قسانە زۆر بەسوودە و، لەگەڵ هەست و بیری گشتیداو لەگەڵ عەقڵی ساغدا گونجاوە..

بێ گومان ئەم پەلەوەرە پەروەردگارێکی پێویستەو، پەروەردگاریش نابێ بێ هۆش و هەست بێ، پەروەردگاری زاناو تواناو ئاگادار لە جیهان بێجگە خوای پاك و بێ خەوش کەسی تر نییە.. دەربارەی حەوت سیفەتەکانی مەعانیی زاتی یەزدانەوە دەڵێین: یەکەم عیلمە کە سیفەتێکە دەبێ بە هۆی دەرخستنی هەموو شتێك، چ لە بوو چ لە نەبوو، ئەوەی هەیە و ئەوەی نییە، چ مومکین بێ ببێت چ مەحاڵ، ئەمانە هەموو بە سیفەتی عیلم کەشف دەکرێن..

بەڵگە لەسەر عیلمی خوا ئەوەیە ئەم جیهانە، کە بە یاسایەکی ڕێکوپێك دروست کراوە، هەرگیز لەوانە نییە بە بێ زانست بێتە جێ، بێجگە لەمە دژی زانین، نەزانینە، واتە: ئەگەر خوای گەورە زانا نەبێ دەبێ نەزان بێ، نەزانینیش خەوشەو کەمییەو بۆ زاتی خوا شایان نییەو مەحاڵە..

دووەم و سێیەم لە سیفەتەکانی مەعانی ئیرادەو قودرەتن، ئەم دوو سیفەتە پەیوەندییان بە مومکیناتەوە هەیە، واتە: خوا کە خواستی بوونی شتێکی مومکینی کرد توانا دەخاتە کار بۆ دروستکردنی یا بۆ فەوتاندنی، هەروەها خوا خاوەن ئیرادەیەو ئارەزووی بە دەستی خۆیەتی و کەس زۆری لێ ناکاو، لە خەوش وکەموکوڕی و ناچاری و عاجزی و بێ دەستەڵاتی دوورە؛ چونکە ئەم صیفەتانە نەقسن و نەقسیش بۆ خوا مەحاڵە.

شایانی باسه که ئیرادەو قودرەتی خوای گەورە ڕووناکەنە شتێك که (واجب الوجود) یا (ممتنع الوجود) بێ؛ چونکه هەرشتێك (واجب) بێ بوونی واجبە و نەبوونی مەحاڵە، هەر شتێکیش (ممتنع) بێ نەبوونی واجبە و بوونی مەحاڵە. کەوابوو حەقیقەتی واجیب، قابیل نییە هیچ شتێك کاری تێ بکا؛ چونکه ئەگەر تەئسیرو کارەکە بۆ وجوود بێ، ئەوە دەبێتە (تەحصیلی حاصل) وە ئەگەر بۆ عەدەم بێ ئەوە مەحاڵە.. هەروەها تەئثیریش لە (ممتنع)دا ئەگەر بۆ عەدەم بێ، دیسان دەبێتە (تەحصیلی حاصل) چونکه نەبوونەکەی واجیبە، خۆ ئەگەر بۆ وجوودە ئەوا وجوودی (ممتنع) مەحاڵە..

شایانی باسە کە کاری قودرەت بە پێی ئیرادەو خواستە؛ واتە: هەتا خوا مەیلی لەسەر شتێ نەبێ قودرەتی ڕووی تێ ناکا، هەروەها ئیرادەش بە پێی عیلمە؛ واتە: هەتا شتەکە لە عیلمی خوادا نەبێ ئیرادەی ڕووی تێ ناکات، عیلمی خواش تابیعی مەعلوومە؛ واتە: خوا دەزانێ ئەو شتە لە عالەمدا دێتە جێ ئەوسا ئیرادە ڕووی تێ دەکا.

چوارەم سیفەت لە سیفەتەکانی مەعانی (حیاة)ە، واتە: زیندوویی، ئەم سیفەتە پەیوەندی بە شتێکەوە نییە بێجگە مەوسووفەکەی کە زاتی واجیبە.

بەڵگەی بوونی ئەم چوار سیفەتە بە گشتی ئەوەیە: ئەمانە نەبوونایە هیچ حادسێ لە حەوادیس نەدەبوو؛ کەوابێ بوونی حەوادیس بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە خوای گەورە ئەم چوار سیفەتانەی هەیە.. بەڵگەی تایبەتیش لەسەر حەیات واتە: زیندوویی ئەوەتە کە ئەگەر زیندوویەتی نەبێ علیم و ئیرادەو قودرەت نابن..

پێنجەم و شەشەم لە سیفەتە مەعانییەکانی خوای گەورە سەمع و بەسەرە، واتە بیستن و بینین؛ یانی: هەرچی مەوجووداتە، چ ئەعیان و چ ئەعراز، ئەوانەی خۆیان بە خۆیانەوە وەستاون، یا ئەوانەی بە غەیرەوە ڕاوەستاون، وەك بەنگ و ڕەنگ، هەروەها غەیری ئەو شتانەش کە دەبیسترێن و دەبینرێن، وەك تام و بۆ، هەموو زانراوی زاتی یەزدانن: دەیانبینێ و دەیانبیێ..

حەوتەم لە سیفەتە مەعانییەکان، کەلامی یەزدانە.. کە سیفەتێکی نەفسییەو بە زاتی خواوە ڕاوەستاوەو دوورەو پاکە لە حەرف و لە دەنگ و وەکو سیفەتەکانی تری ئەزەلی و ئەبەدییە، هەر بووەو هەر دەبێ و، نەبوون لێی پێش نەکەوتووەو لێیشی دواناکەوێ..

شایانی باسە کەلام وەك بەو صیفەتە نەفسییە قەدیمەی خوا دەوترێ کە حەرف و

دەنگ نییەو بەرو دوای تێدانییە، هەروەها بەو کەلامە لەفزییەشی دەوترێ، کە سەدو چوار کتێبن و بۆ پێغەمبەرەکانی ناردووە (د.خ) وەك تەوراتی حەزرەتی مووسا و زەبووری حەزرەتی داوودو ئینجیلی حەزرەتی عیسا و قورئانی حەزرەتی (محمد المصطفى) (د.خ) ئەم کەلامە لەفزییەش پێوەندیی غەیری خوای گەورەی پێوە نییە، واتە: نە فریشتەکان نە پەری نە ئادەمیزاد، هیچکامیان دەخڵیان بە سەر ئەو لەفزانەوە نەبووە، بەڵکو لەلایەن زاتی خواوە بە ڕەقەم لە (لوح المحفوظ)دا نووسراون و، بە لەفز بە حەزرەتی جیبرەئیل گەیێنراون بە شێوەی ئیلقای قودسی، ئەویش بێ دەس بۆ بردن و زیادو کەمکردنی هێناویەتیە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکان(د.خ). ئێستە ئەم قورئانە کە ئێمە دەیخوێنینەوە هەمووی کەلامی خوایەو، بە هیچ جۆرێك یەك ڕستەو یەك وشەی غەیری خوای گەورەی تێدانییە.

بەڵگە لە سەر بوونی سیفەتی کەلام ئەوەیە: دژی کەلام، کە لاڵی و بێ بەیانییە، خەوشەو کەموکوڕییەو، بۆ پایەی خواوەند ناشێ.

پێویستە بزانن کە حەقیقەتی سیفەتەکانی خوا، هەروەك حەقیقەتی زاتی، لە تێگەیشتن و ژیریی ئێمەوە دوورەو، پەی پێ نابەین، بەڵام بە هۆی نیشانەکانەوە دەزانین کە ئەم جیهانە، بەرزو نزمی، خوایەك و پەروەردگارێکی هەیە (واجب الوجود)ەو، هەرچی سیفەتی تەواوەتییە هەیەتی و، هەرچی کەموکوڕی و خەوشە لێیەوە دوورە..

بەڵگە لە سەر حەوت سیفەتەکانی مەعانی، بێجگە لە ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر، ئەوەیە ئەگەر یەزدانی مەزن ئەم سیفەتانەی نەبێ دەبێ دژی ئەمانەی هەبێ، وەك مردن، نەزانی، بێ خواستی، بێ هێزی، کەڕی، کوێری، لاڵی، ئەمانەش سیفەتی خەوش و کەموکوڕین و بۆ زاتی یەزدانی گەورە ناشێن، تەنانەت مرۆڤێکی ئاسایی ئەگەر یەکێ لەو خەوشانەی بدرێتە پاڵ زویر دەبێ و نارازییەتی پێشان دەدا، ئیتر چۆن نیسبەت لە خوا دەدرێن «سبحان الله عما یصفون».

لە لایەکی ترەوە ئەم بارەگا جوانە ڕازاوەیەی جیهان ئا بەم جۆرە نایابە ڕازاوەیە، کە پیاهەڵدان و تاریف کردنی مرۆڤی هەرە زانا بە چەمکێکی کەمیشیدا ناگات، هەموو بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر بوونی یەزدانێکی (واجب الوجود).

زانایانی بیروباوەڕ حەوت سیفەتی تریان بۆ یەزدان بڕیار داوە، کە پێیان دەڵێن

سیفاتی مەعنەوییەو، بە هۆی خاوەنیەتیی ئەو حەوت سیفەتە مەعانییانەی کە باسمان کردن، نیسبەت دەدرێن لە زاتی خوا، واتە بوونی ئەم صیفەتە مەعنەوییانە لە بوونی سیفەتە مەعانییەکانەوە پەیدا دەبێ؛ دیارە کە خوای گەورە زیندوویی و زانایی و خواست و توانا و بیستن و بینین و کەلامی بۆ سابت بوو، بوونی خوا بە زیندوو زانا و خاوەن خواست و تەواناو شنەواو بیناو خاوەن کەلام گومانی تێدا نابێ.. دیارە ئەگەر زاتێ زانایی نەبێ بوون بەزاناشی بۆ نابێ، ئەم صیفەتانە کە بە عەرەبی بە « کونە علیما.. کونە مریدا..الخ» دەردەبڕدرێن چەند سیفەتێکی ئیعتیبارین و لە حەقائیق نین.

ئەو سیفەتانەش کە مەحاڵن و بۆ خوای گەورە ناشێن دژی ئەو سیفەتانەیە کە باسمان کردن؛ وەکو (حدوث) و (فنا)و، لە حەوادیس چوون و، پێویستی بە غەیرو ، لەیەك زیاتر بوون و، مردن و، نەزانایی و، ناچاری و، ناتەوانایی و کەڕی و کوێری و لاڵی .. بەتایبەتی لە حەوادیس چوون دەبێتە سەرچاوەی هەموو کەموکوڕی و خەوشێك، بۆ نموونە ئەگەر هاووێنەی ئەجسام بێ دەبێ لە ئەندامەکانی پێك بێ، کە تێکەڵ بوو لە ئەندامەکان هەمووەکەی پێویستی بە یەکە یەکەی ئەندامەکان دەبێ، ئەمەش کەموکوڕی و خەوشەو شایانی پایەی یەزدانی نییە و، سیفەتی ئەو شتانەیە کە لە حەوادیسن..

خۆ ئەگەر هاووێنەی جەوهەر بێ، یانی تاقە مادەیەك کە تاکە و تێکەڵ نییە، ئەوا دەبێ کەڵکی ئەوەی پێوە بێ کە ببێتە پارچەیەك لە جیسم و ڕام بێ بۆ تەرکیبی جیسمی، سیفەتی وەهاش بۆ (واجب الوجود) ناشێ..

هەروەها ئەگەر هاووێنەی عەرەز بێ ئەوا وەك عەرەز ئەویش موحتاجی غەیر دەبێ و، ئەم موحتاجییە لەگەڵ (واجب الوجود)یدا ناگونجێت...

دیارە ئەگەر هاووێنەی مەوجووداتی مومکینە بێ، لەوانەی کە خاوەن جیهەتن، واتە: لە خوارو، لە ژوور، یا لای ڕاست و چەپی شتێکەوەن، ئەوە مەعنای ئەوەیە خوا بوونێکی سنووردارو خاوەنی مەسافەیەکی تایبەتی و پانی و درێژییەکی دیاری بێ و، بکەوێتە لای ڕاست و چەپ و خوارو ژووری شتەکانی ترەوە! ئەمەیش هەر کەموکوڕییەو بۆ زاتی خوا ناشێ، کە دەبێ لە مادە و سنوور پێویستیی بە غەیر دووری بێ. هەروەها یەزدان لە نیش و کاریشدا هاووێنەی حەوادیس نییە، چونکە خاوەن کردەوەی ژیر هەر کارێ کە دەیکات لە بەر مەبەستێکە واتە: موحتاجی مەبەستەکەیەو، بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە ئیشەکە دەکا، بەڵام یەزدانی پاك و بێگەرد هەر شتێکی مەبەست بێت بە (کن فیکون) ێك

دەیکا و، ئەگەر لە سەر پلەی ئەسبابیش بیکا ئەوە هەر لە سەر یاسای ڕەفتاری خۆیەتی لە جیهاندا و، لەبەرئەوە نییە کە موحتاجی سەبەبەکە بێ و، بەبێ ئەو نەتوانێ بیکا!.. هەرگیز پێویستی بەو شتانە نییە کە ئەسبابی عادەتین.. هەروەها پێویستە ئێمە باوەڕمان وا بێ کە هەموو کردارێکی یەزدان حیکمەت و نرخێکی ڕاستی و تایبەتی هەیە، با ئێمەش پێی نەزانین.

«وله الحكمة البالغة في اتخاذ المقصود والمرام، فعال لما يريد من الاغراض والجواهر والاجسام».

ئەی برادەران! زۆر زۆر پێویستە لە کاتی تەمێ و تەربیەی(عوام الناس)دا کە بە ئەندازەی ژیریی ئەوان قسەیان لەگەڵ بکەن، بەتایبەتی لە مەسەلەکانی بیرو باوەڕدا.. پێویستە شتێکیان بۆ باس بکەن کە باش تێی بگەن و لێی حاڵی بن و، ئەوەیان پێشان دەن کە یەزدانی گەورە زاتێکە (واجب الوجود) بوونی پێویستە، بێ چەند و چوونە، «سبحان من لا يعرف قدره غيره، ولا يبلغ الواصفون وصفه، وكل ما خطر ببالك فربنا على خلاف ذلك».

هەروەها دژی سیفەتی (القيام بذاته) ئەوەیە کە بە زاتی خۆیەوە ڕانەوەستابێ، واتە: وەکو سیفەتێك بێ کە پێویستی بە خاوەن سیفەت هەبێ و، بە شوێنەوە ڕاوەستا بێ و، پێویستی بە (مخصص) بێ، ئەمەش وەك وتمان، مەحاڵە.

دژی سیفەتی وەحدەت ئەوەیە کە لە زاتی خۆیدا تێکەڵ بێ، یاخۆ لە زاتدا یا لە سیفاتدا یا لە کرداردا هاووێنە بێ، واتە: لە کردارو دروست کردندا بکەرێکی تر هەبێ و بەیەکەوە ئیش بکەن، ئەمەش مەحاڵە..

دژی ئیرادەو قودرەتیش ئەوەیە کە بوونی یەکێك لە شتە مومکینەکان پەیوەندیی بە خواوە نەبێ، واتە: خوا لێی بێ ئاگا بێ، یا خواست و ئیختیاری تێدا نەبێ، یا دژی خواست و نیازی ئەو شتێك بێتە وجوودەوە، هەموو ئەم حاڵانە مەحاڵن ولە یەزدانی پاك و بێگەردەوە دوورن.

دژی زانین نەزانینە، دیارە نەزانینی تۆزقاڵێك لەم کائیناتە کەمییەو خەوشەو، پێویستە خوای لێوە دوور بێ..

شایانی باسە پێویستە باوەڕمان وا بێ کە زانینی خوا هەموو شتێك دەگرێتەوەو،

هەروەکو زاتی خوا ئەبەدییەو دوایی نایەت، زانینەکەشی بەو جۆرە نەبڕاوەیەو، هەرچی دێتە دایەرەی وجوودەوە بە سوورەتی زیهنی و عەینی دەبێ لای خوا زانراو بێ و، هەرچی نەیێتە دائیرەی وجوودەوە بەڵام لەوانە بێ ببێ وەك ئەو مومکیناتەی کە نین، یا هەر قابیل نەبێ بێتە دائیرەی وجوودەوە وەکو شتە موستەحیلەکان، ئەوە پێویستە سوورەتێکی عیلمیی ئەمانە لای خوای گەورە ببێ و لە بازنەی زانینی ئەو دەرنەچن..

هەروەها هەرچی زەرڕەو تۆزقاڵی ئاسمان و عەرش و کورسی و ئەستێرەکان هەیە، لەگەڵ ئەحواڵی مردووەکاندا، پاش مردن و هەتا ڕۆژی قیامەت و، ئەحواڵی ئەهلی قیامەت لە زیندوو کردنەوەوە هەتاهەتایە و، زەرڕاتی مەوجوود لە دۆزەخداو لە بەهەشتدا دەبێ ئەمانە هەموو لە ئەزەلەوە تا ئەبەد لە بازنەی زانینی خوادا حازر بن و، خوای گەورە پێیان بزانێ.

ئەو سیفەتانەش کە جائیزن و بۆ خوای گەورە ڕەوان و بوون و نەبوونیان بۆ خوا وەك یەکە، بریتییە لە دەسکاری کردنی خوا لە کائیناتدا بە فعل و تەرك، زیندوو کردنەوەو مراندن، گەورەیی و شان و شکۆدان و وەرگرتنەوەیان بە هەر کەس و لە هەر کەس، ئەمانە بۆ خودا جائیزن و، هیچ یەکێك لەمانە لەسەر ئەو پێویست نییەو خۆی کاربەدەست و خاوەن ئیختیارە،«یفعل الله ما یشاء ویحکم مایرید» هەروەها هەر کردەوەیەکی حیکمەتێکی تێدایە، ئێمە پێی بزانین یا نا.. «لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ»..

**سیفەتی پێویست و نەشیاو و ڕەوای پێغەمبەران(د.خ)**

ئەو سیفەتانەی کە پێویستە لە پێغەمبەراندا ببن (د.خ) سێ سیفەتن (١) ڕاستگۆیی (٢) ئەمانەت و دەستپاکی (٣) گەیاندنی ئاین بە خەڵك...

بەڵگەی بێ گومان لەسەر پێویستییەتیی ڕاستگۆیی پێغەمبەران ئەوەیە: کە درۆ لە پێغەمبەرانەوە دەبێتە هۆی درۆ لە وتاری خوادا (تعالی عن علوا کبیرا)؛ چونکە خوای گەورە موعجیزەی داوە بە پێغەمبەران (د.خ)و، ڕاستگۆیی ئەوانی لە بەردەم هەموو خەڵکدا ئیسبات کردووە، ئەمەش واتە: پێغەمبەران هەرچی دەڵێن ڕاستە و درۆیان لێ ناوەشێتەوە، بێگومان ئەگەر، خوا نەخواستە، درۆیان لێ دەرکەوێ، دەچێت بە گژی تەسدیقەکەی خواداو، ئەوەی لێ دەبێتەوە: لەوانەیە ڕاست بکەن و لەوانەیە ڕاست نەکەن، هەروەها دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی کەلامی خوای گەورە ڕاست بێ و ڕاست نەبێ.. ئەمەش مەحاڵە..

بەڵگە لەسەر ئەمانەت و دەستپاکیی پێغەمبەران و گەیاندنی ئەحکام بە خەڵك ئەوەیە ئەگەر ئەم زاتە پاکانە ئەمین نەبن و کردەوەیان حەرام یا مەکرووهـ بێ دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی دوو دژ (جمیع النقیضین)، چونکە لە لایەکەوە ئیتاعەو بە گوێ کردنیان لە هەموو کردەوەیەکدا واجیبە لەبەرئەوەی کە خوا فەرمانی داوە بە ئیتاعەکردنیان و هەرچی ئەوان کردوویانە پێستە ئێمەش جێبەجێی بکەین، لە لایەکی تریشەوە پێویستە لەسەرمان لە کردەوەی حەرام و نارەوا دوور بکەوینەوەو نەشهێڵین خەڵك بیکا، لەم حاڵەدا ئێمە پێویستە ئەو کردەوە حەرامە بکەین کە ئەوان کردوویانە؛ چونکە ئیتاعەیان واجیبە و، پێویستە نەیکەین چونکە حەرامە!!

هەروەها ئەگەر فەرمانی خوا نەگەیەنن و غەیری فەرمانی ئەو بگەیەنن، ئێمە لەلایەکەوە دەبێ دوایان کەوین، چونکە دواکەوتنیان واجیبە و، لە لایەك دەبێ دوایان نەکەوین چونکە فەرمانەکە هی خوا نییە!!

ئەوسیفەتانەش کە ڕەوا (جائز)ن بۆ پێغەمبەران (د.خ) بریتین لەوانەی ڕوودەکەنە ئادەمیزاد، وەکو ساغی و نەخۆشی و نووستن و لە خەوهەستان و، حەز لە هەندێ خواردەمەنی کردن و حەزنەکردن لە هەندێکی تر. بەڵێ هەر ڕووداوێك کە لەگەڵ پایەو پلەی ئەواندا ڕێك نەکەوێ: وەك کوێری و کەڕی لە کاتی ڕەوانەکردنیاندا، یا وەك گولی و بەڵەکی و قۆڕی و باقیی ئەحواڵی ناشیرین، ئەوە هەرگیز بۆ پێغەمبەران ڕەوا نییە لەکاتی بە پێغەمبەربوونیان و بۆ سەر خەڵك ڕەوانەکردنیان، بەڵام ئەگەر لە پاش دامەزرانی پێغەمبەریەتییەکە بوو ئەوە قەی ناکا.

بۆ نموونە : بێ هێزیی چاوی حەزرەتی یەعقووب و، ناساغی و برینی لەشی حەزرەتی ئەیوب(د.خ) لە پاش دامەزرانی پایەی پێغەمبەریی ئەوان بووەو، مایەی پایە بەرزییان بووەو، پەندو ئامۆژگارییەکی ئاینی بەتین بووە بۆ ئادەمیزادەکانی تر، واتە مادام پێغەمبەران (د.خ) گیرۆدەی ناساغی و دەردی سەری دنیا ببن، لە بەر هەر حیکمەتێك کە خوا دەیزانێت ئەوانیش هەروەها گیرودە دەبن و، یەزدانی گەورە یاسای دامەزراو و ڕێکوپێکی هەیە بۆ پایەداریی جیهان و ئەهلی جیهان و، لەمەو پێش چۆن هاتووە لەمەوپاشیش هەروەها دەڕوا.

ئەی برادەرانی ئاینی! سوێندتان بەخوا دەدەم کە گەلێ جار ئەم مەکتووبانەو ئەم ئامۆژگارییانەی منە بۆ موسڵمانان بخوێننەوەو، لە ماناکانیان ئاگادارو شارەزایان

ـكەن، بە تايبەتى بۆ ئەو خوێندەوارانە كە لە پايەى سەرەتاييدان و بە تەواوى پىێ ـگەيشتوون و نەگەيشتوونەتە پايەى زاناكان؛ بەڵكو لە گێژاوى نەزانى دەرچن و ببن بە هۆى رزگارييان و ڕووكردنيان لە ئاينى پاكى ئيسلام.

لەسەر فەرموودەى حەزرەت (د.خ) شارەزايى و ڕاهنموونى كردنى ئادەميزادێك بۆ سەر ڕێگاى ڕاست لە هەمووى جيهان و ئەوەى لە جيهاندايە قازانجى زۆرترە.

هاوڕێكانى حەزرەت (د.خ) لە مەعناى ئەم فەرموودەيەدا وايان فەرمووە كە ئەگەر هەرچى لە جيهاندايە موڵكى يەكێك بىێ و، هەمووى لە ڕێگاى خوادا بەخت بكا. پاداشت و خێرى ئەوەى نييە كە مرۆڤێكى گومراهـ بە قسەو ئامۆژگارى ئەو ڕوو بكاتە ڕێگاى ڕاستى ئيسلام..

زاناكانيش لە حيكمەتەكەيدا وايان فەرمووە كە جيهان تا سەر نييەو ناپايەدارەو، خزمەتى خەڵك بە ژيوارى جيهان خزمەتكردنە بە شتێكى بڕاوەو كۆتاييهاتوو! بەڵام خزمەتكردنى ئادەميزادىێ بە ئاين، واتە: بەو خزمەتە ڕێگاى ئاين بگرێتە بەر دەبێتە خزمەتكردن بە شتێك كە هەرگيز نەبڕێتەوە؛ چونكە بەختيارى و ڕزگاريى ڕۆژى دوايى بڕانەوەى بۆ نييەو هەتا هەتاييە.

**دوايى باس**

ئەى برايانى ئاينى!

يەكەم هەنگاو بۆ چوونە ناو ئاينى پيرۆزى ئيسلامەوە، بەوە دەبىێ كە دوو ڕستەى شەهادەت بڵێى، واتە: «اشهد ان لا آله الا الله واشهد ان محمد رسول الله» ديارە لە ئاينى ئيسلامدا ئەم دوو ڕستەيە كراوە بە دروشمى ئيسلامەتى، چونكە هەرچى بيروباوەڕى موسڵمانە لە واتاى ئەم دوو ڕستەيەدا كۆبووتەوە:

لە وشەى (ئيلاە)دا كە يەكەم وشەيە مەعناى « ئولووهيەت» هەيە، كە بريتييە لە بىێ ئيحتياجى و بىێ نيازى بە غەيرى خوا، واتە: هيچ كەس نييە كە لە هەموو ڕوويەكەوە بىێ نياز بىێ، ئەو خوايە نەبىێ كە پەرستراوى بە ڕاستييەو، عيبادەت و بەندەگى هەر بۆ ئەو شايستەيە و هەر ئەو پەروەردگارو ئافەريىنندەى هەموو جيهانە، بێگومان بىێ نيازى و بەكەس موحتاج نەبوون ئەوەى لىێ دەردەكەوىێ كە ئەو زاتە (واجب الوجود) و قەديمەو هەر دەمێنىێ و، لە هەموو حەواديسەكان جياوازەو، بە خۆيەوە ڕاوەستاوەو، لەهەموو

کەمی وخەوشێك پاکەو دوورەو، لە زات و سیفەتدا تاکە و، لە کارو کردەوەشدا هەر ئەو خاوەن ئیجادو تەئسیرەو دروستکردنی جیهان و هەموو ئەندامێکی جیهان لە ژێر دەسەلاتی ئەودایە..

ئەم مەعنایە کە لە (نولووهیەت)ەوە دەردەکەوێ دەبێتە هۆی ئیسباتی هەموو سیفەتە پێویستەکانی خوای گەورە، وەکو لە پێشەوە باسمان کردن و، لە جوملەی ئەوانەیە: زیندوویی و، زانست و، خواست و تەوانایی، بیستن و، دیتن و، وتوویژ لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا کە بۆ ئامۆژگاریی ئادەمیزاد ناردوونی ...

هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەو خوایە لە کردنی هەر کارێکدا کە بیەوێ بیکا و، لە نەکردنی هەر کارێکدا کە نەیەوێ بیکا، خۆی خاوەن خواست و ئیختیارەو، ئارەزووی کردن و نەکردن بە دەستی خۆیەتی.. هیچ شتێك و چاکیی حاڵی هیچ کەس و هیچ گرووهێ لەسەر خوای گەورە واجیب نییە؛ چونکە ئەگەر شتێ لەسەر ئەو واجیب بێ دەبێتە هۆی کەمی بۆ خوا، لە زاتیدا یا لە سیفاتیدا و، بەو شتە و بەو کردەوە تەواو دەبێ، یا ئەگەر کەسێکی تر دەسەلاتی بە سەر ئەودا ببێ و بە خواستی ئەو خوا کارێك بکا، یا واز لە کارێك بهێنێ، ئەمە دەبێتە کەموکوڕی و موحتاجی بۆ خوای گەورە (تعالی الله عن ذلك علوا کبیرا) .

براکانم!

کە باوەڕمان بوو بەوەی هەموو شتێك موحتاجی خوایەو، خوای گەورە لە عالەم بێ نیازەو موحتاجی کەس و هیچ نییە، دەبێ باوەڕمان بەوە ببێ کە هەرچی بێتە وجوود ، لە کارو خاوەن کار هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورەو، ئەو هەمووی دروست کردوون و دروستیان دەکات «اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ»..

واتە: ئەو کارانە ئێمە دەیکەین وەکو هەستان، ڕۆیشتن، وتوویژ، نووستن، هاتوچو ئازاردان، خزمەت کردنی خەڵك، ڕێز لە خەڵك گرتن وئیهانە کردن هەموویان دروستکراوی خوان ئەو دروستی کردوون، هەر ئەوەندە هەیە کە ئێمە پەیوەندیی ئیختیارو کەسبمان هەیە لەو ڕەفتارانەدا، چ خێر وەکو نوێژکردن و، چ شەڕ وەکو شەراب خواردن، ئەو کەسانە کە دەڵێن: کارە خراپەکان و کارە شەڕەکان لە بەندەوەیەو خوا دروستی نەکردوون قسەکەیان هەڵەیە؛ یەکەم: لەبەرئەوە خێروشەڕ بە نیسبەتی ئێمەوەیە: واتە : بۆ ئێمە هەندێ ڕەفتار خراپەو تاوان و تاوانبارییەو، هەندێ کاریش

چاکە و هۆی پاداشتی چاکە، بەڵام بە نیسبەتی خواوەو، بەو چاوەی کە ئەو دروستی کردوون، هەموو وەك یەك وان. دووەم: کە ئێمە تەماشا دەکەین نەخۆش کەوتنمان، مار پێوەدانمان، لە بەرزیوە داکەوتنمان، کوێربوونمان، هەموو ئەمانە بۆ ئێمە شەڕن و خودایش دروستی کردوون و، کەس نالێ: من خۆم نەخۆشینی خۆمم دروست کردووە؛ خۆ ئەگەر خۆی نەخۆشینی خۆی دروست دەکا ئەی بۆچی خۆیشی چاك بوونەوەی خۆی دروست ناکا و، بۆ چی جگەر گۆشە خۆشەویستە نەخۆشەکەی خۆی لە مەرگ ڕزگار ناکا؟!

هۆی هەرچی کردەوەی شەڕو تاوانبارییە هەمووی دوو شتە یەکێکیان: نەفس و دەروونی ئادەمیزاد خۆیەتی و، ئەویتریان شەیتانە، نەفرینی خوای لێ بێ، ئەی بۆچی هەموو کەس دان بەوەدا دەنێ کە نەفس و، شەیتان خودا دروستی کردوون، کە هۆی هەموو شەڕو خراپەیەکیش ئەم دووانەن؟! کەوابوو ڕاستەکەی ئەوەیە کە خوای گەورە دروستکاری چاکەو خراپەیە، بەڵام لەبەرئەوەی بەندە ئیختیاری هەیە لەوانەدا خوای گەورە لە سەر کردەوەی چاکە پاداشتی چاکی دەداتەوەو لە سەر کردەوەی خراپ سزای سەختی دەدا، هەروەها ئەو کەسانەش کە دەڵێن : هەموو کردەوەیەکی ئیختیاری، چ چاك و چ خراپ، هەمووی بەندە دروستی دەکات و پەیوەندیی خوای پێوە نییە، ئەوانیش بە هەڵەدا چوون و بۆچوونەکەیان بێ بایەخە لەبەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە:

یەکەم: ئەو کەسەی کە شتێك دروست بکا پێویستە لە کاتی دروستکردنەکەیدا لە ئەندازەو ژمارەو چۆنیەتیی ئەو شتە ئاگادار بێت، کەچی ئێمە زۆرباش دەزانین لە چەندیەتی و چۆنیەتیی جموجۆڵی جومگە جومگەی لەشمان ئاگادارنین وشتێکی زۆر زۆر کەمی نەبێ خەبەرمان لێی نییە!! تەنانەت ئەگەر یەکێك بە تایبەتی پرسیارمان لێ بکات لەوانە نەتوانین وەڵامی ڕاستەقینەی بدەینەوە، بەڵکو سەرسامیش دەبین!!

دووەم: ئێمە ئەگەر خۆمان ئەو ئیشە باشانەی خۆمان دروست کردبایە دەبووا بمانتوانیایە لەو جۆرەی کە دەیکەن زۆر چاکترو جوانترمان دروست بکردایە، بە شێوەیەك کە کەس لێمان پێش نەکەوتایە، کەچی هەموو کەس دەزانێ ئەگەر زۆریش هەوڵ بدا ناتوانێ لەو ئەندازەی کە دەیکا زیادی بکات لە ڕێگا ڕۆیشتندا، لە نووستندا، لە قسە کردندا.. هەتاد..

سێیەم: ئێمە ئەگەر توانای دروستکردنی کردەوەی خۆمان ببووایە، دەبووا هەرگیز پێویستمان بە یارمەتیی کەس نەبوایە، چونکە هێزی دروستکردن پێویستە تەواو بێ، خۆ ئەگەر دەڵێ هێزی بەندە کزەو تەواو نییە ئەوە پێی لێ دەنێیت کە هێزی بەندە بە کەڵکی دروستکردن نایەت، تەنیا بۆ کەسب و پەیوەندییە بەو کارانەوە کە خەریکیان دەبێ.

چوارەم: ئەگەر بەندە ئیشی خۆی دروست کردبایە دەبووا مرۆڤی موسڵمان هەرگیز ئیشێکی ناباری تاوانی بۆ خۆی دروست نەکردایە، کە لە پاشەڕۆژدا پێی گیرۆدە بێ و، دەبووایە هیچ مرۆڤێکی شارستانی کردەوەیەکی وەهای نەکردایە کە لەگەڵ یاساو نەریتدا نەگونجێ، چونکە هیچ کەس بەوە ڕازی نابێ کە شەرمەزاری بەردەمی گەورەی خۆی ببێ، بەڵام ئەگەر بەندە کاسب بێ، وەك ئێمە باوەڕمان پێیە، ئەوە وا دەبێ کەسبەکەی لە سەر داوای نەفس و ئارەزووبازی دەڕوات و، دەبێتە هۆی ئەوە کە خوای گەورە لە سەر ئەو کەسبە تاوانبارییەکەی بۆ دروست بکا. هەروەها ئەو بیرەش کە دەڵێ: ئادەمیزاد بێ چارەیەو، وەك دارو بەرد وایە، توانای خۆلادانی لە شەڕ بۆ خێرو لە خێر بۆ شەڕ نییە، ئەویش هەر هەڵەیە لەبەر ئەم چەند هۆیانە:

یەکەم: هەموو مرۆڤێکی ژیر دەزانێ کە ئەگەر یەکێ نەخۆش بکەوێ و لەرزی لێ بێ ناتوانێ نە لەرزێ یا ئارام ببێ، بەڵام ئەگەر بەساغی خۆی بلەرزێنێتەوە بە ئارەزووی خۆی، دەتوانێ بلەرزێ یا ئارام بێ، ئەمە بە ئاشکرا بەڵگەیە لە سەر فەرقی کردەوەی ناچاری و کردەوەی ئیختیاری.

دووەم: ئەگەر مرۆڤ هیچ چارێکی نەبووایە لە چاك و خراپی کردەوەیدا دەبووا لە هیچ کردەوەیەکی خۆیداو، لە زیاندانی لە خەڵکدا مەسئول نەبووایەو، دەبووا خەتاکاری و تاوانباری لە جیهاندا نەبووایە!

سێیەم: دەبووا یاساکانی جیهان و قانوونەکان، چ ئاینی و چ دنیایی، بێ سوود بوونایە؛ چونکە یاساو قانوون بۆ ئادەمیزادی خاوەن خواست و خاوەن هێزو تەوانایەو، دار و بەرد یاسا وەرناگرن!!

کەوابێ ڕاستەکەی ئەوەیە کە مرۆڤی ژیر هێزی ژیان و زانست و خواست و توانای

ئەوەندەی هەیە کە ڕوو بکاتە چاکەو خراپەو فەرقیان بکات و، کە ڕووی کردە هەرشتێ خودایش بە قودرەتی خۆی بۆی دروست دەکا و، لەسەر مەیلی کردەوەی خێر پاداشتی باشی دەداتەوە لە دنیا و قیامەتداو، لە سەر کردەوەی خراپ پاداشتی ئازار و سزای پێدەدات لە دنیاو لە قیامەتدا.. ئەم مەیل و خواستی بەندەیە دەبێتە هۆی عادەتی بۆ ئەوەی کە خوای گەورە ئەو کردەوەی بۆ دروست بکا، وەکو چۆن گەرمای ئاگر هۆی عادەتییە بۆ سووتانی شتێك، یا سەرما هۆیە بۆ وشکبوونی شتێك .. هەروەها ئەسبابەکانی تریش، کە خوا دروستی کردوون، هەموویان هۆی عادەتین، واتە: عادەتی خوای گەورە وەها ڕاهاتووە کە ئەو هۆیانە ببنە هۆی چەند شتێك، ئەگینا نە ئاگر دروستکەری سووتاندنەو، نە سەرما خالقی وشککردنە، وەکو مەشهوورە «أن الله يخلق المسبات عند الأسباب، لا بها» گەلێ جاریش خوا ئەم عادەتە تێك دەدا، ئەوە بوو ئاگر ئیبراهیمی خەلیلی نەسووتاندو... گەلێ شتی تری وەهاش لە جیهاندا ڕووی داوە..

هەندێکیش هەن دەڵێن: خوای گەورە وای موقەدەر کردووە کە فلان فلان بکوژێ و، کەسێك ماڵی کەسێکی تر داگیر بکا، یا فلان نوێژ بکاو، فلان نەیکات و، تەقدیری خوا پێویستە بێتە جێ، ئیتر چارەمان چییە؟! ئەم قسەش زۆر زۆر هەڵەیەو لە نەزانینەوەیە؛ چونکە تەقدیری خوا یانی ئیرادە و خواستی خوا، لە سەر زانستی خۆی دەڕواو، خوایش لە ئەزەلدا ئەوەی زانیوە کە فلان کەس دروست دەکا و هۆش و بیری دەداتێ و، دین و ئاینی بۆ ڕەوانە دەکا و، لە لایەنی زانایانی ئاینیشەوە ئامۆژگاری وەردەگرێ و ئەو کەسەش مرۆڤێکی خاوەن هەست و خواستەو، بە ئارەزووی خۆی لەو کاتە دیارییەدا فلانە کار ئیختیار دەکا، کە پیاو کوشتنەو، گوێ بە یاسای عەقڵ و ئاین نادا، ئیتر تەقدیر مەعنای ئیجبارو زۆرکاری نییە، ئەگەر تەقدیر مانای ئیجبارە، بۆچی کە یەکێك ماڵت بخوا، یا کەسێك بکوژێ بەگژیا دەچی و بە مەسؤولی دەزانی؟!

ئەنجا کە ئیختیاری ئادەمیزاد مایەی کردەوەی خێر و شەڕ بێ، پێویستە هەر کەس ئیمرۆ کردەوەی چاك بکا سوپاسی خوا بکا و، هەرکەس کردەوەی خراپ بکات خۆی سەرزەنشتی خۆی بکا.

برایانی ئاینی!

پێویستە لە سەر هەموو موسڵمانێ پێویستییەکانی بیروباوەڕی ئاینی خۆی بزانێ، هەروەها پێویستە لە سەری کە هەموو پێویستییەکانی عیبادەت، وەکو نوێژ و ڕۆژوو و

ئادابی، بە قەدەر حاڵی خۆی بزانێ، واتە: سەبارەت بە بیروباوەڕ بەوە بزانێ کە خوا و فریشتە و پێغەمبەران هەن و، خوا کتێبی بۆ پێغەمبەران ناردووە، ئەوانیش بە خەڵقیان ڕاگەیاندووە، بەوە بزانێ کە پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی (محمد المصطفى) دروودی خوای لە سەر بێ، بۆ سەر هەموو پەری و ئادەمیزادی جیهان بە پێغەمبەریی ڕەوانە کراوەو، ئەو دوایی پێغەمبەرانەو، لە پاش ئەو پێغەمبەری تر نابێت، هەروەها دەبێ باوەڕی بەوە هەبێ کە هەرچی لە جیهاندا هەیە خوای گەورە دروستی کردووە، پێویستە باوەڕی بەوە هەبێ کە ئێمە هەموو لە پاش مردن زیندوو دەکرێینەوەو ڕۆژی قیامەتی نەبڕاوە دێتە مەیدانەوەو، پاش حیسابی کردەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوی کافرو بێ باوەڕ بووبێ دەخرێتە دۆزەخەوەو هەتا هەتایە تیایا دەمێنێتەوەو ئەویش خاوەن بیروباوەڕی پەسەند بێ و موسڵمان بێ، ئەگەر بێ تاوان بێ زوویەزوو دەبرێ بۆ بەهەشت، ئەوەش تاوانبار بێ یا خوا بە گەورەیی خۆی لێی دەبوورێ و دەیبەخشێ، یابەقەدەر گوناهەکەی لە دۆزەخدا ئازار دەدرێ و لە پاشان لە دۆزەخ دەردەکرێ و بەرەو بەهەشت دەکرێتەوەو، هەتاهەتایە لە ئاسایش و نازو نیعمەتدا دەمێنێتەوە.. هەروەها پێویستە هەموو کەس فێری ئاداب و یاسای نوێژ و ڕۆژوو و ئەحکامەکانی تری ئاین ببێ، وەك پێویستە لە سەر ئەوانەی کاسبی دەکەن کە بە گوێرەی ئیش و کارەکەیان لە یاساو ئادابی ئاین ئاگادار بن، ئەگینا بە تاوانبار دەناسرێن. واتە: بە کورتی مرۆ بە دوو ڕستەی شەهادەت کە بە زمان دەڵێ:

«أشهد أن لا اله الا الله، وأشهد أن محمد رسول الله» دەچێتە نێو زومرەی موسڵمانان و لەوان حسێبە، بەڵام لە پاش ئەوە پێویستە لەو ئاداب و یاسایە کە بە ڕووناکی لە دیندا زانراون و ئاشکران بە قەدەر پێویستی خۆی خەریکی فێربوونیان ببێت، ئەگەر هات و قوصووری کرد و فێر نەبوو ئەوە بە موسڵمانێکی فاسیق دەناسرێ و، ئەگەر تێ کۆشی و فێری واجیباتی ئاینی خۆی بوو، ئەوە بە موسڵمانێکی باش دەناسرێ و، لای خوای گەورە پایەی بەرز دەبێ.

زۆر تکا دەکەین لەو خوێندەوارانە کە خاوەن قابیلییەت و توانان لە ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپەدا کۆتایی نەکەن و، ئەم نامەی بیروباوەڕەش بۆ موسڵمانان بخوێننەوەو، بەزمانێکی شیرین تێیان بگەیەنن و، ڕێگای ڕاستی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان پێشان بدەن، چونکە موسڵمانان برای یەکن و، پێویستە برا بەزەیی

بە برای خۆیدا بێتەوەو رەحمی بۆی هەبێت.

هەروەها تکا لە برایانی ئاینی دەکەین کە هاوڕێیەتی و هاودەمیی زانایانی ئاینی بکەن و، هاوڕێیەتییان بە هەل بزانن و، لە سەر فەرمانی ئەوان رەفتار بکەن. وصلی الله علي سيدنا محمد وعلي آله وصحبه أجمعين وعلی اتباعه باحسان الي يوم الدين. وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.

نامەی سێیەم

# باسی واجیباته

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمد لله. والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه الهداة إلى دين الله.**

**وبعد، براكان! پێویسته بزانن: لەسەر هەموو مرۆیەكی موسڵمانی باڵغ و عاقڵ، چ پیاو و چ ژن، پێویسته ئەوەی لە سەری واجیبه بیزانێ و بە رەسایی فێری ببێ و، باوەڕی وا بی كە ئەو واجیباته واجیبن لە سەری ، چ لە بابەتی بیروباوەڕ بێ وەك باوەڕ بە خوای گەورە، بە فریشته، بە پێغەمبەران، بەو كتێبانەی كە خوا بەفریشتەی پایە بەرز جیبرەئیلدا بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، باوەڕ بە قەزاو قەدەر، باوەڕ بە ڕۆژی قیامەت و یا لە بابەتی كردەوە بێ وەك نوێژ و ڕۆژوو زەكات و حەج... هەتاد...**

**هەر كەس بەقەدەر پێویست ئەمانە نەزانێ و هەوڵ نەدا بۆ زانینیان ئەوە خاوەن تاوانەو بەگوناهبار دەدرێتە قەڵەم.**

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم باسە بزانن ئەوەی كە حەزرەتی (محمد المصطفي صلي الله علية وسلم) لە لایەنی خواوە هێناویە بۆمان و بە تەفسیل بەیانی فەرمووە، وەكو ناوی ئەو پێغەمبەرانە كە لە قورئانی پیرۆزدا بەیان كراون و، ئەو فریشتانەی كە ناویان یا ژمارەیان بەیان كراوە، پێویسته بەو شێوە بیانزانن، هەروەها ئەوانەی كە شرووت و ئەركانی نوێژن  یا نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە، یا لە واجیباتی ڕۆژوون، یا ئەوانەی بەتاڵی دەكەنەوە، پێویسته بیانزانن و، لە لای زانایانی ئاین بەقەدەر لێهاتن و توانایان فێریان ببن، بۆ ئەو كەسەش كە خەریكی مامەڵەیە پێویسته واجیباتی مامەڵەكەی بزانێت و، ئەگەر گوێ نەداتێ و فێریان نەبێ ئەوە تاوانبارەو، ئەگەر بیانزانێ و فێریان ببێ دەبێته خاوەن پایەو مایەی دنیاو قیامەت.

حەزرەت (د. خ) فەرموویەتی: «أيما عبد جاءته موعظة من الله في دينه فانها نعمة سيقت اليه، فان قبلها بشكر زاده الله نعما اخرى، والا كانت حجة من الله عليه.. إلى ان قال: ويزداد عليه سخطا»..

واتە: هەرکەس ئامۆژگارییەکی لەلایەن خوای گەورەوە بۆهات، ئەوە نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی خوا و بۆی ڕەوانە کراوە؛ جا ئەگەر بە سوپاسەوە وەری بگرێ ئەوا خوای گەورە چەند نیعمەتی تری بۆ زیاد دەکات ، ئەگەر نا ئەوە دەبێتە شاهید لە سەری بۆ تاوانباری.. تا ئەوەی کە فەرمووی: خوای گەورە نارەزایی لەو کەسە زۆرتر دەبێ (پەنا بەخودا).

پێویستە بزانن: (یەکەم واجیب) ناسینی خوایە، بەقەدەر توانای ئادەمیزاد و، ئیقرار بە تاق و تەنیایی خوای گەورە و هەموو سیفاتی نەفسیەو سەلبیە و سبووتیەی ، وەکو لە نامەی بیروباوەڕدا باسمان کردن.

(دووەم): باوەڕکردنە بە هەموو ئەوانەی کە حەزرەتی (محمد المصطفى) لە لایەنی خواوە هێناویەتی، لە جوملەی ئەوانەیە باوەڕ بە پێغەمبەرایەتی (نبوت و رسالت) و پێغەمبەرایەتی ئەو زاتانەی کە خوا کردوونی بە خاوەن ئاین، چ پێیان نەسپێردرا بێ ئەو ئاینە بە ئادەمیزاد بگەیەنن کە پێیان دەوترێ نەبی، یان پێیان سپێردرا بێ بیگەیەنن، کە لە عورفی شەرعدا بە(رسول) ناودەبرێن، واتە: فرستادەی خوا بۆ سەر هۆشیاران لە پەری و لە ئادەمیزاد، بە تایبەتی باوەڕ بە دوایی هەموو پێغەمبەران کە حەزرەتی (محمد المصطفى)یە (د.خ) واتە: پێویستە بزانی کە ئەو محەمەدە کوڕی (عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافە و، دایکی ناوی ئامینەی کچی وەهەبی کوڕی زوهرەی کوڕی کلابە و، هەردوو رشتەی باوك و دایکی لە تائیفەی قورەیشن و، لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمن.

هەروەها دەبێ باوەڕت وا بێ کە هەموو پێغەمبەران مەعسووم و لە گوناه دوور و دڵسۆز و فەرمانبەرداری خوای گەورە بوون.

لە جوملەی ئەوانەیە کە پێغەمبەر لای خواوە هێناونی: ئیمان و باوەڕ بە فریشتەکانی خواو، باوەڕ بەو کتێبانەی خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردوون و، باوەڕ بەڕۆژی قیامەت، کە لە پاش تێکچوونی ئەم جیهانە خوا هەموو مردووەکان زیندوو دەکاتەوەو، حیسابی

کردەوەیان لەگەڵ دەکا و، ئەهلی دۆزەخ بۆ دۆزەخ و ئەهلی بەهەشت بۆ بەهەشت دەنێردرێن.. هەروەها باوەڕ بە ئەوزاعی بەرزەخ، واتە: ماوەی پاش مردن و پێش ڕۆژی قیامەت کە مرۆڤ لە قەبردایە، واتە: پێویستە مرۆڤی موسڵمان باوەڕی هەبێ بەوەی پاش ناشتنی مردوو خوای گەورە ئاگاداری دەکاتەوەو دوو فریشتە دەڕۆنە سەری و پرسیاری لێ دەکەن لە خواو لە پێغەمبەرو بیروباوەڕی ئیسلامییەت، پێویستە باوەڕی ببێ بە خۆشی قەبر بۆ ئەوانەی کردەوەیان لە جیهاندا باش بووە و، سزا و ئازار و ناخۆشیی قەبر بۆ ئەوانەی کە کردەوەیان خراپ بووە..

هەروەها پێویستە باوەڕی ببێ کە هەمووی عالەم خوا دروستی کردووەو، هیچ شتێ بێ خواستی ئەو نابێ و، هەرچی خواستی ئەوی لەسەر بێ دەبێ.

(سێیەم واجیب) لە سەر موسڵمان ئەوەیە کە ئەحکامی عەمەلی بزانێ! واتە: ئەو شتانەی کە ئەرکانی ئیسلامەتین، وەکو نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج بە مەرج و ئەرکان و ئادابیانەوەو، ئاگادار بێت لەو شتانەی ئەم عیبادەتانە بەتاڵ دەکەنەوە. یەکێ لە مەرجەکانی نوێژ ڕوو لە قیبلە کردنە کە ناوی کەعبەیەو مزگەوتێکە لە شاری مەکەی موکەڕەمدا، لە بەر ئەوە پێویستە بزانێت قیبلە کوێوە کەوتووە؟ بۆ نموونە: ئێمە کە ئەهلی عیراقین ئەستێرەی قوتب کەوا لە لایەنی شیمالەوەو بەقەدەر (٢٤) دەرەجە لە کەناری ئاسمان بەرز بووەتەوە دەلیلی قیبلەیە؛ واتە: هەر کاتێك مرۆڤ ڕووی لە جەنووب کردوو، بەلای ڕاستدا لای کردەوەو لە پشتی گوێی ڕاستییەوە ئەو ئەستێرەی بینی ئەوە ڕووی لە قیبلەیە.

هەروەها واجیبە لەسەر مرۆڤی موسڵمان بەقەدەر حاڵ ئادابی موعامەلەو کڕین و فرۆشتن و ئادابی نیکاح و حەڵاڵ و حەرام بزانێ. بەڵام ئەو ئەحکامانە کە ئاسان بن لەسەریان واجیبە بیانزانن و، ئەو مەسئەلانەی کە گرانن و زانای بەرز نەبێ نایانزانن، ئەوە لەسەر خەڵکی هەڕەمە (عامة الناس) واجیب نین.

(چوارەم) ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپەیە لەسەر ئەو شێوە کە لە مەکتووبی تایبەتیدا باس کرا.

(پێنجەم) ئیخلاسە لە کردەوەدا، یانی هەر عیبادەتێ کە دەیکا ساغ و ساف لەبەر ڕەزاو خۆشنوودیی خوای گەورە بیکا.

(شەشەم) وەفا بە عەهدە، واتە: هەر پەیمانێکی حەڵاڵی کرد لەگەڵ هەر کەسێکا نەیشکێنێ و دەوامی لەسەر بکا.

(حەوتەم) ئیتاعە و فەرمانبەرداریی خاوەن فەرمانانی ئیسلام لە هەر شتێکدا کە حەڵاڵ بێت، واتە: بەگوێ کردن و فەرمانبەرداریی کار بەدەستانی ئیسلام دەبێ لەسەر یاسای ئاینی ئیسلام بێ.

(هەشتەم) متمانەو دڵنیایی و باوەڕ بە وەعدو وەعیدی خوای گەورە؛ واتە: پێویستە مرۆڤ دڵنیا بێ لە بەڵێنی خێری خوا کە ئەگەر لە جیهاندا کردەوەی باش بێ، لە ڕۆژی پاداشدا جەزای باش دەبێ و، ئەو هەڕەشانەش کەخوا لە تاوانبارانی دەکا ڕاستن و، ئەگەر مرۆ لە جیهاندا کردەوەی خراپ بێ لە ڕۆژی دواییدا پاداشی سزا و ئازار دەبێ ، سا مەگەر خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی چاوپۆشی لێ بکا.

(نۆیەم) پێویستە کە مرۆ کەسێکی خۆشویست لەبەر خوا خۆشی بوێ و، ئەگەر لێی تووڕە بوو هەر لەبەر خوا لێی تووڕە بێ، واتە: تا ئەو کەسە کردەوەی چاك بێ خۆشی بوێ و، ئەگەر کردەوەی خراپ بێ لەبەر کردەوە خراپەکەی ڕقی لێی بێ، هەروەها شتدانی بە خەڵك و شتنەدانی بە خەڵك هەر لەبەر خاتری خوابێ، واتە: ئەگەر کەسەکە بەپێی یاسای ئاین شایانی یارمەتیدان بێ یارمەتیی بداو دەسگرۆیی بکا و، ئەگەر شایانی یارمەتیدان نەبێ، بەپێی یاسای ئاین شتی پێ نەداو یارمەتی و دەسگرۆیی نەکا.

(دەیەم واجیب) پێویستە لەسەر مرۆڤ کە خۆی بناسێت و، نەفسی خۆی بناسێت و، ڕێگەی بەرگری لە نەفس و ئارەزووی بزانێ و، بەو ڕێگەدا بڕوات، واتە: تێ بکۆشێ بۆ ئەوەی نەفسی لە خووڕەوشتی خراپ و نابارو ناڕەواو کینەو حەسوودی و بەدئەندێشی و، تەماع و چاوبرسیەتی ناڕەواو ناشەرعی و، داگیرکردنی ماڵی خەڵك و، دەسبردن بۆ نەفس و ناموسی خەڵك و، شادکامی بە زیانی موسڵمانان و، فیتنەو ئاشووبنانەوە لە جیهاندا و، دووزمانی کردن و، ئابڕووی خەڵك بردن و بڵاوکردنەوەی ڕووداوی ناشیرین و هاوچەشنی ئەمانە پاك بکاتەوە. هەروەها پێویستە تێ بکۆشێ بۆ خووڕەوشتی بەرزی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) وەك ئیمان و ڕاستی و خۆگرتن لە دژواریدا و متمانەو باوەڕ بە دەسەڵاتی یەزدان و پشت ئەستووری بە ڕەزامەندیی خواو... باوەڕی وەها بێ کە ئیبلیس دوژمنی ئادەمیزادەو نەفسیش دزدەسەکی شەیتانەو، ئەگەر ئارەزووی نەفس نەبێ شەیتان ڕێ ناباتە سەر دڵی مرۆڤ و زیانی پێ ناگەیەنێ.

ئەم ئەحواڵ و سیفەتە چاکانە لە هاونیشیی زانایانی دڵپاك و خاوەن ڕۆحانییەت و، لە بەردەوامبوون لەسەر تاعەت و، لە خوێندنەوەو گوێگرتن لە وتاری کتێبە بەنرخەکانی وەك (احیاء العلوم)ی ئیمامی غەزالی (ر.خ)یەوە دەستدەکەون.

(یازدەیەم و دوازدەیەم) خەوف و ڕەجایە، ترس و ئومێد، واتە: ترسی لە ڕقی خودا هەبێت و، لە هەمان کاتدا بە عەفوو لێبووردنی بەرفراوانی خواش ئومێدەوار بێ؛ چونکە ئەمین بوون لە رقی خوا ، یا نائومێد بوون لە میهرەبانی و بەزەیی خوای گەورە هەردووکیان دەبنە هۆی کافربوونی مرۆڤ..

(سێزدەیەم) ڕازی بوونە بەقەزای خوا، واتە: ئەگەر مرۆڤ تووشی بەڵاو ئازارێك بوو، نەفسی خۆی یا خێزان و منداڵی، یا زیانێك لە سامان و دەرامەتی کەوت، یا نوشستییەك بەسەر پایەو حورمەتیدا هات، ئەگەرچی بەپێی سروشت ئازاری پێ دەگا، پێویستە ئاگای لە خۆی بێ و نەیکاتە هۆی ڕەخنەگرتن لە کاری خوا، چونکە خوا خاوەنی جیهانەو، هەرچی بیەوێ دەیکا و، هەموو کردەوەیەکی حیکمەتێکی تێدا هەیە، چ قازانجی تێدا بێ بۆ خاوەن زیانەکە یا نا؛ خوا لە کارێ خۆیدا خواستی بە دەستی خۆیەتی و هەرچی بیەوێ دەیکا.

(چواردەیەم) «توکل» – پشت بەخوا بەستن و دڵنیاییە لێی– واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە مرۆڤ پێویستە بە پێی یاسای جیهان هەوڵ بداو تێ بکۆشێ بۆ بەرگریی زیان، لە خۆی و دەوروپشتی و تێ بکۆشێ بۆ پەیداکردنی خێرو قازانج بە ڕێگاو شێوەی حەڵاڵ، پێویستە لەسەری باوەڕی بەوە هەبێ کە هەموو شەڕ لێ لادانێك و هەموو قازانج کردنێك و خێر و خۆشییەکی پەیوەندیی بە خواستی خواوە هەیە، واتە: هەرچەند ئەسباب ڕێك بخا، مادام خواستی خوای گەورە لەسەر ئەو مەبەستەی ئەو نەبێ، هیچ سوودێ وەرناگرێ؛ خوای گەورە هەروەکو سەبەبسازە سەبەب سۆزیشە.

(پازدەهەم) داپۆشینی عەورەت واتە: لەسەر نێرینەی باڵغ واجیبە کە هیچ شوێنێکی لەشی خۆی پێشانی ژنی نامەحرەم نەداو، مابەینی ناوك و ئەژنۆیشی بە ڕووتی نیشانی پیاوان و ژنانی مەحرەم نەدا... مەگەر حەڵاڵی خۆی..

هەروەها واجبە کە مێینەی باڵغیش هیچ شوێنێ لە لەشی خۆی نیشانی پیاوی نامەحرەم نەداو، مابەینی ناوك و ئەژنۆی نیشانی ژنان و پیاوانی مەحرەم نەدا. مەگەر بۆ مێردی خۆی. بەڵێ چەند کات و شوێن جیاکراونەتەوە بۆ ڕەوابوونی خۆدەرخستن بۆ نامەحرەم، وەکو کاتی نەخۆشی و کاتی فێربوونی واجیباتی ئاینی و کاتی تەحەمولی شەهادەت یا شایەتی دان... هەتاد...

(شازدەیەم) شوکری نیعمەت و یادی خوا لەسەر هەر شتێکی خێر کە دەست کەوت،

واته: کاتێك کە خوای گەورە زانست، یا پایە یا نان و ئاوێکی پاکی دا بە مرۆڤ، پێویستە باوەڕی وەها بێ کە لە لایەنی خواوە بۆی ڕەوانەکراوەو، خوای گەورە هۆیەکانی بۆ ڕێك خستوە بۆیە پێویستە بە دڵ گەورەیی خوا ڕابگرێ و، بە خاوەنی نیعمەتەکەی بزانێ و، هەر کاتێ دەستی کرد بە نان خواردن یادی ئەوە بکات کە ئەو نانە لە خواوە هاتووە، یانی: خوا هۆی ئەوەی جێبەجێ کردووە.. لەڕاستییدا گەلێك جار مرۆڤ هەندێ نیعمەتی دەست دەکەوێ کە هەرگیز بەخەیاڵیدا نەهاتووە کە شتی وەهای دەست دەکەوێ؛ لەبەرئەوە سوننەتە لە ئەوەڵەوە «بسم الله....» و، لە دواییشدا شوکر بە زمانیدا بێ.. هەروەها پێویستە وا بزانێ کە میهرەبانیی خوا نەبووایە ئەو نیعمەتەی بۆ نەدەبوو، بێگومان هەر نیعمەتێ بە ئینسان بگا، تێکچوون و نەمانی گەلێ لای خوا ئاسانەو، بەردەوام بوونیشیی لای ئاسانەو، دەبێ ناوەڕۆکی ئەم ویردەی بەدڵدا بێ:

« اللهم أني أحمدك واشكرك حمداً وشكراً وثناء يملأ كل منها الكون كله على ما أوليتني من النعم التي لا أحصيها ولا أستحقها الا بفضلك وكرمك، وعلى ما صرفت عني بفضلك وكرمك من النقم التي أستحقها وصرفتها عنى برحمتك»..

بە کورتی : پێویستە موسڵمانان بەرامبەر بە ڕەحمەت و کەرەمی خوای گەورە بێ ئاگاو بێ خەبەر نەبن و، پێویستە سوپاسی خوا بکەن و، نان و شان و شکۆو پایە و مایەو نەولادو جێگەو ڕێزی هەمووی لە خوای گەورەوە بزانێ و...، هەر نیعمەتێك لەم نیعمەتانەی نەما وا بزانێ ئەمانەتێکی خوا بووەو بردوویەتییەوە، دیارە ئەمانەت بۆ خاوەنی خۆی دەگەڕێتەوەو، نابێ بە زمانی ئەو نیعمەتە دڵگران بێ و دەبێ بەقەزای خوا ڕازی بێ، هەروەکو پێویستە لە کاتی دەست کەوتنەکەیدا لە خۆی بایی نەبێ، وا نەزانێ کە شایانیەتی و لەبەر شایانیەتی دەستی کەوتووە!!

لە ڕاستیدا هەموو دنیا و ئەوی لە دنیادایە هەمووی شتێکە دێت و دەڕوا و، هەتا هەتایە بۆ کەس نامێنێ، بە خواستی خوا دێ و بە خواستی ئەویش دەڕوا.

(حەڤدەیەم واجیب) ئەوەیە کە مرۆڤ، هەرچەند پایە و مایەدار بێ، پێویستە لەگەڵ ڕاگرتنی ویقار و ئەدەبدا دەربارەی خەڵك خاکینە بێ و خۆی بە کەم بزانێ و، خۆی بە زل نەزانێ و، سڵاویان لێ بکا و وەڵامی سڵاویان بداتەوەو، ئەگەر پرسیارێکی لێ کرا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك وەڵامی بداتەوەو، کە هاتە مەجلیسەوە هەوڵی لای ژوورەوە نەدا و، لە ڕێگا ڕۆیشتندا هەوڵی ئەوە نەدات پێش کەوێ.

(هەژدەیەم واجیب) عیبرەت و پەند وەرگرتنە، واتە: مرۆڤ بە مردنی باوك و برا و ئەولاد و خزم و خۆیشی و بەمردنی پیاوی خاوەن دەسەلات و بەلێقەوماو پیاوی بەهێز، پەند وەربگرێ و تەمێ خوارد بێ و، باوەڕی وا بێ وەکو ئەوان لێیان قەوماو لەناوچوون ئەویش لەوانەیە تووش ببێ و بفەوتێ و، وەکو ئەوان مردن ئەویش دەمرێ، بە تایبەتی ئەگەر یەکێ بەهۆی کردەوەی خراپەوە تووش بوو، لەو تووشبوونە پەند وەربگرێت و، نزیك ئەو جۆرە کردەوە خراپانە نەکەوێ کە دەبنە هۆی نەگبەتی!.

(نۆزدەیەم) پاراستن و ڕاگرتنی تەندروستییە، چ هی خۆی و چ هی ئەوانەی لە ژێر دەستیان.

پارێزگاریی تەندروستی بەوە دەبێ شتی زیاندار نەخوا، کە خواردنی خوارد زیادەخۆری نەکا و تا برسی نەبێ پەلاماری خواردن نەدا و، خۆی لەسەرما و گەرمای بێ ئەندازە بپارێزێ و، کە نەخۆش کەوت سەر لە دکتۆرێکی پسپۆڕ و شارەزا بدا و بە دەستووری ئەو ڕەفتار بکا و، بێجگە لەوەش خێر و سەدەقە بکا بە هیوای ڕزگاربوون لەو ناساغییەو، داوای دوعای خێربکا لە پیاوچاکان، هەروەها کاتێك کە دووچاری بەڵایەك بوو سەدەقە و خێربکا بۆ نەهێشتنی ئەو بەڵایە. ئەوانەی وتمان سەبارەت بە تەندروستیی لەش بوو، هەروەها لەسەر مرۆڤ پێویستە چاودێریی ساغی و بێ دەردیی دڵ و دەروونیشی بکا، واتە: لەگەڵ کۆمەڵی بێ ئاین و بێ عەقڵ و بەدخوو بەدرەوشتدا ناچاری نەبێ، کۆ نەبێتەوەو تێکەڵییان لەگەڵ نەکا و، گوێ بە قسەیان نەدا، بەڵکو بە قەدەر دەسەلات هاوڕێیەتی مرۆڤی چاك و کرداریاك و دڵ و دەروون ڕووناك و دەست و زمان و داوێن خاوێن بکا، بە تایبەتی ئەوانە کە مرۆڤ لە پەند و ئامۆژگارییان خاتر جەم دەبێ و چاوی دەکرێتەوەو، دەکەوێتە سەر شارێگەی بەختیاری...

ژیرەکان فەرموویانە: هەر منداڵێك تا لە شیر دەبڕێتەوە لەبەر دەستی دایکی پاکدا بێ و، تا دەگاتە حەوت ساڵان لە نێو خێزانی بە شەرم و زمان پاك و خاوێن و پیاوچاکدا بێ و، لە پانزە ساڵانەوە تا بیست و پێنج ساڵان لەگەڵ کۆمەڵی خاوەن ئایندا هەڵسێ و دانیشێ، ئەگەر نەبێ بە یەکێ لە ئەولیا دەبێ بە یەکێ لە پیاوە هەرە چاکەکان، تاقی کراوەتەوە کە کۆمەڵی ناپاك و دەورو بەری ناپاك لە هەموو دەردێ بێ دەرمانترە..(اعاذنا الله)

(بیستەم واجیب): پارێزگاری و چاودێری چاو و گوێچکەو دەم و عەورەت ، واتە:

ـ ڕێزگاری چاو لە تەماشای حەرام و، گوێچکە لە بیستنی وتووێژی ناڕەواو، دەم و زمان ـە خواردن و وتاری حەرام و، عەورەت لە بەکارهێنانی ناشەرعی.

(بیست و یەکەم) شەرم کردن و ئەدەب کردنە، واتە: مرۆڤ ئەندازەی وتار و کرداری ـەگەڵ خەڵکدا ڕاگیر بکا و، قسە و گفتوگۆی لەگەڵ هەرکەسێکدا مناسبی حاڵی ئەو کەسە بێ و؛ کردەوەی بێ شەرمانە لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکا و، تا ناچار نەبێ دەمەقاڵەو، قسە بەزۆراندانی نەبێ، تەنانەت با حەقیش لای ئەو بێ! ئەگەر ناچاریش بوو ئاگاداری ئادابی کات و شوێنی موجادەلە بێت و، هەموو کات ئینصاف بەکاربێنێت و، بە سووکی تەماشای بەرامبەر نەکا و ڕێز و پایەی ڕابگرێ.

(بیست و دووەم) «حفظ الغیب»ە، واتە: هەر کەسێ لە بەرەو ڕوودا چۆن حورمەت و ڕێزی لێ دەگریت لە پاش ملەشدا مافی ڕابگرێ و ناوی بە خراپی نەبەی و، ئەگەر کەسێك بەناحەق باسی کرد بەقەدەر توانا پارێزگاری لێ بکەی.

(بیست وسێیەم): ئیسلاحی ناوبەینی خەڵکە، واتە: بەهەر جۆرێ لە تواناداا بێت بەینی موسڵمانان ڕێك بخا و، ماوەی ئاشووب و ئاژاوە نەدا و ئاگری ناکۆکی بکوژێنێتەوە، بە تایبەتی لای ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتدارن قسەی باش بکا و مەیدانی زیان گەیاندن بەبێ تاوانان نەدا و، بە قەدەر توانا عوزریان لای دەستەڵاتدارەکە بۆ بهێنێتەوە بەڵکو چاوپۆشییان لێ بکا.

(بیست و چوارەم) سەرف کردنی ماڵ و پارەو پایە لە پێناوی هەرشتێکدا کە واجب بێ؛ بۆ نموونە: پێویستە لە سەر مرۆڤی موسڵمان کە ماڵ و پارە سەرف بکا بۆ ژیانی خۆی و ژن و منداڵ و مێوانی بە قەدەر دەستەڵات، هەروەها ڕژدی و پارە پیسی و دەس بە ماڵی دنیاوە گرتن لە ڕووی ماڵ و منداڵ و میواندا حەرامە بە جۆرێك کە لە عادەت و نەریتی خەڵکی دەربچێ و، ببێتە هۆی ئەوەی منداڵ و ژن و دەست و پێوەندی چاویان لە خەڵکەوە بێ.. بەڵێ دروستە، بەڵکو سوننەتە مرۆڤ بۆ نەفس شکاندنی خۆی بە نەوعێ بژی کە نەفسی سوغیان نەکا و ئارەزووی نەفسی خۆی کەم بکاتەوە..

هەروەها واجیبە مرۆڤی موسڵمانی دەستەڵاتدار بەپێی توانا، ماڵ سەرف بکا بۆ داماوان و لێقەوماوان، ئەوانەی کە بەهۆی گەدایی و کارەساتی دنیایی تووشی نەگبەتی و نەداری بوون، بەڵام ئەمە کاتێ دەبێ بە واجبی عەینی کە بێجگە ئەو کەسی تر نەبێ،

یا دەوڵەمەند ببن و صەرفی ماڵ نەکەن، لەم کاتەشدا واجب نییە بە خۆڕایی ئەو ماڵە سەرف بکا، بەڵکو دروستە شایەت بگرێ لەسەر ئەوەی کە ئەم بەو نیازە ئەم ماڵەی بۆ سەرف دەکات کاتێ دەستی ڕۆیشت بیداتەوە، بێگومان ئەگەر ئەوە نەکا و هەر لە ڕێگەی خواوە سەرفەکە بکا ئەوە خێرێکی ئێجگار زۆرو بێ ئەندازەیە..

هەروەها واجیبە سەرفی ماڵ بۆ کردنەوەی مزگەوت و ڕاگرتنی خزمەتکار بۆ مزگەوت و کڕینی بەرماڵ و پێویستیی مزگەوتەکەو، خزمەت کردنی ئەو کەسەی کە لەو مزگەوتەدا پێنج فەرزە حازر دەبێت و شیعار و یاسای دین جێبەجێ دەکا؛ چونکە ئەگەر ماڵ سەرف نەکەن ئیمام نایێ و شیعاری ئاین لە کیس دەچێ. هەروەها پێویستە ماڵ صەرف بکرێت لە پێناوی بەڕێکردنی مردووی بێ ماڵ و حاڵ بۆ شۆرین و کفن و دفنکردنی. هە وەکو واجیبە ماڵ سەرف بکرێ بۆ خوێندنی زانستیە ئاینیەکان و یاسای ئیسلام؛ چونکە ئەگەر زانستی ئاین نەمێنێ ئاداب و نەریت و ڕەوشتی ئاین جێبەجێ ناکرێ.

واجیبە ماڵ صەرف بکرێ بۆ دەفعی ئەو کەسانەی دین دەڕووخێنن و دوژمنایەتیی ئاین دەکەن، هەروەها پێویستە ماڵ سەرف بکرێ بۆ لابردنی مەیخانەو شوێنی داوێن پیسی و بۆ دەفع کردنی ئەو کەسانەی بیانەوێ ستەم لە موسڵمانان بکەن و ماڵیان بخۆن و زیانیان پێ بگەیەنن. پوختەی قسە ئەوەیە: هەرشتێ بۆ ڕاگرتنی ئاینی ئیسلام و ڕاگرتنی کۆمەڵی ئیسلام پێویست بێ، پێویستە ماڵی تێدا خەرج بکرێ و، بە هەموو جۆرێ هەوڵی بۆ بدرێ؛ ئەم جۆرە ماڵ سەرف کردنە بە جیهاد دەژمێررێ لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئایندا و ڕەوا نییە کەس لەم بابەتەوە کۆتایی بکات.

لەو واجیبانەی کە باسمان کردن هەرکامیان زۆرتر پێویستی بە یارمەتی بێ، وەکو بەخێو کردنی هەتیو و لێقەوماوان و غەریبان و کەسانی گیرۆدەی دەستی زۆرداران، زۆرتر پێویستە بە پێش خستن و چاودێری کردن..

ئەم ژمارە کەمە لە واجیبات ئێستە لە یادمدا بوون نووسیمن، بەڵام واجیبات زۆرن و، پێویستە هەمیشە بچنە لای زاناکانی ئاین تا واجیباتی خۆتان بزانن و بەپێی توانا جێبەجێیان بکەن. ئەوەی واجیبات فێر دەبێ و، ئەوەی واجیبات فێری خەڵك دەکا خوای گەورە پاداشتی چاکیان دەداتەوە (والسلام علي من اتبع الهدي).

## نامەی چوارەم

# نامەی بچووکی بیروباوەڕە

بسم اللـه الرحمن الرحيم

**الحمد للـه الباطن الذي لا يبلغ أحد عرفان ذاته ولا صفاته والظاهر الذي كل ما سواه برهان وشاهد على كمال صفاته ووجود ذاته، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آلـه وصحبه الكرام إلى قيام الساعة وساعة القيام.**

**(وبعد) ئەی برایان! لەمەوپێش لە باسی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامیدا نامەیەکی درێژم نووسیبوو، بەڵام بەداخەوە لەبەر درێژیی باسەکانی، خەڵك خۆیان پێوە مەشغوول نەکردو، داوای نامەیەکی کورتیان دەکرد؛ منیش بە ناچاری خواستم هاتە سەر کورتکردنەوەی ئەو نامەیە؛ وەکو مەشهوورە « مالا یدرك کلە لا یترك کلە» واتە: شتێ مرۆڤ بە هەمووی نەگا و هەمووی بۆ جێبەجێ نەکرێ، ناشبێ بەجارێ هەمووی تەرك بکا و بە تەواوی وازی لێ بێنێ، مەبەست ئەوەیە کە موسڵمانان لە نەزانیندا نەمێننەوە.**

جەنابی باپیرە گەورەم سەیید باباعەلیی هەمەدانی (قدس اللـه سره) نامەیەکی لە باسی بیروباوەڕدا نووسیوە، کە بە کورتی پێویستییەکانی بیروباوەڕی تێدا نووسیوە، منیش هاتم بە شێوەیەکی کورت لە چەند پەڕەیەکدا بۆم نووسین.

ئەو ذاتە فەرموویەتی: مەبەستی خوای گەورە لە دروستکردنی جیهان ئەوەیە کە خۆی دەربکەوێ و بناسرێ و، لەپاش ناسینەکەی پەرستیاری بکرێت.

ڕیوایەت کراوە لە حەدیسی قودسی خوا فەرموویەتی: «کنت کنزاً مخفیاً فأحببت أن أعرف فخلقت الخلق لکي أعرف»[1] واتە: من وەکو گەنجینەیەکی داپۆشراوو نهێنیی وا

(١) ئەهلی حەدیث فەرموویانە ئەم حەدیثە سەنەدی نییە.

بووم، ویستم بناسرێم، لەبەرئەوە خەڵکم دروست کرد تا بناسرێم. هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: «وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ » واتە: پەری و ئادەمیزادم تەنیا بۆ ئەوە دروست کردووە کە بمناسن و پەرستیاری و بەندەیی و فەرمانبەریم بکەن.

جا لە سەر ئەم بناخەیە لە کاتێکەوە خوای گەورە ئادەمیزادی دروست کردووە هەموو فریشتەکان و پێغەمبەران و دۆستانی خوا و زانایانی جیهان، هەریەك بەقەدەر حاڵی خۆی، خەریکی ناسینی زات و سیفاتی خوای گەورە بوون.. لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی هاتووەتە مێشکی ئەوانەو بۆی چوون بەرامبەر بە ناسینی زات و سیفاتی خوای گەورە وەك نمە ئاوێکە لە دەریایەکی جیهانگیردا، بەڵام ئەوەندە هەیە کە مرۆڤ بە قەدەر توانای بۆ ناسینی زات و صیفاتی خوای گەورە هەوڵ بدا و، بە شێوەیەکی گشتی پێویستە بزانێ کە پەروەردگاری جیهان خوایەکە تاق و تەنیا و هاوکارو هاوبەشی نییەو، تاقانەیەکی وایە وێنەی نییە، خاوەن دەسەڵاتێکی وەهایە هیچ کەسێك و شتێك نییە بتوانێ دژی بوەستێ و بەرەنگاریی بکا؛ چونکە غەیری ئەو هەموو کەس و هەمووشت موحتاج و نیازمەندە بەوو، ئەو بە هیچ شت نیازمەند نییە.

خودا قەدیمێکی وایە کە بوونی سەرەتای نییەو، هەرچی غەیری ئەوە بەو ماوەتەوەو، ئەگەر یەك ئان خوای گەورە جیهان ڕانەگرێ هەمووی دەفەوتێ، ئەمەش واتای (قیومیتی) خویە.

خوای گەورە ئەزەلی و بێ سەرەتاو ئەبەدی و بێ بڕانەوەیە.

خوا ئاشکرایە؛ هەرچی لە جیهاندایە، بەرز و نزم، گەورە و بچووك، جووڵاو و نارام، هەمووی بەڵگەن لە سەر بوونی، هەروەها باطن و نادیارییە، واتە: حەقیقەتی زات و سیفەتی نەبڕاوەی ئەم بەم هۆش و فامە کەموکووڕەی ئێمە کەشف ناکرێ و ڕۆشن نابێتەوە. خوا زیندووە بەجۆرێك کە مردن و نەمان ڕووی تێ ناکات و، هەرچی گیانلەبەرە دڵۆپێکە لە دەریای زیندوویی ئەو..

زانایەکی وەهایە هەرچی زانراوی لەمەوپێش و زانراوی لەمەوپاشە، بە قەدەر خاڵێك، یا بچووکتر یا گەورەتر لە بازنەی زانیاریی ئەو دەرناچێ؛ چونکە زانیاری و تێگەیشتنی جیهان هەمووی دوایی دێ و دەبڕێتەوە، بەڵام زانیاریی خوای گەورە هەرگیز بڕانەوەی بۆ نییە..

خوا خاوەن ئیرادەو خواستەو، هەرچی خواست و ئیرادەی خەڵکە لە دێڕێکی کتێبی ئیرادە و خواستی ئەو کەمترە.

خوا قادر و توانایەکی وایە، هەرچی ڕووی داوەو ڕوو دەدا هەمووی لە نێو مشتی توانای ئەودایە..

خوا شنەوایەو، هەموو ئاواز و دەنگێك لە زماندار و بێ زمان لە ئادەمیزادو پەری و بەڵەوەر و دڕندەو چەرەندە، بە هەر شێوەیەك بێ، دوور یا نزیك، لە بیستنی خوادا حازرەو، دەنگی پێی مێروولەیەك لە بیستنی ئەوا لە دەنگی ناڵی پێی ئەسپ لەلای سوارەکەی دیارتر و ئاشکراترە...

لەهەر ساتێك لەسەر ڕووی زەوی وتەیەك یا پاڕانەوەیەك لە کەسێکەوە ڕوویدات خودای گەورە هەموو ئەوانە دەبیسێت و، دەنگی یەکێك لەوانە ڕێگا لە بیستنی دەنگی ئەویتریان ناگرێ. بیستنی خوا وەکو بیستنی ئادەمیزاد نییە ئەوەندە بێ هێز بێ کاتی تێکەڵبوونی دوو دەنگ هیچ کامیان بە تەواوی نەبیسێت، یاخۆ لە نزیکەوە ببیسێت و لە دوورەوە نەبیسێت، کەم و زۆر، تێکەڵ و سەربەخۆ، دوور و نزیك لای خوای گەورە یەکسانە.

خودا بینایە، هەموو شتێکی گەورە یا بچووك هەتا وردە تۆزی هەواو زەرڕاتی ژێر زەوی و وردە شتی ناو قووڵایی دەریا دەبینێ.. خوا گۆیایەکی وایە کە گەردنی کائینات لە ژێر فەرمووده و ئەمرو نەهیی ئەودان، ئەوەی هۆشیارە بە فەرمانی پادشاهانەی ئەوەوە بەستراوەو، ئەوەی بێ هۆشە بە فەرمانی تەسخیری ئەوەوە ناسراوە، لە پلەی یەکەمدا هەموو پێغەمبەرانی بە کیتابی تایبەتی و نامەی قەزای خوداوەندی خۆی خەڵات کردووەو، لە پلەی دووەمدا بە دەستووری تەوانایی ئەو جیهان ڕام کراوە.

خوا جیسم و جەوهەری مادیی نییە، عەرەز و سیفاتی عادەتیی نییە، زاتی پیرۆزی ئەو سوورەتی نییە، چونکە ئەو وەکو باقیی مەوجووداتی عالەمی نییەو هیچ مەوجوودێ هاوێنەو مانەندی ئەو نییە، چونکە ئەگەر مەوجوودێ ببێ وەکو ئەو بێ پێویستە پەروەردگار بێ، دیارە غەیری خواش کەس پەروەردگار نییەو، زاتی پایە بەرزی ئەو لە ئەندازەو جیهەت و جەوانیب دوورەو، زاتی ئەو لە هیچ شوێنێکدا جێگیر نییە..

قسەی «مجسمە» نەزانەکان کە دەڵێن خودا لە سەر عەرشە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا موحتاجی عەرش بێ، کەچی خوای گەورە نە موحتاجی عەرشە و نە پێویستی بە فەرشە؛ عەرش و فەرش شتێکی حادیس و پەیدابوون، واتە قەدیم نین و لەپاش نەبوون خوا دروستی کردوون، جا ئەگەر خوا موحتاجی عەرش بێ. ئاخۆ لە پێش خەلقی عەرشدا لە چ جێگایەکدا بوویێت « معاذ الله».

خودا زاتێکی قەدیمەو لە پێش عەرش و فەرشدا و لەپێش جیهانی بەرز و نەویدا بووەو، پێویستی بە شوێن نەبووەو، ئیستە وەك ئەوسا هەیەو بێ ئیحتیاجەو، هەر شتێك لە هەر شوێنێکدا ببێ عیلمی خوای گەورە دەیگرێتەوەو، شتێك لە کائیندا نییە، چ دیاری و چ پەنهان کە پەیوەندیی بە خواوە نەبێ ، بەبێ خواست و تەواناییی ئەو یەك ئان دەوام بکا.

پوختەی قسە ئەوەیە: خوای گەورە لەوە دوورە کە لە شوێنێکدا سەقامگیر ببێ و دابمەزرێ، دوورە لە نزیکی و دووری و بەرزی و نزمی و عەوارز وەك چوون، نەمان، گوێزانەوە لە شوێنێك بۆ شوێنێ، ئەمانە هەموویان لە سیفاتی مەوجووداتی حادیس و لە نیشانەکانی مومکیناتن و، (واجب الوجود) لەمانە بەری و پاکە.

عەرش و هەرچی لە ژێر عەرشدایە شتێکی ڕام و موسەخەرن بۆ قودرەت وتوانای خوا، ئەوەش لە ژۆر عەرشەوەیە بێجگە بە شێوەی نەبوون بە ئێمە تەسەوور ناکرێ.

ئاشکرایە کە (واجب الوجود) بووەو هەیە و دەمێنێ و، خاوەنی سیفاتی کەماڵەو، لە سیفەتە شوورەییەکانی کەمووکوڕی دوورەو، زات و سیفاتی خودا نیهایەتیان نییە.

ئێمە داوای ئەوەمان لێ نەکراوە کە بیربکەینەوە لە خوا، چونکە زات و سیفاتی خوا سنووریان نییەو ئەندازەیان نییەو، عەقڵ و تێگەیشتنی ئێمە ئەندازەیەکی تایبەتی هەیە و سنووردارە، دیارە توانای ئەندازەدار و سنووردار ناگات بە شتی بێ ئەندازە و بێ سنووردا. ئەوەندە بزانن کە ئەم ئاسمان و ئەستێرە و مانگ و ڕۆژە درەخشانانەو، ئەم دەریا و زەوی و کەژ و کێوانەو، ئەم دار و درەخت و گوڵ و گیا جوانە جۆراوجۆرانە هەموویان بەڵگەن لەسەر بوون و تەواو و بێ خەوشیی زاتی خودای (واجب الوجود)

لا اله الا هو الحي القيوم.

خوای گەورە خۆی دەتوانێ بەندەکانی خۆی بە خۆی ئاشنا بکا، ڕێگای ئەم ئاشنایەتییەش دووانە.

یەکەم: فەیزی قودسی خۆی بە بێ پەیوەندیی عەبد کە میهرەبانی نووری ئاشنایی بخاتە نێو دڵی ئێمەوە، تا قەناعەت پەیدابکەین و خوای گەورە و پاك و بێ خەوش بناسین.

دووەم: بەردەوام ئیتاعەت و خواپەرستی و بەجێهێنانی ڕەوشتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کە دەبێتە هۆی ناسینی خوا «واعبد ربك حتى يأتيك اليقين».

پێغەمبەران (د.خ)و زانا ئاینییە بەرزەکان و دۆستەکانی خوا هەریەك بەقەدەر ئەندازەی میهرەبانی و عینایەتی خوایی لە خواناسین بەشیان هەیە..

پێویستە مرۆڤ بەقەدەر حاڵ خەریکی یادی خوا بێ بەدەم و دڵ «الا بذکر الله تطمئن القلوب» هەروەها پێویستە مرۆڤ لە خواپەرستی و کاری مایەی ڕەزامەندیی خوادا هەوڵ بدا و کۆشش بکا، تا خوا شارەزای بکات و ڕێگای پێشان بدا.. «وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ».

پێویستە بەقەدەر توانا، مرۆڤ بە دڵ و بە خۆشەویستی هاوڕێیەتیی ڕاستان و پیاوچاکان بکا؛ هەتا بە هۆی پیرۆزیی دەروون و ڕەوشتی ئەوانەوە دڵی نوورانی و ڕووناك بێتەوە، ڕێگەی بەختیاریی خۆی بگرێ
«يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ ».

پێویستە موسڵمان باوەڕی وا بێ هەرچی جۆری ئازار و ئێش و ترس و خەفەت و نەبوونی و دەردەداری و داماوی و گرفتاری بەسەر جیهاندا بێ بە عەدالەتی بزانێ لە خواوە، چونکە هەموو ئەمانە نیسبەت بە خوا کارکردنە لە موڵکی خۆیداو، خاوەن موڵك دەتوانێ بەهەموو جۆرێ دەسکاریی لە موڵکی خۆیدا بکا.

ئەم بیروباوەڕە نیسبەت بە کاری خوایە، واتە: مرۆڤی هۆشیار پێویستە بەرامبەر بە کرداری پەروەردگار بە ئەدەب بێ و لە ڕێگا لانەدا، بەڵام بەش بە حاڵی خۆی خوا فەرمانی پێ داوە کە بە هەموو جۆرو ڕێگایەکی ڕەواو شەرعی تێ بکۆشێ بۆ ڕزگاربوون لەو مەینەتانە، بە کردەوەی خۆی، بە داوێن گرتنی خاوەن هێزی پەنادار، بە دەرمان وەرگرتن لە دوکتۆر، بە سەدەقە و خێرکردن، بە دوعاو پاڕانەوەی موسڵمانان، بە دوعاو لاڵەو پاڵەی خۆی؛ چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:

«أن الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بانفسهم» واتە: خوای گەورە سەر لە کۆمەڵێك تێك نادا ئەگەر ئەوان خۆیان سەر لە خۆیان تێك نەدەن و باری خۆیان نەگۆڕن.

لەلایەکی تریشەوە بە پێی ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) هەر دەرد و ئازارێ، کەم و زۆر، تووشی مرۆڤ ببێ دەبێتە هۆی داوەرینی تاوان و گوناه و دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پایەی لە ڕۆژی جەزادا..

هەروەها پێویستە مرۆڤی موسڵمان بیروباوەڕی وا بێ هەرچی ناز و نیعمەتە و ماڵ

و منداڵ و سامان هەیە و هەرچی هۆی کامەرانی و بەختیاری بێ، کە خوای گەورە بۆی ئامادە بکا، هەمووی فەزل و ئیحسان و ڕەحمەتەو..، لەبەر شایانی و چاکەی زاتی مرۆڤەکە خۆی نییە، ئەگەرنا دەبووا داماو هەر داماو بووایەو، پایەدار هەر پایەدار بووایە هەتا هەتایە، کەچی گۆڕانی حاڵی هەردوولایان لە پێش چاوماندا دیارییە .

پێویستە بیروباوەڕی موسڵمان وا بێ کە هەرچی لە جیهاندا ڕوودەدا لە خێر و لە شەڕ، لە سوود و لە زیان، لە بەرزی و نزمی و غەیری ئەمانە هەمووی بە بڕیارو قودرەتی خوایەو غەیری خوا کەس خاوەن تەئسیر نییە لە هیچ شتێکدا و، هەمووی سەر بەخواست و توانای خوای گەورەیە «لا مرد لقضائه ولا تبديل لكلماته».

پێویستە بیروباوەڕی موسڵمان وا بێت کە خودای گەورە هەمووشتێ دەزانێت و، بە سەر هەموو مومکنێکدا توانای هەیە و، هیچ مانعێك نییە بۆ عیلم و ئیرادە و قودرەتی خوای گەورە.

پێویستە بیروباوەڕی موسڵمان وا بێ هەرچی خوای گەورە لە سەر زمانی پێغەمبەران بە ئێمەی گەیاندووە، لە بەڵێن بەخێرو هەڕەشە بە ئازارو هەرچی بەیانیان کردووە لە حەرام و حەڵاڵ و ئەحکام و فەرمانەکانی ترو، هەرچییان فەرمووە لە ئاکامی مرۆڤ بەرامبەر کردەوەی بەد و پاداشتی باش بەرامبەر کردەوەی خراپ و، هەرچییان نیشان داوە دەربارەی نەمانی دنیاو هاتنی ڕۆژی قیامەت و زیندووکردنەوەی مردوو لە گۆڕداو، ناردنی بۆ مەحشەر و حیساب و کیتاب و میزانی کردەوەی خێر و شەڕو پردی سیرات و، ناردنی تاوانباران بۆ دۆزەخ و ناردنی بەختیاران بۆ بەهەشت هەمووی ڕاستن و دێنە جێ بێ کەموزیاد.

هەروەها ئەوەی بەیان کراوە لە شەفاعەت و تکاکاریی حەزرەتی (محمد المصطفى) لە ڕۆژی قیامەت و، تکاکاریی پێغەمبەرانی تر و پیاوچاکان هەمووی ڕاستەو، پێویستە باوەڕمان وا بێ لە پێش هەموو کەسێکدا پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی (محمد المصطفى) ڕێگای دەدرێ لە لایەنی خودای گەورەوە بۆ تکاکاری و، لە پاش ئەو پێغەمبەرەکانی تر ئەنجا دۆستانی خوا و شەهیدان و زانایانی ئاین و پیاوچاکان تکا دەکەن بۆ باقیی موسڵمانان.

پێویستە باوەڕمان وا بێت کە هەموو موسڵمانان لە بەهەشتدا بە حوزووری خوا دەگەن و بە جۆرە بینینێك کە شایستەی پایەی خوا بێت چاویان بە بینینی ڕوون دەبێتەوە،

«وجوه يومئذ ناضرة إلى ربها ناظرة». واته: گەلێك موسڵمان لە بەهەشتداو لە ڕۆژی قیامەتدا شادمانن و بۆ خوا گەورەترن و دەڕوانن و ڕوویان گەش و درەوشاوەیە، هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ:

«أنكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر» واتە: بەڕاستی لە پاشەڕۆژدا ئێوە خوای خۆتان دەبینن، وەکو چۆن مانگ لە شەوی چواردەدا دەبینن.

پێویستە باوەڕمان وا بێ کە پێغەمبەرانی خوا لە هەموو مەخلووقاتی خوا گەورەترن و، لە نێو پێغەمبەراندا ئەوانەیان کە بۆ گەیاندنی فەرمانی، خوا ڕەوانە کراون، کە لە عورفدا پێیان دەڵێن «رسول» یانی فرستادەو پەیغامبەر لەوانی تر گەورەترن و، ژمارەی ئەمانە لە سەر قورئان و حەدیسی پێغەمبەر(د.خ) سێسەد و چواردەن، لەناو ئەمانەدا (اولو العزم)ەکان، کە پێنج کەسن: نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، محمد المصطفى (صلوات الله وسلامه عليهم) لەوانی تر گەورەترن و، حەزرەتی (محمدا لمصطفى)- د.خ- لە هەموو پێغەمبەران گەورەترەو، ئەم زاتە خاتەم و دوایی هەموو پێغەمبەرانەو، لەپاش ئەو پێغەمبەری تر نابێ و، ئاینی ئەو ناسیخ و هەڵوەشێنەوەی ئاینە پێشووەکانە...

بەڵێ حەزرەتی (محمد المصطفى) ئەگەر چی لە جیهانی ماددەدا دوای پێغەمبەرەکانی تر هاتووە، بەڵام لە جیهانی گیان (ڕۆح)دا ڕۆحی پیرۆزی ئەو لە پێش دروستکردنی هەموو ڕۆحەکاندا دروست کراوەو خەڵاتی پێغەمبەری پێ دراوە، وەکو فەرموویەتی:

«كنت نبياً وآدم بين الروح والجسد».

پێویستە باوەڕمان وا بێ کە ئوممەتی حەزرەتی محەمەد (د.خ) لە ئوممەتی پێغەمبەرەکانی تر گەورەترە؛ وەکو خوای گەورە دەفەرموێ:

«كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن النمكر وتؤمنون بالله».

لەنێو ئوممەتەکەی پێغەمبەردا (د.خ) یارەکانی واتە: (اصحاب). پایە بەرزەکانی لە موسڵمانەکانی تر گەورەترن، بەڵکو بێجگە پێغەمبەرەکان لە هەموو ئەفرادی ئوممەتەکانی تر گەورەترن.

لەنێو یارانی پێغەمبەردا «خلفای ڕاشدین» ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی (ر.خ) و پاش ئەمانە هەمزە و عەباس، ئەنجا حەسەن و حسێن و، سەعد و سەعید و تەلحە و زوبێر و ئەبو عوبەیدە و عەبدورحمان کوڕی عەوف لە یاوەرانی تری پێغەمبەر(د.خ)

گەورەترن، لەپاش ئەمانە یارانی غەزای بەدر کە سێسەد و چواردە کەس بوون، پاش ئەوانیش یارانی غەزای ئوحودو، پاش ئەوان یارانی (بیعة الرضوان) ئەوانەی کە لەژێر دارەکەدا پەیمانی فیداکارییان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست لە یارەکانی تری پێغەمبەر گەورەترن.

ئەم ئەندازەیە کە باس کرا پێویستە موسڵمان بیزانێ و، خەڵکی هەرەمەش پێویستە بچنە لای زاناکانی ئاین بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕو بۆ فێربوونی ئەحکامی کردو کاری موسڵمانان.

ئەی برایان! لەسەرتان پێویستە گوێ بۆ ئەم نامەی بیروباوەڕەو نامەکانی تریش ڕایەڵ بکەن و، بیستنی ئەم نامانە نیشانەی بەهێزیی باوەڕە، چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە: گەورەترین خووڕەوشتی جوانی موسڵمان ئەوەیە کە لە وەرگرتنی ئەحکامی ئاین بێزار نەبێ، واتە : مەیلی وەهابێ کە لە هەموو کاتێکدا بەپێی توانا گوێ بۆ زانایانی ئاین ڕابگرێ و ئامۆژگارییان وەربگرێ.

ئەی برادەران! هەر کەس ئەم ئەندازە کەمە لە ئاین نەزانێ ئیمانی لە زیاندا دەبێ؛ لە قورئانی پیرۆزدا هەرچەند باسی ئیمان کراوە باسی کردەوەی چاك کراوە، بێجگە لە تاقە شوێنێ.. حیکمەتی ئەم تاقە شوێنەش ئەوەیە ئەو کەسانە کە کرداری چاکەیان نییە لە بەزەیی خودا ناهومێد نەبن؛ چونکە تەنیا ئیمان بەسە بۆ ڕزگاربوون لە سزای هەتا هەتایی دۆزەخ... بەڵام ئەگەر لەگەڵ ئیماندا کردەوە و ڕەفتاری باش هەبێ ئەوا ئەو کەسە لە بەزەیی و میهرەبانیی خوای گەورەوە نزیك دەبێ.

کرداری چاکە چەشن و جۆری زۆرەو، حەزرەت (د.خ) لە فەرموودەیەکدا باسی ئەوانەی کردووەو فەرموویەتی: ئیمان حەفتا و ئەوەندە لقە، لە نامەی فێرکردنی منداڵاندا ئەو لقانە باس کراون.

دیارە ئەو کردارانە کە داوا لە موسڵمان دەکرێ جێبەجێیان بکا بریتین لە واجیبات و مەندووبات یا دوورکەوتنەوە لە حەرام و مەکرووهـ بەشی زۆری ئەمانە لە هەشتاو ئەوەندە نامەدا عەرزی برادەرانم کردووەو عەرزیان دەکەم و، ئەوەی لە گەردنمدایە جێبەجێی دەکەم، کەوابێ پێویستە لەسەر برادەرانی زانا و خوێندەوار، بە خوێندنەوەو بە خەڵکی گەیاندنیان، خۆیان ڕزگار بکەن و، واجبی موسڵمانە نەخوێندەوارەکانیش ئەوەیە ڕەفتاریان پێ بکەن. (السلام على من اتبع الهدى واجتنب الردى و على المتعلمين و العاملين).

## نامەی پێنجەم

# نامەی دەسنوێژ و خۆشۆردن و مەرج و ڕوکنی نوێژ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين * والصلاة والسلام على سيدنا محمد خاتم النبيين، وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين لهم بالحسان إلى يوم الدين.

لە پاش ئەمە ئەی خۆشەویستم! شێخی «ابن حجر» فەرموویەتی: هەرکەسێ ئادابی دەسنوێژ گرتن و خۆشۆردن و نوێژ فێر نەبێ، ئەگەر هات و نوێژێکی کرد کە بە دیمەن هەموو ئادابی نوێژەکەی تیا بوو ئەوا نوێژەکەی دروست نییە، لەبەرئەوە کە فەرق ناکا لە بەینی فەرز و سوننەتداو، وا دەبێ سوننەت بە فەرز دەزانێ و، فەرز بە سوننەت[1] بگرە عیبادەتەکانی تریش هەر وایەو، فەرق زانین لە بەینی فەرز و سوننەتدا لە مەرجەکانی دروستی هەموو خوداپەرستییەکە.

لە سەر ئەم بناخەیە هەر کەسێ فێری ئەم ئادابە نەبێت و، فەرقی فەرز و سوننەت دەخات تاوانبارەو، ئەو کەسەیش کە ئەو ئادابانە دەزانێ ونەزانەکان فێرناکا بە نەسسی قورئان و حەدیس مەلعوونە، وەکو ئەو ئایەتەی کە لە ئاخریەوە دەفەرمووێ: [أُولَـٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ] البقرة ٥٩

جا وا من بە کورتی نامەیەکتان بۆ دەنووسم و چۆنییەتیی دەسنوێژ و خۆشۆردن و ئەوانەی ئەم دووانە پووچ دەکاتەوە بۆتان ڕوون دەکەمەوە، هەروەها ئادابی نوێژ و ڕۆژوو، زەکات و حەج، هەریەکێك لە نامەیەکی تایبەتیدا دەنووسم و، هیوام وایە کە

(١) ئەمە فەرموودەی «ابن حجر»ەو، شێخ محەمەدی ڕەمەلیش ئەم مەبەستەی گەیاندووە. بەڵام ئیمامی غەزالی لای وایە ئەو شەخسە نوێژەکەی دروستە مادام فەرزێکی دیاری بە سوننەت نەزانێ.

زاناکان بۆتان بخوێننەوەو، تکاکارم کە ئەم نامەیەش بخوێننەوە و باش حاڵیتان بکەن و، وردە وردە بە قەدەر توانای (عوام الناس) فێرتان بکەن و، تکام وایە کە زاناکان زۆر میهرەبانی لەگەڵ موسڵمانانداا بکەن و، لە ئاین نزیکیان بخەنەوەو فێریان بکەن.

تکایان لێ دەکەم کە نەفەرموون: ئێمە خۆمان زانای ئەحکامین و پێویستیمان بەم نامانە نییە؛ چونکە لەم نامانەدا ئەحکامەکان بە شێوەیەکی ئاسان کۆکراونەتەوە و لە بەردەستیان دان و پێویستییان بەوە نابێ کە بگەڕێنەوە بۆ سەر کتێبەکان...

جا لە پێشدا پێویستە ئاوی پاك و پیسیان بۆ جیابکەنەوەو، چۆنییەتیی (استنجاء) واتە خۆپاك کردنەوەیان حاڵی بکەن.

پێویستە ئەوە بزانن کە لە ئاوی ڕاوەستاودا ئەندازەی کەموزۆر هەیە، زۆرەکەی «قلتین»ە کە لای کەمی دەبێ بەقەدەر گەزێك و بستێ درێژ و پان و قووڵ بێت بە گەزی مرۆڤی مام ناوەندی، گەزی مرۆڤ لە سەر پەنجەی بەرزی دەستییەوەیە هەتا دواییی ئەنیشکی، دیارە مەرجی بەکەڵك هاتنی ئەم قلتینە، بۆ دەسنوێژ و خۆشۆردن، ئەوەتە کە نە ڕەنگ، نە بۆن نە تامی، بەهۆی تێکەوتن یا تێکەڵ بوونی شتێکی پاك یا پیس، نەگۆڕابێ.

ئاوێ ڕاوەستاو، چ دوو قوللە بێ یا زیاتر یا کەمتر، ئەگەر ڕەنگی یا تامی یا بۆنی گۆڕابوو بە کەڵکی دەسنوێژو خۆشۆردن نایەت، نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەگەر بە تێکەڵ بوونی شتێکی پیس گۆڕابوو بێجگە لەوە کە بە کەڵکی دەستنوێژ و خۆشۆردن نایەت، لە هەر شتێکیش بکەوێ پیسی دەکا چ لەش چ بەرگ چ پۆشاك و شتی تر... تەماشاکەن لە هەندێ دێهاتدا ئەوەندە گەڵا شێلم و شتی تر دەخەنە نێو حەوزی مزگەوتەوە ئاوەکەی تام و ڕەنگ و بۆی یا هەندێ لەمانەی دەگۆڕێ، کەچی بۆ دەسنوێژو خۆشۆردن بەکاری دێنن و، نازانن کە ئەم جۆرە ئاوە هەرگیز بۆ لا بردنی بێ دەستنوێژی و لەش پیسی بەکارنایەت. بگرە ئەگەر لەگەڵ ئەو مادانە کە دەکەونە نێو حەوزەکەوە شتی پیس هەبوو، ئەوە حەوزەکە پیس دەبێ و، لەش و جلوبەرگی خۆشۆرەکەش پیس دەکات و، هەرچی نوێژیکات هەمووی بەتاڵە..

ئەندازەی کەم لە ئاوی ڕاوەستاو کە ئاوێکە لە دوو قوللە کەمتر بێ، هەر کاتێ لە پاش نییەتی دەستنوێژ دەستی تێ خست ئیتر ئەو ئاوە بۆ لابردنی بێ دەستنوێژێ یا لەش پیسی بە کارنایەت و، ئەگەر شتێکی پیسی تێ کەوت پیس دەبێ،چ بگۆڕێ و چ نەگۆڕێ.. تەنانەت ئەم ئاوە کەمە بە یەك پشقڵ و کەمتریش پیس دەبێ و، لە هەر شوێنێ بکەوێ پیسی دەکات...

ئاوی جاری، واتە: ئەو ئاوەی لەبەری بڕوات و ڕانەوەستێ هەمان حوکمی ئاوی ڕاوەستاوی هەیە، واتە: ئاوی جاری کە مابەینی ئەم بەر و ئەویەری جۆگەکە دوو قوللە ئاو بێ، ئەوە بۆ دەستنوێژ و خۆشۆردن ، یانی بۆ لابردنی بێ دەستنوێژی و لەش پیسی بەکەڵك دێ، بەو مەرجەی تام و ڕەنگ و بۆی نەگۆڕێ، خۆ ئەگەر هات و بە شتی پیس گۆڕا وەکو پەیناو لە جۆگەدا، ئەوە هەمووی پیس دەبێ..

بەڵام ئەگەر مابەینی ئەم بەرو ئەویەری ئەوەندەی دوو قوللەی تێدا نەبوو ئەوە لای ژووروی ئاوەکە، یانی بەرەو لای سەرچاوەکەیەوە، پیس نابێ، بەڵام ئەو شوێنەی کە پیسییەکەی تێ کەوتووە پیس دەبێ و، هەرچی لە خواری ئەویشەوە بێ هەر پیسە، سا مەگەر وا ڕێك بکەوێ لە شوێنێکدا جۆگەکە قووڵ بووبێ و دوو قوللە ئاوی تیادا کۆبووبێتەوە بە بێ گۆڕانی تام یا بۆن یا ڕەنگ.

لەم جۆرە ئاوانەدا چار ئەوەیە کە مرۆڤ بەری ئاوەکە بگرێ هەتا پەنگ بخواتەوەو، ئەندازەی دوو قوللەی تێدا کۆبێتەوە، ئەگەرنا هەرکەس ئەو ئاوە بە کاربێنێ، بێجگە لەوە کە بۆ دەستنوێژ و خۆشۆردن سوودی نییە لەش و جلوبەرگی کابراش پیس دەکا. بەڵام ئەگەر ئاو بە شتێکی پاك گۆڕا، وەکو حەوزێ کە بەرچینەو سەبەتەی میوەی تێدەخەن هەتا بخووسێتەوە ئەوە زیانی نییە بۆ بەکارهێنانی لە دەستنوێژ و خۆشۆردندا ، مەگەر گۆڕانەکەی ئەوەندە زۆر بێ کە ئاوی حەوزەکە لەوە بکەوێ پێی بوترێ ئاوی موتڵەق، لەم حاڵەتدا هەر پاکە، بەڵام پاکەوەکەر نییە... پێویستە ئەوەش بزانین لەو کاتەدا کە ئاوەکە زۆر گۆڕابێ ئەگەر کەمێك پیسیی تێ بکەوێ ئەو ئاوە پیس دەبێ. زوربەی هۆی پیس بوونی ئەم حەوزانە ئەوەیە کە بەهۆی سەبەتەو بەرچینەوە زۆر دەگۆڕێ، بێجگە لەوەش لەو شوێنانە کە ئەدەبخانەی تایبەتی نییە، هەندێ کەس لە قەراخی حەوزەکاندا تارەت دەگرن، لەمەوە شتی پیس دەکەوێتە نێو حەوزەکەوەو دەگۆڕێ و بەو ماددە پیسە پیس دەبێت و، دەبێتە هۆی پیسبوونی لەش و بەرگ و پۆشاك.

ئەمجا پاش ئەوەی کە ئاوی پاك و پاك کەرەوەتان ناسی و، ئاوی پاکی پاك نەکەرەوەشتان ناسی و، زانیشتان ئاوی پیس کامەیە، پێویستە چۆنیەتیی تارەت گرتن و خۆپاك کردنەوەش لە پیسییەکانی پاش و پێش تێ بگەن؛ چونکە حەزرەت (د.خ) دەربارەی دوو مردوو کە دای بەلای گۆڕەکەیاندا فەرمووی: ئەم دووانە سزا دەدرێن لەبەر دوو شت: یەکەم گوێ نەدان بە میز و پیس بوونی لەش و بەرگ و پۆشاك. دووەم نەمیمە

واتە: قسەی خراپ هێنان و بردن لە نێو خەڵکدا، یا لە پاش ملە بەخراپە و سیفەتی ناشیرین ناوی خەڵك ببرێ!

کەوابێ پێویستە لە پاش میزکردن مرۆڤ بە ئاسپایی دەس بە عەورەتیدا بهێنێ، تا هەرچی تەڕی و پاش میز هەیە بێتە دەر، ئەگەر وەها نەکات پاش هەستان و هەنگاونان لێی دێتە خوارەوەو لەش و بەرگی پیس دەکا و، ئەگەر دەستنوێژی گرت، ئەنجا هاتە خوار دەستنوێژەکەی دەشکێ و بەرگ و بەدەنیشی پیس دەبێ.

پێویستە پاشی خۆی ئەوەندە باش بشۆرێ دڵنیا بێ کە بە هیچ جۆر ڕەنگ و بۆنی پیس نە بە لەشیەوە و نە بە دەستییەوە نەمابێ؛ چونکە مرۆڤ بە دەستی چەپی خۆی دەشوا و بە دەستی ڕاستی ئاو دەکات بە شوێنی پیسییەکەداو، تا ئەو شوێنەی پاك نەبێتەوە بۆنی دەستی ناخۆش دەبێ، بەڵام کە پاك بوویەوە ئیتر بۆنی ئیعتیادی دەبێ.

پێویستە لە کاتی تارەتدا هەرچی مادەی پیسییە دەرچێ، پێویستە ئاو بە هەموو دەوراندەوری عەورەتیدا بگات، ئەم دەوراندەورە حوکمی زاهیری هەیە شۆرینی واجیبە، ئەگەر نەشۆردرێ بە پیسی دەمێنێتەوەو کاتێ لیباسەکەی لێ کەوت پیس دەبێ و، دەبێتە هۆی بەتاڵبوونی هەموو ئەو نوێژانە کە لەوەپاش دەیکا، بێگومان پارێز لەم جۆرە پیسییە شتێکی زۆر پێویستە، بەڵام کاتێ بەو شێوەی باسمان کرد خۆی پاك کردەوە خوای گەورە چاوپۆشی لە تاوانەکانی دەکا و، فریشتەیەکیش دیاری دەکا کە دوعاو نزای خەیری بۆ بکا.

جا ئەگەر ئاو نەبوو کە عەورەتی بشۆرێ، یاخود مەیلی بەکارهێنانی ئاوی نەبوو، پێویستە بە شتێکی زبری پاك وەك بەرد، پارچە دار و هاوچەشنی ئەمانە، خۆی پاك بکاتەوە.. بۆ نموونە سەری زەکەری بەو بەردە پاك بکاتەوە، بەو مەرجەی دووجار سەری زەکەری نەهێنێ بە یەك شوێنی تایبەتی بەردەکەدا، بەڵکو هەرجارێ بە شوێنێکی تایبەتی بەردەکەیدا بهێنێ، چونکە بە جاری یەکەم ئەو شوێنە پیس دەبێت و کەڵکی جارێکی تری پێوە نییە.

لە پاك کردنەوەی پاشدا پێویستە هەرجارێ تەنیشتێکی بەردەکە بەکاربهێنێ بۆ لابردنی پیسییەکە هەتا بە تەواوی پاکی دەکاتەوە.. لە دواییدا قەی ناکات ئەگەر سووچێکی پاکی بەردەکە بەسەر هەموو عەورەتیدا بهێنێ.. بەهەر حاڵ پێویستە بەرد پیاهێنانەکە لە سێ جار کەمتر نەبێ.. خۆ ئەگەر بە سێ جار پاك نەبوویەوە ئەوا زیاتری بکا تا شوێنەکە بەتەواوی پاك دەبێتەوە..

پێویسته مرۆی موسڵمانی باڵغی عاقڵ، جۆرەکانی پیسی بزانیّ و ئاگادار بیّ لەو ـیسییەی عەفووی لیّ دراوەو، لەو پیسییە عەفووی لیّ نەدراوەو، چۆنییەیی پاك بوونەوە ـەو پیسییانە بزانیّ.

پێویسته ئەوە بزانن هەرشتێك لە پێش و پاشی ئادەمیزادو گیانلەبەران دەردەچیّ هەمووی پیسە، چ هی گیانلەبەریّ کە گۆشتی بخوریّ و، چ هی ئەوەی گۆشتی ناخورێت، هەروەها خوێن و کێم و ڕشانەوە هەموو پیس (نجس العين)ن، واتە: مادەکەیان پیسەو ـە هەرشتیّ بکەون پیسی دەکەن، بەلاّم خوێن و کێمی کەم لە لەشی مرۆڤدا و لە شوێنی خۆیاندا عەفوویان لیّ دراوە، هەروەها جل و بەرگی عاستی ئەو خوێن و کێمە کە بەهۆی ئەوانەوە تەڕ دەبیّ عەفووی لیّ دراوە. خوێنی برین و دمەڵ با زۆریش بیّ، عەفووی لیّ دراوە، ئەگەر بە دەستی ئەو برینە نەگووشیّ و نەیخورێنیّ، ئەگینا لە کەمی عەفوو دەدریّ نەك لە زۆری، هەروەها ئەو دەرمان و مەڵهەمانە کە دەنرێنە سەر برین و دمەڵ، بەقەدەر پێویست عەفوویان لیّ دراوە.

کەموزۆریی ڕیشانەوە، چ گۆڕا بیّ و چ نەگۆڕابیّ، مادام لە ناوەوە بێتە دەرەوە هەمووی پیسە و عەفووی لیّ نادریّ و پێویسته بشۆردریّ، مەگەر ڕیشانەوەی منداڵ بەسەر بەرگ و پۆشاکی دایکیدا، ئەوە لەبەر ناچاری لە کەمی عەفوو دەدریّ. شایانی زانینە هەموو مردارەوە بوویەك، لە گیانداری پاك وەك بزن و مەڕ، یا گیانداری پیس وەك سەگ و بەراز، هەموو پیسەو بە (نجس العين) دەدرێتە قەڵەم، بێجگە ئادەمیزاد و ماسی و کوللە؛ ئەمانە بە هۆی مردنەوە پیس نابن و بە پاك دەناسرێن، تەنانەت مرۆی کافریش.. بەلاّم ئەگەر ماسی خوێنی هەبوو ئەوە ئەو خوێنە عەفووی لیّ نادریّ و، ئەگەر دای لە لەش و پۆشاك پێویسته بشۆردریّ.

مردووی ئەو گیانلەبەرانە کە خوێنی ڕەوانیان نەبیّ، ئەگەرچی بە پیس دەژمێررێن، کە بکەونە ناو ئاو یا چێشت یا چایی عەفوویان لیّ دەدریّ، جا ئەگەر بە کەوچکەچایی یا بە پەنجە ئەو مردووە لە ناو چێشت و ئاوەکە هێنرایە دەرەوەو، پاش ئەوە کەوچکەکە یا پەنجەکە خرایەوە نێویان پیسی ناکات و عەفووی لیّ دەدریّ، وەکو شێخی (ابن حجر) لە توحفەدا لە سەرەتای کیتابی تەهارەتەوە باسی کردووە، هەروەها خوێنی کێچ و ئەسپیّ لە لەش و بەرگی مرۆڤدا ، کەم بیّ یا زۆر، عەفووی لیّ دەدریّ، بەلاّم پێستەکانیان پیسن و گەر لە پۆشاکدا بمێننەوە، نوێژ بە تاڵ دەکەنەوەو، ئەگەر بکەونە نێو ئاوی لە قوللەتەین کەمتر پیسی دەکەن. شایانی باسە: بێجگە خوری و موو و پەڕ، کە لە کاتی زیندوویدا لە

حەیوانێ گۆشتی بخورێ جیا بکرێتەوە، هەرچی لە گیانلەبەر جیا بکرێتەوە پیسە، چ لە کاتی زیندوویەتیداو، چ لە پاش مردنی.

جا کاتێك لەش یا بەرگی مرۆ پیس بوو، ئەگەر ئەو پیسبوونەی بە هۆی سەگ و بەرازەوە بوو، ئەوە پێویستە حەوت جار بشۆردرێ و، جارێکیان بە ئاوێ کە لەگەڵ گڵێکی پاك تێکەڵ کرابێ بە جۆرێ کە ڕەنگی گۆڕابێ، یا خو ئاوەکە بە هۆی لافاو یا بە هۆی ئەو شوێنەی کە پێدا دەڕوات سوور بووبێ و بووبێتە قوڕاو، بەڵام جارەکانی تر دەبێ بە ئاوێکی پاکی ڕووناك بێ. ئەگەر شتێکی تر بە ئاوی گڵاوی دەرکردنەکە تەڕ بوو، تێ دەفکرین: ئەگەر تەڕبوونەکە لە پاش جاری بە کارهێنانی لێڵاوەکە بوو ئیتر شتەکەی تر کە تەڕ بووە لێڵاوی ئاوێ و تەنیا ئاوە پاکەکانی تر بەسە و، ئەگەر لە جاری سێیەمدا بوو، پێنج ئاوی پێویستەو، ئەگەر لە جاری چوارەمدا بوو چوار ئاوی پێویستەو، ئەگەر لە جاری پێنجەمدا بوو سێ ئاوی دەوێ و، ئەگەر لە جاری شەشەمدا بوو دوو ئاوی پێویستە و، ئەگەر لە ئاوی حەوتەمدا بوو تەنیا ئاوێکی دەوێ.

هەروەها ئەگەر نێچیر بە دانی سەگ بریندار بووو، لە پاشاندا نێچیرەکە بە شێوەیەکی شەرعی سەربڕا، یا خۆ سەگەکە فێرکراو بوو و نێچیرەکە لە بەردەستیدا گیانی دەرچوو، ئەوا پێویستە ئەو نێچیرە گڵاویی دەربکرێ: جارێ بە گڵاو و شەش جار بە ئاوی ڕووناك بشۆردرێ و، پێویستە باش تەماشای جێگەی دانی سەگەکە بکرێ و هەر خوێنێ لەو شوێن دانەدا وشك بووەتەوە هەمووی پاك بکرێتەوەو، ئەنجا گڵاویی دەربکرێ، چونکە هەتا ئەو خوێنە وشکە لە شوێنی خۆیدا مابێ گڵاویی دەرکردنی سوودی نابێ و بە شەرعی پاك نابێتەوە..

بەڵام ئەگەر پیسبوون بە هۆی غەیری سەگ و بەرازەوە بوو، ئەوا لێی ورد دەبینەوە: ئەگەر پیسییەکە مایەدار بوو، وەکو شیاکەی حەیوان، ئەوا پێویستە ئەو مادەیە لەو شوێنەدا لابرێ بە جۆرێ نە ڕەنگی نە بێنی نەمێنێ، بەڵێ ئەگەر لاچوونی ڕەنگەکەی زەحمەت بوو و شوێنەکەی بواردبوو، ئەوە قەی ناکاو مانەوەی ئەو ڕەنگە بە تەنیا ڕێگا لە پاکبوونەوەی شوێنەکە ناگرێ.. بەڵام ئەگەر پیسییەکە مایەدار نەبوو، ئەوا بۆ پاکبوونەوەی بەسە تەنیا یەك جار ئاوی پاکی بەسەردا جاری بێ.

بەڵێ شوێنێ کە بە میزی منداڵی نێرینە پیس بووبێ ، کە بێجگە شیری دایك هیچی نەخواردبێ، ئەوە تەنیا ئاو لێ پرژان بەسە بۆی و، پێویست نییە ئاو بە سەریا ڕەوان ببێ.

ـجا بزانن فەرزەكانی دەستنوێژ شەشن:

یەكەم: نیەتی لا بردنی بێ دەستنوێژی، بە جۆرێك كە لەگەڵ شۆرینی هەندێ لە ڕوودا بكەونە یەك .. ئەم نیەتە بۆ یەكێكە تووشی نەخۆشیی میزە چركە و با لێ دەرچوون و خوێن بەربوون نەبووبێ؛ ئەمانە نابێ نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی بهێنن؛ چونكە بێدەستنوێژییەكەیان لاناچێ، بەڵكو دەبێ نییەتی حەڵاڵبوونی نوێژ بهێنن، جا ئەگەر لە پێشدا نییەتی هێناو لە كاتی شۆرینی دەم و چاودا نییەتەكەی لە دڵدا نەمابوو، ئەوە دەستنوێژەكەی بەتاڵە.

دووەم: شۆرینی ڕوخسارە كە بەدرێژی مابەینی شوێنی ڕوانی مووی سەرە هەتا برانەوەی چەناگەو، بە پانی نێوانی هەردوو گوێچكەیە، پێویستە هەموو پانایی ڕوخسار و ئەو سپیاییە كەوا لەبنی گوێچكەكاندا بشۆردرێن، هەروەها پێویستە ئەو گرێی لای خواری چەناگە، كە شوێنی بەیەك گەیشتنی هەردوو شەویلەكانە باش بشۆردرێن، هەروەكو پێویستە هەموو پێست و مووی ڕوخسار دەر و ناوی بشۆردرێ، بەڵام مووی ڕیش ئەگەر ئەوەندە پڕ بێ كە پێستی ڕوخساری لێوە دەرنەكەوێ ئەوە هەر دیوی دەرێ پێویستە بشۆردرێ، پێویستە ئەم لاو لای چاوەكان و، ئەو بەشەی لە لووتی مرۆڤ كە ڕووی كردۆتە لێو هەمووی بشۆررێ، شایانی باسە لە شۆریندا تەنیا دەست پیاهێنان بەس نییە، بەڵكو پێویستە ئاو بەسەریدا جاری ببێ، هەروەها پێویستە بەقەدەر قەیتانێ لە سەر بشۆررێ هەتا بە ڕاستی دەربكەوێ كە ڕۆخسار شۆردراوە.

سێیەم: شۆردنی هەر دوو دەستە لەسەر پەنجەوە هەتا دوایی هەردوو ئەنیشكەكان.

چوارەم: مەسحكردنی سەرە بە ئاوێكی تازە هی هەندێ لەو مووانەی كە لە سنووری سەردان.

پێنجەم: شۆرینی هەردوو پێ، سەر و ژێریان، هەتا ژووری قولەقاپەكان و، پێویستە بە قەدەر قەیتانێ لە ژووری قولەقاپەكانەوە بشۆررێ تا بە تەواوی شۆرینی پێ و قولەقاپ مسۆگەر بكرێ، هەروەها لە شۆرینی دەستیشدا پێویستە بەقەدەر قەیتانێ لە ژووری ئەنیشكەوە بشۆرێ بۆ دڵنیابوون لە شۆرینی دەست و ئەنیشك.

شەشەم: تەرتیبە، واتە: ئەو شوێنانەی کە باسمان کردن هەر بەو تەرتیبە بشۆررێن و دەم چاو لە پێش دەستەکانداو، دەستەکان لە پێش مەسحی سەرو، مەسحی سەر لە پێش شۆرینی پێیەکاندا بێ.

**سوننەتەکانی دەستنوێژیش ئەمانەن:**

یەکەم: «بسم الله» کردن لە سەرەتاوە.

دووەم: شورینی هەر دوو بەر و پشتی دەست و لەپێش ئەوەدا کە دەست بخاتە ناو ئاوەکە.

سێیەم: ئاوڕادان لە دەم.

چوارەم: ئاوڕادان لە لووت.

پێنجەم: گەیاندنی مەسح بە هەمووی سەردا.

شەشەم: مەسحی هەردوو گوێچکە دەر وناویان، بە ئاوێکی تازە.

حەوتەم: دەست تەڕکردن بە ریشی پڕداو بە ناوبەینی پەنجەکانی دەست و پێدا .

هەشتەم: پێش خستنی لای ڕاست بەسەر لای چەپدا.

نۆیەم: سێ بارەکردنەوەی ئەم کردەوانە کە باسمان کردن، چ فەرزو چ سوننەت.

دەیەم: «موالاة» واتە بەجێهێنانی واجیباتی دەستنوێژ یەك لە دوای یەك بێ، بەجۆرێ ماوەی زۆر نەکەوێتە بەینیانەوە، بەڵام ئەم موالاتە، بۆ ئەوانەی کە بە ناساغی میزەچرکە یا با لێ دەرچوون، یا خوێنی مایەسیری و وێنەی ئەمانە دووچارن، واجیبە، واتە: دروست نییە بەینی واجیبەکان بخا و پێکەوە نەیانکا.

**ئەو شتانەی کە دەستنوێژ دەشکێنن پێنج شتن:**

یەکەم: دەرچوونی شتێك لە پێش یا لە پاش بەهەر سیفەتێ بێ، عادەتی بێ یاغەیر عادەتی، بێجگە ئاوی «مەنی» چونکە ئەم ئاوە هەر کاتێ لە مرۆڤێکی بەخەبەر یا نووستوویەکی(متمکن)ەوە دەربچێ دەستنوێژەکەی ناشکێنێ... فائیدەی ئەم حوکمە ئەوەیە: لەسەر ئەو قەولەی کە دەستنوێژ داخڵی غوسل نابێ، یانی: بە لاچوونی لەش پیسی، بێدەستنوێژی لاناچێت، ئەم جۆرە کەسە کە باسمان کرد

پاش غوسل، پێویستی بە دەستنوێژ گرتن نییەو، ئەگەر دەستنوێژی گرتەوە نابێ نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی بهێنێت، بەڵکو دەبێ نییەتی تازەکردنەوەی دەستنوێژ بهێنێ.

دووەم: لەو شتانە کە دەستنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە نەمانی عەقڵ و هۆشە جا بە شێت بوون یا بە فێ لێ هاتن، یا بە سەر خۆشی، تەنانەت ئەگەر نووستوویەکی (متمكن) کە قنگی خۆی لە عەرز قایم کردبێ کە بێ هۆشی بەسەردا هات دەستنوێژەکەی دەشکێ، نەك لەبەر نووستنەکەی بەڵکو لەبەر بێ هۆش بوونەکەی، واتە: کاتێ لەو بێ هۆشییە ڕزگار بوو، پێویستە دەستنوێژ بگرێ ئەوسا نوێژ بکا.

سێیەم: بەیەك گەیشتنی پێستی پیاو و ژنی نامەحرەم، مەبەست لە ژن ئەو ئافرەتەیە کە گەیشتبێتە ڕادەی ئەوەی خاوەنی نەفسی عادەتی ئارەزووی بکات، بەڵام گەیشتن بە مووی ژن یا بە ناخونی یا ددانی یا بە پێستی ژنی مەحرەم، وەکو دایك و خوشك ئەوە دەستنوێژ ناشکێنێ. مەبەست لە مەحرەم ئافرەتێکە مارەکردنی حەرام بێ بە هۆی نەسەبەوە وەکو دایك، نەنك و پووررو خوشك و خوشکەزا و کچی براو برازاو کچی مرۆڤ خۆی و کچی ئەولادی، یا بە هۆی شیرەوە وەکو ئەمانە واتە: دایکی شیری و خوشکی شیری.. تاد.. یا بە هۆی ژن و ژنخوازییەوە، وەکو دایکی ژنی خۆت و کچی ژنی خۆت و باوەژن و ژنی کوڕو کوڕەزات ، ئەمانە دەستنوێژ ناشکێنن، بەڵام خوشکی ژن و پووری ژن، هەرچەند لەگەڵ ژنەکەتدا لە مارەکردندا کۆناکرێنەوە، بە مەحرەم دانانرێن، لەبەرئەوەی لە پاش جیابوونەوە لە ژنەکەت مارەیان دێ و دروستە بیانخوازی.. بەڵێ ئەمانە دەستنوێژ دەشکێنن و تەماشاکردنیان و بە تەنیا لەگەڵ دانیشتنیان حەرامە، زۆر کەس ئەمانە بە حەڵاڵ حیساب دەکەن، بەڵام ئەمانە بە هەڵەداچوون و، پێویستە زاناکانی ئاین ئەم فەرمانەیان حاڵی بکەن و تێیان بگەیێنن و ئەم فکرەیان لە مێشك دەرکەن، بەڵێ لە شکانی دەستنوێژی (ملموس)دا، واتە: ئەو کەسەی کە دەستی نامەحرەمەکەی لێ کەوتووە، خیلاف هەیە لە نێوان ڕاکاندا؛ لە ڕایەکی زۆر بەهێزی ئیمامی شافعیدا ئەویش دەستنوێژی دەشکێ، بەڵام لە ڕایەکی تریدا دەستنوێژی ئەو ناشکێ؛ چونکە ئەو هیچی نەکردووەو دەستی لەکەس نەداوەو خەڵك دەستیان لەو داوە؛ کەواتە دەستنوێژی ناشکێ، جا دەست لێدراو ئەگەر لەسەر ئەم ڕایە بڕوات ئەوا دەستنوێژەکەی ناشکێ.

چوارەم: دەست لێدانە بە بەری دەست لە (عەورەت) پێش و پاشی خۆی واتە: لە هەر کام لە دوو ڕێگای بەر و دوا، پیاو بێ یا ژن، بەڵام ئەگەر بە غەیری بەری دەست بکەوێ لە عەورەتی خۆی یانی بە پشتی دەست یا جێگەیەکی تر، ئەوە دەستنوێژی ناشکێ، هەروەها ئەگەر دەست بدا لە گونی یا لەبەر زارمگای، یا دەست بدا لە پاش و پێشی حەیوان ئەوە دەستنوێژی ناشکێت، بەڵێ ئەگەر پیاو بە بەری دەستی دەست لە عەورەتی پیاوێکی تر بدات، زیندوو بێ یا مردوو ، یا دەست بدات لە هەڵقەی پاشی پیاوێکی تر، یا ژنێ بەری دەستی بدا لە عەورەتی ژنێکی تر، زیندوو بێ یا مردوو، ئەوە هەر دەستنوێژی دەست لێدەر دەشکێ و، دەستنوێژی دەست لێدراو ناشکێ.

پێنجەم: نووستنە، واتە: هەر کەس بە پشتا یا بە ڕوودا کەوت، یا بە تەنشتا ڕاکشا، یا پاڵی بە شتێکەوە داو خەوی لێ کەوت، ئەوە دەستنوێژی دەشکێ، بەڵام ئەگەر وەها نووست کە قنگی لە عەرز توند کردبوو، وەکو شێوەی ئەوانەی کە هەردوو پێیان هەڵدەنێن و قنگیان لە عەرز مەحکەم دەکەن ئەوە دەستنوێژی ناشکێ، بەڵام ئەگەر ژێری خۆی مەحکەم نەکردبوو لە عەرز، بەڵکو بە چوارمەشقی دانیشتبوو یاخۆ قنگی نابووە سەر عەرز و پێی ڕاکێشابوو، ئەوە دەستنوێژی دەشکێ.

خولاسەی کەلام: مرۆڤ ئەگەر بە جۆرێك نووست کە دڵنیا بوو لەوەی بای لێ نابێتەوە دەستنوێژی ناشکێ، بەڵام ئەگەر بە جۆرێك نووست کە لەوانەبوو بای لێ بێتەوە ئەوە دەستنوێژی شکاوە.

شەشەم: نەمانی عەقڵ و هۆشە، بە بێ نووستن، وەکو ئەوەی مرۆڤ شێت ببێ یا بێ هۆشی بەسەرابێ، یا بە هۆی شەراب و عەرەق خواردنەوەوە سەرخۆش بێ، یا نەخۆش بکەوێ و لە هۆشی خۆی بچێت، لە هەموو ئەم وەزعانەدا، ئەگەر لە پێشدا دەستنوێژی بووبێ بەهۆی ئەم بێ هۆش بوونەوە دەستنوێژەکەی دەشکێ و، کە هاتەوە سەر خۆی پێویستە دەستنوێژ بگرێ.

## باسی خۆشۆردن و لەش پیسی لابردن:

ئەو شتانەی دەبنە هۆی واجیب بوونی خۆشۆردن لە سەر مرۆڤ شەشن:

یەکەم: داخڵبوونی «حەشەفە» واتە: سەری زەکەر، یا بە ئەندازەی سەری زەکەر، ئەگەر سەری زەکەری بڕابوو، بۆ ناو عەورەتی ئینسانێك یا حەیوانێك چ پێش و چ پاش، ئاوی مەنی بێتە دەر، یا نا.

-ووەم: دەرچوونی ناوی مەنییە لە عەورەتەوە، چ مەنی خۆی بێ یا هی غەیری خۆی..
وەکو ئەو ژنەی پاش جیماع و خۆشۆردن پاشماوەی مەنی مێردەکەی لە فەرجی بێتە دەرەوە، یاخۆ پیاو پاش ئینزالی مەنی و پاش خۆشۆردن پاشماوەی مەنییەکەی لە زەکەری بێتە دەرەوە.

سێیەم: تەواوبوونی خوێنی (حەیز)ە واتە: هەر ئافرەتێك حەیزی پێدا هات و، لە پاش شەو و ڕۆژێ یا زیاتر حەیزەکەی بڕایەوە، پێویستە خۆی بشۆرێ ولەش پیسیی خۆی دەربکا.

چوارەم: تەواوبوون و بڕانەوەی خوێنی زەیسانییە، واتە: کاتێ خوێنی پاش منداڵبوون بڕایەوە لەسەر ئەو ژنە منداڵ بووە، پێویستە خۆی بشۆرێ، هەروەها ئەگەر ئەو منداڵبووە، خوێنی لێ نەهات واجیبە لەسەری خۆی بشۆرێ، ئەگەر منداڵەکەشی لەبار بچێ پاش بڕانەوەی خوێنی منداڵ لەبارچوونەکە پێویستە خۆی بشۆرێ..

پێنجەم: مردنە: واتە: هەرکەسێ مرد، گەورە یا بچووك، نێر یا مێ، ئەوە لەسەر زیندووە موسڵمانەکان واجبە ئەو مردووە بشۆرن بە جۆرێك پێست و مووی بە تەواوی بشۆرن.. بەڵێ مرۆڤێکی موسڵمان کە بە دەستی کافران شەهید بێ ئەوە شۆرینی واجیب نییە..

شایانی باسە کە پێویستییەکانی خۆشۆردن دوو شتن:

یەکەم: نییەتی لابردنی لەش پیسی، بەم جۆرە بڵێ قەسدو نییەتم هەیە حوکمی لەش پیسی لەسەر خۆم لادەبەم، یا خود بڵێ قەسدو نییەتم هەیە، نوێژ لە خۆم حەڵاڵ دەکەم، یا بڵێ قەسدو نییەتم هەیە فەرزی غوسڵ بەجێ دەهێنم، هەروەها ئەو ژنە کە لە حەیز ڕزگار دەبێ بڵێ قەسدو نییەتم هەیە حوکمی حەیز لە سەر خۆم لادەبەم، یا ئەو ژنەی کە لە زەیستانی ڕزگار دەبێ لە ئەووەڵی خۆشۆرینەکەیەوە بڵێ قەسدو نییەتم هەیە حوکمی زەیستانی لەسەر خۆ لادەبەم، یاخۆ بڵێ نییەتم هەیە نوێژ لە خۆم حەڵاڵ دەکەم، جا هەروەکو بەدەم ئەمانە دەڵێ بە دڵیش قەسدەکەی لەگەڵ بێ و، قەسدی ئەمانە بە دڵیدا ڕابوێرێ، چونکە نییەت وا لە دڵداو ئەوەی کە پێویستە نییەتی دڵە نەك وتنی بە زمان، بەڵام بە زمان وتنی ئەمانە سونەتەو خێری تێدایە ئەگەر وتنەکەو نییەتەکە بکەونە یەك، پێویستە ئەم

نییسەتەش لە سەرەتای تەڕکردنی لەشیەوە بێ، ئەگەر لە سەرەتاوە نییەتی نەهێنا هەتا نیوەی لەشی شۆری ئەنجا نییەتی هێنا ئەوە پێویستە ئەو بەشەی کە بەبێ نییەت شۆریویە دووبارە باش، بیشۆرێتەوە، کەواتە باش ئەوەیە هەر لەو کاتەدا دەڕواتە سەرئاو بۆ تارەت گرتن و مەشغووڵی شۆرینی عەورەتی خۆی دەبێ. نییەت بهێنێ، چونکە هەر لەو کاتەدا کە پاش و پێشی خۆی دەشۆرێ لەش پیسی ئەو شوێنانەی دەردەچێ.

دووەم: شۆرینی هەموو لەشیەتی بە پێست و مووەوە دەر و ناوی و، ئەو موویە کە خۆی لوول بێ، پێویستە دیوی دەری بشۆررێ و ئاوی بەسەردا بڕوات، بەڵام ئەگەر ئەو مرۆڤە خۆی بە دەسکاری ئەو مووەی لوول کردبێ، یا هۆنیبێتیەوە بە پەلکە ئەوە پێویستە دەرو ناوی بشۆرێ هەمووی ئاوی بەسەردا بڕوا، تەنانەت ئەگەر پێویست بوو بە کردنەوەی پەلکەکان و، بێ کردنەوە ناوەکەیان تەڕ نەدەبوو ئەوە لەسەری پێویستە پەلکەکانی بکاتەوە هەتا دەرو ناویان بە تەواوی تەڕببێ و، ئاویان پێ بگا.

هەروەها ئەگەر شتێ لکابوو بە لەشیەوە، چ پاك، چ پیس وەکو بنێشت و بۆیە، یا چڵك، یا چنگنە، یا مادەیەکی پیس، وەکو خوێن، یا چەوری، ئەوە واجیبە لەسەری ئەو شتانە لاببا و تەواوی لەشی لەوانە پاك بکاتەوە ئەوسا ئاوی خۆشۆردن و خۆ پاك کردنەوە بکات بەسەر لەشیدا، ئەگەرنا غوسڵی دەرناچێ و لەش پیسییەکەی لاناچێ.. بەم بۆنەوە دەیخەمەوە بیرتان کە هەروەها لە کاتی دەستنوێژ گرتنیشدا ئەگەر شتێك لەو شتانە کە باسمان کردن بە ئەندامی دەستنوێژەوە لکابوون، واتە: بە ڕوومەتەوە یا بە دەستەوە، یا بە قاچەوە، لەوێشدا پێویستە ئەو شتانە لاببرێن، ئەنجا ئاوی دەستنوێژ بکرێ بەئەندامەکاندا و هەتا ئەو شتانە بەئەندامەکانەوە مابن دەستنوێژ تەواو نابێ.. تەنانەت ئەگەر چەورییەکی زۆر بەدەستەوە بێ هەتا ئەو چەوریە لانەبرێ تارەتیش جێبەجێ نابێ، نابێ، چونکە ئەو چەورییە نایەڵێ ئاوەکە بگاتە لەش و پاکی بکاتەوە، بەتایبەتی ئەگەر چەورییەکە وەکو پیو بە دەستی مرۆڤەوە لکابێ.

ئەم ئادابانە کە باسمان کردن تەنیا واجیبات بوون، ئەگەرنا سوننەتی دەستنوێژو خۆشۆردن زۆرن و، پێویستە بڕۆن بۆ خزمەتی ئیمامەکانی خۆتان و پرسیاریان لێ بکەن هەتا باش بۆتان ڕوون بکەنەوە.

ئاگاداری :-

وتمان: له کاتی دەستنوێژدا بڵێ « نییەتم هەیە حوکمی بێ دەستنوێژی لەسەر خۆم لابەم »و، له کاتی خۆشۆردندا بڵێ: نییەتم هەیە حوکمی لەش پیسی لەسەر خۆم لابەم، جا ئێستە پێویستە بزانن حوکمی بێ دەستنوێژی و حوکمی لەش پیسی چییە، هەتا بە دەستنوێژ و خۆشۆردنەکە لابچێ؟.

حوکمی بێ دەستنوێژی ئەو شتانەیە کە لە کاتی بێ دەستنوێژیدا حەرامن، وەك دەست لە قورئاندان، چ قورئانی تەواو و، چ کەمێکی: وەکو چەند ئایەتێك کە بە قەصدی قورئان نووسرابێتەوە، هەروەها حەرامە هەڵگرتنی قورئان یا هەندێ لە قورئان، مەگەر لەناو بەر و بوخچەدا، یا لەناو کۆڵە قوماش و ئەسباب و باردا. دیسان حەرامە بە دەوری (کەعبە)دا بسووڕێتەوە، واتە: حەوت جار سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا، کە لەکاتی حەجدا دەکرێ، پێویستە بە دەستنوێژەوە بێ..

ئەمانە کە حوکمی بێ دەستنوێژی بوون حوکمی لەش پیسیشن؛ واتە: مرۆڤی لەش پیس چ پیاو چ ژن، هەروەها ژن لە کاتی حەیزداو لەکاتی زەیسانییدا حەرامە لەسەریان دەست لە قورئانی پیرۆزەوە بدەن، چ هەمووی و چ کەمێکی و، حەرامە قورئان هەڵبگرن و، لە حەجدا حەرامە حەوت جار بەدەوری کەعبەدا بسووڕێنەوە.س زیاد لەوانەش حەرامە لەش پیس قورئان بخوێنێ بە قەسدی قورئان، بەڵام قەی ناکات، لە کاتێکدا بیستی یەکێك مردووە، بڵێ:

«انا لله وانا اليه راجعون » بە قەسدی زیکری موناسب.

هەروەها حەرامە لەش پیس بە لەشی پیسەوە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، بەڵکو واجیبە زووبەزوو بڕواتە دەرەوە، جا ئەگەر مانیعێ هەبوو لەوەی بچێتە دەرەوە وەکو سەرما یا ترسی دوژمن، ئەوە پێویستە لەسەری (تیمم) بکات بە قەسدی حەڵاڵکردنی مانەوەی لە مزگەوتدا، وەکو لە حاشیەی جەماڵ لەسەر شەرحی مەنهەجدا نووسراوە.

شایانی باسە هەرچی لەسەر مرۆڤی لەش پیس حەرامە لەسەر ئافرەتێکیش لە حەیزدا بێ، یا خۆ زەیسان بێ حەرامە و، بێجگە لەوانەش لە سەریان حەرامە هاتوچۆ بە مزگەوتدا بکەن، ئەگەر ترسی پیسکردنی مزگەوتەکەیان بوو، هەروەها لەسەریان حەرامە هەتا لەو خوێنە ڕزگار نەبن دەست٤٧٠نوێژ بگرن یا خۆیان بە قەسدی خۆشۆردنی شەرعی بشۆن؛ چونکە بۆ ئەوان ئەم کاتانە کاتی عیبادەت نین و، حەرامە نوێژ بکەن یا

ڕۆژوو بگرن. بەڵێ ڕۆژووی ئەو ماوەیە قەرزار دەبن کە ڕێکەوتی مانگی ڕەمەزانی کردبێ و پاش پاك بوونەوە، بەقەزای دەگێڕنەوە، بەڵام قەرزاری نوێژی ئەو ماوە نابن و لەسەریان پێویست نییە کە بیگێڕنەوە.

حەرامە لەسەر ئافرەت کە لەو کاتانەدا ماوەی مێردەکەی بدات بۆ جیماع و، لەسەر مێردەکەشی حەرام، کە لەو ماوەیەدا بە ڕووتی ئەعزای خۆی بلکێنێ بە مابەینی ناوك و ئەژنۆی ژنەکەیەوە، چ لە پێشەوە و چ لە پاشەوە، چ بە جیماع بێ یا بە غەیری جیماع، بەڵام ئەگەر دەرپێیان لـ ێدا بوو، هەردووکیان یا یەکێکیان بە جۆرێ کە بە ڕووتی ئەندامی جینسی لە ئەندامی ەکەوێ، ئەوە دروستە لە مابەینی ناوك و ئەژنۆدا بەیەك بگەن، هەروەها دروستە بە ڕووتی ێکێ بە لای ژوورووی ناوکییەوە، یا بە لای خوارووی ئەژنۆیەوە. بێجگە لەمانەش پاش بڕانەوەی خوێنی حەیزو زەیسانی، کە هێشتا خۆی نەشۆردووە، دروست نییە مێردەکەی جیماعی لەگەڵدا بکا.

## مەرجەکانی واجیب بوونی نوێژ:

مەرجەکانی واجیب بوونی نوێژ سێ شتن؛

یەکەم: بلووغ، بلووغی مرۆڤیش چ پیاو چ ژن یا بە تەواوکردنی پانزەساڵە بە ساڵی دوانزە مانگی . یا بە دەرچوونی ئاوی مەنییە، نیشانەی ئەم ئاوەش ئەوەیە کە بە بازرەقە بەستن دەردەچێ و لەکاتی دەرچوونیدا لەزەت بە خاوەنەکەی دەگا، یا بە دەرکەوتنی خوێنی حەیزە، یاخۆ بە زگ پڕبوونە لە ئافرەتدا بەو مەرجەی تەمەنی ئەو ژنە لە نۆ ساڵ کەمتر نەبێ...

دووەم: مەرجی واجیب بوونی نوێژ عەقڵە، واتە: ئەو مرۆڤە کە باڵغ بووە عاقڵ بێ و شێت نەبێ..

سێیەم: ئیسلامەتییە؛ واتە: ئەو مرۆڤە باڵغە عاقڵە دینی ئیسلامی هەبێ، ئەگینا کافر هەتا کافر بێ داوای نوێژکردنی لێ ناکرێ..

## مەرجەکانی ڕاست و دروستیی نوێژ:

ئەو مەرجانەی کە پێویستن بۆ ڕاستی و دروستیی نوێژو، بە پێی ڕێبازی شەریعەت نوێژەکە تەواو بکا، بریتین لە پێنج شت:

یەکەم: هاتنی کاتی نوێژەکەیە.

دووەم: پاکیی نوێژکەرەکە یە لە بێ دەستنوێژی و لەش پیسی.

سێیەم: پاکیی لەش و پۆشاکی نوێژکەرو شوێنی نوێژەکەیە لە هەر پیسییەك کە عەفووی لێ نەدرابێ.

چوارەم: داپۆشینی هەموو عەورەتە، دیارە عەورەتی نێرینە لە نوێژدا مابەینی ناوك و ئەژنۆیەتی و، عەورەتی ئافرەتیش هەموو لەشیەتی بێجگە دەم و چاو و دەستی تا جمگەی باسك.

پێنجەم: ڕوولە قیبلە کردنە؛ لە سەرەتای نوێژەکەوە تا دوایی، قیبلەش بریتییە لە ماڵی پیرۆزی کەعبە؛ کە لە شاری مەککەی موبارەکدایە. واجیبە لەسەر هەموو موسڵمانێ ئەم مەرجانە بە ڕووناکی لە مامۆستایانی ئاینەوە وەربگرێ، چ لەو شوێنەی کە تێدا دانیشتووەو، چ سەفەر کردن بێ بۆ ئەم مەبەستە بۆ ئەو شوێنەی زانای ئاینیی لێیە.

## ڕووکنەکانی نوێژ:-

ئەرکانی نوێژ، واتە: ئەو یاسا و کارانەی کە پێویستە لە نوێژا بێنە جێ و، ئەگەر یەکێکیان فەوتا نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە، نۆزدە شتن:-

یەکەم: نییەتە بەدڵ، واتە: لەو کاتەدا ڕوو لە قیبلە ڕادەوەستێ بۆ ئەوەی نوێژ بکات ئەو نییەتەی هەبێ، دیارە نییەت لێرەدا بریتییە لە نیازو قەسدی کردنی ئەو نوێژە دیارییە کە دەیەوێ بیکات و، لەگەڵ قەسدی ئەو نوێژە دیارییەدا کە دەیەوێ بیکا فەرزیەتیی نوێژەکەش بێنێتە دڵەوە؛ کەوابێ نییە قەسدو دیاریکردنی ئەو نوێژەیە کە دەیکا لەگەڵ دیاریکردنی فەرزیەتیش ، بۆ نموونە: بەدڵی خۆیدا بهێنێ کە قەسدی هەیە فەرزی ئەم نوێژی بەیانییە بکات.

دووەم: وتنی «الله اکبر »ە بە زمان لەگەڵ ئەو نییەتەی کەوا لە دڵیایە، بە جۆرێ کە بەتەواوی نییەتی دڵی لەگەڵ وتنی «الله اکبر»ەکەدا بکەونە یەك .. جا ئەگەر چی ئەم یەك کەوتنە زەحمەتەو تێکڕا گرانە، بەڵام پێویستە مرۆڤ هەوڵ بدات تا فێری ببێ، هەروەها پێویستە بزانن ئەگەر لە پێش ڕاوەستان و دامەزراندا نییەتەکەی لە

دڵدا بوو و پاش ڕاستبوونەوە ئەو نییەتەی لە دڵا نەماو «الله اکبر»ی کرد ئەوە نوێژەکەی بە تاڵە؛ واتە: پێویستە نییەتی دڵ و وتنی «الله اکبر» هەردوویان پێکەوە لە کاتی ڕاوەستاندا بن.

سێیەم: خوێندنی سوورەتی فاتیحەیە کە بریتییە لە حەوت ئایەت و (بسم الله الرحمن الرحیم) یەکەم ئایەتە لەو حەوت ئایەتانە.

چوارەم: بەپێوە ڕاوەستانە لە کاتی خوێندنی هەموو فاتیحەدا، واتە: ئەگەر نوێژکەر پەلەی کردو تەنانەت نوونی «ولا الضالین» کەوتە حاڵی ڕکووع یا سەر دانەواندن بۆ ڕکووع، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. شایانی باسە: فەرزە لەسەر نوێژکەر، ئیمام بێ یا مەئموم، کە ئاگاداریی هەموو حەرفەکانی سوورەتی فاتیحە بکا و، هەر حەرفێ لە مەخرەجی خۆیەوە دەربکا و.. واجیبە تێ بکۆشێت بۆ فێربوونی خوێندنەوەی فاتیحە بە ڕەوانی. جا ئەگەر هات، (حێ)ی کرد بە (هێ) و لە باتی (الحمد) وتی(الهمد)، یا عەینی کرد بەهەمزە و، لەباتی (رب العالمین) وتی: (رب الآلمین) یا ئەگەر سینی کرد بە صادو، صادی کرد بە سین، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە..

بەڵێ ئەگەر هەوڵی دا و فێر نەدەبوو ئەوە بۆ خۆی قەی ناکات بەڵام نابێ ببێتە ئیمام و پێش نوێژی یەکێکی لە خۆی باشتر.

هەروەها پێویستە ئاگای لەو شەددانە بێ کە لە سوورەتی فاتیحەدا هەن.

شایانی باسە ئەگەر کەسێ حەرفێ یاخۆ کەلیمەیەکی لە سوورەتی فاتیحە تەرك کرد، ئەگەر ئەو تەرککردنە بە عەمدی بوو ئەوە کوتوپڕ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو، پێویستە ئیستیغفار بکا و، سەر لە نوێ نوێژەکەی دامەزرێنێتەوە، خۆ ئەگەر بە سەهو بوو ئەگەر زوو بە سەهوەکەی زانی پێویستە کوتوپڕ بگەڕێتەوە بۆ ئەو کەلیمەیە کە تەرکی کردووە یا ئەو کەلیمەیە کە حەرفێکی تەرك کراوەو بە ڕەسایی بیخوێنێتەوە، بەڵام ئەگەر لەپاش ماوەیەکی زۆر پێی زانی، ئەوە پێویستە هەموو سوورەتەکەی فاتیحە لەسەرەوە بخوێنێتەوە.

ئەگەر کەسێ لە ئیمام دواکەوت و کاتێ بە ئیمام گەیشت کە ماوەی خوێندنی فاتیحەی نەبوو، لەم شێوەدا ئەگەر ئیمام لە ڕکووع بەرز بووبووەوە ئەوە نوێژ دابەستنی مەئموومەکە لەو کاتەداو یەککەوتنی لەگەڵ ئیمامدا هەرچەند دروستە، بەڵام سوودی بۆی نییە، واتە: ئەو ڕکاتەی بۆ حیساب ناکرێ، خۆ ئەگەر لە کاتێکدا بە ئیمام گەیشت کە

ئیمام له رکووعدا بوو ئەوە سوودی هەیە بۆی و خوێندنی فاتیحەکەی ئەو ڕکاتەی له کۆڵ دەکەوێ، بەو مەرجەی لەو کاتەدا نوێژ دادەبەستێ باش ڕاوەستێت و لەشی لە جووڵە بکەوێ و نییەتی ئەو نوێژە بهێنێ لەگەڵ ئیمامدا و (الله اکبر)ی تەحەڕوم بکا و بە ڕکووعی ئیمامدا بگات، واتە: لە پێش ئەوەدا کە ئیمام لە ڕکووع سەر بەرز بکاتەوە، ئەم شەخسە دانەوێتەوە بۆ رکووع و رکووعەکەی لەگەڵ رکووعی ئیمامەکەیدا ڕێك بکەوێ. بەڵام ئەگەر بە پەلەپرووزە هات و ، پێش ئەوەی کە ڕاوەستێ و لەشی لە جووڵە بکەوێ نییەتی هێناو دانەویەوە بۆ ڕکووع ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە؛ چونکە ڕاوەستان و ئارامگرتنی لەش بە پێوە شەرتە بۆ نییەت هێنان و، ئەو شەرتەی فەوتاوە، هەروەها (الله اکبر)وتنی دابەستنی نوێژ پێویستە لە ڕاوەستانی ساغدا بێ ئەوەیشی فەوتاوە، جا کە نوێژ دانەبەسترابێ، چۆن ڕەوایە دانەوێت و ڕکووع بەرێ؟! ئەم وردە باسانە پێویستە زانایانی ئاین بیگەیێنن بە نەخوێنەوارەکان.

پێنجەم: لە ئەرکانی نوێژ ڕکووع بردنە، واتە: لە ڕاوەستانەوە سەری دانەوێنێ و پشتی بچەمێنێتەوە، بە جۆرێ کە هەردوو بەری دەستی بگەن بە ئەژنۆکانی بە شێوەیەکی عادەتی، واتە: نەك بەجۆرێ کە هەردوو بن ڕانی بباتەوە بەناوا بۆ ئەوەی دەستەکانی بگەن بە ئەژنۆی، ئەو جۆرە گەیشتنی دەستە جێگەی ئیعتیبار نییەو، بە ڕکووع دانانرێت... بەڵێ ئەگەرنوێژکەرەکە پشتی ناساغ بوو و نەیتوانی پشتی بچەمێنێتەوە ئەوە هەرچەند توانای هەیە خۆی بچەمێنێتەوە و، ئیتر لەو ئەندازەیە زیاتری لەسەر واجیب نییە.

شەشەم: لە ئەرکانی نوێژ: ئارام گرتنە لە ڕکووعدا، واتە: لە ڕکووعەکەدا ئەوەندە بمێنێتەوە کە ئەندامی لە جموجۆڵ بکەوێ، ئەوەندەی کە (سبحان ربي العظيم)ی تێدا تەواو بکا.. بێگومان ئەوکەسانە کە بە پەلە رکووع دەبەن و هەر لە کاتی ڕاوەستاندا دەست بە وتنی (سبحان ربي العظيم) دەکەن بە جۆرێك کە هەندێکی دەکەوێتە رکووع و دواییەکەی دەکەوێتە کاتی بەرزبوونەوەی بەبێ ئارام گرتنی لەش، ئەوە رکووعەکەی بەتاڵە، لەبەر ئەمە زۆر تکاتان لێ دەکەم کە لە ڕکووعدا سێ جار (سبحان ربي العظيم) بکەن بۆ ئەوەی ئەگەر زۆر بە پەلەیش ئەم ویردە بخوێنن یەکەمیان دەکەوێتە کاتی دانەوینەوە بۆ ڕکووع و، دووەمیان دەکەوێتە کاتی رکووع و سێیەمیان دەکەوێتە کاتی بەرزبوونەوە لە ڕکووع، واتە: بەقەدەر (سبحان ربي العظيم)ی ناوەڕاست ڕکووعەکەی دێتە جێ و، ئەم ئەندازە کافیە بۆ

جێبەجێ بوون و دروست بوونی ڕکووعەکەی... بەڵام ئەگەر یەك جار بێ و بەپەلەش بیخوێنێ ئەوە ڕکووعەکەی تەواو نابێ.

حەوتەم: لە ئەرکانی نوێژ: ئیعتیداله، واتە: لە ڕکووع بەرزبوونەوەو ڕێك ڕاوەستان.

هەشتەم: لە ئەرکانی نوێژ: ئارام گرتنە لەم ڕاوەستانەدا بە جۆرێ کە هەموو لەشی لە جموجۆڵ بکەوێ، واتە: ئەگەر ئەو دوعایە، کە سوننەتە بیخوێنێ، لە ئیعتیدالا بە جێگەی بێنێ ئەوجا دانەوێتەوە بۆ سوجدە بردن، ئەوا ئەو ڕوکنەی بەڕەسایی بۆ جێبەجێ دەبێ.

هەندێ کەس کە لە ڕکووع سەر بەرز دەکەنەوە، دەس دەکەن بە خوێندنی (سمع الله لمن حمده)و، بە پەلە دەیخوێنن، بە ئارام گرتنەوە ڕاناوەستن و، وەها دەزانن هەر بە خوێندنی ئەو ویردە ئیعتدالەکەیان تەواو دەبێ، ئەمانە بەهەڵەداچوون ئیعتیدال و ئارام گرتن بەو جۆرە سەقامگیر نابێ و، هەردوو ڕوکنەکەیان ناتەواوە . بێگومان ئەمانە ئەگەر بەدەسەنقەست وا بکەن ئەوا نوێژەکەیان بەتاڵە، بەڵام ئەگەر سەهو، بوو گورج بێدار بوونەوەو گەڕانەوە بۆ سەر ئیعیتدال و بە ئارام گرتن تەواویان کرد، ئەوا ڕکاتەکەیان بۆ تەواو دەبێ، خۆ ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئیعیتدال هەتا گەیشتن بە ڕکووعی ڕکاتی دوایی ئەوا ئەو مابەینە هەرچییان کردووە بێ سوود و ناتەواوەو لەو ئیعتیدالەوە کە ئێستە دەیکەن بەڕەسایی نوێژەکەیان بۆ حیسێب دەکرێ و ڕکاتی پێشووی پێ تەواو دەکرێ. پێویستە ئەم شتانە کە باسمان کردن بەوردی بیزانن و پەیڕەویان بکەن.

نۆیەم: لە ئەرکانەکانی نوێژ: سوجدەی یەکەمە، بەجۆرێ کە لە ڕاوەستانی ئیعتیدالەوە دانەوێ و لەسەر حەوت ئەندامی خۆی سوجدە ببات، ئەم حەوت ئەندامەش بریتین لە تەوێڵ و بەری هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆو بەری پەنجەی هەردوو پێی.. هەروەها پێویستە تەوێڵی ڕووت بێ، واتە: ئەگەر شتێکی بە تەوێڵییەوە بەستبوو، تەوێڵی نەدەکەوتە سەر جێ، نوێژەکەی، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. هەروەك پێویستە هەردوو ئەژنۆی داپۆشرابن، ئەگەر ڕووت بن ئەوە عەورەتی دەردەکەوێ نوێژەکەی پێ بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام هەردوو بەری دەستی و هەردوو بەری پێی ڕووت بن یا داپۆشراو قەی ناکات و نوێژەکە دروست و. تەواوە..بەڵێ پێویستە لای کەمی بەری پەنجەیەك یا دوو پەنجەکانی یا تەنیشتی پێی لە سەر جێ نوێژەکە دانا، ئەوە سوجدەکەی دروست نییەو نوێژەکەی بەتاڵە.

دەیەم: لە ڕوکنەکانی نوێژ: ئارام گرتنە لەم سوجدەدا.

یانزەیەم: لە ڕوکنەکانی نوێژ دانیشتنە لە پاش ئەم سوجدەیە.

دوانزەهەم: ئارام گرتنە لەم دانیشتنەدا.

سیانزەیەم: سوجدەی دووەمە وەکو سوجدەی یەکەم..

چواردەیەم: ئارام گرتنە لەم سوجدەدا..

پانزەیەم: تەحییاتی دواییە.

شانزەیەم: دانیشتنە لەم تەحییاتەدا، شایانی باسە کە لای کەمی تەحییات بەم جۆرەیە:

«التحيات لله. السلام عليك إيها النبي و رحمة الله و بركاته. السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين. أشهد أن لا اله الا الله، وأشهد أن محمدا رسول الله».

حەڤدەیەم: صەڵەوات لەسەر حەزرەتی محەمەد مستەفا (د.خ) کە لای کەمەکەی «اللهم صل على محمد»ە، بەڵام صەڵەوات لەسەر ئالی پێغەمبەر لە پاش تەحییات لە وەجهێکدا واجیبەو دەبێ بڵێ: «اللهم صل على محمد وآله»، لە وەجهێکی تردا واجیب نییە، بەڵکو سوننەتە.

هەژدەیەم: سەلامدانەوەیە تەنها یەك جار و، لای کەمی ئەوەیە بڵێ: «السلام عليكم» لای زۆری سەلام ئەوەیە دوو بێ؛ یەك بەلای ڕاستدا و یەك بەلای چەپدا و، لە هەردووکیاندا بڵێ: «السلام عليكم و رحمة الله».

نۆزدەیەم: لە ئەرکانی نوێژ ڕاگرتنی تەرتیب و پاش و پاشیی ئەم روکنانەیە کە باسمان کردن، واتە: دابەستنی نییەت پێشی فاتیحەو فاتیحە پێش ڕکووع... تاد.

ئەمانە کە باسمان کردن تەنیا ئەرکانی نوێژ بوون و، پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغ وعاقڵ کە بڕوات بۆ لای زانایانی ئاین و واجیبات و سوننەتەکانی نوێژ و ئادابەکانی تری عیبادەت فێر ببێ، بەجۆرێ کە فەرز و سوننەت لەیەك جیا بکاتەوە، ئەگەر نا بە تاوانبار حیساب دەکرێ، بگرە ئەگەر یەکێك لە واجیبات بە سوننەت بزانی ئەوە عیبادەتەکەی بەتاڵە... أن شاء الله بە درێژی باسی فەزائیل و ئاداب و سوننەتەکانی نوێژ دەنووسین.

«وفقنا الله جميعاً للعلم والعمل الصالح بجاه النبي سيدنا محمد صلى الله عليه وسلم و على آله وصحبه وإتباعه باحسان إلى يوم الدين».

## نامەی شەشەم

# باسی وەسوەسەیە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله واصحابه واتباعة في دين الله.

پاش ئەمانە برا ئاینییەکانم! لە مامۆستایان و کاربەدەستان و گەورە ماڵان و پیاوە موسڵمانەکان بە گشتی سڵاوتان پێشکەش دەکەم.

خۆشەویستەکان! ئەم نامەیەو نامەکانی تر کە دەیاننوسم و دەیاننێرم بۆ خزمەتتان بەنرخترین دیارین کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بینێریێ؛ بە دەلیلی ئەو فەرموودەیە کە عەبدوڵڵای ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێ، ڕیوایەتی کردووە لە حەزرەتەوە (د.خ) کە فەرموویەتی:

«ما أهدى مسلم لاخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله تعالى بها هدى أو يرده عن ردى». واتە:

هیچ برایەکی موسڵمان دیارییەکی نەناردووە بۆ برای موسڵمانی خۆی گەورەترو بەنرختر لە وتەیەکی باش و بەسوود کە خوای گەورە بەهۆی ئەو وتەوە شارەزایی ئەو برایە زیاد بکا، یاخود مەنعی زیان و فەوتانی لێ بکا،

«ولولا أهل الارشاد والبيان لبقي الناس كالعميان» واتە: ئەگەر شارەزاو ڕێپێشاندەر نەبن خەڵکی وەك کوێریان لێ دێ و هیچ نازانن!.

ئاشکرایە ئەو کۆمەڵە پیرۆزە کە ڕێنموونیی ئادەمیزاد دەکەن، بۆ ڕێگای ڕاست لە جوملەی ئەوانەن کە خوای گەورە دەربارەی ئەوان فەرموویەتی: «يختص برحمته من يشاء» ولە مەدحیاندا فەرموویەتی :

«ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء».

هەروەها دیارە کە نامەی دۆستی خۆتان هەمووی بۆ شارەزا کردن و ڕێنموونیی موسڵمانانە، کەوابوو پێویستە بە دڵ گوێ ڕابگرن لێیان و ڕەفتاریان پێ بکەن.

پێویستە بزانن کە مایەی پیرۆزی و بەختیاریی ئادەمیزاد دوورکەوتنەوەیەتی لە گوناه و پەیڕەوی کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرە، واتە: دەوام کردنە لەسەر پەرستیاری و بە گوێ کردنی ئەمرەکانی خوا و فەرموودەکانی پێغەمبەرو، ئەم دوو شتە نیشانەی بەهێزیی ئیمانن و پێچەوانەی ئەم دووانە نیشانەی بێ هێزیی ئیمانە.

ئەم دوو شتە گەورەیە، دووریی لە گوناهـ و نزیك بوونەوە لە خواپەرستی و گوێڕایەڵی، لەوەوە دەست دەکەون کە مرۆڤ لە هەموو بیروباوەڕو کردەوە و خوو ڕەوشتیدا بکەوێتە شوێن حەزرەتی محەمەدی مستەفا (د.خ) وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

«قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ»

واتە: ئەگەر خواتان خۆش دەوێ دوام کەون، پەیڕەویم بکەن، لە قسەم دەرمەچن هەتا خوا خۆشتانی بوێ و لە گوناهـ و تاوانتان ببوورێ.

لە ئیمامی حەسەنەوە دەگێڕنەوە، خوای لێ ڕازی بێ، لە مانا لێدانەوەی «فاتبعونی یحببکم الله»دا فەرموویەتی: نیشانەی خۆشویستنی خوا بۆ ئادەمیزاد ئەوەیە کە پەیڕەویی حەزرەتی پێغەمبەر بکا؛ واتە ئەو مرۆ موسڵمانانە کە لە بیروباوەڕو ڕەفتارو خووڕەوشتدا دەکەونە شوێنی پێغەمبەر(د.خ) شوێنکەوتنەکەیان نیشانەی ئەوەیە کە خوا خۆشیانی دەوێ؛ چونکە خوای گەورە شوێنکەوتن و بە گوێ کردنەکەی پێغەمبەری کردووەتە مەرج و، خۆشویستنی خۆی کردووەتە پاداش، کە مەرج هاتە دی پاداشەکەشی دێتە دی، کەواتە هەرکەس پەیڕەوی حەزرەت بکا، پێویستە باوەڕی وا بێ کە خوای گەورە خۆشی دەوێ.. بێگومان لە پێچەوانەی ئەمەوە دەردەکەوێ ئەو کەسەی پەیڕەویی حەزرەت نەکا خوای گەورە خۆشی ناوێ.. ئەوەش زانراوە کە حەزرەت (د.خ) هەرگیز ڕاڕایی و دوودڵی و وتوویرە(وەسوەسە)ی نەبووە لە عیبادەتدا چ نوێژ، چ دەستنوێژ، چ خۆشۆردن. کەوابێ هەرکەسێ پەیڕەویی ئەو بکات و لە وەسوەسە دوور بکەوێتەوە بەقەدەر پەیڕەوییە خودا خۆشی دەوێ و، هەرکەسیش بە وەسوەسەوە خۆی خەریك بکات بەقەدەر ئەو وەسوەسەیە دوور دەکەوێتەوە لە خواو خوا لێی زویر دەبێ.

پەیڕەویی حەزرەت هەروەك بۆ ئاین و بۆ ڕاكێشانی خۆشەویستیی خوا بەسوودە بۆ گوشاد كردنەوەی دەرگای خێر و خۆشیش بەسوودە وەكو خوا فەرموویەتی: «ولو أن أهل القرى آمنوا وأتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء» واتە: ئەگەر خەڵكی دێهاتی دەوروبەری مەككە ئیمانیان بهێنایەو، خۆیان لە گوناهـ بپاراستایە بەڕاستی دەرگای بەرەكەت و خێر و پیتی ئاسمانم لێ دەكردنەوە، واتە: خێرات و بەرەكات بە فەرمانی خوا دەبارێنە سەر ئینسانی لە خوا ترس و گوێڕایەڵ، بێگومان ئەم خێر و بەرەكەتەش پاداشتی باوەڕ بە خواو پەیڕەوی كردنی فەرمانی خواو فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ).

كاتێ مرۆڤ كەوتە نێو گێژاوی وەسوەسەوە شەیتانەكان بەسەر دڵیدا زاڵ دەبن و، بیری وەها تاریك بە دڵیدا دێن كە ڕێی ڕاستی لێ ون دەكەن و بیرو باوەڕی دێتە سەر ئەوە كە ئەو وتوویرە و خەیاڵاتەی باشە و، شێوەی ڕەفتاری حەزرەت و گەورە پیاوانی ئوممەتی پێغەمبەری لە بەرچاو نامێنێ و موبالاتیان پێ ناكا، نەگینا بۆچی لە سەر شێوەی حەزرەت (د.خ) و یارانی ئەو و پیاوە گەورەكانی زانایانی ئوممەت بەڕێگەدا ناڕوا، كە گەلێك ئاسان و بێ مەینەتە؟ بۆچی خۆی دەهاوێتە نێو ئەم وتوویرەو دوودڵییەوە كە گەلێك تووشی مەینەتیی دەكات؟!

بەپێی نەسسی قورئانی پیرۆز شەیتان هەمیشە لە مەڵاسدایە بۆ زاڵبوون بە سەر مرۆڤداو دەیەوێ خەڵكی گومڕا بكا، جا هەر كەس بەشێوەیەك گومڕا دەكا، لەگەڵ هەندێكدا باوەڕیان بە ئاینی ئیسلام تێك دەدا، هەندێكی تر كردەوەی خراپیان لا جوان دەكا وەكو مرۆڤ كوشتن و ماڵی خەڵك خواردن و نامووس بردن و فیتنە و فەسادكردن و ئاگری شەڕ نانەوە، بۆ هەندێ كەس زیان لە خووڕەوشتیان دەدا بە جۆرە خووڕەوشتێ كە سووكیان دەكا، وەكو لە خۆبایی بوون و خۆ لە خەڵك بە باشتر زانین و، حەسوودی بە خەڵك بردن و بەدگومان بوون لەگەڵ موسڵمانانداا . بۆ هەندێ كەس وەسوەسەو دوودڵی دەهاوێتە دڵیانەوەو وایان لێ دەكا كە باوەڕ نەكەن و دڵنیا نەبن لە نوێژو دەستنوێژو تاعەت و پەرستیارییەكانی تر.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا وتەی شەیتان دەگەڕێنێتەوە كە هەڕەشە لە ئادەمیزاد دەكا:

«لا قعدن لهم صراطك المستقيم، ثم لآتينهم من بين إيديهم ومن خلفهم وعن أيمانهم وعن شمائلهم، ولا تجد أكثرهم شاكرين».

واتـه: شەیتـان وتـوویـەتـی: بـەڕاستـی لـەسەر ڕێگـەی ڕاست کـە ئـایـنـی ئـیسلامـە بـۆ موسڵمـانـان دادەنـیشم و، وەك جـەردە ئـەو ڕێگـەیـان لـێ دەگـرم و، بـەهـەمـوو ڕەنـگـێ بەرەنگاریان دەبم بۆ ئەوەی لە ڕێگای ڕاست لایان دەم و، گەلێکیان لە فەرمانی تۆ لادەدەن و شوکرانە بژێریت ناکەن.

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: «يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ » واتە: ئەی نەوەی ئادەم! ئاگاتان لە خۆتان بێ و ڕێگای ڕاست بگرن و لەیادی خوا غافڵ مەبن نەبادا شەیتان ئێوەش لە خشتەبەرێت و تووشی گێژاو و سەرگەردانیتان بکا، وەك چۆن باوك و دایکتان (ئادەم و حەوا)ی لە بەهەشت بەدەرکردن دا.

پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی:

«أن للوضوء شیطاناً یقال لە ولهان؛ فاتقوا وسواس الماء». واتە: جۆرە شەیتانێ هەن بەردەبنە گیانی ئەوانەی دەسنوێژ دەگرن و، دوودڵی دەخەنە مێشکیانەوە، بۆ نموونە بەرامبەر بەو شوێنەی شۆردوویەتی ڕاڕای دەکەن تا بە خۆی دەڵێ: نەمشۆردووە هەتا خـۆی مـانـدوو دەکـا و سەرمـای دەبـێ وەخـتـی بـەخـۆڕایـی دەڕوا و ئـەوەڵـی نـوێژی جەماعەتەکەی لە کیس دەچێت؛ دەی خۆتان بپارێزن لە وەسوەسەی کاتی دەستنوێژ؛ مرۆڤی وتوویرەدارو ڕاڕا وا لە فەرمانی شەیتان و نافەرمانیی خواو پێغەمبەری خوادا، هەتا دەگاتە ڕادەیەك باوەڕی دێتە سەر ئەوەی ئەگەر وەکو بیستراوەو ریوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە دەستنوێژ بگرێ ئەوە دەستنوێژەکەی بە تاڵە، بەڵام ئەگەر لەسەر بیروڕای خۆی دەستنوێژ بگرێ دروستە و ڕەوایە!! ئەمەش دەبێتە هۆی کافربوونی مرۆڤ.

مرۆی ڕاڕا بیری دێتە سەر ئەوە– بۆ نموونە– ئەگەر وەکو لە حەزرەتەوە ریوایەت کراوە نان لەگەڵ منداڵاندا بخوا ئەوا دەستی پیس دەبێ، ئەم بیرەش هەڵەیەو دەبێتە هۆی فەوتانی مرۆڤ..

هەروەها لە نییەت هێنانی نوێژیشدا، لەو کاتەدا ڕادەوەستێ و ڕوودەکاتە قیبلە و خۆی بۆ نوێژکردن ئامادە کردووە، هەرچەند ئاشکرایە ئەم کابرایە بەنیازی نوێژکردن و بەر ستیارییەوە بەرەو قیبلە ڕاوەستاوەو نیازی نوێژ کردنی هەیە، ئەوەندە خەیاڵ و خەتەرە دەکا و لە دەریای دوودڵیدا دەمێنێتەوە کە نییەتی بۆ نایەت و «الله اکبر»ی بۆ ناکرێ و، لـە ئـیـمـام و پـێشەوای نـوێژ زۆر دوا دەکـەوێ و خـێرو حـەسەنـاتـی هـاوجـۆریـی لـەگـەڵ

پێشەوادا بۆ ناکری، بەڵکو جاری وا دەبێت کە ئیمام سڵاوی نوێژ دەداتەوەو لە نوێژ دەبێتەوە، کەچی ئەو زەلامە هێشتا نییەتی نوێژەکەی بۆ دانەبەستراوە!. هەروەها لە کاتی لابردنی پیسی و شۆرینی بەرگ و پۆشاکی خۆیدا بە هۆی وتوویرەوە گەلێ کاتی لە کیس دەچێ و گەلێ کاری لەدەست دەچێ و، رێك دەکەوێ زۆر سەرمای دەبێ و نەخۆش دەکەوێ.. یاخۆ لە کاتی خوێندنی فاتیحەدا ئەوەندە کەلیمە دووبارە دەکاتەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بۆ نموونە: لەکاتی دووبارە کردنەوەی «المغضوب علیهم»دا ئەوەندەی دەڵێتەوە لە جاری دواییدا دەیکاتە (مغضوب علیهم)بەبێ ئەلیف لام، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی نوێژەکەی..، ئەم کردەوە بێ سوودە زیاندارانە لە رێگای ئاینی ئیسلام بەدەرن و، کابرای راڕا رێگەی دین بەردەدات و دەکەوێتە سەر رێگای بێ ئاینی و، ئەمەش پێچەوانەی دەستووری پیرۆزی ئیسلامە، خوا فەرمویەتی: «وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ » واتە: بەڕاستی ئەوەی کە باسمان کرد بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست و ئەی پەیڕەوانی یاسای ڕاست ڕێگای ڕاستەو یاسای ئیسلامەو، بکەونە سەری و، ئیتر مەکەونە شوێنی چەند ڕێگەی لاری ناباری هەوای کافران، کە پەرت و بڵاوتان بکا و لە ڕێگای خودا دوورتان بخاتەوە.

هەرکەسێ بیەوێ لە زیان و لە ناوچوون ڕزگار ببێ، پێویستە پەیڕەویی پێغەمبەر بکا (د.خ) لە کردارو گوفتار و ئەندێشەو خەیاڵاتدا، چونکە خوای گەورە پێغەمبەری کردووە بە پێشەوای بەختیاران و کردوویەتی بە چرای کات و شوێنی تاریك و، هەرکەسێك لە پێشەوا دوور بکەوێتەوە سەرگەردان دەبێ و، هەرکەس بە بێ چراو ڕووناکی بە شوێنی تاریکدا بڕوا ماڵ وێران دەبێ.

جا هەر چەندە شەیتان دوودڵیی بخاتە دڵیەوە، پێویستە بەربەرەکانێی لەگەڵدا بکات و، لەو دوودڵییەو لەو ڕاڕاییە لابدا، وەك حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) دەستنوێژ بگری و خۆی بشۆرێ ونییەت بهێنێ و نوێژ بکات و، زۆر لە خۆی بکا بڵێ: ئەگەر ئەم کاری منە بەتاڵیش بێ من هەر بەم جۆرە ڕەفتار دەکەم و ناکەومە شوێنی خەیاڵات و ڕاڕایی شەیتان تا بۆ خۆی ڕزگار دەبێ و شەیتان لێی دووردەکەوێتەوە.. ئەگەر ئەو بڵێت تەنیا دەسنوێژە دوودڵییەکەی باشە، ئەوا (استغفر الله) دەبێ کە دەستنوێژی حەزرەت (د.خ) دروست نەبێ، ئەم باوەڕە کوفرەو مرۆڤی پێ کافر دەبێ.

شەیتان هەمیشە دەیەوێ مرۆڤ بەرەو دۆزەخ ڕابکێشێ وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: «إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ» واتە: شەیتان کۆمەڵەی خۆی بۆ ئەوە بانگ دەکا کە ببنە ئەهلی دۆزەخ و لە دۆزەخدا سەقامگیر بن.

شێخ (ابن حجر)، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: دەرمانی بەسوود بۆ چاری وەسوەسە ئەوەیە کە مرۆڤ زۆر بکا لە خۆی و لە وەسوەسە لابداو بە خراپی بزانێ و مەیل نەکا بۆی، جا ئەگەر ماوەیەك وا بکات ئەوا بە تەواوی ڕزگار دەبێ، وەکو حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی:

«من أبتلى بالوسوسة فليعتقد بالله في النية» واتە: کەسێ گیرۆدەی وەسوەسە بوو چاری ئەوەیە باوەڕی خۆی بە خوسا بەهێز بکات، کە هەر کارێ خوا دای مەزراندبێ و بڕیاری دابێ ئەوە ڕاستەو، هەرچی شەیتان بیهاوێتە نێو دڵەوە ئەوە پووچەو بەتاڵە تا ڕزگار ببێ.

شێخ(ابن حجر) فەرموویەتی: وەسوەسە بەسەر کەسدا زاڵ نابێ یەکێ نەبێ کە هۆش و فامی کەم بێ؛ چونکە مرۆڤێك کە هۆش و عەقڵی ڕەسای ببێ دەبێ سەیری ئەوە بکا کە ئەو دەستنوێژ و خۆشۆردن و نوێژکردنە پەرستیاریی خوای گەورەن و ڕێ و شوێن و شێوەی پەرستیاریش ئەوەیە کە لە شەریعەتدا ڕوون کراوەتەوەو خوای گەورە دای مەزراندووەو، پێغەمبەر(د.خ) بە ئادەمیزادی گەیاندووە، کەواتە هیچ مەعنایەکی تێدا نییە مرۆڤ پەرستیاری بە جۆرێ جێبەجێ بکا کە داهێنەرەکەی بەوشێوەی نەوتبێ!

هەروەها لەلایەکی ترەوە تەماشای خۆی بکا ئاخۆ ئەم دوودڵی و وتوویرەیە شتێکی باشەو، موافقی گیانی پەرستیارییە؟ بێگومان بۆی دەردەکەوێ کە پەرستیاری وەها نابێ، چونکە پەرستیاری دەبێ لەگەڵ دڵنیایی و شادمانیی ڕۆح بێ، کەواتە شتێکی وەها کە لە دڵتەنگی و زەحمەت بەولاوە هیچی تری تێدا نەبێ، پەرستیاری نییە، شتێکی سووك و بێ نرخ و بێ سوودەو، لە ئاینی پاکی ئیسلامدا نییەو نابێ ببێ...

دەگێڕنەوە کە زەلامێکی گیرۆدەی وەسوەسە سکالای حاڵی خۆی لە خزمەتی پێغەمبەردا کرد (د.خ)، ئەویش فەرمووی: «ئەم وەزعە نالەبارە لات زەحمەتە یا نا؟».. ئەویش عەرزی کرد: ئەگەر دنیا هەموو ماڵی من بێ و لەدەستم دەرچێ ئەوەندە لام گران نییە کە ئەم وەسوەسەیە دێتە سەر دڵم، پێغەمبەریش فەرمووی مادام وایە دڵنیا بە کە تۆ موسڵمانێکی باشی چونکە ئەو خەیالاتەت لە لا خراپەو، ئەگەر نەتوانی چاری بکەی زیانی بۆ تۆ نابێ،

ئەو زەلامە هەر بەو فەرموودەیە شیفای بۆ هات و لەو دەردە ڕزگار بوو.. لەڕاستیدا ئەگەر ئەو ڕاڕایی و دوودڵییە هەر لە سروشتی دروستکراوی مرۆڤدا بووایە ئا بەو جۆرە بێزاریی لێ دەرنەدەبڕی و بەلایەوە خراپ نەدەبوو، تەنیا پێ ناخۆشبوون و بێزارییەکە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو دەردە شتێکی تازەیەو بەسەریدا هاتووەو، بەشێك نییە لە سروشت و، کاری شەیتانی وەسوەسەکارە وەك خودا فەرموویەتی: «الْخَنَّاس[٤] الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ[٥] مِنَ الْجِنَّةِ وَ النَّاسِ». ئەهلی حیکمەت فەرموویانە: نووری ئیمانی موسڵمان وەکو نووری چرا وایەو، شەیتانەکان وەکو ئەو پەپوولانەن کە دەوری چراکە دەگرن و، دەیانەوێ ئەو نوورە بۆ خۆیان داگیر بکەن و، لە ئەنجامدا مادام چراکە هەر داگیرساو بێ پەپوولەکان دەسووتێن و زیان بە چراکە ناگا... جا کە مادام نووری نیمان لە دڵدا بمێنێ ئەو شەیتان و وەسوەسەو دوودڵییانە دەفەوتێن و موسڵمانەکە بە ساغی ڕزگار دەبێ. کەواتە وەڵامەکەی حەزرەت(د.خ) بۆ ئەو کەسە کە گیرۆدەی وەسوەسە بووە ئیشارەیە بۆ ئەوە کە مادام ئەو زەلامە خاوەنی نووری ئیمان بێ ئیشەڵڵا هەر ڕزگار دەبێ، چونکە خوا پارێزگاری مرۆڤی خاوەن ئیمانەو، خوای گەورە لە نووستن و بێ ئاگایی دوورە، جا کەسێك کە نیگەهبان و پارێزگارێکی وەهای ببێ هەر ڕزگار دەبێ.

بەڵام لەم ڕووەوە کە شەیتان هاتووە بە تەنیا دڵی ئەو کەسەی کردووە بە شوێنی خۆی و، بەوێنەی سەگ هەمیشە حەب حەب دەکات لە دڵی ئەودا، هەقیەتی غەم بخوا و بە عەقڵ بیر بکاتەوە کە ئەم خەیاڵانە شتێکی زیسان بەخشەو تەرکی بکا باشەو، هەتا دەتوانێ لە خووڕەوشتی حەزرەت (د.خ) بیر بکاتەوەو، هەتا دەتوانێ لەگەڵ مرۆڤی خاوەن زانست و خاوەن دڵ وخاوەن  بیروباوەڕدا بێ؛ بەڵکو بەپیرۆزیی ئەمانەوە لەم دەردە ڕزگار ببێ. هەروەها لە لایەکی تریشەوە لەسەر فەرمانی ئایەت و حەدیسی پیرۆز بڕوا بەڕێدا، ئەوەتا خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ:

«وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ....» «..... مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ» واتە: هەر کاتێ شەیتان بە خەیاڵێکی خراپ و ئەندێشەیەکی نالەبار ئازاری دڵی دای، تۆ بۆ چاری ئەوە پەنا بە خودا بگرەو، هاوار و پەنا بۆ لای خودا بەرەو بڵێ:

«أعوذ بالله من الشيطان الرجيم» واتە: پەنا دەبەم بە خوا لە شەیتانی لەعنەت لێکراو، ئەمە دەبێتە هۆی ڕزگاربوون لە ئەنجامی ناڕەوای ئەو دوو دڵی و ڕاڕاییەی کە شەیتان دەیخاتە دڵییەوە.

ریوایەت کراوە: لە کاتێکدا کە شەیتان خەیاڵێکی خراپ دەخاتە دڵی مرۆڤەوە، سێ جار پەنجەی شەهادەتی بدا بەسەر ئەژنۆی ڕاستییاو بڵێ:

«بسم الله، الله اكبر،آمنت بالله ورسوله، أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم، وأعوذ بك ربي أن يحضرون، أن الله هو السميع العليم، الله أكبر هو الأول والآخر والظاهر والباطن وهو بكل شئ عليم، الله أكبر» ئەنجا بە لای چەپدا تف بکا و بڵێ «سبحان الملك القدوس» دەبێ بە شیفای ئەم وەسوەسەو ئەم خەتەرە ناڵەبارە.

شێخ (أبو الحسنی شاذلی) (ر.خ) فەرموویەتی : کەسێك وەسوەسە هێرشی بێنێتە سەر، ئەم دوعایە بخوێنێ و بڵێ:

«سبحان الملك الخلاق أن يشأ يذهبكم ويأت بخلق جديد، وما ذلك على الله بعزيز»، لە پاش ئەمە بڵێ: «أذهب عنا سائر المضار والمخاوف والفتن، وأنالنا كل خلق حسن وجعلنا من أهل الولاية أهل النعم والمنن، أنه على ما يشاء قدير وبالاجابة جدير»..

شێخ (ابن حجر) ئەم دوعایەی لە فەتاواکەیدا نەقل کردووەو پەسەندی کردووە.

## نامەی حەوتەم

# باسی خێر و چاکەی نوێژ

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين. والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين والتابعين لهم بالحسان الى يوم الدين.**

**برا ئاینییەکان! دڵنیابن کە هۆی سەرکەوتن و بەختیاریی ئەبراوەی مرۆڤ دوورکەوتنەوەیەتی لە گوناح، لەگەڵ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای گەورەدا. ئەم دوو شتە نیشانەی بە هێزیی باوەڕن، هەروەك نەبوونیان نیشانەی بێ هێزی و لاوازییەتی.**

عیبادەت،کە بریتییە لە بەجێهێنانی فەرمانەکانی خواو، دوورکەوتنەوە لە وانەی نەهی لێ کردوون، سێ بەشە: یەکەم باوەڕ بە دڵ. دووەم وتن و پێ لێنان بە زمان. سێیەم کارکردن بە ئەندامی لەش؛ واتە هەر عیبادەت و خوداپەرستییەك دڵ و زمان و کردەوەی تێدا کۆبوویەوە دەبێتە هۆی زیادبوون و پتەوبوونی ئیمان. ئەم نامە کە پێشکەشتانی دەکەم دیارییەکی زۆر بەنرخە، بەڵکو بەنرخترین دیارییەکە کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بنێرێ؛ بە دەلیلی ئەم فەرموودەیە کە (عبدالله)ی کوڕی (عمر) خوایان لێ ڕازی بێ، لە حەزرەتەوە (د.خ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

«ما أهدى مسلم لاخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده عن ردى» واتە هیچ موسڵمانێ دیارییەکی نەناردووە بۆ برای خۆی کە گەورەتر بێت لە وتارێکی بە کاکڵ و پڕ مانا کە یا ببێتە هۆی زیادە شارەزایی و بەرچاو ڕوونی، یا ببێتە هۆی بەربەست و ڕێگرتن لە خراپە و ماڵ وێرانی.. دەگێڕنەوە لە حەزرەتەوە (د.خ) کە فەرموویەتی: «أيما عبد جاءته موعظة من الله في دينه فأنها نعمة سيقت اليه، فأن قلبها بشكر زاده الله تعالى نعماً أخرى». واتە: هەر بەندەیەك لە بەندەکانی خوا ئامۆژگارییەکی بۆ هات، ئەوە وابزانێ کە نیعمەتێکی لەلایەنی خواوە بۆ ڕەوانە کراوە، جا ئەگەر بە شادمانی و

شوكرانە بژێرییەوە ئەو نیعمەتەی وەرگرت، ئەوا خوای گەورە چەندەها نیعمەتی تری بۆ ڕەوانە دەكات.

برایـنـە! لـەم فـەرموودەی پێغـەمبـەرەوە(د.خ) بـەتـەواوی دەردەكـەوێ كـە هـەر كـەسێك ئامۆژگارییەكی ئاینیی لەبابەتێكەوە وەرگرت، ئەوە خوای گەورە نیعمەتی بۆ زیاد دەكا چ لەو بابەتەوەو چ لەبابەتی ترەوە؛ بۆ نموونە: كەسێك ئامۆژگارییەكی لەبابەتی نوێژەوە وەرگرت، ئەوە خوای گەورە دڵ و دەروونی وا لێ دەكا كە گەلێك ئامۆژگاریی تر بەهۆی نوێژەوە وەربگرێ و، لە هەمان كاتدا كە چەند نیعمەتی تری بۆ زیاد دەكا

«والا لكانت حجة من الله عليه» إلى أن قال: ويزداد بها سخطاً» واتە: ئەگەر سوپاسی ئەو نیعمەتەی نەكرد ئەوە ئەو نیعمەتە كە بۆی ڕەوانە كراوەو ئەو گەڕاندوویەتەوە خوای گەورە دەیكاتە شایەت لە سەر سوپاس ناگوزاریی ئەو كەسەو، ناڕەزاییی خۆی لەسەر زیاد دەكا. ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) بەتەواوی لەگەڵ فەرموودەی خوای گەورەدا ڕێكە كە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «لان شكرتم لازيدنكم، وأن كفرتم أن عذابي لشديد».. واتە: بەڕاستی ئەگەر ئێوە سوپاسی نیعمەتی من بكەن و حەقی ئەوانە جێبەجێ بكەن منیش نیعمەتتان بۆ زیاد دەكەم، هەروەها ئەگەر سوپاس ناگوزار بن و دان بەو نیعمەتەدا نەنێن و ڕوو لە خوا نەكەن، ئەوا سزام بۆ ئەوانە زۆر توندو سەخت دەبێ.

جا ئەی برا ئاینییەكان! دڵنیا بن هەر نامەیەكی من كە بۆتانی دەنێرم دیارییەكەو نیعمەتێكە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئێوە نێرراوە، دیارە ئێوە هەروەك بە دیاریی دنیا دڵشاد دەبن، پێویستە بە دیاریی ئاینی زۆرتر شادمان ببن و، ئەگەر بەم دیاریی منە كە گەورەترین دیارییە دڵخۆش نەبن و وەری نەگرن ئەوە مانای ئەوەیە كە باوەڕتان بێ هێزە؛ چونكە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: لە گەورەترین خووڕەوشتی موسڵمان ئەوەیە كە لە ئامۆژگاریی خێر تێر نەبێ و، بەم خووە گەورە باشە لە بەهەشتدا پایەی بەرزی پێ دەبەخشرێ.

حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی:

« لقد سبق إلى جنات عدن أقوام ماكانوا أكثر الناس صلاة ولا صياماً ولا حجاً ولا أعتماراً، ولكن عقلوا عن الله مواعظ فوجلت قلوبهم و خشعت منهم الجوارح وأطمأنت اليه نفوسهم».

واتە: هەندێك لە موسڵمانان پێش خەڵكی تر دەچنە بەهەشت، كە نوێژو ڕۆژوو حەج و عەمرەیان لە خەڵكی تر زۆرتر هەبووە، بەڵام چەند ئامۆژگاری و نەسیحەتێكیان لەلایەنی خوای گەورەوە وەرگرتووەو تێی گەیشتوون و، بەم هۆیەوە دڵیان ترساوەو، لەشیان فەرمانی خوای بەجێ هێناوە و، دڵ و دەروونیان لەسەر ئەو ئامۆژگارییانە دامەزراوە.

پوختەی وتە: ئامۆژگاری كردن لە خووە بەرزەكانی حەزرەتی پێغەمبەرە (د.خ) هەروەها گوێ ڕاگرتن بۆ ئەو ئامۆژگارییانەو ڕەفتار پێ كردنیان و دڵ پێ خۆش بوونیان لە خوڕەوشتی موسڵمانە باشەكانەو، هەروەك ئامۆژگاری كردن خێرە گوێ بۆ ڕاگرتنیشی خێرەو، هەر زانایێ ئامۆژگاری بكات و، هەر نەزانێ گوێی بۆ ڕابگرێ هەردووكیان بە خێر و پاداشتی چاك دەگەن. ئێستە كە زاناكان دەستبەرداری ئامۆژگاریی بوون و خەڵكی هەرەمەش لە بیستنی وتاری زانایان وەڕس بوون، هەردوولایان لەو پایە بەرزە كە باس كرا نائومێدن. فەرموودەی حەزرەتە(د.خ): «أذا حمل رجل كلمة من الله إلى أخيه المسلم كان خيراً له من حجة وعمرة ومن عبادة سنة وأعظم». واتە: كاتێ مرۆیەك وتارێكی خوای خۆی بە برای موسڵمانی خۆی گەیاند ئەوە بۆ ئەو كەسە باشتر و خێرترە لە حەجێك و لە عەمرەیەك و لە خواپەرستیی ساڵێك.

پێویستە بزانن كە ئەم عالەمی دنیایە مەنزڵگای موسافیرانی عالەمی قیامەتەو ڕێ گوزەرە بۆ ئەوان بۆ گەیشتن بە خوای گەورەو، ماوەی سەفەری دوور پێویستی بە توێشوویە و،توێشووی ئەم ڕێگەیەش نوێژێكە كە لەگەڵ ئاداب و شەرائیت وئەركاندا بكرێ.

جا لەبەرئەوەی ئەم نامەی منە، باسی ئەم توێشووە گەورە دەكا، كە نوێژە، تكا دەكەم لە زاناكان ئەم نامەیە بۆ موسڵمانان بخوێننەوەو، تكاش دەكەم لە برا موسڵمانەكان ئەوانیش گوێ بۆ ئەو زانایانە ڕابگرن كە ئەو نامەیان بۆ دەخوێننەوە.

براكانم! داواتان لێ دەكەم كە بەم میزانە بۆتان بەیان دەكەم ئیمان و باوەڕی خۆتان بكێشن، هەتا حاڵی ببن ئیمانەكەتان بەهێزە یا لاوازە.

ئەی برای ئاینی ئەگەر دەستەڵاتدارێ، فەرمانڕەوایێ، یاسایەك دامەزرێنێ و جاڕ بدا بەناو خەڵكدا: «هەر كەسێ بەم یاسای منە ڕەفتار بكات ئەوە لە بارەگای مندا بە حورمەت دەبێ و، هەر كەسێ بەو یاسایە ڕەفتار نەكات سزا دەدرێ»، لە هەمان كاتدا دوو مەئمووریش بنێرێ بۆ چاودێریی هەموو كەسێك، سوێندتان دەدەم بە خوا هەر كام لە

ئێوە ئەو مەئموورانە ببینیْ چەندێك دەترسیْ و چەندیْ ئاگاداریی خویْ دەكات هەتا بە پێچەوانەی یاسای ئەو فەرماندارە ڕەفتار نەكات؛ چونكە باوەڕی بە قسەكانی هەیە؟!

كەواتە ئێوە وەرن تەماشا بكەن خوای گەورە، قورئانی پیرۆزی ناردووە بۆ سەر حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) كە بە هەموو مرۆیەكی هوشیاری بگەیەنیْ، هەروەها لەم قورئانەدا لە گەلیْ شوێنیدا فەرمانی داوە بە كردنی نوێژ و دانی زەكات و فەرموویەتی: «وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة» و، چەندەها جاریش نەهیی لە گوناح كردن و تاوانباری كردووەو، دوو فریشتەی گەورەیشی كردوون بە چاودێر لەسەر ئێوە تا ئەحوالْتان بنووسن. بە زاتی خوای گەورە سوێندتان دەدەم ئەگەر ئێوە بە ئەمرو نەهیی خوا ڕەفتار نەكەن، ئەوە دەلیل نییە لەسەر بیْ هێزیی باوەڕتان؟ واتە: ئەگەر باوەڕتان بیْ هێز نییە، بۆچی لە كاربەدەستی فەرمانڕەوا دنیاییەكە دەترسن و یاساكەی جێبەجیْ دەكەن، كەچی گویْ بە ئەمر و نەهییەكەی خوای مەزن نادەن؟! ئاخۆ ئەو كەسەی كە تەنیا بەزمانی دەڵیْ ئیمان و باوەڕم بە ئەمرو نەهیی خوا هەیە و زۆر بەهێزە ڕاست دەكا یانا!؟..

زۆر ئاشكراو دیارە كە مرۆڤ ترسی لە فەرمانڕەوای دنیا زۆر زۆرە، وەكو حەزرەتی عوسمان خوای لیْ ڕازی بیْ، فەرموویەتی: «ما يزع الله بالسلطان أكثر مما يزع بالقرآن». واتە: ئەو زەجرو نەهێشتنە كە خوا بە هۆی فەرمانڕەوای دنیاییەوە دەیكات زۆرترە لەو زەجرو نەهێشتنەی كە بەهۆی قورئانەوە دەیكات. بەڵام پێویستە مرۆڤی هوشیار ئەوەندە هەستی هەبیْ ئەوە بێنێتە پێش چاوی كە لە دەستی خوا دەرناچیْ و، لە ئەنجامدا خوا حیسابی ڕەفتاری لەگەڵ دەكا، جا ئەگەر لای وابیْ و بڵێت: خودا (غفورو رحيم)ە، دەبیْ ئەوەش بزانی كە خوا سەختگیرە و سزای بە توند دەدا، بێجگە لەوەش كە بیْ باكە و هەرچی بكا دەیكا، واتە:

(غفورو رحيم)ییەكەی بەرانبەر (شديد العقاب)ییەكەیەتی و، مرۆڤی ژیر هەقی وایە لە ڕۆژی حسابی كردەوەی خۆی ئاگادار بیْ، كە ڕۆژێكی گران و پڕ لە بیمە.

شێخ (ابن حجر) ڕەحمەتی خوای لیْ بیْ فەرموویەتی: ئەو كەسە كە تاوان دەكات و دەڵیْ: خوا (غەفوورو ڕەحیمە) ئەوە شەیتان تەفرەی داوەو، ئەو وەزعە نیشانەی بەدبەختیی ئەو كەسەیەو مانای ئەوەیە لە پاشەڕۆژدا بەر سزاو ئازاردان دەكەویْ لەلایەن خوای گەورەوە. لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە ریوایەت كراوە (د.خ) كە فەرموویەتی:

«الكيس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت، والاحمق من أتبع نفسه هواها، وتمنى على الله الاماني». واته: مرۆڤی زیرەك ئەو كەسەیە كە نەفسی خۆی ڕام بكات و ڕای بهێنێ بۆ ڕەفتارو كردارێك كە لە پاش مردن سوودی هەبێ بۆی، هەروەها مرۆڤی عەقڵ سووكیش ئەو كەسەیە كە نەفسی بخاتە دوای هەواو ئارەزووی، واتە: چی نەفسی ئارەزووی بكا بیكا، لەگەڵ ئەوەشدا لە خۆیەوە داوای داخوازییە جۆربەجۆرەكان بكا لە خوای گەورەو، بەتەما بێ خوا بیداتێ. بێگومان خوای گەورە توانای هەیە هەموو شتێ بكات لەگەڵ هەموو كەسێكدا..، بەڵام یاسای وایە كە لە پاداشتی كردەوەی خراپدا لە دۆزەخدا ئازاریان بدا، ئیتر هەر كەسێ عەفوو بكات ئەوە شێوەی ئیحسان و میهرەبانییەو، هەر كەسیش سزا بدا عەدالەت و دادپەروەرییە..

برادەرەكانم! پیاوێكی خواپەرستی لە خواترس لە خەویا چاوی كەوت بە شێخ ئەبوویەكری كەنارانی، كە یەكێك بووە لە ئەولیاكانی زەمانی خۆی، بەڵێ لە خەودا دیی كە بەسەر گۆڕەكەی خۆیەوە ڕاوەستاوە دەگری. عەرزی كرد: یاشێخ هۆی ئەم گریانەت چییە؟! لە وەڵامدا فەرمووی : هۆی ئەوەیە تەماشا دەكەم ئەوانەی كە دەمرن و دەیانهێنن بۆ گۆڕستان زۆربەیان بە بێ ئیمانی و ئەنجام شەڕی گیرۆدەن، لە ڕاستیدا هۆی ئەمەیش بیروباوەڕی خراپ و ڕەفتاری نالەبارە. جا مادام خەڵكی ئەو ڕۆژە وەها بووبن، كە گەلێ لە ئەهلی ئەم ڕۆژە باشتر بوون، دەبێ حاڵی ئەهلی ئەم زەمانە چۆن بێ؟!.

ئەی برادەرانم! لەم نامەدا باسی گەورەترین گوێڕایەڵی و خوا پەرستی دەكەین؛ بۆیە پێویستە بزانن ئەوی پێویست و (واجیب) بێ لە بابەتی بیروباوەڕەوە، وەكو باوەڕ بە بوونی خوا و بە تەنیایی و بێ هاوڕێیی خواو، باوەڕ بە مەلائیكەو، باوەڕ بەو كتێبانە كە خوای گەورە ناردوونی بۆ پێغەمبەران (د.خ)و، باوەڕ بە هەموو پێغەمبەران و، باوەڕ بە ڕۆژی ڕەستاخێز (قیامەت) و پاداشتی كردەوە، ئەوە تێگەیشتن و فێربوونیان لە هەموو فەرزێ گەورەترە.

بەڵام ئەو بیروباوەڕانەی سوننەت بن، وەكو باوەڕ بە تەفسیلاتی ئەوانەی كە لە كتێبەكانی عەقائیدان، ئەوانە لە نوێژی سوننەت و ڕۆژووی سوننەت گەورەترن.

جا لەبەرئەوەی زیانی تەركی واجیباتەكانی تر زۆرترەو، خێر و پاداشتی نوێژكردن لە خێرو پاداشتی خوا پەرستییەكانی تر زۆرترەو، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) نوێژ كۆڵەكەی دینەو، بەردەوامی لەسەر نوێژی تەواو و خاوەن ئاداب بە نیشانەی بەهێزیی

ئیمانە دانراوە، لەبەر ئەمانە لەم نامەدا باسی چاکی و پایەبەرزیی نوێژ دەکەم.

حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «الصلاة خیر موضوع من أستطاع منکم أن یستکثر فلیستکثر». واتە: نوێژ خێرێکەو بەهرەیەکە بۆ ئێوە دانراوە، یا نوێژ چاکترە لە هەموو عیبادەتێ کە بۆ بەجێهێنانی دانراوە؛ چونکە هێز و بێ هێزیی ئیمانی موسڵمان بە نوێژ دەردەکەوێ و، هەر کەسێ ئیمانی بەهێزتر بێ زۆرتر تێ دەکۆشێ بۆ کردنی نوێژەکەی و چاودێریی کاتی و کۆکردنەوەی مەحاسنی لە ئەرکان و شەرائیت و هەیئات و چاودێریی خشووع و ئەدەب لە نوێژەکەیدا..

باقیی حەدیسەکە دەفەرمووێ: «من أستطاع منکم أن یستکثر فلیستکثر» مانای ئەوەیە: کەسێ کە توانای هەیە زۆر نوێژ بکا با بیکا، دیارە زۆر و کەمیی نوێژ بە پێی سوننەتەکانە ئەگەر نا فەرزەکانی دیارن و زیاد و کەمیان تێدا نییەو فەرزی عەینن و لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغ و عاقڵ پێویستە جێبەجێیان بکا. هەندێ لە زانایان نووسیویانە کە نوێژ دوانزە هەزار خەسڵەتی تێدایە، بە کورتی ئەم دوانزە هەزار خەسڵەتەی هێناوەتە سەر دوانزەو، باوەڕم وایە ئەم خەسڵەتانە بەستراون بە دوانزە ڕوکنی نوێژەوە: نییەت، الله اکبر، ڕاوەستان، فاتیحە خوێندن، رکووع، ئیعتیدال، دوو سوجدە، دانیشتن لە بەینیاندا، تەحییات، سەڵەوات لەسەر حەزرەت (د.خ)، سەلام دانەوە. بەڵگە لەسەر ئەوەی کە نوێژ چاکترو گەورەترە لە جۆرەکانی تری خودا پەرستی چەند شتێکە:

یەکەم: فەرموودەی پێغەمبەرە، دروودی خوای لێ بێ، کە فەرموویەتی:

(أن الله لم یفرض شیئاً أفضل من التوحید والصلاة، ولو کان شئ أفضل أفتراضه) واتە: خوا پەرستیارییەکی لە نوێژو خوا بەیەك زانین، چاکتری دانەناوەو، ئەگەر شتێکی تر بووایە لەم دووانە گەورەتر ئەوەی فەرز دەکرد، لە ڕاستیدا گەورەیی لەمە زیاتر نابێ کە خوا لە قورئاندا نوێژی لەگەڵ خوا بەیەك زانیندا داناوە. هەروەك بە مووسا پێغەمبەریشی فەرموو (د.خ): «أننی أنا الله لا اله الا أنا فاعبدونی وأقم الصلاة لذکري» واتە: ئەی مووسا! بەڕاستی هەر من خوام و ناوی خۆم ناوە «الله» و، هیچ کەس شایستەی ئەوە نییە پەرستیاریی بۆ بکەن من نەبێ ، جا بەڕاستی ودڵسۆزییەوە بمپەرستە و نوێژەکانت بە جێ بهێنە تا ناوم ببەی و یادم بکەی، واتە: نوێژکردن هەم ناوبردنی خوایە و هەم یادکرد نیەتی. بەکورتی

خـوا بـەیـەك زانـین و نـوێژ كردن گـەورەتـرین خـوداپـەرستـین؛ خـوا بـەیـەك زانـین گـەورەتـریـن پـەرسـتـیـاریـی دەروونـی و بـیـروبـاوەڕیـیـە، نـوێژكردن گـەورەتـرین پەرستیارییە كە بە ئەندام بكرێ و، هەروەك خوا بەیەك زانین لای ژووررووی باوەڕە نوێژكردنیش كە نیەت و (اللەاكبر) وتن و ڕاوەستان و ڕكووع و سجوودە لای ژووررووی پەرستیاریی بەدەنییە... باسی جێبەجێكردنی نوێژ لەپاش ئەمر كردن بە پەرستیاری لەبەر گرینگیی نوێژەكەیە؛ واتە: هەر چەندە نوێژ یەكێكە لە خواپـەرستـیـیـەكـان. بـەڵام تـایـبـەتـیـیـەو وەكـو خـوداپـەرستنێكی جیا وایەو، قەدرو پایەی لە خوداپەرستییەكانی تر بەرزترە..

دووەم: ئەوەیە كە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: «أول ما یحاسب علیه العبد الصلاة» واتە: یەكەم خواپەرستنێ، كە لەگەڵ بەندەدا خوا حیساب و كیتابی لەسەر دەكات، نوێژە، واتە: ئەگەر نوێژەكانی باش دەربچن ئەوا دەبێتە هۆی میهرەبانی و ڕەزامەندیی خوای گەورە، خۆ ئەگەر نوێژەكانی باش دەرنەچن ئەوا دەبێتە هۆی قار و سزای خوا، پەنابەخوا.

سێیەم: ئەوەیە كە نوێژ پەرستیارییەكە فریشتەكان كردوویانەو دەیكەن و، لەو ڕۆژەوە دروست كراون ئەوەندەی خوا مەیلی لێ بێ لە وەستاندان و خەریكی تەسبیحاتن و هیچ كاتێ لە یادی خوا غافڵ نین.

چوارەم: ئایەتی پیرۆزی «ولذكر الله اكبر» دەلیلە لەسەرئەوە كە نوێژ لە پەرستیارییەكانی تر گەورەترەو پایەدارترە؛ چونكە هەندێ لە مفسرەكان وتوویانە : مەبەس لە (ذكر الله) نوێژە.

پێنجەم: ئەوەیە لەو ئایەتانەدا كە خوا مەدح و سەنای موسڵمانانی باش دەكا، مەدحیان دووبارە دەكاتەوە جارێ بەوەی كە نوێژ دەكەن و جارێ بەوەی كە پارێزگاریی ئادابە زاهیری و باتنییەكانی دەكەن. هەروەها لە سوورەتی(مؤمنون)دا خوای گەورە تاریفی موسڵمانان بە نوێژ دووبارە دەكاتەوە، یەكەم جار بەوەی كە لە كـاتـی نـوێژدا لـە خـواتـرس و بـەئـەدەبـن ، دووەم جـار بـەوەی كـە پـارێزگـاریـی نوێژەكانیان دەكەن و دەوامی لەسەر دەكەن.

هەروەها لە سوورەتی (فتح)دا خوای گەورە مەدحی یارانی پێغەمبەر (د.خ) بەوە دەكا كە زۆر نوێژ دەكەن، ئەگەر چی پەرستیارییەكانی تریشیان هەر زۆر كردووە ئەمەش

پایەبەرزیی نوێژ دەگەیەنێ؛ ئەوەتا فەرموویەتی: «تراهم رکعاً سجداً یبتغون فضلاً من الله و رضوانا» واتە: لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر نوێژ دەکەن و رکووع و سجدە دەبەن داوای زیادە میهرەبانی و ڕەزامەندی لە خودای گەورە و بەخشندە دەکەن. باسکردنی ڕستەی «یبتغون.. الآیة » لەدوای وشەی «رکعاً سجداً» ئەوە دەگەیەنێ کە نوێژکردنی زۆر دەبێتە هۆی میهرەبانی و ڕەزامەندیی خوا لێیان، هەروەها ئیشارەیە بۆ ئەوەی کە خوا بەڵێنی پێ داون بە میهرەبانی و پاداشدانەوەیان، ئەگەرنا لە باسی تەعریفی ئەواندا بەیانی ئەمەی مەدەکرد . دەلیل لەسەر ڕاستیی ئەم ئیشارەتانە ئەوەیە کە لە بەینی بەندبەندی مەدحەکەداو بەر لەوە مەدحەکە تەواو بکات ئەم ڕستەی «یبتغون فضلاً من الله و رضواناً»ی هێناوەتە بەینەوەو، پاش ئەو ڕستە مەدحێکی تریان دەکات و دەفەرموێ: «سیماهم في وجوههم من اثر السجود» هەروەها لە هێنانی فیعلی مضارعدا، کە دەفەرموێ: «تراهم رکعاً سجداً» ئیشارەیە کە نوێژکردنەکەیان زۆرەو ڕاست و بێ خەوشە؛ چونکە لە زمانی عەرەبیدا فیعلی مضارع مەعنای تازەبوونەوەو بەردەوامیی کارەکە دەگەیەنی.. هەروەها وشەی «تراهم» چ بە مانا دیتن بێ، وەکو لێرەدا دیارییە، چ بە مانا زانین بێت، مانای ئەوە دەبەخشێ کە ئەوە کردەوەی ئەوانە واقیعەو ڕاستەو بێگومانە. لە ڕستەی «یبتغون فضلا من الله ورضوانا» ئەوەش دەردەکەوێ کە نوێژکردن خزمەتکردن و نزیك بوونەوەیە لە خوا، وەکو لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «الصلاة خدمة الله في الآرض». جا هەروەکو کەسێك لەسەر ئەرزدا خزمەتی پاشایەك بکا، دەیەوێ بە شێوەیەك خزمەتەکە بکات کە لای ئەو پاشایە لە هەموو شت و شێوەیەك مەرغوویتر بێ و، دەیەوێ لەم خزمەتەیشیدا بەردەوام بێ، نوێژکردنیش باشترین خزمەتی خوای مەزنە لەسەر ئەرزداو، ئەو نوێژکەرە دڵسۆزانەش دەیانەوێ هەمیشە لە سەر ئەو نوێژەیان بەردەوام بن و، هەموو کات بە دڵ و بە گیان لە بەردەمی خوای میهرەبانی خۆیاندا بن. دیارە نوێژێك کە باشترین خزمەتی خوا بێت دەبێ لەگەڵ لە خواترسی و دڵگەرمی و ئاگاداریی نوێژکەرەکەدا بێ. یەکێ لە پیاوە ئاینییە گەورەکان، کە ناویانگی (دارانی) بووە، فەرموویەتی : ئەگەر «مخیرم» بکەن لە بەینی ئەوەدا کە دوو ڕکات نوێژ بکەم یا بچمە بەهەشت دوو ڕکات نوێژەکە ئیختیار دەکەم؛ چونکە دوو ڕکاتە نوێژەکە داواکراوی خوای گەورەیە، بەهەشت داخوازیی نەفسەو، بێگومان بەجێهێنانی ئەمری خوا دەخرێتە پێش بەجێهێنانی ئارەزووی نەفس. منیش دەڵێم بەڵگەیەکی تر لەسەرئەوەی کە نوێژ چاکترین خواپەرستییە ئەوەیە کە هیچ پەرستیارییەك ئەوەندەی

نوێژ لە قورئانی پیرۆزدا باس نەکراوە؛ چونکە نوێژ لە هەشتاوسێ جێگا لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە، کەچی پەرستیارییەکانی تر بەو زۆرییە باس نەکراون.

شەشەم دەلیل لەسەر گەورەیی نوێژ ئەوەیە کە لە نێو ئەرکانەکانی ئیسلامدا تەماشا دەکەین حەجکردن لە ماوەی عومری مرۆدا یەکجار واجیبە، زەکات لەسەر ئەوانەی نییانە واجیب نییە. ڕۆژ و ساڵی جارێکە، بەڵام نوێژ لە هەموو شەو و ڕۆژێکی ژیانی مرۆدا پێنج جار فەرزە هەتا لەو شەو و ڕۆژەدا هەرگیز لە خوای گەورە بێ ئاگا نەبێ. هەروەها بەڵگەیەکی تر بۆ گەورەیی نوێژ ئەوەیە کە هیچ پەرستیارییەك نییە وەکو نوێژ هەمیشەو لە هەموو شوێنێکدا لە شار و لە دێهات لە کۆچەری و لە دانیشتوییدا لە ساغی لە نەخۆشیدا ببێتە دروشم و نیشانەی دەرکەوتنی ئیسلامییەت و یارمەتیی نێوان خەڵك و یەکترناسین و چاوپۆشی لەیەك کردن و بێ جیاوازیی لە نێوان گەورە و بچووك خادم و مەخدوومدا.

ئەگەر بانگدان و نوێژکردن و جەماعەت نەبووایە دروشم و نیشانەی ئیسلامەتی بەم جۆرە دەرنەدەکەوت. بێجگە لەمانە هەموو نوێژکردن گەلێ قازانجی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و فام وەرگرتنی دەرس و تەمێ و تەربیەی تێدایە. هەروەها هیچ پەرستیارییەك نییە بە شێوەی (فەرزییەت) ئەمر کرابێ بەردەوام لەسەر کردنی بێجگە نوێژ. هیچ جۆرە پەرستیارییەك ئەوەندەی نوێژ نەوعەکانی زۆر نییە؛ نوێژ سی جۆری هەیە: نوێژی کاتی لەماڵ بوون. نوێژی کاتی سەفەر. نوێژی قەسر. نوێژی جەمع. نوێژی کاتی ئاسایش. نوێژی ترس و بیم. نوێژی جەژن. نوێژی ڕۆژگیران. نوێژی نوێژی باران بارین. نوێژی مردوو. نوێژی فەرز. نوێژی سوننەت. نوێژی سوننەتی موئەککەدە. نوێژی سوننەتی غیر موئەککەدە. نوێژی شەو. نوێژی وەتر. نوێژی دەستنوێژ. نوێژی ئیستیخارە. نوێژی ڕەوابوونی حاجەت و پێویستی. نوێژی چوون بۆ سەفەر. نوێژی لە سەفەر هاتنەوە. نوێژی ئیشراق. نوێژی چێشتەنگا و. نوێژی ئەووابین. نوێژی تەراویح لە مانگی ڕەمەزاندا. نوێژی دیاریی مزگەوت. نوێژی (صلاة التسبيح). نوێژی تەوافی (بیت الله). نوێژی جەماعەت. نوێژی جومعەو غیری ئەمانەش کە لە کتێبە ئاینییەکاندا باس کراون...

ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە نوێژ لە هەموو عیبادەتێ خێرو بەرەکەتی زۆرترەو، ئەو پێغەمبەرە کە خوا ناردوویەتی بۆ سەر جن و ئینس، واتە: پەری وئادەمیزادو، کردوویەتی بەهۆی ڕەحمەت و میهرەبانی بۆ جیهان، ئەم نوێژەی هێناوە بۆمان کە ببێتە

مایەی سەرکەوتن و بەختیاری و ڕزگاریمان لە ئازاری ڕۆژی قیامەت. خوسای گەورە بە میهرەبانیی خۆی لەباتی ئێمە جەزای بداتەوە بەو جەزایە کە شایانی پایەی ئیحسانی خۆی و فەزل و پایەی پێغەمبەرە (د.خ). کەوابێ پێویستە ئێمە بە دڵ و بە گیان ئەم تەعلیماتەی ئەو وەربگرین و ڕەفتاری پێ بکەین. بێگومان ئەو کەسەی کە لە سەر ئەم ڕێبازە نەڕوا، خۆی زیان لە خۆی دەدا؛ چونکە نەکردنی ئەم عیبادەتە یا کردنی بە بێ بەجێهێنانی ئاداب و مەرج و ڕوکنەکانی دەبێتە مایەی سزاو ئازاری ڕۆژی قیامەت و نائومێدبوون لە پایە و مایەیە کە دەستی موسڵمانی گوێڕایەڵ دەکەوێ..

هەروەها بەڵگەیەکی تر هەیە کە دەلالەت لە گەورەیی نوێژ دەکات ئەویش ئەوەیە نوێژ پڕیەتی لە ذکری خوداو هەموو ئادابەکانی مایەی ذیکرو یادی خوان: «تکبیر» کە وتنی (الله اکبر)ە بەیانی گەورەیی خوایەو ئەوە دەگەیەنێ کە خوا لە هەموو گەورەیە گەورەترە.. (ڕاوەستان) بەرامبەر بە قیبلە ڕاوەستانێکە بۆ پەرستنی خودایە. (فاتیحە خوێندن) مەدح و سەنای خوایە و پاڕانەوەیە لە بارەگای خوا. (ڕکوع و سجوشکردنی مەدح و پیاهەڵدان بۆ یەزدانی گەورەو، سڵاوکردنە لە پێغەمبەری خواو، سڵاو کردنە لەو کەسانەی کە بۆ ڕەزای خوا هەوڵ دەدەن و، ئیقرار کردنە بە تاق و تەنیایی خواو، دان نانە بە پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەمەد مستەفا (د.خ).

هەموو ئەمانە چ گوفتار و چ ڕەفتار دێنەوە بۆ سەر زیکرو یادی خوای گەورە؛ کەوا بوو نوێژکردن زیکری خوایە بۆیە هەندێ لە موفەسیرین مەعنای «ولذکر الله اکبر» یان بە نوێژ لێ داوەتەوەو فەرموویانە: یانی نوێژ بۆ خودا گەورەترە لە هەموو تاعەتێکی بەدەنی.

هەرەوها پێویستە بزانن کە لە پەرستیارییە ناواجبەکانیشدا خوای گەورە فەرمانی داوە بە بەردەوامبوون لە سەر یادی خواو، لە چەند ئایەتدا ئەم ئەمرەی دووبارە کردووتەوە، واتە: بزانن زیکری خوا لە هەموو شتێ گەورەترەو، بەرامبەری زیکر ، غافڵ بوونە لە خوا کە لە هەموو حاڵێکی ئینسان ناشیرینترە، وەکو خاوەنی «گوڵشەنی ڕاز» فەرموویەتی:

هران کس غافل از حق یك زمان است
درآن دم کافراست اما نهان است
مگر آن غافلی پیوسته گردد
در اسلام بر وی بسته گردد

بە کوردی واتە:

هەرسێ تاوێ لە خوا غافڵ بێ
لەو کاتا نابێ دینی کامڵ بێ
کاتێ کە غەفڵەت دامەزرا لە دڵ
ئیسلام لەو دڵا ناگرێ مەنزڵ

نوێژ کە گەورەترین فەرزەکانی بەدەنە خوای گەورە سنوور و ئەندازەیەکی بۆ داناوە، بەڵام ئەندازەو سنووری بۆ زیکر دانەناوەو عوزری بۆ تەرککردنی بڕیار نەداوە، بەڵکو فەرمانی داوە بە دەوامکردن لەسەری لە هەموو حاڵێکدا. خوای گەورە بەیانی هوشیاری بەو کەسانە کردووە کە لەسەر زیکری خوا بەردەوامن و فەرمویەتی: «أن في ذلك لآيات لأولي الالباب، الذين يذكرون الله قياماً وقعوداً وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والارض..». لە ڕاستیدا مرۆڤ لە هیچ کاتێکدا لە یەکێك لەم حاڵەتانە دەرناچێ، واتە: یا ڕاوەستاوە یا دانیشتووە یا ڕاکشاوە...

حەدیسێکی تر کە بەڵگەیە لەسەرئەوەی نوێژ گەورەترین پەرستیارییە ئەوەیە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: «الصلاة عماد الدين والايمان» واتە : نوێژکردن بناخەو کۆڵەکەی پەرستیاری و باوەڕە، کەواتە نوێژکردن لە پەرستیارییەکانی تر گەورەترەو، نوێژکردن بەڵگەو نیشانەی باوەڕە لە دڵی مرۆڤدا، چونکە باوەڕ شتێکی پەنامەکییەو، پێویستە شتێك هەبێ کە ببێتە نیشانەی و، باشترین نیشانەی باوەڕ دەوامکردنە لەسەر نوێژ.

شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەم شوێنەدا لە سەر شێوەی ئەولیای خاوەن شهوودو کشووفات دەفەرمووێ: دەلیل لە سەر گەورەیی نوێژ ئەوەیە کە نوێژ پەرستیاریی هەموو پەرستیارێکی تێدایە؛ بۆ نموونە: لە نوێژدا ڕاوەستان هەیە و ڕاوەستان عیبادەتی گیا و دارە. نوێژکردن ڕوو لە قیبلە کردنی تێدایەو، ئەم حاڵە حاڵی کەژ و کێوە؛ چونکە کێوەکان ڕوویان لە قیبلەیەو، مرۆی زیرەك بەشێوەی کێوەکاندا قیبلە دەدۆزێتەوە. هەروەها نوێژ زیکری خوایەو، هەموو گیا و دارێکی تەڕ زیکری خوا دەکا، بە دەلیلی ئەوەی کە حەزرەت (د.خ) لقە خورمایەکی تەڕی لە سەر قەبری مردوویەکی ئەهلی سزا داچەقاند کە لە بەر زیکری ئەو لقە تەڕە سزای ئەو مرۆڤە سووك ببێ. نوێژ ڕکووعی تێدایە، ڕکووع

پەرستیاریی فریشتەی ئاسمانی دووەمە کە لەوکاتەوە دروست کراون وان لە ڕکووعدا. نوێژ سوجدەی تێدایە کە سوجدە پەرستیاریی فریشتەی ئاسمانی سێیەمە: ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی : کاتێ گەیشتمە ئاسمانی سێیەم و چەند ڕیز فریشتەم چاو پێ کەوت کە لە سوجدەدا و بوون، لە (جبریل)م پرسی: ئەمانە چین ، وتی: ئەمانە فریشتەن و پەرستیاریی ئەم فریشتانە سوجدەیە بۆ خوا لەو ڕۆژەوە دروست کراون پەرستیارییان ئەمەیە، هەموویان لە حاڵی ترس لە خوادان هەتا ڕۆژی قیامەت؛ حەز دەکەم داوا بکەی لەخوا ئەم جۆرە عیبادەتە بدا بە تۆو بە ئوممەتی تۆ، جا حەزرەتی جبریل فەرمووی: یا ڕەسووڵڵا سڵاویان لێ بکە، حەزرەت دەفەرموێ: سەلامم لێ کردن ئەوانیش وەڵامی سەلامەکەیان دامەوەو لەگەڵ سوجدەکەی خۆیاندا تێ هەڵچوونەوە. نوێژ دانیشتن و ئارامگرتنی تێدایەو دانیشتن و ئارامگرتن عیبادەتی هەر شتێکە لە جیهاندا کە دامەزراو و ئارامە، هەروەها عیبادەتی فریشتەی ئاسمانی چوارەم ئەوەیە کە لەسەر ئەژنۆ دامەزراون و خەریکی پەرستیاریی خوای مەزنن. لەسەر ئیشارەتی حەزرەتی جبریل پێغەمبەر (د.خ) داوای لە یەزدان کرد ئەم جۆرە عیبادەتەش بدا بە ئوممەتی ئەو. جا کە لە شەوی میعراجدا خوای گەورە نوێژی لە سەر حەزرەت و ئوممەتەکەی فەرزکرد، لەو نوێژەدا ڕاوەستان و پشت چەماندنەوەو ناوچاوان لەسەر عەرز دانان و ئارامگرتن و پێشکەشکردنی سوپاس و ستایشی بۆ زاتی خۆی دامەزراند.

بەڵگەیەکی تر لەسەر گەورەیی نوێژ ئەوەیە کە نوێژ هەموو جۆرە پەرستیارییەکی تێدایە تەنیا ماڵ سەرف کردن نەبێ؛ بۆ نموونە: زیکرو، تەهلیلە و تەکبیر و تەحمید و تەسبیح و ئیستیغفار و دوعاو شەهادەت و ئیمان و خوێندنی قورئان و سەڵەواتدانی بۆ سەر پێغەمبەر (د.خ) تێدایە..

لەگەڵ ئەمانەشدا خواردن و خواردنەوەو لەزەتی تر کە لە ڕۆژوودا مەنع کراون لە نوێژیشدا مەنع کراون، زیاد لە وانەش لە نوێژدا قسەکردن یاساغ کراوەو کە قسە کرا لە نوێژدا نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام قسەکردن ڕۆژووی پێ بەتاڵ نابێتەوە.

هەروەکو لە حەجدا نیازی (بیت الله) هەیە لە نوێژیشدا نیازی بەجێهێنانی عیبادەت و ڕوو لە (بیت الله) کردن هەیە. لە نوێژدا جیهادی نەفس هەیە، واتە: مرۆڤ بەهۆی نوێژکردنەوە مەنعی نەفسی خۆی دەکا لەوەی حەزی لێ دەکات، تەنانەت ئەگەر نوێژەکە تەواو بێ و بە ترس و خشووعەوە بێ، خەیاڵ کردنەوەی بێ سوودیش مەمنووعە،

پێویستە مرۆڤی نوێژکەر بە هەموو هێزو هەستیەوە ڕوو لە خوای خۆی بکات.. تەنانەت (صلاة الاشراق) یانی: نوێژی پاش هەتاوکەوتن بەمەرجێ ئادابەکەی باش جێبەجێ بکرێ بە (حەج) دانراوە، واتە: خێری حەجێکی سوننەتی هەیە.

زاناکان: تەشبیهی مرۆڤی نوێژکەریان بە درەختێکی خاوەن بەر کردووەو ئینسانی بێ تاعەت بە داری بێ بەر و مرۆڤی بەدڕەفتارو تاوانباریان بە داری دڕکاوی وەك داری دڕکەزی و تووترك تەشبیە کردووە. جا هەروەکو داری خاوەن بەر لە دنیادا بەڕێزەو ناسووتێنرێ و، هەندێکی تریش کە ئاگری بدەی باش ناسووتێ، مەگەر لەگەڵ داری وشکدا.. ئاوەها لە قیامەتیشدا مرۆڤی نوێژکەر بە ئاگری دۆزەخ ناسووتێ، واتە خوای گەورە لەبەر پیرۆزیی نوێژەکەی نایسووتێنێ، بەڵام هەروەکو داری بێ بەر و خاوەن دڕك زوو ئاگری تێ دەچێ و، خەڵکی دەیاننێن بە ئاگرەوە، لە قیامەتیشدا مرۆڤی بێ گوێ و بێ پەرستیاری و بەدڕەفتارو تاوانبار خوای گەورە دەیانسووتێنێ.

ئەم جۆرە شتانە بۆ ئەوە دەشێن مرۆڤ پەندیان لێ وەربگرێ و بیرکردنەوە لێیان زۆر بەسوودە.

ئیمامی غەزالی (علیە الرحمة) لە لێکدانەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەردا «الصلاة عماد الدین» فەرموویەتی: هۆی ئەمە ئەوەیە نوێژ مایەی فەرمانبەریی دڵە بۆ خوا پاڕانەوەیە لە بەردەمی بارەگای خوادا، هەروەها نوێژ تێکەڵبوونی گیانە لەگەڵ نووری خواداو مل کەچکردن و سەردانەواندن و سەر لە خاکدان و ڕاوەستانە لەبەر هەیبەت و گەورەیی خوا. نوێژ پەرستیارییەکە لەسەر هەموو جۆرە ئینسانێکی موسڵمان فەرز کراوەو، فەرقی گەورەو بچووکی تێدا نییە؛ کەوابوو خزمەتێ وەهابێ پێویستە بە دڵ و بە تێکۆشان بکرێ بۆ خوای گەورە، بۆیە دەبێتە کۆڵەکەی ئاین.

ئایندارە هوشیارە زاناکان فەرموویانە: نوێژ ئەمانەتە لەلای ئینسان، نوێژ خزمەتە بۆ خوا، نوێژ پەردەی ئاینە، واتە: پەردەی قەدر و حورمەتی ئەهلی دینە، نوێژ هۆی چوونە بەهەشتە، نوێژ پەردەیەکە مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ، نوێژ کۆڵەکەی ئاینە.

دەلیلێکی تر لەسەر گەورەیی نوێژ ئەوەیە کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی «الصلاة نور المؤمن» واتە: نوێژ نوورە بۆ موسڵمان. ئەم فەرموودەیە موژدەیە بە ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) کە نوێژ لە جیهاندا دەبێتە هۆی نووری ناوچاوی موسڵمان و، سیمایان جوان

دەكا. ئەوانەی كە نوێژ ناكەن ناوچاویان تاریك و بێ نوورە. هەروەها نوێژ نووری دڵ و دەروونی موسڵمانەو، هەركەس بە ترس ویقارەوە نوێژ بكا خوای مەزن دڵی نوورانی و سینەی گوشاد دەكا بەجۆرێ خۆی بەخۆی دەزانێ. هەروەها نوێژ دەبێتە نور بۆ قەبری مرۆی موسڵمان. لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە (د.خ) كە فەرموویەتی: لە شەوی تاریكدا دوو ركات نوێژ بكەن بۆ چاركردنی تاریكیی قەبر. هەروەها فەرموویەتی:

«صلاة الرجل نور في قلبه ، فمن شاء منكم فلينورقلبه» واتە: نوێژی مرۆڤی موسڵمان نوورە بۆ دڵ و دەروونی، جا ئەو كەسەی دەیەوێ، با دڵی خۆی نوورانی بكا.. دیسان فەرموویەتی: «الصلاه میزان فمن اوفی أستوفي» واتە: نوێژكردن تەرازوویە، یانی: ئەندازە بۆ تەواوكردن و بەجێهێنانی دانراوەو، هەركەس ئەو ئەندازە تەواو بكات جەزای باش و تەواوی خۆی وەردەگرێ. دیارە تەواوكردن و میزان ڕاگرتنی نوێژ بەوە دەبێ كە مرۆڤ هەموو ئاداب و مەرج و پایەكانی بەتەواوی بەجێ بهێنێ و لەكاتی نوێژەكەیدا ئاگای لە مەعنای نوێژەكەی ببێ و بزانێ ئەو نوێژە بۆ كێ دەكات و، لە كاتی نوێژ كردنەكەیدا لەگەڵ كێدا قسە دەكات؟ بەڵێ ئەگەر بەم شێوە نوێژی كرد ئەوە جەزاو پاداشتی چاكە بە ئارەزووی خۆی وەردەگرێ، ئەگینا نوێژەكەی كەم و كورت و ناتەواو دەبێ. ڕیوایەت كراوە ئەو فریشتانەی كە كردەوەی مرۆڤ دەنووسن، لە پاش لێبوونەوەی مرۆڤەكە نوێژەكەی، لە یەكتر دەپرسن: ئەم نوێژە چەندێكی كەم بوو نیوە یا سێیەك یا چواریەك یا زیاتر یا كەمتر ؟.. جا ئەوەی كە بە بێ خشووع و بەبێ چاودێری كردبێتی حسێبی ناكەن و پاداشتی لەسەر نانووسن.

لە ڕاستیدا (خشووع) واتە: ترسی دڵ لە خواو ئارامیی ئەندامەكان و بیركردنەوە لە مەعنای نوێژەكە، گرنگترین سوننەتەكانی نوێژ، تەنانەت هەندێ لە زانایانی ئاین ئەم خشووعەیان بە واجیب داناوەو فەرموویانە: بە هۆی تەركی خشووعەوە نوێژكەر گوناهكار و تاوانبار دەبێ؛ بۆیە پێویستە مرۆڤی نوێژكەر ئەم پایە بەرزەو ئەم مایە بەنرخەی نوێژ چاودێری بكات و بەهۆی بیركردنەوە لە مەعنای نوێژەكە ئەو خشووعە جێبەجێ بكا. خۆ ئەگەر مەعناكەی نەزانی ئەوا دەتوانێ بە ماوەیەكی كەم بە كورتی لە مەعنای نوێژەكە ئاگادار ببێ و لای زانایەكی ئاینی فێری ببێ. هەروەها لە مرۆڤی موسڵمان داوای ئەوە دەكرێ باوەڕی وابێ كە هەموو كردەوەكانی نوێژ، وەك ڕاوەستان و ركووع و هەڵسانەوەو وەستان و سوجدەكان و دانیشتنی نێوانیان ، هەموویان بە ئەمری

خوای گەورەن و لەبەر ڕەزامەندیی ئەو جێبەجێ دەکرێن، واتە: خوا حازرەو ئاگای لەو پەرستیارییە هەیە. بێگومان بەم خشووعە ترس لە خواو گەورەیی خوا دەکەوێتە ناو دڵیەوەو دەرو ناوی مرۆڤ بەئەدەب دەبێ.

لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: کاتێ کە بانگدەر بانگ دەداو دەڵێ: «الله اكبر، الله اكبر» خوا دەفەرموێ: ئەم بەندەیەم ڕاست دەکات و من لە هەموو کەسێ گەورەترم. کە وتی «أشهد أن لا اله الا الله» خوا دەفەرموێ: ڕاست دەڵێ: کەس نییە عیبادەت کردن بۆی ڕەوابێ من نەبێ. کە وتی: «أشهد أن محمدا رسول الله» خوا دەفەرموێ: ڕاست دەڵێ: من محەمەدی عەرەبیم کردووە بە پێغەمبەری خۆم و ناردوومە بۆ سەر جن و ئینس تا ئیمانی پێ بێنن. کە وتی: «حي على الصلاة» خوا دەفەرموێ: ئەم بانگکردنی خەڵکە بۆ نوێژ لەسەر فەرمانی منە.. کە وتی: «حي على الفلاح» یانی: بێن بۆ سەر نوێژکە هۆی ڕزگاریی ئێوەیە لە سزای خوای گەورەو هۆی گەیشتنتانە بە بەختیاری، خوا دەفەرموێ: ئەم بانگ کردنەیش بە فەرمانی منەو، هاتن بۆ نوێژ هاتنە بۆ عیبادەتێك کە هۆی ڕزگارییە لە سزاو گەیشتنە بە پاداشتی چاك.

جا مرۆڤی تێگەیشتوو لەم ڕیوایەتە موژدەیەکی گەورە وەردەگرێ و بەڵێنی ڕاست لە خوا وەردەگرێ کە هەر کەس نوێژ بکات و بەقسەی بانگدەر بکا و، بڕوا بۆ مزگەوت و نوێژەکەی بکات ئەوە لە سزای خوا ڕزگار دەبێت و دەگاتە بەختیاریی ڕۆژی قیامەت، چونکە خوا فەرموویەتی: «إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ]» لەبەر ئەمانەیە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «الصلاة خير موضوع» واتە: نوێژ چاکترین شتێکە کە خوا بڕیاری داوە.

بناغەی ئەمانە هەمووی ئەوەیە کە خوای گەورە جن و ئینس، پەری و ئادەمیزادی بۆ ناسین و عیبادەتی خۆی دروست کردووەو پێویستە مرۆڤ هەمیشە ئاگای لە دڵ و دەروونی خۆی بێ و لەیادی خوا غافڵ نەبێ و مەیدان نەوا دڵی ببێتە شوێنی بیری پەرێشان و شتی بێ سوود، بەتایبەتی لە کاتی نوێژ کردندا و، هەر شتێ بێجگە یادی خوا بێ بەدڵیدا دەفعی بکا و دووری بخاتەوە لە خۆی و ئاگای لە مەعنای ئەو کەلیمەو ڕستانە بێ کە دەیانخوێنێتەوەو، هەمیشە وابزانێ خوای گەورە لە پێش چاویدایە و دەیبینێ. هەروەها لەسەر ئەم وەزعە پایەدار بێ تا دەبێتە ماڵ و دەبێتە خووی جێگرتوو لە دڵیدا.

ئەی برادەران! خوای گەورە گەلێ پێی خۆشە بەندەکانی هەمیشە لە یادی ئەودا بن و زیکری کردووە بە چەند جۆرو بۆ هەر حاڵێك جۆرە زیکرێکی داناوە؛ هەتا مرۆڤ مات و

خـەمـبـار نـەبـێ و لـەیـادی خوای گەورە مـاندوو نـەبـێ، هـەروەهـا لـەنـاو نوێژدا لـەسـەر موناسەبە چەند جۆر زیکری داناوە؛ ئەوەتە لە ڕاوەستاندا سوورەتی فاتیحەی داناوە کە ستایش و سوپاسە بۆ خوا و پاڕانەوەیە لە خوا و، داوای ڕەهنومایی و شارەزاکردنە بۆ ڕێگەی ڕاست، «بلا تشبیه» وەکو ئەو خزمەتکارە نیازمەندانە کە لە بەرامبەری گەورەی خۆیاندا ڕادەوەستن و، گەلێ خزمەت و بچووکیی خۆیان لەگەڵ ستایشی گەورەکەیان عەرز دەکەن و لەپاش ئەوە نیازی دڵی خۆیان دەردەبڕن. هەروەها لە کاتی ڕکووعدا کە مەقامی تەعزیمە «سبحان ربي العظيم» دەخوێنن و، لەکاتی بەرزبوونەوە لە ڕکووعدا ڕادەوەستن، دووبارە ستایش عەرزدەکەن، لە سوجدەدا کە ئەوپەڕی پایەی خۆ بە بچووك زانینە و جێگەی دان نانە بە بەرزیی خوای گەورەداو نزمیی پایەی بەندەی خوا «سبحان ربي الأعلى و بحمده» بڕیاردراوە.

پێویستە ئەوەش بزانن: ئەگەر نوێژکەر ئیمام بێ، باش وایە لەو لەفزانەدا کە بۆ کۆمەڵ بەکاردێن، وەکو «نعبد» و «نستعين» و «اهدنا» لەگەڵ خۆیدا باقیی مەئموومەکانیشی لە دڵدا بێ هەتا ئەو خێرو پیرۆزییە و ئەو نیازمەندییە لەوانەدا دەردەکەوێ هەموو لایەکیان بگرێتەوە. خۆ ئەگەر مەئموموم بوو، نوێژەکەش جەهری بوو وەکو نوێژی سبەینێ و دوو ڕکاتی پێشووی مەغریب و دوو ڕکاتی پێشووی نوێژی عیشا، لەو کاتەدا ئیمام دەڵێ« بسم الله الرحمن الرحيم» مەئموموم بە دڵ نەك بە زبان لە خوا داوابکا کە بە پیرۆزیی ناوی(رحمن و رحيم) ڕەحمی پێ بکا. هەروەها لەو کاتەدا ئیمام دەڵێ« الحمد لله رب العالمين» بـە دڵ بـڵـێ خـوایـا ستـایش بـۆ تـۆیـە لـەسـەر نـیعـمـەتـەکـانت. خـوایـا لـە ئـازارو زەحمەتی دنیا و قیامەت بمانپارێزە. لەو کاتەشدا کە دەڵێ: «الرحمن الرحيم مالك يوم الدين» بە دڵ بڵێ : خوایە لە دنیاو لە قیامەتدا ڕەحمم پێ بکە، ئەی ئەو کەسەی کە سەرداری ڕۆژی جەزای.. هەروەها لەو کاتەدا ئیمام دەڵێ: «اياك نعبد واياك نستعين» بەدڵ بڵێ: خوایا یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی بتپەرستم، یارمەتیم بدە لەسەر ڕاستی و دڵسۆزی بۆ تۆ. لەو کاتەشدا ئیمام دەڵێ «أهدنا الصراط المستقيم» بە دڵ بڵێ: خوایا لەسەر ئەو ڕێگایەی کە پێشانت داوم دامەزراوم بکەو بەو شتانەم شارەزا بکە کە تائێستە نەمزانیون. لە دوایی سوورەتی فاتیحەدا کە ئیمام دەڵێ: «غير المغضوب عليهم ولا الضالين» بەدڵ بڵێ: خوایا غەزەبم لێ نەگری و لە ڕێگەی ڕاست لام نەدەی و گومڕاهم نەکەی، لەگەڵ داوای قەبووڵی ئەم نیازانەدا لەفزی «آمين» بە زوویان بڵێ.

دەگێڕنەوە لە «جبیر»ەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: رزگاریی موسڵمان بە هۆی چوار شتەوەیە: نوێژی بێ غەفڵەت، ڕۆژووی بێ غەیبەت، دڵی بێ خەیاڵ، ڕۆزیی حەڵاڵ . ڕیوایەت کراوە کە یادی مردن دەبێتە هۆی نوێژی لای خوا قەبووڵکراو؛ واتە: لەپێش نییەت هێنانی نوێژ وابزانە کە تۆ دەمریت و لە بەردەمی خوای هەردوو جیهاندا ڕادەوەستی و حیسابی کردەوەت لەگەڵ دەکا، جا پاش ئەمە نییەتی نوێژەکە بهێنەو «اللهاکبر» بڵێ، ئەگەرنا لە نێو نوێژەکدا، بێجگە مەعنای سوورەتی فاتیحەو ئاگاداری لە حازریەتیی خوای گەورە، بیرکردنەوە لە هەر شتێکی تر مەکرووهە.

ئەبوو مەدین کە پیاوێکی گەورە بووە، فەرموویەتی: لای زانایانی ئاین سابت بووە کە لە نوێژی مرۆڤدا تەنیا ئەوەی بۆ حسێب دەکرێ و پاداشتی ئەوەی بۆ دەنووسرێ کە ئاگای لێیەتی و لە دڵیایەو، هەر ئەندازەیەکی دڵی نوێژکەرەکەی لێ غافڵ بێ ئەوە خەسارەتەو بۆی نانووسرێ و وەك ئەوە وایە ئەو نوێژەی نەکردبێ. لەسەر ئەم بناخەیە زانا ئاینییەکان فەرموویانە: خێر و سەوابی نوێژی مروڤێ کە بەتەنیا نوێژ بکا بەئەندازەی حوزووری دڵ و ئاگادارییەتی.

هەندێ لە زاناکان فەرموویانە: نوێژی جەماعەتیش، ئەگەر جەماعەتەکە گەورە نەبێ، ئەویش وەکو نوێژی تەنیایە، واتە: پاداشتی هەر کەس بەقەدەر ئاگاداریی دڵی خۆیەتی. بەڵام ئەگەر جەماعەتەکە گەورە بێ، ئەوە با نوێژکەرەکە لە خۆیدا بێ ئاگا بێ، زیان بە پاداشتی نوێژەکەی ناگەیەنێ و بەهۆی پیرۆزیی جەماعەتەکەوە خێرو سەوابی نوێژەکەی بەتەواوی بۆ دەنووسرێ. بەڵام زۆریەی زانایان لەسەر ئەوەن کە لە جەماعەتدا، گەورە بێ یا بچووك خێری ئەو جەماعەتەو پاداشتی زۆر بۆ هەموویان دەنووسرێ، غافڵ بن یا هوشیار، ئەمەش لەبەر گەورەیی پایەی جەماعەت، ئەمانە ڕیوایەتە پێشووەکەیان تەئویل کردووە بە نوێژی مرۆڤێك کە بەتەنیا نوێژ بکا، ئەگینا نوێژی جەماعەت هەمیشە پاداشتی هەیە ئەم تەئویلە بۆچوونێکی جوانە؛ چونکە زاناکانی ئاین لە فەرموودەی حەزرەتەوە (د.خ) وا تێ گەیشتوون کە خوای مەزن بە هۆی ئاگاداریی دڵی تاقەکەسێك لە نوێژکەرەکان پاداشتی بۆ هەموو نوێژکەرەکان بەتەواوی دەنووسێ و بەهۆی ئاگاداریی دڵی ئەو تاقە کەسەوە جەبری بێ ئاگایی نوێژکەرەکان دەکاتەوە کە ئەو تاقە کەسە بریتییە لە ئیمام.

موژدەی لەمە گەورەتر ئەوەیە کە هەندێ لە زانا ساڵحەکانی پێشینان فەرموویانە:

پێمان گەیشتووە هەر کاتێ جەماعەت بۆ نوێژ دابەسترا خوای گەورە بۆ دڵی ئیمام و مەئموومەکان دەڕوانێ، ئەگەر ئیمام دڵسۆز و هوشیار بوو ئەوا بە پیرۆزیی ئەوەوە لە هەموو مەئموومەکان ڕازی دەبێ . خۆ ئەگەر ئیمام دڵی باش نەبوو، بەڵام هەموو مەئموومەکان یا هەندێکیان یا یەکێکیان دڵیان باش بوو ئەوا خوای گەورە نوێژی هەموویان ، ئیمام و مەئموم، قبووڵ دەکات. بەڵام ئەگەر هەموویان بێ ئاگابوون، خوای گەورە دەفەرمووێ: مادام من ئەمانەم بانگ کردووە بۆ ماڵی خۆم و ئەوانیش بە ئومێد و تەمای عەفوو ڕەزامەند من لە ماڵی مندا ڕیزیان بەستووە وا بڕیارم دا کە لە هەموویان ڕازی بووم و نوێژەکەیانم قبووڵ کرد.

برادەرینە! ئەم میهرەبانیی خودایە بۆ ئەو کەسانەیە کە نوێژ دەکەن و دەڕۆن بۆ مزگەوت و بەکۆمەڵ ڕوودەکەنە خودای گەورە .جا ئەو کەسانە کە نوێژ ناکەن و ناڕۆنە مزگەوت و لەم خێر و بەرەکەتە بێ بەش بوون ئەگەر لە داخی ئەم نائومێدییە زراویان لەت لەت بێ بەدووری مەزانن و بە شتێکی ڕاست و ڕەوای تەماشا بکەن.

برادەرینە! مرۆڤی موسڵمان ئەگەر لە کاروباری شەرعدا دوو ڕیوایەتی جیاوازی بیست، پێویستە لای ئیحتیات بگرێ؛ جا ئێمە هەرچەند ئیمان و باوەڕمان بەوە هەیە کە دەرگای ڕەحمەت و میهرەبانیی خوا زۆر گوشادە، پێویستە ڕیوایەتی پێشوومان لە بەرچاو بێ؛ واتە: مادام جەماعەتەکە گەورە نەبێ ئیعتیماد لەسەر ئەو کەسەیە کە نوێژەکە دەکات و هۆشیاریی دڵی خۆی بە کاری دێ و دەبێ پشت بەو هوشیارییە ببەستین؛ خوا خۆی فەرموویەتی: «وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى» النجم٣٩. شایانی باسە: من بۆ دیاریکردنی ژمارەی جەماعەتی گەورە لە هیچ کتێبێکدا بەڵگەم دەس نەکەوتووە، جا هەر کەس دەیزانێ با داخڵی ئەم مەکتووبەی منی بکا، خوا جەزای بداتەوە، بەڵام بەقیاس لەسەر نوێژی جومعە، کە لای کەمی ژمارەی چل کەسە، زاهیر وایە جەماعەتی گەورە چل کەسەو زیاتر.

دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «نوێژبکە نوێژی کەسێ کە خوا حافیزی لە دنیا بکا و بەجێی بێڵێ؛ یانی کەسێ کە پەیوەندیی نەمێنێ بەدنیاوە، چۆن ڕوودەکاتە قیامەت و ڕوودەکاتە خوا دەبێ نوێژکەر وەها ڕووی دڵی لە خوا بێ و ڕووی لە قیامەت بێ.

دەگێڕنەوە کە حەزرەتی عومەر خوای لێ ڕازی بێ، نامەی نووسی بۆ لای یەکێ لە

کاربەدەستانی فەرمووی: گرنکترین ئیش و کاری تۆ بەلای منەوە نوێژە، ئاگاداری نوێژی موسڵمانان بە. هەر کەسێ پارێزگاریی نوێژی بکا، پارێزگاریی ئاینی خۆی دەکا. هەرکەس نوێژی لەکیس دا پێویستەکانی تری سەرشانی زووتر لەکیس دەدا.

بێگومان مەبەستی خەلیفە لەم نامە ئەوە بووە کە موسڵمانان نوێژ لەکیس نەدەن و لە سەرەتای کاتەوە بیکەن و چاودێریی جەماعەت بکەن؛ هەتا دروشمی ئیسلام بەردەوام بی، چونکە ئەگەر موسڵمان نوێژی لەکیس نەدا، کاروبارەکانی تری ئاین باشتر چاودێری دەکا و،هەرکەس گوێ بەنوێژ نەدا گوێ بە ئەحکامی تریش نادا.

پوختەی قسە: نوێژ ڕاگرتن و نەفەوتاندنی دوورکەوتنەوەیە لە گوناهـ و تاوان و وەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «أنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ» العنكبوت٤٥. واتە: نوێژ مرۆڤ لە خراپەو کاری نارەواو ناشایستە دوور دەخاتەوە.

دەگێڕنەوە کە یەکێك هەبوو بەشەوا نوێژی دەکرد و لە ڕۆژا دزی دەکرد، موسڵمانێ سکالای لەدەست ئەم کابرایە لە خزمەت پێغەمبەردا کرد، ئەویش فەرمووی: مادام نوێژبکات نوێژەکەی دەبێتە هۆی ئەوە کە تەرکی دزی بکا.

لە حەدیسێکدا پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: بەڕاستی پیاوی وا هەیە کە بەساغی و دڵسۆزی نوێژ دەکا و، ئەوەندە دڵی لەسەر نوێژەکە ئەستوورە کە هیچ شتێ لەو نوێژەی ناگێڕێتەوە، دیارە کە موسڵمان گەیشتە ئەم پایەیە ئەوا نوێژەکەی لە هەرچی دارایی و دەسەڵات و ماڵ و منداڵ هەیە باشترە بۆ ئەو.

برا خۆشەویستەکان! ئەوەندە کە خۆتان بۆ کۆکردنەوەی سامانی دنیا ماندوو دەکەن هەزاریەکێکی ئەوە بۆ بەگوێکردن و فەرمانبەرداریی خوای گەورە خۆتان ماندوو بکەن لەهەموو ئەو سامانە کە پەیداتان کردووە چاکترە.

لە یەکێ لە (تابعین) کە ناوی (قتادە) بووە دەگێڕنەوە کە وتوویە : حەزرەتی دانیال پێغەمبەر (علی نبینا وعلیە السلام) باسی ڕەوشت و کردەوەی ئوممەتی پێغەمبەری کردووەو فەرموویەتی : نوێژێکی وەها دەکەن ئەگەر قەومی (نووح) (د.خ) ئەو نوێژەیان بکردایە نوقمی گەرداو نەدەبوون و، ئەگەر قەومی (عاد) بیانکردایە بە بای سەرسەر نەدەفەوتان و، ئەگەر قەومی سەموود بیانکردایە بە هەورە تریشقە بەفەتەرات نەدەچوون، جا (قتادە)کە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە فەرمووی: «علیکم بالصلاة فأنها

خلق المؤمنين» واته: دەخیلتان بم نوێژ بەتەواوی و ڕەسایی بە جیّ بهێنن؛ بەڕاستی نوێژ ڕەوشتی موسڵمانانە.

فەرموودەی پێغەمبەر: هەرکەسێك نوێژێکی ڕاست بەمەرج و ئادابەوە بکا ئەوە لەو ڕۆژەدا کە ئەو نوێژەی تیا دەکا وا لە ذیممەی خوادا، واتە: خودای گەورە بە میهرەبانی تەماشای ئەو کەسە دەکات، جا کەواتە کاریّ مەکەن کە لە زیممەی خوای گەورە دەربچن واتە: نوێژەکانتان لە کیس مەدەن و ئاداب و مەرجەکانیان بەتەواوی جێبەجیّ بکەن تا قەرزدار نەبن؛ چونکە هەر کەس قەرزداری خوا بیّ لە دەستی دەرناچیّ و دەیگریّ و، لە دۆزەخدا ئازاری دەداو لە سێبەری میهرەبانیی خوادا نامێنیّ.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمویّ:

«من نور بالفجر نور الله قلبه وقبره وقبل صلاته» واته: کەسیّ نوێژی سبەینیّ بکات لە کاتێکا کە ڕووناکیی کەناری ئاسمان دەردەکەویّ – یانی لە سەرەتای ڕۆژەوە – ئەوە خوای گەورە نوێژەکەی لیّ وەردەگریّ و، لە دنیادا دڵی نوورانی دەکات و، لەپاش مردنیش قەبرەکەی بۆ ڕووناك دەکاتەوە .

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمویّ : هەرکەسیّ حازری نوێژی سبەینیّ بیّ و لەگەڵ ئیمامدا لە جەماعەتدا بە هەردوو رکاتەکەی بگا، ئەوە وەك ئەوەیە کە نیوەی شەوی زیندوو کردبێتەوە و بە خوا پەرستییەوە خەریك بووبیّ و نەنوستبیّ.

لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: هەر کەسیّ بیکا بە عادەت کە نوێژی سبەینیّ هەمووی بە جەماعەت بکا خوای گەورە لە مونافقی و دووڕوویی ڕزگاری دەکات و، لە ئاگری دۆزەخیش دەیپارێزیّ.

هەروەها حەدیسێکی تر دەفەرموویّ : نوێژی تەواو ڕووی شەیتان ڕەش دەکات ، واتە: دەبێتە هۆی کزکردنی شەیتان و هێزدان بە باوەڕو ئاینی نوێژکەرەکە.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرمویّ: نوێژ گەورەترین چەکە لە بەرامبەری شەیتاندا، واتە: بە نوێژکردنی ڕاست و ڕەوان کۆمەڵەی شەیتان دەشکیّ و پایەی دین بەرز دەبێتەوە.

دەگێڕنەوە: هەرکەسیّ چووە ناو نوێژەوە خوای گەورە دەرگای ڕەحمەتی خۆی لیّ دەکاتەوە، هەتا ئەو کەسە بەڵ هوشیار بێت خوا ڕووی لەو کەسە وەرناگێڕیّ، تا ئەو کەسە لە نوێژەکەی ڕزگار دەبیّ، یاخۆ هەر لە نوێژەکەیدا دەکەوێتە خەیاڵاتی پڕو پووچەوە.

یەکێك لە پایەکانی نوێژ سوجدەیە. لە حەدیسدا هەیە کە ئاگری دۆزەخ هەموو شوێنێ لە لەشی مرۆی تاوانبار دەسووتێنێ شوێنی سوجدە نەبێ لە ناو چاوانیدا، کە لەبەر حورمەتی نیشانەی سوجدە خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێ».

لە حەدیسی قودسیدا هەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: نوێژم لە بەینی خۆم و بەندەی خۆمدا بەش کردووەو، بەندەی من هەرچی داوا بکا بۆی دەبێ: کاتێ کە وتی: «الحمد لله رب العالمین» خوا بە فریشتەکانی دەفەرموێ ئەو بەندەی منە حەمدو سەنای منی کرد. کە وتی: «الرحمان الرحیم» خوا دەفەرموێ: ئەو بەندە ستایشی منی کرد کە وتی: «مالك یوم الدین» خودا دەفەرموێت: ئەو بەندە گەورەیی بۆ من داناو منی بە گەورە و خاوەن دەسەڵات دانا. کە وتی: «ایاك نعبد وایاك نستعین» خوا دەفەرموێ: ئەمەیش وا لەبەینی من و بەندەمدا. کاتێ کە وتی: «اهدنا الصراط المستقیم».. تا دوایی نوێژەکە خوا دەفەرموێت: ئەو بەندەیەم داوای چی دەکا دەیدەمێ، یانی بۆ ڕێگای ڕاست شارەزاییی دەکەم و دەیخەمە سەر ڕێگەی ئەو کەسانە کە ناز و نیعمەتم بەسەریاندا ڕژاندووەو، ئەم بەندانە لەوانە جیان کە غەزەبم لێ گرتوون و گومڕا بوون و ڕێگای ڕاستیان ون کردووە.

ئەی براینە! زۆر حەیفە کە خوای گەورە لەگەڵ مەلائیکەدا بە جواب بێ و باسی بەندەی خۆی بکا، کەچی بەندەش لەو کاتەدا دەروون و دڵی خۆی بە خەیاڵاتی بێ سوودەوە خەریك بکا.

هەروەها لە خوێندنی (تحیات)دا کە نوێژکەر دەڵێ: «السلام علیك إیها النبي ورحمة الله وبرکاته» ئەم چەند ڕستەیە ڕوویەڕوو قسەکردنە لەگەڵ حەزرەتی ڕەسووڵلا دا (د.خ) و، شتێکی دیارە کە ڕوویەڕوو قسە کردن بێ حوزووری قسە لەگەڵ کراو نابێ و شتێکی بێ سوودەو حاشا کە لە نوێژدا شتی بێ سوود ببێ؛ کەوابوو دەبێ مرۆی نوێژکەر بزانێ کە خوای گەورە بەتوانای خۆی دەتوانێ هێزی خۆ نواندن ، خۆپێشاندان بە پێغەمبەری خۆی بدا بەقەدەر یەکەیەکەی ئەو ئوممەتەی کە نوێژ دەکەن و سەلامی لێ دەکەن هەتا حەزرەت بە شێوەیەکی میسالی حازر بی و وەڵامی سڵاوەکەیان بداتەوە. یا خوای گەورە بەتوانای خۆی ڕۆحانییەتی حەزرەت (د.خ) ئاگادار دەکا و، سڵاوی هەموو موسڵمانی ئوممەتی دەبیسێ و وەڵامی سڵاوەکەیان دەداتەوە. بێجگە لەوە پەنامەکییەکانی کاری خوای گەورە و چۆنییەتیی کاری لە ئەرواحدا بۆ ئێمە مەعلووم نابێ، ئەوەندە پێویستە بزانین کە عیبادەتی (تحیات)و پێشکەشکردنی ستایش بۆ خوداو سەلام بۆ حەزرەتی

محەمەد (د.خ) هەموو ڕاستن و وەڵامی سەلامەکانیش هەیە، ئێمە پێی بزانین یان نا؟..

ئەی برادەرینە! چەند فەرموودەیەکی حەزرەت (د.خ) ریوایەت کراون کە هەر کەس دەسنوێژ بگرێ و نوێژێ بکا ئەو نوێژەی دەبێتە کەفارەت بۆ ئەو گوناهانەی کە لەپاش نوێژی پێشوو هەتا ئەم نوێژە کردوویەتی بەو مەرجەی کە لە گوناهی گەورە خۆی پاراستبێ، لە بابەتی کەفارەتی ئەو گوناهانەوە چەند حەدیس هەیە، تەنانەت گەلێ حەدیس ریوایەت کراوە کە هەر کەس بڕوا بۆ نوێژی جەماعەت، هەر هەنگاوێ کە دەینێ بە چاکەیەك دەنووسرێ بۆی و، پایەیەك بەرز دەبێتەوەو کەفارەتی گوناهێکی دەدرێ.

ریوایەت کراوە: گەورەترینی موسڵمانان لە بابەتی پاداشتی نوێژەوە ئەو کەسەیە کە ڕێگەی لە مزگەوتەوە دوورتر بێ، ئەو موسڵمانەشە کە لەپاش ئەوە نوێژی فەرزی کرد لە مزگەوتدا دەمێنێتەوە چاوەڕێ دەکات نوێژێکی تر دابێ و ئەو نوێژەیش بکا ئەنجا لە مزگەوت دەرچێ، لەم حەدیسە پیرۆزەدا دەلیلێکی ڕووناك هەیە لەسەر ئەجری زۆر بۆ ئەو کەسەی لەدوورەوە دەڕوا بۆ نوێژ، یا بۆ ئەو کەسەی چاوەڕێی کردنی نوێژی دوایی دەکا.

هەروەها لەو حەدیسەدا ئەوە هەیە کە ئەو نوێژکەرە لەو سەریشەوە کە لە مزگەوتەوە دەگەڕێتەوە لە هەموو هەنگاوێکیدا خێرو سەوابی هەیە تا دەگاتەوە ماڵی خوی.

لە (ابو هريرە)وە (ر.خ) دەگێڕنەوە: لەو کاتەوە موسڵمان ڕوودەکاتە مزگەوت یەك فریشتە خێر و حەسەناتی بۆ دەنووسێ و فریشتەیەکی تر گوناهی عەفو کراوی دەنووسێ. خوا دەزانێ ئەم جۆرە گەورەیی و پاداشە تەنیا بۆ مرۆڤێکی کردار چاك و دڵسۆزە، یاخۆ گشتییە بۆ هەموو موسڵمانێ کە بۆ نوێژ بڕوات. ئەی خۆشەویستان! هەر چەند لە حەدیسدا هەیە هەر کەسێ دەیەوێ قسە لەگەڵ خوادا بکا با قورئان بخوێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەم گەورەیی قورئانەدا تەماشای ئەوە بکەن کە مادام یەکێ نوێژ بکا دروست نییە کەس قورئان بە دەنگی بەرز بخوێنێ تا نوێژکەرەکە نوێژەکەی لێ تێك نەچێ. لەمەوە دەردەکەوێ. هەروەکو قورئان خوێندن موناجات و گفتوگۆ کردنە لەگەڵ خوای گەورەدا، نوێژکردنیش هەر موناجات و گفتوگۆیە لە گەڵیداو، ئەو موناجاتە کە لەگەڵ نوێژدا بێ گەورەترە لەو موناجاتە کە تەنیا بە قورئان خوێندن بێ، بێجگە لەوەش لە نوێژیشدا زیاتر لە قورئان خوێندنەکە چەند کردەوەیەکی پەرستیاریانە هەیە وەکو ڕاوەستان و ڕکووع و سجوودو شتی تریش. جا لەبەرئەمەیە کە نوێژ فەزلی هەیە و گەورەترە لە قورئان خوێندنی تەنیا.

دەگێردێتەوە کە نوێژکەر سێ پایەی هەیە: یەکەم لە ئاسمانەوە ڕەحمەت دەبارێ، بەسەریدا. دووەم فریشتە دەورەی لێ دەدەن لە ئەرزەوە تا ئاسمان. سێیەم هەر ئەم فریشتانە بانگی دەکەن و دەڵێن: ئەی نوێژکەر ئەگەر بتزانیبایە لەگەڵ کێدا موناجات دەکەی هەرگیز لە نوێژکردن دەستبەردار نەدەبووی. وا دەردەکەوێ ئەم جۆرە گەورەیی و پاداشە بۆ کەسێکە ئاداب و مەرجەکانی نوێژەکە بە تەواوی جێبەجێ بکا و بە حاڵەتی لە خواترسی و دڵ وریاییەوە نوێژەکەی بکا، بەجۆرێ کە ئەو نوێژە لە ڕەفتارو کرداری خراپ مەنعی بکا، چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی : «من لم تنهه صلاته عن الفحشاء والمنكر فلا صلاة له» واتە: کەسێ کە نوێژەکەی مەنعی نەکا لە ئیش و ڕەفتاری ناڕەواو ناشیرین، ئەوە نوێژی نییە، نوێژەکەی وەك نەبووەو، هەر دەڵێ نوێژی نەکردووە!

فەرموودەی پێغەمبەرە لە حاڵەتەکانی بەندەی خوا هیچ حاڵەتێکی ئەوەندە جوان نییە کە خوا بەندەی خۆی ببینێ لە نوێژدا کە سەری لەسەر سوجدەگا بێ؛ لەو حاڵ و کاتەدا لە هەموو کاتەکانی تر لە خوای گەورەوە نزیکترە.

فەرموودەی پێغەمبەرە: کلیلی دەرگای بەهەشت نوێژەو هەموو شتێ خولاسەیەکی هەیە، خولاسەو پوختەی ئیمان و باوەڕ بە خوایش، نوێژە.

لە یارانی پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە کە نوێژ هۆی ڕەزامەندیی خوایە، هۆی خۆشەویستیی لای فریشتەکانە، یاسا و ڕەفتاری پێغەمبەرانە، بناغەی باوەڕو ئیمانە، هۆی قبووڵ بوونی نزا و پاڕانەوەیە، هۆی پیت و بەرەکەتی ڕۆزی و ژیانە، ئاسایشی لەشی ئینسانە، چەك و هۆی پارێزگارییە لە دوژمنان، هۆی زویری و تووڕەبوونی شەیتانە، تکاکارە لە بەینی نوێژکەرو ئەو فریشتانەی کە بەڕاسەریەوەن، تکاکارە لە بەینی نوێژکەر و فریشتەی مەرگدا، چرا و ڕووناکییە بۆی لە گۆڕدا، ڕایەخە بۆی لە گۆڕدا، وەڵامدەرەوەی فریشتەی پرسیاری گۆڕە، هاودەمی نوێژکەرە هەتا ڕۆژی قیامەت. هەروەها لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو نوێژە دەبێتە تاجی سەری و دەبێتە سێبەر بەڕاسەریەوەو مەنعی گەرمای ئەو ڕۆژەی لێ دەکات و دەبێتە بەرگ و پۆشاك بۆ لەشی و بە نوور و ڕووناکی لە بەردەمیەوەو، بە پەردە لە بەینی ئەو و ئاگری دۆزەخدا و، بە شاهید و ڕاهنومای خێر لە بەردەم زاتی پاکی یەزدان و، دەبێتە هۆی قورس بوونی تای خێری تەرازووی کرداری. هەروەها دەبێتە چرا بۆی لەسەر پردی ڕۆژی قیامەت کە لە زمانی کوردیدا پێی دەڵێن: «پردی سیرات» هەروەك دەبێتە کلیل بۆ دەرگای بەهەشت، چونکە نوێژ تەسبیحات و ستایش و بەگەورەزانینی خوا و قورئان خوێندنەو، نوێژی ئەوەڵ وەخت گەورەترین پەرستیارییە.

جا ئەی برادەرینە بزانن ئەم هەمووە پایەو گەورەیی نوێژە بۆ کەسێکە لەگەڵ ئاداب و مەرجەکانـدا و لـەگـەڵ لـە خـواتـرسی و ڕێز و دڵسۆزیـداو لـەبـەر خـاتری خوای گەورە نوێژەکانی بکات.

لە(ابن القیم)ەوە دەگێڕنەوە، کە یەکێك بووە لە زانا حەنبەلییەکان، فەرموویەتی : نوێژ دەبێتە هۆی هێنانی ڕزق و ڕۆزی و دەبێتە هۆی پاراستنی نیعمەت و لابردنی ئازار و زەحـمـەت و، پـیت و پـیـرۆزی ڕادەکـێشێ بـۆ خـاوەنـەکـەی و، دەبـێتـە هـۆی تـەواوکـردن وپەروەردە کردن و پێگەیاندنی دەرو ناوی نەفس. لە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) کە شێوەی نوێژکردن وەکو ئەوەیە کە یەکێك جۆگەیەك ئاو لە بەردەم دەرگاکەیدا بڕواو هەموو ڕۆژێ پێنج جار لەو جۆگەدا خۆی بشۆرێ، واتە: هەروەك ئەو ئاوە چڵك وپیسی بە لـەشی مـرۆڤـەکـەوە نـاهـێڵـێ هـەروەهـا نـوێژیش ڕێـگـای گـونـاهـ و تـاوانـبـاری لـە مـرۆڤـی نوێژکەر دەگرێ.

لە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ): هەر کەسێ بەباشی دەستنوێژ بگرێ و دوو ڕکات نوێژی پێ بکا ئەوە لە هەموو گوناهی پێش ئەو نوێژ و دەستنوێژەی چاوپۆشی دەکرێ، بەڵام بەو مەرجەی کە لەو نوێژەدا بە هیچ جۆرێك بیر لە غەیری خوا نەکاتەوە.

هەروەها ریوایەت کراوە کە نوێژکردن لە سەرەتای کاتدا هۆی ڕەزامەندیی خوایەو لە ناوەڕاستی کاتدا هۆی ڕاکێشانی میهرەبانیی خودایەو لە ئەنجامیشدا مایەی خۆشبوونە لە گوناهی ئەو نوێژ کەرە.

ڕیوایەت کراوە کە ڕۆژێ حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) بەلای کۆمەڵێك لە یارانی خۆیدا ڕابوردو فەرمووی: ئایا دەزانن خودای ئێوە چی دەفەرموێ؟ عەرزیان کرد: نەخێر، فەرمووی:خوا دەفەرموێ: هەر کەسێ مویالاتی نەکرد بە نوێژەکانی، واتە نەیکردن یا باش نەیکردن و ئادابەکەی بە چاکی ڕانەدەگرت و، لە ئەوەڵی وەختدا بەجێی نەدەهێنان ئەوە عەهدی لەسەر من نییە؛ ئارەزووم کرد ئازاری دەدەم ئارەزووم کرد عەفووی دەکەم، بەکورتی ئەو کەسە لە زیممەی مندا بەحورمەت تەماشای ناکرێ و لە نێوان لێبووردن و سزادایە، بەڵام بەپێی ئەوەی کە خوای گەورە باسی عەزاب و سزادانەکەی پێش خستووە لەعەزاب و سزاوە نزیکترە. حەزرەتی عومەر(ر.خ) دەگێڕێتەوە: جارێ یەکێ لە پێش چاوی حەزرەتدا (د.خ) نوێژێکی کرد و زۆر مویالاتی بە ئادابەکەی نەکرد، لەوێدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەم مرۆڤە ئەگەر بەم حاڵەوە بمرێ ئەوە لەسەر غەیری میللەتی محەمەد دەمرێ.

ئەی براینە! بۆ یەکێك هەست و تێگەیشتنی هەبێ ئەم ئەندازە هەڕەشەیە بەسە.

دەگێڕنەوە جارێ لە جاران هاوڕێیەکانی پێغەمبەر (د.خ) نوێژێکیان کرد و هەر لە شوێنی خۆیاندا مانەوەو چاوەڕوانی نوێژێکی تریان دەکرد، لەوێدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: خوای گەورە بەڕێزەوە سەیری ئەم کارە دەکا و بە فریشتەکان دەفەرموێ سەیر بکەن ئەم موسڵمانانە لەگەڵ ئارەزووی نەفس و گیروگرفتی دنیایشدا بەم جۆرە خەریکی پەرستیارین و، لەپاش نوێژی وەختێ چاوەڕوانی نوێژی وەختێکی تر دەکەن.

مەعنای ئەمە وەهایە: هەر کەسێ ئەم جۆرە بارەی بۆ ڕێ بکەوێ ئەوە بەردەوام وا لە عیبادەتدا تا مزگەوت بەجێ دێڵێ و دەڕواتەوە بۆ ماڵ. هەروەها ئەو فریشتانە کە مەئموری ناو مزگەوتن و کردەوەی ئەهلی مزگەوت دەنووسن و دوعای خێریان بۆ دەکەن دەڵێن خوایا! ئەمانە عەفوو بکەو میهرەبانییان لەگەڵدا بەکاربێنەو تەوبەیان لێ قبووڵ بکەو ڕەحمەتیان بەسەردا برژێنە، بێگومان ڕەحمەتی خوایان بەسەردا دەبارێ. دیارە کەسێ ئەمە ئیشی بێ و هەر لە دەرگای مزگەوت بدا لە ئەنجامدا دەرگای ڕەحمەتی خوای بۆ دەکرێتەوەو دەچێتە نێو دائیرەی ڕەحمەتی خوای گەورە.

دەگێڕنەوە کە نوێژ لە ئاینی ئیسلامدا وەکو سەر وایە بۆ مرۆ، واتە: هەروەکو مرۆ کە سەری نەما نامێنێ یەکێ نوێژ نەکات ئیسلامییەتی نامێنێ. جا لەبەر ئەمەیە کە حەزرەتی عومەرو حەزرەتی عەلی، خوایان لێ ڕازی بێ، فەرموویانە: تەرکی نوێژ کوفرە، یا ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، کە یەکێکە لە ئیمامانی موجتەهیدین، لەسەر ئەو بیرەیە کە تەرکی نوێژ کوفرە. جا مادام کە نوێژ سەری ئیسلام بێ ئەوە لەگەڵ حەدیسی «الصلاة خير موضوع» باش تەواو دەبێ و ڕێك دەکەوێ.

ریوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە، خوایان لێ ڕازی بێ، کە یەکێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (د.خ)و عەرزی کرد: چ عیبادەتێ هەیە لە هەموو عیبادەتەکان گەورەتر بێ؟ ئەویش فەرمووی: نوێژ. تا سێ جار ئەم پرسیارو وەڵامە لە نێوانیاندا ڕابوورد، واتە: یەکێك مادام دەوامی کرد لەسەر نوێژ خوا تەوفیقی دەدا لەسەر جێبەجێ کردنی ئادابەکانی تری ئیسلام.

ڕیوایەت کراوە: «خصلتان أذا كانتا في عبد كان سائر عمله تبعاً لهما حسن الصلاة وصدق الحديث» واتە: دوو ڕەوشت هەن لە هەر کەسێکدا ببن کردەوەو ڕەوشتە چاکەکانی تر بە دوایاندا دێن: یەکەم نوێژ، دووەم ڕاستگۆیی.

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە کە خوای گەورە شوانێکی خۆش دەوێ کە بەلای حەیوانەکانیەوەیە لە شاخێکدا کە کاتی نوێژ هات بانگ دەدا و نوێژەکەی جێبەجێ دەکا، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێ: تەماشا بکەن ئەو بەندەی منە لەگەڵ ئەوەدا کە هەژارەو شوانە لە کاتی نوێژدا بانگی دا و نوێژی کرد لەبەر ڕەزاو خۆشنوودیی من، ئاگاداربن وا لە گوناهەکانی عەفووم کرد و دەیخەمە بەهەشتەوە.

جارێ یەکێ لە هاوڕییەکانی پێغەمبەر حەقێکی لەسەر حەزرەت هەبوو(د.خ)، پێی فەرموو: سەبر بکە تا تالآنی کافران دێت ئەوسا خۆت چیت ویست وەری بگرە، ئەویش عەرزی کرد: یا ڕەسووڵڵا ئەمە لەلای تۆوە قیمەتی نییە، من پایەی قیامەتم دەوێ، حەزرەت فەرمووی: مادام وایە یارمەتیم بدە بە سوجدە بردن بۆ خوای گەورە؛ تا بەهۆی ئەو سوجدانەوە ماوەی ئەوەم ببێ کە تکات بۆ بکەم لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەی برادەرە خۆشەویستەکان! ئەگەر شتێ بوویبووایە لە نوێژ چاکتر و بەنرختر بووایە حەزرەت (د.خ) ئەمری بە کردنی ئەو شتە دەکرد، مادام هەر ئەمری بە سوجدە کردو، سوجدەش لە نوێژدایە، ئەوە مەعنای وایە کە نوێژ لە هەموو پەرستیارییەك بەرزترە؛ بۆیە دەبێتە هۆی شەفاعەتی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ).

یەکێ لە یارانی حەزرەت (د.خ) ڕەبیعە ناو، دەڵێ : ئاوی دەستنوێژم هێنا بۆ حەزرەت (د.خ) کە دەستنوێژ بگرێ، لەو دەمەدا فەرمووی ئەی ڕەبیعە چی داوا دەکەی داوای بکەی، منیش عەرزم کرد: یا ڕەسووڵڵا! خۆشنوودیی خوام دەوێ لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەویش فەرمووی: مادام وایە یارمەتیم بدە بە سوجدەی زۆر، واتە: نوێژ بکە هەتا ژمارەی سوجدەت بۆ خوا زۆر بێ و ببێتە هۆی ئەوە کە ماوەی تکای من بۆ تۆ زۆر بێ.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ هەر کەسێ دەستنوێژێکی باش بگرێ و بە ئاداب و ئەرکانەوە نوێژێك بکاو رکووع و سوجوودەکەی تەواوبێ، ئەو نوێژەی دەبێتە پارچە هەورێك بەراسەریەوەو دەڵێ خوا بتپارێزێ وەك منت پاراست، جا دەرگای ئاسمانەکان لەسەر نوێژی ئەو کەسە دەکرێتەوەو نوێژەکەی لێ قبوڵ دەکرێ و تکا دەکات بۆ خاوەنەکەی.

خۆ ئەگەر نوێژ و دەستنوێژەکەی ناتەواو بێ، دووبارە ئەو نوێژە دەبێتە پارچە هەورێك بەڕاسەریەوە و دوعای شەڕ دەکات لە خاوەنەکەی و دەڵێ: خوا بتفەوتێنێ وەکو منت فەوتاند. ئیتر دەرگای ئاسمانەکانی لێ دەبەسترێ و لێی قبووڵ ناکرێ و بەوێنەی پۆشاك دەپێچرێتەوە و فڕێ دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا.

هەروەها لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: هەرکەس نوێژەکانی تەواوبن ئەوکەسە ویقار و هەیبەت پەیدا دەکا و شەیتان لێی دەترسێ و ناتوانێ گومڕای بکا، یانی بەهۆی ئەو نوێژەوە نوورێکی وەها لە دڵیدا پەیدا دەبێ کە مەنعی هاتوچۆی شەیتانی لێ دەکا. خۆ ئەگەر نوێژەکەی ناتەواو بێ ئەوە دەبێتە هۆی بێ نرخی ئەو کەسەو دەبێتە مەیدانی شەیتانەکان و جێگای تێفرێدانی خەتەرەو خەیاڵاتی پڕوپووچ و ئەو مرۆڤە دەخەنە نێو مەترسییەوە، خووڕەوشتی ناشیرین و ناپەسەندی زۆر دەبن و تووشی نەخۆشیی نەفسی دەبێ.

بەڵێ لەمەوپێش لە مەعنای یەکێ لە حەدیسەکاندا باس کرا کە نوێژی باش چەکە بۆ مرۆڤ. بێگومان ئەگەر مرۆی جەنگی چەکی چاکی هەبوو دوژمنەکەی لێی دەترسێ و بەسەریدا زاڵ نابێ.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: «الصلاة أمان في الارض» واتە: نوێژی تەواو هۆی ئاسایش و پارێزراویی خاوەنەکەیەتی لەسەر ئەرزدا، واتە: نوێژ کردن دەبێتە هۆی ڕزگاربوون و پارێزراویی ئادەمیزاد لە گرفتاری و خەشم و قینی یەزدانی گەورە. فەرمودەی پێغەمبەرە(د.خ): هەرکاتێ کە وادەی دابارینی بەڵاو غەزەب بێ بەسەر زەویدا، خوای گەورە سەیری مزگەوتەکان دەکات، ئەگەر لەو مزگەوتانەدا نوێژکەر هەبوون ئەوا خوای گەورە ئەهلی وڵاتەکە لەو بەڵایە لادەدا؛ چونکە نوێژکەرەکان لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆش دەوێ و، لە بەرەبەیاندا، کە کاتی نووری بەزەییی خوای گەورەیە، لێی دەپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەن.

ڕیوایەت کراوە: جارێك دمەڵێ لە ملی حەزرەتی ئادەم (د.خ) پەیدا دەبێت زۆر ئازاری دەدا، ئەویش هەڵدەستێ دەست بە نوێژکردن دەکات و لە خوا دەپاڕێتەوە بۆ چاری ئەو دمەڵە، زۆری پێ ناچێ دمەڵەکە لە ملیدا نامێنێ و ئەمجارە لە سینگیدا پەیدا دەبێ، جارێکی تر هەڵدەستێ و دەست بە نوێژکردن دەکا تا لەو شوێنەش لا دەچێ و بۆ پەنچە گەورەی پێی دەگوێزرێتەوە، دیسان هەڵدەستێ و هەندێ نوێژی تر دەکات هەتا خوای گەورە لەوێش لای دەبا.

لە (وهب)ی کوڕی (منبه) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: هیچ هۆیەك نییە لای خودا لە نوێژ باشتر و بەسوودتر بێ بۆ دەستکەوتنی نیازو لابردنی ئازارو بەڵا. زانا گەورەکانی ئیسلام لەمەوپێش زوریەی بەڵاو نارەحەتییان بە نوێژ لە خۆیان دوور خستووەتەوە،

واتە: پاش نوێژەکانیان زۆری پێ نەچووە کە خوا بەڵاو موسیبەتەکەیانی لەسەر لابردوون. ریوایەت کراوە: «کان، صلى عليه وسلم، أذا حزبه أمر صلى» واتە: هەرکاتێ کارێکی گەورە رووی بکردایەتە پێغەمبەر (د.خ) نوێژی دەکردو، ئەم نوێژکردنە بوو بوویە رەوشتی بۆ دەفعی بەڵاو موسیبەت. لەم یاسا و سوننەتە گەورەدا بەگوێ کردنی ئەمری خوای گەورە هەیە، کە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

« يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ» البقرة١٥٣. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان بە خوا هەیە بە خۆگرتن و نوێژکردن داوای یارمەتی لە خودای گەورە بکەن بۆ پەیدا کردنی خەیر و لابردنی شەڕ.

دیارە مادام مرۆڤ لە کاتی ئازاردا خۆگرو بوردەبار بێ لە ئەنجامدا خوا دەرگای خەیری لێ دەکاتەوە، هەروەها ئەگەر لە کاتی نارەحەتیدا دەستی کرد بە نوێژکردن، کە پاڕانەوەیە لە خوای گەورە و قسە لەگەڵ کردنیەتی، خوا بێگومان دەرگای خێری لێ دەکاتەوە، جالەبەر ئەمانەیە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: نوێژ چاکترین شتێکە کە بۆ ئێوە دانراوە، هەر لەبەر ئەوەشە کە خۆیشی لە کاتی خەم و مەینەتدا نوێژی کردووە.

ریوایەت کراوە کاتێ کە حەزرەت (د.خ) غەم و پەژارەیەکی پێ بگەیشتایە دەیفەرموو: «یا بلال ارحنا بالصلاة» واتە: ئەی بیلال! هەستە، بە نوێژ لەم خەمە ڕزگارمان بکە، واتە: بانگ بدە با نوێژەکەمان بکەین و لەم پەرێشانییە ڕزگار ببین.

حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی: خوا دڵخۆشیی منی لە نوێژکردندا ناوە، واتە: خوای گەورە نوێژی کردووە بەهۆی دەفعی بەڵاو ڕزگاریم لە غەم و پەریشانیی دڵ و، بەهۆی ڕووناکبوونەوەی دەروونی مرۆڤ و شادمانیی گیان..

جا شێخ دەفەرمووێ: نەك وەکو ئەهلی ئەم زەمانەی ئێمە، کە شادمانیی خۆیان لە ڕابواردن و گوناهکردن و بەجێهێنانی ئارەزووی نەفسدا وەردەگرن، بەم جیهانە کاتییە چەند ڕۆژییە بایی دەبن و لە خۆیان دەگۆڕێن. من بەرامبەر بەم وەزعە گەلێ حەسرەتمەندم و زۆر گلەییم لەم هاوچەرخانە هەیە، ئەگەر قسە دەکەم زمانم دەسووتێ و ئەگەر قسەش ناکەم دڵم دەسووتێ؛ شاعیر وتوویە:

مرا دردیست اندردل اگرگویم زبان سوزد

وگر پنهان کنم ترسم کەجان ناتوان سوزد

واتە: دەردێکی وا لە دڵمدایە گەر بە زوبان بەیانی بکەم زوبانم دەسووتێ، ئەگەر لەناو دەروونداپەنهانی بکەم دەترسم گیانی لاوازو ناتوانام بسووتێ، واتە: شکاتی لە ڕۆژگار و حاڵی موسڵمانان زۆرە.

دەگێڕنەوە کە عەبدورەحمانی کوڕی مەسعوود ڕۆژووی سوننەتی کەم بوو، لێیان پرسی : بۆ چی ڕۆژوو کەم دەگری؟ فەرمووی : دەترسم بەهۆی ڕۆژوەکەوە لاواز ببم بە باشی نوێژم پێ نەکرێ، واتە نوێژ لە ڕۆژوو گرینگترە.

ڕیوایەت کراوە:

«اول ما يحاسب به العبد يوم القيامة صلاته، فاذا كان اتمها كتبت له تامة، فان لم يكن اتمها قال الله تعالى املائكته: أنظروا هل تجدون لعبدي من تطوع تكملون به فريضته، ثم الحديث يذكر الصوم كذلك... وذلك لرحمة الله وعدله، فأن وجد فضل في ميزانه قيل له: ادخل الجنة مسرورا،وان لم يوجد له شيئ من ذلك امرت به الزبانية فاخذ بيده ورجله ثم قذف به في النار».

واتە: یەکەم پەرستیارییەك کە لەڕۆژی قیامەتدا موحاسەبەی بەندەی لەسەر دەکرێ نوێژە؛ جا ئەگەر نوێژەکانی بەڕەسایی کردبن ئەوە بەتەواوی بۆی دەنووسرێ، خۆ ئەگەر بەڕەسایی نەیکردبن ئەوا خوا دەفەرموێ بەفریشتەکانی : بڕوانن ئاخۆ نوێژی سوننەتی ئەوەندەی هەیە کە نوێژە فەرزەکانی پێ تەواو بکرێ، لە پاشا لە حەدیثەکەدا ناوی ڕۆژوویش بەم جۆرە دەبا، واتە: ئەگەر ڕۆژووە فەرزەکەی تەواو بێ، ئەوە باشەو، ئەگەر ناتەواوبێ بەڵام ڕۆژووی سوننەتی ببێ ئەوە ڕۆژووە فەرزەکانی پێ تەواو دەکرێ، ئەمە هەمووی لەبەر زیادە میهرەبانیی خوایە. جا ئەگەر قورسی لە تەرازووی خێری ئەو موسڵمانەدا دەست بکەوێ پێی دەوترێ: بڕۆ بۆ بەهەشت بەشادمانی، خۆ ئەگەر دەست نەکەوێ ئەو جارە فەرمان دەدرێ بەفریشتەی مەنمووری دۆزەخ دەست و پێی دەبەستن و فڕێی دەدەنە دۆزەخەوە. ئەی برادەران! ئەمەی کە ئێمە باسمان کرد بۆ یەکێکە (تارك الصلاة) نەبووە، بەڵکو نوێژکەر بووەو نوێژەکانی باش نەبووەو، لە نوێژی سوننەتدا ئەوەندەی نەبووە کە نوێژە کەموکوورەکەی پێ تەواو بکرێ. کەوابێ هاوار بۆ ئەو کەسانە کە هەر لە ئەسڵدا نوێژ ناکەن.

وا دەردەکەوێ کە ئەم میهرەبانییەی خوای گەورە کە بە نوێژی سوننەت نوێژە فەرزە

ناتەواوەکان تەواو دەکرێن بۆ مرۆیەکی موسڵمانی وەهایە کە شایانی ئەم فەزل و میهرەبانییە بێت، (والله اعلم).

ریوایەت کراوە: یەکەم تاعەتێك لە ڕۆژی قیامەتدا حیسابی بەندەی لەسەر بکرێ نوێژە، واتە: ئەگەر نوێژەکانی ڕەساو تەواو بن کردەوەکانی تری قبوولْ دەکرێن و ئەگەر نوێژەکانی باش نەبن کردەوەکانی تریشی بە باشی لێ وەرناگیرێن. جا باش بڕوانن مادام نوێژ لەوانەیە کە باشەکانی ببنە هۆی وەرگرتنی کردەوەکانی تری و ناتەواوەکانی ببنە هۆی وەرنەگرتنی کردەوەکانی تر، ئەمە مەعنای ئەوەیە کە نوێژ چاکترین کارە، وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: (الصلاة خير موضوع).

هەروەها لە حەدیسێکدا دەفەرموێ: یەکێك لە فریشتەکان پێی سپیدراوە کە لەکاتی هەر نوێژێکدا بانگ بکا: ئەی موسڵمانینە! هەستن، ئەو ئاگرەی کە نەفسی خۆتان هەڵی گیرساندووە بە پیرۆزیی نوێژەکان بیکوژێننەوە.

لە حەدیسدایە: هەر کەس بەعەمدی نوێژ بفەوتێنێ لە قاپیی دۆزەخدا ناوی لە لیستەی ئەهلی دۆزەخدا دەنووسرێ. جا ئەگەر تۆبەی کردو دەستی دایە نوێژکردن ئەوا ناوی لە لیستەکەدا لادەبرێ..

دەگێرنەوە کە حەزرەت (د.خ) دەرحەق بەو کەسانە کە نوێژ دەفەوتێنن فەرموویەتی: قەسەم بە خوا نابێ بەئاشکرا تەرکی نوێژ بکەن، مادام ئەم گوناهە بکەن خەڵك دەنێرم سەریان ببڕن. هەر لەسەر بناغەی ئەم حەدیثەیە کە ئیمامی شافیعی (د.خ) فەرموویەتی: یەکێك نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر نەکا لەبەر تەمەڵی، ئەوە پێویستە ئیمامی موسڵمانان ئەو کەسە لەسەر حەددی شەرعی بکوژێ.

ئەو نوێژ کەرانەش کە نوێژ دەکەن، بەڵام ئاگایان لەو شتانە نییە کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوەو، نوێژەکەیان بە یەکێ لەوانە بەتاڵ دەبێتەوە، مادام لەو نەزانینەدا عوزریان نەبێ وەکو تازە موسڵمان یا ئەوانەی کە لە شارو دێهاتی ئیسلامەوە دوورن، ئەوانەش حوکمی (تارك الصلاة)یان هەیە.

لە فەرموودەی پێغەمبەردایە: گەورەترین کار نوێژکردنە لە سەرەتای کاتیداو، هیچ نوێژێ بەقەدەر نوێژی سبەینێی جەماعەت خەیری نییە.

هەر لەم بابەتەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : حازربوون لە جەماعەتی نوێژی

بەیانییان لەلای خوای گەورە بەرێزترە لە شەو بێداری و نوێژکردن هەتا سبەینێ،

لە حەدیسدا هەیە: هەرکەسێ نوێژی عەسری کرد و بەتەنیا لە مزگەوتدا دانیشت و چاوەڕێی نوێژی مەغریبی کرد هەتا نوێژەکەی مەغریبیشی کرد، ئەو ماوەیەی بەعیبادەت بۆ حسێب دەکرێ و، وەك ئەوەیە هەشت بەندەی لە ئەولادی ئیسماعیل ئازاد کردبێ و، دەبێ بەهۆی ئەوە کە خوا لە گوناهەکانی خۆش ببێ، بەڵکو ئەوەندە پایەی بەرز دەبێ کە لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت و تکا بۆ تاوانباران بکا و، هەر دوعایەك بکا فریشتەکان «آمین» دەڵێن بەڕاسەریەوە.

براکان! لەپاش نوێژی سبەینێ ڕزق و ڕۆزی بەش دەکرێ و، لە پاش نوێژی عەسر خەڵاتی مەعنەوی و بەهرە بەسەر موسڵمانانـدا بەش دەکرێتەوە؛ جا لەبەرئەوە چاکتر ئەوەیە کۆڕی (خەتم) و (تـوجـهـاتـی) نەقشبەندییەکان و کۆڕی زیکر و حوزووری قادرییەکان لە پاش نوێژی عەصر بێ تابەو خێر و پاداشانە بگەن و بەهرەمەند ببن.

ئەی برادەران ڕیوایەت کراوە: بۆ ئەو کەسانەی کە پێنج فەرزەی نوێژیان بەباشی بەجێ هێناوە، لە بەهەشتدا خوای گەورە لەکاتی هەر نوێژێ لە نوێژەکانی دنیادا بە فریشتەدا دیارییەکی وەهای بۆ دەنێرێ کە لە بەهەشتی ئەو کەسەدا دەست نەکەوێ. ئەی برادەران! لە مەفهوومی حەدیسەکانەوە وەها دەردەکەوێ ئەگەر (تارك الصلاة) بە ئیمانەوە بمرێ و خوای گەورە لێی خۆش ببێ و بڕواتە بەهەشتەوە، لەم دیاری و ئیکرامە کە بۆ نوێژکەر ڕەوانە دەکرێ بێ بەش دەبێ؛ چونکە ئەو بەش و بەهرەیە بۆ ئیکرام و ئیحترامەو (تارك الصلاة) هەرچەند عەفوو بکرێ ئەو حورمەتەی نییە.

ئەی برادەران! سەرگوزەشتەی فەرزبوونی ئەم پێنج فەرزە نوێژە وەها بووە کە لە شەوی میعراجدا واتە: لەو شەوەدا کە حەزرەت (د.خ) لەگەڵ حەزرەتی جوبرەئیل لە مەککەوە ڕۆیشت بۆ (بيت المقدس) لە شاری (قدس) دا و، لەوێوە بە قودرەتی خوا بەسواریی بوراق سەرکەوت تا لە هەر حەوت ئاسمانەکان سەرکەوت و لەو مەقامەوە بەتەنیاو بە بێ جویرەئیل سەرکەوت تا ئەو شوێن و پایەیە کە خواستی خوای لەسەر بوو، بەڵێ لەو شەوەدا کە پێغەمبەر (د.خ) موناجاتی لە حوزووری خوادا کرد خوای گەورە بۆ هەر شەو و ڕۆژێ پەنجا فەرزی لە سەر حەزرەت و لە سەر ئوممەتی ئەو فەرز کرد. جا کاتێ لەو مەقامە هاتە خوارەوە بە حەزرەتی مووسای کوڕی عیمران گەیشت «على نبينا وعليه الصلاة والسلام» و، لێی پرسی: خوا چی لەسەر ئوممەتت فەرز کرد؟ ئەویش فەرمووی

پەنجا فەرز بۆ هەموو شەو و ڕۆژێ، مووسا فەرمووی: ئوممەتەکەت ناتوانن ئەم پەنجا فەرزە بەجێ بێنن بڕۆرەوەو داوای کەم کردنەوەیان بکە لە خوا، ئەویش گەڕایەوەو داوای کەم کردنەوەیانی کرد. خوای گەورە پێنج فەرزی لەو پەنجا فەرزە کەم کردەوە، حەزرەت (د.خ) گەڕایەوە، دووبارە گەیشتەوە بە حەزرەتی مووسا (د.خ) و فەرمووی: خودا پێنج فەرزی لە پەنجا فەرزەکە کەم کردەوە، دووبارە حەزرەتی مووسا فەرمووی: ئوممەتی تۆ ناتوانن ئەم میقدارەش بەجێ بهێنن؛ بۆیە حەزرەت (د.خ) گەڕایەوە بۆلای خوا تا چەند جارێ و، پێنج پێنج لەو پەنجا فەرزە لادەبراو، حەزرەتی مووسا عەرزی حەزرەتی دەکردەوە کە ئەمە زۆرە، تا جارێ دوایی خوای گەورە فەرمووی وا ئەو، پەنجا فەرزەم کرد بە پێنج فەرز. حەزرەتی مووسا دووبارە پێی فەرموو: بڕۆرەوە بۆ حوزووری خوا بۆ کەمکردنەوەی، بەڵام حەزرەت فەرمووی ئیتر شەرم دەکەم لە خوا کە جارێکی تر داوای کەمکردنەوەی ئەم نوێژانە بکەم، بۆیە نوێژ لە سەر ئەم پێنج فەرزە جێگیر بوو هەتا هەتایە.

ئەم پێنج فەرزە نوێژە لە هیچ ئاین و شەریعەتێکدا کۆنەبووەتەوە؛ بۆ نموونە: حەزرەتی ئادەم هەر نوێژی سبەینێ و حەزرەتی داوود نوێژی نیوەڕۆ و حەزرەتی سلیمان نوێژی عەسرو حەزرەتی یەعقوب نوێژی مەغریب و حەزرەتی یونس نوێژی عیشای بووە.

بێگومان هەریەك لەم نوێژانە جۆرە گەورەیی و پایەیەکیان هەیەو، هەموویان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کۆبوونەتەوە ؛ هەتا ئەو هەمووە حیکمەت و ڕەحمەت و میهرەبانییەی خوا بۆ ئەم ئوممەتی ئیسلامە جێبەجێ ببێ. لەلایەکی ترەوە زۆر سوپاس لەسەر ئەم ئوممەتە واجیبە کە لەکاتی ئەو موعجیزە گەورەی میعراجە بۆ ئەو سەرداری جیهانە (د.خ) ئەم پێنج فەرزە نوێژە واجیب کراوە کە لە هەمو عیبادەتێك گەورەترە. ئەم پێنج فەرزە نوێژە حەڤدە ڕەکعەتن، وەکو شێخ (ابن حجر) نەقلی کردووە حیکمەتەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ هەر جۆرە مرۆڤێك بێ لە شەو و ڕۆژدا حەوت سەعات دەنوێ و حەڤدە سەعات ئاگادار و بێدارەو لە هەر سەعاتێکدا پێویستە تاعەتێکی هەبێ کە ببێتە کەفارەتی غافڵی و هەندێ تاوان. جا هەر ڕەکعەتێ لەو حەڤدە ڕەکعەتانە دەبێتە کەفارەتی تاوانی سەعاتێك، لەو تاوانانەی کە مافی خودان یا مافی خەڵکن و بە کەفارەت چاریان دەکرێ.

حیکمەتی ئەوەش کە نوێژی سبەینێ دوور رکات ئەوەیە مرۆڤ کە لەخەو هەستێ لەشی قورسە و ناتوانێ زۆر نیش بکات، لەبەرئەوە خوای گەورە ئەو نوێژەی کردووە بە

دوو ركات. نوێژەكانی تر لەكاتی ئاسایش و ئاگاداری و بەهێزیدان، لەبەرئەوە كراون بە چوار ركات، نوێژی مەغریب نەبی كە كراوە بە سێ ركات؛ چونكە سێ تاقەو خوای گەورە ژمارەی تاقی خۆش دەوێ، لەلایەكی ترەوە كاتی مەغریب نە وەك كاتی سبەینێیە كە لەشی مرۆڤ سست بێ و، نە وەكو كاتەكانی ترە لە بەهێزیدا؛ لەبەرئەوە كراوە بە سێ رەكعەت.

ئەی برادەرینە! بەختیار ئەو كەسەیە كە بە نووری تاعەتی خوا و نوێژكردن دڵی خۆی نوورانی دەكا و بەدبەخت ئەو كەسەیە كە پشت لەم ڕەحمەتە دەكا بەنەوعێ كە خۆی لە ئارەزووی نەفسدا دەفەوتێنێ.

لە حەدیسدا هەیە هەر كەسێ حەزدەكا لەوەی كە عومری درێژ بێ بانوێژ بكا، چونكە نوێژكەر یا عومری بە ساڵ درێژ دەبێ، یاخۆ لەبەر دڵشادی و دەروون گوشادی با تەمەنیشی كەم بێ بەقەدەر عومرێكی درێژ خۆشی لە ژینی خۆی وەردەگرێ.

فەرموودەی پێغەمبەرە كە جەماعەتی نوێژی سبەینێ و نوێژی عیشا لە هەموو جەماعەتێ خێری زۆرترەو، ئەگەر خەڵك بیانزانیایە خێر و سەوابی ئەمانە چەند زۆرە، ئەگەر لەسەر چنگیش بووایە دەهاتن بۆ ئەم نوێژە، واتە: تەنانەت ئەگەر دەست و پێشیان یارمەتییان نەدا هەر تەركی ئەم نوێژانەیان نەدەكرد. ئەم نوێژانە لەسەر شانی كەسێ دینی تەواو نەبێ گرانترین نوێژن.

ئەی براینە! ئەوەی عەرزم كردن لەم مەكتووبەدا كەمێك بوو لە گەورەیی نوێژ بەشێوەیەكی گشتی، ئەگەرنا نوێژ چەند جۆری هەیەو، هەر جۆرێكی چەند پایەو گەورەیی هەیە، هەندێ لەو پایەو گەورەییانەم لە دوو سێ مەكتووبدا نووسیون، وەكو مەكتووبی تەركی نوێژو، مەكتووبی جەماعەت و، مەكتووبی عیبادەت و، مەكتووبی جوابی (بین باشی) بەغدایی و، مەكتووبی سوننەتانی نوێژ.

زاناكان فەرموویانە: حەسەناتی سوننەتەكانی نوێژ، غەیری فەرزەكان، شەست و نۆ هەزارو حەوت سەد و حەفتا و دوو حەسەنەیەو، هیچ فەرزێك لە خواپەرستییەكان ئەوەندە جۆری نییە كە نوێژ هەیەتی و، هیچ سوننەتێ ئەوەندە خێرو بەرەكەتی نییە كە نوێژ هەیەتی؛ ئەمە هەمووی بەڵگەو ئیسباتە بۆ ئەوەی كە نوێژ خواپەرستییەكە لە هەموو خواپەرستییەكانی تر گەورەترە.

ئەی برادەرینە! قەسەم بە خوای گەورە زوربەی کات من خەفەتی ئەحواڵی ئێوە دەخۆم و ئێوە بێ ئاگان ، ئەوانەش کە بەخەبەرن خۆیان بە گەورە دەزانن و ئەم نووسراوانە بەباشی ناخوێننەوەو، خۆیشیان کتێبی لەم جۆرەیان نییە کە تەماشای بکەن، دیارە سینگی مرۆڤیش (لوح المحفوظ)نییە کە هەموو شتێکی تیابێ.

بە یەکێك لە مەلاکانی دێیەکی گەورەم وت: ئەلحەمدولیلا ئەهلی ئەم دێیە حەز لە ئاین دەکەن؛ بۆچی مەکتووباتی ئێمەیان بەسەرا ناخوێنێتەوە؟ فەرمووی: یا شێخ! تەقسیرم نەکردووەو، زۆر قسەم لەگەڵدا کردوون، بەڵام گوێی پێ نادەن. وتم: ئەلحەمدولیلا، بەڵام رجات لێ دەکەم ئەوەی کە لە بابەتی تەرکی نوێژەوە و ئەحواڵی ئەوانەی کە تەرکی نوێژ دەکەن وتووتە لای منیش بیڵێ. وتی: وتوومە: تەرکی نوێژ حەرامە و خراپە. وتم: ئیتر چیت وتووە؟ وتی : یاشێخ سەیرە ئێوە باوەڕناکەن، من زۆرم وتووە. وتم: ئاخر چیت وتووە بیڵێ ، وتی: وتوومە: تەرکی نوێژ زۆر حەرامە.

هەرچی تەکرارم کردەوە بەرودوا ئەم حەرفە بوو!

بەخودا قەسەم ، من بەرەحمەتێکی زۆر لە کتێبە باوەڕ پێکراوە گەورەکان هەر مەکتووبێك لەم مەکتووبانەم کۆکردوەتەوە، ئەو بێ چارە نە کتێبەکانی منی هەبوو، نە لە عیبارەتی مەکتووبەکانی من ئاگادار بوو، نە زیاتر لەوەی کە بۆم گێڕانەوە وتی!.

خۆشەویستەکانم! مەکتووباتی دڵسۆزتان پاروویەکی ئامادەیە، کەچی پێیان عەیبە بە مەکتووباتەکەی من ئامۆژگاریی موسڵمانان بکەن، جا بەهۆی ئەو جۆرە خۆ بەزل زانینانەوە نە من خێرم دەگات و، نە ئەوانیش بە پاداشی گەورەی ئەمرو نەهی دەگەن.

انا لله وانا اليه راجعون، والسلام على من أتبع الهدى وأجتنب الردى وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

## نامەی هەشتەم

# باسی نوێژ نەکردنە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه وأتباعه الهداة الى دين الله.

پاش ئەمە سەلام و ئیحتیرامێکی زۆر پێشکەشی براکانی خۆم دەکەم. ئەی براینە! ئەم عەریزانە کە بۆ خزمەتی ئێوەیان دەنێرم، گەورەترین و بەسوودترین دیارییەکە کە دۆست بۆ دۆستی ڕەوانە دەکا، بە دەلیلی ئەو حەدیسە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ر.خ) لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

«ما أهدى مسلم لاخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده عن ردى»

واتە: هیچ موسڵمانێك دیارییەکی نەناردووە بۆ برای خۆی کە بەنرختر بێ لە وتارێکی زانیاری بابەت کە شارەزاییی زیاتر بکا، یا لە خراپەیەك ڕزگاری بکا.

جا لەبەر ئەمە ئومێدەوارم کە نامەی دڵسۆزی خۆتان بەدڵ وەربگرن و، ئەم دیارییانە کە بۆتانی ڕەوانە دەکەم بەگوێی دڵ ڕای بگرن. ئاخۆ بەسوودترین دیارییەك لەلایەنی برایەکەوە کە دڵسۆزترین دۆستتان بێ قەبووڵ ناکەن؟ هەرکاتێ لە درێژی نامەکانی ئەم دڵسۆزەتان بێ تاقەت نەبوون، بەڵکو دڵشاد بوون، موژدە بێ ئەوە ئیمانتان تەواوە، چونکە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: گەورەترین ڕەوشتی چاکی موسڵمان ئەوەیە کە هەرگیز لە بیستنی وتاری خێر تێر نەبێ و هەمیشە ئارەزوومەندی ببێ.

ئەی برادەرانی من ئەگەر ئینسافتان ببێ، لەمەوپێش بیستووتانەو دەزانن کە خودا لێخۆشبووی باوکم هەمیشە خزمەتی پێشینانی ئێوەی کردووەو، لە هەر کاتێکدا یەکێك لەوانە تووشی نالەباری و ئازاریّ بووبیّ و ئەوی ئاگادار کردبیّ لە خزمەتکردن و یارمەتیدانیدا کۆتایی نەکردووەو هاودەردو هاومەینەتی بووە، تەنانەت چەند جار رێکەوتووە کە دەسەلاّتداری ڕۆژ شتێکی ناڕەوای لە ئەهلی ولاّتەکە ویستووەو مەئموری دیاری کردووە بۆ بەجێهێنانی ئەو کارە، کەچی خوا لێخۆشبووی باوکم تکای لە دەسەلاّتدارەکە دەکردو دەفعی ئەو ئازارەی لیّ دەکردن و، هەموو ئەهلی ولاّتەکەی لەو بەلاّیە دوور دەخستەوە.

پوختەی قسە ئەوەیە کە ئێمە حەقمان لەسەر ئێوە زۆرەو، ئێستە کە ئاخر زەمانەو ئێمە لە زانایانی ئاینی ئیسلامین و دەزانین کە هەموو برادەران بە موسیبەتی قیامەت و زیانی دنیایی گیرۆدە بوون و، لەم ڕووەوە خەم و پەژارە لەسەر دڵ بووە بە بار ، پێویست بوو کە خۆم بێم بۆ خزمەتی ئێوە، بەڵکو بەهۆی ڕجاو تکاکردن چارێکی ئەم وەزعە بکەین، بەلاّم بۆم ڕێك نەکەوت خۆم بێم، بۆیە ئەم مەکتوبەم ڕەوانەکرد بۆ خزمەتتان. زۆر تکا دەکەم و حقووقی باوکم کرد بە تکاکار لە خزمەتی ئێوەدا کە گویّ بگرن بۆ ئەم مەکتووبانە کە من تەقدیمیان دەکەم و ڕەفتاریان پیّ بکەن. ئەو کەسە کە ئەم مەکتووبە دەخوێنێتەوە لە پێشدا بانگی خەڵکەکە بکا کە هەموویان بە دڵ ئاگادار بن تا لە هەموو عەریزەکەم حاڵی ببن و ڕەفتاری پیّ بکەن، تابزانن هەرکەسیّ بەو موسیبەتانە گیرۆدە نەبووە، زۆر سوپاسی خوا بکا و، ئەو کەسەی گیرۆدە بووە زوو پەشیمان بێتەوە و خەم بخوا لەسەر ئەو گوناهانەی کە کردوونی و لێیان پەشیمان بێتەوە.

ئەم جارە نووسراوەکەم لەبابەتی تەرکی نوێژ یا دروست نەبوونی نوێژەکەیە لەبەرئەوەی ئادابی جێبەجیّ نەهاتووە یاخۆ تەمەڵی و سستی کراوە لە کردنی نوێژەکەداو چاودێریی وەخت و وادەی نەکراوە، ئیشەڵلا مانگ بە مانگ لە بابەتی هەر گوناهیّ یا هەر موسیبەتیّ کە ئیستە ڕووی دابیّ یاخۆ زووتر بووبیّ نامەتان بۆ دەنووسم. لەم کاتەدا باسی نوێژم پێش خست؛ چونکە فەرموودەی پێغەمبەرە کە نوێژ کۆڵەکەی ئاینە، هەر لەبەرئەمەشە کە فەرموویەتی: ئەو کەسانەی تەرکی نوێژ دەکەن یا نوێژەکەیان دروست نییە یا خوویان بەوەوە گرتووە کە نوێژەکەیان لە وەخت و وادەی خۆی دوابخەن لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتی حیسابی کرداردا وان لە زیاندا، چونکە ئەوەی کە نوێژی نەکردووە یا نوێژەکەی بەتاڵە نوێژی بۆ حسێب ناکریّ و بەهۆی ئەمەوە

کارەکانی تریشی لیّ قبووڵ ناکریّ. ئەوەش کە لەکاتی خۆیدا نویّژ ناکا، نویّژەکەی خێرو پاداشی نییە و باقیی عیبادەتەکانی تری بە نرخەوە بۆ حسێب ناکریّ، وەکو لە ناخری حەدیسەکەدا دەفەرمووێ: « فقد خاب و خسر» هەروەها «فأولئك هم الخاسرون» کە ناخری ئایەتێکە لە سوورەتی «منافقون» دا و ئەمەش دەلالەت دەکات لە سەر ئەم قسەیە کە کردمان.

پوختەی قسە: لە ڕۆژی قیامەتدا بەهۆی نویّژەوە دەوڵەتی قیامەتی ئێوە بە تالآن دەڕوا و حەسەناتەکەتان نامێنیّ و تاوان لەسەر شانتان دەبێتە بارو جێگەتان دەبیّ بە ئاگری دۆزەخ.

برادەرەکانم! کەواتە بیربکەنەوە: ئاخۆ لە ئەووەڵی دنیاوە تا ئاخری دنیا کەس هەیە بەوە ڕازی بیّ کە لە ڕۆژی قیامەتدا بیّ دەوڵەت و خەسارەتمەند دانیشیّ و لەو بەش و بەهرەیە ناهومێد ببیّ و لە ناو ئاگری دۆزەخدا بمێنێتەوە؟

ڕیوایەت کراوە : یەکەم کۆمەڵێك کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوویان ڕەش دەبیّ کۆمەڵی نویّژنەکەرانە.

برایان! گەورەترین مافەکانی خوای مەزن و گرینگترین داوای ئەو، پاش باوەڕ بە خوا و بە پێغەمبەری خوا، نویّژە، پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی:

«أول ما يحاسب عليه العبد الصلاة، وأول ما يقضى بين الناس في الدماء» واتە: یەکەم شتێك موحاسەبەی بەندەی لەسەر دەکریّ لە ڕۆژی قیامەتدا نویّژەو، یەکەم حوکمیّ کە لەبەینی خەڵکدا جێبەجیّ دەکریّ حوکمی گوناهی مرۆڤ کوشتنە.

براکانم! نیشانەی بەختیاری و ئاخر خەیریی مرۆڤ ئەوەیە کە بە ئایەتەکانی هەڕەشەکردنی خوای مەزن عیبرەت وەربگریّ و لە تاوان دەستبەردار بیّ، هەروەها ئەوەیە کە ئاگای لە خۆی بیّ و چاودێریی نویّژەکانی بکا و مەرج و ڕوکنەکانی بزانیّ لەگەڵ ئەو شتانەی دەبنە هۆی بەتاڵ کردنەوەی نویّژو، هەر کاتیّ دەنگی بانگی بیست بیر لە فریشتەی ڕۆژی قیامەت بکاتەوەو، باوەڕی وەهابیّ کە هەرکەسیّ بەئارەزوو شادی و دڵخۆشی ڕۆیشت بەدەم بانگەوەو نویّژەکانی بەجیّ هێنا ئەوە ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا بەنەرمی و میهرەبانی بانگ دەکریّ و، بە حورمەتەوە حەشر دەکریّ و، لەترسی ڕۆژی قیامەت دەپارێزریّ و لە خەشمی خوا ئەمین دەبیّ. هەروەها هەر کەسیّ گویّ بە بانگ نەداو نەڕوا بەلای نویّژەوەو گوێی نەداتیّ ئەوە دەبێتە شوێنی خەشمی خوای مەزن

و له بەزەییەوە دوور دەکەوێتەوەو له پاشەڕۆژدا فریشتەی بانگ کردنی ئەهلی مەوقیف به ترس و توندی و گرانی بانگی دەکا و دەیداته بەر. پەنا بەخوای مەزن.

ریوایەت کراوه: نوێژی دروست ڕووی شەیتان ڕەش دەکاو، سەدەقه پشتی دەشکێنێ و، یەکتر خۆشویستنی موسڵمانان له نێو خۆیاندا لەبەر ڕەزای خوا بەیەکجاری هێز له شەیتان دەبڕێ. کەوابێ هەر کۆمەڵه موسڵمانێك نوێژەکانیان بەڕاستی بکەن و سەدەقه و خێرات بەداماوان بدەن و، له ناو خۆیاندا یەکتریان خۆش بوێ ئەوە بێگومان شەیتانیان لێ دوور دەکەوێتەوە بە ئەندازەی دووریی مابەینی خۆرهەڵات و خۆرنشین. هەروەها ڕیوایەت کراوه: هەرکەس حەزدەکا تەمەنی درێژ بێ با خزمەتی باوك و دایکی بکا و سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێ و نوێژەکانی بەباشی جێبەجێ بکا، واته: ئاداب و مەرج و ڕوکنەکانی بەتەواوی تێدا بێ و لەکاتی نوێژکردنەکەدا زۆر بەترس و مل کەچییەوە لەبەردەم خوای خۆیدا ڕاوەستێ.

فەرموودەی پێغەمبەره(د.خ): له ڕۆژی قیامەتدا کاتێ که موسڵمانان له بەهەشتدا جێگیر دەبن هەموو کاتێك له کاتەکانی نوێژەکانی دنیایان خوای گەورە بەفریشتەدا دیارییان بۆ ڕەوانه دەکا به جۆرە دیارییەکی تایبەتی. "والله اعلم".

دیاره ئەمەش واتا: ئەو نوێژنەکەرانەی که عەفووکراون و چوونەته بەهەشت ئەو جۆرە دیارییه تایبەتەیان بۆ ڕەوانه ناکرێ. هەتا جیاوازی له مابەینی ئەم دوو جۆرە موسڵمانانەدا هەبێ.

براکانم! بۆتان دەرکەوت که نوێژ گەورەترین خواپەرستییەو، به گوێرەی ئایەتی «ولدینا مزید» خوا زیاده بەخشش دەدا به نوێژکەران و، لەمەوە دەردەکەوێ که نوێژ چاکترین خواپەرستییەکه بۆ موسڵمانان دانراوەو، نوێژنەکردن خراپترین هۆیەکه دانراوه بۆ بەدبەختیی مرۆڤ، خوا پەنامان بدا لێی.

لەسەر بناغەی تەفسیر و مەعنا لێدانەوەی وشەی (ذکر) له ئایەتی (ولذکر الله اکبر)دا دەلیلێکی تر دەێته مەیدان بۆ دەلالەت لەسەرئەوەی که نوێژ چاکترین خواپەرستییەکه بۆ موسڵمانان دانراوه. له قورئانی پیرۆزدا له هەشتا و دوو شوێندا خوای گەورە باسی نوێژ دەفەرمووێ، بەڵام له سی و دوو شوێنیدا لەگەڵ زەکاتدا باسی کردووە، ئەمه بەڵگەیه بۆ ئەوەی که زەکات پەیوەندیی به نوێژەوه هەیه، واته زەکات بێجگه نوێژ له هەموو خواپەرستییەك گەورەتره.

بۆ بەڵگە لەسەر گەورەیی نوێژ ئەوەندە بەسە کە حەزرەت (د.خ) لە نەخۆشینی وەفاتیدا تا زیانی مویارەکی هێزی تیابوو وەسیەتی هەر بە کردنی نوێژ بوو، موسڵمانانی لە تەرك کردنی نوێژ دەترساند؛ ئەمەش بەڵگەیەکی زۆر ڕووناکە لەسەرئەوەی کە نوێژ لە پێویستییەکانی تری ئایینی ئیسلام گەورەترە؛ چونکە نە ڕۆژوو نە حەج نە هیچ واجیبێکی تری ئایینی ئیسلامی ئەوەندەی نوێژ باس نەکردووە.

ڕیوایەت کراوە کە بیر کردنەوە لە مردن دەبێتە هۆی ئەوە کە نوێژی مرۆڤ باش بێ ، واتە لە پێش نییەت هێناندا یادی مردنی خۆی بکا هەتا دڵی بترسێ لەو کات و ساتەو ئەوجا نییەت بێنێ، بەم شێوە لە نوێژەکەیدا ترسی لە خوا بۆ پەیدادەبێ، پێغەمبەر (د.خ) بەم جۆرە چاری خشووعی کردووە.

دەگێڕنەوە: ئەو فریشتانەی کە کردەوەی مرۆڤ دەنووسن، پاش ئەوەی کە مرۆڤ لە نوێژەکەی بوویەوە لە یەکتر دەپرسن: کە فلان کەس چواریەکی نوێژەکەی ناتەواوە یا زیاتر یا کەمتر، هەروەها لە ناو خۆیاندا ئەم حیسابە دەکەن بۆ ئەوەی ئەو میقدارەی لەگەڵ ئاگاداری و لە خواترسیدا کراوە بینووسن و پاداشەکەی بنووسن، ئیتر ئەوی تری نانووسن. کەوابێ زۆر پێویستە کە مرۆڤ کارێکی وەها بکات لە نوێژەکەیدا ترسی خوای لە دڵدا بێ، ئەم لە خوا ترسانەش بۆ ئەهلی غەفڵەت بەوە دەبێ کە لەپێش نییەتی نوێژەکەیدا یادی مردنی خۆی بکا و لە ناو نوێژەکەیدا بیر لە واتای ئایەتەکان بکاتەوەو، ئەگەر نەخوێندەوار بوو لەلای زانایەك فێریان ببێ، ئەگەر فێرنەبوو ئەوە بابزانێ کە نوێژکردن پاڕانەوەو نزایە لەگەڵ خوای گەورەداو، خوا حازرە و بەڕاسەریەو، ئاگادارە، بەم جۆرە ئومێد هەیە ئاگاداری و لە خوا ترسان لە دڵیدا پەیدابێ.

لە حەزرەتی عومەرەوە دەگێڕنەوە (د.خ) کە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) چاوی لە پیاوێکەوە بوو نوێژی کردو نوێژەکەی زۆر سووك بوو، باش ئادابەکەی بەجێ نەهێنا، جاحەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئاگادارن لەم پیاوە؟ ئەمە ئەگەر بمرێ لەسەر غەیری میللەت و ئایینی محەمەد دەمرێ، ئەمەیش لەبەر سووکیی نوێژەکەی فەرموو.

براکانم! هەر کەسێ تۆزقاڵێ باوەڕی ببێ ئەم ئەندازە هەڕەشەیەی بەسە. یاخوا هەموو ساڵی من بەقوربانی ئەو موسڵمانە بێ کە بەم جۆرە موسیبەتانە گیرۆدە نەبێ، ئەم موسیبەتانە موسیبەتی دینی و قیامەتین یا خوا هەرگیز تووشی نەبن.

برادەرینە! بزانن حاڵی نوێژنەکەر ئەوەندە شووم و نالەبارە کە گەلێ لە ئەسحابەکان وەکو ئیمامی عومەر و ئیمامی عەلی و عەبدوڵڵای ئیبنو عەباس و عەبدوڵڵای ئیبنو مەسعوود، کە لە زانا بەرزەکانی ئەصحابەن و، (ابوهریرە) و عەبدورەحمانی کوڕی عەوف جابیرو مەعازی کوڕی جەبەل و غەیری ئەمانەش، خوایان لێ ڕازیی بێ، باوەڕیان وایە کە هەرکەسێ بەدەسەنقەست و بە هۆی تەمەڵی کەمتەرخەمی یەك نوێژی فەرز تەرك بکا کافر دەبێ، مەگەر تەوبە بکا و بەقەزای بگێڕێتەوە.

هەندێ لە ئیمامانی (تابعین)، کە ئەوانەن هاوڕێیانی حەزرەتی پێغەمبەریان دیوە، فەرموویانە: ئەمان بیستووە کە هیچ کەسێکی تر لە باقیی یارانی پێغەمبەر بە خیلافی فەرموودەی ئەو ئەسحابانە، کە تەرکی نوێژیان بەدەسەنقەست بە کوفر زانیوە، قسەی کردبێ. پوختەی قسە ئەوەیە کە بیروباوەڕیان لە سەر ئەوە بووە کە هەر کەسێ بە بێ بەهانەیەکی شەرعی و بەدەسەنقەست نوێژێکی فەرزی تەرك کرد ئەو کەسە کافر دەبێ.

لە عەبدوڵڵای ئیبنو نەقیف خوای لێ ڕازی بێ، ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: یارانی پێغەمبەر (د.خ) تەرکی هیچ واجیبێکی ئاینییان بە کوفر دانەناوە نوێژ نەبێ؛ واتە: لەنێو واجیباتە عەمەلییەکاندا ، وەك نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج، هیچ کامیان وەك نوێژ بەوە داناوە کە تەرك کردنی کوفر بێ، بەڵام تەرکی نوێژیان بە کوفر داناوە.

لە پاش وەفات کردنی هەموو ئەسحابەکانی پێغەمبەر (د.خ) هەژدە ئیمامی زانای بەرز بوون کە لە ئاینی ئیسلامدا (مجتهد) بوون و خزمەتی ئاینیان کردووەو، ئەگەر خزمەتی ئەوان نەبووایە ئەحکامی ئاین وەها رووناك نەدەبوو بۆ موسڵمانان، لەم هەژدە ئیمامانە چواردەیان کەوتوونەتە شوێنی فەرموودەی ئەسحابەکان و فەرموویانە: تەرکی نوێژێکی فەرز و دواخستنی لە کاتی ناچاری، واتە کەسێ نوێژی نیوەڕۆ نەکا تا کاتی عەسر تەواو دەبێ و نوێژی مەغریب نەکا تا کاتی نوێژی عیشا ڕادەبووڕێ ئەوە کوفر حسێب دەکرێ بۆی. ئەم ئیمامانە وەکو ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیمام ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهو ئیمام یەعقووبی سەجستانی و داوودی تەیالسی و ئەبووبەکری کوڕی شەیبەو ئیمام زوبەیر و غەیری ئەمانەش هەموو ئەمانە کە لە ئاوی شەو پارێزییان کردووە، بیروڕایان وایە و فەرموویانە: هەر کەسێ فەرزێکی نوێژ بەعەمدی تەرك بکات کافر دەبێ و کافر حسێب دەکرێ. لەگەڵ ئەمەشدا حوکمدان بە کوفری موسڵمان گەلێك نالەبار و نارەوایەو پارێز لێکردنی لە جوملەی واجیباتە،

تەنانەت ئەگەر کەسێ بەناحەق موسڵمانێ بە کافر دابنێ، ئەوە خۆی کافر دەبێ، کەواتە ئەو زانا پایەبەرزانە ئەگەر ئەو فەتوای خۆیانە بە ڕاست نەزانیایە ئەو فەتوایانەیان نەدەداو نەیاندەفەرموو: مرۆڤ بەتەرکی نوێژ کافر دەبێ.

من نامەیەکم لە بابەتی ئادابی موسڵمانانەوە لەسەر فەرموودەی حەزرەت (د.خ) نووسیوە و لەو نامەدا نووسیومە: ئەمری پێغەمبەرە (د.خ) کە لە شەودا دەمی گۆزەی ئاو داپۆشن تا شتی خراپی تێ نەچێ، هەروەها دەمی مەشکە و خیگەی ڕۆن ببەستن. لەو کاتەدا ئەوانەم نووسی ئەوەم کەوتەوە یاد کە پێشینان لە مەدحی پیاوچاکاندا وتوویانە: «لە ئاوی شەو پارێز دەکات» ئەمەش مەعنای ئەوەیە کە لەبەر رووناکیی فەرموودەکەی پێغەمبەردا ڕەفتاریان کردووەو، لە ئاوی گۆزەی سەردانەپۆشراو و مەشکە و جەوەندەی دەم نەبەستراویان نەخواردووەتەوە، واتە: ئێجگار زۆر پارێزیان کردووە، جا ئیمامی لە خوا ترسی کردار چاکی وەها کە لە ئاوی شەو پارێز بکا، بێگومان هەتا تەحقیق نەکا و نەگاتە بنج و بناوانی شت فتوا نادا و خۆی و خەڵکیش ناخاتە نێو مەترسی و هەڵەوە.

بەڵام ئیمام (ابوحنیفە)و ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی، خوایان لێ ڕازی بێ، فەرموویانە: مرۆڤی موسڵمان هەتا ئینکاری واجبێتیی نوێژە فەرزەکان نەکا کافر نابێ، بەڵام لای ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی بۆ ئیمامی ئیسلام دروستە کە فەرمان بدا بە کوشتنی نوێژنەکەر لەلایەنی حەددی شەرعییەوە، نەك لەلایەنی کوفرەوە؛ چونکە ئەو مرۆڤە بەتەرکی ئەو فەرزە کافر نابێت، کەچی ئیمامی ئەبوو حەنیفە فەرموویەتی : کوشتنی دروست نییە، بەڵکو حەپس دەکرێ هەتا تەوبە دەکات و دەست دەکاتەوە بە نوێژکردن یا دەمرێ. جا لەم بارەوە ئەو فەرموودانەی پێغەمبەریان (د.خ) تەئویل کردووە، کە دەلالەت لە سەر کوفری نوێژنەکەر دەکەن، بەو نوێژنەکەرەی کە ئیمان و باوەڕی نەبێ کە ئەو نوێژە فەرزە و واجیبە، واتە: لە کاتێکدا باوەڕی ببێ بەوەی کە نوێژەکە واجیبە و لە بەر تەمەڵی تەرکی بکا، ئەوە کافر نابێ. بەڵام ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵ و هاوفکرەکانی تەئویلی فەرموودەکانی پێغەمبەریان نەکردووەو حوکمیان کردووە بە کوفری نوێژنەکەرو، لەم ڕووەوە فەرموویانە: کوفر دوو جۆرە، یەکەمیان کوفری قورس وەکو باوەڕنەکردن بە خوا و بەپێغەمبەر (د.خ) دووەمیان کوفری سووکە وەکو نوێژنەکردن لە بەر تەمەڵی.

جا لە سەر ئەم بناغەیە، شێخ ئیبنو حەجەر لە(توحفە)دا لە کتێبی نیکاحدا دەفەرمووێ

: مارەکردنی ژنی (کتابیە) وەك جورلەکەو گاور باشترە لە مارەکردنی ژنێکی موسڵمانی نوێژنەکەر، چونکە بە (ئیجماع)ی ئیمامان دروستە بۆ موسڵمان ژنی (کتابیە) مارەبکات لە کاتێکدا کە مەرجەکانی ئەم مارەکردنە بێتەجێ، بەڵام ئیختیلافیان هەیە لە دروست بوونی مارەکردنی ژنی نوێژنەکەردا، چونکە لای گەلێك لە ئیمامەکان، وەکو باسمان کرد، ژنی موسڵمان کە نوێژ تەرك بکا بە (مرتدە) واتە: هەڵگەڕاوە لە دینی ئیسلام دادەنرێ و، (مرتدە) بە هیچ جۆرێ مارەکردنی دروست نییە، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلامەتی و نوێژەکانی دەکا.

ریوایەت کراوە: پایەی نوێژ لە دنیادا وەکو سەری ئینسانێ وایە بۆ لەش، جا هەروەکو لەش بە بێ سەر ژیانی نامێنێ ئاینیش بە بێ نوێژکردن وجوودی نابێ.

هەروەها نوێژ تەشبیە کراوە بە مرۆڤێك، ئەرکانی نوێژەکە وەك سەریەتی و، مەرجەکانی وەکو رۆحی وایە، بەتایبەتی لە خواترسان (خشووع) و ئاگاداری لە نوێژدا، کە لای زانا گەورەکان بە شەرت و مەرج حسێب کراون، ئەگەر لە خوا ترسان و ئاگاداری نەبێ نوێژەکە پاداش و پایەی نابێ، ئەو سوننەتانەش کە لە (أبعاضی) نوێژن، وەکو قنووت لە نوێژی سبەینێدا و ڕاوەستان لە قنووتدا، یا وەك تەحییاتی یەکەم و دانیشتن لەو تەحییاتەدا، ئەمانە وەکو ریش و سمێڵ و برۆ و برژانگی ئینسانەکەن، واتە ئەگەر ئەمانە نەبن ئەو نوێژە جوان نابێ وەك چۆن یەکێ ئەگەر برۆو برژانگی نەبێ جوان نییە.

برادەرینە! لە بابەتی نوێژەوە ئیحتیات زۆر پێویستە؛ چونکە یارانی پێغەمبەر (د.خ) کە لە حوزووری ئەو زاتە پایە بەرزەدا بوون و، چواردە ئیمام لە ئیمامانی تابعین وایان بڕیارداوە کە ئەگەر یەکێك بەعەمدی نوێژ تەرك بکا کافر دەبێ و، چەند ئیمامێ موخالەفەی ئەوانیان کردووەو فەرموودەکەی پێغەمبەریان تەئویل کردووە بە ئینسانێك کە لە بەر بێ باوەڕی نوێژەکە نەکا، یا فەرموویانە مەبەست لە حەدیسەکە ئەوەیە کە نوێژنەکەر نەفسی خۆی ئامادە کردووە، بۆ کوفر بە هۆی گوناهی گەورەی نوێژنەکردنەکەوە ، کە پەنا بەخوا لەوانەیە ببێتە هۆی سەلبی ئیمان؛ چونکە دین و ئیمانی موسڵمان وەکو دارێکی بەرزی بەردارەو، نوێژکردن وەکو ئاودانی ئەو دارەیە؛ جا هەروەکو داری تەڕ کە لە وەختی خۆیدا ئاو نەدرێ وشك دەبێ هەروەها دینی ئیسلامیش مادام نوێژی لەگەڵدا نەبێ ئەو ئیمانەی دەفەوتێ و وشك دەبێ و دەکەوێ و لە ڕەگ و ڕیشە دەردێ.

جا مرۆڤ کاتێ تەماشای زاهری فەرموودەی حەزرەت بکا (د.خ) لەبابەتی نوێژ نەکەرەوەو، تەماشای فەرموودەی یارانی پێغەمبەرو ئیمامانی تابعین بکات حەقی وایە کە هەرگیز تەرکی نوێژ نەکا؛ چونکە هۆی نوێژنەکردنەکە ئەوەیە کە ترس لە خوداو لە گەورەیی خودا لە دڵ و دەروونی نوێژنەکەرا نامێنێ و، نووری بەجێهێنانی حوقووقی خودایی لە دڵدا نامێنێ، ئەگەرنا کەسێ کە نووری هەیبەتی خواو حوقووقی خوای لە دڵدا هەبێ هەرگیز تەرکی نوێژ ناکا و، لە بەجێهێنانی واجیبی ئاینیی خۆی لانادا.

ئەو حەدیسانە کە بەزاهیر دەلیلن لەسەر کوفری نوێژنەکەر زۆرن و جێگەی ئیعتبارن، تەنیا عیبارەتەکانیان جیاجیان، بەڵام لە مەعنادا یەکن، بۆ نموونە: یەکەم حەدیس کە تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە دەفەرمووێ: «من ترك الصلاة متعمداً فقد كفر جهارا» واتە: کەسێ بە عەمدی نوێژ نەکا ئەوە بەئاشکرا کافر بووە. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: «بين العبد والشرك ترك الصلاة ، فأذا ترك فقد كفر» واتە: فەرق لەبەینی عەبدی موسڵمان و عەبدی موشریکدا کردن و نەکردنی نوێژە، واتە: ئەگەر نوێژی کرد ئەوە موسڵمانەو، ئەگەر نوێژی نەکرد ئەوە لە کافرە موشریکەکان بووە لە زەمانی پێغەمبەرداو، بە کافری موتڵەق دەناسرێ ئەمڕۆ.

هەروەها لە حەدیسێکی تردا هەیە شێخی بوخاری ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێ: «من لم يصل فهو كافر» واتە: کەسێ نوێژ نەکا کافرە.

بە ژمارە چل حەدیس زیاتر هەیە کە ئەهلی حەدیس ڕیوایەتیان کردووەو کردوویانە بە دەلیل لەسەرئەوەی کە نوێژنەکەر کافرە.

هەروەها ئەهلی حەدیس ئەم ئایەتەی خوارەوەیان کردووە بە دەلیلی ئەوەی کەنوێژنەکەر کافرە، ئایەتەکەش ئەوەیە کە خوای گەورە لە باسی ئەهلی دۆزەخدا فەرموویەتی: «مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ[٤٢] قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ[٤٣]» المدثر واتە : لە ڕۆژی قیامەتدا ئەهلی بەهەشت یاخۆ فریشتەی مالیك ناو گەورەی فریشتەکانی مەئمووری دۆزەخ پرسیار لە ئەهلی دۆزەخ دەکەن و دەڵێن: چ تاوانێ بوو بەهۆی ئەوەی ئێوە گیرۆدەی دۆزەخ بن؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: هۆ ئەوەبوو کە لەدنیادا نوێژمان نەدەکرد.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوا فەرموویەتی: «فأن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة

فاخوانكم في الدين» واته: ئەگەر ئەو كۆمەڵە پەشیمان بوونەوە و نوێژیان كرد و زەكاتی ماڵیان دەركرد ئەوە برای ئاینیی ئێوەن، دیارە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە ئەگەر پەشیمان نەبوونەوەو نوێژیان نەكرد و زەكاتیان نەدا ئەوە برای ئاینیی ئێوە نین.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) فەرمووی: خرایا! لە نێو ئوممەتی مندا مرۆڤی چارە ڕەش و ناهومێد مەهێڵەرەوە. پاش ئەوە بەهاوڕێیەكانی فەرموو: ئایا دەزانن بەدبەخت و ناهومێد كێن؟ عەرزیان كرد: نەخێر، فەرمووی: ئەو مرۆڤانەن كە تەركی نوێژ دەكەن.

دەگێڕنەوە: كە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: خێر نییە لە ئاینێكی وەهادا كە ڕكووعی تیا نەبێ، واتە: یەكێ بڵێ: ئاینم هەیە، بەڵام نوێژ ناكەم؛ ئەوە ڕاست ناكا، تەنانەت كردەوەی باشیشی هەبێ پاداشی چاكی نابێ.

دەگێڕنەوە: یەكێ چاوی بە شەیتان كەوت و پێی وت: من چی بكەم تا وەك تۆم لێ بێ؟ واتە: لە كۆمەڵی ئێوە حسێب بكرێم؟ لە وەڵامدا پێی وت: ئەگەر دەتەوێ وەكو من بی، تەركی نوێژ بكەو سوێندی درۆ و ڕاست زۆر بخۆ؛ واتە: گوێی مەدەرێ و بەڕاست و بەدرۆ هەمووكاتێ هەر سوێند بخۆ تا قەدر و قیمەتی خوای گەورەت لا نەمێنێ ، كابرا كە ئەم وەڵامەی لە شەیتان بیست وتی: «عبدالله» بێ كە هەرگیز نوێژ نەفەوتێنم و هەرگیزیش سوێند نەخۆم ئەنجا شەیتان وتی: هیچ كەس بەفێڵ وەكو تۆ خۆی ڕزگار نەكرد لە داوی من و، تۆ ئەم ئامۆژگارییە لەمنەوە فێر بووی، پەیمان بێ ئیتر هەرگیز لەگەڵ كەسدا قسەیەكی وەها نەكەم كە فێری ئەوەبێ خۆی لە دەسیسەی من ڕزگار بكا. دەگێڕنەوە كە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: بەخوا قەسەم نابێ نوێژنەكەرەكان بە ئاشكرا ئەم گوناحە بكەن و تەركی نوێژ بكەن، یا كەسێ دەنێرم بدا لە گەردنیان یا دەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەر نوێژ كردن. ئیمامی شافیعی لەبەر ڕووناكیی ئەم حەدیسە فەرموویەتی : كە ئەگەر نوێژنەكەر هەر سوور بوو لە سەر نوێژنەكردنەكەی خەلیفەی ئیسلام بۆی دروستە بیكوژێ.

ئیمامی غەزالی (ر.خ) لە باسی ئەو شتانەدا كە دەبنە هۆی مردنی ئینسان بە بێ ئیمانی (پەنابەخوا) وتوویە: یەكێ لەو شتانە تەركی نوێژە. هەروەها ئیمامی حەنەفی و ئیمامی شافعی (ر.خ) فەرموویانە: مرۆڤی نوێژنەكەر ئەگەرچی كافر نییە، بەڵام مەترسیی ئەوەی لێ دەكرێ كە سەلبی سەرەمەرگ بێ، ئەمەش لەگەڵ مەترسیی كوفردا زۆر فەرقی نییە، وا دەبێ مرۆڤی نوێژنەكەر ئەوەندە گوناح دەكا تا لە ئەنجامدا كافر دەبێ.

ڕیوایەت کراوە : هەرکەسێ سێ شت لە خۆی بگرێتەوە خوایش سێ شت لەو کەسە دەگرێتەوە: هەر کەسێ زەکاتی ماڵی لە داماوان بگرێتەوە خوایش لەش ساغی لەو دەگرێتەوە، هەرکەسێ نوێژ نەکاو نوێژ لە خۆی بگرێتەوە خودا لەئەنجامدا ئیمانی لێ وەردەگرێ. هەرکەسێ دوعا نەکات و لە خوا نەپاڕێتەوە خوایش بەجێهێنانی دڵخواز لەو کەسە دەگرێتەوە . دەگێڕنەوە کاتێ خەلیفەی دووەم حەزرەتی (عومەر)- خوای لێ ڕازی بێ- بە نێزەکەی (ابو لۆلۆە)ی مەجووسی، بریندار بوو خوێن لە برینەکەی فوارەی دەکرد، خەریکی نوێژ بوو، نوێژەکەی تەواو کرد، لەگەڵ ئەوەشدا حازرانی خزمەتی عەرزیان کرد کە خوێن پیسە و نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، ئەو خۆی بە ناچار زانی و، هەرچۆن بێ نوێژەکەی کرد .

ئەی برادەران! چەند ئایەت و چەند حەدیس لەسەر نوێژ هەن، بۆ نموونە: خوای گەورە فەرموویەتی:

«يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ» واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان بە ئاینی ئیسلام هەیە، با ماڵ و منداڵتان ئێوە لە نوێژ و یادی خوا غافڵ نەکا. بێگومان هەر کەسێ ماڵ و منداڵ لە نوێژ و یادی خوا غافڵی بکا ئەوە ڕەنج بەخەسارە.

ئەم لەیادی خوا غافڵ بوونە چەند جۆرە: یەکەم ئەوەیە کە مرۆڤ هەر نوێژەکە نەکا و بەجارێ وازی لێ بێنێ. دووەم ئەوەیە کە چاودێریی کاتی نوێژەکە نەکا و بەبێ عوزرێکی ڕەوای شەرعی دوای بخات لە وەختی ئیختیار. سێیەم ئەوەیە کە لە نوێژەکانیدا چاودێریی ئاداب و شەرت و ڕوکنەکانییان نەکا. چوارەم ئەوەیە کە ترس و ملکەچی و دڵ کزی حوزووری خوای نەبێ، کە زۆربەی نوێژکەران گیرۆدەی ئەم بەشە دەردەن، بە هەرحاڵ بە هەر بەشێك لەم بەشانە بەهۆی پێوەندیی دنیاوە مرۆڤ لە نوێژ غافڵ بێ، ئەوە بێگومان ڕەنج بەخەسارەو لە زیاندایە. بەڵام فەرق و جیاوازی لەنێوان ئەم جۆرە زیانانەدا هەیە، واتە: زیانی تەرکی نوێژ زۆرترە لە زیانی تەرکی خشووع لە نوێژدا.

هەروەها خوا فەرموویەتی: « فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا[٥٩] إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ..» ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی ئەولادو نەتەوەی پێغەمبەرەکانی پێش زەمانی حەزرەتی (محەمەدی مستەفا) دەکا (د.خ) ئەوانەی نوێژیان فەوتاندوە، واتە: ئەو نوێژەی کە لە ئاینی خۆیاندا واجیب بووە تەرکیان

کردووەو، کەوتوونەتە شوێن ئارەزووی نەفس، جا بە بۆنەی هەڕەشەکردن لەوانە فەرموویەتی: لەمەولا لە پاشەڕۆژدا لە قیامەتدا تووشی شەڕ دەبن مەگەر ئەوانەیان کە تەوبەیان کردووەو لە ڕەفتارە نالەبارانە وازیان هێناوەو ئیمانیان بەخواو بە ئاینەکەیان هێناوەو ڕەفتاریان باش کردووە.

جا لە زاهیری ئەم ئایەتەوە دەردەکەوێ: ئەو کەسانە لە نەتەوەی پێغەمبەران بوون بەهۆی نوێژ فەوتاندن و دوای ئارەزووی نەفس کەوتن کوفریان بەسەردا هاتووەو، بە پاداشی خراپ هەر لەو شوێنەدا یا لە دۆزەخدا کە ناو دەبرێ بە (غی) ئازار دەدرێن. سەبارەت بە ئێمە مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە ئەو کەسە نوێژ بفەوتێنێ و تەرکی بکات کافر دەبێ و لە قیامەتدا سزا دەدرێ، مەگەر ئەوانەی کە تەوبە دەکەن و ئیمان دێنن و ڕەفتاری باش دەکەن. دەگێڕنەوە مرۆڤێك بووە خواپەرست و تەرکی دنیاکەرو خاوەن پارێز بووە. کاتێ وەفاتی کرد و ناشتیان، لەلای خوای گەورەوە سەد جەڵدەی بە سزا بۆ حەواڵە کرابوو، ئەویش لە خوا پاڕایەوە و وتی: یارەببی! من بەقەدەر توانای خۆم عیبادەتم کردووەو، تکای لوتف و میهرەبانیی تۆ دەکەم. لە ئەنجامدا خوای گەورە عەفووی کرد لە یەك جەڵدە نەبێ، کە لێی درا هەموو گیانی ئاگری تێ چوو. فریشتەکان پێیان ڕاگەیاند کە لەگەڵ ئەوەدا کە تۆ خۆت بە باش دەزانی هەندێ ڕەفتاری خراپت بووە ئەمە جەزای ئەو ڕەفتارانە بوو؛ یەکەم: نوێژێکی بێ دەستنوێژت کردووە، دووەم: ستەم لێکراوێ هاواری بۆ هێنای و دەتتوانی فریای بکەوی و ڕزگاری بکەی، بەڵام گوێت نەدایەو ڕزگارت نەکرد.

مەبەست لەم نەقلە گوێ بە نوێژدانە، کە بەهۆی تاقە نوێژێکی بێ دەستنوێژەوە خودا ئەو سزایەی داوە.

ئەی برادەران! نوێژ پایەیەکی زۆر گرینگە لە پایەکانی ئیسلام و هەرکەس هێزی تێدابێ پێویستە بەڕاوەستانەوە بیکا، خۆ ئەگەر نەیتوانی بەڕاوەستانەوە بیکا ئەوا پێویستە بەدانیشتنەوە بیکا، وایش نەیتوانی پێویستە بەڕاکشانەوە بیکا، واتە: هەتا هۆش و وریایی تێدابێ پێویستە نوێژە فەرزەکەی بکا، بەڵام کە هۆشی تێدا نەما ئیتر لە دائیرەی تەکلیف و لێپرسینەوە دەردەچێت، لەگەڵ ئەوەشدا کەی چاك بوویەوە پێویستە هەر نوێژێکی فەوتاوە بەقەزای بگێڕێتەوە، چونکە وەخت و وادەی واجیب بوونی ڕابووردووە، با لەو کاتەشدا موکەللەف نەبووبێ.

بەڵام دەرکردنی نوێژ لە وەختی خۆی یا دواخستنی تا دواوەخت لەبەر عوزرێکی شەرعی، وەکو لەبیرچوونەوەی وەخت و وادە، یاخۆ کەسێ حەپسی کردبێ. یا تازە موسڵمان بێ و ئاگای لە شەرع نەبێ، یا نووستبێ و خەبەری نەبووبێتەوە تا نوێژەکەی دەچێت، ئەمانە عەفوون بەو شەرتەی زووبەزوو نوێژە فەوتاوەکەیان بە قەزا بگێرنەوە. بەڵام پێویستە بزانن کە نووستن وەختێ دەبێتە عوزری شەرعی کە بە هەڵکەوت بێ، واتە: ئەو کەسەی بەردەوام خەوی گران بێ و خەبەری نەبێتەوە ئەوە لەسەری پێویستە بەپێی توانا بگوێزێتەوە بۆ شوێنی قەرەباڵغ، یاخۆ یەکێ تەمێی بکا کە لەکاتی نوێژدا خەبەری بکاتەوە، بەم جۆرە نەبێ گوناهبارو تاوانبار دەبێت و نووستنەکە نابێتە عوزری شەرعی بۆی، مەگەر هەر کەس دەست نەکەوێ و ناچار بێ.

هەروەها فەوتانی نوێژ لەبەر ڕزگارکردنی کەسێك لە ئاو یا لە ئاگر، یا لە دوژمنی ستەمکار، یا بەهۆی دەفعی شەڕ لە نەفس یا لە ناموس یا لە ماڵ، یا لەبەر ترسی فەوتانی ڕاوەستان لە عەرەفاتدا، یا بەهۆی ڕاکردن لە دەستی دوژمن کە وەزعی ئەوەندە خراپ بێ بە هیچ جۆرێ نوێژەکەی بۆ نەکرێ، ئەمانە هەموو بە فەوتانی عوزردار حسێب دەکرێن، بەڵام پێویستە پاش ڕزگاربوون گورج نوێژەکەی بەقەزا بکاتەوە .

لە ئایەتێکی ترا خوا فەرموویەتی: « وَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ[٤] الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ[٥] الماعون» حەزرەت (د.خ) لە ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی : ئەمانە ئەو کەسانەن کە نوێژەکان لە وەخت و وادەی خۆیان دوا دەخەن، واتە: هەر بەیەکجاری نایکەن، یا بە بێ عوزری شەرعی و بەشێوەی بێ موبالاتی نوێژەکانیان دەخەنە دوادوایی وەختەوە . واتای (ویل) لای گەلێك لە مفسرەکان هاوارەو، لای هەندێکیان شوێنێکی دیارییە لە دۆزەخدا ئەوەندە گەرمە ئەگەر بەردی تێ بکەوێ دەتوێتەوەو دەبێتە ئاو.

سستی و بێ ئاگایی لە نوێژدا، ئەوەندە خوویەکی ناشیرینە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا کردوویەتی بە نیشانەی (منافق) یانی ئەوکەسەی کە بەڕواڵەت موسڵمانەو لە دڵدا ئیمانی نییە؛ ئەوەتە خوا دەفەرموێ:

«إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى يُرَآؤُونَ النَّاسَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللّهَ إِلاَّ قَلِيلاً ». واتە: مونافیقەکان بە خەیاڵی بەتاڵی خۆیان فێڵ لە خوا دەکەن و، دەیانەوێ بە هاتوچۆی عادەتی و بەم بەدەم موسڵمانییە بە موسڵمانی

ساغ حسێب بکرێن، کەچی خوا لە دڵیان ئاگادارە، ئەو مونافیقانە کە هەڵدەستن بۆ نوێژکردن بە تەمەڵی و سستی ڕاست دەبنەوە، وەکو یەکێك بە زۆر ئیشی پێ بکرێ، هەستانەکەیان بۆ نوێژ بەڕاستی نییە بەڵکو خۆیان نیشانی خەڵك دەدەن و نوێژەکەیان بەشێوەی ڕیاکاری و بەر چاوییەو جار جار نەبێ ناوی خوا ناهێنن و ئەو جارجارەش هەر لەبەر ڕیایە.

ئەی براینە! کەسێك پیاوەتی و غیرەتی ببێ حاڵی خۆی ناکا بە حاڵی مونافیق و، نوێژەکانی بە تەمەڵی و سستی ناکا، بەڵکو بەنیشات و شادمانی و رووخۆشی جێبەجێیان دەکا، وەکو یەکێ بڕوات بۆ خزمەتی پادشایێ بەئەدەب و گورجوگۆڵی و بەرگ پاکی و لەش خاوێنییەوە دەڕوا.

تەماشا بکەن: خوای گەورە باسی مونافیقەکان بەوە دەکا کە ناوی خوا نابەن، یا یادی خوا ناکەن ، جار جار نەبێ، جا مادام ئەمە حاڵی مونافیق بێ دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێ کە بەغەفڵەت و بێ هۆشی ڕۆژ دەداتە دەم شەو و شەو دەداتە دەم ڕۆژ، بێ ئەوەی ئاگای لە ئەوامیری خوای گەورە هەبێ؟. ئەی براینە! دەگێڕنەوە هەندێ لە موسڵمانە پێشینەکانمان کاتێ کە دەنگی بانگدەریان بیستووە بە گورجی ڕاست بوونەتەوەو بەپەلە پەل خەریکی نوێژەکەیان بوون، کە لێیان دەپرسین: بۆچی وا بەپەلە دەڕۆن؟ لەوەڵامدا دەیانوت: دەترسین لە زومرەی ئەوانە حسێب بکرێین کە خوای گەورە لەو ئایەتەدا باسی کردوون، واتە لەوە ترساون کە لە مونافیقان بژمێردرێن.

ریوایەت کراوە: هەر کەسێ ئاگاداریی نوێژی خۆی بکات و، بەتەواوی ئاداب و مەرج و پایەکانی جێبەجێ بکا ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا نوێژەکەی وەك چرا دەبێتە نوور و ڕووناکی لە بەردەمیدا و لای ڕاستیەوەو دەبێتە شایەت لەسەر ئیمان و خوا پەرستیی ئەو نوێژکەرە.

هەروەها ئەو کەسەی چاودێریی ئادابی نوێژەکەی نەکا، ئەوە نوێژەکەی نە دەبێ بەنوور و نە دەبێ بە شایەتی ئیمانی و نەسوودی لێ وەردەگرێ و، حەشریشی لەگەڵ فێرعەون و هامان و قاروون و (ابی)ی کوڕی (خلف)دا دەکرێ؛ چونکە ئەو نوێژەکەی بە نادروستی و ناڕاستی و ناڕەوایی لە ملی خۆی کردوەتەوە، یا لەبەر خۆ بەزل زانین، واتە: لە سەر خووی فیرعەون بووە، یا لەبەرئەوەی کە خەریکی ئیش و کاری دنیا و کوشتن و بڕین و ئازاردانی خەڵك بووە، واتە: لە سەر خووی هامانی وەزیری فیرعەون بووە، یا

لەبەر تەماشاکردن و سەرپەرشتی کردنی ماڵ و سامان و دارایی و ڕێکخستنی هۆی ماڵ کۆکردنەوە بووە، واتە: لە سەر خووڕەوشتی قاروون بووە، یا لەبەر نیفاق و دووڕوویی بووە، واتە: لە سەر خووڕەوشتی (ابی)ی کوڕی (خلف) بووە کە سەرۆکی پێرە مونافیقەکەی مەدینە بووە! جا کەسێ هەموو عومری لە سەر خووڕەوشتی کەسێك رابوێرێ ئەوە مەعنای وەهایە کە ئەو کەسەی خۆش دەوێ و لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوا حەشر دەکرێ؛ چونکە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) «المرء يحشر مع من أحب» واتە : مرۆڤ لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوانەدا حەشر دەکرێ کە لە دنیادا خۆشی ویستوون.

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) ڕۆژێ لە نێو هاوڕییەکانیدا دانیشتبوو، فەرمووی : ئەمشەو لە خەوما دوو فریشتە هاتن بۆ لام و، وتیان: وەرە بابڕۆین، منیش لەگەڵیانا ڕۆیشتم، گەلێ ئەهلی سزایان پێشان دام؛ یەکەم کەس لەوانە پیاوێك بوو لە سەر گازی پشت ڕایان کێشابوو، فریشتەی عەزاب و سزا بەراسەریەوە ڕاوەستابوو، بەردێکی گەورەی بەدەستەوە بوو، کە بەردەکەی دەدا بەسەری ئەو پیاوەدا مەغزو ئێسقان و پێست و گۆشتی سەری لەیەك جیادەبوونەوەو پرژو بڵاو دەبوونەوەو، فریشتە دەڕۆیی بەردەکە بهێنێتەوە، تا ئەو بەردەکەی دەهێنایەوە سەری کابرا وەکو یەکەم جاری لێ دەهاتەوەو بە تەواوی چاك دەبوویەوە، دووبارە فریشتەکە هەمان بەردی پیا دەماڵی و وەك جاری پێشووی لێ دەهاتەوە، هەروەها بەم شێوە ئازاری ئەو پیاوەی دەدا. وتم : ئەم عەزابە لە سەر چییە؟ فریشتەکان لە وەڵامدا وتیان: ئەمە لە سەر ئەوەیە کە ئەم پیاوە لە دنیادا لە نوێژ کردن سەرگران بووەو نوێژەکانی لە وەختی خۆیان دەرکردووە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ لە بەجێهێنانی نوێژ بێ، مویالات بێ بە پانزە جۆرە سزا گیرۆدە دەبێ، پێنجیان لە دنیاداو، سێیانیان لە کاتی مردندا و، سێیانیان لە گۆڕداو، سێیانیان لە کاتی دەرچوون لە گۆڕ بۆ مەحشەر. جا بێتۆشی ڕەحمەتی خوا لێ بێ فەرموویەتی : ئەمە چواردەو تکا وایە پانزەهەمیان، کە گیرەرەوە (راوی) باسی نەکردوو و لەبیری چووەتەوە، ئەوەبێ کە لە ڕۆژی قیامەتدا رووی ڕەش دەبێ، وەکو لە حەدیسدایە؛ چونکە ریوایەت کراوە: یەکەم ڕوویەك کە ڕەش ببێ لەڕۆژی قیامەتدا، بەهۆی تاوانبارییەوە ، ڕووی ئەو کەسانەیە کە (تارك الصلاة)ن. ئەو پێنج سزایە کە لە دنیادا گیرۆدەی دەبێ ئەمانەن:

یەکەم: بەرەکەت لە عومریا نابێ، واتە: یاعومری کورت دەبێ ، یا ئەگەر درێژیش بێ، خۆشیی تیا نابینێ.

دووەم: ڕەواڵەتی پیاوچاکان لە ڕوویاندا مەحو دەبێتەوە.

سێیەم: هەر کردارێکی چاك و خواپەرستییەك کە بیکەن فریشتەی نامەی کردار بە خاوەن سەوابیان نانووسێ.

چوارەم: هەر دوعایەك بکەن بەرز ناکرێتەوە بۆلای خوا تا قبووڵ بکرێ.

پێنجەم: لە دوعای ساڵحان بێ بەش دەبێ. چونکە هەموو نوێژکەرێ لە تەحییاتدا دەڵێ:

«السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین» دیارە ئەو مرۆڤە نوێژنەکەرە بەر زومرەی صالحان ناکەوێ هەتا لەو دوعایانە بەشدار بێ. ئەو سزایەش کە لەکاتی مردنیدا تووشی دەبێ ئەمانەن:

یەکەم: بەزەلیلی دەمرێ. دووەم: بە تینوویەتی دەمرێ، واتە: ئەگەر هەرچی ئاو هەیە بیکەی بە گەروویدا تینوویەتیی ناشکێ و بەو گەرمیی دەڵەوە دەمرێ. سێیەم: بە برسێتی دەمرێ. لەپاش ئەوەش کە نێژرا و بەخاك سپێررا گیرۆدەی ئەم بەلایانە دەبێ:

قەبرەکەی لەسەر تەنگ دەبێ و دەیگوشێ بە نەوعێ کە ئێسقانی لەشی تێك دەچێ و، خوا قەبرەکەی لێ گەرم دەکا وەکو تەنوورو، هەمیشە ئەم دیوو ئەودیو دەکا بەسەر ئاگردا، هەروەها مارێکیشیان بەسەرا زاڵ دەکا کە پێیانەوە دەداو ئازاریان دەدا، هەروەها لە ڕۆژی قیامەتدا حسێبیان زۆر بە شیدەتەو، خوا غەزەبیان لێ دەگرێ و، لە ئەنجامدا لە ئاگری دۆزەخدا سزا دەدرێن.

دەگێڕنەوە مرۆڤێکی باش منداڵێکی بوو، مرد، لەپاش چەند ڕۆژێ شەوێ لە خەودا چاوی پێ کەوت، کە ئەو منداڵەی هەموو مووی سەری سپی بووە، ئەویش پرسیاری لێ کرد: ڕۆڵە! تۆ منداڵ بووی و، بەمنداڵی مردی ، بۆچی وا سەرت سپی بووە، لە وەڵامدا وتی: لەم گۆڕەستانەدا چەند منداڵێ هەن هەموویان بەم دەردی منە گیرۆدە بوون و سەریان سپی کردووە، لەبەرئەوە کە ئێمەیان لە نزیکی قەبری چەند کەسێکی نوێژنەکەرەوە دەفن کردووە، لە ترسی سزای ئەواندا ئێمە هەموو سەرمان سپی بووەو، ئەهلی قەبرستان بەهۆی ئەوانەوە ئاسایشیان لێ هەڵگیراوە.

دەگێڕنەوە کە یەکێ لە پیاوە باشەکان خوشکێکی بوو مرد و دەفنی کرد، لەو کاتەدا

کیسەی پارەکەی کەوتە نێو قەبرەکەوەو پێی نەزانی ، کاتێ گەیشتە ماڵەوە بیری کردەوە کە کیسەکەی کەوتووەتە نێو ئەو قەبرە، کاتێ چوو بۆ سەر قەبرەکەی و هەڵی دایەوەو، بەردی سەری لەشەکەی لابرد تەماشای کرد قەبرەکە پڕە لە ئاگر، ئەویش زوو سەری قەبرەکەی داپۆشییەوەو بە غەم و مەینەتەوە گەڕایەوەو، ڕۆیشتە لای دایکی و سوێندی دا کە ئەو خوشکەی چ ڕەفتارێکی خراپی بووە کە وا عەزاب دەدرێ، وتی: هیچ کردەوەیەکی نالەبارم پێوە نەدیوە ئەوە نەبێ کە لە نوێژکردن زۆر سست و تەمەڵ و لەش گران بوو، نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا بەجێ نەدەهێنان.

لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە: کاتێ مردوو دەخرێتە گۆڕ ئەگەر لە نوێژنەکەرەکان بێ گەلێ کون دەبێتە قەبرەکەی و لە هەر کونێکەوە جۆرە جانەوەرێکی ژاردار دێتە دەرەوە بۆئەوەی پێیەوە بداو ئازاری پێ بگەیەنێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا هەیە کە هەورێکی ڕەش بەڕاسەری ئەو مرۆڤەوە پەیدادەبێ و لەو هەورەوە مارو دووپشك و جانەوەری خاوەن ژار بەسەر ئەو مردووەدا دەبارێ ، هەریەکە بە جۆری ئازاری دەدا و، بەهۆی سزای ئەو مرۆڤەوە هەموو مردووی قەبرستانەکە بێ ئیستیراحەت دەبن. جا مادام عەزابی نوێژنەکەر وابێ پێویستە لەسەر ئەو کەسەی بیەوێ ڕەحم بە خۆی بکا، بێدار بێتەوەو پەشیمان بێتەوەو دەس بە نوێژکردن بکا و، ئەو نوێژانەی فەوتاندوونی بەقەزا بیانگێڕێتەوە، بەڵکو خوای میهرەبان بە ئیحسان چاوپۆشیی لێ بکاو عەفووی بفەرموێ . والسلام على أتبع الهدى.

نامەی نۆیەم

# باسی ئەو شتانەیە کە نوێژ بە تاڵ دەکەنەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خير خلقه سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

پاش ئەمانە ئەی برادەران! لە خودا تکا دەکەم کە لە سەر پەیداکردنی دەوڵەتی پاشەڕۆژ موەفق بن و، لە نەزانیی ئاینی پارێزراو بن. لە مەوپێش لە بابەتی ئەگبەتی و زیانی ئەو کەسانەی کە نوێژ دەفەوتێنن نامەیەکم نووسی بۆتان، ئەڵبەتە بەدڵ گوێتان بۆ ڕاگرتووە. بۆیە پێویست بوو ئەو شتانەشتان پێ ڕابگەیەنم کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە هەتا برایانی ئاینی لەو شتانە پارێز بکەن؛ چونکە نوێژنەکەر تەنیا ئەوانە نین کە بەیەکجاری نوێژ ناکەن، بەڵکو ئەوانەیش کە نوێژ دەکەن و یەکێ لە موبتەلاتی نوێژیان لێوە ڕوودا ، یاخۆ قەزای نوێژەکانیان بەشێوەیەکی شەرعی جێبەجێ نەکەن، ئەوانەش هەر بە نوێژەکانیان بەشێوەیەکی شەرعی جێبەجێ نەکەن ئەوانەش هەر بە نوێژنەکەر دەناسرێن و، گوناهی ئەوانەی کە نوێژەکەیان بە بەتاڵی ڕادەبوێرن زیاترە لە گوناهی نوێژنەکەر؛ چونکە دەوام لەسەر نوێژی بەتاڵ و پرسیارنەکردن لە زانایەکی ئاینی لە ئەحواڵی نوێژو موبالات نەکردن بە ئادابی نوێژ گاڵتەکردنە بە عیبادەت و، گاڵتەکردن بە عیبادەت ئەگەر بەهۆی نەزانین و ئیشتباه بێ، یا بەهۆی فەرق نەخستن بێ لە بەینی ئاداب و ئەو شتانەی ڕێ لە دروستیی نوێژ دەگرن ئەوە دەبێتە گوناهی گەورەو، بەردەوامی لە سەر گوناهی گەورە، لەوانەیە مرۆڤ ڕابکێشێ بۆ کوفر. پەنا بەخوا. خۆ ئەگەر ئەو گاڵتەکردنەش بە عەمدی بێ ئەوە بێگومان کوفرە.

خۆشەویستەکانم! ئەو نامەی کە من دەینێرم بۆتان بە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) لە چاکترین دیاریی ڕووی عەرزە، تەنانەت لەو دیارییانە باشترە کە پاشایان بۆ یەکتریان ڕەوانە دەکەن؛ چونکە دیاریی ئەوانە بۆ خۆشیی دنیایە و، دیارییەکانی ئێمە بۆ بەختیاریی نەبڕاوەی قیامەتە.

پێویستە بزانن سێ دیاری لە دیارییەکانی من لە باقیی دیارییەکانی ترم گەورەترن؛ یەکەم: نامەی بیروباوەڕی موسڵمانان، دووەم: نامەی باسی تەرکی نوێژ، سێیەم: ئەو نامەی کە باسی ئەو شتانە دەکات نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە.

فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) : «ماأهدى مسلم لاخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده عن ردى» هەروەها فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) کە فێربوونی مەسەلەیەکی ئاینی و، فێرکردنی بە نەزانێ خێر و پاداشی هەزار ڕکات نوێژی سوننەتی هەیە.

ئەی برای زانا هەر مەسەلەیەك کە دەینووسم زۆر ڕوودەدات، بەتایبەتی ئەو مەسەلانەی هەموو کەس ئاگایان لێیان نییە. ڕجام وایە لەڕێی خوادا بە ڕووی میهرەبانی نەزانەکان فێربکەن؛ چونکە مادام فێرکردنی مەسەلەیەکی ئاینی خێری هەزار ڕکات نوێژی ببێ، دەبێ خێری هەموو ئەو ئەحکامە کە زانایان فێری موسڵمانانی دەکەن چەندێ زۆر بێ؟

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر دەفەرموێ: «أذا حمل رجل كلمة من الله إلى اخيه المسلم كان خيراً له من حجة وعمرة ومن عبادة سنة». واتە: کاتێ مرۆڤێ وتارێکی ئاینی بگەیەنێ بە برای موسڵمانی خۆی ئەوە لە حەجێك و عەمرەیەك و عیبادەتی ساڵێ چاکترو خێردارترە بۆی. موحەدیسەکان فەرموویانە: بەیانی شتی کەم مونافی نییە بۆ زۆر کەوابێ مومکینە تەعلیم و فێرکردنی ئەو مەسەلە ئاینییە خێری زیاتر بێ لە چەند حەج و چەند عومرەو لە عیبادەتی چەند ساڵێك ؛ چونکە پایەی خێرو ثەوابی کردەوە بە گوێرەی پایەی خاوەن کردەوە کات و شوێن و زیادە گەورەیی ئەو ڕەفتارەیە؛ بە نموونە : فێرکردنی مەسەلەیەك بە مرۆڤێکی گەورەی قسەڕەوای وەها کە بەهۆی ئەوەوە خەڵکی زۆر ئەو ڕەفتارە چاکە بکەن گەلێك خێری زۆرترە لە فێرکردنی مرۆڤێك کە هەر تەنها خۆی ڕەفتار بەو مەسەلەیە بکا. کەوابێ بەخوا قەسەم ئینساف نییە وەکو ئێوە دیاریی دنیایی قبووڵ دەکەن و پێی دڵشاد دەبن وەها ئەم دیارییە باشانەی ئێمەش قبووڵ

نەکەن کە وەرگرتنی دەبێتە هۆی شادبوونتان بە بەهەشتی نەبڕاوەی هەتاهەتا.

فەرموودەی پێغەمبەرە: « لقد سبق إلى جنات عدن أقوام ما كانوا أكثر الناس صلاة ولا صياماً ولا حجاولا أعتمارا، ولكن عقلوا عن الله مواعظ فوجلت قلوبهم وخشعت منهم الجوارح، وأطاعت لهم نفوسهم».

واتە: گەلێ قەوم لە پێش خەڵكی تردا چوونە بەهەشت، لەگەڵ ئەوەشدا كە نوێژ و ڕۆژوو حەج و عەمرەیان لە خەڵك زیاتر نەبوو، بەڵام لە بیستنی ئامۆژگاریی زانایانی ئاین و بیستنی فەرموودەكانی پێغەمبەر دڵیان ترساوەو، دەست و دەم و زمان و چاو و گوێیان لە شتی چاكدا سەرف كردووە.

لە نامەیەكی تایبەتیدا پایە و گەورەییی نوێژم بەیان كردووە كە گەورەترین عیبادەتی بەدەنییەو، گرینگترین هۆی ڕەزامەندیی خوایەو، بەسوودترین زەخیرەی قەبر و قیامەتە، لەبەرئەمانە پاراستنی نوێژ لە شتێك بەتاڵی بكاتەوە، زۆر پێویستە، من لە بابەتی نوێژەوە شەش نامەم نووسیوە، ئومێدەوارم كە بە فێربوون و فێركردنی ئەوانە، بەتایبەتی ئەم نامەیە كە باسی ئەوانەیە نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە، ئیهتیمامێكی زۆر بفەرموون.

قال الشعراني:

«من صلى جاهلاً بكيفية الوضوء أو الصلاة كأن قصد بفرض معين أو ركن أو شرط النفلية لم تصح عبادته، وان وافقت الصحة، أنتهى.. قلت: وكذلك غير الوضو، والصلاة من العبادات في ذلك، فافهم».

واتە: شێخی شەعرانی فەرموویەتی: یەكێك نوێژ بكات و ئادابی دەسنوێژ و نوێژەكەی نەزانێ، وەك ئەوەی فەرزێك یا ڕوكنێك یا شەرتێك بە سوننەت بزانێ، ئەو كەسە عیبادەتەكەی دروست نییە، با لە خۆیدا ئەو دەسنوێژ و نوێژەشی ڕێكوپێك و دروست بێ. شێخ (ابن حجر) دەفەرمووێ: منیش دەڵێم: هەروەها غەیری دەسنوێژ و نوێژیش لە عیبادەتەكانی تر ئەگەر مرۆڤ ئادابەكانی نەزانێ ئەویش بەتاڵە. هەروەها شێخ ئەحمەدی ئیبنو حەجەر لە توحفەدا لە سەرەتای كیتابی چۆنیەتیی نوێژدا وەها دەفەرموێ.

منیش دەڵێم: هەروەها عەبدولحەمیدی شیروانی لە حاشیەی كتێبی توحفەدا ئەم مەعنایە بەزیادەوە لە خاوەنی كتێبی (نهاية)وە دەگێڕێتەوە.

بەڵێ هەر لەو حاشیەدا دەفەرمووێ: «وأفتى حجة الاسلام الغزالي بأن من لم يميز من العامة فرض الصلاة من سننها صحت صلاته إى وسائر عباداته بشرط أن لا يقصد بفرض نفلا، وكلام المصنف في مجموعة يشعر برجحانه، والمراد بالعامي من لم يحصل من الفقه شيئاً يهتدي به إلى الباقي، ويستفاد من كلامه، إى «المجموع» إن المراد به هنا من لم يميز فرائض صلاته من سننها، وأن العالم من يميز ذلك، وأنه لا يغتفر في حقه ما يغتفر في حق العامي .. أنتهى».

واتە: غەزالی فتوای داوە: نوێژی ئەو عەوامەی کە ئادابە فەرزەکانی نوێژ لە ئادابە سوننەتەکانی جیانەکاتەوە، لەگەڵ عیبادەتەکانی تریدا دروستن بەو شەرتەی فەرزێك لە فەرزەکانی نوێژ بە سوننەت نەزانێ. ئیمامی نەوەویش لە کتێبی (مەجمووع)دا تەرجیحی ئەم رایەی داوە.

مەبەست لە (عەوام) ئەو کەسەیە ئەوەندە زانیاریی ئاینیی نەبێ کە تێکرا شارەزا بێ.

هەروەها لە قسەی (مەجمووع)ەوە دەردەکەوێ کە مەبەست لە (عەوام) ئەو کەسەیە ئادابە فەرزەکانی نوێژ لە ئادابە سوننەتەکانی جیا نەکاتەوە و (عالم)یش ئەو کەسەیە ئەم دووانە لەیەك جیا بکاتەوە.

دیارە ئەو کردەوەیەی لە عەوام روویدا چاوپۆشیی لێ دەکرێ، ئەگەر لە عالم بوەشێتەوە چاوپۆشیی لێ ناکرێ. بە هەر حاڵ ئەم مەسەلەیە زۆر پەنهانەو، زۆر جار وا رێك دەکەوێ گەلێك لە موسڵمانان فەرزو سوننەتی عیبادەتیان لەیەك جیا ناکەنەوە، بۆیە واجیبە هەوڵ بدەن هەتا چۆنییەتیی نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەجی خۆیان و ئادابی دەسنوێژو خۆشۆردنیان بەباشی فێرببن. بێگومان ئەگەر مەبەستیان بێ زوو فێری دەبن و عیبادەتەکەیان راست و دروست دەبێ. ئەگینا ئەگەر کەسێ چۆنییەتیی خۆپاك کردنەوە بە ئاو یا بە بەرد نەزانێ و، ئادابی دەستنوێژو خۆشۆرینی لابردنی لەش پیسی نەزانێ و، ئاوی پاك و پیس لە یەك جیانەکاتەوە و، نەزانێ کام ئاو بۆ دەسنوێژو خۆشۆردن بەکاردێ و، ئاوێکی پیس یا ناوێ کە بۆ دەسنوێژو خۆشۆردن دەس نادا بەکاری هێنا، ئەوە ئەو کردەوەیە ناشەرعییەو نوێژەکەشی بەتاڵە، واتە: ناتەواویی دەسنوێژ و خۆشۆردنەکەی دەبێتە هۆی ناتەواویی نوێژەکەی؛ چونکە هەر لەبناخەوە نوێژەکەی دانەمەزراوەو، بە بێ دەسنوێژو بە لەش پیسییەوە دەمێنێتەوە، هەتا فێری ئادابەکەی دەبێ و، گێرانەوەی ئەو نوێژانەشی لە سەرە.

هـەروەهـا ئـەگـەر شتـێ لـکـابـوو بـە یـەکـێ لـە ئـەنـدامـی دەسـنـوێـژیـەوە، یـا بـە ئـەنـدامـی خۆشۆردنیەوە، وەك ڕۆنی مەییو، یا پی و بەز، یا مێو و بۆیەو مورەکەبی نووسین، یا خەنەو وسمە، یا بنێشت، ئەمانە هەموو نەیەڵن ئاو بگاتە ژێریان و دەبنە هۆی بەتاڵیی دەسنوێژو خۆشۆردنەکەو پێویستە لەپێشدا ئەو مادەیە یا بە سابوون یا بە سپۆن یا هەر دەرمـانـێکـی تـر لابـبـرێ و ژێرەکـەی پـاك بـکـرێتـەوە، ئـەنـجـا ئـاوی دەسـنـوێـژ یـا ئـاوی خۆشۆردنەکەی بەسەردا بڕوا، هەتا دەسنوێژو خۆشۆردنەکەی، دروست بێ بە هۆی نییەت هێنان لە سەرەتای ئەو دەسنوێژو خۆشۆردنەوە، هەروەها ئەگەر یەکێ مووی پێڵووی چاوی خراپ بووبێ و قیری بەو مووەوە لکاندبێ بۆ ئەوەی ڕاست بێتەوەو نەشکێتەوە ناو چاوی ، پێویستە بۆ هەموو دەسنوێژێکی فەرز (تیمم) بکا، لەبەرئەوەی کە ژێری ئەو مووە تەڕ نابێت و قیرەکە نایەڵێ ئاوی پێ بگا، ئەگەر تەیەموم نەکات نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، جا کاتێ ئەو مانیعە نەما پێویستە نوێژەکانی بەقەزا بگێڕێتەوە؛ چـونـکـە کـاتـی خـۆی دەسـتـنـوێـژەکـەی نـاتـەواو بـووەو، ئـەو مـووە قـیـراوییـە نـەشـۆراوەو، تەیەمومەکەشی هەر ناتەواو بووە، چونکە قیرەکە نەیهێشتووە تۆز بە ژێری ئەو قیرە بگا.

جا ئەم ئادابە زۆر پەنهان و شاراوەیە لە خەڵکی موسڵمان و، پێویستە زاناکانیان فێریان بکەن؛ هەتا هەردوولایان خێریان بگا.

هـەروەهـا زۆر جـار هـەڵدەکـەوێ کـە ئـاوی لـووتـی مـرۆڤ لـە حـەدی زاهـیـردا وشك دەبێتەوەو، دەبێتە مانیع لە شۆردنی ئەو شوێنە و دەستنوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، جا بۆیە پێویستە ئەو مادە لاببرێ و شوێنەکەی بشۆردرێ و، ئەمەش پەنهانەو زۆرەو هەموو کەسیش پێی نازانێ.

هی وا هەیە لە کاتی دەستنوێژدا بەری لووتی ناشۆرێ یانی ئەو بەشەی کە رووی کردووەتە لێو، ئەمەش واجیبە بشۆرێت، چونکە بەشێکە لە دەم و چاو. ئەو کەسانەش کە پیشەیان بنێشت دروستکردنە لە هاویندا، یا خەریکی بۆیەکارین ئەوانیش هەتا ئەو مادە بنێشتە یا ئەو بۆیەیە بە ئەندامی دەستنوێژیانەوە یا ئەندامی خۆشۆردنیانەوە بێ، نە دەستنوێژیان دروستە و نە خۆشۆردن و، نوێژەکەیان بەتاڵە، تەنانەت بۆیەیەك کە بەسەر نینۆکەوە وشك دەبێتەوە دەبێتە هۆی بەتاڵیی دەستنوێژ و خۆشۆردن، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر ئەو جۆرە کەسانە کە لەپێشدا بەڕۆن یا بە دەرمانێکی تر ئەو بنێشت و بۆیەیە

لەسەر لەشیان لابەن و، پاش ئەوە نییەتی لێ بێنن و، دەستنوێژەکە بگرن یا خۆیان بشۆن.

هەروەها ئەگەر یەکێ هەموو سەری بریندار بوو و دەرمانێکی چەوری لێ دابوو تا میقدارێ لە سەری لەو دەرمانە چەورە پاك نەکاتەوە ئەوە مەسحی سەری لە کاتی دەستنوێژدا دروست نابێ. ئەم مەسئەلانەش هەر پەنهانن و جارجار ڕوودەدەن.

کاتێ کە مرۆڤ نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژیی هێناو دەموچاوی شۆری و کاتی شۆرینی دەستی هات ئەو ئاوە کە هەڵی دەگرێ بۆ شۆردنی قۆڵی هەڵی دەگرێ نەك بۆ شۆرینی بەروپشتی دەستەکانی، جا کە هات و ئەو ئاوەی کرد بەقۆڵیدا، بێ دەستنوێژیی قۆڵی دەردەچێ و، بێ دەستنوێژی بەروپشتی دەستی دەرناچێ، تەنانەت ئەگەر بە نییەتی شۆردنی بەروپشتی دەستیشی ئاوەکە هەڵبگرێ ئەوەندە ئاو نامێنێ کە لەو سەرەوە لە ئەنیشکەوە بگەڕێتەوە بۆ شۆرینی پشتی دەستی. چاری ئەمەش ئەوەیە لەپێش ئەوەدا کە قۆڵی بشۆرێ بەرو پشتی دەستی ڕاستی بشۆرێ، هەتا بێ دەستنوێژی ئەوەی دەربچێ، ئەمجار قۆڵی ڕاستی بشۆرێ، هەروەها بۆ دەستی چەپیشی، ئەم مەسەلەش هەر پەنهانە.

«وفي العباب وشرحه ما نصه: فرع يشترط في المغسول من أعضاء الوضوء والغسل جري الماء عليه، فلا يكفي أن يمسه الماء بلا جريان أتفاقاً؛ لانه لا يسمى غسلاً . أنتهى» واتە: لە کتێبی عوباب و شەرحەکەیدا دەڵێن لە شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ و خۆشۆردندا پێویستە ئاو بەسەریدا بڕوات و، تەنیا ئەوەندە بەس نییە کە ئاوەکەی لێ بکەوێ بە ئیتیفاقی هەموو لایە؛ چونکە ئاولێکەوتن پێی ناوترێ شۆردن. لەسەر ئەمە ئەگەر کەسێك بەپێچەوانەی ئەمە جووڵایەوە ئەوە دەستنوێژەکەی دروست نابێ، جا کە دەستنویژی بەتاڵ بوو، نوێژەکەشی دانامەزرێ، ئەم مەسەلەش پەنهانەو زۆربەی هەرەمە خەڵکەکە ئاو بەسەر ئەندامەکانی دەستنوێژدا جاری ناکەن و تەنیا دەستی تەڕی بەسەردا دەهێنن، بۆیە پێویستە لەم شێوە واز بێنن و ئاو بەسەر ئەندامەکاندا جاری بکەن. هەروەها ئەگەر کەسێ (الله اکبر)ی تەحەڕوم (نوێژ دابەستن)یا سوورەتی فاتیحە یا تەحییات بە غەلەت بخوێنێ ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، بۆ نموونە: ئەگەر لەبەینی لەفزی (الله) و لەفزی (اکبر)دا واوێکی ساکنی زیاد کرد یا واوێکی مەفتووح، یا درێژە بە هەمزەی (الله) بدا و بڵێ (الله اکبر) یا ئەلفێ لە بەینی بێ و ڕێی (اکبر)دا زیاد بکا و بڵێ: (الله اکبار)لە هەموو ئەم حاڵانەدا تەکبیرەکەی بەتاڵە. هەروەها زیادکردنی واو لەپێش

لەفزی (اللە) واتە: بڵێت (واللە اکبر) دەبێ بەهۆی دانەمەزرانی نوێژەکە، نەك لەبەر زیادەی حەرفێ لە نوێژدا، چونکە یەك حەرفی وەها کە مەعنایەکی لێ وەرنەگیرێ نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە تەکبیری تەحەڕوم بەم شێوە پێك نایەت و، پێویستە بە(اللەاکبر)ی تەنیا بێت و بەس . ئەم مەسەلەش لە مەسەلە پەنهانەکانە، بەڵام کەمتر ڕوودەدا.

هەروەها ئەگەر زیاتر لە ئەندازەی ڕاگرتنی هەناسە لە بەینی دوو کەلیمەی (اللە) و (اکبر)دا ڕاوەستا نوێژەکەی دانابەسرێ. ئەمەش ئەگەر چی کەم ڕوودەدات مەسەلەیەکی پەنهانە.

ئەگەر هەموو حەرفەکانی (اللە اکبر) یا سوورەتی (فاتحە) یا واجیبی (تەحییات) وەها نەخوێنێتەوە کە خۆی بەعادەتی و بە بێ مانعێکی خارجی بیانبیسێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، چونکە کاتێ ئیعتیبار دەکرێ بەخوێنراوە کە بیسراوی خۆی بێ، ئەگینا وەك نەیخوێنێتەوە وەهایە. ئەگەر ئیمام (اللە اکبر) بکات بە قەصدی ئاگادارکردنی خەڵك لەوە کە خۆی داخڵی نوێژ بووە ئەوە نوێژەکەی دانامەزرێ؛ چونکە تەکبیری تەحەڕوم مەرجەکەی ئەوەیە یا بە قەسدی زیکر، یا قەسدی زیکرو ئاگادارکردن بێ پێکەوە، واتە: تەنیا بە قەسدی ئاگادارکردنی ڕووت بە تەکبیری تەحەڕوم حسێب ناکرێ. خۆ ئەگەر ئەوانەش لە پێشیەوە نوێژدەکەن بەوە بزانن کە ئیمام بەنیازی ئاگادارکردن (اللە اکبر)ی وتووە ئەوە ئیقتیداکردنەکەیان دروست نییە و بە هۆی تابیع بوونیان بەو ئیمامە نوێژەکەیان بێ ئیعتیبارو بێ قیمەتە.

(مبلغ) کە دەنگ بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە ئەوزاعی ئیمام ئاگادار بکا لە تەکبیری تەحەڕوم و لە هەندێ ئەحکامی تردا وەکو ئیمام وایە؛ واتە: واجیبە دەنگ بەرز کردنەوەی بۆ تەکبیری تەحەڕوم بەقەسدی زیکر یا زیکرو ئاگادارکردن بێ و، نابێ بەقەسدی ئاگادار کردنی ڕووت بێ ، هەروەها نابێ مەئموومەکان بە پاژنەی پێی بکەونە پێشی ئەو (مبلغ)ە.

بەڵام لە غەیری تەکبیری تەحەڕومدا، واتە: لە (اللە اکبر)ەکانی هەڵسان و دانیشتن و ڕکووع و سجووددا، ئەگەر تەنیا بەنیازی ئاگادارکردن بن زاهیر وایە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، چونکە ئەو زیکرانە سوننەتن، بێگومان ئەگەر ئەو دەنگ بەرزکردنەوەیە نوێژ بەتاڵ بکاتەوە، دەبێ نوێژی مبلغەکان هەموو بەتاڵ بێ.

بەڵام ئەگەر (مبلغ) لە پێش تەکبیری تەحەڕڕومی خۆیدا (الله اكبر)ی بە دەنگی بەرز وت بۆ ئاگادارکردنی مەئموومەکان و، ئەوانیش تەکبیری تەحەڕڕومیان کرد ئەگەر هەردوولا لە مزگەوتدا بن ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر مەئموومەکان لە دەرەوەی مزگەوتەکەدا بوون لەم حاڵەدا نوێژی مەئموومەکان دانامەزرێ؛ چونکە (مبلغ)ە کە بۆ ئەوانە وەك ئیمام وایەو، دیارە پێشکەوتنی تەکبیری تەحەڕومی مەئموم لە ئیمام نوێژی پێ دانامەزرێ و نوێژەکەیان بەتاڵە.

ئەگەر مەئموم پاش تەکبیری تەحەڕوم کەوتە گومانەوە: ئاخۆ لە جێگای ڕاوەستاندا پێش ئیمام کەوتووە یانا؟ ئەوە قەی ناکات و، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە؛ چونکە ئەسل ئەوەیە کە پێش نەکەوت بێ، واتە: ئەوەی بڕیاری ئەساسییە نەبوونیی شتێکە کە نوێژەکە بەتاڵ بکاتەوە. بەڵام ئەگەر ئەم گومانەی لەناو تەکبیری تەحەڕڕومدا بوو ئەوا نوێژەکەی دانامەزرێ.

هەروەها ئەگەر مەئموم کەوتە گومانەوە لەوەی کە نییەتەکەی بەرامبەر و هاوشانی نییەتی ئیمام یا پاش نییەت هێنانی ئەو بووە ئەوا نوێژەکەی دانامەزرێ، چونکە واجیبە بەشێوەیەکی بێگومان کە نییەت هێنانی مەئموم لە پاش نییەت هێنانی ئیمامەوە بێ، ئەم مەسەلەش لە مەسەلە نادیارەکانە.

پێویستە بزانرێ لە کاتی تەکبیری تەحەڕومدا بەپێوە ڕاوەستان پێویستە کەوابوو ئەگەر نوێژکەر بەبێ عوزر چەمایەوە، بە جۆرێ کە لە لای کەمی سنووری ڕکووع نزیکتر بێ و، بەم حاڵەوە (الله اكبر)ی نوێژ دامەزراندنی وت، ئەوا نوێژەکەی دانامەزرێ، هەروەها ئەگەر بە دانیشتنەوە (الله اكبر)ی کرد ئەنجا ڕاست بوویەوە بۆ نوێژ خوێندن، یاخۆ هەندێ لە (الله اكبر)ەکەی بە دانیشتنەوەو هەندێکی تری بە ڕاوەستانەوە وت، ئەوەیش نوێژەکەی دانامەزرێ، هەروەها ئەگەر لە بەینی هەستان و ڕاوەستاندا تەکبیری تەحەڕومی کرد هەر نوێژەکەی دانامەزرێ، چونکە هەمووی لە حاڵی ڕاوەستاندا نەبووەو، واجیبە تەکبیری تەحەڕوم هەمووی بە ڕاوەستانەوە بێ.

زۆر جار دەبینرێ کە خەڵکی هەرەمە، بۆ ئەوەی بگەن بە ڕکووع لەگەڵ ئیمامدا بەپەلە (الله اكبر)ی تەحەڕوم دەخوێنن، هەندێکی لە ڕاوەستانداو هەندێکی لە دانەویندا و لە حاڵی ڕکووعدا. ئەمانە پێویستە بزانن ئەم جۆرە نوێژەش دانامەزرێت؛ چونکە پێویستە نوێژکەر هەموو تەکبیرەکەی لەکاتی ڕاوەستاندا بێ و، ئەنجا دانەوێتەوەو لەگەڵ ئیمامدا ڕکووع ببا.

هەروەها پێویستە بۆ نییەت، کە بریتییە لە قەسدی کردنی ئەو نوێژە فەرضە دیارییە یا ئەو نوێژە سوننەتە دیارییە، کە بەرامبەر و هاورێی عادەتیی وتنی (الله اکبر)ەکە بێ، واتە: لەکاتی وتنی (الله اکبر)ەکەدا تێکڕا نییەتەکە فەرامۆش نەکا.

درێژیی ئەم باسە بەم جۆرەیە:

بەرامبەری پێ کردنی نییەت لەگەڵ (الله اکبر)دا دوو جۆرە، یەکەم: بەرامبەری و هاورێیەتیی ڕاستەقینە، کە بریتییە لەوەی ئەو کەسەی نوێژ دەکات قەسدی کردنی ئەو نوێژە فەرزە دیارییەی ببێ لەگەڵ هەموو حەرفەکانی (الله اکبر)دا، واتە: لە هەمزەو لام و ئەلیف و هێی(الله) و لەگەڵ هەمزەو کاف و بێ و ڕێ (اکبر)دا ئەو سێ شتەی لە دڵدا بێ(١) قەسدی کردنی (٢) نوێژی فەرزی (٣) کاتی دیاری ، ئەمە بیروباوەڕی ئیمامی شافعییە خوا لێی ڕازی بێ، کە زۆر گرانەو بۆ کەم کەس دەست دەدا؛ جا لەبەر ئاسانکردنی ئەحکامی ئیسلام بۆ موسڵمانان زانا ئاینییە دواییەکان وەك (امام الحرمين) و ئیمامی غەزالی و هەندێ زانایانی پاش زەمانی ئەوانیش، وەك (تاج الدين سبكي) فتوایان داوە کە موقارەنەو لەگەڵ بوونی عورف و عادەتی بەسەو، ئەم موقارەنە عورفییەش بە چوار شێوە بەیان دەکرێ، یەکەم: نوێژکەر قەسدی کردنی نوێژە فەرزە دیارییەکەی ببێ، لەگەڵ وتنی هەمزەی (الله اکبر)دا دووەم: لەگەڵ وتنی (هێ)ی (الله)و هەمزەی (اکبر)دا کە ناوەڕاستی تەکبیری تەحەڕومە ئەو نییەتەی ببێ. سێیەم: لەگەڵ وتنی (بێ)و (ڕێ)ی (اکبر)دا ئەو نییەتەی ببێ. پوختەی قسە: یا لە سەرەتای وتنی (الله اکبر)دا، یا لە ناوەڕاستیدا، یا لە دوادواییەوە ئەو نییەتەی ببێ. چوارەم ئەوەیە کە نییەتەکە دابەش بکا، واتە: قەسدی کردنی نوێژەکەی لە سەرەتای (الله اکبر) و، یادی فەرزایەتیی نوێژەکە لە ناوەڕاستیداو، دیاریکردنی فەرزەکە، کە نوێژی سبەینییە یا نیوەڕۆ لە دوا دوایی(الله اکبر)ەکەوە بێ .

واتە: بە هەر شێوەیەك لەم چوار شێوەیە ئەم نوێژکەرە لەگەڵ وتنی (الله اکبر)دا نییەتی کردنی فەرزی نوێژی ئەو کاتە دیارییەی ببێ دروست و ڕەوایە؛ چونکە بە هەر شێوەیەك لەمانە ببێ لە عورفا ئەو ئینسانە بە نوێژکەر حیساب دەکرێ و، بە خۆ حازرکردوو بۆ نوێژ لە قەڵەم دەدرێ. شێخ دەفەرمووێ لای دۆستی خۆتان ئەم شێوەی چوارەمە کە تەوزیعە موقارەنەی عورفیەو باشە.

ئەوەی کە شێخ (ابن حجر) لە شەرحی (عباب)دا لە کتێبی (جواهر)ەوە نەقڵی کردووە،

ئەم ڕای ئیمە بەهێز دەکات، ئەمەش دەقەکەیەتی: «أن العراقيين جروا على المختار، وعبروا عنه بأنه مخير بين مقارنة النية للهمزة وبسطها مع جميع التكبير انتهى»

واتە زانا ئاینییە عیراقییەکان لەسەر بیری هەڵبژێرراو ڕۆیشتوون کە موقارەنەی عورفییە و، ئەم بیرەیان بەوە دەربڕیوە کە کابرای نوێژکەر خاتر خۆیە لە نێوان بەرامبەری کردنی نییەتەکە لەگەڵ هەمزەی (الله اكبر)دا و، بڵاوکردنەوەی نییەتەکە لەگەڵ هەموو بەشەکانی (الله اكبر)دا.

وا بۆمان دەرکەوت کاتێ کە لەگەڵ سەرەتای وتنی هەمزەی (الله)دا یادی قەصدو فەرزییەت و تعیین بکا، یا لەگەڵ دوا دوایی تەکبیردا ئەو یادەی ببێ، یا بەشەکانی نییەت بەسەر بەشەکانی (الله اكبر)دا دابەش بکا، بەسە بۆ پێکهاتنی موقارەنەی عورفی. لای من ئەم شێوەی تەوزیعە بۆ خەڵکی هەرەمە لە باشترین شێوەکانی موقارەنەی عورفییە؛ چونکە لە سێ شێووە پێشوەکاندا ئەو نییەتە یا لەگەڵ سەرەتای تەکبیردا، یا لەگەڵ ناوەڕاستیدا، یا لەگەڵ سەرەتا و ناوەڕاست و دوا دواییدا هەیە، واتە: نییەتەکە بڵاودەبێتەوە بەسەر ئەجزاکانی تەکبیرەکەداو، بۆ هەرەمە خەڵکەکەش ئاسانە، جا بۆیە پێویستە لە سەر زانایانی ئاین ئەم شێوەیە بە خەڵکی فێربکەن تا هەردوولایان تووشی خێرو پاداش بن و، فێری ئەوەیان بکەن کە تەقلیدی ئەم زانایانە بکەن، واتە: بڵێن بە دڵ ڕازین بە فەرموودەی ئەو ئیمامانە کە فەرموویانە: بەرامبەریی نییەت لەگەڵ (اللهاكبر)ی تەحەڕڕومدا، بەشێوەی عورف کافیەو، تێیان بگەیەنن موقارەنەی عورفی چییە و چۆنە؟ چونکە موقارەنەی حەقیقی، کە ئەسڵی مەزهەبی ئیمامی شافعییە، لە سەر شانی هەرەمەی خەڵك زۆر گرانەو پێیان هەڵناسووڕێ. هەروەها بزانن کە تەقلید هەر ئەوە نییە کە بە دەم بڵێ تەقلیدی فلان ئیمامم کرد، بەڵکو پێویستە بە دڵیش نییەتی ئەوەی ببێ کە بە گوێرەی پەیڕەوی ئەو ئیمامە ڕەفتار بکا کە ڕەوایە مرۆڤ دوای فتوای بکەوێ.

ئەی براینە! وتمان: نییەت قەسد کردنە بەو شێوەی باس کراو قەسد وا لە دڵدا، کەوابێ ئەگەر کەسێ لە پێش (الله اكبر)دا بڵێ:

نییەتمە: چوار ڕکات نوێژی فەرزی ئەم نیوەڕۆیە دەکەم، (الله اكبر) ئەوە نییەتەکەی دروستە، چونکە وتنی ئەو چەند کەلیمەیە مرۆڤ ئامادە دەکات بۆ ئاگاداری و وریایی دڵ و، لە کاتی وتنی(الله اكبر)دا لە دڵی خۆیدا نییەتەکە دەهێنێ و بەرامبەرێتیی عورفی جێبەجێ دەبێ.

ئەو کەسەی وتوویە ئەم نییەتە بەم شێوەیە بەتاڵە لەبەرئەوەی ئەو نییەتە وتراوە، سیفەتی ئەو نییەتەیە کە وا لە دڵدا و پێشخستنی سیفەت لە سەر خاوەن سیفەت دروست نییە، ئەوە قسەکەی هەڵەیە؛ چونکە ئەو نییەتە وتراوە سیفەتی نییەتە قەلبییەکە نییە بەڵکو مرۆڤ بۆ ئەو نییەتە قەلبییە ئامادە دەکات و، نییەت قەلبییەکە کە دڵدایەو، لە کاتی تەکبیری تەحەڕومدا دێ بە دڵی نوێژکەرەکەدا و نییەتەکە دروست دەبێ؛ دەلیل لە سەر ڕاستیی ئەم قسەیە ئەوەیە کە ئەگەر نوێژکەر ئەو چەند کەلیمەیە تەرك کرد، قەی ناکات و، ئەو کەلیمانە هەر ئەوەندەیە کە مرۆڤ بۆ نییەت هێنان ئامادە دەکەن و بەس، واتە: سیفەتی نییەتە قەلبییەکە نین. عیبارەتی کتێبی(منهاج)و (تحفه) یاریدەی ئەم قسەی ئێمە دەدا کە دەڵێن:

«فأن أخطأ الامام في تعيين تابعه في غير الجمعة، كأن نوى الامامة لزيد فبان عمراً لم يضر، لان خطأه في النية لا يزيد على تركها وهو جائز له» چونکە لەم عیبارەتەوە دەردەکەوێ : هەرچی تەرکی دروست بێ بەهەڵەچوون تیایدا زیانی نییە، ئەوەبوو لە پێشەوە وتمان: ئەو نییەتە وتراوە ئەگەر نەش وترێ قەی ناکا. کەواتە ئەو وتراوە بە هیچ جۆرێ نابێتە هۆی بەتاڵیی نییەتەکە.

ئەی برادەران مەئمووم لە پەیڕەویی ئیمامی شافیعیدا دوو جۆرە: مەئموومی موافیق لەگەڵ ئیمامدا و، مەئموومی دواکەوتوو. مەئموومی موافیق ئەوەیە کە ماوەی ئەوەی ببێ لەگەڵ ئیمامدا سوورەتی فاتیحە بەتەواوی بخوێنێ، بەڵام مەئموومی مەسبووق و دواکەوتوو پێچەوانەی ئەوەیە کە باسمان کرد، بێگومان حوکمەکانی نوێژی ئەم دوو جۆرە لە یەکتر جیان؛ بۆ نموونە: ئەگەر مەئموومی موافیق لەکاتی ڕکووعدا کەوتە دوودڵییەوە لەوەی کە نییەتی ئیقتیدای بە ئیمام هێناوە، یا نا ئەوە کوتوپڕ بە نوێژکەری تاك دەناسرێ؛ چونکە ئەسل و ئەساس نەبوونی نییەتی ئیقتیدایە. هەروەها ئەگەر لە پێش نییەتی ئیقتیدا بە ئیمامدا دوای ئیمام کەوت و ، ڕێك بوو لە گەڵیدا لە هەڵسان و دانەوینەوەو کردەوە کانی تری نوێژەکەیدا، ئەوە نوێژەکەی بە بەتاڵ حسێب دەکرێ.

بەڵام ئەگەر مەئموومی دواکەوتوو لە کاتی ڕکووعدا کەوتە شك لەوەی کە نییەتی ئیقتیدای هێناوە بە ئیمام یا نا؟ ئەوە بە مەئمووم ناناسرێ و پێویستە بگەڕێتەوە بۆ وەزعی ڕاوەستان و سوورەتی فاتیحەکە هەمووی بخوێنێ و، وەك نوێژکەری تەنیا نوێژەکەی تەواو بکا؛ چونکە فاتیحە خوێندن تەنیا لە سەر لادەچێت کە بێگومان نییەتی

ئیقتدای بە ئیمام هێنابێ، جا مادام ئەم نوێژکەرە گومانی لە نییەتەکەی هەیە، ئەوا ئیقتیداکەی بەتاڵەو، نوێژەکەی وەکو نوێژی تەنیا حسێب دەکرێ، بەڵام پاش ئەوەی نوێژەکەی بەشێوەی تەنیایی دامەزرا، ئەگەر لەنێو نوێژەکەیدا ویستی دوای ئیمام بکەوێ و، بەدڵ نییەتی ئیقتیدای هێنا، ئەوە دروستە، جا پێویستە لە باقی مەندەی نوێژەکەیدا تابعی ئیمام بێ و لێی پێش نەکەوێ، بەڵام پاش سەلامدانەوەی ئیمام هەرچەندی لە نوێژەکەی خۆی مابوو تەواوی بکا و سەلام بداتەوە. هەرکەسێ ئیقتیدای کرد بە کەسێ پێویستە لە کاتی نییەتدا قەسدی ئیقتیدای بەو ئیمامە ببێ و، ئەگەر کەوتە شك لە نییەتی ئیقتیدا ئەوە بە منفرد دەناسرێ، واتە نوێژەکەی وەك هی یەکێکی بەتەنیا نوێژ کردوو حیساب دەکرێ و دروستە. بەڵام ئەگەر لەوەدا کەوتە شك کە ئیمامە یا مەئموومە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە؛ چونکە نییەتی یەکێکە لە دوو ئەمری دژی یەك و هەردووکیان بەتاڵ دەردەچن ، بەڵام لەکاتێکدا شکی لە نییەتی ئیقتیدا بوو شتێکی دیارە نییەتی نوێژی هێناوە، تەنیا ئەوەندەیە شکی لە ئیقتیداکە پەیدا کردووە، کە ئەسڵ نەبوونی ئەو ئیقتیدایە، ئیتر نییەتە رووتەکەی بۆ دەمێنێتەوەو بە نوێژکەرێکی بەتەنیا نوێژکردوو حیساب دەکرێ، وەکو(ابن القاسم) لە حاشیەی (تحفە)ی (ابن حجر)دا فەرموویەتی.

ئەگەر نوێژکەرێ کەوتە شك لەوەی کە نییەتی هێناوە یا نا، یاخۆ کەوتە شك لەوەی نییەتەکەی هاورێی (الله اکبر)ی تەحەرروم بووە یا نا، یا کەوتە شك لەوەی نییەتی نوێژی نیوەرۆی هێناوە یا نوێژی عەسر، ئەوە لەهەموو ئەم شێوانەدا نوێژەکەی بەتاڵە.

تەنیا لە شێوەی شك لە دیاریکردنی نوێژەکەدا کاتێ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە کە تا ماوەی روکنێك ئەو شکەی دەوام بکا، یا ماوەی شکەکەی بەپێی عورف و عادەت درێژ بێ، واتە: ئەگەر ماوەی شکەکە کەم بوو، روکنێکی بەو شکەوە تەواو نەکرد ئەوا ئەو شکە نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام پێویستە هەرچییەکی لە کاتی، شکەکەدا کردووە دووبارەی بکاتەوە.

ئەگەر نوێژکەر دوودڵ بوو لەوەدا کە نوێژەکەی ببڕێ و، لە دڵدا وتی: ئەم نوێژە ببڕم یا نەیبڕم؟ ئەوە کوتوپڕ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. خۆ ئەگەر عەزمی کرد لە سەر بڕینی نوێژەکەی ئەوە چاکتر نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە نییەت روکنی نوێژەو، ئەو نییەتە پێویستە تا دواهاتنی نوێژەکە دەوام بکات.

ئەگەر نوێژکەر قەسدی بڕینی خوێندنی فاتیحەی کرد، ئەوە زیانی نییە، بەڵام ئەگەر

لەگەڵ قەسدی بڕینەکەیدا، بێ دەنگ بوو، ئەوە پێویستە ئەو ئەندازەی لە فاتیحە کە زوو خوێندوویەتی بیخوێنێتەوە، ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر لە پاش سەلامدانەوە، کەوتە شك لەوەدا کە فاتیحەی خوێندووە یا نا، رکووعی بردووە یا نا، سجوودی بردووە یا نا، ئەوە زیانی نییە و، ئەسڵ وایە نوێژەکەی بەڕەسایی بەجێ هێنراوە. بەڵام ئەگەر شکی لە نییەت هێنانی نوێژدا یا لە موقارەنەی عورفیدا هەبوو ئەوە نوێژەکەی بەتاڵەو، پێویستە لەسەری ئەو نوێژە بەتەواوی بگێڕێتەوە.

ئەگەر بەدڵ قەسدی کرد کارێکی نوێژ تێکدەر بکا وەکو هەنگاوێکی نالەبار و زل، ئەوە تا دەست نەداتە ئەو کارە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

ئەگەر قەسدی کرد لەسەر یەك سێ کار بکات لەو کارانەی کە لەبابەتی کاری نوێژ نین، ئەوە کاتێ دەستی کرد بەیەکێ لەو کارانە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، هەروەها بە یەك کاری ناقوڵا کە لە غەیری بابەتی کاری نوێژ بێ، نوێژەکە بەتاڵە دەبێتەوە. خۆ ئەگەر بەعەمدی یا بە سەهوو کارێکی ناقوڵای کرد ئەوە هەتا نەبێ بە سێ کار نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام بەو شەرتەی کە بەشێوەی یاری و گاڵتەکردن نەبێ، ئەگەر نا بە یەك کار نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە، با کارێکی ناقوڵاش نەبێ. ئەگەر سێ کاری سووکی یەك لەدوای یەکی کرد ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، نموونەی کاری سووك وەکو جووڵاندنەوەی سەرپەنجەکان بەبێ جووڵاندنەوەی دەست.

ئەگەر عەزمی کرد: هەر کاتێ، فلان کەس، بە میوانی هات یاخۆ فلان شت ڕووی دا نوێژەکەم دەبڕم، ئەوە هەر لە کاتی ئەو عەزمەدا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. با بڕینی نوێژەکەیشی بە شتێکەوە ببەستێ کە بەعادەت نەشیاو و نەکراو بێ، بۆ نموونە: بڵێ: ئەگەر فلان کەس لەم سەعاتەدا لە ماڵی خۆیانەوە ڕێ کەوت و، گەیشت بە من نوێژەکەم دەبڕم و دەڕۆم بەپیرییەوەو، ماوەی بەینیان چوار سەعات بوو ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە ئەم شەرتە هەرچەند بە عادەت مەحاڵە بەڵام بە عەقڵ مومکینە، کابرا بەشێوەی نا ئاسایی بە سەعاتێ ڕێگەی چوار سەعات ببڕێ. جا مادام وایە ئەگەر کەسێ بڕینی نوێژەکەی بە مەحاڵی عەقڵییەوە ببەستێ، بۆ نموونە: وتی ئەگەر دوو دژ لە یەك جێگەدا گردەوەبوون من نوێژەکەم دەبڕم، ئەوە نوێژەکەی بە تاڵ نابێتەوە، چونکە مەحاڵی عەقلی هەرگیز نایەتەجێ و پێوەبەستنەکەی کابرا بێ بایەخە.

هەروەها ئەگەر مەئموومیش بڕینی ئیقتیداکەی بە شتێکی مومکنەوە بەست ، با ئەو

شتەش بەعادەت مەحاڵ بێ، ئیقتیداکەی گورج بەتاڵ دەبێتەوە، بۆیە پێویستە گورج نییەتی ئیقتیدا بێنێتەوە، ئەگەر نا بە بێ نییەتی ئیقتیدای دووبارە، بەتەنیا دواکەوتنی ئیمامی لە کرداردا، نوێژەکەی بەتاڵە.

ئەگەر نوێژکەر لە پاش سڵاودانەوەی نوێژ کەوتە شك لەوەدا کە دەستنوێژی بووە یا نا ڕوو لە قیبلە بووە یا نا، عەورەتی لە کاتی نوێژەکەدا داپۆشیوە یا نا، ئەوە نوێژەکەی دانەمەزراوە؛ چونکە لێرەدا ئەسڵی نییە کە ئیستیسحاب بکرێ و ئەسڵیش لە هەر شتێکدا نەبوونیەتی؛ کەواتە لێرەدا ئەسڵ ئەوەیە کە ئەو نوێژکەرە پاك نەبووبێ، ڕووی لە قیبلە نەبووبێ، عەورەتی دانەپۆشیبێ، بۆیە لەم حاڵاتەدا پێویستە لە سەری نوێژەکەی بکاتەوە لەوەختەدا، یا بەقەزا بیگێڕێتەوە ئەگەر وەختی نەمابوو.

ئەگەر یەکێ دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، دوای ئەوە دەستنوێژی تازە کردەوە و نوێژێکی تری کرد، دوای ئەمانە بیری کردەوە کە بەیەقین لە یەکێ لە دەستنوێژەکانیدا مەسحی سەری نەکردووە، بەڵام نازانێ کام دەستنوێژە، ئەوە هەردوو نوێژەکەی بەتاڵە، چونکە بە یەقین تەرکی ڕوکنێ لە ڕوکنەکانی دەستنوێژی کردووەو، بۆ ئیحتیات وا دادەنرێ کە لە دەستنوێژی یە کەمدا، تەرکی مەسحی سەری کردووە. ئەم مەسەلەیە، ئەگەرچی بە دەگمەن ڕێك دەکەوێ، بەڵام پەنهانەو زانینی دەوێ.

ئەگەر نوێژی جەماعەتی دابەست بە نییەتی ئیقتیدا بە مەلا ڕەحیم، کە تەماشای کرد ئیمامەکە مەلا ڕەجەبە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام ئەگەر ئیمام لە تەعیینی مەئموومدا بەهەڵەچوو لە غەیری نوێژی جومعەدا ئەوە قەی ناکاو نوێژەکەی دروستە، بەڵێ لە نوێژی جومعەدا زیانی هەیە مادام ئەو کەسەی کە تیایا بەهەڵەداچووە لە چل کەسەکەی جومعە بێ، وەکو شێخ عەلی شیبرامیللەسی فەرموویەتی.

ئەگەر ئیحرامی نوێژەکەی بە نوێژی سبەینێ دابەست، کەچی لەپاشاندا بڕیاری داو وتی: ئەم نوێژە دەگۆڕم و دەیکەمە نوێژی سوننەتی پێش نوێژی سبەینێ؛ چونکە هێشتا وەخت زۆرەو گەورەییی سەرەتای وەختم لە کیس ناچێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. هەروەها لە کاتی (جمع التاخیر)دا ئەگەر ئیحرامی بە نوێژی نێوەڕۆ بەست و، لە پاشاندا وتی: ئەم نوێژە دەگۆڕمەوە بە نوێژی عەسر هەتا فەزیلەتی سەرەتای وەختم بۆ عەسر دەست بکەوێ ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. بێگومان ئەم دوو مەسەلەیە، کە بەدەگمەن ڕێك دەکەون، شتێکی پەنهانن و هەموو کەس پێیان نازانێ.

پوختەی قسە ئەوەیە: کە لە پاش نییەت هێنان بۆ نوێژ گۆڕینی نوێژی فەرز بە سوننەتی پاش و پێشی نوێژی فەرز یا بە نوێژە فەرزێکی تر نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە.

ئەگەر نوێژکەرێك چاوی کەوت بە چەن کەسێ کە هاتن نوێژی نیوەڕۆیان بە جەماعەت دابەست و، ئەویش لەوە ترسا کە ئەگەر ئەم نوێژە فەرزە تەنیایە نەگۆڕێ بە سوننەت جەماعەتی نیوەڕۆی لەدەست دەردەچێ، ئەوە دەتوانێ ئەو نوێژەی بە نوێژی سوننەتی موتڵەق بگۆڕێ و لە پاش دوو ڕکات و تەحیات سەلام بداتەوە؛ چونکە لە نوێژی سوننەتی موتڵەقدا نییەتی دیاریکردن پێویست نییە، بەڵام ناتوانێ بیگۆڕێتەوە بە سوننەتی ڕاتیبەی پێش نوێژی نیوەڕۆ؛ چونکە لە نوێژی سوننەتی ڕاتیبەی پێش یا پاشی نوێژدا هەر لە سەرەتاوە نییەتی نوێژی فەرزی نیوەڕۆی بەتەنیایی هێناوە.

ئەگەر کەسێ نوێژێکی فەرزی بە تەنیا کردبوو، لە پاشا بۆی ڕێ کەوت بەجەماعەت بیکاتەوە، ئەم دووبارە کردنەوەیە کارێکی سوننەتە، بەڵام بۆ پێکهاتن و دامەزرانی ئەم سوننەتە، پێویستە ئەگەر ئیمام بێ، نییەتی ئیمامەت و، ئەگەر مەئمووم بێ نییەتی ئیقتیدا بە ئیمام بهێنێ و، نییەتەکەش موقارەنەی عورفی بکات لەگەڵ (الله اکبر)ی نوێژ دابەستندا؛ چونکە دووبارەکردنەوەی نوێژی فەرز بەشێوەی جەماعەت نەبێ سوننەت نییە[^1] جا پێویستە هەتا دواییی نوێژەکە لەگەڵ جەماعەتەکەدا بێ و واتە: نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام نوێژەکەی بەتاڵ دەکاتەوە.

لە نوێژی جومعەیشدا بۆ ئیمام نییەتی ئیمامەت واجبە.

هەروەها بۆ مەئموومیش لە جەماعەتی نوێژی جومعەدا ئیقتیدا واجیبە، وەك چۆن لە هەموو نوێژەکانی تردا کە بە جەماعەت بکرێن ئەم نییەتی ئیقتیدایە لە سەر مەئمووم واجیبە.

لەم نوێژی جومعەیەدا ئەگەر مەئمووم (موافق) بوو، واتە: هەر لە ئەووەڵەوە لەگەڵ ئیمامدا بوو، دروست نییە نییەتی لە ئیمام جیابوونەوە بێنێ، بەڵکو پێویستە تا

[^1]: (١) شایانی باسە کە نوێژی فەرز کرا جارێکی تر بە شێوەی تەنهایی دووبارە کردنەوەی سوننەت نییە، چونکە ئەگەر لە نوێژە پێشووەکەدا خەلەلێك بووە ئەوە دووەمەکە پێی ناوترێ دووبارەکراوە، بەڵکو نوێژێکی سەرلەنوێیە. خۆ ئەگەر خەلەلی تیا نەبووە، ئەوە پێویست بە دووبارە کردنەوە نییە، بەڵام بۆ دەستکەوتنی خەیری جەماعەت ئەگەر بۆی ڕێ کەوت سوننەتە بە جەماعەت بیکاتەوە، ئەم دووبارە کردنەوە لە عورفی شەرعدا پێی دەڵێن (أعادة). وەرگێڕ

سەلامدانەوە لەگەڵیدا بێ. هەروەها لە قەسردا، چ ئیمام بێ و چ مەئمووم و چ تەنیا، پێویستە نییەتی کورت کردنەوەی ئەو نوێژە لەگەڵ (الله اکبر)ی نوێژ دابەستندا پێکەوە بن، پێکەوە بوونێکی موافیقی عورف. بەڵام لە غەیری قەسرو دووبارەکردنەوەی نوێژی فەرزو نوێژی جومعە موقارەنەی نییەتی ئیقتیدا بۆ مەئمووم سوننەتە و واجیب نییە، واتە: ئەگەر نییەتی ئیقتیدای لەگەڵ (الله اکبر)دا نەبوو، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو بەتەنیایی دادەمەزرێ؛ جا ئەگەر ویستی ببێ بە جەماعەت ئەوا پێویستە هەر پاش (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن ، یا لە پێش چاوەڕوانییەکەی بەعورف درێژ، لە ناو نوێژەکەیدا بەدڵ نییەتی ئیقتیدا بە ئیمامەکە بێنێ بەجۆرێ کە بەڵیدا بێ: خۆم کرد بە مەئمووومی بۆ فڵان کەس، دەشتوانێ موتابەعەی ئیمام نەکا، چونکە نوێژەکەی بەتەنیا دامەزراوە. خۆ ئەگەر بە بێ قەسدی ئیقتیدا دوای ئیمام بکەوێ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وەکو لەمەوپێش باسمان کرد.

هەروەها ئەگەر ئیمامی غەیری نوێژی جومعە و غەیری نوێژی فەرزی دووبارە کراوە لە کاتی (الله اکبر)ی نوێژ دابەستندا، نییەتی ئیمامەتی نەبووبوو، سوننەتە پاش ئەوە کە مەئموومی لە پشتیەوە ڕاوەستان و نییەتی نوێژیان هێنا، ئەمیش لە دڵی خۆیدا بڵێ: وا خۆم کرد بە ئیمامی ئەم مەئموومییانە، هەتا خێری جەماعەتی پێ بگات، ئەگەر نا هەر مەئموومەکان خێری جەماعەتیان دەست دەکەوێ و ئیمام خێری جەماعەتەکەی بەرناکەوێ. ئەم مەسەلەیش پەنهانەو هەموو کەس پێ نازانێ.

ئەگەر کەسێ ئیقتیدای کرد بە نوێژکەرێکی تەنیا، کە ئیمامەتی دروست بێ، ئەوە چاکتر بۆ ئەو بەتەنیا نوێژکردووە ئەوەیە ئەویش لەدڵیدا نییەتی ئیمامەت بهێنێ هەتا خێری جەماعەتی دەست بکەوێ، ئەگینا هەر ئیقتیدا کردووەکە خێری جەماعەتی دەست دەکەوێ، ئەم خێرەش کەمترە لە خێری جەماعەتێ کە ئیمام نییەتی ئیمامەتی هێنابێ.

ئەگەر مەئمووم لە نوێژی دووبارەکراوەدا لە پێش سڵاودانەوەی ئیمامدا نییەتی جیابوونەوەی لە ئیمام هێنا ئەوە بەلای شێخی ڕەمەلییەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە یەکێ لە شەرتەکانی نوێژی بە جەماعەت دووبارەکراوە ئەوەیە کە لە ئەوەڵەوە هەتا ئاخر ئەو نوێژە بە جەماعەت بێ. بەڵام لای هەندێ لە زاناکانی دوازەمان نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام خێرو پاداشی جەماعەتەکەی ناقیس دەبێ. واتە: ئەگەر بە بێ عوزریش نییەتی جیابوونەوەی هێنا، ئەوە تەنیا خێری ئەو میقدارەی لەکیس دەچێ کە

لە پاش جیابوونەوەی لە ئیمام کردوویە؛ چونکە بەڕای ئەم زانایانە تەنیا ئەوەندە بەسە کە نوێژەکە بەقەدەر (اللە اکبر)ی نوێژدابەستن بەجەماعەت بێ. خۆ لەم نموونەدا جیابوونەوەی مەئموومەکە لە دوا دوایی نوێژکەدا بووە نەك لەکاتی (اللەاکبر)ی نوێژدابەستندا. شێخی (ابن حجر)یش، خوای لێ ڕازی بێ ڕای ئەم زانایانە پەسەند دەکات. بەڵام لای هەندێ لە زانایانی تر بۆ نوێژی دووبارەکراوە پێویستە لای کەمی بەقەدەر ڕکاتێکی بەجەماعەت بێ وەکو نوێژی جومعە بەڵام ڕەئیەکەی (ابن حجر) لە هەموویان باشترە، واتە: ئەگەر هەر لە (اللە اکبر)ی نوێژدابەستندا موافیقی ئیمام بێ، بەسە. ئەم مەسەلەش پەنهانەو کەم ڕوودەدا.

دەبێ ئەوەش بزانین لە (اللە اکبر)ی دابەستنی نوێژی دووبارە کراوەدا تەنیا نییەتی نوێژە فەرزێکی بەشێوە فەرز، بەسە نەك فەرزی واقیعی، واتە: پێویستە نییەتەکەی بەم جۆرە بێ: «نویت أن أصلي مقتديا فريضة الظهر التي أديتها. أو نويت أن اصلي فريضة الظهر، التي هي فرض على المكلف، مقتديا الله أكبر» واتە: هەر کاتێ بۆی هەڵکەوت نوێژ دووبارە بکاتەوە نییەتی کردنەوەی نوێژێ بهێنێ کە لە وەختی خۆیدا فەرز بووە لە سەری، نەك ئێستە، چونکە دووبارە کردنەوەی نوێژ واجیب نییە و، ئەو نوێژە ئێستا دەیکاتەوە تەنیا لەشێوەدا فەرزە نەك لە واقیعدا؛ لەبەرئەوە یا دەبێ نییەتی ئەو نوێژە بێنێ کە زوو لە سەری فەرز بووە، یا نییەتی نوێژێ بێنێ کە تێکڕا فەرزە، ئەگینا پاش ئەوەی کە زوو ئەو نوێژەی کردووە، ئیتر ئەمەی لە سەر فەرز نییە.

شایانی باسە ئەگەر پاش دووبارە کردنەوەی نوێژەکە بۆی دەرکەوت کە نوێژە پێشووەکەی بەتاڵ بووە، ئەوە ئەم نوێژە دووبارەکراوەشی هەر بەتاڵ دەبێ، چونکە ئەم نوێژە دووەمە شێوەی فەرزی یەکەمە، کە یەکەم بەتاڵ بوو، ئەمیش بەتاڵ دەبێ. ئەم مەسەلە زۆر پەنهانە بەڵام بەدەگمەن ڕوودەدا.

شەرتەکانی تری گێڕانەوەی نوێژمان لە (نامەی جەماعەت)دا باس کردووەو دەتوانن پێابچنەوە.

پێویستە بزانن کە لە سوورەتی (فاتحە)دا چواردە (شدە) واتە: گیرە، هەیە. هەرکاتێ نوێژکەر یەکێك لەم شەددانە بە دەسەنقەست (عمدی) تەرك بکات ئەوە نوێژەکەی بەتاڵەو، ئەگەر بە سەهوو تەرکی بکا ئەوە خوێندنی ئەو کەلیمە بەتاڵە، کەواتە ئەگەر زۆر دوانەکەوت ئەوە هەمان کەلیمە بە شەددەوە بخوێنێتەوە، خۆ ئەگەر زۆر دواکەوت ئەوە

پێویستە لەسەرەوە فاتیحە بخوێنێتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە و، ئەگەر سەهووی کرد و نەگەڕایەوە بۆ خوێندنی فاتیحە تا ڕکووعی برد، ئەنجا کەوتەوە یادی، پێویستە کوتوپڕ ڕاست بێتەوەو فاتیحە بخوێنێتەوە؛ چونکە ڕۆیشتنی بۆ ڕکووع بە زۆر دواکەوتن دەدرێتە قەڵەم، خۆ ئەگەر نەگەڕایەوە بۆ ڕاوەستان ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، وە ئەگەر بەدەسەنقەست چوو بە ڕکووعدا ئەوە چاکتر نوێژەکەی بەتاڵە.

ئەگەر ئەم ڕووداوانە لە نوێژکەرێك ڕوویان دا کە ئیمام لێی پێش کەوتبوو لە کاتێکدا لەگەڵ ئیمامدا بوو ئەوە سوجدەی سەهوو سوننەت نییە بۆی؛ چونکە ئیمام لەباتی ئەو تەحەممولی دەکا. بەڵام ئەگەر لە پاش سەلامدانەوەی ئیمام لێی ڕوودا، ئەوە سوننەتە خۆی سوجدەی سەهوو ببات، هەروەها ئەگەر بەتەنیاش نوێژ بکات.

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی فاتیحە دەخوێنێ چاودێریی ئەو شتانە بکات کە هەموو حەوت قورئان خوێنەکان لە سەری موتتەفیقن لە بابەتی مەخرەجی حەرفەکان و شەددەومەددەو ئیستیعلاو شتی تر؛ بۆیە تەنانەت وەستانێکی سووك لە نێوان سینی (نستعین)و تیێ کەیدا دروست نییە؛ چونکە ئەم وەستانە یەك کەلیمەکە دەکاتە دوو کەلیمە: (نس) و (تعین). جا ئەگەر بەسەهوو ئەو وەستانەی کرد پێویستە کتوپڕ کەلیمەکە بگێڕێتەوە، ئەگەر نەی گەڕاندەوە ئەوا خوێندنی ئەو کەلیمەیە بەتاڵە، جا ئەگەر زۆری پێ نەچوو هەم دەتوانێ ئیعادەی بکاتەوە. ئەگەر ئیعادەی نەکردەوەو بەسەهوو، چوو، بۆ ڕکووع و گەڕایەوە ئەوە بە توولی فەسل (زۆر پێ چوون) حسێب دەکرێ و، پێویستە سەرلەنوێ فاتیحەکە بخوێنێتەوە. خۆ ئەگەر لە پێش چوونی بۆ ڕکووع توولی فەسل، بوو هەم سەرلەنوێ دەست پێ کردنەوەو، هەم خوێندنەوەی فاتیحەکە واجیبە، ئەگەرنا لەم دوو شێوەدا نوێژەکەی بەتاڵە، جا ئەگەر بە عەمدی نەیگەڕاندەوەو چوو بۆ ڕکووع ئەوە چاکتر نوێژەکەی بەتاڵە.

شایانی باسە مەددەی (ولا الضالین) واجیبە نەك سوننەت، جا ئەگەر بەعەمدی لەوەندەی کەمتر کرد کە بە ئیجماع واجیبەو، ئەم کەمییە بوو بە هۆی کەمبوونەوەی حەرفێ یا گۆڕینی مەعنایەك، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، ئەگەرنا وەکو کەلیمەی (نستعین) واجیبە کەلیمەی (ولا الضالین) لەگەڵ مەددەکەیدا دووبارە بکاتەوە.

ئەگەر نوێژکەرێکی بێ وەسوەسە بەعەمدی حەرفێکی لە سوورەتی فاتیحە یا غەیری فاتیحە زیاد یا کەم کرد کە مەعنای لەفزەکەی گۆڕی، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە،

بەڵام ئەگەر مەعناکەی نەگۆڕی ئەوە بەعەمد بێ یا سەهوو تەنیا خوێندنی ئەو لەفزە بەتاڵ دەبێتەوە نەك نوێژەکە جا ئەگەر زۆری پێ چوو ئەوە ئیعادەی ئەو لەفزە دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر زۆری پێ چوو ئەوە خوێندنەوەی ئەو فاتیحەیە واجیبە؛ ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە لە هەردوو شێوەی عەمدو سەهوودا. هەروەها پێویستە بزانن ئەو کەلیمە ناقیسە یا زائیدە وەکو تەلەفوز کردن بە کەلیمەی (اح)نییە، چونکە ئەو کەلیمەی نوێژە لە قورئانەو زیادەو نوقسانی بەسەرا هاتووە نەك ئەم لەفزی (اح)ە.

هەروەها دەرکردنی حەرف لە غەیری مەخرەجی خۆی بۆ یەکێ بتوانێ فێری ببێ حەرامە، جا ئەگەر دەیزانی خراپە و بە عەمدی بوو ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و، ئەگەر بەسەهوو بوو و زۆر بەینی نەکەوت پێویستە ئەو کەلیمە ئیعادە بکاتەوە. بەڵام ئەگەر زۆری بەین کەوت ئەوە پێویستە هەموو فاتیحەکە دووبارە بکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. سوجدەی سەهوو لێرەیشدا وەکو مەسەلە پێشووەکەیە، واتە: سوننەتە بیبا ئەگەر بەتەنیا نوێژ بکا، یا ئەگەر جەماعەت بکا و ئیمام لێی پێش کەوتبێ و لەپاش جیابوونەوەی لە ئیمام ئەمانەی لێ ڕوودابێ، ئەگەرنا ئیمام بۆی هەڵدەگرێ و موحتاجی سوجدەی سەهوو نییە.

بەڵام ئەگەر نەزان بوو و نەیدەتوانی بەعادەتی فێر ببێ ئەوە نوێژی دروستە، خۆ ئەگەر دەیتوانی فێر ببێ ئەوە پێویستە فێری ببێ و، پێش فێربوونی ئیخراجی حەرف لە مەخرەجی تایبەتیی خۆی نوێژەکەی دورست نییە، مەگەر لەبەر حورمەتی وەختەکە بیکا و لە پاش فێربوونی بەقەزا بیگێڕێتەوە.

پوختەی قسە ئەوەیە: سەبارەت بە دەرکردنی حەرف لە غەیری مەخرەجی خۆی، یا گۆڕینی حەرفێ بە حەرفێکی تر ئەگەر توانای فێربوونی هەبوو و بەعەمدی تەرکی کردو، دەیزانی بەو جۆرە دروست نییە و، هەر بێ موبالاتیی کرد، ئەوە نوێژەکەی دانامەزرێ و بەجێهێنانی نوێژ بەم حاڵە گاڵتەکردنە بە تاعەت و گاڵتەکردن بە تاعەت یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، خۆ ئەگەر بزانێ ئەوە گاڵتە بە تاعەت کردنەو بیکا ئەوە کافر دەبێ ، خوای گەورە بە لوتفی خۆی لە نەزانی و لە کافری بمانپارێزێ و پەنامان بدا، بۆیە هەرکەس توانای فێربوونی واجیباتی ببێ، چ لە بیروباوڕو وتن و چ لە کردار، پێویستە لەسەری هەموو وەختی خۆی بەخت بکات لە پێناوی فێربوونیاندا، مەگەر وەختی نووستن و حەسانەوەو، وەختی پەیداکردنی ڕزق و ڕۆزی بۆ خۆی و ماڵ منداڵی.

قال في العباب وشرحه لابن حجر «ويلزم جاهلا تعليمها أي التكبيرة، وكذا الذكر الواجب ولو بالسفر وأن طال، وعليه فظاهر أنه يشترط أستطاعة له، وينبغي ضبطها باستطاعة الحج الأتية، قال قلت هذا واجب فوري وذاك واجب على التراخي، قلت هي معتبرة فيه، وأن وجب فوراً أنتهى».

وفي التحفة لابن حجر أيضاً: ويظهر ضبط البعد بما لا تجد مؤنة يجب بذلها في الحج توصله اليه، ويحتمل أن ما هنا أضيق لانه واجب فوري أصالة بخلاف الحج ، وعليه فلا يمنع الوجوب عليه الا الامر الضروري لا غير فيلزمه مشى أطاقه، وأن بعد .. أنتهى». لەبەرئەمە واجیبە لە سەر نوێژکەرێ کە کەمتەرخەم بێ لە فێربوونی واجیباتدا نوێژی سەردەمی کەمتەرخەمییەکەی بەقەزا بگێڕێتەوە هەرچەندە نوێژەکانیشی کردبێ، چونکە لەبەرئەوەی کە وەختی خۆی حەرفەکانی لە مەخرەجەکانی خۆیانەوە دەرنەکردووەو توانای فێربوونیشیانی هەبووە، هەر نوێژێ کە کردوویەتی جێگەی ئیعتیبار نەبووە.

تەرکی شەددەی (اياك) بەعەمدی لەلایەنی کەسێکەوە مەعناکەی بزانێ، کە ڕووناکیی ڕۆژە، بە کوفر دادەنرێ. خۆ ئەگەر بەعەمدی بوو، بەڵام مەعناکەی نەزانی ئەوە تەنیا نوێژەکەی بەتاڵ دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر بەسەهوو لەبیرچوونەوە تەرکی شەددەکەی کرد، لەم حاڵەدا ئەگەر زۆری بەین نەبوو تەنیا (اياك)بە شەددەوە بخوێنێتەوەو سوورەتەکە تا دوایی بخوێنێ، بەم جۆرە نوێژەکەی دروست دەبێ. وانەبێ نوێژەکەی بەتاڵە. بەڵام ئەگەر زۆر بەینی بوو ئەنجا کەوتەوە بیری کە (اياك)ی بە بێ شەددە خوێندوەتەوە ئەوە واجیبە هەر لە ئەوەڵەوە فاتیحە بخوێنێتەوە ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. خۆ ئەگەر پاش سەلامدانەوە کەوتەوە بیری لەم حاڵەیشدا ئەگەر ماوە زۆر نەبوو لە بەینی سەلامدانەوەو بیرکەوتنەوەکەیدا، با نەختێ قسەش بکەوێتە بەین، یا پشت لە قیبلەش بکات، یا هەستێ هەرچەند لە نوێژەکەی ماوە بیکاتەوە، هەروەها ئەگەر حەرفێکی بە حەرفێکی تر گۆڕییەوە، وەکو ئەوەی (حێ) ی (الحمدلله) بکات بە (هێ) یا(ضاد)بکات بە (ظێ) یا (ذال)بکات بە (زێ) یا بە (دال) لەم نموونانەدا ئەگەر بەعەمدی دەیکرد، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر بەسەهوو یا بە لە بیرچوونەوە بوو، کە بیری کەوتەوە زۆری پێ نەچووبوو ئەوا ئیعادەی دەکاتەوە ، ئەگەر ئیعادەی نەکردەوە نوێژەکەی بەتاڵە. بەڵام ئەگەر زۆری پێ چووبوو ئەوە پێویستە فاتیحەکەی بخوێنێتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. وە ئەگەر زبانی عاجز بوو، ئەگەر چی دەیتوانی فێر ببێ کەچی کەمتەرخەمیی

دەکرد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، وە ئەگەر زمانی یارمەتی نەدەداو نەیدەتوانی فێر ببێ نوێژەکەی خۆی دروستە و، ئەگەر زانا بەعەمدی یا کەمتەرخەمی بێ موبالات بە دین (طێ)ی (مطبقە)ی (صراط)ی گۆڕی بە (تی)ی بچووك ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، ئەم مەسەلەش پەنهانە.

وەئەگەر (صاد)ی (صراط)ی بە (سین) دەخوێندەوە ئەوە نوێژەکەی دروستە. هەروەها غەڵەتێ کە مەعنا بگۆڕێ وەکو گۆڕینی فەتحەی (تێ) ی (انعمت) بە(ضەممە)یا (فەتحە)ی کافی (ایاك) بە (کەسرە) ئەمە بۆ یەکێك زانا بێ و بە عەمدی بیکات دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی نوێژەکەی، بەڵام خوێندنەوەی کافی(ایاك) بە (ضمە) نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە؛ چونکە مەعنا ناگۆڕێ، ئەمە ئەگەر بەعەمدی نەبوو.

في التحفة، مع أقتصار مني:

«خفف القادر مشددا أو لحن أو أبدل حرفاً بآخر، فأن غير المعنى بأن أبطل أصله أو أستحال إلى معنى آخر، ومنه كسر كاف «اياك» لاضمها، وعلم وتعمد، بطلت صلاته، والا فقراءته لتلك الكلمة، فلا يبنى عليها الا أن قصر الفصل، ويسجد للسهو في ما إذا تغير المعنى بما سها به مثلاً؛ لان أبطل عمدة يسجد لسهوه أنتهى».

ئەگەر بەعەمدی لە نێوان خوێندنی فاتیحەدا بەقەدەر دوو هەناسە بێ دەنگ بوو، یا قەسدی بڕینی فاتیحەی کردو، بەقەدەر یەك هەناسە وەستا ئەوە خوێندنی فاتیحەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو، پێویستە هەر لە سەرەتاوە فاتیحەکە بخوێنێتەوە، جا ئەگەر ئیعادەی فاتیحەی نەکردەوەو بەعەمدی چوو بۆ ڕکووع ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. خۆ ئەگەر بە دڵ قەستی بڕینی قیرائەتی کرد، بەڵام بە زاهیر نەوەستا، ئەوە زیانی نابێ بۆی.

بزانن: هەرشتێ لەو شتانەی پەیوەندییان بە نوێژەوە ببێ ئەگەر بکەوێتە ناو نوێژەکەوە، وەکو ئامین کردن بۆ دوعاو داوای لێخۆشبوون و، داوای پەناگرتن لە سزا و، سوجدە بخوێنێتەوە ، وەکو خوێندنەوەی قورئان بە نییەتی قیرائەت و ئاگادارکردنەوەی ئیمام لەو ئایەتە کە فەرامۆشی کردووە، نەك بە قەستی تەنیا ئاگادار کردنەوەی ئیمام، یابڕینی قیرائەت لەبەر هێرشی کۆکە، ئەوە لەم شەش حاڵەدا زیانی نییە.

وە ئەگەر نوێژکەر هەندێ لە سوورەتی فاتیحە یا هەمووی وا خوێندەوە کە خۆی نەیبیست، لەو کاتەشدا هیچ مانیعێك نەبوو وەکو گوێگرانی یا تێکەڵ بوونی دەنگ و، پێش

ئەوەی درێژە بکێشێت نەگەڕایەوە بۆ خوێندنەوەی ئەوەی نەیبیستووە و، بە دەسنقەست ڕۆیشت بۆ ڕکووع ، ئەوە ئەو نوێژەی بەتاڵە، وە ئەگەر بە سەهوو و نیسیان وای خوێند کە خۆی نەیبیست، ئەوە ئەگەر لە پێش گەیشتن بە چەشنی ئەو ئایەتە لە رکاتێکی تردا بیری کردەوە، واجیبە لە سەری بگەڕێتەوە بۆی و بیخوێنێتەوە، بە جۆرێ کە خۆی بیبیسێ ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر هەتا ڕاوەستانی ڕکاتی پاش ئەوە نەکەوتەوە یادی ، ئەوا واجیبە یەك ڕکات لەباتی ئەو ئەندازە نەبیسراوە بەجێ بهێنێ؛ چونکە مادام ئەو قێرائەتە نەبیسراوەی بەتاڵ بووە، هەرچی لەپاش ئەوەیش کردووە هەر بەتاڵ بووەو، ئەگەر ئەو ڕکاتەی نەکرد ئەوا ئەو نوێژەی بەتاڵە، بەڵام ئەگەر لەبەر مانیع نەیبیست و، ئەگەر مانیع نەبووایە نەیبیست، ئەبێ ئەوەندە دەنگ بەرز بکاتەوە کە حاڵی نەبوونی مانیعدا ببیسرێ. ئەگەر ئەوەندە دەنگی بەرز نەکردووە نوێژەکەی بەتاڵە.

براکانم! یەکێك لە سێزدە ڕوکنەی نوێژ خوێندنی سوورەتی فاتیحەیە بەتەواوی لەهەموو رکاتێکدا ئیللا لە ڕکاتی کەسێکدا کە ئیمام لێی پێش کەوتبێ، یا لە حوکمی کەسێکدا بێ کە ئیمام لێی پێش کەوتبێ، وەکو ئەو کەسەی لەبەر عوزرێك کەوتبێتە دواو بەئیمامدا نەگەیشتبێ، هەروەها پێویستە ئەم فاتیحەیە بخوێنرێ لە کاتی ڕاوەستاندا یا لە بەدەڵی ڕاوەستاندا، وەکو دانیشتن بۆ یەکێك خاوەن عوزر. کەوابێ ئەگەر نوێژکەری ساغ یا نەخۆش فاتیحەی نەخوێند، یا یەك کەلیمە یا یەك حەرفی وەك نوونی(ولاالضالین) تەرك بکات و، بە دەسەنقەست دانەوێتەوە بۆ ڕکووع ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە؛ چونکە بە دەسەنقەست وازهێنان لە ڕوکنێکی قەولی و ڕۆیشتن بۆ ڕوکنێکی تر گاڵتە کردنە بە خواپەرستی و، ئەو کارە بۆ دیوانی خودا ناشێ. بەڵام ئەگەر بەسەهوو بوو ئەوە هەر قێرائەتەکەی بەتاڵە و، هەر کاتێ کەوتەوە بیری ئەوە بە توولی فەسڵ دەژمێردرێ و پێویستە بگەڕێتەوە و فاتیحەکەی بەسەر بگرێتەوە، ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵە.

وە ئەگەر کەسێ هەستایەوە بۆ ڕکاتی دووەم یا سێیەم یا چوارەم و، لە پێش ئەوەی کە باش ڕاوەستێ بەدەسەنقەست دەستی کرد بە خوێندنی فاتیحە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر بەسەهوو دەیخوێند ئەوا خوێندنی ئەو کەلیمەیە بەتاڵە، جا هەرکاتێ کەوتەوە بیری، درێژەی کێشابێ یا نا، ئەگەر لە سەرەتای فاتیحەوە ئەو ئەندازەی نەخوێندەوە نوێژەکەی بەتاڵە.

وە ئـەگـەر بـەسەهـوو یـا بـە لـەبیرچوون فـاتـیـحـەی تـەرك كـردو، گورج نـەگـەڕایـەوە بـۆ ڕاوەستـان و بۆ خوێندنی فـاتیحەكەی ئەوە نوێژەكەی بەتاڵە؛ چونكە ئەمە بە گاڵتە دادەنرێ.

هـەروەهـا هـەتـا ڕكاتەكەی تـەواو دەكا، هـەر كاتێ شكی لە خوێندنی فـاتیحەدا پـەیدا كردو، گورج بەیەقین بۆی دەرنەكەوت كە خوێندوویەتی و، خـاوەن وەسوەسەیش نەبوو، ئەگەر هێشتا هـەر ڕاوەستابوو واجیبە فـاتیحە بخوێنێتەوە، درێژەی كێشابێ یا نا، خۆ ئەگەر لە ڕاوەستاندا نەبوو، پێویستە گورج بگەڕێتەوە بۆ ڕاوەستـان و فـاتحەكەی بخوێنێ؛ كەوابێ ئەگەر گورج نەگەڕایەوە بۆ ڕاوەستان و مـاوەیەك خۆی گرت، یـا بۆ بیركردنەوەیش بـێ، ئـەوە نـوێژەكـەی بـەتـاڵـە. بـەڵـێ ئـەگـەر ئـەم نـوێژەكـەرە مـەئمـووم بـوو، ئـەوە نـابـێ بـگـەڕێتـەوە بـۆ ڕاوەستـان ، چـونـكـە تـابـیـع بـوونـی بـە ئـیـمـام واجیبـە، بـەڵام لـەپـاش سەلامدانەوەی ئیمام یەك ڕكات نوێژ بكا، ئەنجا سەلام بداتەوە، چونكە نوێژەكەی لە سەر شكەكەی خۆی ناقس بووەو، نوێژی ناقسیش بەتاڵە.

ئەگەر ئیمام كەوتە شك لە خوێندنی فـاتیحەو، پـاش سوجدەی یەكەم، پاش دانیشتنی مابەینی سوجدەكان ڕاست بوویەوە بۆ خوێندنی فـاتیحە، ئەوە لە سەر(مەئمووم)ەكان پێویستە نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنن و خۆیـان نوێژەكەیان تەواو بكەن و سڵاو بدەنەوە، یا لە دانیشتنی بەینی سوجدەكاندا، ئەگەر چی ڕوكنێكی كورتیشە، چاوەڕێی ئیمام بكەن تا پێیان دەگاتەوە، ئەنجا لەگەڵیدا بە شێوەی مەئموومی نوێژەكەیان تەواو بـكـەن. بـەڵام شێخ عـەلـی شبـرامـوللـەسی دەفـەرمـووێ: پێویستـە لـە سوجدەی دووەمدا چاوەڕێی ئیمام بكەن، نەك لە دانیشتنی بەینی سوجدەكاندا ، نەبادا ئەم ڕوكنە كورتە ببێتە ڕوكنێكی درێژ.

وە ئەگەر ڕكاتەكەی تەواو كرد ئەنجا كەوتە شك كە فـاتیحەی نەخوێندووە ئەوە ئەو ڕكاتەی پووچ و بێ سوودەو، پێویستە لە سەری بیكاتەوە، ئەگەر نا نوێژەكەی بەتاڵە.

وەئـەگـەر ئـەو نـوێژكـەرەی كـە كـەوتـووەتـە شك لـە خـوێندنـی فـاتـیـحـەكـەدا ئـیـمـام بـوو، پێویستە مەئمووم نییەتی جیابوونەوە لەو ئیمامە بهێنێ و، سەربەخۆ نوێژی خۆی تەواو بكا و سەلام بداتەوە، یاخۆ لە تەحیاتدا چاوەڕێی ئیمام بكا هەتا لەگەڵ ئەوا سەلام بداتەوە، ئەگەر چی چاوەڕێ كردنەكە گەورەترە. بەڵام ئەگەر مەئمووم مەسبووق بوو، واتە: ئیمام لێی پێش كەوتبوو، ئەوە واجیبە لەگەڵ ئیمامەكەدا هەستێ تا ئەو ڕكاتە

لەگەڵ ئیمامدا دەکا، جا کە ئیمام سەلامی دایەوە تەماشا بکا ئەگەر نوێژەکەی تەواو نەبووە هەستێتەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی و ئەنجا سەلام بداتەوە ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

وە ئەگەر لە نێو فاتیحە خوێندندا، یا لەگەڵ دوا حەرفی فاتیحەکەدا کەوتە گومان لە خوێندنی هەندێ لە سوورەتی فاتیحە، ئەوە واجیبە فاتیحەکەی بە تەواوی بخوێنێتەوە؛ چونکە ئەسڵ نەبوونی خوێندنەکەیەو، دەبێ چاری بکا، ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵە.

وە ئەگەر بەدەسەنقەست تەرکی تەرتیبی فاتیحەی کردو، ئەو وەزعە مەعنای دەگۆڕی ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە.. جا لەم حاڵەدا ئەگەر بیناکردن لەسەر ئەوەی وابە دەمیەوە مەحاڵ بوو لەبەر بەین کەوتنی زۆر یا لەبەرئەوە کە لە خوێندنی فاتیحەکەیدا تەرتیبی ئیعجازی گۆڕیبوو بە جۆرێ کە لە ئەووەڵەوە هەندێ لە فاتیحەکەی خوێند، ئەنجا باقییەکەی پاش و پێش کرد، واتە خوێندنەکەی بە بێ تەرتیب بوو، ئەوە واجیبە لەسەری فاتیحەکەی لەسەرەوە بخوێنێتەوە. وە ئەگەر زۆر بەینی بوو یا گۆڕینی تەرتیبەکەی مورەتەب بوو، بۆ نموونە: نیوەی ئاخری سوورەتی فاتیحەی خوێند، جا دەستی کرد بە ئەووەڵەکەی، لێرەدا ئەگەر مەبەستی لە خوێندنی نیوەی یەکەمی فاتیحەکەی تەواوکردنی نیوە دواییەکەی بوو، کە لەپێشدا خوێندبووی ، ئەوە واجیبە بەتەواوی فاتیحەکەی بخوێنێتەوە چونکە ئەو نیوە دواییە کە لەپێشدا خوێندوویە حسێب نەبووەو بێ سوودەو ، تەواو کردنی بێ سوودیش بێ سوودە، بەڵام ئەگەر مەقسوودی خوێندنی فاتیحە بوو ئەوە لەسەر ئەم نیوە ئەووەڵییەوە فاتیحەکەی تەواوبکات، ئیتر واجیب نییە هەر لەسەرەوە جارێکی تر فاتیحە بخوێنێ.

وە ئەگەر لەپێش ڕکووعدا کەوتە گومانەوە لە خوێندنی فاتیحە، ئەوە واجیبە هەموو فاتیحەکە بخوێنێتەوە، چونکە ئەسڵ نەبوونی خوێندنەکەیە، وە ئەگەر لە پێش ڕکووع و لەپاش تەواو کردنی فاتیحە لە خوێندنی هەندێ لە فاتیحە کەوتە گومانەوە ئەوە زیانی نییە؛ چونکە زاهیر وایە کە بە تەواوی تێ پەڕیوە. وە ئەگەر لەپاش سوجدەی دووەم کەوتە گومانەوە لەوەی کە ئایا سوجدەی بردووە یا نا ، یا لەوەی کە لە سوجدەکەیدا دامەزران (طمأنینە) بووە یانا ، ئەوە واجیبە سوجدەکە بەرێ لەگەڵ (طمأنینە)دا، وە ئەگەر کەوتە گومانەوە لەوەی کە ئاخۆ لە سوجدەکەیدا دەستی داناوە لە سەر عەرز یانا، ئەوە سوجدە نەباتەوە، چونکە زاهیر وایە ئەو سوجدەیە بە تەواوی جێبەجێ کراوە. ئەم مەسەلانەش پەنهانن و بەدەگمەن ڕوودەدەن.

ئەی برادەران! هەندێ لەم شێوانە، کە زانایانی ئاین فەرموویانە بەدەگمەن ڕوودەدەن و من لەبەر قاییمەکاری (ئیحتیات) نووسیومن، ئەو کەسەی بەم مەکتوویاتەی من نامۆژگاریی موسڵمانان دەکا، ئەگەر بۆ فێرکردنی قوتابییانە ئەوە قەی ناکات هەمووی پێ بڵێ، خۆ ئەگەر بۆ ڕێبەدێ کردنی خەڵکی هەڕەمەیە، نەیخوێننەوە؛ چونکە خەڵکی هەڕەمە بە بیستنی ئیحتیماڵە بەدەگمەن ڕووداوەکان سەریان لێ تێك دەچێ.

هەروەها ئەگەر لە نێو فاتیحەدا لەپاش (انعمت علیهم) کەوتە گومانەوە لەوەی کە (مالك یوم الدین)ی خوێندبێ و گەڕایەوەو (مالك یوم الدین) ی خوێندو، گورج هاتەوە سەر (انعمت)هکەو (ایاك نعبد)و باقی مەندەی ئەوەی نەخوێند، ئەوە قیرائەتەکەی بەتاڵە؛ چونکە شەرتی خوێندنی فاتیحە لەسەر تەرتیبی قورئانی پیرۆزەو، ئەم تەرتیبە بناغەی ئیعجازی قورئانە، جا ئەگەر بەدەسەنقەست کابرا چوو بۆ ڕکووع و، دەیزانی کە بەو جۆرە قیرائەتەکەی دروست نییە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر نەیزانی یا لەبیری چوو ئەوە حوکمی وەکو هاوچەشنەکانیەتی لەوانەی لەمەوپێش باس کران. ئەوەش بزانن هەرچی عەرزتان کراوە، ئەگەر بەهۆی وەسوەسەوە بێ، ئەوە زیانی نییە، وەکو باسی کراوە. بەڵام پێویستە مرۆڤ گوێ نەداتە خەتەرەی شەیتانی چونکە لە شەرعدا ئەو نوێژە بەتاڵ نییە. زانا گەورەکانی ئاین دەرمانی ئەم دەردە فەوتێنەرەیان وەها داناوە کە مرۆڤی ڕاڕا و دوودڵ بە نەفسی خۆی بڵێ: ئەم نوێژی منە، هەرچەند لەلای من بەتاڵە، بەڵام لەلای شەرع دروستە، کەوابوو من تابیعی شەرع دەبم و تابیعی تۆ نابم و دوات ناکەوم و، تاوانم بە ئەستۆی ئەهلی شەرع بێ کە نوێژەکەی من بە ڕاست دەزانن، هەروا با لە سەر ئەم سێوە بڕوا هەتا وەسوەسەکەی لە دڵ دەردەچێ.

بێجگە لەمانە نوێژکەری ڕاڕا زۆر لەم جۆرە حاڵانەی بەسەرا دێ کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە؛ بۆ نموونە: پاش خوێندنی کەلیمەی (المغضوب)ی ئەلف لام دار جارێکی تر دووبارەی دەکاتەوە، بەڵام بەبێ حەرفی(بێ) ئەنجا لە دڵی خۆیدا دەڵێ: من حەرفی (بێ)م تەرك کردووە؛ لەبەرئەوە بەنیازی ڕاستکردنەوەی هەڵەکەی جارێکی تر دەیخوێنێتەوە، بەڵام ئەمجارە ئەلف لامەکەی دەقرتێنێ و تەنیا (مغضوب) دەڵێ!.

جاروباری وایش دەبێ کە مرۆڤ ڕاڕاو دوودڵ نییە، کەچی تەرکی ئەلف لام دەکا، جا ئەگەر (غیرالمغضوب)ی خوێند بەتەواوی و، لە پاشان هات ئەو کەلیمەیەی بە بێ ئەلف لام خوێندەوەو، فاتیحەی لەسەر ئەوە تەواوکرد، ئەمە ئەگەر بەعەمدی بێ ئەوە نوێژەکەی

بەتاڵەو، ئەگەر بەسەهوو یا لەبەر نەزانی بوو، ئەوە هەر کاتی بەوەی زانیٚ، یا کەوتەوە یادی بەسەر گرتنەوەی فاتیحەی واجیبە لەگەڵ توولی فەسڵداو، ئەگەر توولی فەسڵ نەبوو خوێندنەوەی کەلیمەکە بەساغی واجیبە، بەڵام ئەوە بۆ کەسێکە ڕکاتەکەی تەواو نەکردبێ، خۆ ئەگەر تەواوی کردبێ ئەوە ئەو ڕکاتە پووچ و بێ سوودەو، دەبێ بەم ڕکاتە کە ئێستە پێیەوە خەریکە تەداروکی بکاتەوە.

زۆرم چاو پێ کەوتووە کە لە (تحیات)دا بۆ جوان خوێندنی(صاد)و بەجهێنانی(صفیر)و ئاوازەکەی لەفزی (صالحین) بەبێ (ئەلف) دووبارە دەکاتەوەو تەحیاتەکەی لە سەر ئەو لەفزە تەواو دەکا، کەچی حوکمی ئەمەش وەك حوکمی (غیرالمغضوب) وایە، مادام بە بێ (ئەلف لام) بیخوێنێ ئەگەر زۆری پێ نەچوو کەلیمەکە بە (ئەلف لام)ەوە بخوێنێتەوەو، ئەگەر زۆریشی پێ چوو دەبێ هەموو فاتیحەکە بخوێنێتەوە، ئەم مەسئەلانەش پەنهانن و زۆریش ڕوودەدەن.

وە ئەگەر بە سەهوو ڕوکنێکی قەولی بە ناتەواوی بڕی و ڕۆیشت بۆ ڕوکنێکی تر، وەك ئەوەی تەحیا ببڕێ و بڕوا بۆ سڵاوات و، لە پاشاندا کەوتەوە بیری، ئەوە پێویستە کوتوپڕ بگەڕێتەوەو تەحییاتەکەی لەسەرەوە بخوێنێتەوە، ئەگەر، وانەکات نوێژەکەی بەتاڵە.

وە ئەگەر بەسەهوو سەلامی دایەوە واجیبە، پێش ئەوەی کە زۆری پێ بچێ، بگەڕێتەوەو نوێژەکەی تەواو بکا با قسەیەکی کەمی کردبێ یاخۆ پشتی لە قیبلە کردبێ. هەر کاتێ شکی پەیدا کرد لەوەی ئاخۆ ئەو ڕوکنە فیعلییەی کردووە یا نا واجیبە کوتوپڕ بگەڕێتەوە بۆ سەری و بیکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر عەمدەن ڕۆیشت بۆ ڕوکنێکی تر ئەوە چاکتر نوێژەکەی بەتاڵە، چونکە کارەکەی یاری کردنە. خۆ ئەگەر بەسەهوو ڕۆیشت بۆ ڕوکنێکی تر، لەم حاڵەتەدا ئەگەر ڕکاتەکەی تەواو نەبوو، گورج بگەڕێتەوە بۆ ئەو روکنە گومان لێ کراوە و بیکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر رکاتەکەی تەواو بوو ئەنجا کەوتەوە یادی ئەوە ئەو ڕکاتە پێشووەی بێ سوودەو پێویستە تەداروکی بکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. بەڵام ئەگەر تا ئاخری نوێژەکەی نەکەوتەوە بیری ئەوە واجیبە ڕکاتێکی تر بکات، با لەپاش سەلام بکەوێتەوە بیری و قسەیەکی کەم بکا یا پشتی لە قیبلە کردبێ ، ئەگەرنا ئەو نوێژەی بەتاڵە.

هەروەها تەحییاتی دوایی وەکو فاتیحەیە دەربارەی حوکمی ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە، واتە: هەر کاتێ یەکێك بەعەمدی یەکێ لە شەددەکانی تەرك کرد یا ئیعرابێکی گۆڕی کە مەعنا تێك بدا یا حەرفێکی کەم کرد ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. بۆ نموونە: ئەگەر

بەعەمدی لە سەر وشەی (يا ايها النبي) ڕاوەستاو (بێ)کەی بە (مشددی) نەخوێندەوە ئەوە ئەو نوێژەی بەتاڵە.

بەڵام ئەگەر بەسەهوو بوو لەم حاڵەتەدا ئەگەر پێش ئەوەی زۆر بەینی بکەوێ، گەڕایەوەو بە (مشددی) یێ کەی خوێندەوە ئەوە باشە، خۆ ئەگەر بەعەمدی نەگەڕایەوەو سەلامی دایەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. وە ئەگەر لە بیری چوو یا نەزان بوو و زۆر بەینی نەکەوت کە بیری کردەوە گەڕایەوە بۆی و بە ڕاستی خوێندییەوە ئەوە نوێژەکەی دروستە، ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام ئەگەر بەینی زۆر کەوت، ئەنجا بیری کەوتەوە یا پێی زانی لەم حاڵەتەدا ئەگەر تەحییاتەکەی خوێندەوە ئەوە باشە، ئەگەر نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر لەپاش سەلامدانەوەو پێش ئەوەی درێژە بکێشێ کەوتەوە بیری یا زانی، با قسەی کەم یا پشت لە قیبلە کردنی لێ ڕوودابێ، ئەوە واجیبە تەحییاتەکەی لەسەرەوە بخوێنێتەوە، ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵە.

هەروەها دانیشتن و ئارام گرتن لە تەحییاتدا ڕوکنی نوێژە، جا ئەگەر لە پێش ئارام گرتن لە دانیشتنەکەدا هەندێکی لە تەحییات خوێند ئەوە ئەگەر سەر لەنوێ نەیخوێنێتەوە نوێژەکەی بەتاڵە.

ئەگەر تەحییاتی دوایی وەها نەخوێندەوە کە خۆی بیبیسێ ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، با تاقە حەرفێکیشی نەبیستبێ، ئەمە ئەگەر بەعەمدی بوو، خۆ ئەگەر بەسەهوو یا بە هۆی نەزانینەوە بێ، ئەوە خوێندنی ئەو بەشەی کە نەیبیستووە بەتاڵە، جا ئەگەر پێش ئەوەی ماوەیەکی زۆری پێ بچێ کەوتەوە بیری ئەوە پێویستە ئەو کەلیمانە بگێڕێتەوە بە جۆرێ کە خۆی بیبیسێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر زۆری پێ چوو ئەوە پێویستە تەحییاتەکە لە سەرەوە بخوێنێتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە.

ئەگەر بەسەهوو نوونی زەنەداری کەلیمەی (ان) لە عیبارەتی (اشهد أن اله الا الله) دربخات، ئەوە بەلای (ابن حجر)ەوە، خوالێی خۆش بێ، خوێندنی ئەو کەلیمەیە بەتاڵە؛ چونکە پێچەوانەی یەکگرتن و(ئیجماع)ی حەوت قیرائەتەکەی قورئانە. جا ئەگەر پێش ئەوەی درێژە بکێشێ کەوتەوە بیری ئەوا بگەڕێتەوە بۆ ئەو کەلیمەیەو بەئیددیغامەوە بیخوێنێتەوەو، لەسەرئەوە نوێژەکەی تەواو بکات، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. خۆ ئەگەر درێژەی کێشا ئەنجا کەوتەوە بیری ئەوا واجیبە تەحییاتەکەی بخوێنێتەوە، ئەگەر نا نوێژەکەی بەتاڵە.

نـوونـی (تـەنـویـن)ی (مـحـمـدا) لـەگـەڵ ڕێـی (رسـول)دا ئـەویـش لـەسـەر ئـەم ڕێـبـازەیـە کـە باسمان کرد، واتە: ئەگەر نوێژکەر بە عەمدی نوونەکەی دەربڕی و زانا بوو ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام ئەگەر نەزان بوو نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەگەرچی (ابن قاسم)- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- باسی کردووە کە دەرخستنی نوون نە بۆ زانا و نە بۆ نەزان نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوەو، ئەم عیبارەتەی نەقڵ کردووە: «قال أبن الجزري في النشر في باب أدغام النون الساكنة والتنوين ما نصه: وخير البزي بين الادغام والاظهار فيهما، أي في النون والتنوين عندهما أي عند اللام والراء.. أنتهى»

بیگومان ئەم فتوایە ڕەحمەتە بۆ موسڵمانان. وا نەبووایە بەڵای گشتی ڕووی دەکردە نوێژکەری هەرەمەی نەزان.

ئەگەر نوێژکەر (التحيات لله)ی بە کەسری(هێ) خوێندەوە، هەمزەی (السلام)ی دەرج نەکرد، ئەگەرچی فەسیح ئەوەیە کە دەرجی بکا، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. هەندێ لە زانایانی هاوچەرخ لایان وایە کە دەرج نەکردنی ئەو هەمزەیە لەحنە، واتە غەڵەتەو نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام ئەم ڕایە بەتاڵە لەبەر ئەم چەند دەلیلانە:

یەکەم: ئەگەر بڕیاریش بدەین لەحنە ئەو لەحنە نییە کە مەعنا بگۆڕی؛ کەوابێ نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

دووەم: وەقف، وسڵ، دەرج و هاووێنەکانیان تایبەتی قورئانی پیرۆزن، چونکە خوێندنی قورئان عیبادەتەو، وەها نازڵ بووە. بۆ سەر پێغەمبەر (د.خ)و، بەوشێوەیە بە ئێمە گەیشتووە، بەڵام غەیری قورئان وەها حیساب ناکرێ.

سێیەم: هەمزەی (السلام) داخڵی کەلیمە مەعریفەکەیە، جا لە کاتی ڕاوەستان لە سەر کەلیمەی پێشەوەیدا دەرخستنی هەمزەکە موافیقی لەهجەی فەسیحەو، لە حاڵەتی لکاندنی لەگەڵ کەلیمەی پێشوویدا دەرجەکەی فەسیحە، بەڵام بەهۆی موخالەفەی لەهجەی فەسیح بە خاریج و بە زیادە حسێب ناکرێ. في شرح العباب: «وفيه – أي في المجموع أيضاً كما في التحقيق –: «وأن يقطع همزة الجلالة ويحققها، فوصلها بنحو (مأموما) أو (أداءا) حتى تذهب في الدرج خلاف الاولى. انتهى..» وقال أبن عبدالسلام: مكروه. وقال ابن الصلاح:« وإنما لم تبطل لانه لم يترك حرفاً ثابتاً في حال الدرج، لان ثبوتها مخصوص بغير هذه الحالة. أنتهى».

تەنانەت زیادکردنی دوو حەرف وەکو (یا) لەپێش (إيهاالنبي) واتە: بڵێ (یا إیها النبي ورحمة الله وبرکاته) ئەگەر چی بەعەمدی بێ و نوێژکەرەکە زاناش بێ زیانی نییە، وەکو هەندێ لە زانایانی ئاین لەسەر ئەوەن؛ کەوابێ هێشتنەوەی هەمزەی (السلام) لە حاڵەتی وەصڵدا، کە هەر هیچ مەعنا ناگۆڕێ، چاکتر نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

چوارەم: (قیرائەتی شازە) ئەگەرچی لە نوێژدا (علی الاصح) حەرامە و خێر و پاداشت دەفەوتێنێ، بەڵام هەر کاتێ لە نوێژدا زیادەیەکی تێدابوو کە مەعنا نەگۆڕێ دروستە، بێجگە لەوە کە هەمزەی (السلام) پێی ناوترێ زیادە، ئەگەر چی موافقی عەرەبیی فەسیح نییە.

هەروەها (واو)ی عاتیفەی نێوان دوو وشەی (شەهادەت) خوێندنی واجیبەو ڕای باوەڕپێکراو (معتمد) ئەوەیە کە بەدەسەنقەست تەرککردنی نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە.

وتمان دانیشتن لە هەموو تەحییاتی دوایدا ڕوکنی نوێژەو ئارام گرتن شەرتی ئەم دانیشتنەیە، کەچی لە گەلێ موسڵمانی نوێژکەرەوە دەبینرێ کە کاتێ سەری لە سوجدەی دووەم بەرز دەکاتەوە، لەپێش ئەوەی دابنیشێ و ئارام بگرێ، دەس دەکات بە خوێندنی تەحییات، ئەمەش پێچەوانەی ئەمری شەرعە. جا ئەگەر ئەمە بە سەهوو بوو، زۆری پێ چووبێ یا نا، واجیبە تەحییاتەکە لەسەرەوە بخوێنێتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر هات و بەدەسەنقەست وای کرد ئەوە چاکتر نوێژەکەی بەتاڵە؛ چونکە ئەم شێوەیە یاری کردنە. ئەم مەسیەلەش پەنهانەو کەم کەس پێی دەزانێ.

ئەگەر لەکاتی خوێندنی تەحیاتدا نوێژکەر، بۆ ئەوەی جێی پێی لەژێریدا خۆش بکات، پشت و سەری بەرەو لای قیبلە ئەوەندە دانەواند هەتا گەیشتە ئەندازەی ڕکووعی کەسێ کە بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەمە لە سەر فەرموودەی (اصح) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ، کەم کەسیش هەیە خۆی لەم کردەوەیە بپارێزێ، بەڵێ قەولێ هەیە کە دەڵێ نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام ئەم قەولە لاواز (ضعیف)ە.

هەروەها سەلامی یەکەم، ڕوکنی نوێژەو، واجیبە بڵێت: (السلام علیکم) و، دروست نییە بڵێت: (سلام علیکم) بەبێ ئەلف لامی تەعریف و، ئەگەر بەدەسەنقەست سەلامی تەرك كرد ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر بە سەهوو بوو واجیبە پێش ئەوەی بەینی زۆری بکەوێ فریای بکەوێ و سەلام بداتەوە، یا قسەیەکی کەمیشی لە دەم دەرچووبێ یا کەمێ پشتی

له قیبله کردبێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. هەروەها واجیبە هەتا ئاخری میمی(علیکم) سینگی بەرەو قیبلە بێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، وە واجیبە سەلامی یەکەم، وەها بخوێنێ کە خۆی گوێی لێوەبێ و، ئەگەر بەدەسەنقەست ئەوەندە سووکی بڵێ کە خۆی گوێی لێ نەبێ ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. هەروەك واجیبە سەلامی یەکەمی لە کاتی دانیشتندا بێ و، ئەگەر بەدەسەنقەست سەلامەکەی لە دانیشتندا نەبوو، یانی ڕاکشا، یا هەستایەوەو سەلامی دایەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر بەسەهوو بوو ئەوە واجیبە لە پێش ئەوەدا کە درێژەبکێشێ دانیشێ و سەلام بداتەوە، هەرچەند قسەیەکی کەمی کردبێ، یا پشتی لە قیبلە هەڵکردبێ. ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. ئەم دوو کارە کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە دێن بەبیرداو لەم دوو حاڵەدا ڕوودەدەن، یەکەم: کارێکی پەلەی وا ڕووی تێ بکا کە سەری لێ تێك چێ و لەبەر بێ ئاگایی وابزانێ سەلامی یەکەمی داوەتەوە. دووەم: تەحییاتی دوایی بە تەحییاتی یەکەم دەزانێ و بە خەیاڵی خۆی هەڵدەستێ بۆ تەواوکردنی باقیی نوێژەکەی، ئەنجا دەکەوێتەوە بیری کە ئەو تەحییاتە هی دوایی بووە. جا لەم دوو حاڵەدا واجیبە دابنیشێ و ئارام بگرێ ئەنجا سەلامەکەی بداتەوە ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە.

ئەگەر نوێژکەری بێ وەسوەسە سەلامی دووەمی دایەوەو، پێش بەین کەوتنی زۆر کەوتە گومان لەوەی کە سەلامی یەکەمی داوەتەوە یانا ئەوە واجیبە سەلامی یەکەم بخوێنێ و،پاش ئەوە سەلامی دووەمیش بخوێنێ، چونکە ئەم سەلامی دووەمە لە کارە سوننەتەکانەو جێگای سەلامی یەکەم ناگرێتەوە، چونکە نییەتی نوێژ لە ئەسڵدا سەلامی دووەم ناگرێتەوە، ئەم سەلامی دووەمە وەختێ دەبێ کە نوێژکەر بەهۆی سەلامی یەکەمەوە لە نوێژەکە دەرچووە. ئەم مەسەلەیە زۆر پەنهانەو، ڕوویش دەدا. ئەگەر نوێژکەری مەئمووم بەدەسەنقەست لە پێش سەلامی یەکەمی ئیمام سەلامی دایەوە واتە: پێش خوێندنی میمی (علیکم) لەلایەنی ئیمامەوە ئەم سەلامی دایەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، هەرچەند ئەوەڵی سەلامەکەی لەگەڵ ئەووەڵی سەلامی ئیمامدا جووت بێ و بەرامبەری یەك بن. بەڵام بەرامبەریی هەموو سەلامی مەئمووم لەگەڵ سەلامی ئیمامدا نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵکو فەزیلەتی نوێژەکە دەفەوتێنێ و ئیتر نەفسی نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە.

بەڵام بەرامبەریی سەلامی دووەمی مەئمووم، لەگەڵ سەلامی دووەمی ئیمامدا یا پێش کەوتنی لێی، ئەوە (خلاف الاولی)یەو، سەلامی دووەمی مەئموومەکە بەتاڵ ناکاتەوە؛

چونكه له پاش دەرچوون له نوێژ دەست بەم سەلامە كراوە. ئەم مەسئەلانەش پەنهانن و زۆر ڕوودەدەن.

سەلامی دووەم بۆ مەئمووم سوننەتە با ئیمامەكەش تەركی بكات. بەڵام ئەگەر مانیعێ پەیدرابوو، وەكو بێ دەسنوێژی، یا نەمانی كاتی نوێژی جومعە، یا دڕانی خوف و، نییەتی نیشتەجێ بوون بۆ ئینسانی موسافیر، یا تەواوبوونی موددەی دەس پیا هێنانی خوف، یا كەوتنە گومانەوە لەوەدا ماوەی دەس پیاهێنانی خوف تەواو بووە یا نا؟ ئەوە لەم حاڵانەدا ئەگەرچی نوێژەكەی دروستە، بەڵام سەلامی دووەم نەك تەنیا سوننەت نییە، بەڵكو حەرامیشە، چونكە لە حاڵی نوێژی جومعەكەدا تا ئەو سەلامە تەواو دەكا نوێژەكە لە كاتی خۆی تێپەڕ دەكا، لە حاڵی بێ دەسنوێژییەكەشدا وەك ئەوەیە كە بەشێ لە نوێژەكەی بە بێ دەسنوێژی بكات. ئەگەر پاش سەلامدانەوە ئینسانی بێ وەسوەسە كەوتە گومان لە نەكردنی فەرزێ لە فەرزەكانی نوێژ، غەیری نییەت و (الله اكبر)ی نوێژ دابەستن، ئەوە زیانی نییە؛ چونكە ئەگەر زیانی هەبێ، دەبێتە هۆی تەنگ هەڵچنین بە بەندەگانی خوا. خۆ ئەگەر لەپاش سەلامدانەوە كەوتە یادی كە لە پێش (الله اكبر)ی نوێژ دابەستندا بەیەقین دەسنوێژی بووە، بەڵام كەوتووەتە گومانەوە: ئایا بێ دەسنوێژی بەسەرا هاتووە یا نا، ئەوە نوێژەكەی دروستە.

ئەگەر لە پاش سەلام یەقینی بوو كە لە پێش (الله اكبر)ی نوێژ دابەستندا شكی بووە لە دەستنوێژو، ئەو شكەی لانەچووە، هەتا نوێژەكەی دابەستووە، ئەوە دیارە كە نوێژەكەی دانەمەزراوە.

ئەگەر لە پێش تەواوكردنی دەستنوێژدا كەوتە گومانەوە: ئایا دەستی شۆریوە یا نە، یا مەسحی سەری كردووە یا نە و، گومانەكەی لانەچوو، ئەوە واجیبە دووبارە بە نییەتی لابردنی بێ دەسنوێژی ئەو ئەندامانە بشۆرێ، یا مەسحی سەری بكا و، ئەندامەكانی تری پاش ئەوانەش بە تەرتیب بەو نییەتە بیانشۆرێ، ئەگەرنا بەو دەسنوێژە پێشووە دانامەزرێ. ئەم مەسەلەش پەنهانەو كەم جار ڕوودەدا.

بەڵام ئەگەر ئەو گومانەی سەبارەت بە شۆرینی ئەندام یا مەسحی سەری لە ناو نوێژدا بۆ پەیدابوو ئەوە زیانی نییە. في التحفة لابن حجر ما نصه: «فرع. وقع هنا للقاضي ومن تبعه أنه لو شك في أثناء الصلاة في مبطل لطهارته أثر كما لوشك في النية، والمعتمد أنه لا يؤثر. أنتهى».

ئەگەر لە پێش تەواوکردنی دەستنوێژا گومانی بۆ پەیدابوو لە شۆرینی بەشێ لە بەشەکانی دەستی: ئایا بەتەواوی شۆریویەتی یا نە؟ ئەوە دەسنوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو نوێژەکەی دادەمەزرێت.

ئەگەر لەپاش تەواو کردنی دەستنوێژ کەوتە گومان: ئایا مەسحی سەری کردووە، یا نییەتی لابردنی حوکمی بێ دەستنوێژی هێناوە، یا نا ئەوە ئەم گومانە زیانی نییە.

ئەگەر لەکاتی دەستنوێژدا یەکێ لە هۆیەکانی بێ دەستنوێژی لێ روودا، چ بە ئارەزوو یا بە ناچاری ئەوە بە ئیتتیفاقی هەموو زانایانی ئاین دەستنوێژەکەی دەشکێت، بەڵام جیاوازیی بیروڕاکان لەوەدایە کە ئایا بەرامبەر شۆردنی ئەو ئەندامانەی شۆردوونی خێرو پاداشی هەیە یا نا؟ (أصح)ئەوەیە کە ئەگەر شکانەکە بەناچاری بووبێ، خێرو پاداشی هەیە، ئەگینا نییەتی.

ئەی براینە!

برانن لە مەرجەکانی دەستنوێژە کە نییەتەکەی لە دڵدا بمێنێ هەتا دەستنوێژەکەی تەواو دەکات، واتە شتێکی وا لە دەستنوێژگرەکەوە ڕوونەدا کە دژی ئەو نییەتە بێ؛ لەبەرئەمە ئەگەر لەناو دەستنوێژەکەیدا قەستی بڕینی دەستنوێژەکەی کرد و پاش ئەوە پەشیمان بوویەوە، ئەوا پێش ئەوەی دەستنوێژەکەی بە یەکێ لە ئەسبابەکان بشکێ پێویستە لە سەری دووبارە نییەتی لابردنی حوکمی بێ دەستنوێژی بهێنێ بۆ ئەوەی باقیی ئەندامی دەستنوێژی بشۆرێ، بەڵام ئیتر پێویست نییە ئەوەی زوو شۆردوویە دووبارە بیشۆرێتەوە؛ چونکە نییەتی بڕینەکە لەوە پاشی بەتاڵ دەکاتەوە نەك پێشووەکەی، ئەگەر وەها نەکات کە وتم دەستنوێژەکەی بەتاڵە. ئەم مەسەلەش پەنهانەو کەم کەم ڕوودەدا.

ئەگەر، خوانەکەردە، لەناو دەستنوێژدا لە دین وەرگەڕاو، کوتوپڕ لەو حاڵە پیسە پەشیمان بوویەوە، ئەوە واجیبە دەستنوێژەکەی بەتەواوی بگرێتەوە؛ چونکە ئەو لە دین وەرگەڕانە کار لە پێش ئەو دەستنوێژە دەکا. ئەم مەسەلەیش کەم ڕوودەدا.

ئەگەر بە یەقین یا بە گومان خۆی بە پاك و دەستنوێژدار دەزانێ، بەڵام دوودڵییەکی هەبوو لە بێ دەستنوێژی و، لەبەر ئیحتیات دەستنوێژەکەی تازە کردەوە، ئەگەر پاش ئەم دەستنوێژە بەتەواوی بۆی دەرکەوت لە پێشا دەستنوێژی نەبووە ئەوا ئەم دەستنوێژە

ئیحتیاتەشی دروست نییە؛ چونکە لە کاتی دەستنوێژە ئیحتیاتەکەیدا لە نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژیدا دوودڵ بووە، هەروەها دەستنوێژی پێشوویشی نەبووە، کەوابێ هەر نوێژێ بەو دەستنوێژە کردوویەتی بەتاڵە. جا لەبەرئەمە بۆ ئەم جۆرە حاڵە وا باشە کە لەپێش تازەکردنەوەی دەستنوێژەکەیدا دەستنوێژەکەی بشکێنێ، نەوەك ئەو حاڵە کە ئێستە بەیانمان کرد لێی ڕوویدا. بەڵام ئەگەر لە پاش ئەم دەستنوێژە ئیحتیاتە حاڵی دەستنوێژی پێشووی مەعلووم نەبوو، ئەوە ئەم دەستنوێژە ئیحتیاتەی دروستە، چونکە ئیستیسحابی یەقین بە شك لاناچێ و، ئەو دەستنوێژە پێشووەی بەتەواو دروست دادەنرێ.

ئەگەر یەکێك کەوتە گومان لەوەی ئاخۆ ئێستە دەستنوێژی هەیە یا نا و، لە هەمان کاتدا یەقینی هەبوو کە بێ دەستنوێژیی بەسەردا هاتووە، بەڵام گومانی لەوەدا هەبوو کە ئاخۆ پاش ئەو بێ دەستنوێژییە دەستنوێژی گرتووەتەوە یا نا، ئەنجا ناچار بوو دەستنوێژی گرت، ئەو دوودڵییە زیانی نییە ئەگەرچی لەپاشانیش دەرکەوێ کە بێ دەستنوێژ بووە؛ چونکە ئەسڵ ئەوەیە کە بێ دەستنوێژییەکەی مابێ، کەوابوو ئەو دەستنوێژەی گرتوویەتی دروستە و نوێژەکەی ڕاست و تەواوە. ئەم دوومەسەلەیەش پەنهانن و کەم ڕوودەدەن.

ئەگەر کەوتە گومانەوە ئایا دەستنوێژی هەیە یا نا، بە جۆرێ هەردوو لایان– دەستنوێژداری و بێ دەستنوێژی– وەك یەك بوون ئەوە واجیبە دەستنوێژی خۆی بەتەواوی بشکێنێ ، بۆ نموونە دەست لە عەورەتی بدا تا دەستنوێژەکەی بشکێ، ئەنجا نییەتی لابردنی حوکمی بێ دەستنوێژی بهێنێت و دەستنوێژ بگرێ، ئەگەرنا ئەو دەستنوێژەی بەتاڵ دەبێ، چونکە بەڕاستی نازانێ کە دەستنوێژی هەیە یا نا، دیارە نییەت لەگەڵ دوودڵیدا نابێ، ئەم مەسەلەش پەنهانەو زۆر جار ڕوودەدا. ئەگەر یەکێك دوو فەرزی نوێژی کرد بە دوو دەستنوێژ، چ دەستنوێژی دووەم بۆ لابردنی بێ دەستنوێژی بووبێ یا بۆ تازەکردنەوەی دەستنوێژو، لە پاشاندا لای یەقین بوو کە مەسحی سەری لە یەکێك لە دەستنوێژەکاندا جێبەجێ نەکردووە، بەڵام نازانێ کامیانە، ئەوە هەردوو نوێژەکەی بەتاڵەو، پێویستە لەگەڵ نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژیدا مەسحی سەری بکا و، هەردوو پێی بشۆرێ و هەردوو نوێژەکانی بکاتەوە؛ چونکە دڵنیایە لەوەی کە مەسحی سەری بەجێ هێشتووە، بەڵام نازانێ لە دەستنوێژی کام نوێژیاندا بووە خۆ ئەگەر لە پاش دەستنوێژیی دووەم بێ دەستنوێژ بوو، ئەوجا کەوتەوە بیری کە

مەسحی سەری تەرك كردووە، ئەوە واجیبە هەر لە سەرەوە بەتەواو دەستنوێژ بگرێ و، هەردوو نوێژەكان بگێڕێتەوە؛ چونكە بەهۆی بەتاڵبوونەوەی دەستنوێژی دووەم حوكم بە بەتاڵبوونەوەی دەستنوێژی یەكەمیش دەدەین، چونكە نازانێ مەسحی سەری لە دەستنوێژی دووەمدا تەرك كردووە یا لە یەكەمدا. ئەم دوو مەسئەلەیە شێوەی یەكەمیان زۆر پەنهانەو شێوەی دووەمیان پەنهانەو زۆریش ڕوودەدا.

هەروەها بەم بۆنەیەوە دوو شێوەی ترتان عەرز دەكەم چونكە پەنهان و پێ نەزانراون: شێوەی یەكەم ئەوەیە هەركاتێ ژنێ لەناو نوێژەكەیدا حەیزی پێدا هات كوتوپڕ نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوەو حەرامە تەواوی بكا، چونكە خوێندنی قورئان لە حاڵی حەیزدا، لەگەڵ زانین بە حەرامییەكەدا، بەگوناهی گەورە دەژمێردرێ، جا ئەگەر لە نوێژی عەسردا تێ كەوت و، بەقەدەر نوێژ و موقەددیماتی نوێژ وەخت تێ پەڕیبوو ئەوە پاش پاكبوونەوە لەسەری واجیبە ئەو نوێژی عەسرە بە قەزا بگێڕێتەوە، چونكە مادام پێش تێكەوتنەكەی ئەوەندەی وەخت بەدەستەوە بووە كە بتوانێ نوێژی عەسری تێدا بكا، ئەوە لەم دواخستنەدا بە موقەسیر (تاوانبار) دەدرێتە قەڵەم و، وەك وتمان نوێژی عەسرەكەی دەگێڕێتەوە. شێوەی دووەم ئەوەیە هەر كاتێ بەقەدەر (الله اكبر)ی نوێژدابەستن لە وەختی نوێژی عەسر مابوو، كە ژنەكە پاك بوویەوە، ئەوە لەپاش خۆشۆردن نوێژی عەسرو نوێژی نیوەڕۆیشی لەسەر واجیبە قەزایان بكاتەوە، چونكە وەختی عەسر وەختی نیوەڕۆیشە لە هەندێ كاتدا، هەروەها ئەگەر لە دواكاتی نوێژی عیشادا پاك بوویەوەو، تەنیا ئەوەندەی (اللـه اكبر)ی نوێژدابەستنی مابوو، هەمیسان لەپاش خۆشۆردن نوێژی مەغریب و عیشایشی لەسەر واجیبە بەقەزا بیانكاتەوە.

براكانم! گێڕانەوەی ئەم دوو نوێژە پێشووە، واتە: نیوەڕۆ بەهۆی عەسرەوەو مەغریب بەهۆی عیشاوە، دوو حیكمەتی تێدایە: یەكەم ئیحتیات چونكە لەوانەیە ئەو ژنە هەر لەوەختی نوێژی نیوەڕۆدا یا لە وەختی نوێژی مەغریبدا حەیزەكەی تەواو بووبێ  و بە خۆی نەزانیبێ. دووەم ئەوەیە كە نوێژی نیوەڕۆ تابیعی نوێژی عەسرەو نوێژی مەغریب تابیعی نوێژی عیشایە لە (جمع التاخیر)دا. ئەم دوو مەسەلەش پەنهان و نادیارین و زۆر ڕوودەدەن.

ئەگەر نوێژكەر بەعەمدی تەركی ڕوكنی قەولی كرد بۆ سوننەتی قەولی وەكو بڕینی سوورەتی فاتیحە بۆ خوێندنی«اعوذ باللـه من الشیطان الرجیم»  ئەمە زیانی نییە

ئەگەرچی (مکروه)ە، بەڵام ئەگەر بەعەمدی ڕوکنی فیعلی بڕی بۆ سوننەت، چ قەولی چ فیعلی، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بۆ نموونە: ئەگەر تەحییاتی یەکەمی بەسەهوو یا بەلەبیرچوونەوە تەرك کردو، ڕاستەوە بوو گەیشت بە (قیام) کە ڕوکنی فیعلییە، لەپاشان بەعەمدی لەم ڕوکنە فیعلییە، کە ڕاوەستانە، گەڕایەوە بۆ تەحییات ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

بەڵام ئەگەر بەهۆی نەزانینەوە یا لەبیرچوونی واجبەکەوە، گەڕایەوە بۆ تەحییات، چ ئیمام و چ بەتەنیا نوێژکەر ئەوە زیانی نییە، جا ئەگەر لەپێش تەواوکردنی تەحییاتەکەدا بیری کەوتەوە کە لە ڕاوەستانەوە گەڕاوەتەوە ئەوە واجیبە کوتوپڕ هەستێتەوە بۆ ڕاوەستانەکە وەك لەوەپێش، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. هەروەها ئەگەر بەسەهو بگەڕێتەوە نوێژەکەی دروستە؛ چونکە زیادکردنی کارێ لە جینسی کاری نوێژ بەسەهوو نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام ئەگەر لە پێش تەواوکردنی تەحییات کەوتەوە بیری کە بەسەهوو هاتووەتەوە بۆ تەحییات ئەوە لە سەری واجیبە کوتوپڕ هەستێتەوە بۆ ڕاوەستان، خۆ ئەگەر لە پشت سەری ئیمام بەجەماعەت نوێژی دەکردو، بەسەهو ڕۆیشتبوو، بۆ ڕاوەستان، ئەوە واجیبە گورج بگەڕێتەوە بۆ تەحییات؛ چونکە دوابەدوایی و لەگەڵ بوونی ئیمام واجیبەو، ئەگەر گورج نەگەڕایەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. جا لەو حاڵەدا کە مەئمووم بەسەهوو بەرز دەبێتەوە هەرچی خوێندووە لە سوورتی فاتیحە پێش بەرزبوونەوەی ئیمام بۆی حسێب ناکرێ و، پێویستە دووبارە لەپشتی ئیمامەوە بیخوێنێتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەپێچەوانەی شێوەی عەمدی وەکو باسی دێ. بەڵام ئەگەر مەئمووم بەعەمدی تەرکی تەحییاتی یەکەمی کرد، ئەوە واجیب نییە بۆ موتابەعەی ئیمام بگەڕێتەوە، هەرچەند گەڕانەوەکەی سوننەتە، لە هەمان کاتدا پێویستە هەر بە پێوە بێت و چاوەڕێی ئیمام بکات، چونکە لە جێهێشتنی واجیبی دوابەدوایی ئیمام و ڕۆیشتنی بۆ واجیبی بەپێوە ڕاوەستان بە نیازێکی ڕاست بووە. یاخود لەکاتی ڕاوەستانەکەیدا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بهێنێ و بەتەنیا نوێژ بکا.

ئەم شێوەیە وەك ئەو شێوە نییە کە تەحییاتی بەسەهوو تەرك کردبێ چونکە لەوێدا لەبەرئەوەی نییەتی ڕاستی نەبووە بەوە حیساب ناکرێ کە واجبێکی بەجێ هێشتبێ بۆ واجبێکی تر؛ بۆیە حوکمیان جیاوازە. ئەم مەسیەلەش لە مەسەلە پەنهانەکانە.

هەروەها ئەگەر ئیمام یا نوێژ بەتەنیا کردوو بەعەمدی تەرکی تەحییاتی یەکەمی

کردو گەیشتە عاستی  وەستان، یا لەوەستانەوە نزیکتر بوو تادانیشتن، ئەنجا بەعەمدی گەڕایەوە بۆ دانیشتن، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە لە بناغەدا بەعەمدی تەرتیبی نوێژەکەی بڕیوەو گۆڕیویەتی.

ئەگەر ئیمام یا نوێژ بە تەنها کردوو، لەبەر بێ تاقەتی، یا لەبەر هۆیەکی تر بەعەمدی لەناو تەحییاتی یەکەمدا هەستا، ئەگەر لە ڕاوەستان نزیکتر بوویەوەو، بەعەمدی گەڕایەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە شتێکی زیاد کردووە کە یاسای نوێژەکەی گۆڕیوە. خۆ ئەگەر لە دانیشتنەوە نزیکتر بوو، یا نزیکیی لە دانیشتن و ڕاوەستانەوە، وەك یەك بوو و، بەعەمدی گەڕایەوە، ئەوە نوێژەکەی دروستە، ئەگەر بەسەهوو گەڕایەوە ئەوە هەمیسان نوێژەکەی دروستە؛ چونکە زیادکردنی کارێ لە جینسی کارەکانی نوێژ بەسەهوو نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام ئەگەر لەپێش تەواوکردنی تەحییات کەوتەوە بیری کە بەعەمدی (تەحییات)ی تەرك کردووەو بەسەهوو گەڕاوەتەوە ئەوە واجیبە کوتوپڕ هەستێ بۆ ڕاوەستان، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە ئەگەر بەسەهوو تەحییاتی یەکەمی تەرك کردو، لە ڕاوەستانەوە نزیکتر بوویەوەو، ئەنجا بەسەهو گەڕایەوە ئەوە نوێژەکەی دروستە، بەڵام ئەگەر لە پیش تەواو کردنی تەحییاتدا کەوتەوە یادی کە بەسەهوو گەڕاوەتەوە، ئەوە واجیبە کوتوپڕ هەڵسێتەوە بۆ ڕاوەستان، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. ئەم مەسەلەش پەنهانەو پێویستە بیزانن. وەئەگەر بە عەمدی ڕاستەوەبوو لە تەحییات، بەڵام بەشێوەیەکی وا نەبوو کە بەکاربێ ، بۆ نموونە: مەبەستی ئەوە بوو هەستێ و بگەڕێتەوە بۆ تەحییات، یا هەر مەبەستی یاریکردن بوو، ئەوە هەر بەڕاست بوونەوەکە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە تەنیا دەستکردن بە شتێکی وەها نوێژ بەتاڵ بکاتەوە، نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە .

ئەگەر مەسبووقێ نوێژی دابەست، لە کاتێکدا کە ئیمام لە تەحیاتی دواییدا بوو، واجیبە گورج دابنیشێ مادام ئیمام سەلام نەداتەوە کەوابێت ئەگەر دانەنیشێ و زیاتر لە کاتی دانیشتنی ئیستیراحەت ڕاوەستێ بەپێوە، ئەوە چ دانیشێ و چ دانەنیشێ، مادام بەعەمدی بێ و پێی بزانێ، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو، ئەم مەسەلەش پەنهانەو کەم جار ڕوودەدا.

ئەگەر مەسبووق نوێژی دابەست و، پاش دابەستنی نوێژەکەی ئیمام سەلامی دایەوە، ئەو کەسە بەپاداشتی جەماعەتەکە دەگا، بەڵام ئیتر نابێ دابنیشێ؛ چونکە سەلامی داوەتەوەو، بەتەواوبوونی میمی(علیکم) لە (السلام علیکم)ی یەکەم ئیقتیدا تەواو دەبێ،

واتە: ئەگەر مەئموومەکە دابنیشێ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەم مەسەلەش پەنهانەو ڕوویش دەدا.

ئەگەر مرۆڤێکی وەها کە ڕاڕاو دوودڵ نەبووە، گومانی پەیداکرد: ئایا لە نوێژی نیوەڕۆدا چوار ڕکاتی کردووە یا سێ؟ ئەوە واجیبە خۆی بگەیێنێتەوە بە یەقین، واتە: ئەو ڕکاتە کە دوودڵە لە کردنی بیکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. ئەگەر یەکێك لە دەرەوەی نوێژکەران ئاگاداری کرد کە ئەوەندە ڕکاتەت کردووە، ئەوە نابێ دوای قسەکەی بکەوێ، مەگەر خۆی بیر بکاتەوەو، بەدڵنیایی بزانێ قسەی کابرا ڕاستە، یاخۆ ئەوانەی کە ئاگاداریان کردووە بگەنە ژمارەی تەواتور کە لای کەمی پێنج کەسە، لەم حاڵەتەدا دواکەوتنی ئەو ئاگادارییە واجیبە.

ئەگەر یەکێ لە مەئموومەکان بە (سبحان الله) ئیمامی ئاگادار کرد، بەڵام ئیمام بیری نەکردەوە، ئیتر ئەو مەئموومە دروست نییە خۆی دوای ئیمامەکەی بکەوێ، بەڵکو واجیبە نییەتی جیابوونەوەی لێ بێنێ. جا ئەگەر ئەمە لە تەحییاتی دواییدا ڕووی دا دووبارە دەبێ یا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنێ و بۆ خۆی نوێژەکەی تەواو بکا، یاخۆ لە تەحییاتدا بمێنێتەوە چاوەڕێی ئیمام بکات هەتا پێی دەگا، ئەنجا لەپاش ئەو سەلام بداتەوە، خۆ ئەگەر یەکێ لەم دوانەی نەکرد ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. ئەم مەسەلەش پەنهان و نادیاری.

ئەگەر مەئموومەکان ئیمامیان ئاگادار کردەوە لە سەر شتێ، وەکو ئەوەی کە هەموو هەستن بۆ ڕاوەستان، ئەگەر ژمارەی ئەو مەئموومانە گەیشتبووە ئەندازەی تەواتور، واتە لە پێنج کەس کەمتر نەبوون ئەوە واجیبە ئیمام وەك ئەوان ڕەفتار بکا. ئەگەر مرۆڤێکی عادل واتە: مرۆڤێکی تاعەتکاری پارێزگار لەگوناح، نوێژکەرێکی ئاگادارکرد کە پۆشاکەکەی یا بەرماڵی نوێژەکەی یا لەشی پیسە یا کەسێکی ئاگادار کرد کە دەیەوێ نوێژ دابەستێ، ئەوە واجیبە قسەکەی قبووڵ بکا، ئەگەرچی کابرای ئاگادارکراو خۆی شتی وەهای نەیەتەوە بیر. هەروەها ئەگەر ئاگاداری کرد بە کردەوەیەك کە نوێژ بەتاڵ بکاتەوە لەم حاڵەتەشدا واجیبە ئەو نوێژە بگێڕێتەوە کە بەو حاڵەوە کردوویەتی، ئەگەر وەخت مابوو، خۆ ئەگەر وەختی تێپەڕیبوو ئەوا بەقەزای بگێڕێتەوە، ئەگەر بە گوێی نەکرد ئەوە بە (تارك الصلاة) دەدرێتە قەڵەم. ئەم مەسەلەش پەنهان و نادیارە.

ئەگەر یەکێك یەقین یازەننی نەبێ کە کاتی نوێژ هاتووە، بەڵکو تەنیا (شك)ی بوو و

نـوێژەكـەی كـرد، ئـەوە نـوێژەكـەی دانـامـەزرێ، ئـەگـەر چـی لـە پـاش سەلامـدانـەوەی نوێژەكەیشی بۆی دەركەوێ كە نوێژەكەی لە وەختی خۆیدا بووە؛ چونكە لە عیبادەتدا دووشت جێگای ئیعتیبارە، یەك: واقیع، دوو: باوەڕی نوێژكەر. جا كاتێ هیچ كام لەمانە نەبوو ئەوە ئەو عیبادەتە دروست نییە. ئەم مەسیەلە لە دێهاتدا زۆر ڕوودەدا؛ ئاگادارم كە لە وەرزی زستاندا ئەهلی جەماعەت بەتایبەتی جەماعەتی دێهات لە نوێژی بەیانییاندا هەندێكیان دەڵێن: هێشتا شەوە، هەندێكیشیان دەڵێن: نەخێر ڕۆژە و غاڵبیان لەسەر ئەوەن كە ڕۆژە، جا ئیمامی ئیحتیات نەكەر بەقسەی زوربەكە دەكا كە دەڵێن ڕۆژە و نوێژەكە دادەبەستێ و، ئەو مەئموومییانەش كە وتوویانە: هێشتا شەوە لەگەڵ ئەوانی تردا نـیـیـەت دێـنـن و نـوێژی جـەمـاعـەت دەكـەن، لـەگـەڵ ئـەوەشدا نـوێژەكـەیـان دانـامـەزرێ و، ئیمامەكەش چەند دەقیقەیەك ڕاناوەستێ هەتا ئەمانیش بێنە سەر ئەوەی كە ڕۆژە، هەروەها پێشیان ناڵێ كە نوێژەكەیان دانەمەزراوە، جا تاوانی ئەوە لە ئەستۆی ئەو جۆرە ئیمامەیە.

ئەگەر نوێژكەر بەشێوەی گاڵتە تەلەفوزی كرد بە یەك حەرف، یا كارێكی سووكی كرد، یا پێ كەنی، ئەگەر چی تاقە حەرفێكی لێوە دەرنەكەوێ، ئەوە ئەو نوێژە بەتاڵە، چونكە گاڵتە بۆ نوێژ ناشێ، لەبەرئەوە نوێژكەر وا لە دیوانی خوادا موناجات دەكات و، پێویستە بـە ئـەدەب بـێ چـاوەڕێی ئـیـحسانـی خـوا بـێ. هـەروەهـا ئـەگـەر نـوێژكـەر لـە نـوێژەكـەیدا بەدەسەنقەست دوو حەرفی لە حەدیسی قودسی وت، چ جایێ كەلامی بەشەر و ئەو دوو حەرفە یەك لە دوای یەك بن، هەرچەند مەعنایشیان لێ دەرنەكەوێ، ئەوە نوێژەكەیان بەتاڵە، بەڵام زیادكردنی (یا) لەسەر «إیها النبي ورحمة الله» زیانی نییە و نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە.

وفی التحفة: « زیادة (یا) قبل (إیها النبي) غیر مبطل كما أفتی بە شیخنا» أنتهی. وزاد الشبراملسی «وأن كان عامداً عالماً» أنتهی.

واتە: شێخی ئیبنو حەجەر لە (تحفە)كەیدا وتویە: زیادكردنی (یا) لە پێش (أیها النبی) نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە، هەروەكو شێخمان فتوای پێ داوە. شبراملەسیش لێی زیادكردووەو وتوویە: با بەعەمدی و پێ زانینیش بیكا.

ئەگەر مەددەی لە سەر حەرفێ زیادكرد كە مەددەی نەبوو، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونكە با ئەو مەددەیە یەك حەرف بێ لە حوكمی دوو حەرفی بەدوای یەكدا

هاتوودایه، بەڵام ئەو مەددەیە کە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە مەددە لە سەر حەرفێکی قورئان مادام مەعنا نەگۆڕێ نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە وەك (شبراملسی) وتوویە؛ چونکە (تەجوید) بەتایبەتی هی قورئانەو، لە بناغەدا مەددە شایانی قورئانەو، بەمەرجێك مەعنا نەگۆڕێ شتێکی لائیقەو زیانی نییە، بەپێچەوانەی مەددەی غەیری قورئان وەك مەددە لە تەحیاتدا.

ئەگەر بەهۆی کۆکەوە یا بەهۆی گریانێ کە لەبەر غەڵبەی ترسی خودا نەبێ، دوو حەرف لە نوێژکەرەوە دەرکەوت ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە دەبێتەوە.

ئەگەر کۆکە یا شتی وەك کۆکە زۆر بوو و زاڵ بوو بە سەر نوێژکەردا و ئەو حەرفانە کە لەوەوە پەیدا دەبوون بەعورف و عادەت کەم بوون ئەوە زیانی نییە و نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە. بەڵام (ئەسنەوی) خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویە: ڕاست ئەوەیە کە بەهۆی کۆکەو پژمەو هاوچەشنی ئەمانەوە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە، با حەرفی زۆریشیان لێ پەیدا بێ، چونکە خۆپاراستن لەمانە لە تواناندا نییە.

هەروەها ئەگەر بەهۆی کۆکەوە نەیدەتوانی سوورەتی فاتیحە یا زیکرێکی واجیب بخوێنێ و، لەم حاڵەتەدا نوێژکەرەکە کۆکی هەتا قوڕگی بەر بێ و بتوانێ فاتیحە یا زیکرەکە بخوێنێ، ئەگەر ئەو حەرفانە کە لەوەوە پەیدا بوون کەم بوون، ئەوە مەعزوورەو نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام ئەگەر کەم نەبوون ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

«في التحفة: نعم بحث الاسنوی أستثناء الجهر بأذكار الانتقالات عند الحاجة إلى أسماع المأمومين، إی بأن تعذرت متابعهم له الا به أنتهی».ئەگەر ئیمام (ئحەئحە)ی کردو، دوو حەرفی لێوە پەیدابوو ئەوە واجیب نییە مەئمووم نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بهێنێ، چونکە لەوانەیە ئەو کۆکەی ئیمامە لەبەر عوزرێ بێ، بەڵێ ئەگەر نیشانەی ئەوە هەبوو کە بە بێ عوزر کۆکیوە، ئەوە واجبە لە سەر مەئموومەکە نییەتی جیابوونەوە بهێنێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر ئیمام لە فاتیحەدا لە سوورەتی پاش فاتیحەدا غەڵەتێکی کرد کە مەعنای دەگۆڕی ئەوە واجیب نییە مەئموومەکە گورج نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنێ بەڵکو چاوەڕێ بکات هەتا ئیمام دەگاتە حاڵی ئیعتیدال، ئەو کاتە ئەگەر ئیمام بیری کردەوەو غەڵەتەکەی چارکرد، واتە سەرلەنوێ دەستی بە خۆێندنەوەی کرد ئەوە تەواوە، ئەگەرنا

پێویسته نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنیّ. تەلەفوز بە یەك حەرف زیانی نییە، ئەگەر مەعنا بگەیەنی، وەکو (ق) لە زمانی عەرەبیدا بە واتای (بپارێزە)، یا وەك (ن=نە) لە کوردیدا، واتە: (نا).

نوێژ بەیەك کاری (فاحش)ی لە غەیری جینسی کاری نوێژ، چ عەمدی بیّ و، چ غەیرە عەمدی، بەتاڵ دەبێتەوە وەکو باز و هەڵمەت.

بەڵام ئەگەر بەعەمدی یا بەسەهوو کارێکی نافاحشی کرد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، مەگەرلە عورفدا ببیّ بە سیّ کاری یەك لەدوای یەك. خۆ ئەگەر عەمدەن سیّ کاری سووکی کرد، وەك جووڵاندنەوەی پەنجەکانی، بەبیّ جووڵاندنەوەی بەرو پشتی دەست، ئەوە زیانی نییە، مەگەر ئەو کارە سووکە لە ڕووی گاڵتەکردن و بیّ نرخ کردنی عیبادەتەکەوە بیّ، ئەوە بێگومان نوێژەکەی بەتاڵ دەکاتەوە. ئەگەر بە بیّ عوزر سیّ جار زمانی بەتەواوی لەدەمیدا جووڵاند، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و، ئەگەر دەستی یا پێی یا سەری یا پێڵووی چاوەکانی یا ئەژنۆی یا شەویلەکانی، کە دوو ئێسکی ئەم لاو ئەو لای دەمن، بە عەمدی سیّ جار لە سەر یەك جووڵاندنەوە بە بیّ عوزر ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

هەروەها ئەگەر سیّ جار لە سەر یەك تفی لە دەمی فڕیّ دا ، لەگەڵ جووڵاندنی دەمیدا دیسان نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. وە ئەگەر سیّ جار پەنجەکانی لەگەڵ بەرو پشتی دەستیدا جووڵاندەوە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، مەگەر لەکاتی لەش خوراندنی خۆیدا، کە بەبیّ ئەو خوراندنە ئارام نەگریّ، واتە: گیرۆدەی بیرۆ یا گەڕۆڵی بوویێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر عەمدەن لە ڕکووعدا یا لە ئیعتیدالدا یا لە سوجدەکاندا یا لە دانیشتنی نێوانیاندا تەرکی ئارامی و ئیتمینانی کرد، واتە: بەپەلە و بیّ ئارامگرتن بەجێی هێنان ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر لە نوێژی سوننەتدا تەرکی ئیعتیدالی کرد، یا تەرکی دانیشتنی نێوان سوجدەکانی کرد لەوێشدا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

براکان! ئەم کردەوە ناشیرینانە کە دەبن بە هۆی بەتاڵ بوونەوەی نوێژ هەمووی لەبەر بیّ خشووعیی نوێژکەرەکانە؛ تەماشا دەکەن کە لەکاتی نوێژکردندا، وەکو باڵندەیەك

بەنووك بە دانەی دانەوێڵەدا بدا، وەها سوجدە دەبەن، لەمە عەجایەبتر ئەوەیە كە مەئموم لەكاتی مەئموومیدا خۆی ناگرێ كە دوای ئیمامەكەی ڕكووع و سوجدە ببا، بەڵكو پێش ئیمامەكەی دەكەوێ، كەچی هەرچی بكات تا ئیمام سەلام نەداتەوە ناچارە لەگەڵیدا بمێنێتەوە!. ئەوەش بزانن كە لای كەمی ئیتمینان لە ڕكووع و ئیعتیدال و روكنی تردا ئەوەندەیە كە ئەندامی ئینسان لە جموجووڵ بكەوێ و ئارام ببێ، ئەگەرنا نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە.

پێویستە روكنی كورتی وەكو ئیعتیدال پاش ئەو زیكرەی بۆی دانراوەو تیایا دەخوێنرێ، لە ئەندازەی خوێندنی فاتیحەیەك زیاتر تێیدا نەمێنێتەوە، هەروەها لە دانیشتنی نێوان سوجدەكاندا زیاد لە ئەندازەی تەحییاتی واجیب درێژەی پێ نەدا، ئەگەر لەمانە زیاتر درێژەی پێ بدات ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە، مەگەر لە قنووتی نوێژی سبەینێدا، یا لە ئیعتیدال و دانیشتنی نێوان سوجدەكانی (صلاة التسبیح)دا، كە لەمانەدا درێژەپێدان زیانی نییە، هەروەها درێژەپێدانی ڕوكنی كورت، ئەگەر بەسەهوو یا بە لە بیرچوونەوە بێ، زیانی نییە و نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە بەڵام درێژەدان بە ڕوكنی درێژ ئەوە حوكمەكەی ئەمەیە: في التحفة، في مبحث مبالغة الامام في الانتظار:

«والا بأن كان لو وزع على جميع أفعال الصلاة لظهر له أثر محسوس في كل على أنفراده كره..»

بۆ نموونە: ئەگەر ئیمام لە ڕكووعدا بەقەدەر سەعاتێك مایەوەو خەریكی دوعا خوێندن بوو، ئەگەر ئەو سەعاتە بەش بكەینەوە بە سەر ئیعتیدال و دوو سوجدەكە و دانیشتنی نێوان سوجدەكاندا، هەریەكێك لەوانە چارەكێكی بەردەكەوێ، واتە: لەهەموو یەكێك لەوانەدا مانەوەی زۆر دەردەكەوێ، بێگومان چاوەڕوانیی وەها لەلایەن ئیمامەوە مەكرووهەو، فەزیلەتی جەماعەتەكە دەفەوتێنێ.

فی التحفە:

«وأما منفرد أحس بداخل یرید الاقتداء به فینتظره، ولو مع تطویل؛ أذا لیس ثمة من یتضرر به» انتهى.

هەروەها (ابن قاسم) دەفەرمووێ: دوور نییە بڵێین بۆ نوێژكەری بەتەنیا سوننەتە چاوەڕێی خەڵكی خارج بكا بۆ بەجێهێنانی جەماعەت، ئەگەرچی ببێ بەهۆی

درێژەپێدان، هەتا نوێژەکەی بەتەنیا نەکا، بەشکو یەکێك بێ و، نوێژەکەی لەگەڵدا بکا بەجەماعەت و، بگاتە پایەی جەماعەت.

ئەگەر نوێژکەر لە دانیشتنی بەینی سوجدەکاندا لەسەر هەیئەتی (تمکن) نووست ئەوە دەستنوێژەکەی ناشکێ و نوێژەکەی دروستە ئەگەر نووستنەکەی زیاتر لە ئەندازەی تەحییاتێك درێژە نەکێشێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ ئەم مەسەلەش پەنهانە.

هەروەها ئەگەر بەغافڵی بەلای چەپدا یا ڕاستدا خۆی هەڵسووڕاند بەجۆرێ کە سینەی لە قیبلە وەرگەڕا ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، جا هەر لە بەر ئیحتیات چاك وایە کە ئینسان لە کاتی هەستانەوە لە سەر هەردوو دەست ڕاست بێتەوە نەوەك سینەی لە قیبلە هەڵسووڕێ و نوێژەکەی بەتاڵ ببێتەوە.

ئەگەر چوو بە ڕکووعداو عەمدەن هەردوو ئەژنۆی خۆی چەماندەوە بەنەوعێك کە هەردوو سمتی چوون بەناودا هەتا بەری دەستەکانی گەیشتنە ئەژنۆکانی ئەوە ئەو ڕکووعەی بەتاڵە، چونکە پێویستە بەشێوەی عادەتی بەری دەست بە ئەژنۆ بگات لە ڕکووعدا، جا ئەگەر نەگەڕایەوە بۆ سەر شێوەی عادەتی ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. ئەم مەسەلەش لەوانەیە زۆر ڕوویدا. بەڵام ئەگەر ئەو وەزعەی بە سەهوو یا بە نەزانین بەسەردا هات ئەوە ئەگەر پێش ئەوەی بگات بە ڕکووعی ڕکاتی دوایی کەوتەوە بیری یا زانستی و، گەڕایەوە بۆ ڕکووع، ئەوا ئەو ڕکووعە بە ڕاستی بەجێ دێنێ و، لەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو دەکا. خۆ ئەگەر پاش گەیشتن بەو ڕکووعە ئاگادار بوو ئەوا پێویستە ئەم ڕکووعە بە ڕکووعی پێشوو دابنێ، واتە: ڕکاتێ زیادە بکات ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. بەڵام سوننەتە سوجدەی سەهوو بەرێ. ئەم مەسەلەش پەنهانە.

ئەگەر مێزەری سەری لە سەر تەوێڵی بوو و لە سەر ئەوە سوجدەی برد، واتە: بەعەمدی ئەو مێزەرەیە دوورنەخستەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. بەڵام ئەگەر عەمدی نەبوو، ئەوە ئەگەر لە پێش ئەوەدا کە سەر بەرز بکاتەوە خەبەردار بوو ئەوە واجیبە مێزەرەکە لە تەوێڵی دوور بخاتەوە، یا سەری بە لایەکدا ڕاکێشێ هەتا مێزەرەکە لە سەر تەوێڵی لادەچێ و، تەوێڵی بە ڕووتی دەنیشێتە سەر سوجدەگاکەی و ئارامیش کە شەرتی سوجدەکەیەتی جێبەجێ ببێ، ئەوسا سەری لە سوجدەگاکە بەرز بکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە زیادکردنی کارێك لە جینسی کارەکانی نوێژ بەعەمدی نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

فى التحفة مع المتن: «ولو فعل في صلاته غيرها اى غير أفعالها، ان كان المفعول من جنسها اي جنس أفعالها التي هي ركن فيها كزيادة ركوع أو سجود، وإن لم يطمئن فيه، ومنه أن ينحني الجالس إلى أن تحاذي جبهته ما أمام ركبتيه، ولو لتحصيل توركه أو أفتراشه المندوب، كما هو ظاهر؛ لان المبطل لا يغتفر للمندوب، بطلت، الا أن ينسى أو يجهل » أنتهى. خولاسەی کەلام: کردنی ڕوکنی زیاد، ئەگەرچی (طمأنینه)شی تێدا نەبێ، نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، مەگەر ئەو زیادەیە بۆ بەسەرگرتنەوەی ڕوکنێکی تەرك کراو بێ ئەوە زیانی نییە، وەکو ئەوە نوێژکەرێ لە کاتی ڕاوەستاندا بکەوێتە گومان: ئاخۆ لە ڕکاتی پێشوودا ڕکووعی بردووە یا نا؟ جا گورج ڕکووعی برد لەگەڵ ئارام گرتندا، ئەنجا لە ڕکووعەکەدا بۆی دەرکەوت کە لە کاتی خۆیا ڕکووعی بردووەو ئارامیشی گرتووە، ڕاوەستانەکەی ڕاوەستانی ئیعتیدال بووە لەگەڵ ئارامگرتندا، ئەوە دەبێ لەم ڕکووعە دووەمەدا نەگەڕێتەوە بۆ ئیعتیدال بەڵکو کوتوپڕ دانەوێتەوە بۆ سوجدە، ئەگەرنا ڕوکنێکی زیادەی بۆ پەیدا دەبێ، بەڵام ئەگەر نوێژەکەرەکە لەبیری چوو یا نەزان بوو دووبارە هەستایەوە بۆ ئیعتیدال و لەپاش ئیعتیدال دانەوییەوە بۆ سوجدە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە؛ چونکە ئەوەی شتی لەبیر دەچێ یا نەزانە عوزری ڕەوایە. ئەم مەسەلەیەش وردەو، لە هەرەمەی خەڵك شاراوەیە.

یاخۆ پاش بیرهاتنەوەکەی لەم ڕکووعە دووەمەدا هەستایەوە بۆ قیام لەبەر خاتری پەیڕەوی کردنی ئیمام، کە لە ئیعتیدالدا بوو، لەم کاتەشدا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. ئەم مەسەلەش پەنهانە.

دیارە لە عیبارەتی (من جنسها)ی توحفە و مەتنەکەی ئەوە وەردەگیرێ کە زیادکردنی سوننەتێك، وەك بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە غەیری شوێنی خۆیدا، نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، ئەمەش شتێکی ڕاستە هەروەکو لە شەرحی ئیرشاددا باس کراوە. هەروەها واجیبە نوێژکەر لە هەموو سوجدەیەکدا هەندێ لە تەوێڵی و هەردوو ئەژنۆی و هەندێ لە بەری هەردوو دەستی یا لەبەری پەنجەکانی هەردوو دەستی و، هەندێ لە بەری پەنجەکانی هەردوو پێی، با لە هەر دەستێکی بەری پەنجەیەك و لە هەر پێیەکی بەری پەنجەیەك بێ، لە جێگەی نوێژدا دابنێ، بەو مەرجە کە لەکاتی دانانی ئەو ئەندامانەدا ئارامگرتنی ئەندامەکان بێتەجێ جا ئەگەر بەعەمدی تەرکی ئارامگرتنی ئەندامەکانی کرد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر بەسەهوو بوو یا لەبەر نەزانینی حوکم بوو، ئەوە

ئەگەر لە پێش گەیشتنی بە هاوچەشنی ئەو ڕوکنەدا حوکمەکەی زانی یا کەوتەوە یادی ئەوا پێویستە کوتوپڕ بگەڕێتەوەو ئەو ئادابانە لەگەڵ ئارامگرتندا بەجێ بهێنێ، ئەگەرچی ماوەیەکی پێ چوو ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە.

بەڵام ئەگەر لەپاش گەیشتن بە هاوچەشنی ئەوانە ئاگادار بوو بەسەر کارەکەدا، یا لەپاش سەلامدانەوە و لەپێش درێژەکێشاندا ئەوا پێویستە هەستێ و یەك ڕکات نوێژ بکا، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. سەبەبی ئەمەش ئەوەیە کە ئەو ڕوکنانە بەوێنەی خۆیان لەپاشیانەوە پینە دەکرێن و، ئەو ڕکاتە کە ئەو ڕوکنە ناتەواوانەی تێدا بووە وەکو نەکراوی لێ دێ و، بەم ڕکاتە، کە لەدواییدا دەیکات پینە دەکرێ.

گەلێ جار ڕێك دەکەوێ هەندێ نوێژکەر، لەپاش سوجدەی یەکەم بەشێوەی (ئیفتیراش) دادەنیشن، ئەو شێوەی ئیفتراشە ناگۆڕن و سوجدەی دووەم دەبەن. لەم حاڵەتەدا هەر پەنجەی تاقە پێیەکیان دەنیشێتە سەر جێگەی نوێژەکەیان و، پێکەی تریان بەسەر جێگە نوێژەکەوە نییە، لەم شێوەیەدا سوجدەی دووەمی بەتاڵ دەبێ، جا ئەگەر لەپێش سەلامدانەوە بەم وەزعە نادروستەی زانی، یاخۆ پاش سەلامدانەوە، پێش ئەوەی زۆری پێ بچێ، پێی زانی ئەوە واجیبە ڕکاتێ نوێژ بکا، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. بەڵام ئەگەر پێش گەیشتن بە هاوچەشنی ئەو ڕوکنە پێی زانی ئەوا واجبە بگەڕێتەوە بۆ چاککردنی ئەو ڕوکنە لە سەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو بکا.

ئەوە کە لەپێشەوە عەرزم کردن کە دانانی بەری یەك پەنجە لە هەریەکێك لە دەست و پێی ڕاست و چەپ، کە دەکاتە چوار پەنجە، بەسە بۆ دروستیی سوجدەکان، ئەوە عەینی ڕاستی و دروستییە، وەکو لە جاشیەی (بجیرمی)لەسەر شەرحی مەنهەج لە سەر فەرموودەی (مصنف) نووسراوە:

«ویجب وضع جزء من رکبتیه ومن باطن کفیه واصابع قدمیه في السجود». لەحاشیەکەدا دەڵێ: (قوله) (وأصابع قدمیه) «إي باطنها ولو جزء من أصبع واحدة من کل رجل وید» أنتهی.

بەم جۆرە بۆم ڕوون کردنەوە کە فەرموودەی هەندێ لە زانا هاوچەرخەکان سەهووەو ڕاست نییە، کە دەفەرموون: «دانانی بەری هەموو پەنجەکانی دەست و پێ لەسەر جێگەی نوێژ لە هەردوو سوجدەکاندا واجیبە».

ئەگەر لەسەر جێگەیەکی زبر سوجدەی بردو، لەبەرئەوەی کەمتر ئەزیەتی ببێ لەپێش ئارامگرتندا سەری بەرز دەکردەوەو دەشیزانی ئەم کارە حەرامە، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە ئارامگرتنی تەرك کردووە کە مەرجی دروستبوونی سوجدەیە. هەروەها ئەگەر پاش ئارامگرتن سەری لەو شوێنە بەرز کردەوەو لە شوێنێکی تردا سوجدەی برد دیسان نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە کردنی ڕوکنی زیادە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر وەها ڕێ کەوت سوجدەی لە سەر دڕکوداڵ برد و ئازار بە سەری گەیشت و، لەپێش ئارامگرتندا سەری بەرز کردەوەو، لە شوێنێکی تردا سوجدەی برد و لەوێدا ئارامی گرت، ئەوە زیانی نییە و، ئەو سوجدە ناقسە پێشووە نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە. خۆ ئەگەر لە پاش ئارامگرتن سەری بەرز کردەوەو، لە شوێنێکی تردا سوجدەی برد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. لە سەر زانایان واجیبە ئەم ئەحکامانە بە خەڵکی هەرەمە بڵێن.

ئەگەر دوویشك دای بەنوێژکەرەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، چونکە هەرچەند زەهرەکەی پیسە، بەڵام چووەتە ناو لەشی نوێژکەرەکەوەو بەدەرەوە نییە. بەڵام ئەگەر مار پێوەی دا ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە زەهری مار هەندێکی دەچێتە نێو لەشەوەو، هەندێکی بە لەشی ئینسانەکەدا دەڕژێ لە دەرەوە، ئەو زەهرەیش پیسە. هەموو خاوەن زەهرێکی تریش کە زەهرەکەی بەدەرەوە بێ ئەو حوکمەی هەیە کە ئێستە باسمان کرد.

ئەگەر نوێژکەری (مسبوق) نییەتی نوێژی لە پشتی ئیمامێکەوە دابەست کە لە سوجدەی یەکەمدا بوو و لەگەڵ ئیمامدا ئەو سوجدەیە برد، پاش ئەوە لە دانیشتنی نێوان دوو سوجدەدا ئیمامەکە دەستنوێژی شکاو جەماعەتەکەی بەجێ هێشت، لەم حاڵەدا لە سەر ئەو مەئمومە مەسبووقە پێویستە کە سوجدەی دووەم تەرك بکات و، هەستێ بۆ ڕاوەستان و، لەو ڕاوەستانەوە نوێژەکەی تەواو بکات. خۆ ئەگەر ڕاست نەبوویەوە بۆ ڕاوەستان و سوجدەی دووەمی بردو دەشیزانی کە حەقی ئەوەی نییە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵێ ئەگەر نەزان بوو بە نادروستیی کارەکە یا لەبیری چوو بوو ئەوە عوزری ڕەوایە چونکە ئەم مەسەلە لە مەسەلە پەنهانەکانە.

ئەگەر لەنێو نوێژدا شتێکی خوارد یا خواردەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە هەرچەند ئەو شتەش کەم بێ، بەڵێ ئەگەر لەبیری چوو یا نەزان بوو، وەکو دەشتەکییەکی دوور لە زانایان یا تازە موسڵمان، ئەوە قەی ناکات ئەگەر ئەو خواردن و خواردنەوەیە کەم بوون.

ئەگەر شتێك لە بەینی دانەكانییا مایەوەو، لە كاتی نوێژدا ڕۆیشتە خوارەوە بە قورگییا، لەگەڵ ئەوەشدا كە دەیتوانی نەهێڵێ بچێتە خوارەوە بەڵام كەمتەرخەمی دەكرد، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە . هەروەها ئەگەر بەڵغەم هات و گەیشتە سنووری زاهیرو توانیی فڕێی بدا، بەڵام فڕێی نەداو قووتی دا، بەمەش نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە. هەروەها ئەگەر بەڵغەم لە قورگییا پارچە پارچە بوو، بە بێ كۆكەكۆك بۆی دەرنەدەكراو، لەو كۆكانەش دوو حەرف پەیدادەبوون، ئەوە واجیبە بكۆكێ و ئەو بەڵغەمە فڕێ بدا و، دەركەوتنی ئەو حەرفانە زیانی نییە.

بەڵێ مانەوەی تام یا لەزەتێ كە لە ئاساری خواردەمەنیی تاڵ یا شیرین بمێنێتەوە، وەلحال ئاوی دەمیان نەگۆڕیبێ، ئەوە زیانی نییە، بەڵام ئەگەر ئاوی دەمیان گۆڕیبێ، وەكو ئەو ئاسارەی كە لە خواردنەوەی قاوە یا چایی ڕەنگداری شیرین یا جگەرەكێشان لە دەما دەمێنێتەوەو ڕەنگ و تامی ئاوی دەم دەگۆڕێ ئەوە تا دەم نەشۆرێ نوێژی ئەو كەسە دروست نییە؛ چونكە مانەوەی ئەم تام و ڕەنگە دەلیلە لەسەرئەوەی كە عەینێك لەنێو دەمیا ماوەتەوە، كەوابوو چوونە خوارەوەی ئەو عەینە نوێژەكەی بەتاڵ دەكاتەوە.

ئەگەر مەئمووم بەعەمدی بەدوو ڕوكنی كاریی یەك لەدوای یەك لە ئیمامەكەی پێش كەوت و، دەشیزانی ئەم پێش كەوتنە حەرامە، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونكە ئەمە بە موخالەفەیەكی ناڕەوا دادەنرێ، ئەگەرچی یەكێك لەو ڕوكنانە كورت بێ وەكو ڕكووع و ئیعتیدال، یا هەردووكیان درێژ بن، وەكو قیام و ڕكووع یا وەكو سوجدەی دووەم و دانیشتنی تەحییاتی دوایی.

خۆ ئەگەر ئەم پێش كەوتنە بەسەهوو یا بە لەبیر چوونەوە، یا لەبەر نەزانینی حوكمی شەرعی بوو، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ نابێتەوە. بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی كە ئیمام پێی بگا لەم وەزعە هەڵەیە ئاگادار بوویەوە، ئەوە واجیبە دووبارە لەگەڵ ئیمامدا ئەو دوو ڕوكنە بگێڕێتەوە، ئەگەرنا نوێژەكەی بەتاڵە و، ئەگەر بەشێوەیەك لەو شێوانە لەگەڵ ئیمامدا نەیگەڕاندەوە، یا پاش ئەوەی كە ئیمام پێ گەیشت ئاگادار بوویەوە، ئەوە واجیبە لە پاش سەلامدانەوەی ئیمام یەك ڕكاتی تر بكا، ئەگەرنا نوێژەكەی بەتاڵەو، لە كۆمەڵی نوێژنەكەران حسێب دەكرێ. ئەم مەسەلانە هەموویان پەنهان و نادیارین.

ئەگەر بەعەمدی بە دوو ڕوكنی غەیرە فیعلی پێش ئیمام كەوت و، دەشیزانی ئەم كارە حەرامە ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ نابێتەوە، چونكە موخالەفەكەی كەمە، چ ئەو دوو ڕوكنە

قەولی بن وەك تەحییات و سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەر (د.خ) یا یەكێكیان قەولی و ئەویتریان فیعلی بێ، وەك خوێندنی فاتیحە ئەم گەیشتە ڕكووع، جا ئەگەر ئیمام بە مەئموومەكەی نەگەیشتەوە، ئەوە سوننەتە مەئموومەكە بگەڕێتەوە بۆلای ئیمام و دوا بەدوای بڕوا.

ئەگەر بەعەمدی بە یەك ڕوكن لە ئیمام پێش كەوت و، ئەو ڕوكنەش سەلامی یەكەم نەبوو، دیسان سوننەتە بگەڕێتەوە بۆ موتابەعەی ئیمام، بەڵام ئەگەر بەسەهوو بەم یەك ڕوكنە پێش كەوت، ئەوە ئارەزووی خۆیەتی: بگەڕێتەوە بۆ موتابەعەی ئیمام یا نەگەڕێتەوە، ئەم مەسەلانەش شاراوەن و كەم جار ڕوودەدەن.

براكان! بێجگە لەوەی كە بەعەمدی پێش كەوتن لە ئیمام كارێكی حەرامە لەوانەیە زیانی تریشی هەبێ، چونكە كە مەئموم لەپێش ئیمام سەری لە سوجدەی دووەم بەرز كردەوەو دانیشت بۆ ئیستراحەت، لەوانەیە ئیمام سەری لێ تێك بچێ و، لە دڵی خۆیدا وابزانێ كە نوێژ تەواو بووەو، ئەویش دابنیشێ، ئەگەرچی هێشتا ڕكاتێكیشی ماوە، هەروەها لەوانەیە مەئموومەكانی تریش وەكو ئەو مەئموومە پێش كەوتووە لە ئیمام پێش بكەون.

ئەگەر مەئموم بە بێ عوزر بە دوو ڕوكنی فیعلی؛ كورت یا درێژ، لە ئیمام دواكەوت ئەوە نوێژەكەی بەتاڵە.

نموونەی پاش كەوتنی مەئموم بە بێ عوزر وەكو ئەوە كە بۆ خوێندنی فاتیحە دوابكەوێ و، لەكاتی خۆیدا بەعەمدی وازی لە خوێندنی ئەو فاتیحەیە هێنابێ هەتا ئیمام گەیشتە ڕكووع. یا وەك پاش كەوتنی بەهۆی خوێندنی دوعای (ئیستیفتاح) و «اعوذ بالله... الخ» لەگەڵ ئەوەشدا بزانێ واجیبی ئەو، پاش (الله اكبر)ی نوێژدابەستن، تەنا خوێندنی فاتیحەیە. یا وەك پاش كەوتنی بۆ تەواوكردنی تەحییاتی یەكەم لە حاڵێكدا كە ئیمام هەمووی تەحییاتی خوێندبێ یا هەندێكی خوێندبێ و هەندێكی واز لێ هێنابێ. یا وەك پاش كەوتنی لەپێناوی خوێندنی تەحییاتی یەكەمدا لە حاڵێكدا كە ئیمام لە خوێندنی تەحییاتی یەكەم وازی هێنابێ؛ چونكە دواكەوتن لەم شێوەدا نوێژەكە بەتاڵ دەكاتەوە. ئەم مەسەلەش زۆر شاراوەیە.

كەوابێ لە حاڵەتێكدا مەئموم سوورەتی فاتیحەی تەرك كرد، كە ئیمام ڕۆیشت بۆ ڕكووع لە سەر مەسبووق فاتیحە بخوێنێ، جا ئەگەر لە ڕكووعدا گەیشت بە ئیمام و

لەشی ئارامی گرت ئەوە زۆر باشە، ئەگەرنا مەئمووم ئەو ڕکاتەی لە کیس  دەچێ و، لە سەر ئەم مەئموومە پێویستە یا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بهێنێ، یا لە پێش ئەوەدا کە ئیمام بۆ سوجدەی یەکەم دانەوێتەوە مەئمووم موتابەعەی بکا، واتە: بڕوات بۆ ئەو ڕوکنەی کە ئیمام خەریکیەتی، کە ئیعتیدالە، نەك بڕوات بۆ ڕکووع و ئەنجا بۆ ئیعتیدال و دوای ئەوە بۆ سوجدە، چونکە وەك وتمان پاش کەوتن لە ئیمام بە بێ عوزر بە دوو ڕوکنی فیعلیی یەك لە دوای یەك نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

ئەگەر ئەو مەئموومەی  کە باسمان کرد، هێشتا فاتیحەی تەواو نەکردبوو، ئیمام ویستی دانەوێ بۆ سوجدەی یەکەم،و ئەوە بێگومان واجیبە لە سەر ئەو مەئموومە یا دوای ئیمام بکەوێ و دانەوێ بۆ سوجدەی یەکەم، یا نییەتی لە ئیمام جیابوونەوە بێنێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. بەڵێ ئەگەر مەئمووم نەزان بوو یا لەبیری چوو ئەوە مەعزوورە، واتە پاش کەوتنەکەی نە مەکرووهەو نە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی کردوویەتی و خوێندوویەتی بەکارنایەت ، کەوابێ واجیبە لە پاش سەلامی ئیمام ڕاست بێتەوەو، هەرچی لە سەر ماوە بیکا، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. لەو بارەدا، کە مەئمووم بەهۆی تەحییاتی یەکەمەوە لە ئیمام دوادەکەوێ، پێویستە لە سەری لە پاش ڕکووع بردنی ئیمام بەقەدەر ئەوەی کە فەوتاوە لە فاتیحە بیخوێنێ، جا کاتێ کە فاتیحەی تەواوکرد، ئەگەر لە ڕکووعی سێیەمدا گەیشتەوە بەئیمام و ئارامی گرت ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر تا ئەم فاتیحەکەی تەواوکرد ئیمام ڕکووعی تەواو کردو گەیشتە باری (اعتدال) ئەوە لەسەر مەئموومەکە واجیبە یا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنێ و لە سەر تەرتیبی خۆی نوێژەکەی تەواو بکا، یا دوای ئیمام بکەوێ، واتە: ڕکووع نەبات و لە ئیعتیدالدا دوای ئیمام بکەوێ. هەروەها ئەگەر لەم بارەدا ڕکووعی بردو حوکمە شەرعییەکەی دەزانی و بەعەمدی کردی ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، خۆ ئەگەر لەبیری چوو یا حوکمی شەرعی نەدەزانی ئەوە مەعزوورە، واتە ئەو دواکەوتنەی نە مەکرووهەو نە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی کە کردوویەتی و خوێندوویەتی بە کارنایەت کەوابێ واجیبە لە پاش سەلامی ئیمام ڕکاتێکی تر نوێژ بکا، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و، ئەگەر فاتیحەی تەواو نەکردبوو و ئیمام ویستی دانەوێ بۆ سوجدەی یەکەم ئەوە واجبە گورج دوای ئیمام بکەوێ، یا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنێ و لە سەر تەرتیبی خۆی نوێژەکەی تەواو بکا، ئەگەر یەکێك لەم دوو شێوەیە بەجێ نەهێنا ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر ئیمام تەحییاتی یەکەمی تەرك کردو، مەئموومەکە بەعەمدی دواکەوت و، دەشیزانی کە ئەم پاشکەوتنەی حەرامەو، نەختێك لەپێش هەستانەوەی ئیمامدا نییەتی جیابوونەوەی لە ئیمام نەهێنا، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، ئەگەرچی ئیمام بۆ دانیشتنی حەسانەوە دانیشتبێ، چونکە ئەم دانیشتنە وەك دانیشتن وایە، چونکە دانیشتنی حەسانەوە لەو کاتەدا سوننەت نییە، هەتا بڵێین مەئموومەکە بەو دانیشتنە موتابەعەی ئیمامی کردووەو موخالەفەی نەکردووە.

بەڵام ئەگەر ئەو مەئموومە نەزان بوو یا لەبیری چووبوو ئەوە بە خاوەن عوزر حسێب دەکرێ، واتە: ئەو پاشکەوتنەی بۆ تەحییاتەکە مەکرووە نییە و نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام پێویستە لە پاش سەلامدانەوەی ئیمام ئەو مەئموومە ڕکاتێکی تر نوێژ بکا، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە.

هەروەها پاشکەوتنی مەئموم بەعەمدی بۆ خوێندنی سوورەت لە پاش فاتیحە، یا بۆ دانیشتنی حەسانەوە، وەکو پاشکەوتنی مەئمومە بۆ تەحییاتی یەکەم.

براکانم! کاتێ کە ئیمام وازی لە دانیشتنی حەسانەوە هێنا، یا مەئموم لەبەر پیری یا ناساغی لە هەستانەوەدا سست بوو، وەلحال ئیمام بەپەلە دەیخوێند لەم حاڵەتەدا دانیشتنی حەسانەوە بۆ مەئموم حەرامە. ئەم مەسەلەش پەنهان و شاراوەیە.

ئەگەر نوێژکەری مەئموم لەگەڵ عوزردا بە سێ ڕوکنی درێژ لە ئیمام دواکەوت ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە.

نموونەی عوزر، وەك ئەوە کە مەئموم بەتەبیعەت خوێندنەوەی سست بێ و ئیمامەکە لە خوێندندا سەریع بێ، نەك هەستانەوەی مەئموم سست بێ، چونکە ئەو کەسەی هەستانەوەی سستە وەکو مەسبووق وایەو، مەسبووق ئەگەر بە دوو ڕوکن پاش بکەوێ لە ئیمام نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەم مەسەلەش پەنهانە.

نموونەیەکی تری عوزر وەك ئەوە کە مەئموم چاوەڕوانی بێ دەنگ بوونی ئیمام بێ بۆ ئەوەی فاتیحەکەی بخوێنێ، کەچی ئیمام پاش تەواو کردنی خوێندنە ئاشکراکەی زوو ڕۆیشت بە ڕکووعداو، ماوەی ئەوە بۆ مەئموم نەمایەوە کە فاتیحەکەی بخوێنێ.

نموونەیەکی تر ئەوەیە کە نوێژکەر لەبەر بێ خشوعی یا لەبەر دووری لە ئیمام ئاگای لەوە نەبوو کە ئیمام فاتیحەی خوێندو، کاتێ پێی زانی کە ئیمام چوو بەڕکووعدا ، لێرەدا

له سەر ئەم مەئموومە پاشکەوتووە واجیبە دوای ئیمامەکەی بکەوێ لە ڕکووعدا ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، جا کە موتابەعەی ئیمامی کرد پێویستە لە پاش سەلامی ئیمام یەك ڕکاتی تر نوێژ بکات، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە.

ئەگەر نوێژکەر بەدوو ڕوکنی قەولی وەکو سەلەوات و سەلامی یەکەم یا بە ڕوکنێکی قەولی و ڕوکنێکی فیعلی وەکو فاتیحە و ڕکووع، لە ئیمام پاش کەوت، ئەوە با بەعەمدیش بێ، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

ئەگەر مەسبووقێك نوێژی دابەست و، ئیمام لە ڕکووعدا بوو، ڕکوعێك کە حیساب دەکراو زیادە نەبوو[1] گورج مەسبووقەکە چووە ڕکووعەوە، سەیر دەکەین ئەگەر مەئمووم لەگەڵ کەمترین ئارامگرتندا فریای ڕکووعی ئیمام کەوت ئەوا ئەو ڕکاتەی بۆ حسێب دەکرێ، تەنانەت ئەگەر ئارام گرتنەکەیشی لە کاتی بەرزبوونەوەی ئیمامدا بێ، بەڵام پێش ئەوەی ئیمام بگاتە کەمترین پلەی ڕکووع، ئەو ڕکاتەی بۆ حسێب دەکرێ، واتە: مادام هێشتا ئیمام ئەوەندە بەرز نەبووەتەوە کە بەکەمترین پلەی ڕکووع بکات ئەوە وەکو ئەوە وایە کە ئیمام هەر لەڕکووعدا بێ، بەڵام ئەگەر ئیمام ئەوەندە بەرز بوویەوە کە گەیشتە کەمترین پلەی ڕکووع، ئەوسا مەئموومەکە لە ڕکووعدا ئارامی گرت، ئەوە بەو ڕکاتە نەگەیشتووە.

ئەگەر مەئمووم ڕۆیشت بۆ ناو ڕیزی نوێژکەران بۆ نوێژ دابەستن بە جەماعەت و، هێشتا هەر لە ڕۆیشتندا بوو ڕانەوەستابوو، نییەتی هێناو (الله اکبر)ی کرد، ئەوە نوێژەکەی دانامەزرێ؛ چونکە مەرجی (الله اکبر)ی نوێژدابەستن ئەوەیە کە لە حاڵی وەستاندا بێ، ئەم مەسەلەش لە مەسبووقی نەزانی پەلە زۆر ڕوودەدا.

ئەگەر مەسبووقێك لە کاتی ڕاوەستانداو لە ناوەندی (الله اکبر)ی نوێژدابەستندا دەستی بە دانەوێن کردو، مەبەستی لە (الله اکبر)ەکە (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بوو و دوا دوایی (الله اکبر)ەکەی لە ڕاوەستانێکی تەواودا نەبوو، بەڵکو لە حاڵێکدا بوو کە لە ڕاوەستانەوە نزیکتر بوو تا کەمترین پلەی ڕکووع، ئەوە نوێژەکەی دادەمەزرێ.

جا لەم کاتەدا ئەگەر مەئمووم بەتەواوی ئارامی گرت لەگەڵ ڕکووعی ئیمامدا، لەپێش

---

(١) بەڵام ئەگەر ڕکووعەکەی حیساب نەدەکرا، چونکە موقارینی بێ دەستنوێژی ئیمام بوو، یا زیادە بوو، بە سەهو، ئەوە ڕکاتەکە بۆ مەئمووم حیساب ناکرێ.

ئەوەدا کە ئیمام لە کەمترین پلەی ڕکووع دەرچێت، ئەوە ئەو ڕکاتەشی بۆ حسێب دەکرێ، ئەگەرنا واجبە لە پاش سەلامی ئیمام زیاد لە ئیمام ڕکاتێك بکات. ئەم مەسئەلەیش شاراوەیەو زۆر جار ڕوودەدات.

ئەگەر ئیمام تەحییاتی یەکەمی دەخوێندو مەئمووم بەسەهوو ڕاست بوویەوە، ئەوە واجیبە لە سەری بگەڕێتەوە بۆ تەحییات و موتابەعەی ئیمام بکات ، خۆ ئەگەر بەعەمدی نەگەڕایەوەو دەشیزانی کە موتابەعەی ئیمام واجیبە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەرچی لە کاتی ڕاوەستانەکەدا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنێ؛ چونکە ئەو ڕاوەستانەی بێ سوودو پووچە و، نییەتی جیابوونەوە لەو ڕاوەستانەدا بێ سوودە. وە ئەگەر بەعەمدی لە تەحییاتی یەکەم هەستاو ئیمامی بەجێ هێشت و گەیشتە عاستی ڕاوەستان ئەوە واجب نییە بگەڕێتەوە بۆ لای ئیمام، بەڵکو سوننەتە، جا ئەگەر نەگەڕایەوە واجیبە چاوەڕێی هەستانەوەو ڕاوەستانی ئیمام بێ، واتە: لەگەڵ ئیمامدا، ڕکووع ببا، نەك لە پێش ئەودا، چونکە لەم حاڵەدا ڕکووع بردنی مەئمووم لەپێش ئیمامدا نوێژەکەی بەتاڵ دەکاتەوە، ئەم مەسەلەش زۆر شاراوەیە. ئەگەر ئەو مەئموومە، کە بەسەهوو لە تەحییاتدا ئیمامی بەجێ هێشت و ڕاست بووەوە، ئاگای لەوە نەبوو کە ئیمام لەبەر تەحییات دواکەوتووە هەتا ئیمام هەستایەوە بۆ ڕاوەستان، ئەوە بۆ مەئموومەکە دروست نییە بۆ خوێندنی تەحییاتەکە بگەڕێتەوە، چونکە بەهۆی ڕاست بوونەوەی ئیمام موتابەعەو دوابەدوا ڕۆیشتنی ئیمام لە تەحییاتدا بڕایەوەو، نوێژەکەی دروستە، بەڵام هەرشتێکی لە فاتیحە بەتەنیا خوێندەوە بۆی حسێب ناکرێ و، پێویستە لەگەڵ ئیمامدا دووبارەی بکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. خۆ ئەگەر نەیدەزانی کە واجیبە ئەو میقدارە فاتیحەیە دووبارە بکاتەوە، بەڵام لە کەسێکەوە تێ گەیشت، ئەوە پێویستە لەسەری لە پاش سەلامی ئیمام هەستێ و ڕکاتێ نوێژ بکا، ئەنجا سەلام بداتەوە.

ئەگەر ئیمامێ سەلامی دایەوە و، مەسبووق ویستی هەستێتە سەر پێ بۆ تەواوکردنی باقیمەندەی نوێژەکەی، با تەماشا بکا ئەگەر ئەو شوێنە شوێنی دانیشتنی مەسبووق بوو بۆ تەحییات، ئەوە سوننەتە لە کاتی هەستاندا (الله اکبر) بکات، خۆ ئەگەر جێی دانیشتنی نەبوو، ئەوە سوننەت نییە(الله اکبر) بکا و، ئەگەر کردی کەراهەتی تێدا نییە، چونکە هەندێ لە زانایان فەرموویانە سوننەتە (الله اکبر) بکا، هەتا ئازوگوێز کردنی لە ناوی خوا خاڵی نەبێ، جا لەم شێوەدا واجیبە لەسەری لە پاش سەلامی ئیمام گورج ڕاست بێتەوەو بۆ تەواو کردنی باقیمەندەی تەحییاتەکەی، ئەگەر مابووی، نەمێنێتەوە. خۆ

ئەگەر مایەوەو مانەوەکەی زیاتر لە ئەندازەی تەحییاتی واجیب بێ و، بەعەمدی بمێنێتەوەو بزانێ خراپە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. ئەم مەسەلەش پەنهان و پێی نەزانراوە.

في التحفة:«ويظهر أن المخل بالفورية هنا ما يزيد على قدر جلسة الاستراحه، وقد مر أن تطويلها المبطل يقدر بما يقدر به تطويل الجلوس بين السجدتين، وذلك لان قدرها عدوة تطويلا غير فاحش، وكذا يقال في كل محل قالوا فيه: يجب على المأموم القيام أو نحوه فورا، فضبط الفورية يتعين بما ذكرته، ثم رايته في المجموع صرح بذلك..» أنتهى.

ئەگەر ئیمام بەسەهو سوجدەی سەهووی تەرك كرد، بەڵام پێش ئەوەی زۆری پێی بچێ گەڕایەوە بۆ سوجدە سەهووەکەی، ئەوە لە سەر مەئمووم واجیبە ئەویش لەگەڵ ئیمامدا سوجدەی سەهوو ببات، ئەگەرنا نوێژی مەئموومەکە بەتاڵ دەبێتەوە، مادام بە یەقین نەزانێ کە ئیمام بەهەڵەدا ڕۆیشتووە، بەڵام ئەگەر پاش ئەوەی کە ئیمام سوجدەی سەهووی تەرك كرد مەئمووم بەعەمدی سەلامی دایەوە، ئەوە نوێژەکەی دروستەو، ئەگەر ئیمام گەڕایەوە بۆ سوجدەی سەهوو مەئموومەکە نەگەڕایەوە، ئەوە زیانی نییە؛ چونکە بەو سەلامدانەوە عەمدییە پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئیمامدا دەبڕێ و، وەك ئەوەیە کە نییەتی جیابوونەوەی لە ئیمام هێنابێ.

خۆ ئەگەر مەئمووم خۆی سوجدەی سەهووی برد و لە ئیمام دواکەوت، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، چ پێش گەڕانەوەی ئیمام بۆ سوجدی سەهوو سوجدەی سەهووی بردبێ یا پاش ئەوە؛ چونکە دواکەوتن بۆ بردنی سوجدەی سەهوو ئیقتیدا بە ئیمام دەپچڕێنێ و، نوێژەکەی بەتەنیا دروست دەبێ، ئەم مەسەلانەش شاراوەن.

ئەگەر ئەو مەئموومە، کە ئیمامەکەی سوجدەی سەهوو تەرك دەکات و لە پاشدا بۆی دەگەڕێتەوە، مەسبووق بوو و لە پاش سەلامی ئیمام هەستایەوە بۆ تەواوکردنی باقیمەندوی نوێژەکەی ئەوە واجیبە لە سەری ئەویش بگەڕێتەوە بۆ سوجدە سەهووەکەو، موتابەعەی ئیمام بکا، ئەگەرچی لە هەستانەوەکەشدا نییەتی جیابوونەوەی لە ئیمام هێنابێ؛ چونکە ئەو نییەتی جیابوونەوەی لە جێی خۆیدا نەهێناوە[1] کەوابێ ئەگەر نەگەڕێتەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. جا کە ئەم مەسبووقە بۆ موتابەعەی ئیمام گەڕایەوەو سوجدەی سەهووی برد لەسەری واجیبە پاش سەلامی ئیمام ڕاست بێتەوەو

(١) چونکە نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام وەختێك دەبێت کە ئیمام لە نوێژەکەدا بێ.

دووباره فاتیحەکەی بخوێنێتەوە، ئەگەرچی لە پێش گەڕانەوەی بۆ لای ئیمام هەندێکی لێ خوێندبێ؛ چونکە ئەو خوێندنە لە جێگەی خۆیدا نەبووەو بۆی حسێب ناکرێ، کەوابێ ئەگەر سەر لەنوێ دەست نەکاتەوە بە فاتیحە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو، ئەم مەسەلەش شاراوەو پێ نەزانراوە.

ئەگەر ئیمام ، پێش ئەوەی کە مەئمووم لای کەمی تەحییات بخوێنێ یا لەپاش ئەوە، سوجدەی سەهووی برد، ئەوە واجیبە لە سەر مەئمووم دوای ئیمامەکە بکەوێ و سوجدەی سەهووی لەگەڵ بەرێ، جا ئەگەر ئەو مەئموومە وەختی خۆی تەحییاتی تەواو نەکردبوو، ئەوا واجیبە لە سەری ئەو تەحییاتە تەواو بکات، واتە: پێویست نییە هەر لە ئەووەڵی تەحییاتەوە بیخوێنێتەوە، خۆ ئەگەر ئەو باقیمەندەیە نەخوێنێ ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە. دیارە ئەو سوجدەی سەهووە کە مەئموومەکە لە پێش تەواوکردنی تەحییاتەکەی لەگەڵ ئیمامدا بردوویەتی دروستەو کافییەو، پێویست نییە کە سوجدەی سەهوو بباتەوە؛ چونکە دانیشتنی تەحییاتی دوایی شوێنی سوجدەی سەهووەو، ئەمیش لەگەڵ ئیمامەکەدا لە جێگەی خۆیدا سوجدەی سەهووی بردووە. بەڵام ئەگەر نەکەوتە دوای ئیمام و موتابەعەی نەکردو جماو بوو، لە پاش تەحییاتی خۆی و دوعاکانی سوجدەی سەهووی برد، ئەوە بەهۆی دواکەوتنی لە ئیمام لە سوجدەی یەکەمی سەهوو دانەوینی ئیمام بۆ سوجدەی دووەمیان نوێژی مەئمووم بەتاڵ دەبێتەوە؛ چونکە مەئمووم بە بێ عوزر بە دوو ڕوکن لە ئیمام دواکەوتووە، ئەو دوو ڕوکنەش بریتین لە سوجدەی یەکەم و دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکان. ئەمانە ئەگەرچی لە ڕاستیدا ڕوکنی نوێژ نین، بەڵام (شێخی ابن حجر)، خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویەتی : بۆیە بە ڕوکن ناودەبرێن چونکە لە سەر مەئمووم واجیبە موتابەعەی ئیمام بکا لە دوو سوجدەی سەهوو دانیشتنی ناوەینیاندا، کەواتە ئەم دووانە ڕوکنن و دواکەوتنی مەئمووم لە ئیمام بە دوو ڕوکن و بێ عوزر نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. ئەم مەسەلەشە زۆر پەنهانە و گەلێ جاریش ڕوودەدا.

ئەگەر مەسبووقێ گومانی برد کە ئیمام سەلامی داوەتەوە؛ بۆیە هەستا بۆ بەجێهێنانی باقیمەندەی نوێژەکەی و، کە گەیشتە وەزعی ڕاست بوونەوە تێ گەیشت کە لەو کاتەدا ئەم هەستاوە ئیمام سەلامی نەداوەتەوە، لێرەدا واجیبە گورج بگەڕێتەوە بۆ دانیشتنی تەحییات، چ ئیمام لەو کاتەدا سەلامی دابێتەوە یانا، چونکە بائەم مەسبووقە لە کاتی هەستانەکەیدا نییەتی جیابوونەوەی لە ئیمام هێنابێ، مادام هەستانەوەکەی ناڕەواو بێ

جیّ بووه نییەتی جیابوونەوەیشی بیّ سوودە، چونکە دەبووا لە پێش ڕاست بوونەوەو ڕاوەستاندا نییەتی جیابوونەوەی بهێنایە. جا هەرکاتیّ ئەم مەسبووقە لە دانیشتنەکە بوویەوەو، هەستایەوەو ڕاوەستا ئەوا لە سەری واجیبە هەرچی لە ڕاوەستانە پێشووەکەیدا خوێندوویە دووبارەی بکاتەوە، چونکە خوێندنە پێشووەکە بیّ سوود بووە و جێگەی خۆی نەبووە، واتە: ئەگەر دووبارەی نەکردووە، بۆ نموونە: ئەوسا تا نیوەی سوورەتی فاتیحەی خوێندبیّ و ئێستەش نیوەکەی تری بخوێنیّ و نوێژەکەی تەواو بکا، ئەو نوێژەکەی بەتاڵە. وەهەر کاتیّ گەڕایەوە بۆ دانیشتن و، هێشتا ئیمام سەلامی نەدابووەوە، ئەوە ئەم مەسبووقە ئارەزووی خۆیەتی کە یەکیّ لە دوو شت بکا: یەکەم لە دانیشتندا بمێنێتەوە، تا ئیمام سەلام دەداتەوە، ئەوسا هەستیّ بۆ تەداروکی باقیی نوێژەکەی ، دووەم ئەمەیە کە دابنیشیّ و ئارام بگریّ ئەوسا نییەتی جیابوونەوە بێنیّ و، بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی خۆی هەستێتەوە. و ئەگەر ئەو مەسبووقە بە عەمدی لە ڕاوەستانەوە نەگەڕێتەوە بۆ دانیشتن و بیشزانیّ کە نەگەڕانەوەکەی خراپە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و، ئەگەر نەزان بوو یا لەبیری چووبوو، بەڵام لە پێش سەلامدانەوەی ئیمام ئاگادار بوویەوە کە موتابەعەی ئیمام واجیبە، ئەوە پێویستە لە سەری کە بگەڕێتەوە بۆ دانیشتن لەگەڵ ئیمامداو، هەرچی لە ڕاوەستاندا کردوویەتی هەمووی بیّ سوودە، جا کە دانیشت کەیفی خۆیەتی یا لەگەڵ ئیمامدا دەمێنێتەوە هەتا سەلام دەداتەوەو ئەنجا هەستیّ بۆ تەواوکردنی باقیی نوێژەکەی، یاخود نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنیّ و هەستێتەوە بۆ تەداروکی باقیی نوێژەکەی، خۆ ئەگەر پاش زانینی حاڵ نەگەڕایەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، جا لە حاڵی گەڕانەوەیدا بۆ لای ئیمام سوننەت نییە خۆی لە پایانی نوێژەکەیدا سوجدەی سەهوو ببا؛ چونکە ئیمام لەباتی ئەو هەڵی گرتووە.

خۆ ئەگەر تا ئیمام سەلامی نەدایەوە مەئموومەکە بەوەی نەزانی کە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ دانیشتن، ئەوە ئیتر دروست نییە بگەڕێتەوە؛ چونکە بەهۆی سەلامدانەوەی ئیمامەوە موتابەعە نەما، بەڵام هەرچی لە پێش سەلامدانەوەی ئیمام و لە پاش هەستانەوە خۆی کردوویەتی هەمووی پووچ و بیّ سوودە؛ چونکە لە جێگەی خۆیدا نەبووەو دەبیّ بیانکاتەوە، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە، ئەم مەسەلە شاراوەیەو کەم ڕوودەدا.

ئەگەر مەئموم گومانی وابوو کە ئیمام سەری لە سوجدە بەرز کردوەتەوە، بۆیە ئەویش سەری بەرز کردەوە، یا بە سەهوو لە پێش ئیمامدا ڕکووعی برد، ئەوە موخەییەرە

لەنێوان  دوو شتدا: یا بگەڕێتەوە بۆ لای ئیمام، یا هەر لەو حاڵەی خۆیدا بمێنێتەوە تا ئیمام پێی دەگا، چونکە ئەم پێشکەوتنەی فاحیش نییە.

ئەگەر مەئمووم لە پێش ئیمامدا سەری لە سوجدەی یەکەم بەرزکردەوە؛ چونکە گومانی وابوو کە ئیمام سەری بەرز کردووەتەوەو، لە هەمان کاتدا ڕۆیشت بۆ سوجدەی دووەم؛ چونکە گومانی وابوو ئیمام لە سوجدەی دووەم دایە، کەچی لە ناوەندی سوجدەکەدا بۆی دەرکەوت کە ئیمام هێشتا لە سوجدەی یەکەمدایە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام دانیشتنی نێوان دوو سوجدەو سوجدەی دووەمی بۆ حسێب ناکرێ؛ چونکە ئەگەر چی موخالەفەکەی فاحیش نییە، بەڵام فەحشی تری تێدایە ئەوەش ئەوەیە کە بە ڕوکنێك و هەندێ لە ڕوکنێکی تر لە ئیمام پێش کەوتووە، بەپێچەوانەی مەسەلەی ڕکووع و سوجدەکە کە لە پێشەوە وتمان؛ کەوابێ واجیبە موتابەعەی ئیمام بکات و بگەڕێتەوە بۆ دانیشتنی نێوان دوو سوجدە و لەگەڵ  ئیمامدا سوجدەی دووەم ببا. وە هەر کاتێك مەئمووم گەڕایەوە بۆ دانیشتنی نێوان دوو سوجدەو، هێشتا ئیمام لە سوجدەی یەکەمدا بوو، واجیبە لەسەری یا موتابەعەی ئیمام بکا و بگەڕێتەوە بۆ سوجدەی یەکەم، یاخۆ بە دانیشتوویی بمێنێتەوە تا ئیمام سەر لە سوجدەی یەکەم بەرز دەکاتەوە، ئەنجا سوجدەی دووەم لەگەڵیدا ببا. وەئەگەر مەئمووم لە دانیشتنی نێوان سوجدەکاندا مایەوەو، ئیمام سەری لە سوجدەی یەکەم بەرز نەکردەوەو ئەم چوو بۆ سوجدەی دووەم، یاخۆ هەر نەمایەوەو خۆی ڕۆیشت بۆ سوجدەی دووەم، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە بە بێ عوزر بە دوو ڕوکن پێش ئیمام کەوتووە کە بریتین لە دانیشتنی نێوان سوجدەکان و سوجدەی دووەم.

وە ئەگەر حاڵی ئیمام بۆ مەئمووم دەرنەکەوت هەتا وەختێ ڕاست بوویەوە بۆ قیام یاخۆ هەتا ئیمام بە دانیشتنی نێوان سوجدەکان گەیشت، ئەوە موتابەعەی ئیمام واجیبە و، لە شێوەی  یەکەمدا، بێجگە موتابەعە، لە سەری واجیبە پاش سەلامی ئیمام یەك ڕکاتی تر نوێژ بکا، واتە: ئەگەر موتابەعەی ئیمامی نەکرد، یا موتابەعەی کرد بەڵام ئەو  ڕکاتە نوێژەی نەکرد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. ئەم مەسەلانە نادیارین و بە دەگمەن ڕوودەدەن.

ئەگەر مەئمووم لە کاتی سەهووی ئیمامدا (الله اکبر) یا (سبحان الله) یا زیکرێکی تری بە دەنگی بەرز وت، لەو زیکرانەی کە لە نوێژدا ڕەوان و، مەبەستیشی تەنیا ئاگادار بوونەوەی ئیمام بوو، یا هیچ مەبەستی نەبوو، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام

ئەگەر مەبەستی تەنیا زیکری خوا یا زیکرو ئاگادار کردنەوەی ئیمام بوو، ئەوە زیانی نییە و نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵێ لە سەر ئەو مەئموومە واجیبە، کە ئیمام ئاگادار دەکاتەوە لە سەهوویەك، یا لە کاتی لێ تێك چوونیدا دەیەوێ بیخاتەوە سەر ڕێ، قەستی زیکر یا قەستی زیکرو ئاگادار کردنەوەی لەگەڵ هەموو لەفزی (الله اکبر) یا (سبحان الله)دا بەرابەری و هاوڕێیەتی بکا، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەم مەسەلەش زۆر شاراوەیە و زۆر جاریش ڕوودەدا و، لە سەر زانا وریاکانی ئاین پێویستە کە مەئموومەکان لەم باسە حاڵی بکەن و تێیان بگەیەنن.

ئەگەر نوێژکەرێ لەبەر هۆیەکی وەك نەخۆشی نەیدەتوانی ڕاوەستێ و، بە دانیشتنەوە ڕکاتێ نوێژی کردو، پاش ئەوە مانیعەکەی نەما، واجیبە لە سەری بۆ باقیی نوێژەکەی ڕاست بێتەوە. شایانی باسە ئەگەر بە کرێ یەکێکی دەست دەکەوت دەستی پێوە بگرێ و ڕاوەستێت واجیب نییە لە سەری بەکرێی بگرێ و، حوکمەکەی هەر ئەوەیە کە وتمان. خۆ ئەگەر ئەو نوێژکەرەی باسمان کرد هەر بە دانیشتنەوە ئەو نوێژەی تەواوکردو نەیدەزانی هەستانەوە واجیبە، ئەوە نوێژەکەی دروستە، چونکە ئەم مەسەلە لە وردە بابەتەکانی ئایینەو، خەڵکی هەرەمە ڕێی پێ نابەن و لێیان ناگیرێ. بەڵام ئەگەر دەیزانی کە هەستانەوە واجیبەو، بە دەسەنقەست هەڵنەستایەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر لە ناوەندی نوێژکردندا پیسییەکی وشك کەوت بەسەر نوێژکەرەکەداو، نوێژکەرەکەیش گورج، بەهۆی جووڵاندنەوەی جلوبەرگییەوە، پیسییەکەی لە خۆی دوور خستەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام ئەگەر بەدەستی خۆی ئەو پیسییەی هەڵگرت و فڕێی دا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

فی الحلبي: «وافتی والد شیخنا فیما لو صلی علی ثوب متنجس الاسفل، ورجله مبتله، ثم رفعها فارتفع معها الثوب لالتصاقه بها، أنه أنفصل عن رجله فوراً، ولو بتحریکها ، صحت صلاته، والا بطلت. أنتهی» ئەم مەسەلە پەنهانەو زۆر ڕوودەدا.

ئەگەر لەش یا پۆشاکی نوێژکەر، بۆ نموونە، بە قوڕی کۆڵانی، پیس پیس بوو ئەوە عەفو لەو ئەندازە پیسییە دەدرێ کە خۆ لێ پاراستنی گران بێ، بەمەرجێ ئەو نوێژکەرە مرۆڤێکی خاوەن موبالات بێ. دیارە زۆریی ئەو قوڕە پیسەش دەگاتە ئەندازەیەك کە خەڵك بڵێن: فلان کەس کەوتووەتە ناو قوڕەوە.

پێویستە ئەوەش بزانن کە ئەم عەفووە بەپێی کات و شوێن و ئەندامی لەشی ئینسان

دمگۆڕێ، بۆ نموومە: عەفوو لە وەرزی زستاندا و لە پیس بوونی پێدا زۆرترە لە عەفووی وەرزی هاوین و پیس بوونی سەرپێچ. «فی الشبراملسي: ولا فرق في ذلك بين ان يستعمل الناس لباس الشتاء في زمنه أو زمن الصيف؛ لأنه لا يكلف غسله.. أنتهى» واتە: بەو مەرجەی ئەو پۆشاکە بۆ ئینسان پێویست بێ؛ چونکە پۆشاکێ کە لەکاتی ساردیی هەوادا پێویست بێ لە هاویندا پێویست نابێ.

في التحفة:« ومنه يؤخذ أن ما يتخلل خياطة الثوب من نحو الصبان، وهو بيض القمل، يعفى عنه و أن فرضت حياته ثم موته، وهو ظاهر لعموم الابتلاء مع مشقة شق الخياطة لاخرابه .. أنتهى .يعني: لاسيما في صورة مشقة... الخ. ئامل[1] ئەگەر سوارێ لە سەرەتای نوێژەکەیەوە لەغاوی ولاخێکی گرت کە دەمی یا شوێنێکی تری پیس بوو، یا خۆ منداڵێ کە پۆشاکی یا لەشی پیس بێ دەستی بە داوێنیەوە گرت، ئەوە لەم دوو شێوەدا نوێژەکەی دانامەزرێ؛ چونکە لە شێوەی یەکەمدا ئەم ولاخە بە ڕاکێشانی نوێژکەرەکە ڕادەکێشرێ و، لە شێوەی دووەمدا نوێژکەرەکە هەڵگری بەرگی خۆیەتی کە لکاوە بەدەستی منداڵە پیسەکەوەو ، وەك ئەوەیە کە خۆی هەڵگری پیسییەکە بێ.

قال الشيخ أبن حجر في التحفة: « ولو أمسك لجام دابته في الصلاة، وبها نجاسة، ضر، فليتنبه له .. أنتهى » وقال الشيخ نور الدين المصري : و هذه المسألة مما تعم به البلوى وتقع للناس كثيراً فيأتي الانسان بولده معه في المسجد ثم يحرم بالصلاة، فيأتي ولده ويمسك ثوب أبيه، والولد غير مستنج بالماء، فينبغي التفطن لهذه المسألة» أنتهى.. شێوەی گرتنی لە غاوە کە دوو جۆرە: یەکەمیان ئەوەیە نوێژکەرەکە سوار بێ، ئەمەیان شاراوەیەو کەم ڕوو دەدا. دووەمیان ئەوەیە لەولاغەکە دابەزیبێ و لەغاوەکەی بگرێ و نوێژ بکا، ئەم شێوەیە لەگەڵ شێوەی هێنانی منداڵەکەدا شاراوەیەو زۆر ڕوو دەدا، بەڵام ئەگەر لەغاوەکە بخاتە ژێر پێی و، نوێژ بکا بەسەریەوە، ئەوە زیانی نییە؛ چونکە هەرچەند پێی نوێژکەرەکە بەسەر سەرێکی لەغاوەکەوەیەو، ئەویش بە شتێکی پیسەوە پەیوەندە، بەڵام خۆی هەڵگری شتی پیس نییە و، نوێژەکەی لەو نوێژە دەچێت لەسەر ڕایەخێك بکرێ کە لەسەر شتێکی پیسی وشك ڕاخرابێ، ئەمەش نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

ئەگەر یەکێك لە نوێژا بوو یەکێکیش دەستی پیس بوو یا کەوشی پیسی بەدەستەوە بوو،

---

(١) مەبەستی شێخ ئەوەیە کە تەنیا زۆر تووشبوونەکە بەسە بۆ عەفوو لێ کردنی، بێ گوێدان بە گرانیی دڕینی دروومانەکە.

ئەو دەستە پیسە یا ئەو کەوشە پیسە کەوتە سەر ئەو نوێژکەرەو بەقەدەر هەناسەیەك مایەوە، واتە: قورسیی دەستی کابرا یا کەوشەکەی کەوتە سەر نوێژکەرەکە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە نوێژکەرەکە دەبێتە هەڵگری شتی پیس.

في شرح العباب: «ولو مس نجسا بجانبه، فأن علم حالا فتنحى لم تبطل، والا بطلت أنتهى...»

بەڵام ئەگەر یەکێك پۆشاکەکەی پیس بوو، بە پیسییەکی وەها کە بۆ خۆی عەفوی لێ درابوو و پۆشاکەکەی کەوتە سەر ئینسانێکی نوێژکەر ماوەی هەناسەیەك یا کەمێك لەوە زیاتر، ئەوە زیانی نییە.

في شرح العباب: ويكره السجود على ذيل غيره أو طرف عمامته. أنتهى.

شایانی زانینە ئەم مەسەلانە شاراوەن و، بەسەر گەلێ لە خوێندەواراندا تێ دەپەڕن، چ جایێ خەڵکی هەرەمە، بۆیە لەسەر ئەو کەسە پێویستە کە دەیانزانێ خەڵکی نەزان ئاگادار بکا لێیان و تێیان بگەیەنێ. ئەگەر یەکێك لە خانوویەکدا نوێژی دەکرد کە بانەکەی پیس بوو، ئەوە زیانی نییە چ سەری نوێژکەرەکە بدات لە بن میچی خانووەکە یا نا، هەروەها ئەگەر بن میچەکەی پیس بوو بەڵام سەری نوێژکەرەکە لەو بن میچەی نەدەدا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. بەڵێ ئەگەر سەری دەیددا لەو بن میچە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر هەندێ لە پۆشاکی پیس بوو، بەڵام مەعلووم نەبوو ئەو شوێنە کوێیە، ئەوە هەرکەس ئەو پۆشاکە بکاتە بەرو نوێژی پێوە بکا نوێژەکەی بەتاڵە، وە ئەگەر نوێژی لەسەر بکا هەندێ لە زانایان فەرموویانە نوێژەکەی دروستە. قال الشبراملسي: والمتجه أنه حيث أحرام خارجه ثم مسه أو أكمل الصلاة عليه صحتها للشك في المبطل بعد الانعقاد . أنتهى.

ئەگەر یەکێك دەست بەو پۆشاکەوە بدا کە بەشێکی نادیاری پیسە، ئەوە دەستی پیس نابێ، چونکە شوێنی پیسییەکە نادیارو نەزانراوە ئەم دوو مەسەلەش نائاشکران و ڕوودەدەن.

ئەگەر یەکێك پۆشاکی بە خوێنی کێچ خوێناوی بووبوو، هەرچەند دەیشۆری ڕەنگی خوێنەکەی پێوە دەما، ئەوە زیانی نییە ئەگەر هەر تەنیا ڕەنگەکەی مابێ، بەڵام ئەگەر ڕەنگ و تامیشی مابوو، ئەوە زیانی هەیە.

ئەگەر پیسییەکی عەفو لێنەدراو کەوتە سەر پیسییەکی عەفوولێدراو، ئەوە عەفوە پێشووەکە نامێنێ و، واجیبە ئەو پۆشاکە باش بشۆرێ هەتا ئاساری ئەو دوو پیسییە لادەچێن.

ئەگەر کەسێ دمەڵی لێ دەرهاتبوو، دەرمانی دمەڵەکەی کردبوو، لەش و پۆشاکی بەخوێنەوە تلان، ئەوە لە کەمیی ئەو خوێنە عەفوو دەدرێ نەك لە زۆری هەروەها ئەگەر ئەو دمەڵەی بەدەرزی تەقاندو خوێن و کێمی لێ دەرچوو هەر لە کەمێ لە خوێنی ئەو شوێنە عەفوو دەدرێ.

ئەگەر یەکێ لەشی بریندار بوو و خوێنی ئەو برینانە دایان لە لەشی یا لە پۆشاکی ئەوە لە کەم و زۆریی عەفوو دەدرێ، چ لەسەر لەشە بریندارەکەو چ لەو پۆشاکەی کە لەو برینە دەدا، بەو شەرتە ئەوەندە زۆر نەبووبێ کە لە بەرامبەرەکەی تێ پەڕێ، بۆ نموونە: ئەگەر برینەکە بەقەدەر درهەمێك بێ و لە پۆشاکەکەیشی بەقەدەر درهەمێك خوێناوی بووبێ نەك لەوە زیاتر.

هەروەها ئەگەر دمەڵەکە خۆی کرابووەوە ئەوە لە کەموزۆریی خوێن و کێم زەرداوی عەفوو دەدرێ، بەمەرجێك کە بریندارەکە پاش کرانەوەی برینەکە خۆی نەیگوشێ و، لە شوێنی خۆی تەجاوزی نەکردبێ و، بەرامبەرەکەیشی هەر بە قەدەر برینەکەی پیس بووبێ.

ئەگەر کونی دمەڵەکە دیاربوو واجیبە لە خۆشۆردندا ئاو بڕواتە ناو ئەو کونەوە، بەڵام ئەگەر ترسی ئەوەی بوو ئاودز و هەو بکا ئەوە پێویستە تیمم بکات لەباتی دەستنوێژ.

وە ئەگەر خوێن و پێست وشك بوویەوە بەسەر کونی برینەکەدا واجیب نییە، هەڵیان بکەنێ، تەنها واجیبە ئەوەی بەدەرەوەیە بیشۆرێ. ئەمەش تا چاك بوونەوەی برینەکە.

هەروەها لە خوێنی کێچ و گوومێش و وێنەی ئەمانە وەك ئاوی بلۆقی دەست و پێ، کە لە ئیشکردنەوە یا لە ڕێگە و ڕۆیشتنەوە پەیدا بووبن، عەفوو دراوە. هەروەك عەفوو دراوە لە ئاوی هەندێ برین کە لە ئەندامەکانی لەشدا پەیدا دەبن، مادام تێکەڵ نەبێ لەگەڵ شتێکی بێگانە وەك خوێنێك کە لەم برینانە دەرچێ. هەروەها عەفوودراوە لە پیسبوونی پۆشاك واتە: پیسبوونی ئەو شوێنەی کە بەرامبەری برینەکەیەو بە لێکەوتنی برینەکە پیس دەبێت. نەك لە پۆشاکێك کە بە بێ پێویستی لەو برینە بکەوێ و پیس ببێ. هەروەها

یەکێك بێ پۆشاکێك لەبەر بکات کە بە خوێنی برینی بێگانە پیس بووبێ و نوێژی پێوە بکا، ئەوە لە کەمیی عەفوو دەدرێ نەك لە زۆریی.

ئەم عەفووە کە باسمان کرد تەنیا بۆ نوێژە نەك بۆ شتی تر، بۆ نموونە: پۆشاکێکی بە خوێنی کێچ پیس بوو، ئەگەر بکەوێتە نێو ئاو یا خواردەمەنی ئەوە پیسی دەکات، هەروەها ئاوێك ئەو خوێنەی تێ کەوتبێ و کەمتر بێ لە (قلتین) دروست نییە، دەستنوێژی پێ بگیرێ یا دەم و چاوی پێ بشۆردرێ یا سەری پێ بخووسێنرێ بۆ تاشین.

وفي البجيرمي: « ويعفى عن دم الحلاقة المختلط بماء البلة الاولى دون الثانية لطروه عليه. أنتهى» جا ئەگەر چی لە تەرکردنی دووەمی کاتی تاشیندا، کە زۆر ڕوودەدات، چاودێریی کردنی پاکیی ئاوەکە شتێکی پێویستە، من نەمدیوە کەس گوێی بداتێ و، ئاگادارکردنەوەی خەڵك لەسەر ئەمە واجبە.

واجیبە بزانن کە عەورەتی پیاوی (حر) و (عبد) و (جاریە) ئەگەرچی (مبعضە) یا (مکاتبە) یا (ام الولد) بێ، مابەینی ناوك و ئەژنۆیەتی، لەم ڕووەوە پێویستە بەشێك لە ناوك و بەشێك لە ئەژنۆیشی بخاتە سەر بۆ ئیحتیاط؛ چونکە هەر شتێ تەواو بوونی واجیبی لەسەر ڕاوەستابێ ئەویش واجیب دەبێ.

بەڵام عەورەتی ئافرەتی (حر) هەموو ئەندامیەتی، بێجگە دەم و چاو و هەردوو دەستی تا جومگەی مابەینی دەست و بازووی.

وفي شرح العباب :« ويجب ستر جزء منها كما بحثه الاذرعي نظير ما مر في السره و الركبة» کەوابوو ئەگەر کەمێ لە عەورەتی پیاو یا ژن دەرکەوت لە نوێژداو، گورج دای نەپۆشی ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، تەنانەت ئەگەر تاڵەموویەك یا بەقەدەر تاڵەموویەك لە عەورەتیان دەرکەوت لە لیباسێکی ناسکی وەهاوە کە ئەوشتانەی لێ دەرکەوێ یا لە پۆشاکی دڕاوەوە دەرکەوت و گورج دای نەپۆشن ئەوە نوێژەکەیان بەتاڵە، تەنانەت ئەگەر لە ناو کونێکەوە لە شوێنی دڕاوی کراسەوە یا لەژێر کراسەوە بەقەدەر موویەك لە مووەکانی عەورەت دەرکەوێ و، گورج دای نەپۆشێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. پۆشاکێ بەتەواوی قەوارەی عەورەت بنوێنێ، واتە: ئەندازەی گەورەیی و بچووکیی ڕان و ئەندامەکانی تر دەربخا، لەبەر کردنی حەرامە و، ئیمامی ئەزروعی (ر.خ) وای پەسەند کردووە کە نوێژ لە پۆشاکی وەهادا، کە باسمان کرد، دروست نییە و بەتاڵەو، پۆشینی

پۆشاکی وەها هۆی سەرزەنشتە لە قیامەتدا و هۆی بێ شەرمی و بێ ئەدەبییە لە دنیادا؛ حەزرەت (د.خ) فەرموویە: «الحیاء من الایمان» واتە: شەرم کردن بەشێکە لە باوەڕو لە ئاین و، لە شەهامەتی نوێژکەرەوە دوورە کە پۆشاکی ئەوەندە تەنگ بێ کە بەتەماشا کردنی ئەو پۆشاکە وەزعی ئەندامی ئینسان دەرکەوێ و، ئامۆژگاریی ئەو خوێنەوارانە دەکەم کە کردوویانە بەعادەت کراسی کورت لەبەر کەن و پێیان دەڵێم: لەکاتی ڕکووع و سجووددا، بێجگە لە دەرکەوتنی قەوارەی ئەندامیان، خودی عەورەتیشیان دەردەکەوێ.

هەروەها برادەرە دەوڵەمەندەکان ئامۆژگاری دەکەم کە خێزانەکانیان کراسی کەتان و جلی ناسکی وەها لەبەر دەکەن کە ئەوەندە تەنکە ڕەنگی لەشی خاوەنەکەیان دەردەخەن، واتە: ئەگەر یەکێ تەماشایان بکا دەزانێ ڕەنگیان سپییە یا سوورە، ئەو ئافرەتانە ئەگەر لەژێر ئەو پۆشاکە ناسکەوە شتی تریان لەبەر نەبێ نوێژەکەیان بەتاڵە. بێگومان مایەی خەم و پەژارەیە کە ئینسان لە پێناوی هەوای نەفسیدا نوێژەکەی بەتاڵ بکاتەوە. لە سەر زانایانی ئاین پێویستە بەو ئافرەتانە بڵێن و ئەمریان پێ بکەن کە لە ژێر ئەو پۆشاکە تەنکانەوە شتێکی وەها لەبەر بکەن کە مەنعی دیتنی ڕەنگی ئەندامیان بکات، ئەگەرنا نوێژەکانیان بە تاڵەو، هەر نوێژێ بەو شێوە کرابێ بەتاڵەو بەقەزا گێڕانەوەی واجیبە..

ئەگەر کەسێ بە بێ دەرپێ نوێژ بکا و لەکاتی ڕکووعدا یا لەکاتی سوجدە بردندا لە بەرۆکەوە یا لە تەنیشتەوە عەورەتی دەربکەوێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام ئەگەر لە داوێنەوە عەورەتی دەربکەوێ نەك لە بەرۆك و تەنیشتەوە ئەوە قەید ناکات و نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە. ئەگەر کەسێك برین هەندێ لە ئەندامی دەستنوێژی داگرتبوو، ئەوە ئەگەر لەوانە بوو بشۆرێ ئەوا دەستنوێژ دەگرێ و شوێنەکە دەشۆرێ و پێویست بە تەیەمومم ناکا، خۆ ئەگەر لەوانە نەبوو بشۆرێ تێد ەفکرین: یا ئەو ئەندامە لە ئەندامەکانی تەیەموممە، وەکو دەم و چاوە دەستەکان هەتا ئەنیشك ، یا لە ئەندامەکانی تەیەمومم نییە، وەکو سەرو هەردوو پێ، لەم دوو حاڵەدا یا برینەکە داپۆشراوە یا نا، واتە: هەشت شێوەی لێ پەیدادەبێ:

شێوەی یەکەم: برین لەسەر هەمووی ڕوخسارەو ساتری بەسەرەوە نییە، واتە: دانەپۆشراوە، لەم شێوەدا واجبە هەر لە سەرەتاوە بەنییەتی حەڵاڵکردنی نوێژ تەیەمومم بکا و، ئەنجا دەست بکا بە شۆرینی دەستی و، هەر لە سەرەتای شۆرینی دەستیەوە نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی بهێنێ و

دەستنوێژەکەی تەواو بکا و، لەپاشانیش هەموو نوێژەکانی بە قەزا بکاتەوە، چونکە مادام ڕوخساری نەشۆریوە دەستنوێژەکەی ناقیس بووە، لەبەرئەوەیش بە هۆی برینەکەیەوە تۆز بە پێستی ڕوخساری نەگەیشتووە تەیەموممەکەیشی ناقیس بووە، کەوابوو قەزای نوێژەکانی پێویستە.

شێوەی دووەم: ئەوەیە برینەکە لەسەر هەموو ڕوخساری بێ و داپۆشرابێ، لەم شێوەشدا پێویستە لە سەرتاوە بە نییەتی حەڵاڵکردنی نوێژەکە تەیەموم بکا و، ئەنجا دەستی تەڕ بەسەر ساترەکەدا بهێنێ و، پاش ئەوە دەستەکانی بە نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی بشۆرێ و دەستنوێژەکەی تەواو بکا، لەم شێوەشدا لەبەر هەمان دەلیلی پێشوو پێویستە نوێژەکانی بە قەزا بکاتەوە.

شێوەی سێیەم: ئەوەیە برینەکان بەسەر دەستیەوەن و ساتریان نییە، واتە: دانەپۆشراون ، لەم شێوەدا پێویستە بە نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی ڕوخساری بشۆرێ و ئەنجا تەیەموم بکات و لەپاش تەیەموم دەستی تەڕ بهێنێ بەسەر برینەکەداو دەستنوێژەکەی تەواو بکا، لەم شێوەشدا، لەبەر هەمان دەلیل کە باسمان کرد، پێویستە نوێژەکانی بە قەزا بگێڕێتەوە.

شێوەی چوارەم: ئەوەیە برین لەسەر دەستەو، برین پۆشیشی لەسەرە، لەم شێوەدا واجبە لە پێشدا بە نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی ڕوخساری بشۆرێ و، پاش ئەوە تەیەموم بکات و دەستی تەڕ بەسەر برین پۆشەکەدا بهێنێ، دوای ئەوە مەسحی سەری بکاو پێیەکانی بشۆرێ. لەم شێوەشدا قەزای نوێژەکانی واجیبە لەبەر هەمان دەلیلی پێشوو، کە بریتی بوو لە ناقیسیی دەستنوێژ و تەیەموم.

شێوەی پێنجەم: ئەوەیە برین لە هەموو سەردایە و برین پۆشی بەسەرەوە نییە، لەم شێوەدا واجیبە بە نییەتی لابردنی بێ دەستنوێژی دەم و چاوی بشۆرێ و پاش ئەوە دەستەکانی بشۆرێ، جا ئەگەر برینەکە وەهابوو کە مەجالی مەسحی سەری نەهێشتبوو ئەوا تەیەموم بکاو پاش ئەوە هەردوو پێیەکانی بشۆرێ، لەم شێوەدا قەزای نوێژەکانی لە سەر نییە، چونکە با دەستنوێژەکەی لەلایەنی مەسحی سەرەوە ناقیس بێ تەیەممەکەی تەواوە.

شێوەی شەشەم: ئەوەیە کە برینەکە هەموو سەری داگرتبێ و برین پۆشی بەسەرەوە بێ، لەم شێوەدا واجیبە دەستنوێژ بگرێ تا دەگاتە مەسحی سەر، لەو کاتەدا تەیەمومم بکا و، پاش ئەوە پێیەکانی بشۆرێ، لەم شێوەشدا قەزای نوێژەکانی لە سەر نییە؛ چونکە تەیەموممەکەی تەواوە.

شێوەی حەوتەم: ئەوەیە برین لە سەر پێی بێ و برین پۆشی بەسەرەوە نەبێ ، وەك سووتاو، لەم حاڵەدا دەستنوێژ دەگرێ تا دەگاتە کاتی شۆرینی پێی، جا تەیەمومم دەکا، لەم شێوەشدا قەزای نوێژەکانی لە سەر پێویست نییە ئەگەر وابوو ئەوە قەزای نوێژەکانی واجیبە.

شێوەی هەشتەم: ئەوەیە کە برین لە سەر پێی بێ و برین پۆشی بەسەرەوە بێ، لەم شێوەدا واجیبە دەستنوێژ بگرێ تا دەگاتە کاتی پێ شۆردن، ئەوجا تەیەمومم بکا، لەم شێوەدا ئەگەر برین پۆشەکەی لە سەر دەستنوێژ دانابوو، واتە لەکاتی پێچانی برینەکەدا دەستنوێژی هەبوو، خوێنی زۆری عەفوو لێنەدراوی لە سەر نەبوو ئەوا قەزای نوێژەکانی واجیب نییە، ئەگەرنا قەزای لەسەرەو هەر نوێژێ بە پێچەوانەی ئەم یاسایە بکا بەتاڵە.

ئەگەر لە دێیەکدا نوێژی جومعە دەکراو، جارجاریش لەبەر هەندێ مانیع جومعەیان نەدەکرد، ئەوە لە ڕۆژانی جومعەدا پێویستە نوێژەکەی نیوەڕۆ ئەوەندە پاش بخەن کە بەتەواوی ناهومێد ببن لە کردنی نوێژی جومعە، ئەگەرنا ئەو نوێژی نیوەڕۆیانە بەتاڵ دەبێ.

ئەگەر یەکێ لەوانە کە لەباتی پێ شۆردن، دەستی تەڕ بەسەر (خف)دا دەهێنن کەمێك (خف)ەکەی دڕابوو بەجۆرێ کە هەندێ لە پێی دەرکەوێ، لەو بەشەی کە واجیبە بشۆرێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، وەئەگەر وارێ کەوت کە لە ناو نوێژەکەیدا ماوەی (مەسحی خف)ەکەی تەواو بوو، ئەوە مەسحی ئەو جارەی بەتاڵەو نوێژەکەشی بەتاڵە.

ئەی برادەران! کاتێك کە دڕکێ بە ئەندامی نوێژکەردا بڕوا، ئەگەر ئەو دڕکە ئەوەندە بچووك بوو کە لە پاش دەرهێنانی شوێنی دیار نەبوو، ئەوە عەفووەو دەرهێنانی پێویست نییە وەکو لە فەتاوای گەورەدا باس کراوە. و ئەگەر دڕکێ چوو بەدەستیدا یا بە پێیداو سەری ئەو دڕکە دیاربوو، ئەوە واجیبە بۆ دروستبوونی خۆشۆردن یا دەستنوێژ گرتن ئەو دڕکە

دەربهێنرێ و شوێنەکەی بشۆردرێ، چ سەرەکەی تری گەیشتبێ بە خوێن یانا، وە ئەگەر دڕکەکە لە ئەندامییا ون بوو بوو، هیچ سەرێکی دیارنەبوو ئەوە دەرکردنی دڕکەکە واجیب نییەو ، حوکمی ئەو شتانەی هەیە کە لە دیوی ناوەوەن و دەرناکەون.

ئەگەر لە پاش خۆشۆردن یا دەستنوێژ گرتن دڕکێ چوو بە دەستیدا یا بە پێیدا ئەگەر ئەو سەرەکەی نەگەیشتبووە خوێن ئەوە قەی ناکا نە بۆ دامەزرانی نوێژەکەو نە بۆ دروست بوونی، بەڵام ئەگەر ئەو سەرەکەی گەیشتبووە خوێن ئەوە واجیبە دەری بهێنێ، ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵە. ئەم دوو مەسەلەی باسی دڕکە پەنهانن و زۆریش ڕێك دەکەون.

ئەگەر کەسێ لە پشتی ئیمامەوە نوێژی بەجەماعەت دەکردو، لەبەر بێ ئاگایی خۆی تەحییاتی دوایی بە تەحیاتی یەکەم دەزانی و، لە پاش سەلام دانەوەی، ئیمام ئاگادار بوویەوە لەوەی کە ئەو تەحییاتە تەحییاتی دوایی بووە، ئەوە واجبە قەناعەت بکا بەو تەحیاتەی کە لەگەڵ ئیمامدا خوێندوویەتی و، پێویست نییە جارێکی تر تەحییات بخوێنێ و، بە فەرزەکە بۆی حسێب دەکرێ. ئەگەر کەسێ سوجدەی دووەمی لەبیرچوو تەرکی کردو لە پاش دانیشتنی ئیستیراحەت، کە هەستایەوە، ئاگادار بوویەوە کە سوجدەی دووەمی تەرك کردووە، ئەوە واجیبە هەر لە ڕاوەستانەکەوە دانەوێتەوە بۆ سوجدە نەك بۆ دانیشتنی نێوان سوجدەکان؛ چونکە ئەو دانیشتنی ئیستیراحەتە کە بەنیازی سوننەت کردوویەتی لەباتی دانیشتنی نێوان سوجدەکان حسێب دەکرێ و، نموونە بۆ قاعدە کە سوننەت جێگای فەرز دەگرێتەوە زۆرە.

ئەگەر کەسێ بۆ لابردنی لەش پیسی (جنابە)خۆی شۆردو ناو دەمی نەشۆری، کەچی ناو دەمی بە خوێن و یا بە شتی تر پیس بووبوو، ئەوە لە پاش خۆشۆردنەکە هەتا دەمی نەشۆرێ هەر نوێژێ کە بیکا بەتاڵە؛ چونکە ناودەمی ئینسان هەرچەند لە خۆشۆردنی دەستنوێژدا حوکمی ئەندامی زاهیر هەیە و شۆرینی واجیبە.

بۆ دامەزرانی نوێژی کەسێك کە هەمیشە بێ دەستنوێژ بێ، بەهۆی میزەچرکێ یا دەرچوونی با لە سکیەوە بە شێوەیەکی هەمیشەیی، یا بەهۆی دەرچوونی خوێنەوە، چەند ئاداب هەیە واجیبە موسڵمان ئاگای لێیان بێ:

ئەگەر بێ دەستنوێژییەکەی بەهۆی دەرچوونی باوە بوو، ئەوە واجیبە کاتێ کە وەختی

نوێژه واجیبەکەی هات دەستنوێژ بگرێ و گورج نوێژه فەرزەکەی بکات و، هەر بەو دەستنوێژه دەتوانێ سونەتەکانیشی بکا، بەڵام دروست نییە دوو نوێژی فەرزی پێ بکا. خۆ ئەگەر بێ دەستنوێژییەکەی بەهۆی خوێنەوە بوو، وەکو ژنێك کە خوێنی نەخۆشی پێدا بێ، واجیبە دەستنوێژ نەگرێ ، هەتا وەختی نوێژەکە دێ، ئەنجا لە پێش دەستنوێژەکەدا فەرجی بشۆرێ، و، ئەگەر بەڕووژوو نەبوو پارچەیەك لۆکە بخاتە فەرجیەوە وە، ئەگەر ئەو لۆکە بەتەنیا ڕانەدەوەستا واجیبە پارچەیەك قوماشی درێژ وەکو پشتێن لە بەینی هەردوو ڕانیەوە لەبەر و دوادا ببا بۆ عاستی پشتێنی پشتی و، لەگەڵ پشتێنەکەدا قایمی بکات هەتا دانەکەوێ، جا پاش ئەوە دەستنوێژ بگرێ و زووبەزوو نوێژه فەرزەکەی بکا و، دروستە هەر بەو دەستنوێژه سونەتەکانیشی بکا، بەڵام بەو دەستنوێژه لە فەرزێ زیاتر ناتوانێ بکا. سەبارەت بەو نەخۆشە کە باسمان کرد، ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی بکردایە، خوێنی دەرنەدەچوو واجیبە لە سەری بەدانیشتنەوە نوێژەکانی بکا، چونکە دەفعی خوێنەکە مهمترە لە ڕاوەستان بۆ نوێژ.

ئەگەر ئینسانی هەمیشە بێ دەستنوێژ چاك بوویەوە قەزای ئەو نوێژه فەرزانەی کە بەپێی یاسای پێشوو کردوونی واجیب نییە (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا ).

لە سەر زانایانی ئاین واجیبە کە بەقەدەر توانا خەریکی تێگەیاندنی خەڵکی هەرەمەو نەزان بن، هەروەها لە سەر خەڵکی هەرەمەو نەزانیش واجیبە هەوڵ بدەن بۆ فێربوونی ئادابی ئاین بەپێی توانایان. وەکو لە سەریان واجیبە کە لە ئامۆژگاریی زانایان ماندوو نەبن؛ چونکە لە حەزرەتەوە (د.خ) ڕیوایەت کراوە:

«بەرزترین ڕەوشتی جوانی موسڵمان ئەوەیە کە لە بیستنی خەیری ئاینی خۆی تێر نەبێ».

والسلام على من أتبع الهدى وأجتنب الردى.

نامەی حەیەم

# باسی سوننەتەکانی نوێژ دەکا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة و السلام على رسول الله وعلى آله وصحبه المجاهدين في دين الله.

وبعد. براکانم! نووسراوێکم لە بابەتی ئەوانەی کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە بۆ ناردن، هەروەها نووسراوێکم بۆ ناردن لە بابەتی فەزائیلی نوێژ، بەڵام لەو نووسراوانەدا باسی ژمارەی سوننەتەکانی فەزائیلی نوێژم نەکردبوو؛ بۆیە بە پێویستم زانی باسی سوننەتەکانی نوێژیشتان بۆ بکەم، تا ئەوەی دەیزانن بیتەوە بیرتان و، ئەوەی نایزانن بیزانن؛ چونکە خواوەندی میهرەبان (جل جلاله) ئەم دنیایەی کردووە بە مەنزڵگای ئەوانەی بەرەو دنیای تر سەفەر دەکەن، بە ڕاگوزەری ئەوانەی کە بەتەمای پیرۆزیی گەیشتن بە حوزووری خوای بەخشندەن، بەڵکو لەم مەنزڵگایەدا، لەم ڕاگوزەرەدا تۆشەیەك بۆ بەختیاریی نەبڕاوەی پاشەڕۆژ هەڵگرن و، بە بێ زادوتۆشە قەستی سەفەری سارای قیامەت نەکەن.

جا لەبەرئەوەی کە لە پاش بناغەکانی ئاین، لە فەرعەکانی ئایندا هیچ عیبادەتێك نییە لە نوێژ گەورەتر بێ، چەند نووسراوێکم بەشێوەی دیاری بۆ برادەران پێشکەش کرد؛ چونکە لە سەر فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ر.خ) دەیگێڕێتەوە، ئەو نووسراوانەی کە دوعا خوازتان بۆی ناردوون، باشترین دیارییەکن دۆست بۆ دۆستیان بنێرێ؛ پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ:

« ما أهدى مسلم لإخيه هديه أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى أو يرده عن ردى ».

**واتـه: ئـيـنسانـی مـوسـڵـمـان هـەرگـیز دیـاریـیـەکی نـەنـاردووە بـۆ بـرای موسڵمانی باشتر بێ لە وشەیەکی زانایی کە خوا بەهۆی ئەو وشەوە زیاتر بەرچاوی ڕوون بکاتەوە، یا لە خراپەیەکی لابدا.**

کەواتە بزانن نوێژ، کە پایە بەرزترین عیبادەتی بەدەنییە، هەرکەسێ لەگەڵ مەرج و روکنـەکـانـیدا دوور لـە مـوبـتـیـلات بـیـکـا و، بە پێی یـاسای ئـاین سوننـەتـە دیـاری و پەنهانەکانی جێبەجێ بکا، بێگومان بە زەخیرەی گەورەی لەباری قیامەتی خۆی دەگا؛ چونکە لای کەمی هەر تاکە سوننەتێك دە خێر و پاداشتی لە سەرە، چ لە سوننەتەکانی نوێژی فەرزو، چ لە سوننەتەکانی نوێژی سوننەت، خۆ واجیباتی نوێژی فەرزو، ئەوەی پێویستە بۆ نوێژی سوننەت، ئەوە یەك بە حەفتا پاداشت و جەزای چاکەی هەیە. لە سەر ئـەمـە ئـەگـەر مـوسڵـمـان یـەك سوننـەت بکـا دە خـەیری بۆ دەنووسرێ و، ئـەگـەر هـەمـوو سوننەتەکان  بەجێ بهێنێ ئەوە حەسەناتی زۆر زۆر بۆ دەنووسرێ.

هەندێ لە زانا ئاینییەکان خەیر و حەسەناتی سوننەتە کانی ناو نوێژە فەرزەکانیان کۆکردووەتـەوە، لـەگـەڵ سوننـەتـەکـانـی پێش (اللـه اکبـر)ی نـوێژدابـەستـن، گەیشتوونەتە (٧٦٥١٠) حەفتا و شەش هەزار و پێنسەد و دە حەسەنە.

جا کەوابێ  سوننەتە موسڵمان پێش ئەوەی دەست بە نوێژەکەی بکا ئەوە بزانێ کە نوێژ سوننەتی زۆرە. سوننەتە ئینسانی موسڵمان دڵی خاڵی بکات لە یادی غەیری خوا، چونکە ئەم حاڵە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دڵ ڕوو بکاتە خواو، تەنیا سەیری گەورەیی خوا بکا، تەنانەت یادی ئارەزووی بەهەشت یا ڕزگاربوون لە ئازاری ئاگری دۆزەخ نەکا و، لە دڵی خۆیدا بڕیاری ئەوە بدا کە ئەم نوێژە بە خوشووع و وریـایـیی دڵەوە دەیکەم و، هەر لەبەر ترس و شەرم لە خوای گەورە بەجێی دەهێنم.

نوێژکەر ئەگەر لە پێش دابەستنی نوێژەکەیدا ئەم خەیاڵە بکا، پایەداریی خوشووع و خوزووع، واتە: ئاگاداریی دڵ و ئارامیی ئەندامی لە سەر ئاسان دەبێ. ئەم خوشووع و خـوزووعـە، ئـەگـەرچـی لای هـەنـدێ لـە زانـاکـانـی ئـایـن سوننـەتـە، لای هـەنـدێ لـە زانـا بەرزەکانی ئاین مەرجی نوێژەو، ئەگەر نوێژ بێ خوشووع و خوزووع بکرێ  بەتاڵەو، وەك ئەوە وایە کە نوێژ نەکرابێ و، ئەو موکەللەفە نوێژەکەی هەر لەئەستۆدا بێ.

هـەروەهـا تێفکرین و بیرکردنـەوە لـە واتـای ئـەو کـەلیمـانـە، کە نوێژکـەر دەیـانخوێنێتەوە، سوننـەتـەو، ئـەم بـیـرکـردنـەوەیـە دەبـێـتـە هـۆی خشوع و خـوزووع، بـۆیـە فـەرموویـانـە:

گرنگترین سوننەتەکانی نوێژ پاش خوشووع و خوزووع تێفکرینە لە واتای ئەو وشانەی دەیانخوێنێ.

هەروەها سوننەتە کاتێ ئینسان دەچێتە نوێژەوە بە گورج و گۆڵی و شادمانییەوە تێ هەڵچێ، وەك یەکێك کە بۆ شادی و خۆشی بانگ کرابێ؛ ئەوەتە خوای گەورە (جل جلالە) زەممی مونافیقەکانی بەوە کردووە کە بەسستی تەمەڵی و بێ شەوقی دەست بە نوێژ دەکەن «وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى» واتە: کاتێ کە هەڵدەستن بۆ نوێژکردن بە سستی و تەمەڵی هەڵدەستن.

تەرتیلی قیرائەت سوننەتە، واتە: خوێندنی وشەکان بە ئارامی و لەسەرخۆ و حەرفەکانی لە شوێنی خۆیان دەرببڕدرێن، ئەم سوننەتەش دەبێتە هۆی حازرکردنی مەعناکانیان و لێحاڵی بوونیان، ئەمەش دەبێتە هۆی خوشووع.

ئیمامی نەوەوی (ر.خ) دەفەرموێ: هەر سوننەتێ کە ئیختیلاف لە واجیبییەتیدا هەبێ نەکردنی مەکرووهە.

سوننەتە پاش تەواوکردنی نوێژە فەرزەکە، بۆ نوێژە سوننەتەکان شوێن بگوێزێتەوە، چ فەرزی حازرو چ قەزای رابردوو. هەروەها سوننەتە پاش ئەوەی نوێژی سوننەتی پێش فەرزی کرد لەو شوێنە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر تا نوێژە فەرزەکەی تێدا بکا، بەمەرجێك فەسیلەتی ڕیزی یەکەم یا ئازاردانی ئەهلی ریز ڕێگا لەم گوێزانەوەیە نەگرێ. جا ئەگەر نەیگوێزایەوە ئەوا سوننەتە لە مابەینی نوێژە فەرزەکە و نوێژە سوننەتەکەدا یا قسەیەك یا ڕاکشانێك بکا، وەك ڕاکشانی پاش سوننەتی قەبلییەی بەیانی؛ چونکە لە سەحیحی موسلیم فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) نەهیی کردووە لە لکاندنی نوێژێك بە نوێژێکی ترەوە، مەگەر لە پاش قسەیەك یا گوێزانەوە لەو شوێنەی تێیدا بووە بۆ شوێنێکی تر.

سوننەتە پێش چوونە ناو نوێژ خۆی خاڵی بکاتەوە لە میز و شتی تر؛ چونکە دەبێتە مانیع لە خوشووع، هەرچەند ترسی لەکیس، چوونی جەماعەتیشی ببێ، بەڵێ ئەگەر ترسی لە کیس چوونی نوێژی فەرزی بوو ئەوە قەی ناکا.

سوننەتە بەدەوام تا دوایی نوێژەکەی هەر تەماشای شوێنی سوجدەکەی بکا و بەم لاو لادا نەڕوانێ، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بێ ئاگایی لە نوێژەکەی، مەگەر لە کاتی

شەهادەتدا لە تەحییاتدا، لەوێدا بڕوانێ بۆ پەنجەی شەهادەتی. لەکاتی بەجێهێنانی نوێژی ترس (الصلاة الخوف) و لە کاتی سوجدەدا چاو بەیەکا نەنێ و، بڕوانێ بۆ جێگەی سوجدەکەی، با چاویشی لە سوجدەدا بەشدار بێ، بێجگە لەوەش چاو بەیەکانانی کاتی سوجدە، عادەتی جوولەکەیەو، بۆ موسڵمان وا باشە تەرکی بکا، بەڵێ ئەگەر بەم حاڵە دڵی پەریشان دەبوو ئەوا دەتوانێ چاو بنێ بەیەکدا، وەکو کاتێ کە جێگەی نوێژەکەی قوماشێکی نەقشداری وەها بێ کە بە تەماشاکردنی دڵی پەریشان ببێ، یا ڕیزی بەردەمی لە پۆشاکێکی وەهادا بن کە تارماییی عەورت یا مەقعەدیان دەربخا.

سوننەتە هەر پۆشاکێ بەیەکدا پێچرابێ بیکاتەوە، ئەگەر عوزری نەبێ وەکو مێزەرەو پشتێن بەتایبەتی لەکاتی سەرمادا.

سوننەتە لیباسی خۆی هەڵنەکات، بۆنموونە: چاکی کەوا نەکا بەلاداو، فەقیانەی کراس بەربداتەوەو نەیبەستێ بە قۆڵیەوەو، لفکەی سەرپێچ بەربداتەوەو نەیکا بە کڵاوەکەیدا.

سوننەتە ئەوەی دەست و پێی داپۆشیبێ، وەکو دەستکێش و گۆرەوی، لایبا، مادام عوزرێکی نەبێ وەکو سەرما. بەڵام دەرخستنی تەوێڵ واجیبە وەکو داپۆشینی هەردوو ئەژنۆ لەسەر پیاو واجیبەو، بۆ ژن داپۆشینی لەش واجیبە، بێجگە ڕوومەت و هەردوو دەستی هەتا جمگە، کە ئەم دوو شوێنە دروستە دەربخرێن، بەڵام پێویستە پێیەکانی داپۆشێ و، ئەگەر کەمێك لە پێیەکانی بەدەرەوە بوو لەکاتی نوێژدا ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

سوننەتە نوێژکەر مێزەرە واتە سەرپێچکی ببێ و، نوێژ بەبێ سەرپێچ کەراهەتی هەیە. سوننەتە لە کاتی نوێژدا نوێژکەر لە سەر هەردوو پێی ڕاوەستێ و، ڕاوەستان لە سەر یەك پێ مەکرووهە. سوننەتە پێیەکانی وەها دابنێ کە پەنجەکانی ڕوو لە قیبلە بن، بەتایبەتی لەکاتی دابەستنی نوێژدا. سوننەتە ماوەی بەینی هەردوو پێی لەکاتی ڕاوەستانی نوێژدا بە ئەندازەی یەك بست بێ و، ئەم حاڵە تا دواییی نوێژەکە بەردەوام بێ

سوننەتە لەکاتی ڕاوەستاندا پشتی ڕێك بگرێ و، مەیلی لای چەپ و ڕاست نەکا و، پشتی کۆم نەکاتەوە. سوننەتە بەم جۆرە خۆی ئامادە بکا لە پێش دابەستنی نوێژەکەدا هەتا سوننەتەکان هەموو کاتی نوێژەکەی داگیر بکەن.

سوننەتە بەدەم نییەتەکە بڵێ ئەنجا (الله اکبر) بڵێ و، لەو کاتەدا ئەم رستە دەڵێ دەبێ رووی لە قیبلە بێ، هەروەها بەدەم وتنی (ئەدا) و (قەزا) و بەیانی ژمارەی ڕکاتەکان و، لەفزی (لله تعالی)، یانی« بۆ خوای گەور، سوننەتن. سوننەتە لە سەرەتای (لله اکبر) وتنی نوێژدابەستندا هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە بە جۆرێ پشتی هەردوو دەستی بەرامبەری گوێی بێ و، پەنجەکانی بڵاو بن و، پەنجەی گەورەی بەرامبەری نەرمەی گوێی بێ و، کەمێ سەرپەنجەکانی مەیل بکەن بەناوا، وە لە سەرەتای وتنی نییەتەکەدا بە ئارام دەستەکانی بەرزبکاتەوە بەجۆرێ کە لەگەڵ ئاخری وشەی نییەتەکەدا ئاخری بەرزکردنەوەی هەردوو دەستی بێ، خۆ ئەگەر بەم جۆرە دەست بەرزکردنەوەکەی بۆ جێبەجێ نەکرا، ئەوە هەر دەست بەرز بکاتەوە، چونکە ئەسڵی دەست بەرزکرنەوەکە سوننەتەو، ئەو شێوانەی کە لە پێشدا باسمان کردن سوننەتێکی ترن. هەروەها سوننەتە هەردوو ئەنیشکەکانی لە هەردوو کەلەکەکانی جیابنەوە، بەڵام نەك جیابوونەوەیەکی زۆر.

سوننەتە تەلەفوز کردن بە نییەتەکە پەنامەکی بێ و، هەر خۆی بیبیسێ و، بەرامبەریوونی مەعنای «أصلي فرض الظهر» لەگەڵ (الله اکبر)ی نوێژ دابەستندا واجیبە لەسەر ئەو یاسایە کە لە باسی ئەرکانی نوێژدا نووسیمان.

ئەگەر کەسێك بیەوێ لە پشتی ئیمامەوە نوێژ بکا پێویستە لەکاتی (الله اکبر) وتندا نییەتی ئیقتیدای بەو ئیمامە هەبێ، ئەگەر نییەتی ئیقتیدای نەبێ و، لە نوێژەکەیدا دوای ئیمام کەوت و، وەکو ئەو جووڵایەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەکورتی هەر کەسێ بیەوێ تابیعی یەکێك بێ لە نوێژا واجیبە نییەتی ئەوە لە دڵیدا ببێ کە تابیعی ئەو کەسە دەبێ.

هەروەها سوننەتە (لام)ی (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بەقەڵەوی بخوێنێ و، درێژە بە (مد)ی (الله اکبر) نەدا؛ چونکە ئەو مەددە تەبیعییەو درێژی تێدا نییە، بەڵام لە(الله اکبر)ەکانی بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەدا سوننەتە مەددەی لامەکە درێژ بکاتەوە.

ڕاوەستان لە نێوان (الله) و (اکبر)دا لە کاتی نوێژدابەستندا موخالیفی سوننەتە، بەڵکو ئەگەر بەدەسەنقەست بەقەدەر دوو هەناسە لەنێوانیاندا ڕاوەستێ، ئەوە (الله اکبر) ەکەی بەتاڵ دەبێ و، پێویستە سەر لەنوێ (الله اکبر) بڵێ. واجیبە (الله اکبر)ی نوێژدابەستن ئەوەندە بە دەنگی بەرز بڵێت کە خۆی بیبیسێ، ئەگەر لەو ئەندازە زیاتر دەنگ بەرز

بکاتەوە ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو، کارەکەش سوننەت نییە. بەڵام بۆ ئیمام و بۆ (مبلغ) سوننەتە دەنگ بەرز بکەنەوە چ لە (الله اکبر)ی نوێژدابەستندا و، چ لە (الله اکبر)ەکانی ئینتیقالاتداو، پێویستە (مبلغ)بە (الله اکبر)ی نوێژدابەستنی خۆی مەئموومەکانی تر ئاگادار بکا، نەك لەپێش نییەت هێنانی خۆیدا ئەو (الله اکبر)ە بکا بۆ ئاگادار کردن و خەبەردان بە خەڵك و، لەپاش ئەوە خۆی (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بکا، چونکە هەرکەس لە پێش ئەم (الله اکبر)ەی نوێژدابەستنی (مبلغ) دا (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بکا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ؛ چونکە (مبلغ) وەکو ئیمام وایە بۆ ئەو خەڵکانەی ئاگادارییان دەکا.

سوننەتە نوێژکەر دەستی ڕاست بنێتە سەر دەستی چەپی و، جمگەی مووچی دەستی چەپی بە پەنجەکانی دەستی ڕاست بگری و، پەنجەکانی دەستی ڕاست لە سەر درێژی دەستی چەپی ڕابکێشێ و، پەنجەکانی بلکێنێ بەیەکەوەو، هەردوو ئەنیشکی بنێتە سەر تەنشتی، بەڵام نە تەواو بیلکێنێ بە تەنیشتیەوە نە دووریش بن و، دەستەکانی لەژێر سینەو ژووری ناوکیەوە دابنێ.

سوننەتە لە پاش (الله اکبر)ی نوێژدابەستن کەمێ ڕاوەستێت و بەقەدەر وەستانی هەناسەدان، ئەنجا بڵێ:

«الله اکبر کبیراً، و الحمد لله کثیراً، وسبحان الله بکرة وأصیلا» ئەم دوعایە بۆ مەئمووم و بۆ یەکێك بەتەنیا نوێژ بکا سوننەتە، هەروەها سوننەتە بۆ ئیمامێك کە مەئموومەکانی بە درێژەپێدانی نوێژەکە ڕازی بن.

شایانی باسە گەورەترین سوننەتی ئیستیفتاح ئەوەیە بڵێت: «إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ». إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ[١٦٢] لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِين».

هەروەها سوننەتە ئەم دوعایە و دوعاکانی تر بە لەهجەی جوان و بە تەرتیل و ئاگاداری لە مەعناکانیانەوە بخوێنێ با کورتە مەعنایەکیان بێ.

هۆی ئاگاداری لە مەعنا و حازر کردنی ئەوەیە کە ئینسان دەستی کرد بە نوێژەکەی لە دڵیدا بێ ئەو نوێژە بەئاگاداریی دڵەوە بخوێنێ. خۆ ئەگەر نوێژکەرەکە نەخوێندەوار بوو، لەلای زانایەك فێری مەعناکەی ببێت. جا کە دوعای ئیستیفتاح تەواو بوو سوننەتە

بەقەدەر ئەوەندەی بڵێ (سبحان الله) ڕاوەستێ و، ئینجا بڵێ: أعوذ بالله من الشیطان الرجیم. شایانی باسە کە خوێندنی (أعوذ... هەتاد) لەهەموو ڕکاتێکدا سوننەتە، بەتایبەتی لە دوو ڕکاتی یەکەم و دووەمی نوێژی سێ ڕکاتی و چوار ڕکاتیدا. وە ئەگەر وا ڕێك کەوت کە لەپێش دوعای ئیستیفتاحدا (اعوذ..)ی خوێند، دوعای ئیستیفتاح نەخوێنێ.

گەلێ لە نەخوێنەوارەکان کە لە ڕکاتی یەکەم بەرز دەبنەوە بۆ ڕکاتی دووەم لە پێش ئەوەی بگەنە ڕادەی ڕاوەستان (اعوذ..) دەخوێنن، ئەمە دروست نییە.

لە پاش دوعای ئیستیفتاح و (اعوذ...) نوێژکەر واجیبە دەست بە خوێندنی فاتیحە بکات و، سوننەتە فاتیحەکە بە تەرتیل بخوێنێ و،لە سەر هەموو ئایەتێکدا بەقەدەر هەناسە کێشانێ بوەستێ.

ڕاوەستان لە سەر یەکەم (علیهم) سوننەت نییەو، ئەگەر هات و وەستا لە سەری سوننەتە وشەی (علیهم) دووبارە بکاتەوە، بەڵام لە سەر (علیهم)ی دووەم بەبێ بەهانە وەستان دروست نییە، چونکە شوێنی وەستان نییەو، هەر شوێنێ کە شوێنی وەستان نەبێ، وەستان لە سەری بە بێ بەهانە حەرامە. شێخ ئیبنو حەجەر (ر.خ) لە کتێبی (شرح العباب)دا لەبابی تەیەمموم ئەمەی وتووە.

لە سەر نوێژکەر واجیبە لە خوێندنی فاتیحەو سوورەتی تردا ئەوەی ئیجماعی هەموو قورڕاکانی لە سەرە پەیڕەویی بکا و پارێزگاریی بکا لە مەخرەجی حەرف و شەددەو ئینقیلاب و ئیستیرخاو ئیستیعلاو غەیری ئەمانەش؛ لەبەرئەمە وەستانێکی سووك لە نێوانی (سین)و (تی)ی (نستعین) و (مستقیم) دا دروست نییەو، ئەگەر وەستانێکی وای کرد دەبێ سەرلەنوێ کەلیمەکە بخوێنێتەوە؛ چونکە لە یەك جیاکردنەوەی بەشەکانی یەك کەلیمە پێچەوانەی ئیجماعی هەموو قورڕاکانەو، بەم جیاکردنەوەیە کەلیمەکە دەبێتە دوو کەلیمە وەك(نس) و (تعین) یا (المس) و (تقیم)، خۆ ئەگەر دووبارەی نەکردەوە ئەوە تەماشا دەکەین ئەگەر مەعنای کەلیمەکەی گۆڕی و بەدەسەنقەست کردی ئەوا نوێژکەی بەتاڵە، خۆ ئەگەر وانەبوو، ئەوا هەر بەتەنیا خوێندنی کەلیمەکە بەتاڵە وە لەم حاڵەی دواییدا، ئەگەر زۆری پێ نەچوو ئەوا دووبارەی دەکاتەوە، خۆ ئەگەر کەلیمەکەی دووبارە نەکردەوەو بە سەهوو ڕۆیشت بۆ ڕکووع و ئەنجا گەڕایەوە بۆ خوێندنی کەلیمەکە، ئەوە بە زۆر پێ چوّن و، بەین کەوتنی درێژ حسێب دەکرێ و، پێویستە فاتیحەکەی لە سەرەوە

بخوێنێتەوە، بەڵام ئەگەر زۆری پێ چوو، ئەوا دیسان پێویستە سەرلەنوێ فاتیحەکە بخوێنێتەوە. ئەگەرنا نوێژەکەی بەتاڵەو، ئەگەر بە دەسەنقەست ڕۆیشت بۆ ڕکووع ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە، چونکە ئەم کارە پێچەوانەی ئیجماعی قورِاکانە.

مەددەی (ولا الضالين) سوننەت نییە، بەڵکو واجیبە، جا ئەگەر مەددەی ئەم کەلیمە کەمتربوو لەو میقدارە کە بە ئیجماعی قورِاکان واجیبە ئەوە خوێندنی ئەو کەلیمە دروست نییەو دەبێ بەمەددەوە بیخوێنێتەوە.

سوننەتە زۆر پێ دانەگرێ و زیادەڕەوی نەکا لە شەددەکانی سوورەتی فاتیحە و ئەو سوورەتەی کە لە پاش فاتیحە دەیخوێنێ . ئەم زیادەڕەوییە مەکرووهە.

سوننەتە بۆ ئیمام لە کاتی خوێندنی (اياك نعبد واياك نستعين)دا بە دڵ نیازی خۆی و مەئموومەکانی بکا. هەروەها لەکاتی خوێندنی (اهدنا الصراط المستقيم)دا هەم نیازی خۆی و مەئموومەکانی ببێ و، مەبەستی لە دوعاکە ئەوەبێ کە خوا لە سەر ئاینی ئیسلام و بیروباوەڕ و کردەوەو خووی چاك دامەزراویان بکا. هەروەها سوننەتە لە پاش (ولا الضالين) بەقەدەر خوێندنی (سبحان الله) ڕاوەستێ ئەوسا ئامین بڵێت، یاخود بڵێ: (يارب أغفرلی) ئەوسا بڵێ ئامین. سوننەتە مەئموومەکان ئامینەکە بە دەنگی بەرز بخوێننەوە، بەڵام دەنگیان لە دەنگی ئیمام نزمتر بێ لەبەر ئەدەب و ڕێز گرتن لە ئیمام. سوننەتە ئامینی مەئموومەکان بەرامبەری ئامینی ئیمام بێ و بکەونەیەك، هەروەها بۆ هەموو نوێژکەرێ سوننەتە لەگەڵ وتنی ئامیندا قەستی دوعای قبووڵی مەعنای (اهدنا الصراط المستقيم)و، مەعنای (رب اغفرلی) بێنێتەوە دڵی خۆیەوەو، لە پاش لەفزی ئامین سوننەتە بۆ ئەو کەسەی فاتیحەی خوێندووە (رب العالمين) بڵێ، چ ئیمام بێ و چ بەتەنیا نوێژ بکات، خۆ ئەگەر مەئموم بۆی ڕێك نەکەوت لەگەڵ ئامینی ئیمامدا ئامین بکا، سوننەتە لەدوای ئەو بیکا.

ئەگەر ئیمام ئامینی لە میقداری سوننەت دواخست بۆ مەئموم سوننەتە ئامین بکا، وە ئەگەر مەئموم فاتیحەی خوێند لەگەڵ ئیمامدا و بۆ فاتیحەی خۆی ئامینی کرد، ئەنجا ئیمامەکەی ئامینی کرد، سوننەتە بۆ مەئموم جارێکی تر لەگەڵ ئیمامدا ئامین بکات.

لە وتنی ئامیندا سوننەتە درێژە بە ئەلیفی ئامین بدا بەقەدەر مەددەی (هابیل) هەروەها سوننەتە درێژە بە (ی)ی (ئامین) بدا و، لە پاش کەلیمەی ئامین بەقەدەر

(سبحان الله) ڕاوەستێ ئەنجا دەست بە خوێندنی سوورەتی پاش فاتیحە بکا.

بۆ ئیمام سوننەتە لە پاش ئامین کردن بە دەنگی بەرز قورئان نەخوێنێ هەتا مەئموومەکان فاتیحە تەواو دەکەن، لەو ماوەدا با بەپەنهانی قورئان بخوێنێ و، کاتێ باوەڕی هاتە سەر ئەوە کە مەئموم فاتیحەی تەواو کردووە ئەمیش دەنگ بەرز بکاتەوە هەتا مەئموومەکان گوێی لێ ڕابگرن، یاخود لەو ماوەدا بەپەنهانی ئەم دوعایە بخوێنێ کە ڕەوایە لەو کاتەدا بخوێنرێ: «اللهم باعد بيني وبين خطاياى كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقني من خطاياى كما يقنى الثوب الابيض من الدنس، اللهم أغسلنى من خطاياى كما يغسل الثوب الابيض بالماء والثلج و البرد». ناو بردنی ئەم شتانە لەم دوعایەدا هەموو بۆ موبالەغەیە لە تکای عەفووی خوا لە گوناهەکانی بەتەواوی. خۆ ئەگەر ئیمام ئەم دوعایەی نەخوێند، ئەوا دەتوانێ بێ دەنگ بێ و، بیر لە نیشانەکانی گەورەیی و دەسەلاتی خوا بکاتەوە تا مەئموومەکە فاتیحەکەی تەواو دەکا، ئەنجا ئیمام دەست بکا بە خوێندنی سوورەت بە دەنگی بەرز.

بۆ ئیمام و بۆ نوێژکەری بەتەنیا سوننەتە لە نوێژی بەیانیدا پاش سوورەتی فاتیحە لەو سوورەتانە بخوێنێ کە لە (طوالی مفصل)ن و ، لە نوێژی نیوەڕۆدا نزیك لە (طوالی مفصل)و، لە نوێژی عەسر و عیشادا لە (اوساطی مفصل) و، لە نوێژی مەغریبدا لە (قیصاری مفصل) بخوێنێ، بەڵێ لە نوێژی بەیانی جومعەدا سوننەتە سوورەتی (سوجدە)و (دەهر) و لە نوێژی جومعەدا یا ئەم دوو سوورەتە یاخود سوورەتی (جومعە) و (منافقین) بخوێنێ، یاخود سوورەتی (اعلى) و (غاشیە) بخوێنێ و، لە شەوانی جومعەدا لە نوێژی مەغریبدا لە رکاتی یەکەمدا سوورەتی (کافرون) ولە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی اخلاص بخوێنێ.

(بۆ زانین): (مفصل) بەو سوورەتانە دەڵێن کە ئایەتەکانیان کورت کورتن لەبەرئەوەی زۆر ئایەت لە ئایەتی تر جیا دەبێتەوە ناو نراون (مفصل). جا ئەم سوورەتە مفصلانە سێ بەشن : ١- درێژەکانیان لە سوورەتی (حجرات)ەوە تا سوورەتی عەممە واتە: (نبأ) ٢- مام ناوەندییەکانیان، کە نە زۆر درێژ و نە زۆر کورتن، لە سوورەتی (نبأ)ەوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە سوورەتی (الضحى) ٣- کورتەکانیان لە سوورەتی (الضحى)وە یە هەتا دوایی قورئانی پیرۆز.

هەروەها سوننەتە لە خوێندنی ئەم سوورەتانەدا تەماشای تەرتیب بکا واتە:

سورەتی(لهب) لە پێش سوورەتی (اخلاص)و، سوورەتی (فلق) لە پێش سوورەتی (ناس)دا بخوێنێ، سوننەتە سوورەتی ڕکاتی یەکەم درێژ تر بێ لە سوورەتی ڕکاتی دووەم، سوننەتە چاودێریی ئارامی و تەرتیل بکات لە هەموویاندا، خۆ (تەجوید) ئەوە هەر واجیبە.

شایانی باسە لە سوورەتی (الضحی)وە هەتا دوا سوورەتی قورئان لەدوای هەموو سوورەتێکەوە (تکبیر) سوننەتە.. واتە: «لا اله الا الله والله اکبر، الله اکبر ولله الحمد»

خوێندنی سوورەتێکی تەواو، با کورتیش بێ، گەورەترە لە خوێندنی چەند ئایەتێك هەرچەند لە سورەتەکە درێژ تر بن، مەگەر هەندێ ئایەتی تایبەتی، کە لە شەرعدا بەتایبەتی باس کراون وەك دوو ئایەتی دوایی سوورەتی (بەقەرە)و ئایەتی ئالی عیمران لە نوێژی سبەینێدا.

سوننەتە ئیمام ئارام و لەسەرخۆ بێ لە خوێندنی سوورەتەکان و زیکر و دوعاکاندا ، هەروەها لە کردەوەکانیشدا، هەتا مەئمورمە بێ هێزەکان زۆر لە ئیمام دوا نەکەون. ئەم ئارامییە بۆ نوێژکەری بەتەنیاش سوننەتە؛ هەتا لە مەعنای ئەوەی دەیخوێنن ئاگادار بن و دڵیان لای بێ و، سوننەتە لە کردەوەشدا بە ئەدەب بن.

ئەگەر بەهۆی پەلەپەل کردنی ئیمامەوە، مەئموم بۆی نەکرا لە دوو ڕکاتی یەکەم و دووەمی نوێژی (سری)دا سوورەت بخوێنێ، سوننەتە لە ڕکاتی سێیەم و چوارەمدا بیانخوێنێ، ئەو مەئمومەش کە ئیمام لێی پێش کەوتووە، هەمان حوکمی هەیە کە باسمان کرد، واتە: سوورەت بخوێنێ.

ئەگەر مەئموم لە پێش ئیمامدا فاتیحەی ڕکاتی سێیەم یا چوارەمی تەواو کرد، سوننەتە بە بێ دەنگی ڕانەوەستێ، بەڵکو سوورەت بخوێنێ، هەتا ئیمام دێ بۆ ڕکووع، وە ئەگەر مەئمومی لە نوێژی (جهریە)دا دەنگی ئیمامی دەبیست ئەوە سوننەت نییە، سوورەت بخوێنێ، بەڵکو دەبێ گوێ بگرێ. خۆ ئەگەر دەنگی ئیمامی نەدەبیست، ئەوا سوننەتە سوورەت بخوێنێ، بەڵام بە دەنگێکی پەنهان و کەس پێ نەزانیو.

بەش بەش کردنی سوورەتی کورت، کە سێ -چوار ئایەت بێ موخالیفی سوننەتە ، بەڵام ئەگەر سوورەتەکە درێژ بوو، قەی ناکا بەش بەشی بکا.

ئەگەر ئیمام لە دوو ڕکاتی یەکەم و دووەمدا سوورەتی نەخوێند ئەوە بۆ مەئمومەکە

سوننەتە بیخوێنێ ئەگەر ماوەی هەبێ، بەڵام ئەگەر ماوەی نەبوو خوێندنی سوورەت کەراهەتی دەبێ، نەبادا زیاد لە ئەندازە لە ئیمام دوا بکەوێ.

دەوام کردن لە سەر خوێندنی سوورەتێك یا چەند سوورەتێکی تایبەتی، پاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، مەکرووهە، مەگەر سوورەتێکی تر نەزانێ، یا شەرع دیاریی کردبێ.

جەلالەدینی سیوتی لە (عقبە)وە دەگێڕێتەوە:- «لن تقرء سورة أحب إلى الله، ولا أبلغ من «قل أعوذ برب الفلق» ، و «قل أعوذبرب الناس» «فأن أستطعت أن لا تدعهما في الصلاة فأفعل». بەڵێ ئەگەر خوێندنی تەنیا ئەو سوورەتانە بە نیازی تەخسیس نەبوو ئەوە قەی ناکا.

لە نوێژی (جەهری )دا، لە کاتێکدا کە ئیمام فاتیحە دەخوێنێ سوننەتە مەئمووم گوێ بگرێ، وە ئەگەر گوێگرتنی لەتوانادا نەبوو با (فاتیحە) بخوێنێ. هەرچەند (مبلغ)یش بێ، وە لە پاش خوێندنی سوورەت بەقەدەر (سبحان الله) یەك ڕاوەستێ ئەنجا بڕوا بە ڕکووعدا. ئەو سوننەتانەی تا ئێرە باسمان کردن دووسەدو بیست و دوو سوننەتن.

بەئاشکرا خوێندنی فاتیحە و سوورەت لە نوێژی جەهرییەدا بۆ کەسێك بەتەنیا نوێژ بکا سوننەتەو، بۆ ئیمام سوننەتی دووپاتە، ئیتر بۆ غەیری خوێندنی فاتیحە و سوورەت و (الله اکبر)ەکان، ئەگەر ئیمام بوو، دەنگی بەرز مەکرووهە.

سوننەتە لە کاتێکدا دەڕوا بۆ ڕکووع (الله اکبر) بکا و،لامی (الله) بەقەڵەوی بخوێنێ و، هەروەها رێی (اکبر)یش بە قەڵەوی بخوێنێ، سوننەتە (ر)ی (اکبر)بە زەنەدار بخوێنێ و، وای نەخوێنێ ببێتە دوو (ڕێ). سەرەڕای ئەمانەش جوان وتن و جوانیی لەهجە سوننەتن. بۆ مەئمووم و ئەوەی نوێژ بەتەنیا دەکات سوننەتە ئەم (الله اکبر)ە بەپەنهانی بخوێنێ، بەڵام بۆ ئیمام سوننەت وایە بە ئاشکرا بیخوێنێ. هەروەها سوننەتە لە سەرەتای دانەوینەوەدا بۆ ڕکووع دەست بە (الله اکبر)ەکە بکا و، لەگەڵ وتنیا هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە، ئەمە ئەسڵی سوننەتەکەیە، بەڵام کەمالی سوننەت لێرەدا ئەوەیە لە (الله اکبر)ەکانی نوێژدابەستن و چوون بۆ ڕکووع و بەرزبوونەوە بۆ ئیعتیدال و هەڵسانەوە لە تەحییاتی یەکەم بۆ ڕاوەستان هەردوو دەستی بەرزبکاتەوە، پەنجەکانی ڕاست بن و کەمێ بەینیان ببێ و، سەرپەنجەکانی کەمێ بەرەوناوەوە بن و، لە کاتی دەست بەرز کردنەوەدا سەری پەنجەکانی بەرامبەری لای ژووررووی گوێی بن و، سەری پەنجەی گەورەی بەرامبەری نەرمەی گوێی بێ و، بەری هەردوو دەستی ڕوو لە قیبلە بن و، بە

ئارام وشەی پیرۆزی (الله) بڵێ و لە (الله اكبر)ی ركووعدا درێژەبدا بە لامی (الله) تا هەردوو دەستی دەگەنە ئەژنۆكانی. بەڵام ئەم مەددە، وەك وتمان، لە (الله اكبر)ی نوێژدابەستندا سوننەت نییە.

سوننەتە بە ئارامی دانەوێ و پەنجەكانی لە سەر ئەژنۆكانی بڵاو دابنێ بڵاوییەكی كەم نەك زۆر، هەروەها سوننەتە پەنجەكانی لە سەر ئەژنۆكانی روویان لە قیبلە بێ و، سوننەتە زیادەڕەوی نەكات لە دانەوینەوەی ركووعدا. پێویستە گەیشتنی بەری هەردوو دەستی بەئەژنۆكانی طەبیعی بێ، ئەگەر لە پشتەوە سمتی هەردوو لای برد بەناوا بۆ ئەوەی دەستی بگاتە ئەژنۆی، ئەوە ڕكووعەكەی بەتاڵە، وەكو لە پێشەوە وتمان، ئەم مەسەلەش شتێكی نادیارییە. سوننەتە پشت و ملی لە كاتی ڕكووعدا هەردوو ڕێك بن. سوننەتە ئەژنۆكانی نەلكێنێ بەیەكەوە، بەڵكو بەقەدەر بستێ بەینیان هەبێ، سوننەتە سكی لە ئەژنۆیەوە دوور بێ و، ئەنیشكەكانی لە تەنیشتەكانی دوور بن.

سوننەتە گورج لە پاش ئارام گرتنی لە دانەوینی بۆ ركووعدا، بڵێ (سبحان ربي العظيم)و (وبحمده) لێ زیاد بكات. زانینی كورتە مەعنایەكیشیان سوننەتەو، لەو كاتەدا مەعناكەیان لە دڵیدا ئامادە بكا. سوننەتە بێ زۆر لە خۆكردن بە ئارام و بە پەنامەكی بیخوێنێ و ژمارەی خوێندنەكەی تاق بێ، واتە: یا یەك جار، یا سێ، یا پێنج، یا حەوت، یا نۆ، یا یازدە لە (١١) تێ نەپەڕێ، بەڵام بۆ ئیمام دروست نییە زیاتر لە سێ جار بیخوێنێ، مەگەر بۆ ئیمامی گەلێكی كەمی تایبەتی، كە ڕازیی بن بە درێژەدان بە نوێژەكەیان. جوان خوێندن و جوانیی لەهجەو بەعادەتی خوێندن و دوور لە زۆر لە خۆكردن سوننەتن.

بۆ نوێژكەری بەتەنیا و بۆ ئەو ئیمامەی وتمان لەپاش خوێندنی (سبحان ربی العظیم) سوننەتە بڵێت: (اللهم لك ركعت وبك آمنت ولك أسلمت، خشع لك سمعی وبصری ومخی وعظمی وعصبی وما أستقلت به قدمی) بەو شەرتە كە تەسبیحەكەی یازدە جار نەخوێندبێ، ئەگەرنا سوننەت نییە.

سوننەتە هەر لە سەرەتای سەر بەرزكردنەوە لە ڕكووع دەست بە خوێندنی (سمع الله لمن حمده) بكا بە جۆرێ كە لەگەڵ تەواو بوونی سەربەرز كردنەوەكەدا ویردەكەش تەواو بێ.

سوننەتە لەكاتی دەست بەرزكردنەوەدا دەستەكانی ڕووت بن و، پەنجەكانی

نەقونجێنێ و کەمێ بڵاویان بکاتەوەو، سەری پەنجەکانی بەرامبەری ژووری گوێچکەی بێ، بەڵام پەنجەی گەورەی دەبێ بەرامبەری نەرمەی گوێی بێ. سوننەتە سەری پەنجەکانی کەمێ مەیل بکا بۆ ناودەستی و، لەم کاتەدا ئەنیشکەکانی کەمێ دوور بن لە تەنشتی و، پاش ڕاست بوونەوە بڵێ:

«ربنا لك الحمد حمداً كثيراً طيباً مباركا فيه ، ملأ السموات و ملأ الارض وملأ ما بينهما وملأ ما شئت من شئ بعد» ئەم زیکرە لە کاتی ئیعتیدالی هەموو نوێژێکی فەرزا سوننەتە، نەك تەنیا لە نوێژی سبحەینێدا وەك خەڵك گومان دەبەن، سوننەتە بۆ هەموو نوێژکەرێك، ئیمام بێ یا مەئمووم یا تەنیا، کە ئەم زیکرە بە پەنهانی بخوێنێ. بۆ نوێژکەری بەتەنیا و ، بۆ ئیمامی کۆمەڵێك کە ڕازی بن بە درێژەپێدانی نوێژ، سوننەتە لە پاش زیکری پێشوو بڵێ: (أهل الثناء والمجد! أحق ما قال العبد، وكلنا لك عبد: لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ، ولا راد لما قضيت، ولا ينفع ذا الجد منك الجد) واتە: ئەی خوای شایانی ستایش و گەورەیی باشترین وتەیەك کە بەندەی تۆ بیڵێ، هەموویشمان بەندەی تۆین، ئەوەیە کەس ناتوانێ مەنعی ئەو شتە بکا کە تۆ بیدەی و، کەس ناتوانێ ئەو شتە بدا کە تۆ نەیدەی و، کەس ناتوانێ ئەوەی تۆ بڕیارت داوە بەرپەرچی بداتەوەو، دەوڵەت و دارایی و سامان سوود بە دارا ناگەیەنێ، هەموو سوود و قازانجێك هەر لە تۆوەیە. ئەم ویردە سوننەتە بە پەنهانی بخوێنرێت چ لە لایەن ئیمام یا مەئموومەوە یا ئەوەی بەتەنیا نوێژ دەکا، سوننەتە هەموویان مەعنای ئەم ویردە بزانن و بەیادی مەعناوە لەگەڵ تەلەففوزی باش و لەهجەی باشدا بیخوێنن. سوننەتە پاش ئیعتیدال لە سەرەتای دانەوینەوەی بۆ سوجدەی یەکەم دەس بە (الله اكبر) بکا و، درێژە بە ئەلیفی (الله) بدا تا دەگاتە سوجدەو، لامی (الله) بەقەڵەوی بخوێنێ، جا نوێژکەری بەتەنیاو مەئمووم بە پەنهانی دەیخوێنن، بەڵام ئیمام و مبلغ بە دەنگی بەرز. سوننەتە لە پێشدا ئەژنۆکانی بە داپۆشراوی بنێتە عەرد، ئەنجا هەردوو بەری دەستی بەجۆرێ کە بەرامبەری ناوشان بن، ئەنجا تەوێڵ و لووت دابنێتە سەر عەرد، بەڵام ڕووت کردنی تەوێڵ واجیبەو، ڕووت کردنی لووت واجیب نییە، بەڵکو سوننەتە، بەڵێ ئەمەی کە باسمان کرد شێوە سوننەتی سوجدەیە، نەوەك لە پێشدا دەستی لە سەر عەرد دابنێ و ئەنجا ئەژنۆکانی، وەك چۆن وشتر دەنوێ، ئەمە خراپە و نەهیی لێ کراوە.

پێویستە بزانن کە دانانی بەشێ لە تەوێڵ و لە هەردوو ئەژنۆکانی و بەری هەردوو دەست و سکی پەنجەی هەردوو پێی، واتە هەندێ لە پەنجەکان لەگەڵ ئارام گرتندا

واجیبه، ئەگەرچی ئەو بەشە زۆر کەمیش بێ، کەوابوو ئەگەر لە سوجدەی دووەمدا، تەنیا سکی پەنجەی یەك پێی داناو سکی پەنجەی پێیەکەی تری دانەنا ئەوە نوێژەکەی بەتاڵەو دووبارەکردنەوەی سوجدەکە واجیبە. گەلێ لە خەڵکی هەرەمە گیرۆدەن بەم جۆرە وەزعەوە؛ لەبەرئەوە لە دانیشتنی بەینی سوجدەکاندا بە شێوەی (افتراش) دادەنیشن و لە کاتی رۆیشتن بۆ سوجدەی دووەم ئەو وەزعی ئیفتیراشە تێك نادەن. جا رەحمەت لەو کەسانە کە نەزانەکان حاڵی دەکەن هەتا خۆیان لەو شێوەیە بپارێزن کە بۆ نوێژو ئادابی ئاین زیانی هەبێ.

دانانی هەموو سکی، هەموو پەنجەکانی هەردوو پێی و تەواوی تەوێڵ و ئەژنۆو لووت ئەوەی لە تواناد‌ا بێ ئەوە سوننەتەو واجیب نییە، وەکو باسمان کرد.

سوننەتە هەردوو پێی پیاو لە نوێژدا رووت بن مەگەر لەبەر عوزرێ وەکو سەرما یاخۆ لە کاتێکدا خوفی لە پێدا بێ و، مەسح لە سەر خوف بکا، ئەوە پێویستە پێی داپۆشراو بێ. سوننەتە لە کاتی باوێشکداندا لە نوێژدا پشتی دەستی لە سەر دەمی دابنێ. هەروەها سوننەتە لە سەر داوێنی کەسی تر سوجدە نەبا.

کاتێ رۆیشت بۆ سوجدە سوننەتە گورج بڵێ: (سبحان ربي الاعلى)، وتنی (وبحمده) سوننەتێکی ترە. سوننەتە ژمارەی ئەم تەسبیحە تاق بێ، واتە: یەك جار، سێ جار، یا پێنج جار، یا حەوت جار، یا نۆ جار، یا یانزدە جار بێ، بەمەرجێ ئیمام نەبێ؛ چونکە بۆ ئیمام رەوا نییە زیاتر لە سێ جار بڵێ، مەگەر مەئموومەکانی هەموو رازی بن. هەروەها سوننەتە هەموو کەس بەپەنهانی بیخوێنێ. سوننەتە بۆ تەنیا و بۆ مەئموم و ئیمام و بۆ (مبلغ) هەموویان ئەم زیکری سوجدەیە بە لەفزی جوان و لەهجەی رێکوپێك و بێ تەکلیف بخوێنن و مەعناکەی بزانن و ئاگایان لە مەعناکەیشی ببێ.

سوننەتە سکیان بەقەدەر بستێ لە ئەژنۆیان بەرز بێ و، هەردوو ئەنیشکیان لە تەنیشتیان دوور بێ، بەڵام بۆ ژنان سوننەت وایە کە سکیان بکەوێتە سەر ئەژنۆیان و، هەردوو باسکیان لە سەر عەرد دابنێن، چونکە ئەم شێوەیە موناسبی حاڵی ژنە.

سوننەتە بۆ هەموو نوێژکەرێ کە لەکاتی سوجدەدا ئیعتیماد بکاتە سەر بەری هەردوو دەستی و، پەنجەی دەستی لە سەر زەوی بێ و نەقونجاو بن و، بەیەکەوە لکابن و، روویان لە قیبلە بێ ، سوننەتە هەردوو پێیان نەسب بکرێن و، پەنجەکانیان روو لە قیبلە بن و، ئیعتیماد بکەنە سەر سینگی پێیەکان و سکی پەنجەکان.

سوننەتە بۆ نوێژکەری بەتەنیا لە پاش تەسبیحەکە لەکاتی سوجدەکەدا بڵێ:

«اللهم لك سجدت وبك آمنت ، ولك أسلمت. سجد وجهي للذي خلقه و صورة وشق سمعه و بصره بحوله وقوته، تبارك الله أحسن الخالقين». ئەم زیکرەش بە پەنامەکی دەخوێنرێ.

ئەنجا لە پاش تەواوکردنی ئەو زیکرە، کە لە سوجدەدا دەخوێنرێ، سوننەتە بۆ نوێژکەر سەر بەرز بکاتەوەو (الله اكبر) بکا، ئیمام و مبلغ بە ئاشکراو غەیری ئەمان بە پەنهانی بیڵێن. سوننەتە لە سەرەتای سەر بەرزکردنەوەکەدا دەست بە (الله اكبر)ەکە بکا و ئەلیفی (الله) درێژ بکاتەوە بەجۆری کە لەگەڵ تەواو بوونی سەر بەرزکردنەوەکەیدا (الله اكبر)ەکەش تەواو بێ.

لەپاش ئارامگرتن لە دانیشتنی بەینی سوجدەکان سوننەتە بەپەنهانی بڵێ: «رب أغفر لي وأرحمني وأجبرني وأرفعني وأرزقني وأهدني و عافني» هەروەها سوننەتە مەعنای بزانێ و ئاگای لە مەعناکەی ببێ و لەفزەکانی بە جوانی و بەلەهجەی جوان و بێ تەکلیف بخوێنێ و، بە ئارامی سەر لە سوجدە بەرزبکاتەوەو، هەردوو بەری دەستی لە سەر ڕانی دابنێ و، سەری پەنجەکانی لەسەری ئەژنۆکانی نزیك بن و، پەنجەکانی بڵاو بن و ڕوویان لە قیبلە بێ و بەیەکەوە لکاوبن. سوننەتە لە دانیشتنی بەینی سوجدەکاندا بە شێوەی ئیفتیراش دابنیشێ، واتە پێی ڕاستی هەڵ بنێ و پێی چەپی بخاتە ژێری، جا لەپاش تەواوبوونی زیکری بەینی سوجدەکان دانەوێ بۆ سوجدەی دووەم و، لە سەرەتای دانەوینەوەدا دەس بە (اللهاكبر)بکا و، درێژە بە ئەلیفی (الله) بدات هەتا لەگەڵ گەیشتنی بە سوجدەی دووەمدا تەواو بێ، هەروەها ئیمام و (مبلغ) بە ئاشکرا و غەیری ئەوان بە پەنهانی بیخوێنێ.

لەپاش ئارامگرتن لە سوجدەدا (سبحان ربي الاعلى و بحمده) بڵێ، بەتاق ، واتە: یەك جار ، یا سێ جار، هەتا یازدە، ئەگەر ئیمام نەبێ. ئەم زیکرە هەمیشە و بۆ هەموو کەس بە پەنهانی دەخوێنرێ. بۆ ئینسانی بەتەنیا نوێژ کردوو، بۆ ئیمام کۆمەڵێکی ڕازی بە درێژە بەنوێژدان سوننەتە ئەو زیکرە بخوێنێ کە لە سوجدەی یەکەمدا باسمان کرد، واتە:

«اللهم لك سجدت وبك آمنت ولك أسلمت، سجد وجهي للذي خلقه و صوره وشق سمعه و بصره بحوله و قوته ، تبارك الله أحسن الخالقين» ئەم ویردە باش بخوێنێ و مەعنای بزانێ و ئاگای لە مەعناکەی بێ و بێ تەکلیف بیخوێنێ.

لـەم سوجـدەشدا سونـنـەتـە کـە سکـی پـیـاو لـە ئـەژنـۆی و لـە ڕانـەکـانـی دوور بـێ و، ئەنیشکەکانی کەمێ لە تەنیشتی جیا بن، بەڵام بۆ ئافرەت سوننەتە کە سکی بلکێ بەڕانیەوەو، ئەنیشکەکانی بەتەنیشتیەوە.

سوننەتە پاش ئەوەی دەستی کرد بە سەر بەرزکردنەوە لەم سوجدەیە (الله اکبر) بڵێ و، لەگەڵ گەیشتن بە ڕادەی ڕاوەستاندا تەواوی بکا، سووکە، بەڵام ئەگەر ئیمام دانەنیشت بۆ حەسانەوەو، مەئمووم لەبەر پیری یا نەخۆشی سست بوو و، ئیمام بە پەلە دەیخوێند، ئەوە لەم شێوەدا دانیشتنی حەسانەوە بۆ مەئمووم سوننەت نییە؛ چونکە دەبێتە هۆی لە ئیمام دواکەوتن و، ترسی ئەوەیش هەیە کە بە دوو ڕوکن لە ئیمام پاش بکەوێ و نوێژەکەی بەتاڵ ببێتەوە.

لە دانیشتنی حەسانەوەدا سوننەتە دەستی لە سەر ڕانی دانێ لە نزیکی ئەژنۆکانیداو، پەنجەکانی دەستی نەنووقێنێ و ڕاست ڕایان بکێشێت بە جۆرێ لەسەری ئەژنۆکانی نزیك ببنەوەو، بیانلکێنێ بەیەکەوەو، ڕوویان لە قیبلە بێ.

کاتێ وێستی هەستێتەوە بۆ ڕسکاتی دووەم دەستەکانی لە پێش ئەژنۆکانی بەرز بکاتەوە. بەڵام با پەنجەکانی پێی لەجێی خۆیاندا بمێنن و لەو جێگایەدا بەرزیان نەکاتەوە.

لە هەستانەوەدا هێز بداتە سەر بەری هەردوو دەستی و پەنجەکانی و لەسەر عەرد دایان بنێ، چونکە ئەم نەوعە هەستانەوە ئاسانترەو، هەموو کەس بە ئاسانی بۆی دەکرێ و زۆرتر خاکینەییە، جگە لەوەش کە ئەم نەوعە هەڵسانەوە لە حەزرەتەوە (د.خ) سادر بووە، وەکو شێخی بوخاری (ر.خ) لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە بە ناوونیشانی: «باب : کیف یعتمد علی الارض أذا قام من الرکعة».

لە ریوایەتێکی تردا: حەزرەت (د.خ) لەکاتی هەستانەوەدا هەردوو دەستی لە سەر ئەژنۆکانی داناوەو ڕاست بووەتەوە، واتە: حەزرەت (د.خ) هەردوو شێوەکەی ڕەوابینیوە.

هەروەها شێوەی دووەم لە وائیلی کوڕی (حجر)ەوە بەم دەقەی خوارەوە ڕیوایەت کراوە: «وأذا نهض نهض علی رکبتیه، وأعتمد علی فخذیه» واتە: کە ڕاست دەبوویەوە لە سەر هەردوو ئەژنۆکەی ڕاست دەبوویەوەو هێزی دەدایە سەر ڕانەکانی. ئەمەش (ابو داود) ڕیوایەتی کردووە.. بەڵام زاناکانی ئاین فەرموویانە: ئەگەر نوێژکەر دەستی نەکردبوو،

بەشێوەی یەکەم سوننەتە وەك شێوەی دووەم ڕاست ببێتەوە؛ بەڵگەیان لە سەر ئەم ڕایەیان ئەوەیە کە حەزرەت (د.خ) زۆرتر لە سەر شێوەی یەکەم ڕاست بووەتەوە؛ بۆیە شێوەی یەکەمیان لە شێوەی دووەم بەباشتر زانیوە، ئیتر ئەم زانایانە گوێیان نەداوەتە ئەوەی کە شێوەی یەکەم وەك شێوەی ڕکووعی نوێژکەرێکە کە بەدانیشتنەوە نوێژ بکا و، کردنی کارێك لە جۆری کارەکانی نوێژ، نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. هۆی ئەم گوێ نەدانەشیان دوو شتە:

١- لەبەر پەیڕەوکردنی حەزرەت (د.خ) کە خۆی وەها هەستاوەتەوەو قورسایی خستووەتە سەر هەردوو دەست و پەنجەکانی کە لە سەر عەرد بوون.

٢- لەبەرئەوە ئەم جۆرە شێوەیە وەك ئەو کارانەیە کە نوێژەکەیان لە سەر ڕاوەستاوەو بێ ئەوانە جێبەجێ ناکرێ، لەبەرئەوە پەیدابوونی شێوەی ڕکووعی نوێژکەری دانیشتوو زیانی نییە؛ نابینی کە هەڵسوکەت و ئازو گوێزی نوێژ گەلێ کاری تێدایە کە لە جۆری کارەکانی نوێژن، بەڵام لەبەر پەیڕەوکردنی حەزرەت قە بووڵ کراوە، کەوا بوو ئەم شێوەیە لەو قاعیدەیە دەردەکرێ کە دەڵێ: (المبطل لا يغتفر لتحصيل المندوب) واتە: بۆ جێبەجێ کردنی سوننەتێك چاوپۆشی لە کارێك ناکرێ کە نوێژ بەتاڵ بکاتەوە[١] لە کاتێکدا دەبەوێ لە شوێنی خۆی هەستێ بۆ ڕاوەستان با پەنجەکانی پێی لە جێگەی خۆیاندابن، هەروەها لەو کاتەدا پێ نەخاتە پێشەوە؛ چونکە ئەم شێوەیە بە ناشیرینترین هەنگاو دانراوە بەلای خواوەو، لە کاتی ڕاست بوونەوەدا قورسایی نەخاتە سەر یەك دەستی؛ ئەم کەراهەتی هەیە، چونکە لەوانەیە سینگی لە قیبلە وەرچەرخێ و، کە بە کاری خۆی سینگی لە قیبلە وەرچەرخێ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. بەقیاس لە سەر مەسەلەی دواکەوتن لەئیمام لەبەر دانیشتنی حەسانەوە دەبێ دانانی یەك لە هەستانەوەدا حەرام بێ، بەڵام من نەمدیوە زاناکان ئەمەیان وتبێ، لەبەر ئیحتیات پێویستەو، دەبێ لە سەر هەردوو دەستی بەرزبێتەوە.

سوننەتە لە دانیشتنی نێوان دوو سوجدەداو، لە دانیشتنی حەسانەوەدا بەشێوەی (افتراش) دابنیشێ و، لە هەردوو دانیشتنەکەدا مابەینی هەردوو ئەژنۆی بەقەدەر یەك بست بێ و، پەنجەکانی بڵاوبن، واتە نەنووقاوبن، بەڵام لکابن بەیەکەوەو ڕوویان لە

---

(١) دەردەکەوێ کە خوالێخۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخ لە سەر ڕەئیی ئەحمەدی ڕەمەلییە، نەك ئیبنو حەجەر. وەرگێڕ

قیبلە بێ. سوننەتە پێی ڕاست نەسب بکا واتە: هەڵنێ و پەنجەکانی ڕوو لە قیبلە بن، وەکو وێنەی ئەمانە کە بەیان کران. ڕکاتەکانی تریش وەکو ئەمەیە کە باسمان کردو، هەموو سوننەتەکانی پێشوویان تیایە، «وجهت وجهي ...تاد» نەبێ، لەگەڵ تەسبیحاتەکەی پێشیدا: «الله اکبر کبیرا...تاد» واتە : ئەم دووانە لە ڕکاتەکانی تردا سوننەت نین، هەروەها ئەو سوننەتانەی لەپێش (الله اکبر)ی نوێژ دابەستندان لە ڕکاتەکانی تردا سوننەت نین.

تێکڕا سوننەتەکانی نوێژی دوو ڕکاتی، کە نوێژی بەیانییەو، نوێژی سێ ڕکاتی، کە نوێژی مەغریبەو، نوێژی چوار ڕکاتی، کە نوێژی نیوەڕۆو عەسر و عیشایە، لەگەڵ (وجهت وجهي....) و، تەسبیحی پێش ئەو و، سوننەتەکانی پێش (الله اکبر)ی نوێژدابەستن، شەش هەزار و چوار سەدو نۆزدە سوننەتن. هەر واجبێکیش بە حەفتا سوننەتەو، نوێژ هەموو خواپەرستیی و ئیتاعەتێکی تێدایە، ماڵ بەختکردن نەبێ و، نوێژ گەورەترین ئیتاعەتێکە کە بە بەدەن بکرێ؛ هەر لەبەرئەمەیە حەزرەت (د.خ ) فەرموویەتی: «نوێژ چاکترە لە هەموو ئیتاعەتێ کە بۆ ئوممەتی من دانراوە».

ئەی برای نەخوێنەوار! بە نەزانینی فاتیحەو تەحییات و بە نەزانینی سوننەتەکانی نوێژو ئەوانەی نوێژ بە تاڵ دەکەنەوە زۆر زیانت لێ دەکەوێ.

ئەی برای خۆشەویستم! خوای گەورە هۆی بەختیاری و خۆشی و ئاسایشی بۆ تۆ ئامادەکردووە، ئەی تۆ بۆچی گوێیان پێ نادەی و خێر و قازانجی خۆت لە دەست دەردەکەی؟!!

بزانن کە لە نوێژی بەیانیاندا لە کاتی ئیعتیدالی ڕکاتی دووەمدا، لە پاش (وملء ما شئت من شئ بعد) قنووت سوننەتە، لەگەڵ سڵاواتدان لە سەر حەزرەت (د.خ) و خزم و یارانی و، لەگەڵ تەسلیمیشدا، لەفزەکەشی ئەمەیە:

(وصلى الله على النبي وآله وصحبه وسلم) ئەم سڵاواتە بەم شێوەیە پێمان گەیشتووە؛ بۆیە زانایانی ئاین فەرموویانە: پێویستە صلاواتی دوایی قنووت بەم شێوە بێ و، نەهییان لەوە کردووە کە بڵێت: (وصلى الله على محمد..) تاد قنووتی مەشهوور ئەمەیە: (اللهم أهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، و تولني فيمن توليت، و بارك لي فيما أعطيت ، وقني شر ما قضيت؛ فانك تقضي ولا يقضى عليك، وأنه لا يذل من واليت، ولا يعز من عاديت، تباركت ربنا و تعاليت، فلك الحمد على ما قضيت نستغفرك ونتوب اليك، وصلى الله على النبي الأمي و آله وصحبه وسلم).

سوننەتە بۆ نوێژکەری تەنیاو بۆ ئیمامی کۆمەڵێکی دیاری، کە ڕازی بن بە درێژەپێدانی نوێژ، قنووتی حەزرەتی عومەریش بخوێنێ لە پاش قنووتی مەشهوور، ئەویش ئەمەیە: «اللهم أنا نستعينك، ونستغفرك ونستهديك، ونتوب اليك، ونؤمن بك، ونتوكل عليك، ونثنى عليك الخير كله، نشكرك ولا نكفرك، ونخلع و نترك من يفجرك، اللهم إياك نعبد و لك نصلي ونسجد نسعى ونحفد، نرجو رحمتك ونخشى عذابك أن عذابك الجد بالكفار ملحق». سوننەتە بۆ ئیمام کە لە قنووتەکەدا بە لەفزی جەمع بخوێنێ و بە دەنگی بەرز بخوێنێ. هەروەها سوننەتە بۆ مەئمووم لە قنووتی مەشهووردا هەر ئامین بکا. تا ئیمام دەگاتە «أنك تقضى...» لەوێوە ئەویش بیخوێنێ لەگەڵ ئیمامدا و، لەکاتی سەڵەواتدان و سەلام ناردن بۆ حەزرەت و ئال و ئەسحابی ئامین بکا، بەڵێ مەئموومێ کە دەنگی ئیمام نەبیسێ خۆی بە پەنهانی قنووتەکەی بخوێنێ.

سوننەتە بۆ ئیمام و بۆ نوێژ بەتەنیا کردوو کە لە هەمووی قنووتدا هەردوو دەستیان بەرز بکەنەوە، بەڵام بەشێوەیەکی مام ناوەندی نەك بە زیادەڕەوی، سوننەتە هەردوو ئەنیشکیان لە تەنیشتیان جیابکەنەوە، بەڵام نەوەك جیاکردنەوەیەکی زۆر. سوننەتە بەری هەردوو دەستیان ڕوویکەنە ئاسمان، ئەمە لە کاتێکدا بەڵایەکی تایبەتی نەبێ، ئەگەر هەبوو سوننەتە پشتی دەستی بکەنە ئاسمان.

في التحفه، في باب الاستسقاء: «وكذا يسن ذلك لكل من يريد رفع البلاء، ولو في المستقبل ليناسب المقصود، بخلاف قاصد تحصيل شئ فأنه يجعل بطن كفه إلى السماء لأنه المناسب بحال الآخذ أنتهى.»

سوننەتە پەنجەکانی دەستی کراوە بن و نەقوونجاو بن و سەر پەنجەکان کەمێ مەیلی بەری دەست بکەن و، دەستەکان ڕووت بن و، لە بەینی دەستەکانیانەوە تەماشای جێگەی سوجدەکەیان بکەن، سوننەتە کە مەعنای قنووتەکان بزانن و، ئاگایان لە کورتە مەعناکەیان بێ، لەگەڵ چاکی لەفز و لەهجەداو بەبێ تەکلیف بیخوێنێ، ئەم سوننەتی قنووتە هەمیشەییە داخڵی نوێژی بەیانیانەو بەس. سوننەتە لە پاش تەواوکردنی قنووت و، لە سەرەتای دانەوینەوە بۆ عەرد دەس بە (الله اكبر) بکا.

سوننەتە درێژە بە ئەلفی (الله اكبر)بدا بەقەدەر دوو هەناسە ئەنجا سوجدە ببا. بەم دوو سوننەتە ژمارەی سوننەتەکانی نوێژی بەیانی دەگاتە سەد و چل و چوار سوننەت.

تەحییاتی یەکەم سوننەتەو، لە دانیشتنەکەیدا (ئیفتیراش) سوننەتە، کە ئەوەیە پێی

ڕاستی ڕاست کاتەوەو پێی چەپی بخاتە ژێری، نەرم کردنی جومگەی پشت سوننەتە، واتە: بەبێ عوزر پشتی نەچەمێنێتەوەو بەهیچ لایەکدا مەیل نەکات، یانی: نە بەلای ڕاستدا و نە بەلای چەپداو نە بەرەوپێش و نە بەرەو دوا لار نەبێتەوەو، سوننەتە هەردوو بەری دەستی لە سەر ڕانی دابنێ نزیك بە ئەژنۆی و، سێ پەنجەی دەستی ڕاستی لەلای ڕاستیەوە بنووقێنێ و، پەنجەی شەهادەتی بەرەڵلا بکا و، پەنجە گەورەکەی پێوە بلکێنێ بەشێوەیەك کە سەری پەنجەکەی بدا لە بنی پەنجەی شەهادەتی و، سەری پەنجەی شەهادەتی بەرامبەری سەری ئەژنۆی دابنێ و، سەری پەنجەکانی دەستی چەپیشی بەرامبەری سەری ئەژنۆی چەپی دابنێ و، پەنجەکانی دەستی چەپی هەموو بەرەلاو ڕوو لە قیبلەو بەیەکەوە لکاوین، کە لە وتەی شەهادەتدا گەیشتە (الا الله) پەنجەی شەهادەتی دەستی ڕاستی بەرز بکاتەوە، بەقەدەر ئەوەندەی کە دەنکە مێوژێك لەژێریا جێی ببێتەوەو، نیازی دڵی بەم پەنجە بەرزکردنەوەیە دڵسۆزی و دڵساغی بێ لە خوا بە یەك ناسیندا و کەمێ سەری پەنجەی شەهادەتی دانەوێنێ بۆ سەر ئەژنۆی لە دوا دوایی (الا الله)دا، ئەنجا لە تەحییاتی یەکەمدا تا ڕاست دەبێتەوە و، لە تەحییاتی دووەمدا تا سەلام دەداتەوە با پەنجەی شەهادەتی بەرزبێ و لە سەر ئەژنۆی بێ و، بۆی بڕوانێ؛ چونکە ئەم شێوەیە دەبێتە هۆی ئاگاداری و ڕاگرتنی بیری دڵسۆزی و خوا بەیەك ناسین و، تا نوێژەکەی تەواو دەبێ لە سەر باشترین ئەحواڵی ئاگاداری دەوام بکا، جا با پەنجەی شەهادەتی نەجووڵێنێتەوە؛ چونکە جووڵاندنەوەی کەراهەتی هەیە.

«وأن حركه مع الكف بطلت صلاته بثلاث حركات متواليات عامداً عالماً ، قال أبن قاسم».

واتە: ئەگەر پەنجەی لەگەڵ بەری دەستیدا جووڵاندەوە، بە دەسەنقەست ئەمەی کرد و دەیزانی خراپە، ئەوا بەهۆی سێ بزووتنەوەی یەك لە دوای یەك نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. با لە بەرزکردنەوەی پەنجەی شەهادەتیدا زیادەڕەوی نەکا، چونکە پێچەوانەی ئەدەبە.

سوننەتە هەموو تەحییاتەکەی بەپەنهانی بخوێنێ و، لە دوو شەهادەتەکاندا دەنگ بەرز نەکاتەوە؛ ئەم دەنگ بەرزکردنەوەیە مەکرووهە. سوننەتە مەعنای تەحییات بزانێ و ئاگاداری کورتە مەعنایەکی بێ و، خوێندنەوەو لەهجەی باش بێ و زۆر لەخۆکردنی تێدا نەبێ. سەڵەواتدان لە ئال لە تەحییاتی یەکەمدا سوننەت نییەو، لە تەحییاتی دووەمدا سوننەتە.

لەپاش تەواوکردنی تەحییاتی یەکەم بەرزبێتەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و، (اللە ا کبر) بڵێ و، درێژە بدا بە ئەلفی(اللە) تا بەتەواوی ڕاست دەبێتەوە، سوننەتە هەردوو دەستی ڕووەو قیبلە بەرز بکاتەوەو لاریان نەکاتەوە. سوننەتە پشتی هەردوو دەستی بەرامبەری شانی بێ و، پەنجەکانی نەنووقێنێ و، پەنجەی گەورەی بەرامبەری نەرمەی گوێچکەی بێ و، سەری پەنجەکانی تری بەرامبەری لای ژووروویی گوێچکەی بن و، کەمێ سەری پەنجەکانی بچەمێنێتەوە، سوننەتە پەنجەکانی بەیەکەوە نەلکێنێ و زۆریش بڵاو نەبن و، بە ئارامی لە بەرزەوە بیانهێنێتە خوارەوە. سوننەتە هەردوو دەستی لە خواری سینەوەو لە ژووری ناوکیەوە دابنێ، بە جۆرێ دەستی ڕاستی لە سەر پشتی دەستی چەپی دابنێ و جمگەی چەپی بە پەنجەی دەستی ڕاستی بگرێ و، پەنجەکانی ڕاست بەسەر درێژیی دەستیدا درێژ بکاتەوە، وەکو لە باسی تەکبیری تەحەڕومدا نووسیمان.

ئەمە چل وحەوت سوننەتن کە لە نوێژی سبەینێیاندا نین و، لە نوێژەکانی تردا هەن و، هەریەك لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر (١٥٣٣)و، نوێژی مەغریب (٩٦ ١٠) سوننەتی هەیە.

ئەو نوێژکەرەی کە ئیمامی لێ پێش کەوتووە، ئەگەر ئیمامەکەی دەستی بەرزکردەوە، سوننەتە ئەمیش دەست بەرز بکاتەوە، ئەگەرنا ئەمیش دەست بەرز نەکاتەوە. هەروەها لەگەڵ ئیمامدا (اللە اکبر) بڵێ، ئەگەرچی تەحیاتی یەکەمی لە جێگەی خۆیدا نەبێ، وە ئەگەر ئیمام سەلامی دایەوەو، شوێنەکە شوێنی تەحییاتی مەسبووق نەبوو، ئەوە کاتێ کە هەستایەوە(اللەاکبر)نەڵێن. وە ئەگەر مەئمووم لەپێش هەستانی ئیمامدا تەحییاتی یەکەمی تەواو نەکردبوو، ئەوە هەتا ئیمام هەڵنەستێتەوە خەریکی خوێندنی تەحییات بێ، جا کاتێ ئیمام هەستا ئەویش هەڵسێتەوەو، دوابەدوای ئیمام هەڵسوکەوت بکا، چونکە دواکەوتن و هاوجۆریی لەگەڵ ئیمامدا واجیبەو، خوێندنی تەحییاتی یەکەم سوننەتە. بەڵام ئەگەر مەئموومەکە مەسبووق بوو واتە: ئیمام لێی پێش کەوتبوو و، جێگەی تەحییاتی خۆی نەبوو، ئەوە باشتر دەبێ لەگەڵ ئیمامدا ڕاست ببێتەوە.

ئەگەر مەئمووم بەهۆی خوێندنی تەحییاتەوە بە دوو ڕوکن، چ درێژ چ کورت، لە ئیمام پاش کەوت، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە ئەم پاشکەوتنە لە تەقسیرەوە بووەو وەکو مەسەلەی بێ قسوورێك نییە، کە هەتا بە سێ روکنی درێژ لە ئیمام پاش نەکەوێ نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

جا ئەگەر لە مەسەلەی پاشکەوتندا ، پێش ئەوەی کە بە دوو روکن لە ئیمام دوابکەوێ

نییەتی لە ئیمام جیابوونەوەی هێناو، بۆ خۆی نوێژی کرد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

لە تەحییاتی دواییدا دانیشتن بەشێوەی (تورك) سوننەتە، واتە: نوێژکەر پێی ڕاستی (نەصب) بکا و، پێی چەپی لە ژێر پێی ڕاستیەوە دەربکا و، لە سەر ولْمەی بنی ڕانی چەپی دابنیشێ، بە مەرجێ ئەم جۆرە دانیشتنە ڕێگای (خوشوو‌ع)ی لێ نەگرێ، واتە: ئەوەندە لە سەر لەشی گران نەبێ کە دڵی تێك بدا، ئەگەرنا سوننەت نییە؛

چونکە هەر سوننەتێك ڕێگا لە (خوشوو‌ع) بگرێت، ئەوە بەجێهێنانی مەکرووهە.

ئەگەر یەکێك سوجدەی سەهووی لە سەر بوو و نییەتی وابوو ئەو سوجدەیە ببا، ئەوە سوننەتە لە تەحییاتی دواییدا بەشێوەی (ئیفتیراش) دابنیشێ، خۆ ئەگەر نییەتی نەبوو سوجدە سەهووەکە ببا ئەوە سوننەتە بە شێوەی (تورك) دابنیشێت، جا ئەگەر لەم نییەتە پەشیمان بوویەوە، ئەوا سوننەتە بگەڕێتەوە بۆ شێوەی ئیفتیراش، بەڵام بەوشەرتە لەم گەڕانەوەدا بەقەدەر ڕکووعی ئەو کەسەی بەدانیشتنەوە نوێژ بکا، نەچەمێتەوە؛ چونکە کارێکی وەها بەپێی (اصح) نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، ئەم مەسەلەیە پەنهان و نادیارەو زۆرجار ڕوودەدا.

بۆ مەئموومێك کە ئیمام لێی پێش کەوتبێ، سوننەتە لە تەحییاتی دوایی ئیمامدا بەشێوەی ئیفتیراش دابنیشێ.

تێکڕا لە هەردوو جۆرە دانیشتنەکەی ئیفتیراش و تەوەڕوکدا سوننەتە پێی ڕاستی نەسب بکا و، پەنجەکانی ئەم پێیەی ڕوو لە قیبلە بن. سوننەتە لە دانیشتندا جومگەکانی پشتی باش نەرم بکا ، واتە: پشتی لار نەکاتەوەو، بە هیچ لایەکدا لانەدا. سوننەتە بەری دەستی ڕاستی لە نزیکی ئەژنۆ یا لەسەر ڕانی دابنێ. سوننەتە پەنجەکانی دەستی ڕاستی یەکەم و دووەم و سێیەمی – لای ڕاستەوە– بنووقێنێ و، پەنجەی شەهادەتی بەرەڵلا بکات و، سەری پەنجەی گەورەی بە بنی پەنجەی شەهادەتیەوە بلکێنێ و، سەری پەنجەی شەهادەتی بەرامبەری سەری ئەژنۆی بێ. هەروەها سوننەتە سەری پەنجەکانی دەستی چەپی لەسەر ڕانی چەپی لەنزیکی ئەژنۆیەوە دابنێ و، هەموویان بەرەڵلا بکا و بیانلکێنێ بەیەکەوەو ڕوو لەقیبلە بن.

سوننەتە باسکەکانی لە سەر ڕانەکانی دابنێ. سوننەتە لەگەڵ وتنی (الا الله)دا پەنجەی شەهادەتی بەرز بکاتەوەو بەقەدەر ئەوەندەی کە دەنکە مێوژێك بەژێریا بچێ. سوننەتە

پەنجەی شەهادەتی بە بەرزی ڕابگرێ هەتا سەلام دەداتەوە، هەروەها هەمیشە تەماشای پەنجەی شەهادەتی بکا بۆ، ئەوەی تا دوایی نوێژەکە خاترجەمع بێ. سوننەتە پەنجەی شەهادەتی نەجوولێنێ. چونکە جوولاندنەوەی مەکرووهە. هەروەها لە بەرزکردنەوەی پەنجەکەیدا زیادەڕەوی نەکا، چونکە خیلافی ئەدەبە. سوننەتە بەپەنهانی و بە جوانی و ئارامی و لەهجە باشی و حازرکردنی مەعناوە دوو شەهادەتەکە بخوێنێ، سەڵەواتدان لە ئالی پێغەمبەر (د.خ) لەم تەحییاتی دواییەدا سوننەتە و زیاد لەسەرئەوەش هەتا (حمید مجید) سوننەتە، تەنانەت بۆ ئیمامیش، بەمەرجێ ئەو ئیمامە ئیمامی مزگەوتی سەر ڕێگا نەبێ، واتە: لەوانە نەبێ کە خەڵکی تر بێجگە لە کۆمەڵە مەئموومەکەی خۆی بێن و ئیقتیدای پێ بکەن، هەروەها کۆمەڵە مەئموومەکەی خۆیشی ڕازی بن و، هەقی خەڵکیان بەسەرەوە نەبێ، وەکو ئینسانی کرێکارو ژنی شوودار، هەروەها ئەوەندە ماوە مابێ کە بەشی نوێژێکی ڕەسا بکا، هەرچەند پاش ئەوە کاتەکە تەواو بی .. ئەو زیادەش ئەمەیە:-

(اللهم صل على محمد عبدك ورسولك النبي الأمي وعلى آل محمد وأزواجه أمهات المؤمنين وذريته وأهل بيته، كما باركت على أبراهيم وعلى آل أبراهيم أنك حميد مجيد).

سوننەتە بۆ نوێژکەر ئەم سڵاواتە بزانێ و، بە پەنهانی بیخوێنێ و مەعناکەی بزانێ و، ئاگای لە مەعناکەی ببێ و، لەفز و لەهجەی جوان بێ و لە زۆر لەخۆ کردنەوە دوور بێت.

سوننەتە دوعاکانی پاش تەحییات بخوێنێ وەکو:

(اللهم أغفر لي ما قدمت وما أخرت وما أعلنت وما أسررت وما أسرفت وما أنت أعلم به مني، أنت المقدم وأنت المؤخر، لا اله الا أنت أستغفرك وأتوب اليك).

یا وەك: (اللهم أني أعوذ بك من عذاب جهنم ومن عذاب القبر و من فتنة المحيا والممات ومن فتنة المسيح الدجال).

ئەم دوو دوعایە هەردوویان مەئسوورن ، واتە: لە حەزرەتەوە وەرگیراون (د.خ) بەلام دووەمەکەیان گەورەترە، چونکە خیلاف لەوەدا هەیە کە واجیب بێ.

سوننەتە، بۆ ئەو ئیمامەی کە چاوەڕێی خەڵك نەبێ بێن و داخڵی نوێژبن، ئەو دوعایە کە دەیخوێنێ کەمتر بێ لە لای کەم لە تەحییاتی واجیب و لە سەڵەواتی واجیب و، لەمانە زیاتر نەخوێنێ، بەڵکو گەورەتر ئەوەیە لەوانە کەمتر بخوێنێ؛ چونکە مەکرووهە بەقەدەر ئەوانە بخوێنێ. ئەم مەسەلەش پەنهانە.

بەڵام بۆ نوێژکەری بەتەنیا سوننەتە ئەو دوعایانە بخوێنێ و، دروستە لەوانەش زیاتر بخوێنێ ئەگەر نەکەوێتە ناو سەهووەوە. دیارە ئەم زیادە خوێندنە بۆ مەئمووم نییە؛ چونکە مەئمووم دواکەوتووی ئیمامە. سوننەتە ئەم دوعایانە بەپەنهانی بخوێنێ و، مەعنایان بزانێ و، ئاگای لە مەعنایان بێ. هەروەها سوننەتە لەفظ و لەهجەی جوان بێ و لە خوێندندا عادەتی بێ و زۆر لە خۆی نەکا و زیادەڕەوی نەکا.

ئەگەر مەئمووم تەحییاتی یەکەمی لە پێش ئیمامدا تەواوکرد، با بێ دەنگ نەبێ، بەڵکو دوعاکانی تەحییاتی دوایی بخوێنێ تا ئیمام ڕاست دەبێتەوەو، حوکمی ئەو کەسەش ئیمام پێشی کەوتووە هەروەهایە هەتا ئیمام هەڵدەستێ.

سەلامی دووەم سوننەتە، ئەگەرچی ئیمام تەرکی بکات، بەڵام ئەگەر مانعێ ڕووی دا لەکاتی ئەم سەلامی دووەمەدا، وەکو بێ دەستنوێژی ، یا تەواوبوونی وەختی نوێژی جومعە، یاخۆ نوێژکەر خوففی لەپێدا بوو بە مەسحی خوففەوە نوێژی دەکردو، لە کاتی سەلامەکەدا خوففەکەی دڕا، یا سەفەری بوو بە مەسحی خوففەوە نوێژی دەکردو، لە کاتی سەلامەکەدا نییەتی ئەوەی هێنا جێنشین بێ و سەفەری نەبێ، یاخۆ لەو کاتەدا ماوەی ڕەوابوونی مەسحەکە تەواو بوو، کە بۆ نیشتەجێ شەو و ڕۆژێکەو، بۆ مسافر سێ شەو و سێ ڕۆژە، یا کەوتە گومان لە تەواو بوونی ئەو ماوەیە، لەم حاڵەتانەدا هەموویان سەلامی دووەم حەرامە؛ چونکە ئەم سەلامە گەلێ پەیوەندیی بە نوێژەکەوە هەیەو ، وەکو ئەوەیە کە هێشتا نوێژکەر لە نوێژدا بێ، دیارە نوێژیش لەگەڵ ئەم مانیعانەدا دروست نییە. ئەم مەسەلەش زۆر پەنهان و نادیارە. سەلامی یەکەم، هەرچەند واجیبە، چونکە هۆی بڕانەوەو تەواو بوونی نوێژەکەیە، نییەتی دەرچوون لە نوێژ سوننەتە لەگەڵیدا، واتە: لەگەڵ سەرەتای سەلامەکەدا بیبەیتە دڵتەوە کەوا نوێژەکەت تەواو بوو.

سوننەتە وتنی(سلام) لە سەر سینگ بێ و، وتنی(علیکم) لای ڕاستەوەبێ. سوننەتە بڵێ: (ورحمة الله وبرکاته). سوننەتە مابەینی دوو سەلامەکە بەقەدەر (سبحان الله)یەك بێ، بە مەرجێ ئیمامەکە لەوە نەترسێ کە مەئموومەکانی پێش ئەو سەلام بدەنەوە، ئەگەر ئەم ترسەی هەبوو دەبێ یەك لە دوای یەك و بێ جیاکردنەوە، هەردوو سەلامەکە بداتەوە. هەروەها سوننەتە لە سەلامی دووەمیشدا وتنی(سلام) لە سەر سینە بێ و، وتنی(علیکم) لەلای چەپەوە، بەجۆرێ کە لەپێشەوە کوڵمی چەپی ببینرێ. ئەگەر لەکاتی سەلامدانەوەی یەکەمدا نوێژکەر ئەوەندە زۆر لای کردەوە کە سینەی لە عاستی قیبلە وەرچەرخا، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

سوننەتە سەلامدانەوە چ بە پەلە بێ، واتە: زۆر سستی تیا نەکرێ.

سوننەتە مەئمووم پاش هەردوو سەلامەکەی ئیمام سەلام بداتەوە، چونکە تەواو بوونی سەلامی مەئمووم لە پێش تەواو بوونی سەلامی دووەمی ئیمام هۆی لە کیس چوونی سەوابی مەئموومە؛ چونکە مەکرووهە.

ئیمامی نەوەوی لە کتێبی (مەجمووع)یدا دەڵێ: تەرك کردنی سوننەت مەکرووهە، بەڵام بە لێکۆڵینەوەی زانا دواییەکانی ئاین تەرك کردنی سوننەت (خلاف الاولی)یە.

سوننەتە مەئمووم و نوێژ بەتەنها کردوو بەپەنهانی سەلام بدەنەوە، بەڵام ئیمام و (مبلغ) سەلامی دووەم بەئاشکرا بخوێنن[1] سوننەتە نوێژکەر مەعنای سەلام بزانێ و، ئاگای لە کورتە مەعنایەکی هەبێ. سوننەتە لەفز و لەهجەی باش و، بە بێ تەکەللوف بیخوێنێ.

بۆ مەئمووم و بۆ نوێژ بەتەنیا کردوو سوننەتە لە سەلامی یەکەمدا نییەتی سەلامکردنی ببێ لەو کەسانەی کە لەلای ڕاستیەوەن، چ لە فریشتە پارێزەرەکان و چ لە فریشتەی ترو، چ لە ئادەمیزاد. هەروەها لەکاتی سەلامی دووەمدا نییەتی سەلامکردنی ببێ لەو کەسانەی کە لەلای چەپیەوەن لە فریشتە و موسڵمانانی ئادەمیزادو پەری و، بەهەر کام لەم دوو سەلامە نییەتی سەلامکردنی لە ئیمام ببێ قەی ناکا، بەڵام بە سەلامی یەکەم باشترە.

ئیمامیش بە سەلامی یەکەم لە ئەهلی لای ڕاستی و، بە سەلامی دووەم سەلام لە ئەهلی لای چەپی بکا. ئیتر بۆ ئەوانەی کە لە پشتیەوەن بەهەر کام لەم دوو سەلامە قەستیان بکات باشە.

مەئموومەکانی ریزی هەرە دوایین، چونکە کەس لە پشتیانەوە نییە تەنیا قەستی سەلام بکەن لەوانەی لە پێشیانەوەن، بە سەلامی یەکەم بێ یا دووەم . بەڵام مەئموومەکانی ڕیزەکانی تر دەتوانن بە هەر کام لەم دوو سەلامە قەستی سەلام لە ڕیزی پێشەوەیان بکەن[2] ئەی برادەرینە! بێجگە لەم سوننەتانە، کە باسمان کردن، سوننەتی

(١) بەئاشکرا خوێندنی سەلامی دووەم لەلایەن ئیمام و (مبلغ)ەوەم لە هیچ کتێبێکدا نەدیوە.

وەرگێڕ

(٢) لە نوسخە دەستنووسەکەدا لێرەدا نووسراوە: ئەمە شەشسەدو شەش سوننەتن بەیان کران، کە داخڵی=

نوێژ زۆرن، یەکێ لەوانە ئەوەیە: سوننەتە بۆ ئەو کەسانەی کە لەکاتی قامەت کردندا دانیشتوون لە پاش تەواوکردنی قامەتەکە هەستن، بەمەرجێ کە پیرو نەخۆش نەبن، ئەگەر وابوون سوننەتە، بۆیان لە کاتێکدا هەستن کە بە (الله اکبر)ی نوێژدابەستنی ئیمامدا بگەن.

هەروەك بۆ ئەو کەسانە، کە لە کاتی قامەت کردندا لەو شوێنەدا ڕاوەستاون، سوننەتە دانەنیشن. هەروەها سوننەتە پاش بەجێهێنانی نوێژە فەرزەکان دەست بکەن بەو زیکرو ئەورادانە کە مەئشوورن و بیانخوێنن، ئەنجا لە پاش ئەوانە نوێژە سوننەتەکان بکەن، مەگەر ترسی لە کیس چوونی ئەو نوێژە سوننەتانەیان هەبێ، لە کاتی ئەم ترسەدا دیارە نوێژە سوننەتەکان پێشی ئەورادەکان دەخرێن.

شایانی زانینە: هەر سوننەتێك لەم سوننەتانی نوێژە خێرو پاداشتیان لە میهرەبانیی خوای گەورە یەك بە دەیە تا بە پێنسەد و زیاتر. بەم پێیە پاداشی سوننەتەکان گەلێك زۆر دەبن.

ئەی برادەرینە! لە خوای پایە بەرزو بێ خەوش تکاکارم حاڵتان بەجۆرێ بگۆڕێ کە خەمی خۆتان بخۆن. هەروەکو شەو و ڕۆژ خەریکی چارکردن و پەیداکردنی ژیان و بەجێهێنانی ئارەزووی نەفستانن و، خەریکی دابینکردنی خۆشین بۆ خێزان و منداڵتان، کەمێکیش بۆ بەجێهێنانی ئاسایش و ڕەحەتیی پاشەڕۆژی نەبڕاوەی خۆتان تێ بکۆشن و، هۆی ئازادبوون لە ئازاری گۆڕو سزای ڕۆژی قیامەت بۆ خۆتان مسۆگەر بکەن. لای کەمی ئادابی ئەم پێنج فەرزە نوێژانە و مەرج و روکن و سوننەتەکانیان بزانن و، ئەوەش بزانن کە نوێژ بە چی بەتاڵ دەبێتەوەو، بە چ جۆرێ دەبێتە هۆی بەختیاری و پیرۆزیی نەبڕاوەتان. بەتایبەتی فێری دڵسۆزی و لە خوا ترسی بن و، ئارام بوونی دڵ و ئەندامەکانتان لە نوێژەکانتاندا ڕاگرن؛ چونکە بە فەرموودەی هەندێ ئەهلی دین و ئاین: هەر نوێژێ (خوشووع وخزووع)ی تیا نەبێ بەتاڵە، ئەوانە فەرموویانە: خوشووع لە بەشێ لە نوێژەکەدا مەرجی دروست بوونی نوێژە؛ واتە: ئەگەر نوێژەکە هەر هیچ خوشووعی تێدا نەبوو، ئەوە بەتەواوی بەتاڵە.

---

= هەر پێنج فەرزەکانن، کەوابێ سوننەتی نوێژی بەیانی نۆسەد و دوانزە سوننەتن و، بۆ نوێژی مەغریب بوون بە هەزارو دووسەد و شەست و دوو سوننەت و، بۆ نیوەڕۆ و عەسر، عیشا، هەریەك، گەیشتنە هەزارو پێنسەدو نەوەدو نۆ سوننەت. وەرگێڕ

ئەی برادەرینە! دەخیل سەد دەخیل! ئەم پایە بەرزە و ئەم پاداشە مەزنە کە لە نوێژدا هەیە لە کیسی خۆتانی مەدەن، ئەم پێنج فەرزانە بە خۆیان و نوێژە سوننەتەکانی پاش و پێشیانەوە لە هەر شەو و ڕۆژێکدا زیاتر لە دوو سەعاتیان ناوێ واتە: بیست و دوو سەعاتتان بۆ دەمێنێتەوە، بۆ خۆتان و بۆ ئەرك و ئازاری دنیا بەکاری بێنن، ئامۆژگاریی ئەهلی تەمێ و تەربیەی ئاین وەربگرن. مەیدانی پەشیمان بوونەوەو بۆ لای خوا گەڕانەوەو، بەدەستهێنانی بەختیاری، زۆر گوشادە. فەرمووودەی پێغەمبەرە (د.خ): گەورەترین خووڕەوشتی باش و بەکەڵکی موسڵمان ئەوەیە کە لە بیستنی خێری ئاینیی خۆی تێر نەبێ. باقی: السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە. رحم الله أمریء أذا رای سنة ترکتها کتبها فیها.

## نامەی یازدەیەم

# باسی ویردەکانە

بسم الله الرحمن الرحیم

بسم الله، الحمد لله، والصلاة والسلام علي رسول الله.

پاش ئەمە، ئەی برادەرینە! لەناو خەڵکدا ئاشکرایە کە دەڵێن: "من عرف نفسه فقد عرف ربه" واتە هەرکەس خۆی بناسێ بەو سیفەتەی کە (حادث)ە، واتە: لە خۆیدا نەبووەو خوا دروستی کردووە، وە (ممکن)ە، واتە: بوون و نەبوونی لەخۆیدا وەك یەك وایەو، خۆی لە زاتی خۆیدا نە بوونی واجیبەو نە نەبوونی واجیبەو، ئەگەر ئیرادە و خواستی خوا لەسەر بوونی بێ، دەبێ و. ئەگەر ئیرادە و خواستی خوا لەسەر نەبوونی بێ، نابێ. هەروەها (محتاج)ە، واتە: لە زات و سیفات و لە هەموو پێویستییەکیدا موحتاجی خوای باڵایەو، ئەو چاودێریی دەکا، ئەوە ئەو کەسە بەهۆی ناسینی خۆیەوە خوای بەرزوباڵا دەناسێ و ئەوە دەزانێ کە خوای گەورە دروستکارو، پەروەردگار و (واجب الوجوده)و، بێ ئیحتیاج و بێ نیازە لە جیهان. بە کورتی کە ئادەمیزاد خۆی ناسی خوای خۆیشی دەناسێ.

ئەی براینە!

ئەو ناسینە ئەمەیە کە ئادەمیزاد بە ڕاستی بڵێ: من جیسم و لەشم و، بەهۆی ئیسقان و ڕەگ و گۆشت و خوێن و ئەندامەکانی تری لەشەوە هەم و گیانم بە بەردا کراوەو، خاوەن گیان و خاوەن دڵ و هۆشم و، هێزی تووڕەبوون و ڕقهەڵگرتنم هەیەو، هێزی ئارەزوو کردنم هەیە، کە دیارە ئارەزووی خواردن و خواردنەوە و شتی ترم هەیەو، هێزی زانستم هەیە. ئەمانەش هەموویان هیچیان لە خۆمەوە نین و، هەمووم لە پەروەردگارەوە وەرگرتووە، کەوابێ دەبێ من حوقووقی ئەو پەروەردگارەی خۆم بناسم و ئەو حوقووقەی جێبەجێ بکەم و، خۆم لە گیانلەبەرانی بێ عەقڵ و هۆش جیا بکەمەوە و، دان بەوەدا بنێم کە ئەو خوایە بە بێ حیکمەت دروستی نەکردووم، بەڵکو ئەم پایەی وجوود و هۆش و عەقڵەی پێ داوم بۆ ئەوەی کە لە پێش هەموو شتێکدا ئەو بناسم و، لەسەر ئەو یاسایە

بڕۆم کە لەگەڵ ڕەهبەران و پێغەمبەراندا ناردوویەو، لە دوای هەموویان بەهۆی فریشتەی ئەمین (جوبرەئیل) ناردوویەتی بۆ حەزرەتی فەخری عالەم (محمد) دروودی خوای لێ بێ، ئەویش گەیاندوویەتی بە ئادەمیزاد و، دەست بە دەست و دەم بە دەم لەوانەوە بە ئێمە گەیشتوە و، ئێمەش دەبێ پەرستیاریی خوا بەجێ بێنین هەتا لە گیانلەبەرە بێ هۆشەکان جیابینەوە.

پێویستە بزانین کە بەختیاریی ئادەمیزاد بە خواپەرستییە، واتە: سەرکەوتن، بەهرەمەندی و بەختەوەریی ئادەمیزاد لە زانستی بیروباوەڕی باش و خووڕەوشتی باشەوەیەو، لەوەدایە کە بیروباوەڕ و کردار و ڕەفتار و خووڕەوشتی لەسەر ئەو یاسایانە بێ کە پێغەمبەری گەورە و ڕەهبەری جیهان بۆی هێناوین و، نەگبەتی و بەدبەختیشی بەوە دەبێت کە لەم یاسا پیرۆزە لا بدا و، خۆی لە گیانلەبەرانی بێهۆش جیانەکاتەوە.

پێویستە ئادەمیزاد بزانێ لە کوێوە هاتووەو بۆ کوێ دەڕوا. پێویستە بزانێ بەبێ خالیق دروست نەکراوە، بەڵکو خالیق بە حیکمەتی خۆی دروستی کردوە. کەوابێ لە ئەساسەکەیدا خواستی خوا لەسەر بوونی بووەو، ئەنجامەکەی مردن و ڕۆیشتنە بۆ جیهانی دووەم، کە لەوێدا حیسابی بیر و باوەڕ و کردەوە و خووڕەوشتی لەگەڵ دەکرێ و، جەزاو پاداشی خۆی لە خوا وەردەگرێ، یا بەوە کە لە دۆزەخدا ئازار دەدرێ، یا لە بەهەشتدا بە نیعمەت و ئاسایش هەتا هەتایە دەمێنێتەوە.

پێویستە بزانێ هەروەکو لە ژیاندا لەگەڵ باقیی گیانلەبەران هاوبەشە و دەخواو دەخواتەوە و لەزەت و ئارەزوو وەردەگرێ و قەڵەو دەبێ، لەگەڵ فریشتەکانیشدا هاوبەشە، واتە: خاوەن زانستە و دەتوانێ خەریکی خواپەرستی بێ و، یادی خوا بکاتەوە و، بە زیکر و تەسبیحاتەوە بەجۆرێ خەریک بێ کە گیانی لە ژەنگی گوناە و تاوانباری دوور بێ و، هەمیشە دەروونی پڕ لە نوور بێ. کە مادام ئەگەر ئادەمیزاد لەسەر یاسای حەیوانات هەمیشە خەریکی خواردن و خواردنەوە و نووستن و ڕابواردن بێ و، وەختەکانی لەمانەدا تەواو بکا، ئەوە لە کاتی ژیانی خۆیدا ئاسایشی گیانیی دەس ناکەوێ و، دڵ و گیانی وەك دڵ و گیانی حەیوانات دەبێ و، لەسەر ئەم شێوەیە دەمرێ و کاتێکیش لە گۆڕدا گیانی بە بەردا کرایەوە و فریشتە پرسیاریان لێ کرد، هەر لەسەر ئەو حاڵە کە لە سەری ژیاوە، وەها وەڵامیان دەداتەوەو، باسی کردەوەی وەختی ژیانی خۆی دەکا. خۆ ئەگەر لە ماوەی ژیانیدا لەسەر یاسای فریشتە ڕۆیشت، واتە ڕێگەی خواپەرستی و بەختیاریی گرتەبەر و

بیروباوەڕ و کردەوە و خووڕەوشتی باش بوو ئەوە کاتێ کە مرد و لە گۆڕا پرسیاری لێ کرا، لەسەر ئەو شێوە کە بووە، وەڵامی فریشتەکان دەداتەوە. هەر لەبەر ئەمەیە دەگێڕنەوە کاتێ شێخ یەعقووبی چەرخی وەفاتی کردو، فریشتەکان پرسیاری خوایان لێ کرد، چونکە کاتی خۆی خەریکی خوێندنی قورئان بوو، وا وەلامی دانەوە وتی: "اني آمنت بربکم فاسمعون". هەروەها دەگێڕنەوە کە کەسێك لە کاتی سەرەمەرگدا کە هۆشی لای خۆی نەبوو، خەڵکی شەهادەتەکەیان دەخستە سەر زمانی کەچی ئەو خەریکی قسەکردن بوو دەربارەی ئەو نیشانەی کە لە کاتی ساغیدا کردبوونی و، بانگی ئەو گیانلەبەرانەی دەکرد کە لە گەڵیاندا ژیابوو. ئەم وەزعە موافیقی فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) کە فەرموویەتی: "کما تحیون تموتون، وکما تموتون تبعثون" واتە: لەسەر ئەو حاڵە دەمرن کە لە دنیادا دەژین و، لەسەر ئەو حاڵە زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژانی قیامەتدا کە لەسەری دەمرن، واتە: حاڵی مردن تابیعی حاڵی ژیانە.

بۆیە ئەم پێشەکییەم لە پێشەوەی نامەی بیروباوەڕ و نامەی عیبادەت و نامەی مزگەوت و ئەورادەوە نووسی؛ چونکە عیبادەت کردن بۆ خوا سێ جۆرە، یەکەم: بەدڵ باوەڕکردن، کە نامەی بیر و باوەڕ باسی دەکا. دووەم: ئیقرار و وتن و دان پیانانە بە زمان، کە نامەی زیکر بۆ هاندان و پەیداکردنی ڕەغبەتی خەڵکییە بۆ ئەم جۆرە عیبادەتە. سێیەم: کاروکردەوەیە بە ئەندامەکانی لەش، کە نامەی ویردەکان و عیبادەت بۆ ئەمەیە.

ئەی برادەرینە! بەپێی فەرموودەی بێگەردی پێغەمبەر (د.خ) ئەم جۆرە نامانە کە دەیاننووسم و بۆتانی دەنێرم، باشترین دیاری و سەوقاتێکن کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بنێرێ. (عەبدوڵلا)ی کوڕی (عومەر) (ر.خ) دەگێڕێتەوە: "ما اهدی مسلم لاخیه هدیة افضل من کلمة حکمة یزیده الله بها هدی او یرده عن ردی". واتە هەرگیز موسڵمان دیارییەکی وەهای نەناردووە بۆ برای موسڵمانی خۆی گەورەتر و باشتر بێ لە وشەیەکی زانستیی بەرز کە بەو وشەیە خوا زیاتر شارەزای ڕێگای ڕاستی بکات، یان لە خراپەیەکی مایەنەگبەت لای بدا و دووری بخاتەوە.

تکاتان لێ دەکەم ئەم دیارییەم وەربگرن و بیخوێننەوە، گوێ بدەنە ئەوانەی کە نەتانزانیون، با خەمبار و ماندوو نەبن؛ چونکە فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) گەورەترین خووڕەوشتی موسڵمان ئەوەیە هەرگیز لە بیستنی وشەی چاکە و خێر تێر نەبێ کەوابێ پێویستە گوێ بدەنە خوێندنەوە و تێگەیشتنی نامەی دۆستی دڵسۆزی خۆتان، چونکە

زۆربـەیـان تـوێشووی سەفـەری پـاشەڕۆژتـان بۆ ئـامـادە دەکـەن، شتێکی ئـاشکرایـە کـە ئافەریدگاری جیهان ئەم جیهانەی ئەمڕۆی کردوەتە مەنزڵگای ئەوانەی بەرەو قیامەت دەڕۆن و، بەردەبازی ڕێڕەوی ئەوانەیە کە بەختیاریی نەبڕاوەیان دەوێ، هەتا لەم کاروان سەرایەدا کە هەولەو ماوە فراوانەو، لەم دنیایەدا، کە مەزرەعەی ڕۆژی قیامەتە، تۆشەی تەواو بۆ خۆمان هەڵبگرین و، بە سەربەرزی بکەوینە ڕێگا بۆ پاشەڕۆژمان و، بەبێ توێشوو قەستی سەفەری سارای قیامەت نەکەین.

ئەم نامەی ئەورادە یەکێکە لە زادو توێشووەکانی ڕێگەی دوور و سەفەری قیامەت. سوپاس بۆ خوا برادەران حەز لە خواپەرستی و فەرمانبەرداریی خوای گەورە دەکەن، بـەڵام بـەداخـەوە نـەخـوێنـدەوارن. بـیستـوومـە موریدەکـان حـەز لـە ئـەوراد و ئـەحـزابـی ئەولیاکان دەکەن، بەڵام لەبەرئەوەی مەعنایان نازانن، گریمان مەعنایشیان بزانن، چونکە لە ئەهلی غەفڵەتن بە غافڵی و بێ ئاگایی دەیانخوێننەوە و سەواب و پاداشیان دەست ناکەوێ و ماندوو بوونەکەیان بێ سوود دەبێ. براینە! پێویستە پێتان بڵێم: ئەوەی بۆ ئێوە بەکاردێ و سوودی لێ وەردەگرن هەر بە خوێندنەوەی ئەوەوە مەشغوول بن. لە هەموو ئەورادێ بەسوودتر بۆ ئێوە قورئانی پایەبەرز و گەورەیە: سەواب و پاداشتی خوێندنی قورئانی پیرۆز گەلێك زۆرە، بۆ نموونە شێخ ئەحمەدی (ابن حجر) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: پاداشی خوێندنی سوورەتی (فاتحە) لە پاداشی خوێندنی سوورەتی (بقرە) زۆرترە، ئەگەرچی سوورەتی بەقەرە لە دوو (جوزء) زیاترە؛ بە دەلیلی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) کە فەرموویە: "الا اخبرك بخير سورة في القرآن: الحمد لله رب العالمين". واتە: ئاگادارتان دەکەم و پێتان دەڵێم: کە چاکترین سوورەتەکانی قورئان سوورەتی (الحمد)ە. هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە سوورەتی (فاتیحە) بـەقـەدەر سێیـەکی قـورئـانـە، واتـە: خـوێنـدنـی سوورەتـی (فـاتـیحـە) بـەقـەدەر خوێندنی دە جوزئی قورئان خێر و پاداشی هەیە.

دەگێڕنەوە شەیتانی مەلعوون سێ جار لە داخ و خەفەتدا هاواری لێ هەستاوە هاوارێکی وەها کە لە هاواری هەموو کاتێکی بەهێزتر بووە، یەکەم: لە کاتی نازڵ بوونی (فاتیحە)دا، چونکە ئەو دەیزانی کە ئەم سوورەتە سامانێکی گەورەیە بۆ ئوممەتی (محمد) (د.خ). هەر لەبەر گەورەییەتی کە کراوە بە ڕوکنێ لە ئەرکانی نوێژ؛ هەتا موسڵمانان بیخوێنن و پاداشی زۆریان بەنسیب بێ و، لەو پیرۆزی و بەختیارییە ناهومێد و بێ بەش نەبن.

ئیمام (محمد)ی غەزالی (ر.خ) خوێندنی (فاتیحە)ی بەم جۆرەی خوارەوە ڕیز کردووە:

بەیانییان (٢٥) جار، نیوەڕۆ (٢٥) جار، عەسر (٢٥) جار. مەغریب (١٠) جار. عیشا (١٥) جار، کە هەمووی دەکاتە (١٠٠) جار. وە گەلێ ئەسراری عەجایبی لەم سەدجار خوێندنەی فاتیحەدا باس کردووە، گەلێ سوودی تێدا هەیە بۆ دین و بۆ دنیا. جا لەبەر ئەوەی کە جارێك (فاتیحة) لە سوورەتی (بەقەرە) گەورەترە – وەك لە پێشەوە وتمان – ئەم سەدجار فاتیحەیە لە دووسەد و سی و پێنج جوزئی قورئان گەورەترە، کە دەکاتە حەوت خەتم و بیست و پێنج جوزء واتە لە دووهەزار و چوارسەد پەڕە قورئان کە بیخوێنی گەورەترە.

هەروەها ریوایەت کراوە کە (فاتحة الکتاب) واتە: سوورەتی "الحمد لله..." شیفای هەموو دەردێکە، واتە چ بە نووسراوی هەڵی بگرێت و، چ نووسراوەکە بە ئاو بکوژێنێتەوەو ئەو ئاوە بخواتەوەو، چ بیخوێنێ بەسەر نەخۆشدا، یا نەخۆشەکە خۆی بیخوێنێ.

لە (جواهر التفسیر)دا دەگێرێتەوە لە کتێبی خەواسی تەمیمییەوە: ئەگەر سوورەتی فاتیحە بە ئاوی میسك و زەعفەران لەسەر کاسەیەکی بلووری بنووسرێ و بە ئاو گوڵاو بشورێتەوەو، حەوت ڕۆژ بە ناشتا بیخواتەوە، ئەوە قووەتی حافیزەی وەها زیاد دەبێ هەرچی لەبەر بکا لە بیری ناچێتەوە. سوورەتی فاتیحە گەلێ ناوی وەهای هەیە کە دەلالەت لەسەر گەورەیی پایەی دەکەن، یەکێکیان (أم القرآن)ە، حەزرەتی عائیشە، خوای لێ ڕازی بێ، گێڕاویەتییەوە کە (أم القرآن)ە، لای خوای گەورە پایەی لە عەرش تا زەوی بەرزترە، واتە لە هەموو ئەوشتانە بەرزترە کە لە مابەینی عەرش و زەویدان. بۆیەش بەم ناوەوە ناونراوە. چونکە سوورەتی یەکەمی قورئانە و، ئەسڵە بۆ هەموو ئەو کتێبانە کە خوا نازلی کردوون.

ناوێکی تری (فاتحة الکتاب)ە واتە: دەرگاکردنەوەی قورئان بەم سوورەتەیەو، قورئان خوێن یەکەم جار ئەم سوورەتە دەخوێنێ. هەروەها دوو ناوی تری هەیە (کافیە) و (شافیە). لە نێو ناوەکانی ئەم سوورەتەدا بیست و شەش ناوی مەشهوور هەیە:

یەکەم (فاتحە) واتە: گوشایندە، کە بەڕاستی ئەم سوورەتە گوشایندەی دەرگای ڕەحمەتە بەسەر بەندەکانی خوادا، چ بۆ کاروباری ئاین و چ بۆ کاروباری دنیاو پەیداکردنی بەرژەوەند و ژیوار و کاسبی.

دووەم: (فاتحة الکتاب)ە، چونکە ئەم سوورەتە سەرەتاو کلیلی قورئانەو، ئەو کەسانە کە قورئان دەخوێنن دەست بە فاتیحە دەکەن. هەروەها سوورەتی (الحمد)یشی پێ دەڵێن؛

چونکه لەفزی (الحمد)ی تیایە، وەکو چۆن سوورەتی (البقرە)و (ئال عمران) ئەو لە فزانەیان تێدایە..

سێیەم: (سورة الشکر)ە، لەبەرئەوە کە ئەم سوورەتە سوپاس و ستایشی خودای گەورەی تێدایە، وە لە بارێکی ترەوە لەبەرئەوەی کە ئەم سوورەتە پەرستنی خوای تێدایەو، بە ڕاستگۆدانان و باوەڕپێکردنی تێدایە بە فەرمانەکانی خواو ئەوانەی کە نەهیی لێ کردون، وەك ئەوەیە کە هەمووی شوکر کردن و سوپاس بێ بۆ یەزدانی بالآ لەسەر نیعمەتەکانی، کە هەرگیز لە ژمارە نایەن، بوونی (حەمد) لەم سوورەتەدا لایەنگری ئەم ناوەی دەکا.

چوارەم (أم القرآن)ە . لە تەفسیری (مفاتیح الغیب)ی فەخری ڕازی باس دەکا کە پوختەی مەبەست لە قورئان چوار شتە:

(١) باسی زات و سیفەتەکانی خوا.

(٢) باسی نبووەت، واتە ناردنی پێغەمبەران.

(٣) باسی (مەعاد) زیندووبوونەوەی دوارۆژ.

(٤) باسی قەزاو قەدەر، واتە دروست کردن و تەسڕوفاتی خودا لە هەموو شتێکدا، چ لە دنیا و چ لە دوارۆژدا.

ئایەتەکانی سوورەتی فاتیحە هەموو ئەم چوار باسانەیان تێدایە، چونکە ئایەتی یەکەم و دووەم ئیلاهیات دەگەیەنن، واتە: باسی ذات و سیفەتەکانی خوان. ئایەتی سێیەم دوارۆژ دەگەیەنێ. ئایەتی چوارەم دەلالەت لە قەزاو قەدەر دەکا و مەنعی (جەبری) و (قەدەری)یە. ئایەتەکانی تر نبووەت و هیدایەت دەگەیەنن لەگەڵ باسی ئەوانەی کە سەرکەش و گومڕاهن، جا لەبەر ئەوە کە مەبەست لە قورئانی پیرۆز ئەو چوار باسەیە و، ئەوانەش هەموو لە سوورەتی فاتیحەدا هەن، ناویراوە بە (أم القرآن).

حەزرەتی عائیشە (ر.خ) گێڕاویەتیەوە کە (أم القرأن) بەلای خواوە لە عەرشەوە تا ژێر خاك گەورەترە، هۆی ناونانی بەم ناوە ئەوەیە کە فاتیحە سەرەتای قورئانە و ئەسڵە بۆ هەموو ئەو کتێبانەی کە خودا ناردوونی بۆ پێغەمبەران. پێنجەم: (ام الکتاب)ە ، یانی هەموو واتای ئەو نامەو کتێبانە کە خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردووە (د.خ) لە سوورەتی فاتیحەدایەو، خوای گەورە ئەم حەوت ئایەتە کورتەی نازڵ کردووەو، بە کورتی مەعناو

واتای هەموو کتێبەکانی تێدایە، وەکو حەوت سیفەتەکەی خوا کە مەعنای هەموو سیفەتێکی زاتی و فیعلیی خوایان تێدایە. شەشەم: (سورة المنه)یە؛ چونکە خوای گەورە بە ناردنی ئەم سوورەتە منەتی بەسەر حەزرەتی پێغەمبەردا کردووە کە فەرموویەتی: "ولقد آتيناك سبعا من المثاني والقرآن العظيم" واتە: ئەی پێغەمبەر ئێمە میهرەبانیمان لەگەڵ تۆ کرد کە حەوت ئایەتمان بۆ تۆ نارد لەو ئایەتانەی کە بە درێژاییی کات دەخوێنرێتەوە، لەگەڵ قورئانی مەزندا کە ئەویشمان بۆ ناردی. دیارە حەوت ئایەتەکە فاتیحەیەو، بۆیە بە (سبع المثاني) ناوبراوە؛ چونکە حەوت ئایەتن و لە هەموو نوێژێکدا دووبارە دەکرێنەوە، یا لەبەرئەوەی دووجار نازل بووە، جاری یەکەم لە شاری مەککە لە پاش میعراج و، جاری دووەم لە مەدینە لەو کاتەدا کە قیبلە گۆڕا. دیارە لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا حەزرەت (د.خ) لە نوێژدا ڕووی لە (مسجد الاقصى) دەکرد کە لە شاری قودسدایە، پاش ئەوە کە هەژدە مانگ بەسەر کۆچیدا لە مەککەوە بۆ مەدینە تێ پەڕی، لە کاتی نوێژی عەسردا قیبلە گۆڕاو لە نوێژدا ڕوو کرایە کەعبەی مەزن کە لە شاری مەککە، خوای گەورە پایە و شەرەفی زیاد بکا.

لە کتێبی (موجز) دا دەڵێ: "مثاني" لە "ثني" وە وەرگیراوەو، واتاکەی وەرچەرخاندنی دەستەلەغاوی ئەسپە لە لایەکەوە بۆ لایەکی ترو: موناسەبەی لەگەڵ "فاتحە"دا ئەمەیە کە ئەم سوورەتە ڕووی ئینسان دەگۆڕێ لە غەیری خواوە بۆ لای خواو ڕاستیی پایەی ئەم سوورەتە ئەوەیە کە ئینسان لە ناحەقەوە هەڵدەسوورێنێ بۆ حەق.

باشتر ئەوەیە بڵێین لەسەر مەعنای ئەساسیی هەر ئایەتێك لە سوورەتی فاتیحە مەیدانێکی کە سوارانی مەیدانی خواناسی هەر لەحزەیەك لە پایەیەك لە پایەکانی شهوود و خودناسینەوە جڵەوی هیممەتی خۆیان بۆ پایەیەکی بەرزتر دەگۆڕن و، بەهیچ پایەیەکەوە خۆیان ماتڵ ناکەن و تا ماوەی تەوفیق ببێ سەردەکەون.

ناوی هەشتەمی سوورەتی فاتیحە (القرآن العظيم)ەو، بەڵگە لەسەر ئەمەش هەر ئایەتە پێشووەکەیەو، تەفسیری "القران العظيم" بە سوورەتی فاتیحە کراوەتەوە، لەبەرئەوە کە حەوت ئایەتە بە کورتی هەموو علوومی قورئانی تێدایە.

ناوی نۆیەم (وافيه)یە، واتە: ئەم سوورەتە بەسە بۆ هیدایەت و شارەزاکردنی ئینسان، واتە: دەبێتە هۆی لابردنی داماوی و ڕزگاربوونی ئینسان لە سزای قیامەت و ئازاری دنیا.

ناوی دەیەم: (کافیە)یە، واتە: بەشی کاروباری هەموو ئینسانێکی وەها دەکا ڕەفتاری پێ بکا، وەکو لە تەفسیری (ینابیع)دا بە سەنەدی سەحیح دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەرکەسێ بە نیەتی هەر کارێکی خێر سوورەتێ بخوێنێ خوا بە میهرەبانیی خۆی چاری کاری ئەو کەسە دەکا و بۆی ئاسان دەکات.

ناوی یازدەیەم: (مجزیە)یە، بەبۆری (میم)و زەممەی (جیم)و ژێری (زێ) و سەری یێ. لە ئەبوو دەردائەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "فاتیحة الکتاب تجزي مالایجزي شئ من القرآن، ولو أن فاتحة الکتاب جعلت في کفة میزان وجعل القرآن في کفته الاخری لفضلته فاتحة الکتاب سبع مرات" واتە: سوورەتی فاتیحە بەکاری شتی وەها دێ کە هیچ بەشێکی تری قورئان بەکاری ئەو شتە نایەت و، ئەگەر فاتیحە بخرێتە تای ترازوویەك و، باقیی قورئان بخرێتە تاکەی تریەوە فاتیحە حەوت ئەوەندەی ئەو قورس دەبێ.

ناوی دوانزەیەم: (منجیە)یە، واتە: نەجاتدەر و لە سزا ڕزگار کەر.

ناوی سیانزەیەم: (اساس)؛ لە شەعبییەوە دەگێڕنەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس فەرموویەتی: هەر شتێ بناغەیەکی هەیە؛ بناخەی زەوی عەردی مەککەیە، لەوێوە عەرد ڕاخراوە، ئەساس و بناخەی ئاسمانەکانیش ئاسمانی حەوتەمە، بناغەو ئەساسی زەوی تەبەقەی حەوتەمیەتی، کە تەبەقەی مەرکەزییەتی، بناخەو ئەساسی بەهەشت (جنە العدن)ە کە باقی دەرەجەکانی بەهەشت لەسەر ئەو بیناکراون، ئەساس و بناخەی دۆزەخ (هاویە)یە، کە باقیی چاڵەکانی دۆزەخ لەسەر ئەوەوە دروست کراون. هەروەها ئەساس و بناخەی ئادەمیزاد حەزرەتی ئادەمە، دروودی خوا لەسەر ئەو و لەسەر پێغەمبەری خۆمان بێ. ئەساس و بناخەی ئەنبیای (أولو العزم) حەزرەتی نووحە، کە پێغەمبەری دوای ئەو لە نەتەوەی ئەون. بناغەی (بنی اسرائیل) حەزرەتی (یعقوب)ە، کە دوانزە ئەسبات ئەولادی ئەون. ئەساس و بناغەی کتێبەکان، کە بۆ پێغەمبەران نێراون، قورئانە کە هەموو نوقطەیەکی تیاکۆبووەتەوەو، ئەساس و بناخەی قورئانیش سوورەتی فاتیحەیە کە هەموو بابەتەکانی قورئانی تێدا کۆ بووەتەوە، جا ئەگەر ببی بە یاری قورئان و هاوڕێ و هاودەمی، واتە: باوەڕت بەوە هەبێ کە کەلامی خوایەو، بیخوێنیتەوە، قورئانت بۆ دەبێ بە شیفاو دەوای هەموو دەردو نەخۆشییەك، چ نەخۆشیی لەش و، چ نەخۆشیی ڕۆحانی و، دەبێتە دەرمانی هەموو دەردێکی دڵ و بەدەن. دەگێڕنەوە کە

(فاتیحە الکتاب) شیفایە بۆ هەموو دەردێ چ بەهۆی هەڵگرتنیەوەو، چ بەهۆی خوێندنەوەی و چ بەهۆی نووسین و شۆردنەوەی، وەکو لەمەوپێش باسمان کرد.

چواردەیەم: ناو "الرقیە"یە – بە بۆڕی (ڕێ) و ژێری (قاف) و سەری (یێ)ی گیرەدار، واتە: دوعای نووسراو یا خوێنراوە بەسەر بریندارویبیماردا.

لە (موسلیم)و (بوخاری)دا ڕیوایەت کراوە: جارێك حەزرەت (د.خ)چەند کەس لە یارەکانی ناردبوو بۆ سەفەر، ئەوانە لە گەڕانەوەدا بە خێڵە عەرەبێك گەیشتن و، لە نزیکی ئەواندا دابەزین و داوای میوانداریيان لێ کردن، بەڵام ئەوان گوێیان پێ نەدان، تا بە قەزاو قەدەری خوا مار دای بە سەرۆکەکەیانەوەو زۆر ئازاری پێ گەیشت و، هەرچی هەوڵیان دا بۆ ڕزگاربوونی کابرا لەو ئازارە سوودی نەبوو، ناهومێد بوون، لە دواییدا هات بە دڵی یەکێکیاندا کە بڕۆن بۆ لای ئەو کۆمەڵی میوانانە کە لەنزیکی ئەواندا بارگەو بنەیان خستووەو، داوای دەرمانێ یا دوعایەکیان لێ بکەن، کە هاتن بۆ لایان و داوای دەرمان یا دوعایان لێ کردن، یەکێك لەو کۆمەڵە کە ناوی (ئەبو سەعیدی خدری) بوو (ر.خ) فەرمووی: من دوعای ڕزگاریی ئەو مارگەزە دەزانم، بەڵام، لەبەر ئەوەی شێوەی میهرەبانی و میوانداری و پیاوەتیتان لەگەڵ ئێمەدا بەجێ نەهێنا، هەتا شتێکی باشمان نەدەنێ، ئەو دوعایەتان بۆ ناکەم، ئەنجام لەسەر (٣٠) سەر مەڕ ڕێکەوتن و، ئەبوسەعید ڕۆیشتە سەر کابرای مارگەستوو حەوت جار سوورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێندەوەو فووی بە شوێنە گەزراوەکەدا کرد، بە فەرمان و خواستی خوای گەورە کابرا ڕزگار بوو، شیفای بۆ هات و، هەستاو بە سەلامەتی هاتوچۆی کرد. ئەنجا یارانی حەزرەت (د.خ)(٣٠) سەرە مەڕەکەیان لێ وەرگرتن و بەرەو مەدینەی نوورانی کەوتنە ڕێ و، بڕیاریان دا کە تا ڕەزامەندیی پێغەمبەری لەسەر نەبێ نەیخۆن؛ جا کاتێ کە گەیشتینە مەدینە و بە حوزووری حەزرەت گەیشتین (د.خ)و، سەر گوزەشتەکەیان بۆ گێڕایەوە، بە ئەبوو سەعیدی فەرموو: تۆ بە چ دەلیلێ زانیت کە خوێندنی سوورەتی فاتیحە سوودی بۆ ئەو بیمارە هەیە؟ ئەبوو سەعید عەرزی کرد: (یارسول الله! شيء ألقي في روحي) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا شتێ بوو خوا خستیە دڵم، لە پاشا پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: – "لقد أصبتم، اقتسموا، واضربوا لي معكم سهما، وضحك النبي(ص)" واتە: ئیشێکی باشتان کردووە، بەشی بکەن لەناو خۆتاندا، پشکێکیش بۆ من دابنێن.. هەروەها حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) پێ کەنی لە خۆشیی ئەوەی کە لەناو یارانی ئەوا ئینسانی وا هەیە

ئیجتیهادی ڕاست بکا و بڕیاری خوێندنی بەرامبەر ماڵ بدا بۆ شیفاو چاکبوونەوەی نەخۆش و، بڕیار لەسەر ئەوە بدا کە خوێندنی سوورەتی فاتیحە سوودی بۆ بیماران تێدایە.

پازدەیەم (سورة تعليم السؤال)ە؛ لە ڕاستیدا خوای مەزن بەم سوورەتە بەندەکانی خۆی فێر کردووە کە لە پێش نزاو دوعادا ستایشی خوا بکەن و، تکای ئەوە بکەن کە خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی بۆ ڕێگای ڕاست شارەزایان بکا کە ڕێگەی پێغەمبەران و شەهیدان و ڕاستگۆیان و پیاو چاکانەو، تکای ئەوە بکەن کە لەسەر ئەو ڕێگایە پایەداریان بکا.

ناوی شازدەیەم (سورة الدعا)یە دیارە ئەم سوورەتە دوعای تێدایە وەك "اهدنا الصراط المستقيم".

ناوی حەفدەیەم (سورة السؤال)ە. چونکە لەم سوورەتەدا پاڕانەوەو ملکەچی هەیە.

ناوی هەژدەیەم: (سورة التلقين)ە، چونکە لەم سوورەتەدا خوای گەورە تەلقینی بەندەکانی خۆی کردووە – واتە: فێری کردوون و خستوویەتیە سەر زمانیان – چۆن داوای یارمەتی لە خوای خۆیان بکەن، خوایش لەوە گەورەترە کە لە پێشدا فێری دوعا و پاڕانەوەیان بکا و، دوایی بەشیان نەدا، واتە: باوەڕی موسڵمانان ئەوەیە کە خوای گەورە نزاو پاڕانەوەیان لێ قبووڵ دەکا و، بە داخوازیی خۆیان دەگەن لە دنیا بێ یا لە قیامەتدا.

ناوی نۆزدەیەم (سورة الصلاة) لەبەر ئەوەی کە ئەم سوورەتە لەگەڵ نوێژدا پەیوەندییەکی تەواوی هەیە؛ چونکە لە پەیڕەوی ئیمامان: شافیعی و مالیك و ئەحمەددا خوێندنی ئەو سوورەتە فەرزی عەینە.

ناوی بیستەم: (سورة مكافأة القوافل السبع)ە واتە: پاداشی حەوت قافلەی بازرگانی کە هاتوون بۆ شاری مەککەی موکەڕەمە. بناغەی ئەم حیکایەتە ئەوەیە: ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) لە ناو گەلێ لە یارانی خۆیدا دانیشتبوو ئامۆژگاریی دەکردن، لەوکاتەدا دەنگی شادی و دەف ونەی بەرز بوویەوەو ئەوانیش بیستیان، کاتێ کە پرسیاریان لە هۆی ئەوە کرد، دەرکەوت کە قافڵەی قورەیش لە وڵاتی شامەوە گەڕاوەتەوە. کۆمەڵێك لە یارانی حەزرەت (د.خ) ڕۆیشتن و، لەسەر شوێنێکی بەرز تەماشای قافڵەکەیان دەکرد، دیيان ئەوا حەوت قافڵەی بەماڵ و سامان ڕازاوە هاتنەوە. قافڵەیەك لەوانە هی (بني مخزوم)و

قافڵەیەك هی (بنی زهرە) و قافڵەیەك هی (بنی امیە) بوو، هەروەها قافڵەکانی تریش هەر یەکەی هی لایەك بوو. هەرقافڵەیەك لەوانە هەزار وشتر بوو، بارەکەیان گەنم و هەنگوین و هەمە جۆری خواردن بوو. هەندێ لەو یارانەی حەزرەتیش چەند ڕۆژێ بوو بە برسێتی و موحتاجی مابوونەوە، بە چاوپێکەوتنی ئەم وەزعە دڵتەنگ بوون و، سەریان سووڕ دەما لەوەی ئەمان برسی و تینوو بن و، کافرەکانیش خاوەنی ئەو هەموو نازو نیعمەت و داراییە بن. حەزرەت (د.خ) لەم وەزعە خەبەردار بوو، ئەویش هەر دڵی زویر بوو؛ جا حەزرەتی جوبرەئیل هاتە خوارەوەو ئەم ئایەتەی هێنا "ولقد آتیناك سبعا من المثاني والقرآن العظیم" واتە: ئەی خۆشەویستی بەڕێز! بەڕاستی حەوت ئایەتمان داوە بە تۆ کە بە درێژاییی زەمان دەخوێنرێتەوە، ئەم حەوت ئایەتە گەلێ بەسوودترن لەو حەوت قافڵەیە کە لە شامەوە گەڕاونەتەوە؛ چونکە ئەو قافلانە مایەی بژێویی و هێزی لەشی ئینسانن، بەلام ئەم ئایەتانە هۆی هێزی گیان و هێزی باوەڕن؛ ئەو قافلانە خزمەتی ژینی براوەی جیهان دەکەن. بەلام ئەم حەوت ئایەتە خزمەتی ژینی نەبراوەی ڕۆژی دوایی دەکەن و شوێنەواریان هەتا هەتایە دەمێنێتەوە[١]. هەروەها قورئانی گەورەمان بۆ نازڵ کردووی کە مایەی پیرۆزیی ئەهلی جیهانەو، مایەی بەختیاریی ئەو کەسانەیە کە ڕەفتاری پێ دەکەن و، ئەوانە بە سەربەرزیی دنیا و قیامەت دەژین. "ولا تمدن عینیك الی ما متعنا بە اوزاجا منهم" واتە: مەڕوانە و چاوەمەبڕە ئەو ڕۆزی و سامان و داراییەی کە بە هەندێ لە بێ ئاینەکانمان داوەو، لەزەتی لێ دەبینن؛ چونکە سامانی دنیا بە بێ باوەڕو خواناسی نرخی نییە و مایەیەکی بێ بەهاو بێ بەقایە.

لەم بەیانەوە دەردەکەوێ کە ئەم سوورەتە لە پاداش و بەرامبەریی ئەو حەوت قافڵەدا وارد بووەو، خوێندنەوەی بووە بەهۆی جەزای نەبڕاوە بۆ ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ).

ناوی بیست و یەکەم: سوورەتی (الواقیة)یە، واتە: نیگادار و پارێزگەر، سیڕی ئەمەیش ئەوەیە کە خوێندنەوەی ئەم سوورەتە خوێنەرەوەکەی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزی و، مرۆڤ دەتوانێ ئەم سوورەتە بە قەڵغانێ کە خاوەنەکەی لە ئازار و بڕشتی دەمی شمشێری تیژ دەپارێزێ و، لەوەی و ناهەموارییەکانی تریش پەنای دەدا.

---

(١) لە ڕیوایەتێکی ترا دەڵێ: حەزرەت (د.خ) لە (اذرعات) لە سنووری شامدا حەوت کاروانی جوولەکەکانی (بنی قریظە) و (بنی نضیری) ی تەسادوف کردو، موسوڵمانەکان دڵگران بوون. جا ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

ناوی بیست و دووەم: سوورەتی (مجمع الاسماء)ە، چونکە لەم سوورەتەدا بە (تصریح) و بە (کنایە) گەلێ ناوی پیرۆزی خوای گەورە هەیە؛ بە تەصریح (الله)، (رب)، (رحمان) ، (رحیم)، (مالك). بە کینایەش (مەعبوود)، (مستعان)، (هادی)، (منعم)، (منتقم) هەیە.

ناوی بیست و سێیەم: (سورة الثناء)ە؛ چونکە لەم سوورەتەدا وەسفی خواو ستایش و پیاهەڵدان هەیە، بەوەی کە دەفەرموێ: میهرەبان و بەخشندەیە و پەروەردگاری هەموو جیهانە و فەرمانداری ڕۆژی پاداشی گەورەیە، کە پاداشی هەموو کردەوەکان دەدرێتەوە، چاك و خراپیان.

ناوی بیست و چوارەم (سورة الکنز)ە. لە (عەبدوڵلا)ی کوڕی (عەباس)ەوە دەگێڕرێتەوە کە بیستوویەتی لە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: لە شاری مەککەی موبارەك جوبرەئیل هاتە لام و، فەرمووی: ئەی (محەمەد) گەنجێکم لە گەنجەکانی خوای گەورە بۆ هێناوی، منیش لێم پرسی ئەو گەنجە کامەیە؟ فەرمووی (أم القرآن)ە. واتە: سوورەتی (فاتحە)، بێگومان ئەم سوورەتە گەنجێکە پڕ لە زانیاری و گەنجێکە کە خوای تەعالا لەناو هەموو ڕەهبەراندا بە خەڵات بۆ تۆی ناردووە.

خۆشەویستەکان! جەوهەری مەعنای سەدو چوار کتێبی خودای گەورە، کە لە ئاسمانەوە نازڵ بوون، بۆ ڕەهبەران، وا لە سەدو چواردە سوورەتی قورئاندا کە بۆ پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی (محەمەدی مستەفا) (د.خ) هاتوەو، هەرچی واتاو حەقایقێ کە لەم سوورەتانەدا هەن هەموویان بەکورتی لە سووڕەتی فاتیحەدا هەن و، بە ڕستەی "بسم الله الرحمن الرحیم" مۆر کراوەو، بۆ پێغەمبەر (د.خ) ڕەوانە کراون.

ڕووناککردنەوەی ئەم باسە ئەوەیە کە ئەو سەحیفانەی بۆ حەزرەتی ئادەم هاتوون، پڕن لە ئەسراری علووم و مەعاریفی (لدني) و، فێرکردنی ئادەم بە ناوەکان و دەرخستنی پایەو شەرەفی بەسەر فریشتەکانا. سەحیفەکانی حەزرەتی (شیث) (د.خ) باسی بەخشش و چاکەکردن و نیعمەتەکانی خوایە، کە برانەوەیان نییەو، دواییان نایەت و، ناوی حەزرەتی (شیث) بە مەعنا (هبة الله) یە، واتە: بەخششی خودا، لەبەر ئەوە کە زۆر لە نیعمەتەکانی خوای پێ دراوە. سەحیفەکانی حەزرەتی (ادریس) - (د.خ)- بەیانی بەرزیی پایەی زانست دەکا، کە پایەی ئیدریس لەسەر زانست و هۆشیاری دامەزراوەو، خودای گەورە لە باسی ئەودا فەرموویەتی: "ورفعناه مکانا علیا". لە سەحیفەکانی حەزرەتی ئیبراهیمدا باسی مەعاد، واتە: زیندووبوونەوەی مردووەکان و ڕۆژی حەشر و،

لێپرسینەوەی ئادەمیزاد و پەرییان دەکا، هەر بەو بۆنەوە بوو کە حەزرەتی ئیبراهیم داوای لە خوای گەورە کرد پیشانی بدا چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە؟ وەکو ئایەتی (رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى) باسی ئەمە دەکا. هەروەها لە تەوراتی حەزرەتی مووسادا باسی ئەحکامی عیبادەت و تەکلیفاتی خوایی دەکات کە بۆ بەنی ئیسرائیل هاتووە. لە زەبووری حەزرەتی داوودا (د.خ) وەعز و ئیرشاد و زیکر و تەسبیحی زاتی خودای گەورە هەیە. لە ئینجیلی حەزرەتی عیسادا ئەحکام و ئەزکار و ئامۆژگاری هەیە بۆ بەنی ئیسرائیلەکان لەسەر تەرکی دنیا و ئارەزووی نەفس. هەروەها موژدەی تیایە بەوەی کە خوای مەزن لە پاش ئەو پێغەمبەرێکی رەهبەرو خاوەن پایە بۆ بەرەی ئادەمزاد رەوانە دەکات کە ناوی ئەحمەدەو، هەر لەو ئینجیلەدا بە پەیرەوانی ئەحمەددا هەڵدەداو زەمی دوژمنەکان و ناحەزەکانی دەکا. ئەو زانایانە کە دڵیان بە تیشکی خوداناسیی راستەقینە رووناك بووەتەوەو، خوای گەورە راستیی خستوەتە دڵیانەوە، لە واتای سوورەتی فاتیحەدا لە کۆمەڵێك لە واتای ئەو کتێبانە تێ گەیشتوون کە بۆ پێغەمبەرانی رابردوو نێرراون:

بۆ نموونە: لە "بسم الله" دا پەنامەکییەکانی زانستی حەزرەتی ئادەمیان وەرگرتووە. لە "الحمد لله" دا چەشنەکانی ناز و نیعمەت و بەخششی خوایان بۆ دەرکەوتووە. لە "الرحمن الرحيم" دا پایەی میهربانیی خودا و پیرۆزیی ئەو کتێبانە و ئەو بەش و بارەیە کە بە حەزرەتی "ئیدریس" دراوە تێ گەیشتوون. لە "مالك يوم الدين" دا باسی رۆژی قیامەت و زیندووبوونەوەی ئینسان و پەری و داوەری و پاداشت وەرگرتن و سزادان تێ گەیشتوون، وەکو لە سەحیفەکانی ئیبراهیمدا نووسراوە. لە "اياك نعبد واياك نستعين" دا باسی عیبادات و ئەحکامی خوا دەکا بۆ ئوممەتی پێغەمبەرانی پێشوو، بەتایبەتی تەکالیفی ئوممەتی حەزرەتی مووسا. لە "اهدنا الصراط المستقيم" دا پەنامەکییەکانی خوا بە یەك زانین و ئەورادو ئەزکاری حەزرەتی داوودیان وەرگرتووە. لە "صراط الذين انعمت عليهم" دا پەنامەکییەکانی دڵی لە خواترسان و دۆستان و هاورێ تایبەتییەکانی حەزرەتی عیسایان دەیوەتەوە. لە "غير المغضوب عليهم ولا الضالين" دا خراپی ی بارو دۆخ و تێکچوونی بیروباوەر و کردەوەی پیاوخراپ دۆزراوەتەوە. هەروەها بە شێوەی باسکراو جوانکاری و پەنامەکییەکانی هەموو نامە ئاسمانییەکان لەم سوورەتە پیرۆزەدا دانراوە؛ بۆیە (محەمەد)ی کوری (حەنیفە) خوای لێ رازی بێ لە ستایشی سوورەتی فاتیحەدا فەرموویەتی: سەرەتاکەی پیاهەڵدان و سوپاس و ستایشی خودایەو، ناوەراستەکەی بەندەگی و خواپەرستییەو، لە نیوەی دواییدا داوای رێ بەدیی کردن و سەرامەدبوون

دەكات لە خواو، لە دوادواییيەكەیدا لەخوا پاڕانەوەیە بۆ ئەوەی لە ڕق و قینی خۆی و لە گومڕاهی بمانپارێزێ. بێگومان زۆریی ناونیشانەی بەرزیی پایەیە.

هەروەها بۆ پاراستنی ئیمان ویردێ كە لە قورئان وەرگیرابێ بۆ هەموو كەس سوودمەندە. دەگێڕنەوە حەزرەتی (خزر) (د.خ) لە حەزرەتی (محمد) ی پرسی (د.خ): چ ویردێك بۆ پاراستنی ئیمان سوودی هەیە؟ ئەویش فەرمووی: لە جیبرەئیلم پرسیوە، ئەویش فەرموویەتی: لە خوای گەورەم بیستووە فەرموویەتی: هەر كەسێ ئەم ئایەتانەو ئەم سوورەتانە لە پاش هەموو نوێژێك بخوێنێ ئەوە ئیمانی پارێزراو دەبێت: سوورەتی فاتیحە و، (آیة الكرسي)و، دوادوایی سوورەتی "بقرە" لە "لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاوات وَمَا فِي الأَرْض"ەوە هەتا دوایی سوورەتەكە، هەروەها ئایەتی "شَهِدَ اللّـهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ "و، لە بەینی ئەم ئایەتە و ئایەتی دواییدا ئەو حەدیسەش بخوێنی كە وارید بووە "وانا اشهد بما شهد الله به واستودع الله هذه الشهادە، وهی لی عند الله ودیعە" جا تەواوی ئایەتی "ان الدین عند الله الاسلام" و، ئایەتی "قل اللهم مالك الملك.." تا دەگاتە "بغیر حساب" هەروەها سوورەتی "ئیخلاص" و هەردوو "معوذە"كان بخوێنێ. سوودی تێكڕای هەموو ئەمانە پاراستنی ئیمانە و، وا سوودی یەكە یەكەیشیان بەتایبەتی بە برادەرانی خۆشەویستم ڕادەگەیەنم:

لە حەدیسی شەریفدا هەیە كە "ایە الكرسی" گەورەترین ئایەتی قورئانە. هەروەها لە حەدیسێكدا هەیە: هەركەس لە پاش هەموو نوێژێك (آیة الكرسي) بخوێنێ هیچ شتێ ڕێگای بەهەشتی لێ ناگرێ، مەرگ نەبێ، واتە: هەر ئەوەندە واتای ئەم حەدیسە تەنیا بۆ ئەو كەسانەیە كە مەعنای (آیة الكرسي)یەكە بزانن، یاخۆ بۆ هەموو كەسێكە كە بەئاگاداریی دڵەوە بیخوێنێ، یا هەرچۆنێ هەبێ؟. لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە كە ئایەتەكانی دوادوایی سوورەتی (بقرە) شیفای نەخۆشن، لە فەرموودەی ترا هەیە كە خوای گەورە ئایەتەكانی دوادوایی بەقەرەی خۆش دەوێ، كەواتە بیانخوێننەوەو، ژن و منداڵتان فێربكەن؛ چونكە ئەمانە هەموو قورئانن و دوعان.

تایبەتییەتیی ئایەتی (شهد الله... الآیة) لەگەڵ ئایەتەكانی دوا دوایی سوورەتی بەقەرە ئەوەیە كە هەر كەسێ ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەواندا، پاش هەموو نوێژێ، بخوێنێ لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ئینسانە بانگ دەكرێت و، خوای گەورە دەفەرموێ: ئەم بەندەی منە لەگەڵ مندا پەیمانی بەستوەو، من لە هەموو پەیمانداریێ ڕاستترم بۆ بەجێهێنانی

پەیمانی خۆم، پێویستە بیبەن بۆ بەهەشت، ئیتر کتوپڕ فریشتەکان دەیبەن بۆ بەهەشت. ئەی براینە! پایەی پاداشی ئەم ویردە بە جۆرێکە کە لەعەرشدا دەنووسرێ و دەمێنێتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت. لە ڕۆژی قیامەتا فریشتە بانگ دەکا: کێ ئەمانەتی لە لای خوا هەیە با بێ ئەمانەتەکەی وەربگرێتەوە، لەو کاتەدا ویرد خوێنەکە پاداشەکەی دەدرێتە دەست. شایانی باسە کە هیچ گوناهێك ئاساری ئەو شەهادەتە لانابا، بەلاّم خواپەرستیی ترو چاکەکردن بەهۆی گوناهـ کردنەوە دەفەوتێن، بۆ وێنە: کەسێ کە هەندێ ئیتاعە و خواپەرستیی هەبێ، وەکو سەدەقە و چاکە لەگەڵ خەڵك کردن، ئەگەر منەت بنێتە سەر ئەو کەسە کە چاکەکەی لەگەڵ کردووە، خێرەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، هەروەها بەهۆی غەیبەت کردن و، لە پاشملە بەخراپی باس کردنەوە، گەلێك لە خێراتی ئەو کەسە غەیبەتکەرە دەکوژێتەوە. تەنانەت دەگێڕنەوە کە لە مەیدانی پاداش وەرگرتندا خاوەن خێرات شکات دەکا و دەڵێ: من گەلێ خێراتم کردووە، فریشتە نووسەرەکان نەیاننوسیوە! ئەنجا وەلاّمی دەدرێتەوە: بەڵێ ڕاستە ئەو خێرانەت بووە، بەلاّم بەهۆی غەیبەت کردنەوە خێرەکانت لە نامەی کردەوەت هەڵگیراون و لە نامەی کردەوەی کابرای غەیبەتکراودا نووسراون و بوون بە خێری ئەو. هەروەها گەلێ گوناهی گەورە هەیە، وەکو بەخیلی بەخەڵك بردن و بوختان بۆ خەڵك هەڵبەستن، دەبنە هۆی کوژانەوەی کردەوەی خێر لە نامەی کردەوەی ئەو موسڵمانانەدا، بەلاّم باوەڕ بەخوا کردن و شەهادەتدان بەوەی کە خوا تاق و تەنیایە، ئەوەندە گەورەیە هیچ گوناهێ نایشۆڕێتەوە، وەکو ئەمانەت بۆی هەڵدەگیرێ "لان الله تعالى لا يضيع ودائعه" تەنانەت ئەگەر چاکە و کردەوەی باشی کابرا ئەوەندەش نەبێ کە ببێ بەهۆی ڕزگاریی، ئەو شەهادەتە دەبێتە هۆی ڕزگار بوونی لە ڕۆژی قیامەتدا و، لە ئەنجامدا دەڕواتە بەهەشت.

ڕیوایەت کراوە کە (اسمی اعظم) لە ئایەتی "شهد الله انه لا اله الا هو" دایە. هەروەها دەگێڕنەوە کە یەکێ لە هاوڕێیەکانی پێغەمبەر (د.خ) کە ناوی (معاذ)ی کوڕی (جبل) بوو لەلای پێغەمبەر (د.خ) سکالاّی قەرزاری و نەداریی خۆی کرد، حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئایەتێکت تەسلیم دەکەم بیخوێنەو دوعای لەگەڵدا بکە، ئەگەر بەقەدەر کێوی (احد) قەرزت لەسەر بێ خوای گەورە بۆت دەداتەوە: هەموو ڕۆژێ بڵێ: «قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ [٢٦] تُولِجُ اللَّيْلَ فِي الْنَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الَمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ» وە بەشوێنی ئەم ئایەتەدا

بلّێ: - "رحمن الدنیا والآخرة ورحیمهما تعطی من تشاء وتمنع من تشاء" وه له ڕیوایەتێکی تردا "تعطیهما من تشاء وتمنع منهما من تشاء، فارحمني رحمة تغنینی بها عن رحمة من سواك، اللهم اغننی من الفقر، واقض عنی الدین، وقوني في عبادتك وجهاد في سبیلك یا ارحم الراحمین". له فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووه سوورەتی "اخلاص" واتە: "قل هو اللـه احد. الآیة" بەقەدەر سێیەکی قورئان پاداشی هەیە. هەروەها له فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووه: که هەر کەس هەزار جار ئەم سوورەته بخوێنێ نامرێ هەتا جێگای خۆی نەبینێ له بەهەشتدا، بەتایبەتی ئەگەر له ڕۆژی "عەرەفە" دا هەزار جار ئەم سوورەتەی خوێند دوعا و نزای لای خوا وەردەگیرێ. هەروەها له ڕیوایەتێکی ترا دەڵێت: ئەو کەسە نەفسی خۆی له خوا کڕیوە. له ڕیوایەتێکی ترا دەڵێ: خوێندنی سوورەتی ئیخلاس بۆ خۆی و ئەهل و ئەولادی قازانجی هەیە و، بەرەکەتی زۆرە. له فەرموودەیەکی تردا هەیە که هەرکەس له پاش هەموو نوێژێك دوانزە جار سوورەتی ئیخلاس بخوێنێ گوناهی عەفوو دەکرێ و ڕەزای خوا دەبارێتە سەری. له فەرموودەیەکی تردا هاتووه که خوێندنی ئەم سوورەتە دەبێتە هۆی ئەوەی له بەڵای هاوبەش بۆ خوا دانان دووربکەونەوە، فریشتەی بەزەیی لێی نزیك ببێتەوەو، ئەهریمەنەکان لێی دووربکەونەوە، ئەو سوورەتە بە دەوری عەرشدا دەسوورێتەوەو له خوای گەورە دەپاڕێتەوەو، دەڵێ: خوایا ڕەحم بەو کەسە بکە کە بەخوێندنەوەی منەوە خەریك بووە.

له حەدیسێکی تردا هەیەکە هەر کەس دەڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی لەوکاتەدا بەمەنزڵەکەی دەگات سەلام بکات و یەك جار سوورەتی (قل هو الله) بخوێنێ هەتا دوایی سوورەتەکە، ئەوە شوێنەکەی له هەژاری پاك دەبێتەوەو خودای گەورە رزق و ڕۆزییان بۆ زیاد دەکات. هەروەها دەگێڕنەوە: کە هاوڕێی پێغەمبەر (مەعاذ) (ر.خ) له خزمەتی پێغەمبەردا (د.خ) سکاڵای دەردی هەژاریی خۆی کرد، ئەویش پێی فەرموو: هەر کاتێ چوویتەوە ماڵی خۆت ئەگەر کەس لەوێ بوو سڵاوی لێ بکەو، ئەگەر کەس نەبوو سڵاو له نەفسی خۆت بکە بە لەفظی (السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین)، ئەنجا سوورەتی ئیخلاص بخوێنە. (معاذ) خودای لێ ڕازی بێت ئەم ئامۆژگارییەی وەرگرت و، پەیڕەوی کرد: ئەوەندەی پێ نەچوو کە خودای گەورە دەرووی لێ کردەوەو ڕۆزی زیاد کرد بەجۆرێ کە مەعاذ (ر.خ) خزمەتی دراوسێکانی خۆیشی دەکرد.

دەگێڕدرێتەوە کە حەزرەتی جوبرەئیل هات بۆ لای حەزرەت بەشێوە و هەیبەتێك کە

دەشت و کێوی داگرت و، فەرمووی ئەی محەمەد! دەتەوێ حازری نوێژی جەنازەی (موعاویە)ی کوڕی (معاویە)ی مەزەنی ببیێ؟. حەزرەت (د.خ) دەفەرموێ: منیش حازری جەنازەکەی بووم و، نوێژەکەیم کرد، دیم دوو ڕیز لە فریشتەکانیش نوێژی بەسەرەوە دەکەن.. پرسیم ئەی جویرەئیل! موعاویە بەهۆی کام کردەوەیەوە بەم پایەیە گەیشتووە؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: لەبەرئەوە کەسوورەتی (ئیخلاس)ی خۆش دەویست و، لە هەستان و دانیشتن هاتوچۆدا، واتە: لە هەموو کاتێکدا خوێندوویەتی. لە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەردا هاتووە: ئەگەر کەسێ ویستی بۆ سەفەر بڕوا هەردوو دەستی بە هەردوو لای دەرگای خانووەکەیەوە بگرێ و، پانزە جار سوورەتی ئیخلاس بخوێنێ، خوای گەورە ئەو ماڵ و حاڵەی بۆ دەپارێزێ هەتا لە سەفەر دەگەڕێتەوە. لە حەدیسی تردا فەرموویە: خوێندنی (قل هو الله احد) و (معوذتین) سێ جار بەستە بۆ پاراستنت لە هەموو شتێ، بۆ هەموو کەسێ لە خەواس و عەوام و، تێکڕای ئەمانە کە باسمان کردن بۆ پاراستنی ئیمان، بەسوودن و، خوێندنی ئەمانە لەگەڵ تێگەیشتنی مەعناکەیاندا پاداشیان زۆرە• لە هەندێ ڕیوایەتدا دەڵێ: دەبنە هۆی پاراستنی ئیمان، هەرچەند بە بێ تێگەیشتنی مەعناکەشیان خێر و پاداشیان گەورەیە. لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: (معوذتین) زۆر بخوێنن؛ لە پاش مردن، خوا ئێوە بە (معوذتین) دەگەیەنێ و، ئەم دوو سوورەتە قەبرەکانتان بۆ ڕووناك دەکاتەوە و ئەهریمەنتان لێ دوور دەخاتەوەو، خێر و پاداشتان بۆ زۆر دەکا و سەنگی چاکەتان لە ڕۆژی پاداشدا سەنگین دەکا و شارەزاتان دەکا بۆ بەهەشت و لە بەهەشتدا هەتایە دەوام دەکا.

شێخ (جەلالە دینی) سیوتی (ر.خ) لە (عەقەبەی) کوڕی (عامر)ەوە دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: – "لن تقرأ سورة احب الى الله ولا ابلغ من (قل اعوذ برب الفلق) و (قل اعوذ برب الناس) فان استطعت ان لا تدعهما في صلاة فافعل" واتە: هەرگیز سوورەتێك ناخوێنیتەوە کە لای خوا خۆشەویستتر بێ لە سوورەتی (قل اعوذ برب الفلق) و (قل اعوذ برب الناس)و، ئەگەر دەتوانی لە هیچ نوێژێکدا تەرکیان نەکەی تەرکیان مەکە.

براینە! (مونجیاتی سبعە) واتە: حەوت ڕزگارکەرەکە، بکەن بە ویردی سبەینێ و ئێوارەتان، ئەوانەش حەوت سوورەتن دەبنە هۆی ڕزگاربوونی ئەو کەسانەی دەیانخوێننەوە لە بەڵای جیهان و سزای ڕۆژی قیامەت:

یەکەم: سوورەتی ئەلف لام میمی سوجدە. دووەم: سوورەتی یاسین. سێیەم: سوورەتی

حامیمی دوخان. چوارەم: سوورەتی "اذا وقعت". پێنجەم: سوورەتی (تبارك الذی بیده الملك). شەشەم: سوورەتی "هل اتی". حەوتەم: سوورەتی (الم نشرح). تایبەتییەتی ئەم سوورەتانە بە تێکڕایی ئەوە بوو کە وتمان، وا تایبەتییەتیی یەکە یەکەکەیشیانتان بۆ باس دەکەم:

ڕیوایەت کراوە: هەرکەس سوورەتی ئەلیف لام میمی سوجدەو (تبارك الذی بیده الملك) لە نێوان مەغریب و عیشادا بخوێنێ، لە ڕیوایەتێکی تردا: لە پاش عیشا و پێش نووستندا بیانخوێنێ لە فیتنەی پرسیاری (نکیر و مونکەر)و، لە سزای گۆڕ پارێزراو دەبێ. مەبەس لەم فەرموودەیە ئەوەیە هەر پرسیاری لێ ناکرێ لە قەبردا، یا بەئاسانی وەڵامی ئەو دوو فریشتانە دەداتەوە، بەجۆرێ کە خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی دوو فریشتەی بۆ دەنێرێ کە وەڵامی پرسیارەکانی فێر بکەن.

ڕیوایەت کراوە: هەرکەس هەموو شەوێ سوورەتی (یاسین) بخوێنێ؛ کاتێ کە مرد پایەی شەهیدی دەبێ و، لە کاتی سەرەمەرگدا تینووی نابێ و، ئەهریمەنی بەد لەو کاتە نالەبارەدا بەسەریدا زاڵ نابێت.

ڕیوایەت کراوە هەموو شت دڵی هەیەو، دڵی قورئانیش سوورەتی یاسینە، چونکە پوختەی قورئان کە خوا بە یەك زانینە و بەڵگەو دەلیلەکانی ئەم یەکیەتییەو، بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەمەد (د.خ)و، ڕێزگرتن لە قورئان و، گەلێ پەندو ئامۆژگاری و بەڵێن و هەڕەشەی تێدا کۆبوونەتەوە.

ڕیوایەت کراوە کە سوورەتی (یاسین) بەقەدەر دە جار خوێندنی قورئان، کە سوورەتی (یاسین)ی تێدا نەبێ خێرا و پاداشی هەیە. هەروەها لە حەدیسێکی درێژ دا باس کراوە کە ئەگەر یەکێ خواردەمەنییەکی کەمی هەبێ و ترسی ئەوەی ببێ کە بەش نەکات، ئەگەر سوورەتی یاسینی بەسەردا بخوێنێ خوای گەورە بەرەکەتی تێ دەخا و ئەو خواردەمەنییە کیفایەت دەکا. گێڕراوەتەوە کە ئەگەر سوورەتی (یاسین) بنووسرێتەوەو لەئاوا بشۆرێتەوە، هەرکەس ئەو ئاوە بخواتەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نووری ڕەحمەت بچێتە دەروونی و زەحمەت و ناساغی لە لەشی دەربچێ و، گومان و خەیاڵی ناباری لێ دوور کەوێتەوە. لە ڕیوایەتێکی تردا باس کراوە: هەرکەس ناساغ بێ و سوورەتی (یاسین)ی بەسەرا بخوێنرێتەوە خوا حاڵی نەخۆشییەکەی سووك دەکا و، ئەگەر بمرێ گیان دەرچوونی ئاسان دەبێ. زانایانی ئاین فەرموویانە: هەر کاتێ ترست لە شتێ پەیدا کرد،

دوژمن بێ یا غەیری دوژمن سوورەتی (یاسین) بخوێنە بەنیازی لادان و نەهێشتنی شەڕ و زیانی ئەو شتە خوا ڕزگارت دەکا. ڕیوایەت کراوە کە لە تەوراتدا مەدحی سوورەتی یاسین هەیە و، ناوی بردووە بە چوار ناو:

١- (صعودە) کە دەبێتە هۆی بەرزبوونی بەڵا لەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە.

٢- (دافعە) چونکە دەفعی بەڵا دەکا لەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە.

٣- (عەزیزە) چونکە لای فریشتەکان زۆر بەعیزەت و حورمەتەو، عەزیزەی پێ دەڵێن.

٤- (قاضیە) چونکە دەبێتە هۆی جێبەجێ کردنی پێویستی و لابردنی داماویی ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوە.

ڕیوایەت کراوە: هەرکەس لەبەیانیدا ئەم سوورەتە بەنیازی چاری داماوی و جێبەجێ کردنی پێویستی بخوێنێ خوای گەورە پێویستی ئەو ڕۆژەی جێبەجێ دەکا، هەروەها هەر کەسێ لە شەودا بیخوێنێ خوا پێویستییەکانی ئەو شەوەی بۆ جێبەجێ دەکات. هەروەها ڕیوایەت کراوە هەر کەسێ سبەینان حامیمی دوخان بخوێنێ، هەفتا هەزار فریشتە دوعای خێری بۆ دەکەن، ئەگەر لە ڕۆژا بیخوێنێ تا شەو دوعای خێری بۆ دەکەن و، ئەگەر لە شەوا بیخوێنێ هەتا ڕۆژ دەبێتەوە دوعای خێری بۆ دەکەن.

ڕیوایەت کراوە هەر کەس هەموو شەوێ سوورەتی (اذا وقعت الواقعه) بخوێنێ و، تەرکی نەکات، هەرگیز فەقیری و بێ نەوایی بەسەرا نایەت. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرمووی بەهاوڕێیەکانی: سوورەتی دەوڵەمەندی فێری خێزانەکانتان بکەن. عەرزیان کرد: سوورەتی دەوڵەمەندی کامەیە؟ فەرمووی: سوورەتی (اذا وقعت الواقعه)یە.

ئەی براینە لەو حەدیثانەدا کە بەیان کراوە ئەم سوورەتە قازانجی بۆ ڕزق و ڕۆزی هەیە، مانای وایە هەر چۆن بۆ ڕزق و ڕۆزیی دنیا بەسوودە، هەروەها بۆ ڕزقی قیامەتیش کە بریتییە لە زیادە عەفووی خواو پایە بەرزی لە بەهەشتدا بەسوودە، ڕزقی دنیا دەبڕێتەوە، بەڵام ڕزقی قیامەت نابڕێتەوە. وە ئەگەر موسوڵمان زۆرتر مەبەستی ڕزق و ڕۆزی قیامەت بێ لەوکاتەدا کارکردنی ئەم سوورەتە بۆ ڕزق و ڕۆزیی دنیا زۆرتر دەبێ. من خۆم حسێبم کردووە کە خێر و پاداشی خوێندنی سوورەتی (اذا وقعت) لە یەك جاردا دەگاتە هەژدە هەزار و نەوەد حەسەنە... بەخ... بەخ ئەم حەسەناتە بۆ ئینسان

چەندێ لە حەسەناتی دنیا بەسوودترە. ئەمسالی ئەمانە کە بۆ زیادیی ڕزق و ڕۆزی دەخوێنرێن وەکو (سبحان الله) کردنی مەنمومییە کە ئیمامەکەی لە سەهوو پێ ئاگادار دەکاتەوە؛ ئەوە ئەگەر ئەو (سبحان الله)یە دەیخوێنێ بەنییەتی ذیکرو ئاگادارکردن یا هەر بە نییەتی زیکر بێ ئەوا دوو فائیدەی تیایە: پاداشی تەسبیح و پاداشی ئاگادارکردنەوەی ئیمام، خۆ ئەگەر هەر بە نییەتی ئاگادارکردنەوەی ئیمام بێ ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەو کەسەیش ئەم سوورەتانە بخوێنێ ئەگەر هەر لەبەر ڕەزامەندی خوا بێ، یا لەبەر ڕەزامەندیی خواو، بەجێ هاتنی هیواکەی خۆی بێ، ئەوا ڕەزامەندیی خوا و مەبەستە خارجییەکەشی بۆ دەبێ. بەڵام ئەگەر هەر بەنیازی هاتنەدیی مەبەستەکەی خۆی بێ، ئەوە بێ سوود دەبێ، نە سوودی ئاینی و نە سوودی دنیایی هیچیانی دەس ناکەوێ، کەوابوو دەردەکەوێ ئەو کەسانەی ئەم سوورەتانە دەخوێنن و هیچ شتێ نابینن ئەوە لەبەرئەوەیە کە بەنیازی گەیشتن بە ئارەزووی دنیایی خوێندوویانە، بۆیە لە پاداشی قیامەت و لە سوودی دنیاش بێ بەش بوون. پێویستە ئاگاداربن لەم باسە.

چەند حەدیس دەربارەی گەورەیی سوورەتی تەبارەك وارید بووە. لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێت: ئاگادار بووم لەوە کە سوورەتی (تەبارەك) شەفاعەتی دەکرد بۆ یەکێ هەتا خوای گەورە لێی خۆش بوو. لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: "هي المنجية من عذاب البقر" واتە: هەر خوێندنی سوورەتی (تەبارەك) موسوڵمان لە سزای قەبر ڕزگار دەکا، ئیتر مەعنای حەسرەکە ئەوە نییە کە هەر تەنها ئەم سوورەتە ئینسان لە سزای گۆڕ ڕزگار دەکا، هەتا مەعناکەی ئەوە بگەیەنێت کە باقی طاعەت و تەوبەی مەقبوول ئینسان لە سزای گۆڕ ڕزگار ناکەن. هەروەها هەڵدەگرێ مەعنای حەسرەکە وەهابێ کە تەوبەی وەرگیراو دەبێتە هۆی بووردنی خوا لە تاوان بەشێوەی تکا (شفاعت)، بەڵام سوورەتی (تەبارەك) دەبێتە هۆی بووردنی خوا لە تاوان بەشێوەی تکاو بەشێوەی موجادەلەکردن لەگەڵ فریشتەی سزاداندا. لە حەدیسێکی پێغەمبەردا باس کراوە: کە یەکێك مرد و، بێجگە لە سوورەتی (تبارك) هیچی لەبەر نەبوو، کاتێ کە خرایە گۆڕو، فریشتەکانی پرسیار لە ڕاسەری ڕاوەستان، سوورەتی (تبارك) لە بەرامبەریان ڕاوەستا، ئینجا فریشتەی پرسیار پێی گوت: من ناتوانم تۆ عاجز بکەم و، نە ئێمەو نە تۆ ناتوانین بێ فەرمانیی خوا بکەین، جا ئەگەر دەتەوێ ئەم شەخسە ڕزگار ببێ لە سزا برۆ لای خوای گەورە تکای بۆ بکە، بەڵکو خوا لێی خۆش ببێ، سوورەتەکەش ڕۆیشتە ئەو جێگەیە کە بۆ سکاڵاو پاڕانەوە

دیاری کراوه و، عەرزی بارەگای هەره پیرۆزی کردو، وتی: خوایا! فلاّنه بەندەی تۆ له قورئاندا منی پەسەند کردووه و هەڵی بژاردووم هەتا شەو و ڕۆژ بمخوێنێ، ئیسته تکام وایه که له ئاگری دۆزەخدا سزای نەدەی، خوای گەورەش به میهرەبانی و بەزەیی خۆی دەفەرموێ: وا ئەو کەسەم به تۆ بەخشی و، هەرچی تاوانی هەیه لێی بووردم[1] جا پاش ئەمه ئەو سوورەته هات و فریشتەی سزاکەی لێ دوورخستەوەو، دەمی نایه سەر دەمی و وتی: مەرحەبا لەم دەمەی که زۆر جار منی خوێندووەتەوە، مەرحەبا لەم سینەیه که منی لەبەر کردووه، مەرحەبا لەم پێیه که خاوەنەکەی لەسەری ڕاوەستاوەو منی خوێندووەتەوە، جا کاتێ که حەزرەت (د.خ) ئەم بەیانەی فەرموو موسڵمانانی شاری (مەدینەی پیرۆز) هەموو ئەم سوورەتەی (تبارك)یان لەبەر کردو، حەزرەت (د.خ) ناوی نا سوورەتی (منجیه) یانی: ڕزگارکەری موسڵمانان له سزای گۆڕ.

له حەدیسێکی تردا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: پێم خۆشه که سوورەتی (تبارك الذی بیده الملك) له دڵی هەموو موسوڵمانێکدا جێگه بگرێ، یانی: ئەوەنده ئەم سوورەته پایەی هەیه له لای خواوه، بۆ موسڵمانان بەسوودە. هەروەها له حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: هەرکەس لەپێش نووستندا سوورەتی (تبارك) بخوێنێ، که نووست خوای گەوره فریشتەیەك ڕەوانه دەکا و ئەمری پێ دەکا که به پەڕوباڵی خۆی ئەو کەسه بپارێزێ و دای پۆشێ هەتا خەبەری دەبێتەوە. لەحەدیسێکی تردا فەرموویەتی: هەر ئەم سوورەتەیه که له گۆڕدا لەسەر خاوەنەکەی دێته جواب و دیفاعی لێ دەکا؛ بۆیه ناوبراوه بەسوورەتی (مجادله) واته جەدەلکەر.

له حەدیسێکی تردا هەیه که له ڕۆژی قیامەتدا شەخسێ دێنن بۆ مەیدانی لێپرسینەوە، که له دنیادا هەر گوناهێکی بۆ هەڵکەوتبێ تەرکی نەکردووە، بەڵام هەر ئەوەنده بووه که ئیمانی بووه، له قورئانیش هەر سوورەتی (تبارك)ی خوێندووەتەوە، ئەم موسوڵمانه شایانی سزای دۆزەخ دەبێ، کتوپڕ لەوێدا سوورەتی (تبارك) له شێوەی باڵندەیەکدا له سینەیەوه دێته دەرەوەو دەس دەکات به سکاڵاو پاڕانەوە له بەرقاپی خوای گەورەدا تا عەفووی دەکا.

---

(۱) ئەم عیبارەتانه که له حەدیثی شەریفدا هەن لەسەر بناغەی تەشبیهی مەعقوول به مەحسووسه و، بەشێوەی کینایه بەکارهێنراون، بۆ نموونه: جیدالی سوورەتی (تبارك) مەعنای ئەوەیه خودا دەیکا بەهۆی عەفوی تاوانبارەکه.

براینە! گەورەییی پایەی ئەم سوورەتی (مولك)ەو سوورەتەکانی تری سەبعەی مونجیە لەمە زیاترە کە من باسم کرد، بەڵام ئەم ئەندازەیە کە لێرەدا باسم کرد بەسە.

هەروەها سێ ئایەتی تر هەن لە سوورەتی (ڕوم)دان:

١ – "فسبحان الله حین تمسون وحین تصبحون".

٢ – والله الحمد فی السماوات والارض وعشیا وحین تظهرون.

٣ – یخرج الحی من المیت ویخرج المیت من الحی، ویحیی الارض بعد موتها، وکذلك تخرجون"

ئەمانەش بکەن بەویردی خۆتان لە سبەینێ و ئێواراندا چونکە لە فەرموودەی بەرزی پێغەمبەردا هەیە: هەر کەس ئەم ئایەتانە لە سبەینێکاندا بخوێنێ هەرچی خواپەرستییەك لەو ڕۆژەدا لە دەستی دەرچووبێ تۆڵەی وەردەگرێتەوەو، ئەگەر لە ئێواراندا بیانخوێنێتەوە هەرچی لەو شەوەدا لە دەستی دەربچێ تۆڵەی وەردەگرێتەوە، واتە: ئەو ئایەتانە دەبنە هۆی پڕ کردنەوەی کەموکورتیی ئەو شەو و ڕۆژە، تەنانەت خوای گەورە کە دەرحەق بە حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) دەڵێ: "وابراهیم الذی وفی" ئەم سیفەتی وەفایەی لەبەرئەوە بۆ ئیسبات کردووە چونکە لە کتێبەکەی خۆیدا ئەم ویردەی خوێندووەتەوە کە باسمان کرد، واتە: عیبارەتێکی وەهای خوێندووەتەوە مەعنای ئەم ئایەتانەی بەخشیوە.

لە فەرموودەی تردا هەیە: هەر کەس کاتێ کە ڕۆژی لێ بووەوە هەزار جار (سبحان الله وبحمده) بخوێنێ ئەوە بێگومان نەفسی خۆی لە خوای گەورە کڕیوە، بەڵام پێویستە مەعناکەی بزانێ.

لە دوا دوایی سوورەتی (حشر)دا لە ئایەتی (لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ) وە تا ئاخری سوورەتەکە هەر کەس بیخوێنێتەوە ئەوە لەو شەوو ڕۆژەدا هەر گوناهێکی بچووکی کردبێ لەسەری لا دەچێ. لە ڕیوایەتێکی تردا هەیە: ئەگەر ئەو ئایەتانە بخوێنێ و بمرێ پایەی شەهیدیی دەست دەکەوێ.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا هەیە: هەرکەس دەیەوێ بە (اسمی اعظم) بگا لە سەرەتای سوورەتی حەدیدەوە، هەتا دوایی دە ئایەت و، لە دوا دوایی سوورەتی حەشرەوە لە ئایەتی (لا یستوی)یەوە تا دوایی سوورەتەکە بخوێنێتەوە، ئەمجار بڵێ "یا من هو کذلك ولیس کذلك شئ غیرك، اسألك کذا وکذا" خوای گەورە ئەو نزایەی لێ قبول دەکا. ئیمامی

عەلی (ر.خ) فەرمووی بە (بزاء) – (ر.خ) –: واللە ئەگەر بەم ئایەت و دوعایە دوعا لە من بکریٚ کە برۆم بە ناخی عەرزدا، دەڕۆم.

لە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە: هەرکەسێ لە سبەیناندا دوادوایی سوورەتی حەشر بخوێنێ حەفتا هەزار مەلائیکە دوعای خێری بۆ دەکەن و، لەشەڕ و بەدیی ئەهریمەنە ڕاستەقینەکان و ئەهریمەنەکانی لە پێستی ئادەمیزادان ڕزگار دەبێ. وە ئەگەر لە شەودا بیخوێنێ هەروەها مەلائیکەکان دوعای بۆ دەکەن.

براکانم! واجیبە لەسەر ئینسانی موسوڵمان لەم بێ هۆشی و بێ ئاگاییە وریابێتەوەو، ئەم ویردانە هەموویان یا هەندێکیان بخوێنێ و، بیانکات بە ویردی سبەینێ و ئێوارەی. هەروەها دوو کەلیمەی شەهادەت (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) بکەنە ویردی خۆتان و، وشەی (الله) و وشەی (لا اله الا الله) لەگەڵ مەعنادا بکەن بە ویردی خۆتان هەتا بە غافڵی نەمێننەوە. بێگومان خوێندنی ئەم وشە و ڕستانە بۆ کەسێکی خاوەن تەوفیق زۆر ئاسانە و، ئەم وشە و ڕستانە زۆر بە بەرەکەت و خاوەن پاداشتن، بڕیاربدەن بیبانکەن بەویردی زمانتان، ئیتر ژمارە هەر چەند بێ ئارەزووی خۆتانە، بەڵام لەگەڵ ئاگاداریی دڵدا بیخوێنن بەڵکو بە بەختیاری بگەن.

لای کەمی سەڵەواتێکی بچووك بکەن بە ویردی خۆتان و، مەعناکەی فێر ببن و، جار بەجار لەگەڵ ئاگاداری و وریایی دڵدا بیخوێنن، ئەگەر وریایی دڵتان نەبوو هیوا وایە کە بە پیرۆزیی صەڵەواتەکەوە قبوڵ بکرێ. ئەمە خاسیەتی سەڵەواتە کە لە پاش زانینی مەعنا ئەگەر بە غافڵیش بخوێنرێ مەقبووڵە، بەڵام ئەورادەکانی تر بە غافڵی بخوێنرێن قبوول نابن، واتە: پاداش و سەوابیان زۆر نابێ، بەڵام پاداشی ئەسڵیی زیکر و تەسبیحەکە نافەوتێ.

براکان! قسەی ئادەمیزاد چەند زۆرە، ئەسبابی ڕزگاری لە سزای قیامەتیش ئەوەندە زۆرەو، ئێمە گەلێك تێ دەکۆشین بۆ دنیا و زەحمەت دەکێشین، جا ئەگەر عەقڵ و ئینسافمان ببێ پێویستە بەزەییمان بەخۆماندا بێتەوەو، بۆ هۆیەکانی ڕزگاریمان لە قیامەتدا تێ بکۆشین. خوا بە میهرەبانیی خۆی لە تاوان و گوناهمان چاوپۆشی بکات.

براکان! سزای قیامەت لە سزای دنیا زۆر تیژترە، هەروەکو لەزەت و خۆشیی قیامەت گەلێك لە لەزەت و خۆشیی دنیا زۆرترەو، لە ڕاستیدا دنیا، بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکیەوە، لە چاوی قیامەتدا شتێکی زۆر کەمە، هەروەکو ڕیوایەت کراوە: "ما مثل

الدنيا في الآخرة الا كما يغمس احدكم اصبعه في اليم، فانظر بم يرجع؟" واته: ئەم دنيايە بە چاك و خراپيەوە لە چاو ئەو دنياى تردا وەكو ئەوەيە كە يەكێك لە ئێوە پەنجەى بژەنێ بە دەريادا، ئاخۆ چەندێك ئاوى لەگەڵ دێ؟ نيسبەتى سزاو خۆشيى ئەم دنيا لەگەڵ سزاو خۆشيى قيامەتدا بەم جۆرەيە.

خوا بە ميهرەبانيى خۆى لە سزاى دنيا و قيامەت بمانپارێزى و، لە خۆشيى دنيا و قيامەت بەشدارمان بكا، ئامين يارب العالمين.

## نامەی دوازدەیەم

# باسی نەکردنی نوێژی جومعە و جەماعەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه واتباعه باحسان الى يوم الدين.

پاش ئەمە، براکانم! بزانن نیشانەی موسڵمان ئەوەیە کە لە ئامۆژگاریی ئایینی سوود وەربگرێ و، لە بیستنی وەعز و نەسیحەت تێر نەبێ. خوای گەورە فەرموویەتی: "وذكر فان الذكرى تنفع المؤمنين" واتە: ئەی پێغەمبەری رەهبەر، خوا و دینی خوا بخەرەوە بیری خەڵك؛ چونکە بەڕاستی ئەم ئامۆژگارییە و ئەم بیرخستنەوەی دینە زۆر سوود دەگەیەنێ بەوانەی باوەڕیان هەیە. لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێ هەر کەسێ سوود وەربگرێ لە ئامۆژگاریی ئایینی ئەوە ئەهلی ئیمانە؛ جا ئەم موژدە (ما شاء الله)ی دەوێ.

لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە: هەرکەسێ مەسەلەیەکی ئایینی فێر ببێ و بە یەکێکی تری بڵێ و فێری بکا، ئەوە بەقەدەر هەزار ڕکات نوێژ پاداش و سەواب وەردەگرێ، جا کەوابێ ئەم نامەیە گەورەترین دیارییە.

براکانم! لەمەوپێش لە بابەتی خوێندنی فاتیحە و تەحییات و ئەوانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە، بۆم نووسین، ئنیشەڵڵا کارتان پێ کردووەو سوودتان لێ وەرگرتووە، جا کە نوێژەکانتان دروست بوو بۆ ئەوە دەشێن کە بە جەماعەتیش بیکەن. لەم نامەدا باسی تەرکی جەماعەت و تەرکی جومعەتان بۆ دەکەم. بە هیوای ئەوەی سوودی لێ وەربگرن. نوێژی جەماعەت بەلای ئیمامی ئەحمەدەوە (ر.خ) فەرزی عەینەو، لای ئیمامی شافیعی (ر.خ) فەرزی کیفایەیەو، بە هەردوو شێوەکە زاناکانی ئاین تەرکی جەماعەتیان بە گوناهی گەورە ژماردووەو، هەر دێیەك یا گەڕەکێك لە شارێکدا واز لە جەماعەت بێنن ئەهلی ئەو شوێنە هەموو شەو و ڕۆژێك پێنج جار بە گوناهی گەورە گوناهبار دەبن و، هەموو مانگێ، کە (٣٠) ڕۆژ بێ سەدو پەنجا گوناهی گەورەیان لەسەر دەنووسرێ،

بەهۆی وازهێنان لە نوێژی جەماعەت و، هەموو ساڵێ (١٨٠٠) گوناهی گەورە دێتە سەر هەموو نێرینەیەکی باڵغی عاقل لەو شوێنەدا.

ئەی براینە! دەخیلتان بم! ئەوانەتان کە گیرۆدەی تەرکی جەماعەت بوون لەم بارە نالەبارە کە لە تاقەت و تواناتدا نییە خۆتان ڕزگار بکەن. نوێژی جەماعەت، چ فەرزی کیفایە بێ یا فەرزی عەین، چەند فائیدەیەکی بەنرخی هەیە، کە هەندێ لەوانە دەگەڕێنەوە بۆ نەفسی مەئمومەکەو، هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ هەموو حازرەکان لە ئیمام و مەئموم. هەندێ لەوانەش دەگەڕێنەوە بۆ هەموو موسڵمانان.

لە فائیدەی جۆری یەکەمە کە نوێژکەر لەناو جەماعەتدا لە سەهووکردن ئەمین دەبێ و، لە پەرستیاریی خوادا دەچێتە ڕیزی کۆمەڵی موسڵمانانەوە. لە فائیدەی جۆری دووەمە کە دڵی نوێژکەر لەگەڵ موسڵمانانی حازری مزگەوتدا ڕێك دەکەوێ و، خوای گەورە بە چاوی میهرەبانی تەماشای هەموو نوێژکەرەکان دەکا، چونکە هەندێ لە مەعنا لێدەرەوەکانی قورئان فەرموویانە: مەبەس لە بانگکردن بۆ خێر لە ئایەتی "ولتكن منكم امة يدعون الى الخير" بانگکردنە بۆ ئولفەت گرتنی موسڵمان لەگەڵ موسڵماندا. هەروەها لە فائیدەکانی جۆری دووەمە کە خووی بەدی لە خۆڕازی بوون و ڕووپاماییی ئینسان لەناو جەماعەتدا نامێنێ؛ چونکە بەهۆی زۆریی حازربووانی جەماعەت ئەو نوێژکەرە پایەیەکی تایبەت بۆ خۆی نابینێ، بەڵکو خۆی بە یەکێ لەو کۆمەڵە دەژمێرێ، ڕزگاربوونیش لەم جۆرە خووە بەشێکی گەورەیە. ڕزگاربوون لە خۆبەزل زانین لە فائیدەکانی جۆری دووەمە، کە خۆ بە گەورەزانین بەسەر خەڵکدا گوناهێکی گەورەیە: چونکە تەماشا دەکا یەکێکی لە خۆی کەمتر لە ماڵ و حاڵدا بووە بە ئیمام و، ئەمیش دوای دەکەوێ و ملی بۆ ڕادەکێشێ و لە هەستان و دانیشتن و ڕکووع و سجووددا پەیڕەویی دەکا، بەڵێ گەلێ کەس هەن لەبەر فیزو خۆ بەزلزانین لەپشت هەندێ کەسەوە نوێژ ناکەن.

لە فائیدەکانی جۆری سێیەمە: کە بەهۆی حازربوونی موسڵمانانەوە لە مزگەوتەکاندا ئۆلفەتێکی تێکڕایی پەیدا دەبێ بەجۆرێ کە لەو کۆبوونەوەیە هەست بە هێزداری و سەرکەوتنی ئیسلام دەکەن و، لەم بارەوە دڵنیاو دڵ پڕ لە باوەڕو متمانە دەبن لە چارکردنی هەر بەڵایەك کە ڕوویکاتە موسڵمانان، بەڵام نوێژ بەتەنیاکردن وەحشەت بەدڵی ئینسان دەداو، دوور کەوتنەوەیە لە موسڵمانەکانی تر. هەروەها یەکێ لە

فائیدەکان ئەوەیە کە ئینسان لە نێو کۆمەڵدا بەلای زۆرەوە لەسەر بیروباوەڕو ڕەفتاری ئەوان دەبێ، ئەمەش دەبێتە هۆی پارێزراوی لە گومڕاکردنی شەیتان و زاڵبوونی بەسەریدا؛ چونکە شەیتان وەکو گورگە و، گورگیش حەیوانێك دەخوا کە لە کۆمەڵە مەڕەکەوە دوور بێ، دیارە گەلەڕانێ کە هەمیشە لە ژێر چاودێریی شواندا بێ، شوانەکەی نایەڵێ گورگ زەربەیان لێ بدا و زەفەریان پێ بەرێ. یەکێ لە فائیدەکان زۆریی پاداشە، چونکە هەموو هەنگاوێك کە نوێژکەر دەینێ لە ڕێگای مزگەوتدا خوا بەخێری بۆ حسێب دەکا.

یەکێکی تر لە فائیدەکانی نوێژی جەماعەت ئەوەیە کە چاوەڕوانی نوێژ دەکا. لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە: کە چاوەڕوانی کردنی نوێژ خێری نوێژکردنەکەی هەیە. هەروەها لە فائیدەکانی جەماعەت زۆرکردنی وشەی سەلام و خۆشەویستییە لە نێوانی موسڵمانانەدا بە هۆی حازربوونیانەوە بۆ نوێژی جەماعەت. یەکێکی تر لە فائیدەکانی جەماعەت ئەوەیە کە نوێژی لە سەرەتای کاتی خۆیدا دەکرێ. یەکێکی تر لە فائیدەکان ئەوەیە کە (ئامین)ی مەئمووم لەگەڵ (ئامین)ی مەلائیکەکاندا یەك دەگرێ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی قبووڵ بوونی دوعاو عەفووی هەموو لایەکیان لە لایەن خوای گەورەوە. یەکێکی تر لە فائیدەکانی ئەوەیە کە ئینسان بەهۆی ڕۆیشتنەوە بۆ ناو ئەهلی جەماعەت هەیئەتی خۆی جوان دەکاو پۆشاکی باش لەبەر دەکا و بەگوێرەی ئایەتی پیرۆزی "خذوا زينتكم عند كل مسجد" دەجووڵێتەوە.

یەکێکی تر لە فائیدەکانی نوێژی جەماعەت ئەوەیە کە بەهۆی جەماعەتەوە نوێژکەر لە ڕیزا ڕادەوەستێ و بۆشایەتی لە ڕیزەکاندا نامێنێتەوە. یەکێکی تر لە فائیدەکان کردنی نوێژی (تحية المسجد)ە بەهۆی چوونەوە بۆ مزگەوت بۆ جەماعەت. هەروەها بەهۆی ڕۆیشتنەوە بۆ مزگەوت تەمەڵی لە لەشی نوێژکەردا نامێنێ بەهۆی ئەو کۆمەڵە موسڵمانانەوە کە حازر بوون و، ئەمین دەبێ لە هەندێ شت کە بەسەر نوێژکەری تەنیادا دێ. یەکێکی تر لە فائیدەکانی نوێژی جەماعەت هاتوچۆ کردنی زۆرە بۆ مزگەوت، کە دەبێتە هۆی ڕزگاربوون لە نیفاق و بێ دینی؛ چونکە لە حەدیسی شەریفدا هەیە: هەرکەسێ چل ڕۆژ بە (الله اكبر)ی نوێژ دابەستنی ئیمامدا بگا لە نوێژی سبەینێدا ئەوە بە میهرەبانیی خوای گەورە لە دوو مسیبەت پاك دەبێتەوە: یەکەم: نیفاق. دووەم: مانەوەی ئێجگاری لە دۆزەخدا؛ واتە: بەهۆی دەوامی ئەم چل ڕۆژەوە خوای گەورە ئەو

میهرەبانییەی لەگەڵدا دەکا. دیسان لە حەدیسدا هەیە: نوێژی سبەینێ و نوێژی عیشا لەسەر شانی منافق گرانن؛ واتە: بەجێیان ناهێنن. جا بە هۆی دەوامی ئەم چل ڕۆژەوە دڵی نوێژکەر نوورانی دەبێ و باوەڕی بەهێز دەبێ و، لەسەر خوداپەرستی بەهێز و گورج و گۆڵ دەبێ و بە موسوڵمانانی پاك حسێب دەکرێ.

دەگێڕنەوە: کاتێ کە موسڵمانان بۆ نوێژی جەماعەت ڕیز دەبەستن فریشتەکانیش بەدەوری ئەواندا ڕیز دەبەستن و، سەڵاواتیان لێ دەدەن و دوعای خێریان بۆ دەکەن و، دوعایان بۆ دەکەن کە تەویەیان لێ قبووڵ بکرێ و، ئەگەر ئەو موسوڵمانانە دوعایەك بکەن فریشتەکان لەسەر داخواز و دوعاکەیان ئامین دەکەن، بێگومان ئەم نیعمەتە نیعمەتێکی گەورەیە کە موسڵمان بگا بە پایەیەك فریشتە بەو جۆرە خزمەتی بکەن. لەڕاستیدا بەهۆی ڕیزبەستنی موسڵمانانەوە بۆ نوێژی جەماعەت ئەو موسڵمانانە دەشوبهێنە ئەو مەلائیکەتانە کە خوای گەورە لە زبانیانەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێ: "وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ" واتە: بەڕاستی ئێمە ڕیزمان بەستووە بۆ خوا پەرستن و گوێ ڕایەڵیی فەرمانەکانی. ئەم باسە کە خوای گەورە دەیگێڕێتەوە لێیان، وادەگەیەنێ کە خواپەرستی بەشێوەی ڕیز بەستی عابیدەکان لای خودای گەورە شیرینتر و بەنرخترە لە ڕاستیدا ڕیزی ئەو عابیدانە لە ڕیزی ئەو موجاهیدانە دەچێ کە لە جەنگدا دژی کافران ڕیزدەبەستن و کۆمەکی یەکتر دەکەن؛ ئەو موجاهیدانە خۆشەویستی خوان؛ خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:- "إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ" واتە : بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە لە ڕێی خوادا دژی کافران دەجەنگن و، ڕیزەکەیان ئەوەندە توند و یەکگرتووە وەك بینای ڕێك و بتەو وایە.

لە لایەکی ترەوە تەماشا دەکەین ئەم عابیدانە کە بۆ خوداپەرستی کۆدەبنەوە لەگەڵ نەفسی خۆیان و لەگەڵ شەیتاندا دەجەنگن؛ چونکە نەفس هەمیشە فەرمان دەداو هانی مرۆڤ دەدا کە ڕابوێرێ و بە ئارەزووی خۆی بژیێ و گوێ نەداتە فەرمانبەرداری و خواپەرستن، شەیتانیش دوژمنی ئادەمیزادەو هەوڵ دەدا لە ڕێگەی ڕاست لای دا و ملی بشکێنێ.

نوێژکردن بە جەماعەت گەورەترین شیعاری ئیسلامە و، لەلایەنی خوای گەورە بەتوندی داوای دەربڕینی شیعاری ئیسلام کراوەو، خوا فەرمانی داوە بەوە کە موسڵمانان یارمەتیی یەکتر بدەن و لە کاری خێرا هاریکاری بکەن. بێگومان هەر ئاوەدانییەك، چ دێ

بێ و چ خێوەت و ڕەشماڵ، ئەگەر شیعاری ئیسلامی تێدا نەبێ لە ئاوەدانی کافران دەچێ و، ئەهلی ئەو شوێنانە بە گوناهبار و لە دین لادەر ناسراون و دەناسرێن.

پوختەی قسە: فەزل و شەرەف و پایەی جەماعەت و ئەهلی جەماعەت زۆرە و، ئەگەر بێین بەدرێژی باسیان بکەین دەبێتە هۆی ماندووبوون؛ جا با لێرەدا بیبڕینەوە.

لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە: کە نوێژ خێری مەوزووعە، واتە: نوێژ بەرەکەتدار و، عیبادەتێکی پیرۆزەو دانراوە بۆ موسڵمانان هەتا سوودی لێ وەربگرن، نوێژ لە هەر عیبادەتێ کە بە لەش بکرێ سوودی زۆرترە؛ چونکە بەڕاستی نوێژ گەلێ خواپەرستیی تێدایە چ لە بابەتی قسە و چ لە بابەتی ڕەفتار، وەکو خوێندنی (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن و، خوێندنی سوورەتی ترو (سبحان الله) خوێندن و (الحمد لله) و (تحیات) یا ڕکووع و سجوود و ڕاوەستان و دانیشتن و دەست بەرزکردنەوە لە کاتی ئازو گوێز (انتقال) یا لە کاتی قنووتدا، نەك تەنیا ئەمە بەڵکو ماڵ باخت کردنیشی تێدایە، چونکە ئەو مزگەوتە کە نوێژەکەی تیا دەکرێ، پێویستی بە ئیمام و بانگدەر و خادم و فەرش و بەرماڵ و چراو ئاوی دەسنوێژ و خۆشۆردن و گەلێ شتی تر هەیە، کە ئەمانەش هەموو بە ماڵ پەیدا دەبن. ئیمامی غەزالی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: ئەم بەهرەو گەورەییی جەماعەتە لە دەستی هەرکەس دەربچێ، ئەوە لەبەر شوومی و نەگبەتیی گوناه کردنە. واتە تا ئینسان گوناهێ نەکا دڵی وەها ڕەش نابێتەوە کە بە بێ عوزر تەرکی جەماعەت بکا. پێشینانی خواپەرست و لە خواترس، ئەگەر یەکێکیان نوێژێکی جەماعەتی بفەوتایە، تا حەوت ڕۆژی تەواو سەرخۆشیان لێ دەکردو، ئەگەر یەکێ وتنی (الله اکبر)ی نوێژدابەستنی لەگەڵ ئیمامدا بۆ ڕێك نەکەوتایە سێ ڕۆژ سەرخۆشییان لێ دەکرد، ئەو وشەی سەرخۆشی لێ کردنەش ئەمە بوو: "لیس المصاب الا من حرم الثواب" واتە: تەنیا ئەو کەسە تووشی موسیبەت بووە کە لە پاداشی طاعەت بێ بەش بووە. لە ڕاستیدا مرۆڤی بێ تاعەت بێ بەشە لە پاداش.

زانایانی ئاین چەند ئایەت و چەند حەدیسێکیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە واز لە جەماعەت هێنان گوناهە: یەکێ لەو ئایەتانە ئەم ئایەتەیە کە خوا فەرموویەتی: ( يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ[٤٢] خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ). هەندێ لەوانەی واتای قورئانیان لێ داوەتەوە فەرموویانە: ئەم ئایەتە دەرهەق بەو کەسانە هاتووە کە دەنگی بانگ دەبیستن

و بێ بەهانەیەکی شەرعیی ڕەوا، ناڕۆن بۆ نوێژی جەماعەت و بە کۆمەڵ. ئەمەش واتای هەموو ئایەتەکەیە: لەو ڕۆژەدا کە فریشتەی سزا بەڕیز ڕاوەستان و، کافرەکان و بێ دینە تاوانبارەکان دەبەن بۆ دۆزەخ و، هەر کۆمەڵێ لە کافرەکان شوێنی گەورەیان دەکەون، لەلایەن خاوە بانگێ بۆ موسوڵمانان دێ: ئەی موسوڵمانان! وا ئەوانەی کە خوایان نەدەپەرست کەوتنە شوێن گەورەکانی خۆیان و، ڕۆیشتن بۆ دۆزەخ، ئێوەش پێویستە هەمووتان بێن بۆ حزضووری خوا و سوجدەی گەورەیی بۆ بەرن و بە شەرەفی ئەو سوجدەیە بگەن، ئەمجا موسڵمانەکان هەموو دێن و سوجدە لە زاتی خوا دەبەن، ئەو موسڵمانانە نەبێ کە کاتی خۆی بە بێ بەهایەکی شەرعی تەرکی جەماعەتیان کردووە؛ ئەوانە پشتیان وەك تەختەدار ڕەق دەبێ و، هەرچی تێ دەکۆشن ناتوانن بچەمێنەوەو سوجدە بۆ خوا بەرن، لەوێدا فریشتەکان پێیان دەڵێن ئەم بارودۆخە کە ئێوەی تیدا داماون و، بێ بەش بوون لە سوجدە بۆ خوا بردن و، وەها زەلیلی و بێ قەدری داگیری کردوون، لە تۆڵەی ئەوەدایە کە لە دنیادا بانگ دەکران بۆ نوێژی جەماعەت، کەچی ئێوە بە بێ بەهانەی شەرعی تەرکتان دەکردو نەدەچوون بە دەم بانگەکەوە.

براکانم! تەرکی نوێژی جەماعەت ئەوەندە شووم و نەگبەتە و، ئەوەندە هۆیە بۆ دووری لە خوای گەورە کە ئەندازەی دەرناکەوێ؛ بۆ بەڵگە لەسەر ئەمە ئەوەند بەسە پێغەمبەری خوا (د.خ) لەگەڵ ئەو هەموو میهرەبانییەدا کە بوویەتی و، خوا لە شانی ئەودا فەرموویەتی: "بالمؤمنین رؤوف رحیم" دەربارەی ئەوانەی کە تەرکی جەماعەتیان کردوە فەرموویەتی قەستم کرد فەرمان بدەم بە یەکێ ببێ بە ئیمام بۆ موسڵمانان تا نوێژەکەیان بە جەماعەت بکەن و، خۆم لەگەڵ کۆمەڵێ لە یارانمان بڕۆین بۆ سەر ئەو کەسانەی تەرکی نوێژی جەماعەت دەکەن خانوەکانیان بسووتێنم. جا ئەگەر نوێژی جەماعەت زۆر گەورە نەبووایە لای خوا حەزرەت (د.خ) بەم شێوەیە عاجز نەدەبوو لەوانەی تەرکی دەکەن.

دەگێڕنەوە حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئەی عەلی! مرۆڤی بەختیار سێ نیشانەی هەیە، یەکەم: ژیواری لە حەڵاڵدا بێ. دووەم: هەستان و دانیشتنی لەگەڵ زانایاندا بێ. سێیەم: نوێژەکانی بە جەماعەت جێبەجێ بکا. ئەی عەلی! مرۆڤی بەدبەختیش سێ نیشانەی هەیە بەپێچەوانەی ئەوان کە باسمان کردن. دەگێڕنەوە: هەر کۆمەڵە ئادەمیزادێك لە شوێنێکدا کۆببنەوە، چ خێوەتنشین بن و چ دێهاتی، یا شارستانی، کە تەرکی نوێژی جەماعەتیان کرد، گەورە شەیتانیان بەسەردا زاڵ دەکا و ئاشووب دەخاتە ناویان!

ئەی موسڵمانینه! نوێژ بەجەماعەت بکەن با شەیتان گومڕاتان نەکا، شەیتان وەك گورگە، چۆن گورگ حەیوانی تار دەخوا، وەها شەیتانیش مرۆڤی دوور لە جەماعەت گومڕا دەکا. ئەوەش بزانن هەموو ئینسانێ یەك فریشتە و یەك شەیتانی هەیە، شەیتانەکە خەیاڵاتی ناشیرین و کردەوەی ناپەسندی پیشان دەدات و، فریشتەکەیش یادی خواو بیری پەسەندو کردەوەی جوانی نیشان دەدا، جا ئەگەر مرۆڤ بە فەرمانی شەیتانەکە ڕەفتاری کرد، ئەوە ئەنجامەکەی هەر گومڕایی و ماڵوێرانی و بەدبەختییە، خۆ ئەگەر بەفەرمانی فریشتەکە ڕەفتاری کرد ئەوە هەمیشە دڵی ڕووناك و بیروباوەڕی باش و خووڕەوشتی چاك پەسند دەکا، هەتا لە ئەنجامدا هەردوو دنیاو تۆ هەتا هەتایە سەربەرز دەبیّ. یەکێ لەو گوناهانە کە فریشتە لە دڵی مرۆڤ دوور دەخاتەوەو دەبێتە هۆی ئەوەی شەیتان دڵ و دەروونی مرۆڤ داگیر بکا، تەرکی نوێژی جەماعەتە.

دەگێڕنەوە: سێ تاقم هەن دوورن لە ڕەحمەتی خوا: یەکەم ئەوانە کە "حي على الصلاة" و "حي على الفلاح" دەبیسن و موبالات ناکەن و ناڕۆن بۆ نوێژی جەماعەت. هەروا دەگێڕنەوە: هەر کەس نوێژ بەتەنیا لە ماڵی خۆیدا بکا ئەوە سوننەت و سیرەتی پێغەمبەری (د.خ) ون کردووە. هەروەها لە حەدیسی شەریفدا هەیە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەوەندە بەسە بۆ بەدبەختیی موسڵمان دەنگی بانگ ببیسێ و بە بێ بەهانەی شەرعی واز لە نوێژی جەماعەت بهێنێ و، بە دەنگی بانگدەرەوە نەڕوا بۆ مزگەوت؛ چونکە ئەو بانگدەرە موسڵمانان بانگ دەکا و بۆ ڕزگاری لە سزای قیامەت، جا کە موسڵمان ماوەی هەبێ ئەوا پێویستە بڕوا بۆ لای. دەگێڕنەوە پێغەمبەر بە هاوڕێیەکانی فەرموو: هەرکەس دەنگی بانگدەر بیستێ و، هیچ بەهانەی نەبێ مەنعی بکات لە چوونی بۆ نوێژی جەماعەت، ئەو نوێژە کە لە ماڵەوە دەیکا قبووڵ نابێ.. هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: بەهانە چییە؟ فەرمووی: ترسی نەفس، یا ترسی لە کیس چوونی ماڵ، یا تووش بوونی زیانێکی وەها کە شەرع بە زیانی حسێب بکا، یا نەخۆشییەکی وەها کە زەحمەت بێ بۆی بەو حاڵەوە بڕوا بۆ مزگەوت. دەگێڕنەوە جارێ باسی یەکێکیان لای (ئیبن وعەباس) دەکرد، کە هەمووی ساڵ بەڕۆژووەو، شەو هەمووی بە پێوەیە و خەریکی نوێژو پاڕانەوەیە، ئەویش لێی پرسین: ئەی لە نوێژدا چۆنە؟ عەرزیان کرد: نوێژەکانی بەتەنیا دەکا و ناڕوا بۆ جەماعەت و، نوێژی جومعەیش ناکا، ئەنجا (عەبدوڵڵا)ی کوری (عەباس) فەرمووی: "هو في النار" خەڵك ئەم قسەیان لا گران بوو، هەتا ماوەی ساڵێك لەملا و لەولاوە دەهاتن بۆ خزمەتی و، لەم وەلامەیان دەپرسی،

ئەویش هەر هەمان وەڵامی دەدانەوەو، دەیفەرموو: "هو فی النار".

لەڕاستیدا لەم حاڵەدا کە باس کرا کابرا تەرکی نوێژی جومعەی کردووە کە فەرزەو، بە شێوەیەکی هەمیشەیی تەرکی نوێژی جەماعەتی کردووە، کە یا فەرزی عەینە یا فەرزی کیفایەیە...

دەگێڕنەوە (حاتەمی ئەسەم) کە یەکێك بووە لە پیاوچاکان، بەداخەوە دەیفەرموو: من جارێ نوێژی جەماعەتم تەرك کرد، تەنیا ئەبو ئیسحاقی بوخاری سەرەخۆشیی لێ کردم، بەڵام ئەگەر کوڕێکم بمرێ هەزار کەس سەرخۆشیم لێ دەکات، بەداخەوە ئەم خەڵکە موسیبەتی دنیاییان لا گەورەیە، موسیبەتی دینییان لا سووکە؛ ئەگەر نا گەلێ کەس دەهاتن سەرەخۆشیی ئەو نوێژە جەماعەتە لە کیس چوەیان لێ دەکردم. دەگێڕنەوە: (شەقیقی بەڵخی) خوای لێ ڕازی بێ، کە یەکێ بووە لە پیاوچاکانی سەردەمی خۆی، جارێك جەماعەتێکی فەوتا، ئەویش پەنجا دیرهەمی کرد بە خێرو دای بە گەدایان و بێ نەوایان و، هەتا ساڵێکیش لە خوا دەپاڕایەوەو دەیوت: "اللهم اعطنی اجر ما فاتنی".

براکانم! موسڵمانە چاکەکانی لە مەوپێش حاڵیان وابووە کە ئەگەر جارێ دوابکەوتنایە و، بە (اللـه اکبر) نوێژ دابەستنی ئیمامدا نەگەیشتنایە، یەك ڕۆژ سەرەخۆشییان لێ دەکرا، خۆ ئەگەر نوێژێکی جەماعەتیان لە کیس چوویایە ئەوا سێ ڕۆژ سەرەخۆشییان لێ دەکردن، واتە: تا سێ ڕۆژ کە دۆست و برادەرەکانی پێی دەگەیشتن دڵخۆشییان دەدایەوە و پێیان دەوت: ئینشەڵڵا خوای گەورە، پاش ئەم جارە تووشی ئەم ناخۆشییەت ناکا.

دەگێڕنەوە ئیمامی عومەر، خوای لێ ڕازی بێ، ڕۆژێك ڕۆیشتبوو بۆ باخێکی خۆی لە (مەدینە)، هەتا هاتەوە بۆ ماڵ هاوڕییەکانی پێغەمبەر جەماعەتی گەورەی خۆیان تەواو کردبوو، حەزرەتی عومەر، خوای لێ ڕازی بێ، لەم کارەساتە زۆر دڵگران بوو و فەرمووی: "انا لله وانا الیه راجعون" وا ئەم نوێژی عەسرەم بە جەماعەت لە کیس چوو، ئەی حازرینە بەشایەت بن بەڕاستی وا من ئەو باخی خۆمە بەخۆڕایی و لە ڕێی خوادا بەخشی بە هەژاران، بۆ داپۆشین و باربوو کردنەوەی ئەم کارە خراپەی لێی ڕوودام، واتە: لە کیس چوونی نوێژی جەماعەتی ئەم وەختەم، بەڵێ بەتایبەتی ئەو باخەی وەقف کرد؛ چونکە بەهۆی ئەوەوە جەماعەتەکەی فەوتابوو.

(عەبدوڵڵا)ی کوڕی (عومەر) خوایان لێ ڕازی بێ، فەرموویەتی: وەختی خۆی ئێمە

وەها بووین هەر کەسێ جەماعەتی نوێژی سبەینان و عیشای تەرك بکردایە گومانی منافقیمان لێ دەکرد؛ چونکە لە حەزرەتمان (د.خ) بیستبوو دەیفەرموو: ئەم دوو نوێژە زۆر قورس و گرانن لەسەر شانی ئەوانەی منافقن و بە دەم موسڵمانن. حەدیسی پیرۆزە: هەرکەس بە بێ بەهانە تەرکی نوێژی جەماعەت بکا بە عادەت بۆ خۆی پێی بڵێن: منافقە؛ جا تەماشا بکەن کەسێ کە حەزرەت (د.خ) بە منافقی ناو ببا دەبێ بێجگە هیلاك و بەفەتەرات چوون حاڵی چی بێت؟

برادەرینە! ئەهلی هەر دێیەك جەماعەتی پێنج فەرزە یا جەماعەتی یەك فەرز لەوانە تەرك بکەن هەموویان لە ئاینی ئیسلامدا بە فاسق و فاجیر دەژمێردرێن؛ چونکە جەماعەت لە نوێژدا نیشانەی جێبەجێکردنی واجیباتی ئیسلامە و، لای کەمی بە دوو کەس، بە ئیمام و مەئمومێ، جێبەجێ دەبێ، جاکە ئەو خەڵکە ئەوەندە گوێ نەدەرین بە ئایین و جەماعەت تەرك بکەن ئەوە مەعنای وایە کە ئیسلامەتی لای ئەوان سووك و بێ نرخە، بێگومان کە مرۆڤ گەیشتە ئەم پایەیە ئەوا ئەنجامی هەر کەوتنە و، پێویستە ئەو کۆمەڵە بێ جەماعەتە بۆ خۆیان بگرین و، لە خۆیان تەریق ببنەوە؛ چونکە لە هەر شارێکدا کۆمەڵێ لە جوولەکە یا گاور هەبن پەرستگاهێ بۆ خۆیان دروست دەکەن و، غیرەتیان هەڵناگرێ لەو شوێنەدا بە بێ گەنشتە بمێننەوە.

براکانم! ئەگەر مزگەوتتان دروست کرد لە لای قیبلەو میحرابەکەیەوە هەتا نیوەی ئەو شوێنە بە نییەتی مزگەوتەوە بیکەنەوە، ئەویتری، تا شوێنی کەوش و شوێنی ئاگر و دانیشتن بە نییەتی مزگەوت نەبێ، بەڵکو بە نیازی جێبەجێ کردنی پێویستییەکانی موسڵمانی نوێژکەر بێ، واتە: بۆ دانیشتن و دەستنوێژ گرتن و خۆ گەرم کردنەوە و شتی تر، هەتا لە کاتی دانیشتن و کۆڕبەستندا بەهۆی قسەی دنیایی کردنەوە تاوانبار نەبن و، ئەو خێرەی کە بۆتان نووسراوە لە نوێژکردن و جەماعەت و سەڵەواتدان لە کیس نەچێ؛ چونکە قسەی دنیایی لە مزگەوتدا بەڕای هەندێ لە زانایانی ئاین، عیبادەتی حەفتا ساڵ دەفەوتێنێ.

هەروەها شەرمکردن لە ماڵی خوادا (مزگەوت) زۆر پێویستە تەنانەت فەرموویانە: ئەگەر دڕکێ یا شتێکی پیس لەوانە کە لە مزگەوتدا کەوتوون، ئەگەر کەسێ دووریان بخاتەوە لە مزگەوت وا موناسبە هەڵیان بگرێ و، دەستی بخاتە ئەو دیوی دەرگای مزگەوت و لەوێوە فڕەیان بدا، واتە: ئەو شتە پیسانە لە ناو مزگەوتەوە فڕێ نەدا نەبادا

شتی پیس هەوای مزگەوت بگرێ، یا لە هەواوە بکەوێتە ناو مزگەوتەکە، لەبەرئەمە بوو عەرزم کردن بینای خانووەکە بەش بکەن: لای میحرابەوە تا نیوەی یا زیاتر بۆ مزگەوت و، ئەوی تری بۆئەوەی خەڵك تیا بحەسێتەوە. تاوان و زیانی بێ ئەدەبی لە مزگەوتدا هەموو لە نامەی حورمەت و ڕێزگرتن لە مزگەوتدا نووسراوە، بیخوێننەوەو سوودی لێ وەربگرن.

لە بابی نوێژی جەماعەتدا بەرچاوم کەوتووە کە موسڵمانێکی کوێر زۆر مەیلی لەسەر نوێژی جەماعەت بووە، لە شەوێکی باران و تەڕوتووشدا هەستاو کەوتە ڕێ بۆ مزگەوت، ژنەکەی پێی وت: ئیمشەو بارانە و تۆ عوزرت هەیە، بۆچی لە ماڵی خۆتدا نوێژ ناکەی، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ئەگەر بڕۆم بۆ مزگەوت سەواب و پاداشم زۆرە، لە هەمان کاتدا ڕۆیشتنەکەم دەبێتە سوپاس بۆ خوا لەسەر ساغیی دەست و پێم، کە پاش نوێژ لە مزگەوت گەڕایەوە خەوی لێ کەوت، کە ڕۆژی لێ بوویەوە هەردوو چاوی ڕووناك بوویبوونەوە، ئەنجا کابرا وتی بەژنەکەی: تەماشا بکە خوای بەخشندە و میهرەبان چۆن سوپاسەکەی منی قبووڵ کرد و بەڕەحمەت و کەرەمی خۆی چاوەکانیشمی ڕوون کردەوە؟

براینە! بزانن: تەرکی جەماعەت لە نوێژەکاندا بە بێ عوزر، تاوانە، هەروەکو تەرکی نوێژی جومعەش تاوانێکی گەورەیە؛ دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) دەربارەی ئەوانە فەرموویەتی: حەز دەکەم بڵێم بە یەکێك ببێتە پێش نوێژی موسڵمانان و، خۆم بڕۆمە سەر ئەوانە کە تەرکی نوێژی جەماعەت دەکەن، خانووەکانیان بسووتێنم!. دەگێڕنەوە کە ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) لەسەر مینبەر خوتبەی دەخوێند، لە وتارەکەیدا فەرمووی ئەو کەسانە کە نایەن بۆ نوێژی جومعە (واللە) یا دەبێ لەو ئیشە دەسبەردار ببن و بێن بۆ نوێژەکەیان، یا خودای گەورە دڵیان مۆر دەکات و دەیانکات بەوانە کە بێ ئاگان لە یادی خودا و، دوور دەبنەوە لە ڕەحمەت و میهرەبانی ئەو (خودا بمانپارێزێ).

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ بە بێ بەهانە لەبەر سستی و تەمەڵی سێ نوێژی جومعە تەرك بکا خوای گەورە لەبەر شوومیی ئەم تاوانە دڵی مۆردەکات و، نووری ڕەحمەت ناڕواتە ناو دڵیەوە و، لە ئامۆژگاریی کەس سوود وەرناگرێ. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: خوا لەو کەسەیش بێزار دەبێ. ڕیوایەت کراوە: هەر کەس سێ جومعە بەبێ بەهانە تەرك بکا ئەوە دڵی دەگۆڕێ بە دڵی ئینسانێکی منافق و، ئیسلامییەت دەخاتە پشتەوە. ڕیوایەت کراوە: هەرکەس یەك جومعە تەرك بکات خاڵێکی ڕەش لەبەر دڵی پەیدا دەبێ و، ئەگەر

دوو جومعەی تەرك كرد دەبێ بە دوو خاڵ و، ئەگەر سێ جومعەی تەرك كرد دڵی هەموو ڕەش دەبێتەوە (پەنا بەخوا لەم حاڵە ناشیرینە). ڕیوایەت كراوە: دوورترین ئینسان لە ڕەحمەتی خوا كەسێكە خاوەنی دڵی قەسوەتدار بێ، دیارە ئەوەی تەركی جومعە دەكا بەهۆی ئەو خاڵە ڕەشانەوە دڵیشی قەسوەتدار دەبێ. ڕیوایەت كراوە: ڕۆژێ حەزرت (د•خ) خوتبەی دەخوێندو، لە خوتبەكەیدا فەرمووی: ئەی ئادەمیزادینە پێش ئەوەی كە مردن یەخەتان بگرێ پەشیمان بنەوە و، بە هۆی بەجێهێنانی كرداری باش و بەجێهێنانی پەیوەندیی خوێشایەتی و، زۆرهێنانی ناوی خواو خێركردن بە پەنهانی و بەئاشكرا بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە. ئەگەر وەها بكەن خوا رزق و ڕۆزیتان زۆر زیاد دەكا و، هەر نوقسانییەكی بەسەر حاڵ و ماڵتاندا هاتبێ تۆڵەی دەكاتەوە بۆتان. بەڕاستی بزانن كە خودای گەورە نوێژی جومعەی فەرز كردووە لەسەر ئێوە لەم شوێنەدا و لەم ڕۆژەداو لەم مانگەداو لەم ساڵەدا هەتا ڕۆژی قیامەت، ئیتر هەركەس واز لە نوێژی جومعەی بهێنێ لە ماوەی ژیانی منداو لە پاش ژیانی من، چ فەرمانڕەوای دادپەروەر بێ یا زۆردارو ستەمكار، چ لەبەر بەسووك تەماشاكردنی نوێژەكە تەركی بكا، یا لەبەر ئەوەی ئینكاری بكا، لە خوا دەپاڕێمەوە ئیشوكاری ئەو كەسانە پەریشان بكاو، كردو كۆششیان كۆ نەگرێ و، بەرەكەت لە كاسبییاندا نەبێ. ئاگادار بن ئەم جۆرە كەسانە نوێژو ڕۆژوو زەكات و حەجیان لێ وەرناگرێ و، سەدەقەو خێریان لێ قبووڵ ناكرێ، مەگەر تەوبە لە تەركی نوێژی جومعەو بەڕاستی بەجێی بێنن.

براكانم! مادام حەزرەت (د.خ) ئەو دوعایەی كردووە لەوانە كە تەركی جومعە دەكەن، بەڕاستی بزانن تا ئەو كەسە تۆبە نەكا و بەڕاستی پەشیمان نەبێتەوە هەرگیز پیت و پیرۆزی لە كاروكاسبی و حاڵ و ماڵیدا نابێ و خۆشی و ئاسایشی دڵ و گیانی خۆی لەوانەدا دەست ناكەوێ. بەپێچەوانەی ئەمە ئەگەر جومعەكەی بەجێ بهێنێ خوای گەورە بە سەدان و هەزاران پایە بەرەكەت دەخاتە حاڵ و ماڵی ئەو كەسەوە.

ڕیوایەت كراوە: (ابن مالك)، خوایان لێ ڕازی بێ، كە لە نوێژی جومعە دەبوویەوە لە دەرگای مزگەوتەكەدا ڕادەوەستاو دەیفەرموو: ئەی خوای میهرەبان! من بەدەم بانگەكەی تۆوە هاتم و، ئەو نوێژە جومعەی كە فەرمووت جێبەجێم كرد و، وا لە مزگەوت دەرچووم بۆ ئەو كاروكاسبییەی كە ئەمرت پێ كردووە، لێ دەپاڕێمەوە كە بە دەهەندەیی خۆت ڕزق و ڕۆزیم پێ ببەخشی؛ هەرتۆ ڕزق و ڕۆزی بە هەموو گیانلەبەران دەدەی. دیارە كە خودا

ڕێگای ئەوەی داوە لەپاش نوێژی جومعە ئینسان بڕوات بۆ کەسابەت. موسڵمان لە کەسابەتی پاش نوێژی جومعەی خێری دەست دەکەوێ. ڕیوایەت کراوە لە (مجاهد)ەوە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ: کۆمەڵێ لە موسڵمانان لە ڕۆژی جومعەدا گوێیان نەدایە نوێژی جومعە و، دەرچوون بۆ ئیشوکار، هەتا هاتنەوە بۆ ماڵی خۆیان بە بێ ئەوەی دوژمنێکیان ببێ، خانوویان بسووتێنێ، یاخود هۆیەکی دیاری بووبێ، خانووەکانیان ئاگریان تێ بەر بوو بوو سووتابوون. لە ئیمامی (ئەوزاعی)یەوە دەگێڕنەوە کە وتوویە: پیاوێکی ڕاوچی هەبوو گوێی بە نوێژی جومعە نەدەداو، لە ڕۆژانی جومعەدا دەردەچوو بۆ ڕاو، ڕۆژێ لە کاتێکدا لە دەرەوە خەریکی ڕاو بوو بەخۆی و ئەسپەکەیەوە بەعەرزا ڕۆچوون و ون بوون. براکان! یەکێکی تر لە زیانی تەرکی نوێژی جومعە ئەوەیە: ئەهلی ئەو دێیە کە چل پیاوی تێدابێ و نوێژی جومعە نەکەن، ئەگەر لە ئەووەڵی وەختەوە نوێژەکەی نیوەڕۆیان بکەن ئەوە لە لای گەلێ لە زانایانی ئاین ئەو نوێژەیان بەتاڵە، چونکە واجیبە نوێژە نیوەڕۆکە ئەوەندە دوابخەن کە بە عادەت ناهومێد ببن لە کردنی نوێژی جومعە، ئەوسا نوێژی نیوەڕۆیان بۆ دروستە. زیانێکی کە لە نەکردنی نوێژی جومعەوە پەیدا دەبێ ئەوەیە کە گەلێ دوعاو ویردی ڕۆژی جومعە هەیە، تەنانەت نەخوێندەواریش دەتوانێ فێریان ببێ و، گەلێ سوودی دینی و دنیایی لە خوێندنیاندا هەیە، جا ئەو کەسانە کە نوێژی جومعە ناکەن لە بەهرەی ئەوانە ناهومێدو بێبەش دەبن.

یەکێك لەو ویردانە کە بۆ خوێندەواریش دەست دەدەن ئەوەیە کە هەر کەسێ نوێژی جومعە بکاو، لە پاش سەلامدانەوە لە نوێژەکەی هەر بەو شێوەی خۆیە بمێنێتەوە و سوورەتی "فاتحە"، "قل هو الله" و هەردوو "قل اعوذ" یەکێ حەوت جار بخوێنێ و، لەوناوەدا قسە لەگەڵ کەس نەکا، ئەوە لەوساتەوە هەتا جومعەی داهاتوو خوا لە فیتنەی ئادەمیزاد و شەیتان دەیپارێزێ.

دەگێڕنەوە: موسوڵمانێکی خاوەن باخ و خاوەن حەیوان و منداڵدار هەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژەکانی جومعە خۆی حازر کرد بچێ بۆ نوێژی جومعە، ژنەکەی پێی وت: منداڵەکانت برسین و، بارە دەغڵێکمان لە ئاشدایە، بڕۆ بارەکە بهێنەرەوە، مەڕۆ بۆ نوێژی جومعە، تۆ عوزرت هەیە، ئەویش وتی: وەڵڵا من جومعەکەم نافەوتێنم، خوا کەریمە بۆ منداڵەکان. هەر لەوکاتەدا دراوسێ باخەکەشی هات پێی وت: باخەکەت زۆر تینووە فریای بکەوەو ئاوی بدە، ئەویش هەروەکو پێشوو وەڵامی دایەوە. شوانیش پێی وت: فلان حەیوانتان بە

شاخەوە ماوەتەوە، ئەگەر نەڕۆن بە شوێنیدا نایەتەوەو گورگ دەیخوا! کابرا وەڵامی ئەمیشی وەك ئەوانی تر دایەوە و، ڕۆیشت بۆ نوێژی جومعە، کاتێ لە نوێژەکەی گەڕایەوە تەماشای کرد ژنەکەی نان دەکا؛ بۆیە لێی پرسی: ئەم نان کردنەت لە چییە؟ ژنەکەی وتی: دراوسێکەمان باراشەکەی ئێمەی بە باراشی خۆی زانیوەو هێناویەتیەوە بۆ ماڵ ئەنجا زانیویە کە باراشی ئێمەیە، بۆیە بۆی هێنایەوە! زۆری پێ نەچوو کە حەیوانەکەیشیان لە شاخ هاتە خوارو گەڕایەوە بۆ ماڵ، دراوسێ باخەکەشی هات و وتی: مۆژدەبێ! چووم بۆ سەیری باخەکان، تەماشام کرد هاوسێیەکانمان ئاوی باخەکانی خۆیان داوەو ئاوەکە سەرڕێژی کردووەو زۆر بە عادەتی باخەکەی تۆش تێراو بووە. ئەنجا کابرای نوێژی جومعە کردوو زۆر سوپاسی خودای کردو وتی: سوپاس بۆ خوا ئەمانە هەموو لە میهرەبانیی خواوەیە، لە پیرۆزیی نوێژی جومعە بوو کە بەجێم هێناو، بە بێ زەحمەت هەموو ئیشەکانم جێبەجێ بوون. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

نامەی سێزدەیەم

## نامەی عیبادەته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

براکانم! ئەم نامەیە کە نامەی دۆستی خۆتانە و، نامەکانی تریشم بە پێی فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ) گەورەترین دیارییەکن کە پادشاکان بۆ دۆستانیانی ڕەوانە بکەن. جا ئومێدەوارم هەر چۆنێ دیاریی دنیایی وەردەگرن و پێی دڵشاد دەبن، بەو جۆرە دیاریی دۆستی خۆتانیش قبووڵ بفەرموون و، خۆتان ڕەفتاریان پێ بکەن و، بۆ موسوڵمانانی بخوێننەوە، ئەمەش بزانن کە گوێدان بەم نامانە لە خووورەوشتی موسڵمانە. لە حەدیسدا هەیە گەورەترین خووورەوشتی چاکی موسڵمان ئەوەیە هەرگیز لە بیستنی خێری ئاینی تێر نەبێ.

ڕیوایەت کراوە: "ما اهدى مسلم لاخيه هدية افضل من كلمة حكمة يزيده الله بها او يرده عن ردى" هەروەها ڕیوایەت کراوە "ايما عبد جاءته موعظة من الله في دينه فانها نعمة من الله سيقت اليه، فان قبلها بشكر زاده الله نعما اخرى، والا كانت حجة من الله عليه... الى ان قال: "ويزداد عليه بها سخطا..." دیسان ڕیوایەت کراوە: "اذا حمل الرجل كلمة من الله الى اخيه المسلم كان خيرا له من حجة وعمرة ومن عبادة سنة" فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ): فێربوونی مەسەلەیەکی ئاینی و فێرکردنی خەڵك خێری هەزار ڕکات نوێژی سوننەتی هەیە.

براکانم! لەمەوپێش لە بابەتی نەکردنی نوێژ، یا دروست نەبوونی بەهۆی عەیبێکەوە وەك تەرکی ڕوکنێ لە ڕوکنەکانی نوێژەکە، یا جێبەجێ نەبوونی شەرتێك لە شەرتەکانی نامەم بۆ ناردن، ئومێدەوارم لەو ماوەدا

باش ئاگادار بووین لە ئاداب و مەرجەکانی نوێژو ئەوانەی نوێژ بەتاڵ دەکەونەوە و، بەساغی فێری تەحیيات و فاتیحە بووین. جائیستە بەپێویستم زانی هەندێ لەسەوابی نوێژی فەرزو سوننەت و نوێژی جومعەو جەماعەتتان عەرزیکەم. هەتا ئەگەر خوا مەیلی لەسەر بێ، پاش گێڕانەوەی نوێژە لە کیس چووەکانتان، دەست بکەن بە نوێژی سوننەت و سوننەتی پاش و پێشی نوێژەکان و، نوێژی جومعەو جەماعەتەکان بە ساغی بەجێ بێنن.

پێویستە بزانن ڕکاتێ نوێژی فەرز چ حازر بێ چ قەزا، ئەوەندەی حەفتا ڕکات نوێژی سوننەت خێری هەیە. جا هەر کاتێ بەیەقین زانیتان نوێژی فەوتاوتان لەسەر نەماوە، ئەوسا نوێژە سوننەتەکان بکەن، ئەگەرنا حەرامە لەسەر مرۆڤ، قەزای نوێژی فەرزی لەسەر بێ، خۆی بە نوێژی سوننەتەوە خەریك بکا. دڵنیابن نوێژ چ فەرز بێ چ سوننەت، توێشووی ڕۆژی قیامەتەو، شتێکی ئاشکرایە خوای گەورە ئەم دنیایەی کردووە بە شوێنی ئاسایش بۆ ڕێبوارانی ڕێی قیامەت و کردوویە بە ڕاگوزەریان هەتا لەم شوێنەداو لەم کاتەدا هەل بەکار بێنن و، لەم دنیایەدا کە شوێنی کشتوکاڵی قیامەتە توێشوویەك بۆ خۆمان هەڵبگرین و، بەبێ توێشووی ڕێگای قیامەت ئەم دنیایە بەجێ نەهێڵین. هەروەها ئاشکرایە دەستنوێژ گرتن و خۆپاك کردنەوە پێویستە و، لەسەر موسڵمان واجیبە، چ ژن چ پیاو، ئادابی تارەت و دەستنوێژ و نوێژ بەڕاستی بزانێ.

بۆ نموونە: کە ڕۆیشتن بۆ تارەت گرتن ئەگەر لە دەشتدا بوون ڕوو لە قیبلە و پشت لە قیبلە دانەنیشن، بەڵکو تەنشتتان لە قیبلە بێ، بەم جۆرە دانیشتنە خێرێکتان بۆ دەنووسرێ و گوناهێکتان لەسەر لادەبرێ، بەپێچەوانەوە ئەگەر خیلافی ئەمە دانیشن حەرامە. هەروەها لە دەشتدا لە کاتی تارەت گرتندا ڕوومەکەنە مانگ و خۆر، چونکە کەراهەتی تیایە، بەڵێ ئەگەر لەو دەشتەدا شتێ هەبێ بەرویشتی گرتبێ، ئەوا حورمەت و کەراهەتەکە نامێنێ.

ڕیوایەت کراوە: چوار تاقم هەن لەدۆزەخ دا دەبنە هۆی ئازار و سزای ئەهلی دۆزەخ: یەکێك لەو چوار تاقمە ڕیخۆڵەیان لە پاشیانەوە دەردەچێ و، بەشێوەیەکی ناشیرین بەناو ئەهلی دۆزەخدا دەسووڕێنەوە و، ئەوانیش لە چاوپێکەوتنی ئەو شێوە زۆر پەریشان دەبن، پرسیار دەکەن: ئەمانە لە ژیاندا ڕەفتاریان چۆن بووە؟ وەڵامیان دەدەنەوە کە ئەمانە لە

کاتی تارەتا باش تارەتیان نەگرتووە و، بە میز ئەندامیان پیس بووەو، نوێژەکەیان بە بەتاڵی کردووە، واتە: نوێژەکەیان بەتاڵ بووە؛ جا لەبەر ئەمەیە کە لەسەر فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعی و لای ئیمامی حەنەفی، خوایان لێ ڕازی بێ، خۆپاك کردنەوەی ئێجگاری لە میز واجیبە، واتە: لە پاش ئەوە کە ئینسان میزی کرد ماوەیەك بمێنێتەوەو، هەوڵ بدا لە پاش میز خۆی بپارێزێ. ڕیوایەت کراوە کە خوای گەورە بۆ سەر هەر نوێژکەرێ فریشتەیەکی تەرخان کردووە بۆئەوەی ئەگەر ئەو شەخسە لە تارەتدا باش خۆی پاك بکاتەوە، ئەو فریشتە دوعای بۆ دەکات و، دەڵێ: خوایا وەك ئەم بەندەی خۆتە خۆی پاك کردووەتەوە. تۆیش وەها لە گوناهـ و تاوان پاکی بکەرەوە. جا لەبەر گوێدان بە تارات و دەستنوێژو خۆشۆرین لە ئاینی ئیسلامدا پێویستە ئاوی پاك و پیس لە یەك جیابکەنەوە و، هەروەها ئەو ئاوە پاکە کە بۆ دەستنوێژو خۆشۆردن بەکار نایەت جیا بکرێتەوە. لەسەر موسڵمانان پێویستە کە لە ئاوی (قلتین) تێ بگەن، قوللەتەین یانی دوو کووپەی بچووك کە وەختی خۆی لە دەوروبەری شاری مەدینەی نوورانیدا ئاویان تێ کردوون. قوولەتەین بە پێوانە بریتییە لە مابەینی سەری پەنجەی دەست تا ئەنیشك، بە کورتی: بەقەدەر دوو بستی بنیادەمی مام ناوەندی پان و درێژ و قووڵ بێ. جا لە هەر شوێنێکدا ئاوی پاکی ئەندازەی قوولەتەین ببێ و، بەهۆی شتی پاکی وەك شیر و دۆ، وەها نەگۆڕابێ کە پێی نەڵێن ئاو، ئەوە بۆ تارەت و دەسنوێژ و خۆشۆردن بەکاردێ و، بەو ئاوە دەڵێن: پاك و پاککەرەوە (طاهر و طهور). خۆ ئەگەر بە تێکەڵێکی پاك گۆڕابوو بەجۆرێ کە ناوی ئاوی ڕووتی نەمابوو، بۆ نموونە پێیان دەوت (گولاو، ئارداو) ئەوە پاکە، بەڵام پاککەرەوە نییەو بۆ تارەت و دەستنوێژ و خۆشۆردن ناشێت، مەگەر ئەو شتە کە پێی گۆڕاوە لە شوێنی ئاوەکەدا بێ، وەکو ئەرزێکی شۆرەکات کە ئاوەکەی سوێر کردبێ، یا لە نزیکی گوزەرگای ئاوەکەوە بێ، وەکو ئەوەی کە کانی نەوت بەو دەورەدا هەبێ و ئاوەکە بۆنی ئەو نەوتەی گرتبێ ئەوە زیانی نییە بۆ ئاوەکە و، ئەو ئاوە پاکیشەو پاککەرەوەشە. خۆ ئەگەر ئەو قوللەتەینە شتێکی پیسی تێ بکەوێ، بۆ نموونە: قوللەتەینی ئاو بەقەدەر سەرە نینۆکێ پاکەمتەر خوێنی تێ بکەوێ، تام یا ڕەنگی بگۆڕێ ئەوە قوولەتەینەکە هەمووی پیس دەبێ و، بەکەڵکی تارەت و دەستنوێژ و خۆشۆردن نایەت، بەڵکو ئەگەر دڵۆپێك لەو ئاوە لە لەش یا لە پۆشاك بکەوێ ئەو ئەندامەو ئەو پۆشاکە پیس دەبێ و، پێویستە بە ئاوێکی پاك و پاککەرەوە بشۆردرێ.

ئەم باسە هەمووی بۆ ئاوی ڕاوەستاو بوو، واتە: ئەو ئاوەی کە لە بەری نەڕواو لە

شوێنی خۆیدا ڕاوەستابێ. بەڵام ئەگەر ئاوەکە لە بەری دەڕۆیشت وەکو ئاوی جۆگەو جۆگەلەو، ئەو ئەندازە ئاوەی کە لە مابەینی هەردوو لای جۆگەکەدایە قوللەتەین دەبوو، وەکو جۆگەی هەندێ ئاش، یا جۆگەی هەندێ کشتوکاڵ، ئەوە حوکمی قوللەتەینی هەیە، واتە: ئەگەر شتی غەیری ئاوی تێکەڵ نەبوو یا تێکەڵییەکەی لە شوێنی تێپەڕبوونی ئاوەکەدا بوو، وەکو جۆگەیەك کە بە کانی نەوتدا بڕوا، ئەوە پاکەو پاککەرەوەیەو، ئەگەر بەشتێکی پاك گۆڕدرا گۆڕانێکی وەها کە پێی نەڵێن ئاو، ئەوە پاکە، بەڵام پاککەرەوە نییە، مەگەر بە گڵی کێو و دەشت بگۆڕێ، وەکو ئاوی لافاوی بەهاران، ئەوە پاکە و پاککەرەوەیە. خۆ ئەگەر بە شتی پیس گۆڕا، ئەوە پیس دەبێ و، ئیتر بەکاری تارەت و دەستنوێژ و خۆشۆردن نایەت.

بەڵام ئەگەر (قلّمی) ئاوەکە واتە: ئەو ئەندازە وا لەبەینی ئەم بەرو ئەوبەری جۆگەکەدا لە قوللەتەین کەمتر بوو مادام شتێکی پیسی تێ کەوت ئەوە پیس دەبێ، چ لەو شوێنەی کە پیسییەکەی تێدایە یا لە خوارییەوە، یا لە ژووریەوەو، بەکەڵکی تارەت و دەستنوێژ و خۆشۆردن نایەت، هەروەها ئەگەر ئەو ئاوە لە لەش و جلوبەرگ کەوت پیس دەبێ و پێویستە بشۆررێ، ئەو حوکمە کە باسمان کرد سابتە، چ ئاوی ئەو جۆگە کەمە بەو پیسییە گۆڕابێ یا نەگۆڕابێ(١).

دەگێڕنەوە کە کاتێ سەعدی کوڕی مەعاز (ر.خ) کۆچی دوایی کرد حەزرەت (د.خ) فەرمووی: کاتێ کە گیانی پاکی سەعد گەیشتە عەرش لەبەر موبارەکیی پێ و قەدەمی ئەو عەرش کەوتە لەرزەو جووڵانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پاش ئەوەی خستیانە گۆڕو شاردرایەوە ڕوخساری حەزرەت گۆڕدراو نیشانەی غەمگینی پێوە دیاربوو، عەرزیان کرد: هۆی غەمگینییەکەت چییە؟ فەرمووی: چاوم کەوت بە سەعد کە گیرۆدەی ناخۆشییەك بوو، بەڵام لە خوا پاڕامەوەو ڕزگار بوو، لێیان پرسی: هۆی ناخۆشییەکەی چی بوو؟ فەرمووی: بەهۆی بابەتی خۆ پاککردنەوە لە میز بوو. پاش ئەوە حەزرەت (د.خ) فەرمووی زۆربەی سزای گۆڕ لە غەیبەت کردن و، لە خۆپاك نەکردنەوەیە لە میز لەکاتی تارەت گرتندا.

---

(١) بەڵام قەولی قەدیمی (شافعی) خوای لێ ڕازی بێ، لەم مەسئەلەدا جێگای ئیعتیبارە، کە فەرموویەتی ئاوی ڕەوان، هەرچەند کەمتر بێ لە قوللەتەین مادام یەکێ لە صیفەتەکانی نەگۆڕێ، پاکە و پاککەرەوەیە. وەرگێر

لە سوننەتەکانی حەزرەت (د.خ): هەر کاتێ دەستنوێژتان گرت گورج دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەستنوێژ بکەن و، لە ڕکاتی یەکەمدا ئایەتی "وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّاباً رَّحِيماً" وە لە ڕکاتی دووەمدا ئایەتی "وَمَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً" بخوینن.

ڕیوایەت کراوە لە حەزرەتەوە (د.خ) فەرموویەتی:" اشربوا اعينكم من الماء عند الوضوء" واتە ئاو دەرخواری چاوەکانتان بدەن لە کاتی دەستنوێژدا، واتە: کە دەموچاوتان شۆری لە کاتی دەستنوێژ گرتندا چاوەکانتان بکەنەوە با لەو ئاوی دەستنوێژەیان تێ بچێ. ڕیوایەت کراوە کە ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) لە ڕۆژی قیامەتدا لە سارای مەحشەردا (غر) و (محجل) دەبن، واتە: ئاوچاوان سپی و باسك و ساق سپین، تەنانەت ئەوانەشیان کە بەهۆی تاوانبارییەوە دەچنە دۆزەخ هەر بەو شێوە جوانەوە، کە عیبارەتە لە سپییەتی و ڕووناکیی دەم و چاو و دەست و پێیان دەچنە دۆزەخەوەو، بەهۆی دۆزەخەوە ڕەش نابنەوە، بەڵام باقیی ئوممەتەکانی تر وەها نین. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە هەر موسڵمانێك گوناهی گەورەی نەبێ دەستنوێژ دەبێتە کەفارەتی گوناهە بچووکەکانی.

لە حەدیسی پێغەمبەردایە کە لەگەڵ هەر تکێکی دوایی لە ئاوی دەستنوێژ لە هەر ئەندامێکی دەستنوێژەوە بێتە خوارەوە هەر گوناهێ بەو ئەندامە کردوویەتی دەکەوێتە خوار، بەتایبەتی ئەو دەستنوێژەی کە لە کاتی سەرمای سەختدا بگیرێ و بەتەواوی و بەڕەسایی جێبەجێ بکرێ، هەروەها تارەت گرتنی پێش دەستنوێژە کەیشی بە تاعەت و بە عیبادەت بۆ حسێب دەکرێ. شایانی باسە دەستنوێژی دائیمی نیشانەی بەهێزیی ئیمانە؛ واتە هەرکەسێ بەردەوام دەستنوێژی هەبێ ئەوە بە موسڵمانی تەواو حسێب دەکرێ.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە: بەردەوامیی دەستنوێژ دەبێتە هۆی گوشادیی ڕزق و ڕۆزی خاوەنەکەی، هەروەها خۆشۆردن بۆ نوێژی جومعەش ئیحسانێکی گەورەیە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو خۆشۆردنە کە بۆ نوێژی جومعەیە، بۆ لابردنی لەش پیسی (جنابت)یش بێ، واتە کە لە شەوی جومعەدا یا لە ڕۆژی جومعەدا لە پێش کاتی نوێژی جومعە خۆشۆردنی لەسەر واجیب بێ و، بە نییەتی غوسڵی جومعە و لابردنی لەش پیسی خۆی بشۆرێ، ئەوسا بە پاکی و خاوێنی بڕوات بۆ مزگەوت و نوێژی جومعە بکا، ئەوە ئیحسان و پاداشتی گەلێ زۆرترە لەو کەسەی کە بە تەنیا نییەتی غوسڵی جومعە بەجێ بهێنێ، پاداشتەکەی ئەوەندە زۆرە دەترسم لەوە ئەگەر بینووسم خەڵکی هەرەمە بڵێن: ئای ئەم کارە کەمە چۆن ئەوەندە پاداشتی زۆری هەیە؟

هەرکەس دەستنوێژی هەبێ و تازەی بکاتەوە، ئەویش پاداشتی زۆری دەست دەکەوێ. هـەروەهـا سوننـەتـە دەستـنـوێژگـر لـە دوادوایـیـی دەستـنـوێژەکـەیدا کـەمـێ لـە ئـاوی دەستنوێژەکەی بخواتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی شیفای لە نەخۆشی. هەروەها سیواککردن لە سەرەتای دەستنوێژدا سوننەتە، هەروەکو لە پێش دابەستنی نوێژیشدا سوننەتە. یەك ڕکات نوێژ بەسیواکەوە گەورەترە لە حەفتا ڕکاتی بێ سیواك، تەنانەت حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر نەبووایە بەهۆی زەحمەت و ماندووبوون بۆ ئوممەت ئەمرم بە هەموو نوێژکەرێکی ئوممەتم دەکرد لەگەڵ هەموو نوێژێکدا بەواجبی سیواك بەکاربێنن. وەك زانراوە سیواك کردن ئەوەیە کە بە مادەییەکی زبر هەموو دان و زمانی خۆی پاك بکاتەوە لە بەڵغ، بە باری درێژیدا بیهێنێ بە زمانداو، بە پانیدا بیهێنێ بە دانەکانیدا هەتا پووکی زامدار نەبێ، جا باشتر ئەوەیە کە سیواك کردن بەداری (ئیراك) بێ، کە دارێکی بۆن خۆشەو، مەغزەکەی ریشە ریشەیە، لە پاش تەڕکردن و خووساندنەوەی لە ئاودا بە شتێکی قورس بکوترێ هەموو ڕیشە ڕیشە دەبێ و، بۆ پاککردنەوەی دەم و ددان زۆر بەسوودە، خۆ ئەگەر داری ئیراك نەبوو ئەوا لقی داری ترشی سماق زۆر بەسوودە، ئەگەر ئەمەش نەبوو، هەر شتێکی پاکی زبری بە کەڵك هەبوو باشە. شێخ ئەحمەدی (ابن حجر) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، سی و نۆ سیفەتی چاکی لە سیواك کردنا بەیان کردووە. هەروەها بانگدان سوننەتێکی زۆر گەورەیە و پاداشتێکی زۆری هەیە. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك دەیانزانی کە لە بانگداناو لە ڕیزی یەکەمی جەماعەتی پشتی ئیمامدا چ پاداشتێکی گەورە هەیە، یا بەگژی یەکدا دەچوون لەسەر ئەمانە یا قورعەیان دەکرد.

ئـەی برایـنـە! بـانـگـی ئـیسلام بـۆ نـوێژەکـان مـوسـڵـمـانـی بـێ ئـاگـا ئـاگـادار دەکـاتـەوەو، ئەوانەی پێویستییان بەخۆ ئامادەکردن و پۆشاك لەبەرکردن و دەستنوێژ گرتن بێ خـۆیـان بـۆ عـیـبـادەت ئـامـادە دەکـەن، هـەروەهـا بـانـگـدان دەربـڕیـنـی دروشم و نیشـانـەی ئیسلامەتییە لە جیهانداو، دوو کەلیمەی شەهادەت دەدا بە گوێی ئینسانی موسڵماندا کە بناخەی ئیسلامەتییە.

بانگ لە غەیری نوێژی بەیانییاندا پانزە کەلیمەیە بەم جۆرەی لە خوارەوە بۆتان دەنووسم: ــ "الله اکبر الله اکبر الله اکبر الله اکبر، اشهد ان لا اله الله، اشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان محمدا رسول الله اشهد ان محمدا رسول الله، حي على الصلاة حي على الصلاة، حي على الفلاح حي على الفلاح، الله اکبر الله اکبر، لا اله الا الله" بەڵام بۆ نوێژی

بەیانی دووجار "الصلاة خیر من النوم" دەوترێ پاش "حي علی الفلاح". سوننەتە بۆ ئەو کەسەی گوێی لە بانگەوە بێ، وەڵامی بانگەکە بداتەوە، واتە: هەرچی بانگدەر دەیڵێت ئەمیش بیڵێت، بەڵام لە وەڵامی "حي علی الصلاة" و "حي علی الفلاح"دا چوار جار بڵێ: "لا حول ولا قوة الا بالله". هەروەها لە وەڵامی "الصلاة خیر من النوم" دا بڵێ: "صدقت وبررت وبالحق نطقت".

ڕیوایەت کراوە: وەڵامدانەوەی بانگدەر بەو شێوەی کە وتمان دەبێتە کەفارەتی بێ ئاگایی لە مابەینی دوو بانگدا، وە هەر ئاوەدانییەك بانگی تێدا بدرێ لەو ڕۆژەدا ئەگەر سزایەك نازل بێ خوای گەورە دەیپارێزێ. هەرکەسیش دەنگی بانگێ ببیسێ لە جین و ئینس و دار و بەرد لە ڕۆژی قیامەتدا دەبنە شاهید و شەهادەت دەدەن لەسەر ئەو بانگی ئیسلامە کە فلان کەس بانگی داو موسڵمانانی بانگ کرد بۆ نوێژ و بەجێهێنانی پێویستیی ئاین و، ئەو بانگە دەبێتە کەفارەتی گوناهی بچووکی ئەو بانگدەرەوە، هەتا لە بانگەکە ڕزگار دەبێ لە لایەنی خوای گەورەوە ڕەحمەت بەسەریا دەبدارێ. ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) تکای کردوە لە خوا کە گوناهی بانگدەرەکان ببەخشێ، گومان لەوەشدا نییە کە دوعای حەزرەت (د.خ) قبووڵە.

بانگدەران تاقمێکن لە خۆشەویستانی خوا بەومەرجەی بەنییەتی پاك و خاوێن ئەو بانگە بدەن، ئەم بانگدەرانە لە دەشتی مەحشەردا گەردنیان لە ڕەفیقانی خۆیان بەرزتر دەبێ، بەم مەعنا کە تاوانباران سەر شۆڕن و بانگدەران سەربەرزی ڕۆژی قیامەتن و، کاتێ کە زیندوو دەکرێنەوەو سەر لە گۆڕ دەردەکەن بانگ دەڵێن.

ڕیوایەت کراوە: کەسێ(٧) ساڵ لە ڕێی خوادا بانگ بدا، لەشی لە قەبردا نارزێ، واتە: پایەی شەهیدانی هەیەو، لە قەبردا ناگۆڕێ و نارزێ. لە ڕیوایەتێکی تردا وتراوە: موحاسەبەیان لەسەر نییەو، لە قیامەتدا خەمبار نابن و، لەترسی گەورەی ڕۆژی قیامەت کە مەشهوورە بە (الفزع الاکبر) ئەمین دەبن، هەر لەم ڕیوایەتەدا هەیە کە ئەو کەسەش قورئانی لەبەر بێ مادام ڕەفتاری پێ بکا ئەم پایەیە هەیە؛ چونکە هەر کردەوەیە بۆ ڕەزای خودا نەبێ نرخی نییە، تانانەت لە ڕۆژی قیامەتدا فریشتە بانگ دەکا و دەڵێت: ئەو کەسە کە عیبادەتی بۆ خوا نەکردوەو بۆ غەیری خوای کردوە وەکو بت پەرست و ئاگرپەرست یا وەکو ئەوانە کە هەر لەبەر ناوبانگ لەناو خەڵکدا عیبادەتیان کردووە با بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانە کە لەبەر ئەوان عیبادەتەکەیان کردووە هەتا جەزاکەیان

وەربگرن، ئەمانە لە لای خوای گەورە بەشیان نییە، چونکە عیبادەتەکەیان بۆ ئەوە بووە کە خەڵك بڵێن فلان کەس پیاوچاکە یا خاوەن سەخاوەت و بەدەهەنەیە، یا بەغیرەت و ئازایە. باسی ئیخلاسم لە عیبادەتدا لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیوە.

هەروەها هەر کەس بە دەنگی بانگی بانگدەرەوە بڕوا بۆ نوێژ بە جەماعەت یا بە غەیری جەماعەت، ئەوا ئەو بانگدەرە هاوبەشی ئەو کەسەیە لە پاداشی نوێژەکەیدا، هەر کەسیش دەنگی بانگ ببیسێ و قسەی دنیایی نەکا تا بانگدەر لە بانگەکەی دەبێتەوە، لە هەمان کاتدا وەڵامی بانگەکە بەتەواوی بداتەوە، ئەوە بە هەر وشەیەك لەو وەڵامە دوو سەدهەزار خێری بۆ دەنووسرێ، بەڵام ئەگەر لە کاتی بانگەکەدا قسەی دنیایی کرد، ئیتر قسەی حەرام بێ یا مەکرووهـ یا قسەیەکی بێ سوودو زیان بێت ئەوە لەو پاداشە ناهومێد دەبێ و، بە هۆی قسە حەرامەکەشەوە گوناهبار دەبێ بە گوناهێکی گەورەو، بە هۆی قسە مەکرووهەکە یا قسە بێ سوودو زیانەکەشەوە لە خێری گوێ بەبانگدان و جوابدانەوەی مەحرووم دەبێ، لەبەر ئەوە بووەتە مانیعی بیستنی دەنگی بانگەکە، بەم جۆرە دەرکەوت کە قسەکردن لە کاتی بانگدا دوو زیانی هەیە، یەکەم ناهومێدبوون لە سەوابی گوێگرتن و سەوابی وەڵامدانەوەی بانگدەر، دووەم تاوانباری بەهۆی ئەو قسانەوە کە کردوویەتی، ئەگەر قسەی حەرام بێ. بەڵێ ئەگەر ئەو قسە دەیکا لەو کاتەدا لە واجباتێ بێ کە ترسی لە فەوتانی هەبێ ئەوە قەی ناکات. ڕیوایەت کراوە: هەر شارێ کە بانگدەری زۆری هەبێ وێران نابێ لەبەر بەرەکەتی ئەو بانگە زۆرانە، مەگەر بە شێوەیەکی بەدەگمەن بێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە: هەر وشەیەك کە بانگدەر بەدەنگی بەرز ڕای دەگەیەنێ خودای گەورە بەرامبەر بەو وشەیە دەفەرموێ: "صدق عبدي" واتە: ئەو بەندەیەم ڕاست دەکا، دەگێڕنەوە: ڕۆژێ بیلالی حەبەشی (ر.خ) بانگ دەدا، کاتێ کە فەرمووی "اشهد ان محمدا رسول الله" جوولەکەیەك گوێی لێ بوو وتی: ئەی درۆزن خودا بیسووتێنێ، کاتێ کە جوولەکەکە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی ویستی چرا داگیرسێنێ ئاگری تێ چوو سووتا، واتە: دوعاکەی لە خۆی گیرابوو چونکە درۆزن بوو کە باوەڕی نەبوو بەوەی کە حەزرەتی (محمد) (د.خ) پێغەمبەری خوایە، واتە: بانگدەرەکە ڕاستگۆ بوو.

لە لێکدانەوەی مانای ئایەتی موبارەکی "وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ"دا هەندێ لە زانایانی ئاین فەرموویانە: مەبەست لە ئاساری ئەوان شوێنی پێیانە کە لە ماڵی خۆیان دەرچوون و ڕۆیشتوون بۆ دەستنوێژ گرتن و، ڕوویان کردووەتە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت لەگەڵ موسڵمانانەدا.

لە مەعنای هەندێ فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەرەوە دەردەکەوێ هەر کەس دەستنوێژێکی باش بگرێ و، بەرەو مزگەوت بڕوا، بە هەر هەنگاوێ کە دەینێ خوای گەورە گوناهێکی لەسەر لادەبات و خێرێکی بۆ دەنووسرێ و پایەیەکی بەرزیشی پێ دەدات و، کاتێ کە نوێژە فەرزەکەی لە مزگەوتدا کرد و، دانیشت و خەریکی خواپەرستی بوو فریشتەکانی خوا سەلاواتی لێ دەدەن و دەڵێن: "اللهم صل علیه" واتە: ئەی خوایا ڕەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر ئەو بەندەتداو، گوناهەکانی بپۆشە و تۆبەی لێ قبووڵ بکە. وە هەتا لە مزگەوتەکەدا دانیشێ بۆ ئەوە کە جەماعەتەکەی بکات ئەو دانیشتنەی بە نوێژکردن بۆ حسێب دەکرێ و، بە عیبادەت بۆی دەنووسرێ.

ئیمامی حەسەن، خوای لێ ڕازی بێ، کاتێ دەڕۆیشت بۆ نوێژی جەماعەت و، دەگەیشتە دەرگای مزگەوتەکە کزی و زەبوونی و داماویی خۆی دەردەبڕی. بۆ ئێمەش وا موناسبە لەو کاتەدا بڵێین: الهي! عبدك ببابك، مسكينك ببابك، سائلك ببابك، عاصيك ببابك، ذليلك ببابك، پەریشان و شەرمەزارم، هاتووم بۆ قاپیی ڕەحمەت و میهرەبانیی تۆ، داوای عەفووت لێ دەکەم!

لە حەزرەتی عەلییەوە دەگێڕنەوە (ر.خ)و وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (د.خ) فەرمووی: خوای گەورە سرووشت (وحي) بۆ حەزرەتی عیسا نارد (د.خ) کە بە بەنی ئیسرائیلەکان بڵێ: کەس نەڕواتە یانەی خوا بە دڵێکی پاکەوە نەبێ و لەگەڵ نەفسێکی ترساو و چاوێکی داکەوتوو دەستێکی پاکدا.

دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە ئاخر زەماندا قەومێك پەیدا دەبن کە وتووێژی دنیایی خۆیان دەبەن بۆ مزگەوت، خوا هیچ موحتاجی ئەوان و کردەوەی ئەوان نییە، واتە: خوای گەورە لەو کردەوە ناپەسەندەی ئەوانە ناڕازییە؛ چونکە مزگەوت شوێنی خواپەرستییە، شوێنی قورئان خوێندن و یادی خواو نوێژو فێربوونی ئادابی ئاین و خووڕەوشتی بەرزەو، ئەو قسە و باسە بێ خێرانە بۆ مزگەوت ناشین و، دەبنە هۆی تاوانباریی خاوەنەکانیان و، ئەگەر بەهۆی نوێژکردن و جەماعەتەکەوە خێر و پاداشتێکیان دەست بکەوێ، بەهۆی گوناهی قسە بەتاڵەکان لە سەوابیان زۆرتر دەبێ. براکان!

کە حەدیسێکی وەهاتان بیست نەڵێن: کەوابێ ئیتر ناڕۆین بۆ مزگەوت؛ چونکە پشت کردن لە مزگەوت وەکو پشت کردنە لە بەختیاریی دنیاو قیامەت، بەڵکو بڵێین: ئینشائەڵڵا

لەمەوپاش بە ئەدەب و ڕەوشتی جوانەوە دەڕۆین بۆ مزگەوت و قسەو گفتوگۆی ناڕەوا لە مزگەوتدا ناکەین و، کاتمان لە نوێژکردن و ناوی خواو فێربوونی ئادابی ئایندا لای ئیمامی مزگەوتەکان بەسەر دەبەین و، ئامۆژگاری منداڵەکان و گەنجەکانیشمان دەکەین کە لە مزگەوتدا بە ئەدەب بن و تەرکی مزگەوت نەکەن. ئینشائەڵڵالەمەوپاش ئەو فەرموودانەی حەزرەتتان پێ ڕادەگەیێنم کە باسی زیانی دینی و دنیایی ئەو گفتوگۆ دنیاییانە دەکا کە لە مزگەوتدا دەکرێن.

ئەگەر کەسێ خاوەن دین و بەدەسەڵات بێت پێویستە نەیەڵێ قسەی ناڕەوا لە مزگەوتدا بکرێ، یەکەم جار ئامۆژگارییان بکا، ئەگەر ئامۆژگارییەکە سوودی نەبوو زۆر بەکاربهێنێ، هەتا ئەو موسوڵمانانە لەم تاوانە دووربکەونەوە.

برادەرینە! بەداخەوە ئەم نامە کورتەی من جێگای ئەو هەموو پایەو گەورەیییەی نوێژو نوێژی جەماعەت و نوێژی جومعەو سوننەتەکانی جومعەو جەماعەتی تێدا نابێتەوە، بەڵام پێویستە بزانن ئەم عیبادەتانە بۆ ڕۆژی قیامەت زۆر بەسوودن و، ڕۆژ بە ڕۆژ بەدرێژایی مانگ و ساڵەکانی ژیان گەلێ زۆر دەبن. وا بەشێوەی تەخمین شتێکتان بۆ بەیان دەکەم: تەماشا بکەن، ئەگەر لە دنیادا کەسێ گیرۆدەی کردەوەیەکی ناشیرین و ناپەسەند ببێ و، مەئمووری میری بێن ئەو کەسە بگرن و زۆر ئازاری بدەن و، لەناو عالەمدا سووکی بکەن و، بیانەوێ جەزایەکی زۆری لێ بسێنن و، لە بەندیخانەدا ڕای بگرن. ئایا ئەو کەسە ئەگەر دەوڵەمەند بێ حەزناکا بەوە کە بەشێکی گەورە لە دارایی خۆی بدا هەتا لەو زەحمەتە ڕزگار ببێ، دیارە هەموو دەزانین کابرا حەز دەکا هەر چۆن بێ، خۆی لەو کۆسپە نالەبارە ڕزگار بکا، بەلای زۆرەوە بە ماڵی دنیا ڕزگار دەبێ، جا بزانن لە ڕۆژی قیامەتدا ئینسانی تاوانبار کاتێ کە فریشتەکانی سزا دەست بە سزادانی دەکەن بە ئاگر بەجۆرێ کە پێست و گۆشت و ڕەگ و ئێسقانی لەشی هەموویان هەریەکە بە ئازارێ گیرۆدە دەبێ، مەگەر خوا بزانێ چۆنە، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆی تاوانبار لە قیامەتدا نامرێ و ئەو ئازارانەی درێژە دەکێشێ. بێن پێم بڵێن ئەو کەسە ئەگەر دەست بدا بۆی چەندێ حەز دەکا بەوەی کە ماڵ و سامان بدا و لەو ئازارانە ڕزگار بێ و لەو گیرۆدەیییەدا نەمێنێتەوە؟ بێگومان زۆر حەز دەکا لە ڕزگاریی خۆی.

جا لەم شوێنەدا پێویستە بزانن هەر هەنگاوێك لە دنیادا مرۆ دەینێت، لە ڕێگای دەستنوێژ گرتن و چوون بۆ مزگەوتدا، بەفەرموودەی حەزرەت (د.خ) دەبێتە هۆی لاچوونی

گوناهـ و وەرگرتنی خێر و پاداشتی چاك و بەرزبوونەوەی پایەی ئەو مرۆڤە، واتە: سێ شتی لێ پەیدا دەبێ ئەمانە هەر یەکی دابنێین بە درەمێ، یانێ: هەر هەنگاوی سێ درەم دەکات، جا ئەگەر لە ماڵی نوێژکەرەوە هەتا مزگەوت دووسەد هەنگاو بێ، بەهاتوچۆی بۆ تارەت گرتن و دەستنوێژ گرتن، ئەمە دەکاتە شەش سەد درەم بۆ تاقەنوێژێ لە شەوو رۆژداو، ئەگەر پێنج فەرزی تەواو حسێب بکەین دەکاتە سێ هەزار و، ئەگەر ماوەی عومری خۆی بۆ ئەم موسوڵمانانەحسێب دەکرێ، جا هەروەکو لە دنیادا پارە دەبێتە هۆی رزگاربوون لە زەحمەت و ناخۆشی ئەم خێراتەش هەموو دەبنە کەفارەت و فیدیە بۆ رزگاربوون لە ئازارو سزای رۆژی قیامەت. ئەم ژمارە زۆرە سەرمایە و قازانجەو دەمێنێتەوەو، دەبێتە هۆی رزگاریی ئینسان لە کاتێکدا کە زۆر پێویستی بە رزگاری و سەرفرازی هەیە لەناو خەڵکدا، واتە لە رۆژی قیامەتداو لە بەردەمی خوا و پێغەمبەردا. ئەم تەخمین و لێکدانەوە و ژمارەکارییەی من دەربارەی خێر و پاداشت گەلێك کەمترە لەو ئەندازەی کە خوای گەورە بریاری دەدا بۆ کردەوەی موسڵمان، بەڵام دەترسم ئەگەر زیاتر باس بکەم باوەڕ نەکەن و بەهیلاکدا بچن؛ لەبەر ئەوە بەم ئەندازەیە وازدەهێنم.

دەگێڕنەوە جارێك حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئیمشەو مەلائیکەیەك هات بۆ لام و فەرمووی: یامحەمەد! ئایا دەزانی کە مەلائیکەکانی بارەگای هەرەبەرز، واتە ئاسمان، لە چ شتێك قسەو باسیان دەکرد؟ وتم: بەڵێ دەزانم؛ باسی پایە و پاداشتی موسڵمانان و باسی ئەو خێراتەیان دەکرد کە دەبنە کەفارەتی گوناهەکان و، باسی هەنگاونان بۆ مزگەوت و بۆ نوێژی جەماعەت و، باسی دەستنوێژ گرتنی تەواویان دەکرد کە لە کاتی نالەباری سەرماو سۆڵە و ناساغی و تەنگاویدا دەگیرێن، باسی چاوەڕێ کردنی نوێژ لەپاش نوێژیان دەکرد، بۆ نموونە: موسڵمانەکە کە دەڕوات بۆ مزگەوت و نوێژی مەغریبی کرد هەر لە مزگەوتا دەمێنێتەوە و، نوێژەکەی عیشاش بەجەماعەت دەکات، ئەو کەسانەی لە هەمیشە حاڵیان وەهایە بەخێر دەژین و بەخێر دەمرن و، چاوپۆشی لە گوناه و تاوانیان دەکرێت.

ریوایەت کراوە: ئەگەر یەکێ لە ئەهلی جەماعەت ناساغ بکەوێ، یا بەسەفەر بڕوات بۆ شوێنێ و، لە پاش چاك بوونەوەی یا لە سەفەر گەڕانەوەی رووی کردە مزگەوت، خوای گەورە بەرامبەر بەو کەسە نەوازش و میهرەبانی دەکا و، (بلا تشبیە) وەك باوکێ ماوەیەك کوڕی ون بووبێ و لە پاشان بیدۆزێتەوە، هەروەها خێر و پاداشی ئەو ماوەی کە دیارنەبووە بۆی حسێب دەکا.

ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرمووی بە هاوڕییەکانی: حەز دەکەن شارەزای شتێکتان بکەم کە خودای گەورە بەهۆی ئەوەوە گوناهەکانتان لا ببا؟. هاوڕییەکانی عەرزیان کرد: بەڵێ. ئەویش فەرمووی: ئەوشتە ئەوەیە کە دەستنوێژی باش و ئیعتیادی بگرن لە کاتی ناڵەبارو نارەحەتداو، هەنگاوی زۆر بنێن بۆ مزگەوت و، لە پاش نوێژ چاوەڕێی نوێژ بکەن، واتە: ئەگەر موسڵمان موفق بوو ڕۆیشتە مزگەوت و نوێژی عەسریش بەجەماعەت بکا، ئەمە دەبێتە هۆی لاچوونی گوناهی ئەو ئینسانە، هەروەها موژدە بەو کەسانە بدەن کە لەکاتی تاریکیی شەودا بڕۆن بۆ مزگەوت، ئەو تاریکییە دەبێتە چراو ڕووناکی بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا، واتە: لە سارای مەحشەرداو لەسەر پردی سیرات و، کاتێ کە خەڵکی هەموو لە ترس و بیمدان، ئەوان لە خۆشی و شادمانی و ڕەحمەتی خوادان. هەر کاتێکیش کەسێکتان دی هاتوچۆی مزگەوتی کردبوو بە عادەتی خۆی بۆ عیبادەت شایەتی بۆ بدەن کە خاوەن ئیمانە. لە فەرموودەکانی حەزرەتەوە (د.خ) دەردەکەوێ کە ڕۆیشتنی ئینسانی موسڵمان بۆ مزگەوت بە کەیف و شادی نیشانەی تەواویی ئیمانە، هەروەها نەڕۆیشتن بۆ مزگەوت، یا سستی و بێ نیشاتی لە چوونی مزگەوتدا نیشانەی سستی و لاوازی ئیمانە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەس سێ جار دەنگی بانگ ببیسێ و، بە بێ بەهانەی ڕەوا نەڕوا بۆ مزگەوت بۆ جەماعەت ئەوە لە دەفتەری ئەحواڵدا بە منافق دەنووسرێ.

ڕیوایەت کراوە لە هەموو کاتی نوێژدا مەلائیکە بانگ دەکا و دەڵێ: ئەی ئادەمیزاد هەستن بڕۆن بۆ کوژاندنەوەی ئاگری دۆزەخ ئەو ئاگرەی کە بەهۆی تاوانەوە هەڵتان گیرساندوە بۆ گیانی خۆتان. واتە: هەستان بۆ دەستنوێژ گرتن و چوونە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، وەکو چۆن ئاو دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی ئاگر، ئاگری دۆزەختان بۆ دەکوژێنێتەوە. ڕیوایەت کراوە: وەختێ کە خوای گەورە بیەوێ بەڵایەك بۆ شوێنێ بنێرێ بە میهرەبانی تەماشای مزگەوت و ئەهلی مزگەوتی ئەو شوێنە دەکا و، بە یومن و پیرۆزیی ئەوانەوە ئەو بەڵاو موسیبەتە لەو خەڵکە دوور دەخاتەوە؛ چونکە لە حەدیسی شەریفدا هەیە کەسێ بڕوا بۆ مزگەوت میوانی خوایە و، خوا اکرم الاکرمین وارحم الراحمینەو، ڕێز لە میوانی خۆی دەگرێ و، بەهۆی ڕێزی ئەوانەوە بەڵا لەو شوێنە لا دەدا کە نزیکی مزگەوتە.

لە (مجاهد)ەوە"د٠خ" دەگێڕنەوە کە وتوویە: ئاگام لێ بوو یەکێك لە (عەبدوڵڵا)ی کوڕی

(عەباس)ی دەپرسی: ئەگەر یەکێ هەمووی ساڵ بەڕۆژوو بێت و شەو نوێژ بکات، بەڵام جومعە و جەماعەت نەکا، حوکمی چییە؟ لە وەڵامدا (عەبوڵڵا) دەیفەرموو: "هو فی النار" واتە: ئەو زەلامە لە ئاگری دۆزەخدایە. ئەم پرسیارو وەڵامەش هەتا مانگێك دەوامی کرد، واتە بەدرێژایی مانگێك ئەو پیاوە ئەم پرسیارەی لە حەزرەتی "عبد الله" دەکرد و ئەویش هەر هەمان وەڵامی دەدایەوە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ بە بێ بەهانەی ڕەوا تەرکی جەماعەت بکا بە عادەت ئەوە منافقە.

ئەی براینە! ئەو موسوڵمانەی کە باسی گەورەیی جەماعەت ببیسێ و، بە بێ کۆسپێکی ڕەوا تەرکی بکا ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ڕێز و حورمەتی ئاینی لە دڵدا نەماوە، بەڕاستی سەربەرزی و بەختیاری و ڕزگاریی دنیاو قیامەت هەر بەوە دەبێ کە ئینسان مافەکانی خوای گەورە بەجێ بێنێ، دیارە، نوێژ بەجەماعەت کردنیش یەکێکە لە مافە گرینگەکانی خوا بەسەر بەندەکانییەوە و، بەجێهێنانی واجیبی ئاینی ئیسلامە، جا ئەگەر ڕێز و حورمەتی ئەو مافانەی لە دڵ دەرنەچێ، چۆن واز لە مزگەوت و جومعەو جەماعەت دەهێنێ؟

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ دەوام بکا لەسەر بەجێهێنانی دوازدە ڕەکات سوننەت خوای گەورە دەیخاتە بەهەشت و، لە بەهەشت کۆشکێکی پێ دەبەخشێ: ئەو دوازدە ڕەکاتانە ئەمانەن: چوار ڕەکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕەکات لە پاشی، دوو ڕەکات لە پاش نوێژی مەغریب و، دوو ڕەکات پاش نوێژی عیشاو، دوو ڕەکات پێش نوێژی بەیانی. لە حەدیسی پیرۆزدا هاتووە: دوو ڕەکاتی پێش نوێژی بەیانی لە دنیا و هەرچی لە دنیادایە باشترە.

لە هەندێ زانایانی ئاینییەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویانە: هەر کەسێ لە ڕکاتی یەکەمی سوننەتی پێش نوێژی بەیانیدا سوورەتی (الم نشرح) بخوێنێ و، لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (الم تر کیف) بخوێنێ لە نەخۆشیی "مایەسیری" پارێزراو دەبێ و، بەسەر دوژمنانیدا سەرکەوتوو دەبێ، جا بۆ ئەم مەبەستە نابێ ئەم خوێندنەی بە نییەتی چاری ئەو ناساغییە بێت کە وتمان، بەڵکو دەبێ بەنییەتی قورئان خوێندنی پاش سوورەتی فاتیحە بێت.

لە (ابو الدرداء)ەوە دەگێڕنەوە: فەرموویەتی: خۆشەویستم- واتە پێغەمبەر (د.خ)- وەسیەتی بۆ کردم بەسێ شت یەکەم: ڕۆژووی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکا، دووەم: بەجێهێنانی نوێژی "وەتر". سێیەم: دوو ڕکاتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانیان و، حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: کاتی نیوەڕۆ پاش لادانی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان دەرگای ئاسمان دەکرێتەوە و، کردەوەی خەڵك بەرز دەکرێتەوە، زۆر حەز دەکەم لەو کاتەدا خێرو عیبادەتی من سەر کەوێ بۆ ئاسمان. ئەو وەختە ئەوەندە پیرۆزە هەموو دروست کراوی تریش، واتە غەیری جن و انس، هەموو خەریکی تەسبیحاتن، پێغەمبەر (د.خ) کە زۆر بایەخی بە چوار ڕکاتی پێش نیوەڕۆ داوە، لەبەر ئەوە بووە کە ڕێکەوتی ئەو وەختە پیرۆزە بکا و، هەروەها بەهۆی ئەوەی کە دانیشتوانی مزگەوت خەریکی کردنی ئەو چوار ڕکاتەی پێش نیوەڕۆ دەبن، ئەو موسڵمانانەش کە خەریکی دەستنوێژن خۆیان باش ئامادە بکەن و، بە جەماعەتی نیوەڕۆدا بگەن، ئەگەرنا لە پاش نوێژەکەی نیوەڕۆش دیسان چوار ڕکات نوێژ سوننەتە، بەڵێ دوو ڕکاتیان سوننەتی موئەککەدەن و، دوانیان موئەککەدە نین، هەروەها ڕیوایەت کراوە: کە چوار ڕکاتی پێش نیوەڕۆ بەقەدەر ئەوەندەی کە بەندەیەك لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل (د.خ) ئازاد بکەی پاداشت و سەوابی هەیە. هەروەها ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) دوعای بۆ ئەو کەسە کردووە کە سوننەتی پێش نوێژی عەسر دەکات و، لە دوعاکەیدا فەرموویەتی: خوایا! ڕەحم بەو کەسە بکە کە لە پێش نوێژی عەسردا چوار ڕکات سوننەت دەکا و دەوام دەکا لە سەری، هەتا بە گوناه بەخشراوی لە دنیا دەردەچێ.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: سوننەتە سوننەتی ڕاتبەی پاش نوێژی مەغریب زوو بەجێ بێنن، چونکە پاش خستنی دەبێتە هۆی ماندوویوونی ئەو مەلائیکانە کە کرداری چاکی موسڵمانان هەڵدەگرن و دەیپارێزن، واتە: فریشتەی کردەوەنووسی ڕۆژ دەیەوێ نوێژی مەغریب و سوننەتەکەیشی بنووسێ و، لەگەڵ کردەوەی ڕۆژدا بیانباتە بارەگای خوا، جارووتر بیانکەن با فریشتەی ئەعمال دوانەکەون. وە ئەگەر نوێژکەر لە پاش نوێژی مەغریب قسە نەکا تا دوو ڕکاتە سوونەتەکەش دەکا ئەوە فریشتە سەوابەکەی دەبا بۆ (اعلی علیین) کە شوێنی دەفتەری کاری پیاوچاکانە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەس شەش ڕکات نوێژی (سنة الاوابین) لە پاش نوێژی مەغریب و سوننەتەکەی بکا و، لە ناوەندی ئەوانەدا قسەی خیلافی شەرعی بەدەما نەیەت، ئەوە

ئەو شەش ڕکاتە نوێژی وەك عیبادەتی دوانزە ساڵە و، ئەو شەش ڕکاتەی دەبنە کەفارەت و مایەی داپۆشینی گوناهە بچووکەکانی.

براکانم! دەگێڕنەوە لە حەزرەت کە فەرموویەتی: وتووێژی دنیایی لە مزگەوتدا دەبێتە هۆی لاچوون و بڕانەوەی خێرو چاکەکانی قسەکەرەکان.

لە شەرحی کتێبی (عباب)دا نووسراوە: کە قسەی دنیایی لە مزگەوتدا دروستە، بەو مەرجەی قسەکان حەڵاڵ بن، واتە: قسەیەك نەبن کە لەشەرعدا ناڕەواو ناپەسەند بن، وەکو لە پاش ملە باسی خەڵك کردن بە خراپی، یا وەکو جنێودان بەم و بەو، با ئەو قسە حەڵاڵانە لەگەڵ پێکەنینیشدا بێ؛ لەبەر ئەو حەدیسەی کە ئیمامی مسلم دەیگێڕێتەوە: کە حەزرەت (د.خ) پاش نوێژی بەیانییان لە شوێنی خۆی هەڵنەدەستا تا خۆر کەوتن، هاوڕێیەکانیشی لە مزگەوتدا دەمانەوەو، قسە و باسی زەمانی پێش ئیسلامیان دەگێڕایەوە و، حەزرەتیش (د.خ) جارو بار لەو قسانە زەردەخەنە دەیگرت. بەڵام ئەهلی تەحقیق لە زانایان فەرموویانە: قیاسی خەڵکی ئەم ڕۆژە لە کۆمەڵی هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ) ناکرێ، ئەوان هەر قسەیەکیان کردووە کە باش بوویێ. بۆ ئێمە حورمەت گرتن و ڕێز گرتن لە مزگەوت واجیبە و، قسەکردن تیدا حەڵاڵ نییەو مەکرووهە، مەگەر قازانجێکی ئاینیی تێدابێ وەك ئامۆژگاری کردنی نەزانێ یا پرسیارێ کە سوودی تێدابێ. بە هەر حاڵ بێ دەنگی لەو قسانە زۆر باشترە، زۆر حەیفە کە ئینسان بۆ تەنیا ئارەزوویەکی نەفس ئەو خێرە زۆرەی مزگەوت لە کیسی خۆی بدا، یا بەهۆی وتاری ناڕەواوە خۆی تاوانبار بکات. ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ نوێژی سوننەتی چێشتەنگا (سنة الضحي) نەفەوتێنێ و لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ و، نە لە سەفەرداو نە لە نیشتەجێییدا نەیانفەوتێنێ، ئەوە ئەجری شەهیدی بۆ دەنووسرێ.

ڕیوایەت کراوە: شەو کە ئینسان دەنوێ شەیتان سێ گرێ دەدا لەسەری و، لەسەر هەر گرێیەك لەوانە بەدەم دەڵێ:"شەو درێژە بۆ خۆت بنوو" جا کاتێ کە ئینسان خەبەری دەبێتەوە لە کاتی بەرەبەیاندا ئەگەر ناوی خوای برد ئەوە گرێیەك لەو سێ گرێیانە دەکرێتەرە، کە ڕۆیشت بۆ دەستنوێژ گرتن و دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریان دەکرێتەوە و، کە دەستی کرد بە نوێژی سوننەتەکەی شەو ئەو گرێکەشی دەکرێتەوە[1]جا پاش ئەم

(١) لەمەوپێش باسم کرد کە حەزرەت (د.خ) لەم عیبارەتانەدا یا باسی شتێکی کردوە کە تەنیا بۆ خۆی دەرکەوتووە، یا مەبەستی تەشبیهی مەعقوولە بە مەحسووس و، بۆ تێگەیاندنی ئێمەی فەرمووە. دەبێ موسوڵمانی ژیر باش لەم خاڵە ئاگادار بێ.

ئەحواڵە و ئەم شەو نوێژە کە ڕۆژی لێ بوویەوە بە نەفەسێکی پاك و دڵێکی گوشادەوە دەڕوا بۆ بەجێهێنانی نوێژ و عیبادەت. ئەگەر بە پێچەوانەی ئەم حاڵە بێ، ئەوا سبەینێ کە ڕۆژی لێ بوویەوە بەپێچەوانەی ئەو ئەحواڵە باشانە دەبێ.

ڕیوایەت کراوە: ئەگەر کەسێ بەدەستنوێژەوە نووست فریشتەیەك دەکرێتە نیگادارو پاسەوانی. جا کاتێ کە لە خەو هەستا ئەو فریشتە دوعای بۆ دەکا و، دەڵێ: خوایا! ئەم بەندەی خۆتە عەفو بفەرموو؛ چونکە بە پاکی نووست، وە ئەگەر ئەو ئینسانە داوای خێرێکی دینی یا دنیایی بکا لە خوا دوعاو داواکەی لێ وەردەگیرێ.

ڕیوایەت کراوە: لە ئیمامی عەلییەوە، خوای لێ ڕازی بێ، فەرمووی: ڕۆژێ حەزرەتی (فاتمە) خودای لێ ڕازی، بەهۆی ئیشکردنی ناو ماڵەوە دەستی بلۆقی کردبوو، منیش ڕۆژێ کە فاتمە حازر بوو لە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەردا (د.خ) داوای کارەکەرێکم لە حەزرەت کرد هەتا لە ماڵەوە خزمەت بکات، حەزرەت ڕووی کردە فاتمە و پێی فەرموو: لە خوای خۆت بترسەو، پێنج فەرزە نوێژەکانت بەجێ بهێنە و، ئیشی ماڵی خۆت بکەو، هەر کاتێ ڕۆیشتی بۆ سەر جێگای نووستنی خۆت لە شەودا ٣٣ جار بڵێ "سبحان الله" و ٣٣ جار بڵێ: "الحمد الله" و ٣٤ جار بڵێ: "الله اکبر" و دەوام بکە لەسەر ئەم سەد کەلیمە، ئەمە بۆ تۆ لە کارەکە باشترە، حەزرەتی فاتمە عەرزی کرد: بەم دەستوورە کە فەرمووت لە خواو پێغەمبەری خوا ڕازیم و بەجێی دێنم و کارەکەرم ناوێ. ئەی برایان! هەر کەس لە ئێوە زەحمەتی ئیشکردنی لەسەر شان بێ، شەوانە کاتی نووستن ئەم سەد کەلیمە بکا بە ویردی خۆی بە بەرەکەتی ئەوانەوە خودا دەفعی ماندووبوونی دەکا. ڕیوایەت کراوە: کە گەورەترین ڕۆژوو لە پاش ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز مانگی شەوال و (ذي القعدة) و (ذي الحجة) و ڕەجەبە، غەیری ڕۆژی جەژنی قوربان و سێ ڕۆژی پاش جەژن. گەورەترین نوێژیش لە پاش ئەم پێنج فەرزە، نوێژی شەوە. ڕیوایەت کراوە: کە لە بەهەشتدا دارێ هەیە کە هەموو جۆرە خەڵاتێکی جوان و بە شکۆی بەسەرەوەیەو، لە ژێر ئەو دارەدا چەند ئەسپێ هەیە کە زین و بەرگ کراون و، بە زێڕ و زیو و شتی بەنرخ ڕازێنراونەتەوە، ئەو ئەسپانەش وەکو ئەهلی بەهەشت پیساییان نییەو، وەکو باڵدار دەفڕن، جەماعەتی ئەو تەبەقە کە وتمان لە بەهەشتدا سواری ئەو ئەسپانە دەبن و، دەڕۆن بۆ ئەو شوێنانەی کە حەزیان لێیەتی. ئەوانەش کە پایەیان ناگاتە پایەی ئەوان دەڵێن: خوایا! ئەم تاقمە بەختیارانە بە چ کردەوەیەکی بەم پایە گەیشتوون؟ لەلایەن خوای

گەورەوە وەڵامیان دەدرێتەوە: کە ئەمانە شەونوێژیان بوو، کە ئێوە نەتانبوو، لەو کاتانەدا کە ئەوان شەو نوێژیان دەکرد ئێوە لە گەرمەی خەودا بوون، ئەوان ڕۆژوویان گرتووە، ئێوە نەتانگرتووە، ئەوان بەخشش و دەهەندەییان بۆ گەداو بێ نەوایان هەبووە، ئێوە نەتانبووە، ئەوان جیهادیان کردووە؛ واتە: بۆ بەرزکردنەوەی ئاینی ئیسلام هەوڵیان داوە و تێ کۆشاون، ئێوە تێ نەکۆشاون.

ڕیوایەت کراوە: کاتێ کە هەموو ئادەمزاد حەشر دەکرێن و، لە یەك دەشتدا کۆدەبنەوە، فریشتەیەك جارِ دەدا بەناو خەڵکا: ئەوانەی کە شەونوێژیان دەکرد و، سبەینێیان زوو ڕاست دەبوونەوە بۆ نوێژی سبەینێ لە کوێن؟ جا ئەو کەسانە ڕاست دەبنەوە و دەبرێن بۆ هەشت بە بێ لێپرسینەوە ئەنجا فەرمان دەدرێ کە باقیی خەڵك برۆن بۆ لێپرستنەوە لە کردەوەکانیان و، هەموو دەڕۆن بۆ مەیدانی لێپرسینەوە.

ڕیوایەت کراوە: لە هەر شەوێکدا سەعاتێك هەیە، هەر کەسێ لەو سەعاتەدا بۆی ڕێ بکەوێ لەخوا بپاڕێتەوە داوای شتێ لە خوا بکا، خوای گەورە پێی دەدا و، ئەگەر ئەو شتەی بۆ موقەدەر نەبووبێ جەزای دەداتەوە.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: شەو نوێژ؛ پێویستە بۆ ئێوە؛ چونکە شەونوێژ ڕەوشتی پیاوچاکانە و هۆی نزیك بوونەوەیە لە خوای مەزن و، گوناه دادەپۆشێ و، دەبێتە هۆی دوور کەوتنەوە لە گوناهکردن و، دەردو نەخۆشی لە ئینسان دوور دەخاتەوە.

ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: تاقە نوێژێ لە مزگەوتی مندا خێر و پاداشی بەقەدەر پەنجا هەزار نوێژەو، تاقە نوێژێ لە (مسجد الحرام)دا خێر و پاداشی بەقەدەر سەد هەزار نوێژە و، تاقە نوێژێ لە (رباط)دا، واتە: لەسەر سنووری وڵاتی موسڵمانانندا، کاتێ کە سوپا خۆی ئامادە کردبێ بۆ جیهاد، خێر و پاداشی بەقەدەر دووسەد هەزار نوێژە. زیاتر لەمانەش بەجێهێنانی دوو ڕکات نوێژە لەگەڵ لە خوا ترسی و ئاگاداریی دڵدا لە نیوەشەودا بەجێی بێنی، کە مەبەست لەو دوو ڕەکاتە تەنیا ڕەزامەندیی خوای گەورە بێ. ڕیوایەت کراوە: لە حەزرەتی حەسەنی کوڕی عەلییەوە، خوایان لێ ڕازی بێ، کە لە مەعنالێدانەوەی "الذین هم في صلاتهم خاشعون"دا فەرموویەتی: واتە: ئەو کەسانە کەترسی خوا وا لە دڵیانداو، بەهۆی ئەو ترسەوە چاویان لە هەموو تەماشایەکی ناڕەوا نووقاندوە و خۆیان لە فیسق و فجوور پاراستووە، نەك

وەکو ئێمە کە نوێژێکی بێ گیان و بێ هەیبەت و بێ ترس لەخوا دەکەین. لەبەر ڕووناکیی فەرموودەی ئەم زاتە گەورەدا، دەردەکەوێ کە ئینسان، هەتا نوێژەکانی بە خوشووع و لە خوا ترسییەوە نەکا، بە پیاوچاك و بە کردەوە باش ناناسرێ.

ریوایەت کراوە کە خوای گەورە وەحیی کردووە بۆ حەزرەتی داوود (د.خ)و فەرموویەتی: درۆزنە ئەو کەسەی لافی خۆشەویستیی من لێ دەداو، شەو تا سبەی دەنوێ و لە من بێ ئاگا دەبێ و، هەڵناستێ نوێژ بکاو ناوی من بهێنێ.

ریوایەت کراوە: خوای گەورە بە ڕووی دوو کەسەوە پێ دەکەنێ (واتە: لێیان ڕازی دەبێ) یەکێ لەو دووانە موسوڵمانێکە لە شەوێکی ساردا هەڵسێ و، دەستنوێژ بگرێ و دەست لە نووستن و ئاسایشی خۆی هەڵبگرێ لەبەر ڕەزای خواو، چەند ڕکاتێ شەونوێژ بکا. خوای گەورە بە مەلائیکەکان دەفەرموێ: ئەی فریشتەکان! پاداشی ڕەفتاری ئەم بەندەیە چییە؟ ئەوانیش دەڵێن: خوایا! خۆت دەیزانی، خودا دەفەرمووێ: ئەوەی داوای کردووە پێی دەدەم و، لە هەر شتێکیش بترسێ دەیپارێزم.

ریوایەت کراوە: پێغەمبەر فەرموویەتی لە لەشی ئینساندا سێسەدوشەست جومگە هەیەو، هەموو ڕۆژێ پێویستە لە باتی نیعمەتی هەر جومگەیەك لەوانە خێرێ بکا، هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: جا کێ دەتوانێ ئەو هەموو سەدەقەیە جێبەجێ بکا؟ ئەویش فەرمووی ئەوە ئاسانە: دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگا بکا لە باتی ئەو هەموو سەدەقەیە جێ دەگرێ.

ریوایەت کراوە: هەر کەس دەوام بکا لەسەر دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگا خوا گوناهەکانی دەبەخشێ، هەرچەند بەقەدەر کەفی دەریا زۆر بن. ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ نوێژی بەیانیان بکا و، لە جێگەی نوێژەکەیدا دابنیشێ و ناوی خودا بهێنێ تا ئەوەندەی ڕۆژ بەقەدەر ڕمێ بەرز دەبێتەوە و، قسەی دنیایی تیانەکا، ئەنجا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی ئیشراق بەجێ بێنێ، ئەوە پاداشتی حەجێك و عەمرەییەکی بۆ دەنووسرێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە: دانیشتن و مانەوە لە جێگەی نوێژی بەیانیدا لەگەڵ ناوی خوا هێنان و قورئان خوێندن دەبێتە هۆی گوشادیی ڕۆزیی بۆ ئەو کەسە زیاتر لەوە کە هەستێ بڕوا بەدنیادا بۆ پەیداکردنی ڕۆزی، واتە: هەر کەس ئەوەندە لە خودا بترسێ کە لەبەر ڕەزامەندیی خوا لەسەر ئەم حاڵەتە کە وتمان بەردەوام بێ، ئەوە ڕزق و ڕۆزیە زۆر گوشاد دەبێتەوە.

ریوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) بە حەزرەتی عەباسی مامی وت، ئەی مامە! ئایا کارێکت نیشان بدەم ئەگەر بیکەیت خودای گەورە تاوانی لەمەو پێش و لەمەو پاشیشت ببەخشێ؟ ئەو کردەوەیە ئەوەیە کە چوار ڕکات (صلاة التسبیح) بکەی، جا ئەگەر دەتوانی ڕۆژی جارێ یا لە هەموو جومعەیەکدا جارێ، یا مانگی جارێ، یا ساڵی جارێ، یا لە ماوەی عومری خۆتا جارێ ئەو نوێژە بکە. ئەی براینە! بەهۆی زۆری پاداشی ئەو نوێژەوەیە کە حەزرەت (د.خ) هەر دەستبەرداری نەبوەو، فەرموویەتی: تەنانەت لە عومرا جارێ بیکەی باشە، کەوابێ پێویستە ئەو خێرە لە دەستی خۆتان دەرنەکەن. شێخ ئەحمەدی ئیبنو حەجەر فەرموویەتی: کەسێ ئەم فەرموودەیەی بیست و، ئەم نوێژەی نەکرد ئەوە واتە گوێ ناداتە دین.

ریوایەت کراوە: کوێرێ هاتە خزمەتی حەزرەت (د.خ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! دەمەوێ دوعام بۆ بکەی خوای گەورە چاوەکانم ڕووناك بکاتەوە. حەزرەت (د.خ) فەرمووی: دوو ڕکات نوێژی (صلاة الحاجة) بکە بە نییەتی داوای جێبەجێ کردنی پێویستی خۆت لە خوا، پاش ئەوەی کە سەلامت دایەوە بڵێ: "اللهم اني أسألك واتوجه اليك بنبيك محمد نبي الرحمة عليه الصلاة والسلام. يا نبي الرحمة، صلى الله عليك وسلم، اني اتوجه بك الى ربي في حاجتي هذه، وهي ان يرد الله لي بصري، لتقضي لي. اللهم فشفعه في "ثلاثا" واتە: خوایا! تکای پێغەمبەری خۆت دەرحەق بە من قبوول بفەرموو. دەگێڕنەوە: ئەو کوێرە ڕۆیشت دوو ڕکاتە نوێژەکەی کردو دوعاکەی خوێند، هەر لەو کاتەدا چاوەکانی ڕۆشن بوونەوەو، وەك کاتی ساغی دەیانبینی. درێژەی باسی ئەم نوێژەو چۆنیەتییم لە نامەیەکی سەربەخۆدا نووسیوە.

هەروەها (صلاة الاستخارة) واتە: نوێژی داوای خێر کردن لە خوا سوننەتە. ئەم نوێژە دوو ڕکاتە لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی (کافرون) و لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (اخلاص) لە پاش سوورەتی فاتیحە دەخوێنرێ. فەرموودەی حەزرەتە (د.خ): هەر کەسێ کارێکی گەورە بێتە بەردەمی و، لە ئەنجامەکەی سەر دەرنەکا، ئەوە کردنی (صلاة الاستخارة) نیشانەی بەختیاریی ئەو کەسەیە و، ئەگەر تەرکی ئەو نوێژە بکات نیشانەی بەدبەختییەتی. هەروەها (صلاة التوبة)ش سوننەتە. قال الله تعالى: "نَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ" واتە: بەڕاستی ئەو کەسانە کە گوناهێکیان لە دەست دەبێتەوە و، بە دڵ پەشیمان دەبنەوەو، بڕیار دەدەن جارێکی تر ئەو گوناهە نەکەن و، ئەگەر مافی

یەكێكیان بەسەرەوە بوو، تێ كۆشان بۆ دانەوەی یا ئازادبوون لێی و، لە سەحراییەكی دوور لە خەڵك یا لە شوێنێكی چۆڵ و هۆڵدا دوو ڕكات نوێژ بكەن بەنییەتی نوێژی تەوبە، هەركەس بێ و، خوا نەخواستە، ڕۆژی حەفتا هەڵە بكا ئەگەر بەم دەستوورە تەوبە بكات ئەوە بەر ئایەتی (ان الله یحب التوابین) دەكەوێ و، لە دۆستانی خوای گەورە حسێب دەكرێت.

## نوێژی دۆزینەوەی شتی ونبوو

كەسێ كە شتێكی خۆشەویستی لێ ون بوویێ چەن جار نوێژی دۆزینەوەی ون بوو بكا ئینشائەڵڵا تەعالا دەیدۆزێتەوە. ئەو نوێژەش دوو ڕكاتە و، لە پاش سەلامدانەوە لە نوێژەكەی ئەم دوعایە بخوێنێ: "اللهم هادي الضال وراد الضالة اردد علي ضالتي بعزتك وسلطانك، فانها من عطائك وفضلك."

شێخ جلالە دینی سیوتی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ڕیوایەتی كردوە كە لە مابەینی نوێژی مەغریب و نوێژی عیشادا دوو ڕكات نوێژ هەیە بەنیەتی سووك بوون و ئاسان بوونی گرانیی گیان كێشان و، سووك بوونی سزاو ئازاری گۆڕو، ئاسانی پەڕینەوە بەسەر (سرات)دا، لە هەر كاتێكدا لە پاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە یازدە جار سوورەتی (زەلزەلە) بخوێنێ و تەركی نەكا.

## نوێژی پاراستنی ئیمان

شێخ (عبدالوهاب)ی شەعرانی فەرموویەتی: لە نوێژی (سنة الاوابین)دا لە هەموو دوو ڕكاتێكدا، یا هەر تەنیا لە دوو ڕكاتی یەكەم و دووەمدا لە پاش خوێندنی سوورەتی (اخلاص)و، یەك جار سوورەتی (فلق)و، یەك جار سوورەتی (ناس) بخوێنێ و، لە پاش سەلامدانەوەش ئەم دوعایە بخوێنێ "اللهم سددني بالایمان واحفظه علي في حیاتي وعند وفاتي" ئەم دەستوورە بۆ پاراستنی ئیمانی بەسوودە. هەروەها نوێژی (سنة الوضوء) لە پاش هەموو دەستنوێژی زۆر بەسوودە. نوێژی لەبەركردنی قورئانی پیرۆز لە ئیمامی عەلییەوە – كرم الله وجهه –ڕیوایەت كراوە كە فەرموویەتی: جارێ لای حەزرەت (د.خ) سكاڵای كەم بیریی خۆمم كردو عەرزم كرد: شتم زوو لە بیر دەچێتەوە، ئەویش نوێژی شت لە بیرمانی پیشان دام و، فەرمووی: لە حەوت شەوی جومعەدا ئەم نوێژە بكە. شێوەی نوێژەكە بەم جۆرەیە: چوار ڕكات بەنییەتی زیادبوونی هێزی لەبەر

کردنی قورئان داوەبەستریَ، لە ڕکاتی یەکەمدا لە پاش سوورەتی فاتیحە سوورەتی (یاسین)و، لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی حامیمی دوخان و، لە ڕکاتی سێیەمدا (الم سوجدە)و، لە ڕکاتی چوارەمدا "تبارك الذی بیده الملك" هەتاد... بخوێنیَ و، لە پاش سەلامدانەوە حەمدو سەناو سەلات و سەلام بکا، وەك هي (صلاة الحاجة)و، لە پاشاندا ئەم دوعا بخوێنیَ: "اللهم ارحمني بترك المعاصي ابدا ما ابقيتني وارحمني ان اتكلف ما لا يعنيني وارزقني حسن النظر في ما يرضيك عني، اللهم بديع السموات والارض ذا الجلال والاكرام والعزة التی لا ترام! أسألك یا الله! بجلالك وبنور وجهك ان تنور بكتابك بصري وان تطلق به لساني وان تفرج عن قلبي وان تشرح به صدري، وان تستعمل به بدني، فانه لا يعينني على الحق غيرك ولايؤتيه الا انت، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم. ئەم نوێژە بۆ قوتابیان زۆر بەسوودە.

من ئەو نوێژانەی کە لە کتێبەکاندا کەم باس کرابن درێژییەکایانم نووسیوە، بەڵام ئەوانەی کە زۆر هەن لە نێو کتێبەکاندا و دیارین بە درێژیی نەمنووسیون، بەڵام (صلاة التسبيح) لەبەر ئەوەی پاداشتی زۆرە بە درێژای بۆتان باس دەکەم، ئەو نوێژە بەم (صلاة التسبيح) چوار ڕکاتە، ئەگەر لە شەودا بکریَ بە دوو سەلام دەکریَ، خۆ ئەگەر لە ڕۆژدا کرا ئەوا جوانتر وەهایە کە لە پاش (زەوال)و پێش نوێژی نیوەڕۆ بکرێت. بەڵام کردنی ئەم نوێژە لە شەودا خێری زۆرترە و چاکترە، چونکە شەو کاتی ئارامی وبێدەنگییە. شایانی باسە ئەو سوورەتانەی لەم نوێژەدا پاش سوورەتی فاتیحە دەخوێنرێن با لە (طوال المفصل) بن وەکو سوورەتی (حدید) و (حشر) و (صف) و (جمعە) چونکە ئەم سوورەتانە لە سەرەتایانەوە تەسبیح هەیە، هەروەها جار جاریَ لە (قصار المفصل) بن، وەك سوورەتی (زلزلە) و (عادیات) و (تکاثر)و (اخلاص).

عەلی شبراملەسی دەڵیَ: لە دوو ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی (تکاثر)و (عصر)و، لە دوو ڕکاتی دوایيدا (کافرون)و (اخلاص) بخوێنرێن. ئەنجا پاش سوورەتی فاتیحە و سوورەتەکانی تر پازدە جار بڵیَ: "سبحان الله، والحمدلله، ولا اله الا الله والله اكبر" غەزالی لە (احياء علوم الدين)دا دەڵیَ: پاش ئەمانە بڵێت: "ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم" هەروەها لە هەموو ڕکووع و ئیعتیدال و سوجدەی یەکەم و دووەم و دانیشتنی نێوانیان و دانیشتنی حەسانەوەدا، یا پێش تەحییات دە جار ئەو تەسبیحاتە بخوێنی، جمعا (٧٥) جارو، لە چوار ڕکاتەکەدا دەکاتە (٣٠٠) جار، جا کاتیَ لە دانیشتنی

حەسانەوە هەستایەوە بۆ ڕاوەستانی ڕکاتی دووەم یا ڕکاتی چوارەم با (الله اکبر) نەکا، چونکە ئەو تەکبیرەی لە کاتی بەرزبوونەوە لە سوجدەی دووەم بەجێی هێناوە، ئیتر جارێکی تر موناسب نییە، هەروەها ئەگەر – بۆ نموونە – تەسبیحی ڕکووعی تەرك کردو دەستی دایە خوێندنی ویردی تایبەتیی ئەم نوێژە، ئیتر با نەگەڕێتەوە بۆ تەسبیحاتی ڕکووع، بەڵکو بۆی هەیە ئەو تەسبیحە لەبیرچووەی ڕکووعە لە سوجدەدا لەگەڵ تەسبیحی سوجدە بخوێنێ، چونکە ڕکوع ڕوکنێکی کورتە و درێژە پێدانی حەرامە. لە پێش سەلامدانەوە لەم نوێژە سوننەتە بڵێ: اللهم اني اسألك توفيق اهل الهدي، واعمال اهل اليقين، ومناصحة اهل التوبة، وعزم اهل الصبر، وجد اهل الخشية، وطلب اهل الرغبة، وتعبد اهل الورع، وعرفان اهل الصبر، وجد اهل العلم حتى اخافك... اللهم اني أسألك مخافة تحجزني عن معاصيك حتى اعمل بطاعتك عملا استحق به رضاك، وحتى اناصحك في التوبة خوفامنك، وحتى اخلص لك النصيحة حبا واتوكل عليك في الامور كلها حسن الظن بك، سبحان خالق النور". لە پاش ئەم دوعایە سەلام بداتەوە.

(صلاه القبور)یش مەشهوورەو، شێخی سیوتی نەقلی کردووەو، منیش لە نامەی (حقوقی والدین)دا بەیانم کردوە. هەروەها شێخی سیوتی فەرموویەتی: روي عن رسول الله صلي علية وسلم، انة قال: مامن رجل يصلي ركعتين في اول يوم من محرم يقرأ فيهما ماشاء، فاذا فرغ رفع يدية ويقول: "اللهم انت الابدي القديم، وهذه سنة جديدة أسألك العصمة فيها من الشيطان الرجيم واوليائه واعوانه والعون على هذه ألنفس الامارة بالسوء، والاشتغال بما يقربني اليك زلفى والى ارضائك يا كريم، ياذا الجلال والاكرام، وأسألك خيرها، واعوذبك من شرها، واستكفيك مؤنتها وثقلها في عافية برحمتك ياارحم الراحمين» الا خلق اللّه ملكا يذب عنه الشيطان واعانه على نفسه ووفقه لمرضاته...، وان عاش الى آخر السنة يقول الشيطان: "ويلنا قد ايسنا منه جميع السنة".

## نوێژی جومعە

نوێژی جومعە، لەگەڵ بەجێهاتنی ئاداب و مەرجەکانی جومعەو جەماعەتدا بەشێوەی شەرعی، دەبێتە کەفارەت و گوناهە بچووکەکانی بەینی دوو جومعەکە دادەپۆشێ. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: هەر هەنگاوێ لە پێناوی ڕۆیشتن بۆ نوێژی جومعەدا بنرێ بە بیست کردەوەی باش بۆی حسێب دەکرێ. ئەگەر شۆردنی جومعەی تەواو کردو، زوو بەپیادە ڕۆیشت بۆ مزگەوت و، لە نزیکی ئیمامەوە جێگەی نوێژی گرت و، گوێی لە

وتارەکان گرت و، قسەی دنیایی نەکرد و، بە ژنەکەشی وت و ئەویش خۆی شۆرد، ئەوە بە هەر هەنگاوێك کە دەینێ عیبادەت و خوا پەرستیی ساڵێکی بۆ دەنووسرێ، ساڵێکی وەها کە شەوەکانی نوێژ بکا و، ڕۆژەکانیشی بەڕۆژوو بێ. ڕیوایەت کراوە: ڕۆژی جومعە ئەوەندە لای خوای گەورە بەڕێزە کە عیبادەت و خێرو چاکە تیایا یەك بە دەیەو گوناهیشی یەك بەدە تیا دەنووسرێ. ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ڕۆژێ حەزرەتی جیبرئیل مادەییەکی ڕووناك و درەخشانی نیشان دام، کە وەك ئاوێنە بوو، پرسیارم لێ کرد: ئەوە چییە؟ فەرمووی: وێنەی ڕۆژی جومعەیە کە خوای گەورە بەم شێوەیە پیشانی دەدا و، ئەم جومعەیە بۆ تۆو بۆ پەیڕەوانی تۆ جەژنە، ڕۆژی کۆبوونەوە و خێر دەستکەوتنەو، دەبێتە هۆی گەلێ خێرات، ڕۆژی قیامەت ئێوە پێشڕەوی هەموو ئوممەتێکن بۆ بەهەشت، هەروەها لە ڕۆژی قیامەتدا ئوممەتی تۆ لە پێش هەموو ئوممەتێکی تردا حیسابی کردەوەی دەکرێ و، لە ڕەحمەتی ئەو ڕۆژە ڕزگار دەبێ. لە جومعەدا سەعاتێك هەیە هەر موسڵمانێ لەو سەعاتەدا لە خوای گەورە بپاڕێتەوە بۆ دەستکەوتنی شتێك. کە بەشی ئەوی تێدابێ خوا دوعا و نزاکەی لێ قبووڵ دەکات و بە مرادی دەگەیەنێ و، ئەگەر لەو سەعاتەدا داوای پارێزراوی و دووربوونی لە ئاشووب و بەلا بکا، خوای گەورە لەو بەلایەو لە خراپتر لەو بەلایەش دەیپارێزێ؛ کەوابێ هەرکەس جومعە لە کیسی خۆی بداو، نوێژەکەی یا خواپەرستییەکانی تری بفەوتێنێ، ئەوە لە کاروباری خۆیدا شێتە، چونکە ئەو هەموو سوودەی لە کیس دەچێ. فریشتەکان ڕۆژی جومعە بە (یوم المزید) ناو دەبەن؛ چونکە شەوو ڕۆژی جومعە کاتی خێری زۆرەو چاکە تێدا یەك بە دە دەنووسرێ. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە ڕۆژی (سید الایام)ە، واتە: لە هەموو ڕۆژەکانی حەفتە گەورەترە.

وفي كتاب المدامعي:- "والحاصل ان افضل ايام السنة يوم عرفة، وافضل ليالي السنة ليلة القدر، وافضل ايام الاسبوع يوم الجمعة، حتى انه افضل من عيد الفطر وعيد الاضحى، وفضله احمد بن حنبل رضى الله عنه مطلقا؛ حتى على عرفة، وهو خلاف مذهبنا كما عرفت" وانتهى.

لە ڕۆژی جومعەدا پێنج شتی گەورە هەیە:

١- لە جومعەدا حەزرەتی ئادەم دروست کراوە.

٢- لە ڕۆژی جومعەدا کەوتووەتە سەر زەوی.

٣- لەرِۆژی جومعەدا کۆچی دوایی کردووە.

٤- سەعاتی قبووڵی دوعا لە رِۆژی جومعەدایە.

٥- لە رِۆژی جومعەدا قیامەت بەرپا دەبێ.

هەروەها هەموو گیانلەبەرێ لە دنیادا غەیری (انس و جن)یش هەموویان لە رِۆژی جومعە دەترسن، نەبادا قیامەت بەرپابێ و، ئەوان گیرۆدەی سزاو ئازاری ئەو رِۆژە ببن[1] بەڵام (انس وجن) ئەگەر چی بەرِاستی بزانن کەی قیامەت بەرپا دەبێ، لەبەر دڵرِەقیی خۆیان و دوورکەوتنەوەیان لە دەستووری ئاین گوێ نادەنە قیامەت.

رِیوایەت کراوە: لە هەر سەعاتێك لە (٢٤) سەعاتەی شەو و رِۆژی جومعەدا خوای گەورە ژمارەیەکی زۆر لە تاوانبارانی (انس و جن) عەفوو دەفەرموێ؛ لەبەر گەورەیی و رِێزی ئەو شەو و رِۆژی جومعەیە. هەروەها رِیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئاگادارتان دەکەم لەوە کە ئەهلی بەهەشت کەسێکە هیچ عوزرێ دووری نەخاتەوە لە بەجێهێنانی نوێژی جومعە، واتە: لە کاتی باو باران و سەرماو گەرماو خۆشی و ناخۆشیدا تەرکی جومعە نەکا و، لە کاتی خۆیدا حازری نوێژی جومعە ببێ.

دەگێرِنەوە یەکێك لە پیاوە موسوڵمانە باشەکان لەخەودا چاوی بە مردوویەك کەوت، پرسیاری لێ کرد: ئێمە کاتێ دێین بۆ سەر قەبران بۆ زیارەتی ئێوە ئاخۆ ئێوە ئاگاتان لە زیارەتەکەمان هەیە یان نا؟ ئەویش وتی: بەڵێ ئەگەر لە شەوو رِۆژی جومعەدا بێن بۆ زیارەت پێی دەزانین بەهۆی پیرۆزیی ئەو شەو و رِۆژەوە. ئیمامی شافعی، رِەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: پێمان گەیشتوە کە موسوڵمانی مردوو لە شەوو رِۆژی جومعەدا سزای گۆرِیان لێ هەڵدەگیرێ. ئیمامی بەیهەقی دەگێرِێتەوە: عاسم ناوێ بووە کە ئینسانێکی باش بووە، لە پاش مردنی یەکێ خەوی پێوە دیوەو پرسیاری لێ کردووە: ئەحواڵت چۆنە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتوویە: وام لە ناو باغێکدا لە باغەکانی بەهەشت و، لە هەموو شەوو رِۆژێکی جومعەدا لەگەڵ دۆستان و برادەراندا بەیەك دەگەین و، بەخۆشی رِادەبوێرین.

رِیوایەت کراوە: لە رِۆژی قیامەتدا خوای گەورە ئەم رِۆژانەی دنیا هەرکام بە سورەتێکی عادەتی بە خەڵك نیشان دەدا، بەڵام رِۆژی جومعە دەباتە سوورەتی مادەیەکی زۆر نوورانی کە دەدرەوشێتەوەو، دەوروبەری خۆی روونـاك دەکاتەوە و، ئەو موسڵمانانەش کە لە دنیادا نوێژی جومعەیان کردوە لێی کۆدەبنەوەو، بەشەوق و شادی

(١) ئاگاداری لەسەر ئەم ئەحواڵە سیفەتی پێغەمبەرانە (د.خ).

له دەشتی مەحشەردا لە نزیکی ئەواو بە پرتەوی ئەو دەڕۆن بە ڕێگەداو، ئەو کۆمەڵە موسڵمانە بۆنیان وەك میسك خۆش دەبێ و، ڕێگەکەیان بۆ دەبێ بە تەپۆڵکەی کافوورو، بەسەریدا ڕادەبوورن، ئەهلی عەرەصات، کە تەماشای ئەم کۆمەڵە موسڵمانە دەکەن، سەریان سوورِ دەمێنێ لە سەربەرزی و بۆن خۆشی و ناوچاوی پاکیان هەتا ئەمانە داخلی بەهەشت دەبن، وەکەس لەگەڵ ئەمانەدا نییە مەگەر ئەوانەی کە بانگدەر بووبن، واتە: ئەوانەی کە هەر لەبەر ڕەزای خواو بێ ئوجرە بانگیان دابێ چ لەو مزگەوتانەدا کە جومعەیان تێدا دەکرێ، یا ئەو مزگەوتانەی کە جومعەیان تێدا ناکرێ، ئەم ڕەفاقەتەش بە بەرەکەتی بانگدانەکەوەیە، کە دەبێتە هۆی دەربڕین و ڕاگەیاندنی ئیسلام و بانگ کردنی موسڵمانان بۆ بەجێهێنانی فەرزی نوێژ.

"علقمه"، خوای لێ ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی (مەسعوود)دا خوای لێ ڕازی بێ ڕۆیشتن بۆ نوێژی جومعە. عەبدوڵڵا سێ کەسی بینی لە مزگەوتدا کە لە پێش ئەوا هاتبوون بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جومعە، (عەبدوڵڵا) فەرمووی: من چوارەمم، چوارەمیش لە خواوە دوورنییە، چونکە من لە حەزرەتم بیستووە (د.خ) دەیفەرموو: موسوڵمانان لە ڕۆژی قیامەتدا نزیکییان لە حوزووری خوای گەورە بە ئەندازەی پێشکەوتنیانە بۆ نوێژی جومعە: یەکەم، دووەم، سێیەم، چوارەم.

ڕیوایەت کراوە: کە نوێژی جومعە حەجی فەقیرە. واتە: مرۆڤی لات و هەژار ناتوانێ بڕوات بۆ حەج، لەبەر ئەمە خوای گەورە پاداشی چوونی بۆ نوێژی جومعەی بۆ کردووە بە پاداشی حەج. ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەی موسڵمانینە ئێوە لە هەموو ڕۆژێکی جومعەدا دەڕۆن بۆ جومعە، عومرەکەشتان ئەوەیە کە لەپاش نوێژی جومعە لە مزگەوتدا دەمێننەوەو، چاوەڕوانی نوێژی عەسر دەکەن.

ئەی براینە! دەبێ بزانن ئەو کەسەی بڕوات بۆ نوێژی جومعەو، لە کاتی خوتبەی ئیمامدا شتی پڕوپووچ و قسەی دنیایی بکا ئەم سەوابەی نییە، تەنانەت ئەگەر کەسێ قسە بکات ئەم پێی بڵێ: "بێدەنگ بە!" ئەمەش بە لەغوکردن دەژمێردرێ، بەڵکو پێویستە بە ئیشارەت کابرای قسەکەر بێدەنگ بکا.

کەسانێ کە قورئان خوێن نین پاش سەلامدانەوە لە نوێژی جومعە ئەم ویردە بخوێنن، بەمەرجێك قسە لەگەڵ کەسدا نەکەن و، لەسەر هەیئەتی کاتی نوێژی جومعە ڕوو لە قیبلە دابنیشن. ویردەکەش ئەمەیە: سوورەتی (اخلاص)(٧) جار، (ناس)و (فلق) یەکی (٧)

جار، شێخ (ابن حجر) (ر.خ) ڕیوایەتی کردووە: هەر کەس ئەم ویردە بخوێنێ بۆی دەبێتە پارێز لە شەیتانەکان و یاریدەرەکانیان لەم جومعەوە تا جومعەی داهاتوو، بێجگە لەوە کە پاداشی زۆری پێ دەگات. شێخ (ابن حجر) لە کتێبی (زەواجر)دا فەرموویەتی: کەسێ جومعەی لەسەر واجب بێت، ئەگەر سەرکەشی کردو وتی: من جومعە ناکەم و، نەیکرد، ئەوە چەندە نوێژی نیوەڕۆیش بکا، واجیبە (قاضی) بە (حد)ی شەرعی بیکوژێ؛ چونکە موعانەدەو سەرکەشی و بەرامبەرکێ لەگەڵ ئەحکامی ئایندا ناکرێ و، تەرکی نوێژی جومعە بە گوناهێکی گەورە دادەنرێ.

براینە! خوای گەورە فەرموویەتی: "فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ" واتە: هەر کاتێ کە نوێژی جومعە تەواو کرا ئیتر بڕۆنە دەرەوە و، بە ئەرزی خوادا بڵاوبنەوەو، داوای ڕزق و ڕۆزی و پارەو ماڵ لە خوای گەورە بکەن، خوای گەورە بەمیهرەبانیی خۆی پێتان دەدا. لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێ کە کردنی نوێژی جومعە بۆ زیادبوونی ڕزق و ڕۆزی بەسوودە، چونکە خۆی دەفەرموێ: لە پاش نوێژ داوای ڕۆزی بکەن، مادام وای فەرموو بێگومان مرۆڤ بێ بەش ناکاو بەشی خۆی ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێ.

ڕیوایەت کراوە: یەك نوێژی جەماعەت بەقەدەر (٢٧) نوێژی تەنیا خێراو پاداشی هەیە، جا پێویستە ئینسان ئەمە لێك بداتەوە کە دەبێ بۆچی بەبێ بەهانەو بە بێ مانع ئەم (٢٧) نوێژە لەکیسی خۆی بدا؟ ئەگەر کەسێ پێی بڵێن یەك کەوچك چایی بدە (٢٧) کەوچك چات لەو نەوعە دەدەمێ، ئەگەر کابرا نەیدا بە شێت دەدرێتە قەڵەم، بەو پێیە هەر کەس لەو (٢٧) نوێژە دووربکەوێتەوە شێت و بێ عەقڵە.

ڕیوایەت کراوە: کەسێ نوێژی عیشا بەجەماعەت بکا وەکو ئەوەیە کە تا نیوەشەو خواپەرستی کردبێ، کەسێ نوێژی سبەینی بە جەماعەت بکا وەکو ئەوەیە کە تەواوی شەو خودا پەرستیی کرد بێ. ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم لە پاداشی نوێژی عیشا و نوێژی سبەینی ئێوە بتانزانیایە هیچ ڕۆژێ تەرکی ئەو دوو نوێژەتان نەدەکرد و، بەجەماعەت جێبەجێتان دەکردن، ئەگەرچی بەسەر دەستاندا ڕێگەتان بکردایە، چونکە دەوام لەسەر ئەم نوێژانە نیشانەی دڵسۆزانە و، ئەم نوێژانە لەسەر شانی ئەوانەی کە دینیان تەواو نییە لە هەموو شتێ گرانترە.

لە کتێبی (احیاء علوم الدین)ی غەزالی ڕیوایەت کراوە: لە ئیبن عەباسەوە (خودای لێ

ڕازی بێ) كە فەرموویەتی: هەر كەسێ لە شەوی جومعەدا یا لە ڕۆژەكەیدا سوورەتی (الكهف) بخوێنێ، ئەوە هەتا جومعەی ئایندە لە دەردی نابار دەپارێزرێ و، بۆی دەبێتە كەفارەتی گوناهەكانی ئەو بەینەی و، خوێندنی ئەو سوورەتەی بۆ دەبێتە نوورێ كە لەشوێن ئەو شەخسەوە هەتا مەككەی موكەڕەمە ڕووناك دەكاتەوە.

ڕیوایەت كراوە: هەر كەسێ هەموو ڕۆژێ دەوام بكات لەسەر خوێندنی ئەم ویردەی، كە بۆتان باس دەكەم، واتە: لە پاش نوێژی جومعە حەفتاو یەك جار بیخوێنێ، ئەوە خودای گەورە ئەو كەسە بێ نیازو بێ ئیحتیاج دەكا لە خەڵك و، بەجۆرێ كە خۆی پێ نەزانێ ڕزق و ڕۆزی بۆ ڕەوانە دەكا. ویردەكە ئەمەیە: "اللهم یا غني یا حمید، یامبدئ یا معید! یا رحیم یا ودود اغنني بحلالك عن حرامك وبطاعتك عن معصیتك، وبفضلك عمن سواك»، بەڵام بەومەرجە كە لە پاش سەلامدانەوەی لە نوێژی جومعە شێوە دانیشتنی خۆی نەگۆڕی و، لەو شوێنە نەگوێزێتەوە و، قسە لەگەڵ كەس نەكا هەتا ئەو دوعایە بەتەواوی دەخوێنێ. ڕیوایەت كراوە: هەر كەسێ شەوی جەژن بە خواپەرستی زیندوو بكاتەوە لەو ڕۆژەدا كە دڵ تیادەمرێ ئەو دڵی نامرێ. براكانم! ئاشكرایە كە ئاینی ئیسلام لەسەر پێنج ڕوكن دامەزراوە:

١- وتەی پیرۆزی شەهادەت.

٢- پێنج فەرزە نوێژەكان.

٣- ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

٤- زەكات.

٥- حەج، واتە: زیارەتی ماڵی خوا بۆ یەكێك كە توانای هەبێ.

بە تەرك كردنی یەكێك لەم ڕوكنانە بینای ئیسلامەتیی مرۆڤ زیانی پێ دەگا، وەكو یەكێ لە خانوویەكدا بێ چوار دیوار و سەربانێكی هەبێ، كە یەكێ لە دیوارەكانی یا سەربانەكەی بڕووخێ كاری تێك دەچێ. ئاخۆ كەس بە خانوویەكی وەها ناتەواو ڕازی دەبێ، هەتا بە دینێكی ناتەواو و نارەسا ڕازی بێ؟

ڕیوایەت كراوە: كەسێ حەجی ماڵی خوا بكا و لە ماوەی حەج كردنەكەیدا وتاری نارەواو كاری گوناه نەكا، كە حەجەكەی تەواو كردو، گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، وەها دێتەوە كە تازە لە دایك بووبێ، واتە: گوناهی لەسەر نامێنێ مەگەر مافی خەڵقی،

تەنانەت دەربارەی ئەوەش زانا گەورەکان وتوویانە کە مادام خوای گەورە حەجەکەی لێ قبووڵ بکا خاوەن مافەکانیش ڕازی دەکا لەو کەسەو، لێی خۆش دەبن و عەفووی دەکەن.

ڕیوایەت کراوە: کەسێ لە ماڵی خۆی بێتە دەرەوە بەنیازی حەج ئەوە هەر هەنگاوێ دەنێ بە یەك چاکە بۆی دەژمێردرێ و یەك گوناهی لێ دادەوەرێ، بە بەرزکردنەوەی پێی و دانانەکەیشی. هەروەها (طواف) واتە: سووڕانەوەی بەدەوری ماڵی خوادا بۆی دەژمێررێ بە ئازادکردنی حەفتا بەندە لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل (د.خ)... لە ڕێ کردنی مابەینی (صفا)و (مروە)داو، لە ڕاوەستانی خاکی (عرفە)شدا خوای گەورە نوور پرژێنیی بەزەیی خۆی دەردەخا. بە ڕاوەستانی حاجییەکان لە (عرفە)دا بەسەر مەلائیکەکاندا فەخر دەکات و دەفەرمووێ: بڕوانن بۆ بەندەکانی من، چۆن لە ڕێگای دوورەوە هاتوون بۆ قاپیی من و، سەر و پێی خۆیان ڕووت کردووەو، مووی سەریان بەیەکا چووەو تۆزاوی بووە؟ هاتوون داواو تکای لێبووردن دەکەن لە گوناهەکانیان هەتا دەرگای بەهەشتیان لێ بکەمەوە. پاش ئەمە ڕووی میهرەبانی و بەزەیی دەکاتە ئەهلی عەرەفات و پێیان دەفەرمووێ: ئەگەر گوناهەکانتان بەقەدەر لمی شیوەکان و تکەتکەی باران و کەفی دەریاکان بێ عەفووتان دەکەم، ئیتر بەرەو ماڵی خۆتان بگەڕێنەوە بە ئازادی و گوناه بەخشراوی هی خۆتان و هی ئەوانەش کە ئێوە تکاو ڕجای عەفووتان بۆ کردوون. لە کاتی بەردەباران کردنی شەیتاندا هەر بەردێ کە فڕێ دەدەن دەبێتە هۆی دواکەوتنی گوناهێ لە گوناهە گەورەکانیان، ئەو قوربانییەش کە لە ڕێگای خوادا سەری دەبڕن دەبێتە ئازوخە بۆ ڕۆژی قیامەت. ئەو مووانەی سەریشتان کە دەیتاشن هەر یەکێکیان دەبێتە چاکەیەك و گوناهێکتان دادەپۆشێ. خۆ سووڕانەوە بە دەوری ماڵی خوادا، کە لای زۆری لەو کاتەدا گوناهیان نەماوە، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە فریشتەکانی دەوری ماڵی خودا موژدەیان بدەنێ بەوەی کە لە تاوانباری ڕزگار بوون، ئیتر بۆ لە مەولا ئاگاداری خۆتان بن و خۆتان بپارێزن. هەر پارەیەکیش لەم ڕێگەدا سەرفتان کردووە یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەدو زیاتریش بۆتان حسێب دەکرێ. لەو کاتەدا کە حاجییەکان (لبیك لبیك) دەڵێن، ئەگەر نیەتیان لە حەجەکە باش بێ و پارەو زادیان حەڵاڵ بێ ئەوە مەلائیکە وەلامیان دەداتەوەو دەڵێ: حەجەکانتان قبووڵ، گوناهەکانتان عەفوو کراو بێ، خۆ ئەگەر نییەت ناباش و پارە حەرام و تۆشە ناشەرعی بێ لەو کاتەدا فریشتەکان دەڵێن: "لا لبيك ولا سعديك" نییەت ناڕەساو پارە حەرام و، حەجتان ناڕەواو نامەقبووڵە.

براکانم! حەجی مەبروورو قبووڵکراو ئەوەیە کە لەگەڵ نییەت چاکیی حاجی و حەڵاڵیی پارە و تۆشەکەیدا، لە ماوەی حەجەکەیدا واتە: لە هەموو ئەو سەفەرەدا، لە هاتوچۆدا، لە ماوەی مانەوەی لە حەرەمدا لە هەموو ڕەفتارو گوفتارێکی ناشەرعی و ناڕەوا پارێز بکاو، بە هیچ جۆر قسەی نامووناسب و دڵ ئازاردەر بە کەس نەڵێ، بەتایبەتی بە هاوڕێیەکانی و، هەمیشە دڵ گەرم و زمان نەرم و بەحەیا و شەرم بێ، منیش ئەرکەکانی حەج و مەرجەکانی و، ئەوانەی دەبنە هۆی بەتاڵبوونەوەی حەج، لە دوو نامەدا بۆتان دەنووسم.

براکانم! خێرو چاکەی کردەوە ئیسلامییەکان زۆر زۆرەو، لەو عەریضەدا کەمێکی دەگونجا عەرزم کردن، جا پێویستە بزانن هەرچی فەرزی عەین بێ زانینی لەسەر (مكلف) واتە: ئینسانی باڵغی عاقڵ واجیبە، پیاو بێ یا ژن، ئەو کەسەی تەرکی فێربوونیان بکا گوناهبار دەبێ، دیارە ئەم فێربوون و زانینە چەند پلەوپایەی هەیە؛ بۆ وێنە: لەسەر ئینسانی گەداو گیرۆدەوی کاسبی و نان پەیداکردن زانستی سێ ڕوکن لە ڕوکنەکانی ئیسلام واجبە: یەکەم ناسینی خودا و ناسینی پێغەمبەری خوا کە خولاسەی ڕوکنی یەکەمە، زانینی مەعنای "أشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله" واجیبە. دووەم: زانینی نوێژ. سێهەم: زانینی ڕۆژوو لەگەڵ مەرج و ڕوکنەکانیاندا. زانینی ئەو شتانە کە بەتاڵیان دەکەنەوە لەسەر هەموو کەس واجیبە، ئەمانە هەریەك لە نامەیەکی سەربەخۆدا عەرزم کردن، ئەمانە فێربوونیان واجیبە، ڕەفتار و باوەڕ پێکردنیان واجیبێکی گەورەترە، چونکە بە تەرکی فێربوونیان موسڵمان فاسق دەبێ و، بەهۆی باوەڕ پێ نەکردنەوە کافر دەبێ، لەبەر ئەوە کە لەوانەن بەئاشکرا داخڵی دین و ئاینن.

لەسەر ئینسانی موسڵمان کە دەوڵەمەند بێ و زۆر ناچاری کاسبی نەبێ فێربوونی ئەوانەی کە وتمان بەتەواوی واجیبەو، ڕەفتار پێکردن و ئیعتیقادو باوەڕکردن پێیان گرینگترە، هەروەها زانینی واتای زەکات و حەج و ئاداب و مەرج و ڕوکنەکانیان و ئەوانەی دەبنە هۆی بەتاڵ بوونەوەیان واجیبە، چونکە واجیبە زەکات بداو حەج بکا، دیارە بە بێ زانینی ئەوانەش ناتوانێ جێبەجێیان بکا. لەسەر بازرگان و ئەوانەی خەریکی کڕین و فرۆشتنن واجبە ئادابی مامەڵەو مەرجەکان و ڕوکنەکانی بزانن و مامەڵەی ڕاست لە ناڕاست جیابکەنەوە. هەروەها لەسەر هەموو (مكلف)ێ وا جیبە، گەدا بێ یا دارا، کە فێری حەرام و حەڵاڵ ببێ و، چی حەڵاڵەو چی حەرامە، تا حەڵاڵ بە حەڵاڵ

بزانیّ و، حەرام کامەیە و مەکرووهـ کامەیە و موباح کامەیە، واجبە باوەڕی وابیّ ئەوەی خوا واجیبی کردووە واجیبە، ئەوەی خوا حەرامی کردووە حەرامە و، ئەوەی مەکرووهی کردووە مەکرووهەو، ئەوەی خوا بە مەندووبی داناوە مەندووبەو، ئەوەی کە موباحە موباحە، واتە: گوناهبار نەبیّ بەوەی کە واجیب و حەرام و مەندووب و مەکرووهـ و موباح لە یەك جیانەکاتەوە.

بۆ نموونە: عیبادەتیّ کە سوننەت بیّ، وەکو دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی، هەر چەندە بە جێهێنانی واجیب نییە، بەڵام زانینی ئەوەی کە سوننەتە لەسەر موسڵمان واجیبە، بەڵام ئەوەندە هەیە ڕوو وەرچەرخاندن لە بەجێهێنانی سوننەت حەرامە، چونکە ڕوو وەرچەرخاندنە ئەگەر لە زانای دینەوە بیّ بە بیّ موبالاتی و گاڵتەکردن دەژمێرریّ و، ئەم بیّ موبالاتییە حەرامە. وە کردەوەی موسڵمانان هەندێکیان بە شێوەی ئیتاعەت و بەندەگی داواکراون و، هەندێکیان بە شێوەی مەسلەحەت، بۆ نموونە: نوێژکردن ئیتاعەت و عیبادەتە، تەعزیە و دڵخۆش کردن و دڵدانەوەی موسڵمانان و مەرحەبا لیّ کردنیان بە شێوەی موناسەبەو خێر خواهی کۆمەڵەوە مەشرووع و دامەزراوە؛ واتە: ئەم کردەوە واجیب و سوننەتانە هەندێکیان پەیوەندییان هەر بەخودای گەورەوە هەیە. هەندێکیشیان پەیوەندییان بەکۆمەڵ ڕێکخستن و کارسازیی گەلەوە هەیە. بەشی ئیطاعەت و عیبادەتەکە بەبیّ نییەت دروست نییە، وەکو نوێژ و ڕۆژوو حەج، هەندێکیان بە بیّ نییەت دروستن بەڵام ئەواب و پاداشی چاکیان نییە؛ وەکو دانەوەی مافی خەڵك، داوای گەردن ئازادی، گەردن ئازاد کردنی خەڵك، واز لە مەکرووهات هێنان، نەکردنی کاری حەرام، لەم جۆرە شتانەدا هەتا نییەتی بەجێهێنانی فەرمانی خوات نەبیّ خێرت پیّ ناگات، بەڵام ڕزگار بوونی زیممەی موسڵمان لەمانە نییەتی پیّ ناویّ، تەنانەت کارو پیشە، کە فەرزی کیفایەن، نییەتیان پیّ ناویّ، بەڵیّ بەبیّ نییەت سەوابیان نییە، ئەمەش بەم جۆرە دەبیّ کە نییەتی ئەوەت بیّ ئەم کردەوە فەرزی کیفایەیەو، بۆیەی دەکەم کە خۆم سەوابم پیّ بگا و موسڵمانانیش ئەم ئەرکەیان لە کۆڵ بکەویّ و گوناهبار نەبن. بەخ بەخ بۆ پیشەساز چ دەوڵەت و چ بەهرەیەکی گەورەی دەست دەکەویّ ئەگەر کەمیّ دڵ و زمانی خۆی بەم دوو کەلیمەیەوە ماندوو بکات، واتە: نییەتی سەوابی خۆی و ڕزگاریی خەڵکی لەدڵدا بیّ و ئەم نییەتەش بە زوبان بەیان بکات بۆ فێرکردنی خەڵك و بۆ جووتکردنی زوبان و دڵ بەیەکەوە. هەروەها لە خواردن و خواردنەوەدا بەو نییەتە مەیلیان بکات هەتا دڵ و لەش هێزیان تیا پەیدا بیّ و بتوانیّ کارو کاسبیی حەڵاڵ و خواپەرستی بکا

هەروەها نووستن لەگەڵ خێزانیدا بەنییەتی ئەوە بێ کە هەردوو لایان لە گوناهکردن و ئارەزووی نارەوای نەفس ڕزگار ببن و، خوای گەورە لە نوتفەی ئەوان ئەولادی موسڵمانی بەسوود بۆ گەلی موسوڵمان دروست بکا و، بەو نییەتەی کە هاوڕێیی خێزان بە ڕێکوپێکی و دڵی یەکتر ڕاگرتن سوننەتە. ئەمە بە ئیحسانێکی گەورە دادەنرێ، بەتایبەتی لەم مادەدا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: من لە ڕۆژی قیامەتدا شانازی دەکەم بە زۆریی پەیڕەوانم. بەکورتی: لە هەر کردەوەیەکدا کە نییەتی بەگوێکردنی خوا هەبێ و بە مەبەستی ڕەزای خوا بێ دەبێتە پاداش و جەزای چاك. هەر کردەوەیەکیش کە تەرك بێ، وەکو تەرکی شەراب خواردنەوەو تەرکی قومارکردن یا تەرکی هەر گوناهێکی تر پێویستە ئەو تەرکە بە نییەتی ڕەزاو خوشنوودیی خوا بێ، ئەگەرنا هەر ئەوەندەی سوود دەست دەکەوێ کە تووشی ئەو گوناهە نەبێ.

براکانم! بەقوربانتان بم تێ کۆشن بۆ ئیتاعەتی خواو بۆ کاری قیامەتتان، وەکو بۆ کاروباری دنیاتان تێ دەکۆشن، بە هەردووکیانەوە خەریك بن، بەڵام زۆرتر بایەخ بە کاری قیامەت بدەن؛ چونکە قیامەت نابڕێتەوە. هەروەها دڵنیا بن مادام ئێوە کاروباری ئاینی خۆتان باش بەجێ هێنا، مەلائیکەی (کرام الکاتبین) لە دەفتەری خۆیاندا ئێوە بە ئەهلی جومعە و جەماعەت و سوننەت و شەو نوێژ و ڕۆژووگرو کردەوە باش دەنووسن، کە چوونە دەفتەری پیاوچاکانەوە، ئەوسا ئەگەر بەهۆی نەخۆشییەوە، یا بەهۆی سەفەر کردن، یا پیری و لاوازی، ئەو کردەوە چاکانەی، کە لە هەرەتی گەنجی و لەش ساغیدا دەتانکرد، بۆتان نەدەکرا، مەلائیکە ئەو کردەوە باشانەتان بۆ دەنووسێ.

هەروەها مرۆڤی دەوڵەمەند، کە لە کاتی خۆیدا خێرو سەدەقەی کردبێ، لە دواییدا کەم دەس بێ و خێرو صەدەقەی بۆ نەکرێ، مەلائیکەی کردەوەنووس ئەو خێراتەی بۆ دەنووسێتەوە.

موسڵمان هەر کردەوەیەکی دنیایی بکا، تەنانەت نەفەقە و بەرگی ژن و منداڵی خۆی و ئەوانەی نەفەقەیان لەسەریەتی، مادەم نییەتی ئیتاعەتی خودای ببێ، ئەوە بە ئیتاعە بۆی دەنووسرێ، وە هەر کەس لە کردەوەی خێرو صەدەقەدا کەم و کورتی هەبێ و دواکەوتوو بێ، ئەوە زیان لە خۆی دەدا.

براکانم! دەخیلتان بم. بۆ ئاین تێ بکۆشن، لە خزمەتی زانایانی ئایندا فێری ئادابی ئاینی خۆتان ببن، یا گومڕاهـ نەبن؛ چونکە کە مرۆڤ ئەحکامی ئاینی خۆی نەزانێ

گومڕاه دەبیٚ، جا کە فێری ئادابەکەش بوون ڕەفتاری پیٚ بکەن، هەتا خوای گەورە غەزەبتان لیٚ نەگریٚ.

براکانم! مرۆڤ لە ژیانی ئەم دنیایەدا دەتوانیٚ هۆیەکانی بەختیاریی خۆی ڕێك بخا، بیٚ گومان ئەگەر بە کەمتەر خەمی بژی، کاتیٚ کە مرد پەشیمان دەبێتەوەو، لەو کاتەشدا پەشیمانی سوودی نییە.

بەختیارە ئەو کەسە کە ئاینی خۆی فێر دەبیٚ و ڕەفتاری پیٚ دەکا و، بەسەربەرزی دەمریٚ؛ ئەو کەسانە لە ڕۆژی قیامەتدا سەرفراز و سەربەرزن. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

نامەی چواردیەم

## باسی نوێژی داماوی و موحتاجییە

بسم الله الرحمن الرحیم

بسم الله. والحمد لله. والصلاة والسلام علی رسول الله

وبعد. براکانم! هەروەکو پێکهاتنی مەرجەکانی دوعاکردن بۆ قبوول بوونی ئەو دوعایە پێویستە و، ئومێدی قبوول کردنی خوای گەورەش پێویستە، هەروەها بەکارهێنانی رێگای دوعاکردن و ئادابی دوعاکردنیش پێویستە بۆ قبوولْ بوونی دوعا. ئاشکرایە کە رێگای دوعاکردن لە حەزرەتەوە ریوایەت کراوە (د.خ) جا ئەگەر موسڵمان ئەگەر ئەو رێگای حەزرەتەی گرت ئەوا گەلێ هیوا بەهێز دەبێ کە دوعاکە قبوولْ بکرێ. یەکێك لە رێگەکانی حەزرەت (د.خ) بۆ قبوولْ بوونی دوعا (صلاة الحاجة)یە لەگەڵ دوعای تایبەتی ئەم نوێژەدا، یەکەم کەسێك کە حەزرەت (د.خ) نوێژی ئیحتیاجی فێر کرد کوێرێك بوو کە سکاڵای هێنایە لای پێغەمبەر و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! چاوم کوێر بووە، حەزرەت (د.خ) نوێژی ئیحتیاجی و دوعاکەیشی فێر کرد، ئەویش رۆیشت و بەجێی هێنا، لە پاش ماوەیەك هاتەوەو عەرزی حەزرەتی کرد: یا رەسولوڵڵا! چاوم چاك بوویەوە.

براکانم! ئەگەرچی فەرموودە و کردەوەی پێغەمبەر (د.خ) پێویست نییە بە تاقیکردنەوە و بەراورد، بەڵام من بۆئەوەی ئێوە دڵنیا بن، چەند رووداوێکتان عەرزدەکەم:

یەکەم: پیاوێ هەبوو لە شارەزوور ناوی (مام قادر) بوو، لە وەختی گەرمادا کاری بێڵکاری بوو تا نوێژی عەسر، بەهۆی ئەوەوە هەردوو چاوی کوێر بوون، ئەویش گورج سواربوو لەگەڵ (مەعرووف) ناوی کوڕیدا هات بۆ شاری سلێمانی، مەعرووفی کوڕی هاتە لام و وتی: باوکم کوێر بووە، منیش زۆر دڵم بۆی سووتا و، لە شەودا (صلاة الحاجة)م بۆ کرد، سبەینێ لەگەڵ شەفەقدا رۆیشتم بۆ مزگەوت، لە دەرگای مزگەوتدا چاوم بە مام قادر کەوت و پێم وت: کەفارەتی گوناهت بێ، خەم مەخۆ، ئینشەڵڵا هەتا من ماوم نەفەقەی تۆ دەدەم، ئەویش وتی: یاشێخ! موژدەبێ ئیمشەو چاوم چاك بوویەوە.

منیش بە بیستنی ئەم موژدەیە گەلێ سوپاسی خوام کرد و، دوعا و درووودم بۆ گیانی پاکی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەر ناردو وتم: اللهم صل علی سیدنا محمد طب القلوب ودوائها وعافیة الابدان وشفائها ونور الابصار وضیائها وعلی آله وصحبه وسلم. دووەم: مام سلێمان ناوی هەزارمێردی گۆخڵی(١) من بوو، ڕۆژی پێی گەیشتم، وتی: یاشێخ ئازادم بکە؛ خوا لەبەر تۆ منی کوێر کرد! چونکە خیانەتم لێ کردووی، منیش دڵم بۆی سووتاو دوو سێ جار (صلاة الحاجة)م بۆ چاکبوونەوەی کرد، پاش ماوەیەك جوابی بۆ ناردم کە چونکە شێخ ئازادی کردم خوای گەورە چاوەکانی پێ دامەوە.

هەروەها چەند جار بۆ کاری گرینگ ڕووی داوە (صلاة الحاجة)م کردووە، بەشی زۆری خوای مەزن قبووڵی کردوون، بەڵام سوپاس بۆ خودا هەموو کاتێ باوەڕم بەوە بەهێز بووە کە (صلاه الحاجه)م لێ قبووڵ دەکرێ.

براکانم! ئەگەرچی هەموو موسڵمانێك باوەڕی بە پایەی گەورەی پێغەمبەر لای خودا هەیە، بەڵام لە نێوان خەڵکدا فەرق و جیاوازی هەیە، زوربەی قبووڵبوونی دوعا و نزا لەسەر بەهێزی و بتەویی باوەڕە، واتە: هەتا باوەڕ بەهێزتر بێ دوعا و نزا لە قبووڵ بوونەوە نزیکتر دەبێ، جا لەبەرئەمە بۆ ئێمەمانان کە لە خەڵکی هەرەمەین، بۆ ئەوەی داواکەمان بێتە دی، چاکتر وایە چەند جار بۆ مەبەستی حاسڵبوونی مەتڵەبمان نوێژی حاجە و دوعاکەی دووبارە بکەینەوە؛ چونکە بۆ دۆستانی خوا و پیاوچاکان دوعا زوو بەزوو قبووڵ دەبێ، بەڵام بۆ ئێمەمانان وەها نییە.

فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) (ان الله یحب الملحین في الدعاء) واتە: بەڕاستی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە لە دوعادا زۆر دەپاڕێنەوە و لە سەری دەڕۆن و وازی لێ ناهێنن. نابێ گومانی ئەوە بکەین کە پاڕانەوەی زۆرو نزای فرە ئەنجامی خراپ دەبێ؛ ئەم جۆرە گومانە هەڵەیە، چونکە دوعاو پاڕانەوە، کە شەرعی بێت و بۆ شتی ناڕەوا نەبێ، چەندین سوودی هەیە. یەکەم: پاڕانەوە لە خوا واتای ئەوەیە: ئەو کەسە کە دەپاڕێتەوە باوەڕی بە خودای خۆی زۆر زۆر بەهێزەو دان بە گەورەیی و بێ ئیحتیاجی خوادا دەنێ. دووەم: باوەڕی بەوە هەیە کە خوای گەورە دەتوانێ هەموو کارێ جێبەجێ بکا. سێیەم: ئەگەر دوعاکە بە ئاشکرا بێ دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی باوەڕ بە خودای گەورەو گەڕانەوەی ئادەمیزاد بۆ لای خوا.

---

(١) گۆخڵ: سەرپەرشتیکەری مەرمزە.

پێویستە بزانن. هەر بەندەیەك لە بەندەكانی خوا ڕێگایەكی تایبەتی هەیە بۆ بەرزەوەبوونی كردەوەی خێری بۆ ئاسمان و، هەر لەو ڕێگایەشەوە ڕزق و ڕۆزیی بۆ دێتە خوارەوە، هەر لەو ڕێگەوە سەركەوتنی ڕۆحیی هەیە بۆ مەقامی خۆی، جا هەر كاتێ بەندە لەسەر ناوهێنانی خواو ئیتاعەت كردن و لەسەر خێروچاكە و بەخشین دەوامی كرد، بەنیازی لادانی بەلاَ ئەو ڕێگەیە پڕ دەبێ لەم شتە باشانەو ڕێگەی هاتنە خوارەوە دەگرن لەو بەلاَو سزاو ئازارانە كە دەیانەوێ بێنە خوارەوە، سەدەقە و خێرو دوعاكە دەیانەوێ سەركەون و، لەوێدا لە یەكتر دەدەن و هەر دوولایان ماتڵ دەبن، بۆیە لە حەدیسی شەریفدا هەیە: الدعاء والبلاء يقتتلان الى يوم القيامة. زانایان وەها ئەم حەدیسەیان مەعنا لێ داوەتەوە كە دوعا دەرد و بەلاَ دەگێڕێتەوە، مەبەس ئەوەیە كە لەسەر فەرمانی خوای گەورە ئەم دوعاو پاڕانەوەو خێرو چاكەیە دەبنە پەردەی ڕێگرو نایەڵن بنیادەمەكە تووشی بەلاَو ئازار بێ. دوعاو نزاو پاڕانەوە لە قاپیی خودای گەورە گەلێك قازانجی هەیە، دوعا دەبێتە هۆی ئەوە خوای گەورە ڕقی لە ئینسان هەڵنەستێ؛ ڕیوایەت كراوە «من لميسأل اللّه يغضيب عليه» هەروەها ڕیوایەت كراوە: "الدعاء عبادة" لە ڕیوایەتێكی تردا "الدعاء مخ العبادة" بەڵكو دوعا گەورەترین خواپەرستییە، چونكە كرۆكی دوعا بریتییە لە دەربڕینی داماویی ئادەمیزاد لەبەر باری خواداو، شتێ خوای گەورە بۆی نەكا و بۆی نەڕەخسێنێ جێبەجێ نابێت. دوعا بریتییە لەوەی كە ئەو مرۆڤە سەركەش نابێ بە هێزو توانای خۆی و، هەر دەستكەوت و بەرهەمێكی بۆ هەڵبسوورێ، هەمووی لە خواوەی دەزانێ و، دەیباتەوە سەر میهرەبانی و بەزەییی فراوانی ئەو. لە دوعاكردندا ئەوە دەردەكەوێ كە ئەو مرۆڤەی بەڕاستی دەپاڕێتەوە كەسی تر بەشایانی ئەوە نازانێ داوای دڵخوازی دڵی خۆی لێ بكاو لێی بپاڕێتەوە، خوای بەخشندەو میهرەبان و بێ نیاز نەبێ.

ڕیوایەت كراوە: یەكێك هات بۆ لای حەزرەت (د.خ)و عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگارییەكم بكە، فەرمووی: "أوصيك بالدعاء" واتە: ئامۆژگاریت دەكەم بەوەی كە لە خوای گەورە داوای دڵخوازی خۆت بكەی؛ مەعنای ئەم ئامۆژگارییە زۆر وردە؛ مەعنای ئەوەیە: تۆ كە خوای پەروەردگار دروستی كردووی چاو و دەست و گوێی پێ داوی، هێزی تێكۆشان و كاركردنی پێ بەخشیوی، لەسەرت پێویستە خۆت ئەوەندەی كە توانات هەیە تێ بكۆشی و هەر لە خوا بپاڕێیتەوە كە هۆی جێبەجێ بوونی ئەنجامی تێكۆشینەكەت بۆ جێبەجێ بكا و، كۆسپ لە ڕێگەت لابدا و، دڵت ڕووناك بكاتەوە بۆ ئەوەی كە ڕێگەی ڕاست هەڵە نەكەی، ئیتر ئەم حەدیسە پیرۆزە مەعنای ئەوە نییە كە مرۆڤ بە تەمەڵی دابنیشێ

و تێنەکۆشێ و تەنیا پاڵ بداتەوە سەر دوعا؛ چونکە ئەمە خیلافی یاسای خوای گەورەیە لەم جیهانەدا؛ یاسای خوا تێکۆشین و تاڵی نۆشینە، هەتا ئینسان بگاتە خۆشی و ئاسایشی هەردوو دنیا. هەندێ لە نەزانەکان دەڵێن: ڕزق و ڕۆزی بەقەزاو قەدەری خوا لە کاتی خۆیدا بڕاوتەوەو، بەهیچ جۆرێ ناگۆڕێ، ئیتر دوعاکردن و پاڕانەوە لە خوا دەبێ سوودی چ بێ؟ ئەو کەسانەی ئەم جۆرە قسەیە دەکەن، نەفام و تێ نەگەیشتوون و قسەکەیان هەڵەیە بە چەند بەڵگە:

یەکەم: پێغەمبەری خوا (د.خ) لە هەموو کەس زاناترە بەم مەسەلەیە، ئەگەر ئەو بیزانیایە دوعاکردن و پاڕانەوە بێ سوودە هەرگیز ئەمری نەدەکرد بە ئێمە کە دوعا بکەین، هەروەها ئەگەر بیزانیایە خێرو سەدەقەکردن بێ سوودە، فەرمانی نەدەدا بە خێرو سەدەقەکردن، مادام ئەمری کردووە بە دوعاکردن و خێرو سەدەقە کردن ئەوە مەعنای وایە ئەمانە سوودیان هەیە بۆ دین و بۆ دنیا.

دووەم: ئەو نەزانانەی لە مەعنای قەزاوقەدەر حاڵی نەبوون و، وا دەزانن کە قەزا مەعنای ئەوەیە خوا لە وەختی خۆیدا بەبێ قەیدوشەرت بڕیاری داوە فلان کەس ڕزق و ڕۆزی زۆر بێ و، فلان کەس ڕزق و ڕۆزیی کەم بێ، نەیانزانیوە کە دوعاکردن و خێرو صەدەقەکردنیش لە جوملەی قەزاو قەدەرە، واتە: خوای گەورە عیلمی ڕابووردووە بەوەی کە فلان بەندەی لە فلان سەعاتدا دوعا دەکا و لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە بۆ ڕزق و ڕۆزی و، ئەو دوعایشە لە بارەگای خۆیدا مەقبوول دەبێ، هەروەها لە عیلمیدا ڕابووردوە کە فلان کەس لە فلان ڕۆژدا ئەو سەدەقەیە دەکا و، ئەو سەدەقەیە لە بارەگای خۆیدا قبووڵ دەبێ و دەبێتە هۆی زۆریی ڕزق یا لابردن و دوورخستنەوەی دەردو ئازارو مەینەت لەو کەسە. هەروەکو لە عیلمی خوا ڕابووردوە کە فلان نەخۆش زوو بەزوو دەکەوێتە هاتوچۆی نەخۆشخانەو دەرمان وەردەگرێ و دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی.

ڕیوایەت کراوە: لە حەزرەتی عائیشە (ر・خ) کە حەزرەت (د・خ) فەرموویەتی "لا يغني حذر من قدر" وتمامه عند الحاكم: "والدعاء ينفع مما نزل ومما لم ينزل، ان البلاء لينزل فيتلقاه الدعاء فتيعالجان الى يوم القيامة" واتە: خۆپاراستن لە شتێ کە خوا بڕیاری دابێ و، شتەکەی بە قەیدو شەرتێکەوە نەبەستبێ، پێویستە دەبێ هەر ببێ، لەگەڵ ئەمەشدا دوعاو سکاڵاو پاڕانەوە سوودی هەیەو قازانج دەگەیەنێ بۆ پاراستن لەو بەلایە کە

هـاتووەتـە خوارەوەو، لـەوەیش کـە هـێشتـا نـەهـاتـووەتـە خـوارەوە، لـەو بـەڵایـانـە کـە خـودا بەستوونی بە قەیدو شەرتەوەو، بڕیاری داوە بە دوعاو پاڕانەوە دەفعیان بکات یاخۆ سووکیان بکا.

من دەڵێم: پوختەی مەسەلە خوای گەورە پەروەردگاری جیهانەو؛ ماف و دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو مومکینێك لە مومکینەکاندا هەیە؛ جا هەرچی ڕوودەدا لە بەڵاو ئازارو مەینەت کردوونی بە دوو بەشەوە؛ بۆ بەشێکیان بڕیاری داوە کە هیچ شتێ بەرەنگاری پێ نەکرێ و بەشێوەیەکی پێویست دەبێ بێتە جێ، لەم بەشەدا "لا یغني حذر من قدر"... لە بەشەکەی تریاندا، بڕیاری داوە کە بە پاڕانەوەو بە خێرو سەدەقە چاری بکا، بۆ ئەم بەشە دوعاو خێرو سەدەقە بە سوودە، لە عورف و نەریتی زانایانی ئیسلامدا بەشی یەکەم "قضا" ی "مبرم"ەو، بەشی دووەم "قضا" ی "معلق"ە جا لەبەر ئەوەی ئەم جیهانە جیهانی ئەسبابە ئەمرمان پێ کراوە کە بەهۆی ئەسبابی خێرەوە تێ بکۆشین بۆ پەیداکردنی خێرو پاداش و، بەهۆی ئەسبابی خۆ پاراستنەوە تێ بکۆشین بۆ چارەکردن و بەرگری لە مەینەت و ئازار، پێویستە ئێمە بە ڕێڕەوی ئەسبابدا بڕۆین، ئەگەرچی ناشزانین ئەم مەینەتە (مبرم)ە یا (معلق). پێویستە هەرچی هۆی سوودوەرگرتن بێ، یا هۆی چارکردن و لادانی زیان بێ جێبەجێی بکەین.

سێیەم بەڵگە لەسەر هەڵەیی ئەو کەسانە دەوامی تێکۆشینی ئادەمیزادە بۆ دەرمانکردنی نەخۆش و بریندارو، پارە سەرفکردن بۆ پارێزگاری تەندروستی، یا پارە سەرفکردن لە دروستکردنی کۆشك و دامەزراندن و بووژاندنەوەی کشتوکاڵ و، ڕێکخستنی سوپای چەکدار بۆ پاراستنی وڵات و، جیهادکردن لە پێناوی بەرزکردنەوەو سەرخستنی وتەی (حق)و غەیری ئەمانەش لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە ئەسبابەوە هەیە. بۆ نموونە: ناچێتە عەقڵەوە یەکێك بە تۆ بڵێ: بۆچی دەرمانی ئەو بریندارە، یا تەداوی ئەو نەخۆشە دەکەی؟ خۆ ئەگەر موقەددەر بووبێ بمێنێ ئەوا دەرمانیش بەکارنەهێنێ هەر دەمێنێ، چونکە ئێمە ئەوەندە دەزانین ئەمرمان پێ کراوە کە پەیڕەویی ئەسباب بکەین، لەوانەیە لە عیلمی خوادا ڕابووردبێ کە چاکبوونەوەی ئەم نەخۆشە بەو دەرمانە بێ. وتارەکەی من تەواو بوو.

ڕیوایەت کراوە: "ما من مسلم یدعو دعوة لیس فیها اثم ولا قطیعة رحم الا اعطاه الله احدی ثلاث خصال: اما ان یقبل دعوته واما ان یدخرها له في الاخرة او یصرف عنه سوءا مثلها، قالوا اذا نکثر قال: الله اکبر."

واته هەر موسڵمانێ دوعایەك بكا و، دوعاكەی گوناهی تێدا نەبێ و، بڕینی ڕشتەی ڕەحم و خزمایەتی تێدا نەبێ، خوای گەورە یەكێ لەم سێ شتەی بۆ جێبەجێ دەكا: یا دوعاكەی قبووڵ دەكا، یا خێری ئەو دوعایەی بۆ هەڵدەگرێ بۆ پاشە ڕۆژی، یا دەیكا بەهۆی پاراستنی لە مەینەت و ئازارو خراپەیەك كە لە پایەی ئەو شتانەدا بێ كە كابرا داوای دەكا، وە یا بەهۆی پیرۆزیی ئەو دوعاو خێرو سەدەقەیە بەلاو ئازارەكە لەسەر دڵی گیرۆدەكە ئاسان دەبێت و پێی دەگاتە پایەی (ڕەضا بەقەضا). بێگومان ئەم پایەیە لە پایەی قبووڵ بوونی دوعاكە بەرزترەو، بۆ دنیاو قیامەت بەسوودترە.

نابێ بڵێین ئەم (صلاة الحاجة)یە هەر بۆ صاڵحەكان دەبێ، بەڵكو حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) كە لەگەڵ موسوڵمانانندا بەبەزەیی و میهرەبانە، ئەم نوێژەی بۆ هەموو موسڵمانان داناوە.

نییەتی (صلاة الحاجة) ئەوەیە كە بە عەرەبی بڵێ: "نویت ان اصلي سنة صلاة الحاجة ركعتين لله تعالى الله اكبر". یا بەكوردی بڵێ! نییەتم هەیە دوو ڕكات نوێژی داماوی و ئیحتیاجی دەكەم بۆ حوای گەورە «الله اكبر» لە ڕكاتی یەكەمدا لەپاش سوورەتی فاتیحە سوورەتی (كافرون)و، لە ڕكاتی دووەمدا لەپاش سوورەتی فاتیحە سوورەتی ئیخلاس بخوێنێ و، لە پاش ئەوەی كە سەلامی دایەوە ڕوو لە قیبلە لەسەر هەیئەتی كاتی تەحیات دابنیشێ و، ئەم ستایش و درووده بخوێنێ و، لەپاش ئەمانە هەموو داوای مەبەستەكەی بكات، ئەمەش ستایش و درووده‌كەیە:

(الحمد لله على حلمه بعد علمه، وعلى عفوه بعد قدرته. الحمد لله رب العالمين حمدا يوافي نعمه ويكافئ مزيده، يا ربنا! لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك، اللهم لا أحصي ثناء عليك انت كما أثنيت على نفسك، فلك الحمد حتى ترضى ولك الشكر إذا رضيت، الحمد لله بجميع محامده كلها، ما علمت منها وما لم أعلم.

الحمد لله الذي تواضع كل شيئ لعظمته، والحمد لله الذي ذل كل شيئ لعزته، والحمد لله الذي خضع كل شئ لملكه، والحمد لله الذى استسلم شئ لقدرته، الحمدلله الذي لا ينسى ذكره، الحمد لله الذي لا يخيب من رجاه، الحمد لله الذي لا يكل من توكل عليه الى غيره، الحمد لله الذي هو ثقتنا حيث تنقطع عنا الحيل، الحمد لله الذي هو رجاؤنا حين يسوء ظننا باعمالنا، الحمد لله الذي يكشف ضرنا عند كربنا، والحمد لله الذي يجزى بالاحسان احسانا، والحمد لله الذي يجزى بالصبر نجاة، الحمد لله الذي لا اشرك به

شيئا... أشهد ان لا اله الا الله. الحمد لله الذي لم يتخذ ولدا، ولم يكن له شريك في الملك، ولم يكن له ولي من الذل وكبره تكبيرا... الله اكبر واعز مما نخاف ونحذر.

اللهم لك الحمد في بلائك وصنيعك الى خلقك، ولك الحمد في بلائك وصنيعك الى اهل بيوتنا، ولك الحمد في بلائك وصنيعك الى انفسنا خاصة، ولك الحمد بما هديتنا ولك الحمد بما سترتنا، ولك الحمد بالقرآن، ولك الحمد بالاهل والمال والولد، ولك الحمد بالمعافاة، ولك الحمد حمدا كثيرا خالدا مع خلودك، والحمد حمدا لا أجر لقائله الا رضاك. اللهم اني أحمدك واشكرك، واثني عليك حمدا وشكرا وثناء يملأ كل منها الاكوان كله على ما ابقيتني حيا صحيحا سالما، وعلى ما اوليتني من النعم التي لا أحصيها ولا استحقها الا فضلك وكرمك، وعلى ماصرفت عني من النقم التي استحقها،، صرفتها عني بفضلك وكرمك.

سبحان ذي الملك والملكوت، سبحان ذي العزة والجبروت، سبحان الحي الذي لا ينام ولا يموت، سبوح قدوس، ربنا ورب الملائكة والروح، سبحان الذي في السماء عرشه، سبحان الذي في الارض حكمه، سبحان الذي في القبور قضاؤه، سبحان الذي في البحر سبيله، سبحان الذي في النار سلطانه، سبحان الذي في الجنة رحمته، سبحان الذي في القيامة عدله، سبحان الذي رفع السماء، سبحان الذي بسط الارض، سبحان الذي لاملجأ ولا منجى منه الا اليه... سبحان الله عما يصفون، سبحان الله عما يشركون، سبحان من لا يعرف قدره غيره، ولا يبلغ الواصفون وصفه، سبحان المقدر لما يشاء بقدرته، سبحان الفعال لما يريد بعزته، سبحان من يسبح الرعد بحمده والملائكة من خيفته، سبحان الذي بيده ملكوت كل شيئ واليه ترجعون...

اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آل سيدنا محمد، كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميد مجيد، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميد مجيد، اللهم وترحم على محمد وعلى آل محمد كما ترحمت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميد مجيد، اللهم وتحنن على محمد وعلى آل محمد، كما تحننت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميد مجيد... اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا محمد عدد علماتك في معلوماتك.. اللهم صل وسلم وبارك علي سيدنا محمد وعلى آل سيدنا محمد واصحابه عدد خلقك ورضى نفسك وزنة عرشك ومداد كلماتك. اللهم يارب محمد وآل محمد صل على محمد وعلى آل محمد، واجز محمدا ما هو اهله، اللهم صل على محمد كما هو اهله، اللهم صل على سيدنا محمد كما هو اهله، اللهم صل على سيدنا محمد كما تحب

وترضى له. اللهم صل على روح سيدنا محمد في الارواح، اللهم صل على جسد سيدنا محمد في الاجساد، اللهم صل على قبر سيدنا محمد في القبور وعلى آله وصحبه وسلم تسليما كثيرا. اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آل واصحاب سيدنا محمد كما يليق بكمالك وجلالك وجمالك ووجودك ونوالك، كما يليق بكماله، وكما يليق بهم، اللهم صل على سيدنا محمد الحبيب الشفيع الرفيع القدر العظيم الجاه وعلى آله وصحبه وسلم تسليما. اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آل سيدنا محمد صلاة اهل السموات واهل الارضين عليه، واجر يارب لطفك الخفي في امري. اللهم صل على محمد طب القلوب ودوائها وعافية الاجساد وشفائها ونور الابصار وضيائها وعلى آله وصحبه وسلم تسليما. اللهم صل على سيدنا محمد على قدر حبك فيه. اللهم صل على سيدنا محمد على قدر عنايتك به. اللهم صل على سيدنا محمد حق قدره ومقداره. اللهم صل على سيدنا محمد السابق للخلق نوره والرحمة للعالمين ظهوره عدد من مضى من خلقك ومن بقي ومن سعد فيهم ومن شقي، صلاة تستغرق العد وتحيط بالحد، صلاة لا غاية لها ولا منتهى ولا انقضاء، صلاة دائمة بدوامك وعلى آله وصحبه وسلم تسليما مثل ذلك. اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا محمد عبدك ورسولك النبي الامي وعلى آل سيدنا محمد وازواجه امهات المؤمنين وذريته وأهل بيته وخدمه وخلفائه وصحبه كما صليت وسلمت وباركت على سيدنا ابراهيم وعلى آل سيدنا ابراهيم في العالمين انك حميد مجيد، وكما يليق بعظيم شانه وشرفه وكماله ورضاك عنه، وكما تحب وترضى له ابدا دائما، عدد معلوماتك ورضى نفسك وزنة عرشك ومداد كلماتك أفضل صلاة وسلام وابركها واكملها واتمها كلما ذكرك الذاكرون وغفل عن ذكرك وذكره الغافلون وعلى جميع الانبياء والمرسلين وعلى آلهم واصحابهم والتابعين وعلى اهل طاعتك اجمعين من اهل السماوات والارضين، وعلى جبرائيل وميكائيل واسرافيل وعزرائيل، وعلى الكرام الكاتبين وعلينا معهم برحمتك يا ارحم الراحمين. اللهم صل على سيدنا محمد كما تحب وترضى له. اللهم صل على محمد وعلى آله وصحبه وسلم عدد ماكان وعدد ما يكون وعدد ماهو كائن في علمك أو قد كان. اللهم صل على سيدنا محمد صلاة تكون لك رضاء ولحقه اداء ولحوائجي قضاء. لا اله الا الله الحليم الكريم، سبحان الله رب العرش العظيم، والحمد لله رب العالمين، اسألك موجبات رحمتك وعزائم مغفرتك والعصمة من كل ذنب والسلامة من كل اثم لا تدع لي ذنبا الا غفرته، ولا هما الا فرجته ولا حاجة هي لك رضاء الا قضيتها يا ارحم الراحمين، يا أول الاولين ويا آخر الآخرين ويا ذا القوة المتين يا راحم المساكين يا ارحم الراحمين (ثلاثا).

يا من يملك حوائج السائلين، ويعلم ضمائر الصامتين، وان لك في مسألتي .سمعا حاضرا وجوابا عتيدا، وان لك من كل صامت علما ناطقا محيطا، مواعيدك صادقة وأياديك فائضة، ورحمتك واسعة، ونعمتك سابغة، انظر الي بنظر الرحمة يا كريم يا ذا الجلال والاكرام، وتقبل دعواتي وهي أن تحفظ ايماني في حياتي وعند وفاتي وتطول عمري وتحسن عملي، وتوسع رزقي، وتقضي ديوني وتخلصني وترزقني الاخلاص لوجهك الكريم في جميع أحوالي وطاعتي وتفعل (كذا وكذا، وتعد مقاصدك)... اللهم اني أسألك واتوجه اليك بنبيك محمد نبي الرحمة عليه الصلاة والسلام... يا ربنا لك الحمد كما ينبغى لجلال وجهك ولعظيم سلطانك على ان جعلت لنا هذه الوسيلة العظيمة لهدايتنا والشفاعة لنا في قضاء حوائجنا.

ثم يتوجه الى حضرة الرسول صلى الله عليه وسلم، ويقول: يا نبي الرحمة!، صلى الله تعالى عليك وسلم، اني اتوجه بك الى ربي في حوائجي التي اعرضها عليك، وانت شرعت لنا هذه الصلاة فجزاك الله عنا افضل ما جازى نبيا عن قومه. ورسولا عن امته. وانت بشرتنا بان كلا ميسر لما خلق له، وان الله تعالى يسرني لهذه الصلاة، صلى الله عليك وسلم، وانت قلت: اذا سألتم الله فعظموا رغبتكم، فان الله لا يعظم عليه. آمنا بذلك وصدقناك يا رسول الله، واني اتوجه بك الى ربي في حوائجي هذه، ومن اعظمها ان يسددني الله بالايمان ويحفظه علي في حياتي وعند وفاتي، ومن اعظمها ان يسهل امري (كذا، كذا).

ثم يقول: ان تقضى لي حاجتي يا رسول الله، صلى الله عليك وسلم، اللهم شفعه في بجاهه آمين يا ارحم الراحمين (ثلاثا). واته: خوا تكاو شەفاعەتی پێغەمبەر (د•خ) بۆ ئێمە قبووڵ بفەرموو ئەی لە هەموو بەزەییدارێ بەبەزەییتر.

جەلالەدینی سیووتی، رەحمەتی خوای لێ بێ، ڕوایەتی کردووە: کەسێك ئیحتیاجییەکی ببێ لای فەرمانداریێ یا کەسێکی تر لەپاش (صلاه الحاجه)و دوعاکانی ئەم دوعایە بخوێنێ: "اللهم انك انت العزيز الكبير، وانا عبدك الضعيف الذليل، لا حول ولا قوة الا بك.. اللهم سخر لي فلانا (ويذكر اسمه) وجنوده، واتباعه، واشياعه كما سخرت فرعون وجنوده واتباعه واشياعه لموسى عليه الصلاة والسلام، لين لي قلوبهم كما لينت الحديد لداود عليه السلام، فانهم لا ينطقون الا باذنك، نواصيهم في قبضتك، قلوبهم بيدك، جل ثناء وجهك الكريم يا ارحم الراحمين... والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

## نامەی پازدیەم

# دوا نامەی باسی نوێژە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وبعد السلام والدعاء للاخوان بالحفظ من تعييبنا والملام.

براکان! هەشتا نامەی ئاسانی نزیك بەمافی خەڵکی هەرەمەم بە زمانە فارسییەکی تێکەڵ بە کوردی نووسی بۆ خزمەتی دەستە مەلاکانی دێهاتەکان بەهیوای ئەوەی کە ئەو مەلایانە بەو نامانە خەڵکی تەمێ بکەن و فێری ئاینیان بکەن؛ چونکە زووربەی مەلاکان خۆیان کتێبیان نییە، کەچی وا تێ گەیشتم کە گومانیان وایە ئەگەر بەو نامانە ئامۆژگاری موسڵمانان بکەن دەبێتە بێ قەدری بۆیان، گومان دەکەن کە ئەو جۆرە نووسراوانە بۆ منداڵان موناسبەو، بۆ وەعز و ئیرشاد پێکردنی زانایانی ئاینی ناشێن. وا ئەم نامەشم نووسی بە ئومێدی ئەوەی کە نەکەونە شوێن خەیاڵات و لەبەر ڕەزای خرای گەورە ئامۆژگاریی موسڵمانانی پێ بکەن، خۆ ئەگەر لەم نامەیەش نەپرسن ئەوا دەردەکەوێ کە لەبەر عارو عەیب لە نامەکانی تریشیان نەپرسیوە.

لەم نامەدا زۆر تەماشای عیبارەتی ئاسان دەکەم، لەوانە کە تەبیعەتی هەموو کەس وەریان بگرێ و فرێیان نەدا. هەروەها بەهۆی ئەم نامەیەوە ڕاستیم بۆ دەردەکەوێ: ئاخۆ مەیلتان هەیە بەم نامانە ئامۆژگاری بکەن؟ جا لەبەر ئەوەی نوێژ گەورەترین ئیتاعەتی بەدەنییە ئەم نامەیشم هەر لە بابەتی نوێژەوە بۆ نووسین، تا لەگەڵ ئەو نۆ نامەیەدا کە لەمەوپێش لەباسی نوێژا نووسیومن ببنە دە نامەی تەواو.

براکان! ئەبوومەدیەنی مەغریبی (ر.خ) دەگێڕێتەوە کە بەڕاستی لە نوێژی موسڵماندا تەنیا ئەوەندەی دەنووسرێ کە دڵی ئاگای لێ بێ، جا لەسەر ئەم بناغەیە زاناکانی ئاین فەرموویانە: نوێژ لەسەر شێوەی ئادەمیزادە، واتە: هەروەکو چۆن مرۆڤ تێکەڵە لە ئەندامی پەنهان و ئەندامی ئاشکراو، مرۆڤ نابێتە مرۆڤی تەواو ئیللا بە سەلامەتیی ناو و

دەرەوەی، هەروەها نوێژیش تێکەڵە لە (ئەرگان)و (ئەبعاز)و (هەیئات)، هەروەك ئەندامەکانی لەشی ئینسان فەرقیان هەیە، ئەم ڕوکن و هەیئەت و بەعزەش فەرقیان هەیە، هەروەك ئینسان بە لەناوچوونی هەندێ ئەندامی لەشی دەفەوتێ، وەك دڵ و، دەماغ و، بەهۆی لە کیسچوونی هەندێکی تری نافەوتێ، بەڵام تووشی کەموکوڕی دەبێ و لانەواز دەبێ، وەك زمان، گوێ، چاو، دەست، پێ، هەروەها نوێژیش ئەگەر قنووتی بەیانیان، یا تەحیاتی یەکەم نەبێ نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکو کەموکوڕیی تێدا پەیدا دەبێ.

ترس و لە خوا شەرمکردن لە کاتی نوێژکردندا هەندێ لە زانایانی ئاین بە واجبیان داناوە و، بە وێنەی گیانی ئادەمیزادیان داوەتە قەڵەم، واتە: هەروەك ئینسان بە بێ گیان بە مردوو دەژمێردرێ نوێژێ بێ خوشووعیش بە بەتاڵ و بێ گیان دەژمێردرێ. شێوەی ئەو نوێژکەرە کە گوێ بە ڕوکنەکانی نوێژ نەداو لە نوێژا ترس و خشووعی نەبێ، یا گوێ بە قنووت و تەحییاتی یەکەم نەدا، وەکو بازرگانێکە پادشایەکی خاوەن شکۆو شەوکەت ئەمری پێ بکا، غوڵامێکی ورياو زیرەك و هونەرمەندی بۆ بکڕێ کە بۆ حوزووری پاشا بەکاربێ، ئەویش بڕوا غوڵامێکی شەل و کوێر و شێت بێنێ بۆی، لەگەڵ ئەوەشدا داوای خەڵات و بەخشیش لە پاشا بکا، جا هەروەکو ئەم وەزعە بەعەقڵدا ناچێ هەروەها نوێژکەرێ کە خوا داوای نوێژی ڕاست و ڕەوانی لێ دەکاو، ئەویش نوێژێکی نادروست و بێ ترس و خوشووعی بۆ بکا، لەگەڵ ئەوەشدا داوای پایەی بەرز لە خوا بکا، ئەمەیش بە عەقڵدا ناچێ.

پێویستە بزانن نوێژی کەموکورتی دار ڕووناکی بەدڵی ئینسان نادا و، کە دڵی ڕووناك نەکردەوە نابێتە هۆی دووریی لە فەرمانی فاحشە (نالەبار)و تاوان، بەپێچەوانەوە دەبێتە هۆی دووریی لە خوای گەورە، وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "من لم تنهه صلاته عن الفشحاء والمنكر لم يزدد من الله الا بعدا" واتە: کەسێ نوێژەکانی ڕێگای خراپەی لێ نەگرن و مەنعی کاری ناشیرین و ناشەرعیی لێ نەکەن، هەر لە خوای گەورە دوور دەکەوێتەوە.

لە حەزرەتی عومەرەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) وتوویە: "رأى رسول الله (ص) رجلا صلى فاخف صلاته، قال: اترون هذا؟ لو مات على ملة غير محمد" واتە: پێغەمبەر (د.خ) زەلامێکی دی نوێژی دەکرد، بەڵام بە بێ مویالاتی نوێژەکەی دەکرد، واتە: گوێی نەدەدایە ئادابی نوێژەکەی، جا حەزرەت (د.خ) فەرمووی: ئاگاتان لەم زەلامە بوو؟ ئەمە ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بمرێ و، نوێژەکانی ئاوها بکا کە چاومان پێی کەوت، لەسەر میللەتی

غەیری (محمد) – (د.خ) دەمریٚ. جا تەماشاکەن لەم فەرموودەداو لەم تەعبیرەدا هەندیٚ هەڕەشە هەیە، مادام حەزرەت (د.خ) باسی ئاینی دەکا زاهیر وابوو بفەرموویٚ: "مات علی غیر ملة محمد" بەلاّم وای نەفەرموو، بەلّکو فەرمووی: "مات علی ملة غیر محمد" لەبەرئەوە کە پیٚغەمبەرەکان لە مەعنادا وەکو پیٚغەمبەری ئیٚمەن و، لە ئیعتیبارا هەموویان وەکو یەکن، جا ئەنجامی فەرموودەکەی حەزرەت دەبیٚتە ئەوە: "مات علی ملة غیر الانبیاء" واتە: ئەو کەسە کە بەم جۆرە نویٚژ دەکات بە خاوەن ئاین ناناسریٚ و، کاتیٚ کە مرد هیچ ئاینیٚکی نییە، نە ئاینی محمد و، نە ئاینی پیٚغەمبەرانی پیٚشوو، کەوابیٚ لەسەر ئاینی کافرەکان دەمریٚ.

جا ئەگەر یەکیٚك تۆزیٚ باوەڕی هەبیٚ ئەم جۆرە هەڕەشەیە بەسە؛ کەوابیٚ ئەی براکان! نیشانەی ئەهلی سەعادەت و بەختەوەران ئەوەیە نویٚژکەر کاتیٚ نویٚژ دەکا زۆر بە هەست و ژیری چاودیٚریی مەرج و ڕوکن و ئادابی دیاری و پەنهانی نویٚژەکەی بکا و، ئاگای لە هەموو لەفزیٚکی نویٚژەکەی و مەعناکەی هەبیٚ و، بەدلّ وابزانیٚ کە لە بەردەمی خوای گەورەدا ڕاوەستاوەو لیٚی دەپاڕیٚتەوە، کەواتە پیٚویستە لە پاککردنەوەی دلّ و دەروونی غافلّ نەبیٚ، چونکە هەر دلّە کە بەر نەزەری خوای گەورە دەکەویٚ و جیٚگای پڕتەوی نوورو تەجەللای خوایە.

براکان! بزانن ئەو پاکییەی لە موسلّمان داوا دەکریٚ چوار جۆرە، یەکەم پاکیی لەش و پۆشاك و شویٚنی نویٚژ، ئەم جۆرە پاکییە بۆ هەموو نویٚژکەرانە، دووەم پاکیی ئەندامەکانی لەشیەتی لە چلّکی تاوانباری، واتە: زمانی، گویٚچکەی، دەستی، پیٚی، عەورەتی لە کردەوەی ناشەرعی دوور بن، ئەمە تەنیا دیندارە تایبەتییەکان (خواص) پیٚیان دەکریٚ. سیٚیەم پاکیی نەفسە لە هەموو جۆرە خووییەکی ناشیرین و ناپەسەند، وەکو بەخیلی و کینە و خۆپەرستی و خۆ بە گەورە زانین و خووە پیسەکانی تری نەفس، ئەم جۆرە پاکییانە بۆ ڕیٚڕەوانی ڕیٚگەی حەقیقەتە، کە هەمیشە شەرم لە خوای عالەم دەکەن. چوارەم: پاکیی نەفس و ڕۆحە لە پەیوەندی بەغەیری خوای گەورەوە، ئەمەش پایەی "صدیق"انە.

جا تەماشا بکەن کە داپۆشینی عەورەت مەرجی دروست بوونی نویٚژە و، هۆی داپۆشینی عەیب و عەورەتی زاهیری لەشە کە لە پیٚش چاوی خەلّکدا ئەگەر دەرکەویٚت چ ئابڕووچوونیٚکە بۆ ئینسان. هەروەها دەرکەوتنی ڕسوایی لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەردەمی خوای گەورەدا گەلیٚ گرانتر و نابارترە بۆ ئادەمیزاد و، دەرکەوتنی ناشیرنی و چلّکی

خووی ناپەسەندی دەروونی ئینسان وەك بەخیلی و کینە و خودپەرستی لە دنیادا لە حوزووری خوادا و لە قیامەتدا لە بەرچاوی عالەمدا و لە حوزووری خوای گەورەشدا گەلێ لە هەموو عەیبێ عەیبترو ناشیرینترە و زۆرتر هۆی ئابڕووچوونە، بێگومان ئەم عەیبەو ئەم ناپەسەندیی خووڕەوشتە و ئەم چڵکی گوناهباری و سیفەتە ناشیرینانە لە ئینسان دوورناکەونەوە بە تەوبەو پەشیمانییەکی بێگەرد نەبێ، لەگەڵ دەربڕینی شەرمەزاری لە ڕووی حوزووری خوا و سکالا لە بارەگای بالادا، کەوابێ کردەی شایستەی ئادەمیزادی ئازاد ئەوەیە کە لە سەرەتای نوێژەوە باش لە حوزووری خوادا ڕاوەستێ و، هەروەك لە چوار ڕوکنەی جیهاندا هەر (کعبة الله)ی کردووە بە قیبلە، هەر بەو جۆرە لە ناو هەموو دڵخوازێکی دنیاشدا هەر ذاتی خودای گەورە بکا بە قیبلەی دڵ و، بەدڵ و بە ساغی ڕوو لە خوای گەورە بکا، لە کاتێکدا نییەتی نوێژی وەختی هێناو وتی "الله اکبر" لە هەموو بتێکی هەواو نەفس خۆی لادا و، خۆی بهاوێتە ژێر ئالای گەورەیی زاتی خوا و، بەهێزی خوا بەیەك زانین هەموو شەریك بۆ خوا دانانێك و هەموو خوویەکی بەدی نەفس بشکێنێ و، بە وتنی ڕستەی "اعوذ بالله من الشیطان الرجیم" بە قەڵای پارێزگاریی خوا لە هەموو ئاشووب و فیتنە و فێڵێکی ئەهریمەن و دەستەکانی لە بنیادەم و لە جنی خۆی پەنا بدا، کە (بسم الله الرحمن الرحیم) هات بەدەمیا یارمەتی لە زاتی تاق و تەنیای خوای بێ هاوتاو بێ باك داوا بکا و، باوەڕی وەهابێ کە هەر زاتی خودای پەروەردگار (قیوم) و کاربەدەستی هەموو کائیناتە و، تیشکی میهرەبانیی ئەو بەسەر هەموو ڕۆح و شەبەحێکدا پەخش و بڵاو دەبێتەوە و، هەموو بەهێزی خواستی ئەو پەیدا دەبێ و پایەدار دەبێ، کاتێ کە "الحمد لله رب العالمین..." ی خوێند باوەڕی وابێ ئەم جیهانە بەرز و نزمی، هەموو خودا دروستی کردووە و، خوا پەروەردەی دەکا و، هەر نیعمەتێ بە هەر نیعمەت خۆرێ بگات هەمووی هەر خوا خاوەنیەتی و، لەسەر ئەو نیعمەتانە سوپاس بۆ خوا پێویستە، لە کاتێکدا وتی: "الرحمن الرحیم، مالك یوم الدین" باوەڕی وابێ کە لە ڕۆژی قیامەتدا فەرمان و دارایی هەر بۆ خوای میهرەبانە و، خوای گەورە هیچ شتێکی لێ ون نابێ، لە بیروباوەڕی پەسەند و ناپەسەند و کردەوەی شیرین و ناشیرین و، حسێبی هەموو دەکا و، هەر ئەو دەتوانێ حوکم بەسەر خەلائیقدا بدا و، هەر ئەو دەتوانێ تاوانی تاوانبار عەفوو بکا.

هەروەها کە گەیشتە ئایەتی "ایاك نعبد وایاك نستعین" ئەوە بێنێتە بیری خۆی کە نەبووە و پەروەردگارێ دروستی کردووە و ئەندامی لەشی ڕێك خستووە و جوانیی پێ بەخشیوە و، هۆش و بیر و هێزی زانستی پێ داوە، بۆیە پێویستە پەرستن هەر بۆ ئەو بێ و، داوای یارمەتی و کۆمەك هەر لەو بکرێ.

ئینجا کە گەیشتە "اهدنا الصراط المستقیم" بەپاڕانەوە و سکاڵای دڵ داوای بکا لە خوا کە شارەزای بکات، بۆ ڕێگەی ڕاست کە ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، داوای ئەوە بکات کە لەسەر ئەو ئاینە دامەزراوی بکا بەجۆرێ کە بە هۆی ئاشووب و مەینەتی دنیا دڵی لانەدا لە بەجێهێنانی ئادابی ئیسلام و، تەماشای ئەوە بکا کە ئەم ڕێگا ڕاستە ڕێگای ئەو کەسانەیە کە خودای گەورە بە میهرەبانیی خۆی نیعمەتی ئیمان و لەسەر ڕاستی دامەزرانی پێ داون و، لە ڕێگای ئادەمیزادی نابارى عەنادکارانە لای داون کە غەزەبی لێ گرتوون و لای داون لەو نەفام و نەزانانەی کە گومڕا بوون، بەڵکو خوای گەورە لە ڕیزی ئەو ناپیاوانە لایدا بۆ ڕیزی پیاوچاکان و ڕەهبەران و فیداکاران و مرۆڤە ڕاساڵەکان و، لە کانگەی دڵەوە داوای قبووڵ ئەم دوعایە لە خوای گەورە بکا و بەدەم بڵێ "آمین".

لە ڕاستیدا نوێژ خوا پەرستنێکە فەرز کراوە بۆ ئەوەی مرۆڤ بیکابەهۆی یادی گەورەیی خوای خۆی، دەربڕینی بەندەیی و ملکەچیی خۆی و، دەرخستنی نیازمەندیی خۆی بەو خوایە کە بێ نیازە لە جیهان، هەروەها بیکا بەهۆی ڕووناك کردنەوەی دڵ و دەروونی خۆی لە تۆزو غوباری تاوان و خەیاڵاتی پڕوپووچی نەفس و شەیتان بۆئەوەی کە چرایەکی خوداناسینی تێدا هەڵبگرێ کە سوودی هەبێ بۆ ماوەی ژیان و بۆ پاشەڕۆژی، ئەم ئەنجامەش بەوە دەست دەکەوێ کە مرۆڤ لە کاتی نوێژەکەدا بزانێ چی دەڵێ و لەگەڵ کێدا موناجات دەکا، خۆ ئەگەر مرۆڤ لە نوێژدا بێ ئاگا بێ و لە خوا غافڵ بێ ئەوە دەبێ بەهۆی قسوور و دووری لە خوای گەورە و، نابێتە هۆی نزیکی لە بارەگای پەروەردگارەوە.

ڕیوایەت کراوە: لە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا، ڕۆژێ لە باخێکی خۆیدا نوێژی دەکرد، لە ناکاو چاوی کەوت بەبازێ کەوتووەتە شوێنی پەلەوەرێ، دەیەوێ بیگرێ، پەلەوەرەکەش دەیویست لە ناو لقەدارەکانی ئەو باخەدا خۆی ون بکا و، لە دەستی بازەکە ڕزگاربێ، تەلحە لە نوێژەکەیدا ئەمەی هاتە پێش چاو و پێیەوە خەریك بوو، لە نوێژەکەی غافڵ بوو، نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە، بە هەر حاڵ لە پاش نوێژەکەی هات بۆ خزمەتی حەزرەت (د.خ) و سەرگوزەشتەکەی بۆ گێڕایەوە و، عەرزی کرد: وا ئەو باخەم کرد بە هۆی کەفارەتی ئەو لە خودا غافڵ بوونەم و کردم بە سەدەقە چۆن تسەڕوفی تێدا دەکەی بیکە، ئەنجا حەزرەت (د.خ) باخەکەی فرۆشت بە دووسەد هەزار درهم و، بەسەر هەژار و گەداکانی مەدینەی پیرۆزدا بەخشییەوە.

دەگێڕنەوە کە ئیمام (زين العابدين)ی کوڕی حەزرەتی (حسين) خودایان لێ ڕازی بێ، هەر کاتێ دەستی بە دەسنوێژ گرتن دەکرد بۆ نوێژ ڕەنگی زەرد دەبوو، حاڵی دەگۆڕا، عەرزیان دەکرد: بۆچی وەهات لێ دی؟ دەیفەرموو: ئێوە دەزانن کە ئێمە لە بەردەمی کێدا ڕادەوەستین؟ واتە: ئەم نوێژانە کە خوا لە سەری فەرز کردووین نیشانەی بەجێهێنانی یاسای بەندەیی و ملکەچییە بۆ خوای گەورە و، بەندەیی پێویستی بە ساغی و دڵسۆزی هەیە و، دڵسۆزیش ئەرکێکی گرانە و بەجێهێنانی زۆر زەحمەتە؛ لەبەر ئەمەیە من لەم کاتانەدا وەزعم دەگۆڕێ.

لە حەزرەتی (عائیشە)وە دەگێڕنەوە، خوای لێ ڕازی بێ، وتوویەتی حەزرەتی پێغەمبەر بەحاڵێکی عادەتی و ئارام قسەی لەگەڵدا دەکردین و قسەمان لەگەڵ دەکرد هەتا کاتی نوێژ دادەهات، ئەنجا حەزرەت (د.خ) حاڵی دەگۆڕا وەك ئەوەی کە ئەو ئێمە ناناسێ و ئێمەش ئەو ناناسین هەتا نوێژەکەی دەکرد.

دەگێڕنەوە: کە خوای گەورە سرووش "وحی"ی بۆ حەزرەتی مووسا ناردووە تێدا دەفەرموێ: ئەی مووسا! کاتێ ناوی منت هێنا وەها بەترس و هەیبەتەوە ناوم بهێنە وەك ئەوەی کە هەموو ئەندامەکانی لەشت لە یەك جیاببنەوە، لە کاتی یادی من یا ناوبردنی مندا دامەزراو و ئارام بە، با زمانت لە کاتی لەناو بردنما لە پشتی دڵتەوە بێ، واتە: هەتا دڵ بە ناوی من نوورانی نەبێ ناوم مەبە، هەر کاتێ بۆ پەرستنم ڕاوەستای بە شێوەی بەندەیەکی خزمەتکاری داماو لە بەردەم گەورەی خوتدا ڕاوەستە.

جا ئەم جۆرە خواپەرستییە بە کەسێ دەکرێ هەموو مەبەستی بێنێتە سەرچارەی ڕۆژی قیامەت و، هەمیشە گەورەیی و بێباکیی خوا لە دڵیدا دامەزرێ و، بەم بیروباوەڕە جێگەی حیرس و تەماع و ئارەزووی نەفسی لە دەروونیدا نەیەڵێ و، ئاگری حیرس بە ئاوی قەناعەت بکوژێنێتەوە و، باوەڕی بێتە سەر ئەوەی کە هەر کەسێ زیاد لە ئەندازەی پێویست تۆزقاڵێك خۆشویستیی دنیا بچێتە ناو دڵیەوە ئەوە مایەی زیانە بۆی لە قیامەتدا و، ئەگەر باوەڕی وەهابێ کە لەگەڵ خۆشەویستنی دنیادا دەگاتە قازانجی ڕۆژی دوایی، ئەوە بەهەڵەداچووە، وەك ئەو کەسە وایە کە هەموو پۆشاکی بەری تێکەڵی چەوری و چڵکنی بێ و، گومانیشی وابێ کە مێشی پێوە نانیشێت! کە ئەمەش نەبووە و نابێ!.

لە حەزرەتی عائیشەوە (ر.خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەبووجەهم کراسێکی شامیی بەدیاری نارد بۆ خزمەتی پێغەمبەر (د.خ)، ئەو کراسە هەندێ نیشانەو گوڵی جوانی

تێدابوو، حەزرەت (د.خ) کراسەکەی لەبەر کرد و دەستی بەنوێژ کرد، کاتێ سەلامی دایەوە فەرمووی: عائیشە! ئەم کراسە بنێرەوە بۆ ئەبووجەهم، چونکە لە کاتی نوێژەکەمدا چاوم بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی کەوت ئەوەندەی نەمابوو دڵم تێك بداو لە خوا غافڵم بکا.

ریوایەت کراوە: جارێ قەیتانی سۆلەکانی حەزرەت (د.خ) کۆن بوو بوو، بۆیە ئەو قەیتانەی دەرکردو یەکێکی تازەی تێ خست؛ کە سۆلەکانی کردەپێی فەرمووی: ئەو قەیتانە تازە دەربێنن لەم سۆلانە و، قەیتانە کۆنەکەی تێ بخەنەوە؛ چونکە کاتێ کە تەماشای ئەو قەیتانە تازەمە کرد گەلێ دڵشاد بووم و پێم جوان بوو، بەڵام کتوپڕ کەوتە دڵمەوە کە خوای گەورە لەو شادمانی و دڵخۆشیی منە نارازییە و، دەترسم لێمان زویر ببێ! جا کەسێ کە خاوەنی هۆش و دڵی ڕووناك بێ با بەئینساف بیربکاتەوە: لە جێگایەك پێغەمبەر (د.خ) بەو پایە بەرزەوە و بەو خۆشەویستییەی کە لای خوا بوویەتی، سەرەڕای پایەی پێغەمبەرایەتی، لەسەر قەیتانێکی تازەی سۆل لە غیرەت و ڕقی خوا بترسێ و، کوتوپڕ لایبات، دەبێ حاڵی ئەم هەواپەرستانە چی بێ کە شەو و ڕۆژ لە ڕابواردندان و جلی نەرمونیان و ناسك لەبەر دەکەن و ئەنگوسیلەی ئاڵتوون دەکەنە پەنجەیان و لە حەڵاڵ و حەرام ناپرسنەوە؟! دەبێ ئەم دێو ڕەوشتانە، کە بە مەشایخ مەشهوورن و، شانازی بەسەر خەڵکدا دەکەن بە نازو نیعمەتی زۆر و پایە و مایەی بێ شومار، حاڵیان لە حزووری خوادا چۆن بێ؟ ئەم نەزانانە کە بە زانا مەشهوورن و حاڵیان وەهایە کە هەمیشە لە هەوڵ و تەقەڵادان بۆ پۆشاکی نەرم و نوێنی گەرم و ڕابواردن دەبێ لە حضووری خوای گەورەدا حاڵیان چۆن بێ؟ ئەو دەوڵەمەندە بەدبەختانە کە شەو و ڕۆژ لە هەوڵدان و، بۆ ئارەزووی نەفسی ئەممارە هێزی خۆیان بەخت دەکەن و، بیر لە حەرام و حەڵاڵ ناکەنەوە و، لە خوا ناترسن و، واجیباتی بەدەنی و ماڵی بەجێ ناهێنن و، بە زۆر نەبێ یادێکی مردن و حسێب کردنی کردەوەی خۆیان ناکەن، سبەینێ لە کاتی لێپرسینەوەدا حاڵیان چۆن بێ؟

پوختەی قسە ئەوەیە کە خوا ئادەمیزادی بۆ خواپەرستن و گوێڕایەڵی دروست کردووە و، خواپەرستی و گوێڕایەڵیش ئەوەیە کە لەگەڵ دڵسۆزی و چاودێریی ئەدەبدا بێ، گەورەترین عیبادەتێکیش بە لەش بکرێ نوێژە؛ کەوابێ لەسەر ئەو کەسانەی نوێژ دەکەن پێویستە چەند دەتوانن بۆ ئەوە تێ بکۆشن کە لەناو نوێژەکەیاندا ئاگایان لە دڵیان بێ و، دڵیان ببەستن بە بوون لەگەڵ خوادا، بەڵکو خوای گەورە ڕەحمیان پێ بکا.. بەڵێ هەر لەبەر ئەمە بوو کە حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) کە وەختی نوێژ دەهات حاڵی دەگۆڕاو

تێکدەچوو، کە عەرزیان دەکرد: بۆ وا پەرێشانی؟ دەیفەرموو: وەختی دانەوەی ئەمانەت هاتووە، ئەو ئەمانەتەی کە عەرز و عاسمان بۆیان هەڵنەگیراو ئادەمیزاد هەڵی گرت، جا نازانم دەتوانین بەشێوەیەکی ساغ و شایان تەسلیمی بکەینەوە یان ناء؟.

موسڵمان هەقی وایە تێکەڵی و دۆستی لەگەڵ خوادا بێ و، بەعیبادەت و خوداپەرستی دڵی ڕووناك و نوورانی بێ؛ هەتا تام و خۆشیی لە خوا پاڕانەوە بچێژێ، ئەگەرنا ئەو کەسانەی کە شاییی دڵیان بە ژن و ماڵ و منداڵ و مایە و پایەی دنیایە هەرگیز لەزەت و خۆشیی پەیوەندیی لەگەڵ خوا ناچێژن.. چارکردنی دەردی پەیوەندی لەگەڵ دنیای بەد زۆر گرانە؛ میهرەبانی و کەرەم و ڕەحمەتی خوا و هیدایەت و تەوفیقی دەوێ و، لە لایەنی بەندەوە تێکۆشان و خۆ ئازاردان و بیرکردنەوە و هاوڕێیی پیاوچاکانی دەوێ، ئەگینا بە ئاسانی دەست ناکەوێ؛ بۆیە گەلێ لە پیاوچاکان ویستوویانە تەنیا دوو ڕکات نوێژ بکەن بە بێ ئەوەی خەیاڵاتی دنیای تیابێ، کەچی بۆیان ڕێك نەکەوتووە و لایان گران بووە. بەهەر حاڵ پێویستە تێکۆشین بۆ ئیخلاس (دڵسۆزی) جا ئەگەر بەتەواویش دەست نەکەوێ ئەوا کەمێکی بۆ موسڵمان زۆرە. "فان لم یصبها وابل فطل". دڵ وەکو باغ وایە پێویستی بە ئاو و بارانە، ئەگەر بارانی بەهێزی بەسەرا نەبارێ شەونمێکیشی بەسەرا ببارێ هەر باشە، ئەگەر کردەوەمان هەمووی باش نەبێ و هەندێ خراپی تێدابێ ئەوا بەر ئەو کۆمەڵە دەکەوین کە خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی:«وَآخَرُونَ اعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلاً صَالِحاً وَآخَرَ سَيِّئاً عَسَى اللّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ» واتە: چەند کەسانی تریش لە موسڵمانان ئیقراریان کردووە بە گوناهەکانی خۆیان و، کردەوەی چاکیان هەیە و، خراپەشیان کردووە، ئەمانە هیوا هەیە کە خوا لێیان خۆش ببێ، خوا تاوانبەخش و میهرەبانە.

براکانم! ئەگەر بە چاوی ئینساف سەیری ئەم نامەم بکەن بۆتان دەردەکەوێ کە خوێندنەوە و پەیڕەوی کردنی بەسوودە و، بۆ موسڵمانان سوودی زۆرە، بەڵام تەنیا باسی فاتیحەی تیا بوو، تەحییات و ئادابەکانی تری نوێژم تیا باس نەکرد، تکایە ئێوە باسی تەحییات و ئادابەکانی تری نوێژیان بۆ باس بکەن و، ئەم نامەیە بکەنە هۆی سوودی پاشە ڕۆژ بۆ هەموو لایەکمان.

اللهم اغفر لي ولمن غدر بي، وقرأ مكتوبي على اخواني، ولمن اصغى اليه، والسلام على من اتبع الهدى واجتنب الردى.

## نامەی شازدەیەم

# وەڵامی نامەی بینباشی بەغدا

بسم الله الرحمن الرحيم

بسم الله والحمد لله. والصلاة والسلام على رسول الله سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم باحسان في دين الله.

وبعد. براکانم! ئەم نامانە کە دۆستی خۆتان بۆتانی دەنێرێ، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) لە هەموو دیارییەك باشترە کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بنێرێ. فەرموودەکەش ئەمەیە: "ما اهدى مسلم لا خيه هدية افضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى او يرده عن ردى" رواه ابن عمر عليهما الرضوان؛ کەوابێ ئینساف ئەوەیە ئەو دیارییە نەدەنە دواوە و وەری بگرن، وەرگرتنەکەشی بەوە دەبێ کە بەسەر نەزانەکانیدا بخوێننەوە و، بەپێی ئەو نامانە ئادابی دینیان فێر بکەن، هەروەها واجیبە ئەوانیش گوێ بگرن؛ چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە گەورەتر و پەسەندترین خووورەوشتی موسڵمانە کە لە بیستنی باسی ئاین تێر نەبێ، کەوابێ رەفتار کردن بەم حەدیسە بۆ ئەو کەسانەیە کە خاوەنی تۆشە و زادی رۆژی قیامەتن؛ چونکە خوای گەورە ئەم دنیایەی کردووە بە مەنزڵگای موسافیرانی رێگەی قیامەت، هەتا لە دنیادا توێشوویەك بۆ رۆژی قیامەت ئامادە بکەن، باشترین توێشوویش نوێژە؛ چونکە هێزی ئیمان بەهۆی ئیتاعەتەوەیە و، قبووڵ بوونی ئیتاعەتیش لەسەر قبووڵ بوونی نوێژ بەندە؛ بۆیە من لە گەلێ نامەدا هەر باسی نوێژم نووسیوە. کەوایە ئەی براینە! هەروەکو بە زیادبوونی مەعاشی مانگانە شاد دەبن پێویستە بە زیادبوونی ئیتاعەت و عیبادەتیش کە تۆشەی قیامەتە، شادمان ببن، هەرچی لەم رووەوە عەرزتان دەکەم موافیقی فەرموودەی پێغەمبەرە، جا لە جوملەی ئەو نوێژانەیە دوو رکات (راتیبەی بەیانی) کە لە خەراجی دنیا و ئەوی لە دنیادایە بۆ مرۆڤ بەسوودترە، وە چوار رکات سوننەتی راتیبەی پێش نوێژی نیوەرۆ کەبەقەدەر چوار رکات نوێژی شەوی (ليلة القدر) سەوابی هەیە، دیارە هەر رکاتێکی نوێژی شەوی قەدر بە قەدەر سێ هەزار نوێژی شەوی تر خێری هەیە و، پایەی

زیندووکردنەوەی شەوی هەیە و، ئەو شەوە ئەوەندە بەبەرەکەتە کە هەموو گیانلەبەریٚ، بێجگە شەیتان و ئادەمیزادی بیٚ ئاگاهـ، لە تەسبیح و تەقدیسی خودادان، وە لەسەر ڕیوایەتێك ئەو چوار ڕکاتە[1] حەزرەت (د.خ) دەوامی کردوە لەسەریان و بوون بە سوونەتی موئەکەدە، حیکمەتی ئەمەش ئەوەیە کە هەتا حازرانی مزگەوت ئەو چوار ڕکاتە سونەتە دەکەن، کەسانیٚ کە غائیبن لە ئەهلی جەماعەت حازر دەبن و فریای جەماعەتەکە دەکەون. هەروەها دوو ڕکات پاش نوێژی نیوەڕۆیش لە سونەتی موئەکەدەیە و، ئەگەر ماوە هەبیٚ چوار ڕکات بکەن باشترە و خێری زۆرترە. لەوانەیە بلٚێین بۆیە حەزرەت (د.خ) لەسەر ئەم چوار ڕکاتی پاش نیوەڕۆیە دەوامی نەکردوە و، تەنیا دوو ڕکاتی کردووە، هەتا دوو ڕکاتەکەی تر بباتە مالٚەوە، واتە: لەبەر پیرۆزکردنی ناو مالٚ لە مالٚەوە بەجێی هێناون، یاخۆ لەبەر وەعز و ئیر شادی موسولٚمانان ماوەی کەم بووە، بەلاٚم ئەم مانیعە لە پێش نوێژدا نەبووە.

براکان! لە حەدیسدا هەیە کە مرۆڤ بەبیٚ عوزر دەتوانیٚ نوێژی سوننەت بەدانیشتنەوە بکا و، ئەم نوێژەی خێر و پاداشی نیوەی نوێژی بە ڕاوەستانەوەی هەیە، جا دەتوانیٚ دوو ڕکاتە موئەککەدەکە بەپێوە بکا و دوو ڕکاتە غەیرە موئەککەدەکە بەدانیشتنەوە بکا، خۆ ئەگەر پیر و بیٚ هێز بوو ئەوا دەتوانیٚ هەر چوار ڕکاتەکە، موئەککەد و غەیرە موئەککەد، هەمووی بەدانیشتنەوە بکا. وە ئەگەر وەزعی وەها بوو کە بەدانیشتنەوە خوشووعی زیاتر دەبوو، ئەوا هەر چوار ڕکات لە پێش نوێژی عەسردا سوننەتە و، حەزرەت (د.خ) دوعای خێری بۆ ئەو کەسە کردووە کە ئەو چوار ڕکاتە دەکا و، موژدەی پێداوە و فەرموویەتی: هەر کەس لە ئوممەتی من ڕاتیبەی عەصر بکا و، لە زۆربەی کاتدا تەرکی نەکا هەتا لە دنیا دەژی گوناهی بەخشراو دەبیٚ، تەنانەت ئیمامی شافیعی (ر.خ) لە پێش مردنیا وەسیەتی کرد وتی: ئەو کەسەی من دەشۆریٚ پاش مردنم با یەکێك بیٚ کە لە درێژایی تەمەنی سوننەتی ڕاتیبەی پێش نوێژی عەصری تەرك نەکردبیٚ، کە وەفاتی کرد زانایان و پیاوچاکانی ئەو سەردەمەی میسر کۆبوونەوە کەسی وا نەبوو ئەو سوونەتەی هەرگیز تەرك نەکردبیٚ، هەتا پیرەمێردیٚ لە دەرەوەی میسرەوە هات و، فەرمووی: من ئەو سوننەتەم هەرگیز تەرك نەکردوە، ئەو هات و جەنازەکەی ئیمامی شۆرد، ئەگەر ئەو نەبووایە جەنازەکە دوادەکەوت، ئیمامی شافیعییش (ر.خ) کە ئەو وەسیەتەی کرد بە پایەی قوتبیەت گەیشتبوو لە ئالی حەزرەتە (د.خ).

---

(١) ڕای بەهێز لای شافیعی ئەوەیە کە سوننەتی موئەککەدەی پێش نیوەڕۆ دوو ڕکاتە.

دیسان لە پاش نوێژی مەغریب دوو ڕکات سوننەتە، حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی ئەو سوننەتە گورج بکەن؛ چونکە فریشتەی هەڵگری کردەوەی ئادەمیزاد لە ڕۆژدا لەسەر ئەوە ماتڵ دەبێ، هەتا نوێژی مەغریب و سوننەتەکەیشی لەگەڵ نوێژەکانی ڕۆژدا ببەن بۆ (علیین) و لەوێدا بینووسن، بەڵام ئەم پایە گەورەی سوننەتی پاش مەغریبە بەمەرجێکە کە لە پاش سەلامدانەوە لە نوێژی مەغریب هیچ قسەی دنیایی نەکا هەتا ئەو دوو ڕکاتە دەکا.

گۆڕانی جێگەی نوێژ بۆ هەموو نوێژێ سوننەتە، چ فەرزو چ سوننەت، چ ڕاتیبەی پێش نوێژ، چ ڕاتیبەی دوای نوێژ و غەیری ئەمانەش، هەتا جێگەی نوێژ زۆر بن و، لە ڕۆژی قیامەتدا هەموویان شایەتیی بۆ بدەن، دیارە ئەم جێگە گۆڕینە بە مەرجێك سوننەتە کە مانیعێ نەبێ، وەکو فەزیلەتی ڕیزی یەکەم یا مەشەققەتی دڕینی ڕیز، یا هەر هۆیەکی تر، لەم حاڵەتەدا کە شوێنی پێ ناگۆڕێ سوننەتە بەینی دوو نوێژەکە ماوەی هەبێ. وەکو قسەکردن (للنهی في حدیث مسلم عن وصل صلاة بصلاة الا بعد کلام او خروج لا سیما قبلیة الصبح، تفصل عن الفرض باضطجاع او کلام او غیر ذلك) واتە: لە حەدیسێکدا کە موسلیم باسی کردووە لە سەحیحەکەیدا نەهی کراوە، لە لکاندنی نوێژێك بە نوێژێکی ترەوە و دەبێ بە قسەیەك یا دەرچوونێك بەینیان بخرێ، بەتایبەتی ڕاتیبەی پێش نوێژی بەیانی دەبێ لە فەرزەکە جیابکرێتەوە بە پاڵکەوتنێك یا قسەیەك یا شتێکی تر. هەروەها لە بەینی نوێژی مەغریب و عیشادا نوێژی ئەووابین سوننەتە، کە شەش ڕکاتە، ئەگەر لە بەینی ئەو شەش ڕکاتەدا قسەی دنیایی نەکرا، ئەوە بە عیبادەتی دوانزە ساڵ دەنووسرێ و، تا ئەو شەش ڕکاتە تەواو دەکا فریشتە بە چوار دەوری نوێژکەرەکەدا ڕادەوەستن و دوعای خێری بۆ دەکەن. ئەم نوێژی ئەووابینە لای کەمی دوو ڕکاتە و، لای زۆری بیست.

هەندێ لە (اولیاء اللە) کە عیلمی زاهیریشیان بووە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی ئەووابینیان بە نوێژی پاراستنی ئیمان ناوبردووە بەو مەرجەی لە هەموو ڕکاتێ لەو دوو ڕکاتە جارێك سوورەتی "قەدر" بخوێنێ و، شەش یا حەوت جار سوورەتی (ئیخلاس) بخوێنێ و، (معوذتین) یەکی یەك جار بخوێنێ و، لە پاش سەلامدانەوە لەم دوو ڕکاتە سێ جار بڵێ: "اللهم سددني بالایمان واحفظه علي في حیاتي وعند وفاتي" و دە جار ئایەتی "رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ" و، پێنج جار ئایەتی "فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّي فِي الدُّنُيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ" بخوێنێ.

دوو ڕکات سوننەتی ڕاتیبەی پاش نوێژی عیشا بەقەدەر دوو ڕکات نوێژ لە شەوی (قەدر)دا خێری هەیە و، نوێژی (وتر) لە پاش ئەم سوننەتەی پاش نوێژی عیشا زۆر شەرەف و پایەی بەرزی هەیە؛ بۆیە خوای گەورە لەسەر حەزرەتی واجیب کردووە. (د.خ) و، ئیمام ئەبوو حەنیفە لای وایە کە لەسەر هەموو ئوممەت واجبە. بێگومان هەر موسوڵمانێ ئەم نوێژی وترە بکا خوای گەورە لێی ڕازی دەبێ.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە شەودا زۆر مەخەون، چونکە خەوی زۆر لە شەودا دەبێتە هۆی فەقیری و لاتی لە ڕۆژی قیامەتدا.

یەکێکی تر لە سوننەتەکان، نوێژی (تهجد) واتە: شەو نوێژە، ئەم نوێژە لای کەمی دوو ڕکاتە، بەڵام لای زۆری دیاری نەکراوە، واتە: ئەگەر بتوانێ تا سەد ڕکات یا زیاتر بکا بە نییەتی (تجهد) دروستە. نییەتی ئەم نوێژە ئەوەیە بە زمان لەگەڵ موافەقەتی دڵدا بڵێت: (نییەتمە دوو ڕکات سوننەتی شەو نوێژ بۆ خوای گەورە دەکەم "الله اکبر") یا بە عەرەبی بڵێت: (أصلی سنة صلاة التهجد رکعتین لله تعالی، الله اکبر). هەر وەختێ لە خەو خەبەری بوویەوە لە شەودا شەو نوێژ سوننەتە، بەڵام گەورەتر ئەوەیە کە لە سێ یەکی دواییی شەودا بێ ئەگەر وا بۆی ڕێك نەکەوت با لە نیوەی دووەمی شەودا بێ. دەگێڕنەوە: کە مرۆڤ نووست شەیتان سێ گرێ لەسەری دەدا، واتە: سێ کەلیمەی ناباری موافیقی ئارەزووی نەفس دەخاتە دڵیەوە و، پێی دەڵێ "بنوو"، "کاتی شەوە"، "شەو درێژە" مەبەستی ئەوەیە بەهیوای ئاسایشی لەشەوە خەوێکی درێژ بۆ خۆی مسۆگەر بکا و، خەیاڵی هەستان بۆ شەو نوێژ یا زوو هەستان بۆ نوێژی سبەینێی لە بیری خۆی بباتەوە، جا کاتێ مرۆڤ خەبەری بوویەوە کە ناوی خوای هێنا یەکێ لەو سێ گرێیانە دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت گرێی دووەم دەکرێتەوە، خۆ ئەگەر دوو ڕکات نوێژی کرد، گرێی سێیەمیش دەکرێتەوە و، سێبەری شەیتانی لەسەر هەڵدەگیرێ. جا پاش ئەوەی کە نووستەوە و لەگەڵ بانگی بەیانیدا خەبەری بوویەوە تەماشا دەکا دڵی پاك و ڕووناك و لەشی سووك و سینگی گوشادە و تەبیعەتی خۆشە و، بە ئاسانی دەڕوا بۆ دەستنوێژ و نوێژەکەی سبەینێشی دەکات و، بە پیرۆزی و بەختیاری پەرستیاری خوای گەورە دەکات، ئەمە هەمووی بەهۆی نوور و بەرەکەتی ئەو شەو نوێژەوە بوو کە بەجێی هێنا، تەنانەت ئەگەر لەشیشی ناساغ بێ بەهۆی شەو نوێژەوە ناساغییەکەی بەرە بەرە کەم دەبێتەوە، هەتا خوای گەورە بە تەواوی شیفای دەدا. بە پێچەوانەوە ئەگەر لە کاتی نووستندا بڕیاری

ئەوەی نەدا کە شەو هەستێ و شەو نوێژ بکا و سبەی زوو ئامادە ببێ بۆ نوێژی سبەینێ، ئەوە لەشی قورس دەبێ و، کە سبەی خەبەری دەبێتەوە لەو دڵ ڕووناکی و سینە گوشادی و شادمانییەی کە وتمان بێ بەش دەبێ.

براینە! پیاوچاکانی لەمەو پێش لە جێبەجێ کردنی شەو نوێژدا گەلێ ڕەغبەتیان بووە و، خوا لە سایەی پیرۆزیی شەو نوێژەوە لە گەلێ تاریکیی دینی و دنیایی پاراستوونی، واتە: لە بەڵا و دژواریی دینی و دنیایی پارێزراو بوون؛ چونکە شەو نوێژ وەکو بارانی بەهارە، ئاگری ڕق و قینی خوای گەورە لە ئوممەت دەکوژێنێتەوە. هەروەها شەو نوێژ دەبێتە کەفارەتی گوناهی خاوەنەکەی و، لە تێکەڵیی تاوان دەیپارێزێ و، دەبێتە هۆی چارکردنی تاریکی و گەرمیی گۆڕو، ئاگری دۆزەخ لە ئینسان دووردەخاتەوە؛ کەوابێ وا چاکە کاتێ کە سێ سەعات و نیو لە شەو مابێ پیاو لە خەو ڕاست بێتەوە و دەستنوێژ بگرێ و سەعات و نیوێك خەریکی نوێژ بێ و، ئیتر چەندی لە شەو دەمێنێ بخەوێت و، بە یەکێ بڵێت کە بانگی بەیانی درا خەبەری بکاتەوە، تا ماوەیەك لەسەر ئەم حاڵە دەوام بکا ئیتر خووی پێوە دەگرێ و، هەر لە خۆیەوە لە کاتی نوێژدا خەبەری دەبێتەوە.

ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی:- "أشرف امتي حفظة القرأن وأصحاب الليل" واتە: گەورەتری ئوممەتی من ئەوانەن کە قورئانیان لەبەرە و، ئەوانەن کە شەو بێدارن و شەونوێژ دەکەن.

نوێژی "ضحی" (چێشتەنگا) سوننەتە، کە لای کەمی دوو ڕکاتە. دیارە چوار ڕکات لە دوو خێری زۆرترە و هەشتیش لە چوار خێردارترە، هەروەها دوازدە ڕکات گەلێ باشترە.

جا ئەگەر مرۆڤ نوێژی سبەینێ بە جەماعەت بکا و، خۆی بە قورئان خوێندن و بیرکردنەوە لە کاروباری قیامەتەوە خەریك بکاو، قسەی دنیایی نەکا هەتا کاتی چێشتەنگا، ئەنجا دوو ڕکات سوننەتی چێشتەنگا بکا، خێری یەك حەج و یەك عەمرەی تەواوی بۆ دەنووسرێ، حەزرەت (د.خ) لە کاتی بەیانی خێری ئەو موسوڵمانەدا دووجار کەلیمەی (تام تام)ی دووبارە کردەوە هەتا بزانن کە ئەو خێری حەج و عەمرەیە بەتەواوی بۆ دەنووسرێ. بەخ بەخ لەم دەوڵەت و داراییە دینییە، کە لە هەموو ڕۆژێکدا بە سەرفی کاتێکی کەم لە خوداپەرستیدا خێری حەج و عەمرەیێکی تەواوی بۆ دەنووسرێ، بێگومان زەرەرمەند کەسێکە کە ئەم خێرە باشە لە دەستی خۆی دەربکا. ئەم دوو ڕکاتە کە لە پاش هەتاو کەوتن و بەرزبوونەوەی ڕۆژ دەکرێ و، من بە سوننەتی

چێشتەنگام دانا ئەهلی تەریقەتەکان بە نوێژی (اشراق)ی ناو دەبەن، واتە: نوێژی هەتاو دەرچوون.

براکانم! بزانن کە لە لەشی ئینساندا سیسەدو شەست جومگە هەیە و موافیقی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) هەموو کەس کە ڕۆژی لێ بوویەوە پێویستە بەرامبەر هەر جمگەیەك لەوانە خێرێك بکا، جا ئەگەر دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگا بکا لە باتی ئەو هەمووە خێرانە جێ دەگرێ. جا ئەم فەرموودەیە دوو مانای هەیە، یەکەم: ئەگەر ئەو سێسەد و شەست خێرە بکا دەبنە هۆی چارکردنی ئەو دەرد و بەلاّیانەی کە ڕوودەکەنە ئەو سێسەد و شەست جومگانەی لەش. دووەم: ئەو خێرانەی کردنی هەمووی بۆ دەنووسرێ. بە هەر حاڵ ئەم دوو ڕکاتە نوێژە، ئەم سوننەتی چێشتەنگایە جێگەی هەموو ئەو خێرانە دەگرێتەوە.

لە حەدیسی قودسیدا هاتووە: کە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! بێزار مەبە لە بەجێهێنانی چوار ڕکات نوێژ لە سەرەتای ڕۆژەوە، کە ئەو چوار ڕکاتەت کرد دەبنە کەفارەتی گوناهەکانی تر و، من کیفایەتی تۆ دەکەم، واتە: ئەوەندە خێرت بۆ دەنووسم کە بەست بێ، مەبەس لەم چوار ڕکاتە دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانییە لەگەڵ دوو ڕکات نوێژی بەیانیدا کە کیفایەتی ئینسان دەکەن بۆ کەفارەت.

ریوایەت کراوە: "الثابت في مصلاه ابلغ ممن يضرب في الافاق، او كما قال" واتە: کەسێ کە هەموو ڕۆژی لەبەر فەرمانی خوای گەورە نوێژەکەی سبەینێ و سوننەتەکەی بکات و لە شوێنەکەی خۆیدا دابنیشێت، خەریکی یادی خواو خوێندنی قورئانی پیرۆز بێ تا هەتاو دەکەوێ، ئەوە ڕزق و ڕۆزی لە لایەن خوداوە لەو کەسە زۆرتر بۆ دێ کە نوێژەکانی ناکا و، هەر لە سبەینێوە لە ماڵی خۆدەردەچێ، بەئەملاو ئەولای دنیادا دەسووڕێتەوە لە پێناوی ڕۆزی پەیداکردندا.

ریوایەت کراوە: سێ شت لەگەڵ سێ شتدا کۆنابنەوە: گوناه لەگەڵ تەوبەو پەشیمانیدا، دەوڵەمەندی لەگەڵ زیناکردندا، گەدایی دنیا لەگەڵ نوێژی چێشتەنگادا.

دوو ڕکات (تحية المسجد) واتە: نوێژی دیاریی مزگەوت سوننەتە، یانی: کاتێك ئینسان ڕۆیشتە ناو مزگەوتەوە سوننەتە دوو ڕکات نوێژ بکا بەنییەتی دیاریی مزگەوت. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: دەترسم ئوممەتی من بگەنە پایەیەك لە غەفڵەت و بێ ئاگایی لە دین کە چوونە ناو مزگەوتەوە نوێژی (تحية المسجد) نەکەن.

هەروەها چوار ڕكات (صلاة التسبيح) سوننەتە، حەزرەت (د.خ) ئەم نوێژەی بە عەباسی مامی نیشان داو، پێی فەرموو: مامی خۆم! دەتەوێ نوێژێکت فێر بکەم هەر کاتێ بیکەی ببێتە کەفارەتی گوناهی بەرودواو کۆن و تازە و بچووك و گەورە و عەمد و خەتا و ئاشکرا و پەنامەکی و، خوای گەورە لەو گوناهانە عەفوت بکات؟ ئەی مامی خۆم! هەموو ڕۆژێ ئەو نوێژە بکەی باشە، ئەگەر بۆت نەکرا هەموو جومعەیەك، ئەگەر بۆت نەکرا هەموو مانگێ، ئەگەر بۆت نەکرا هەموو ساڵێ، هەر ئەگەر بۆت نەکرا لە عومری خۆتا جارێك. جا سەیر بکەن کە حەزرەت (د.خ) چەندێ بەتەنگی ئەو نوێژەوە بووە و، چەندی مەبەست بووە کە عەباسی مامی خێری ئەو نوێژەی لە کیس نەچێ با یەك جاریش بیکا لە عومری خۆیدا.

براکانم! بزانن هەر عیبادەتێ کە حەزرەت (د.خ) فەرموویێتی دەبێتە کەفارەتی گوناهەکان بەو مەرجەیە کە گوناهەکان بچووك بن و لە گوناهە گەورەکان نەبن، بەڵام بۆ ئەم (صلاة التسبيح)ە بە سەراحەت فەرموویەتی: دەبێتە کەفارەتی گوناهی گەورە و بچووك و، پارێزکردنی لە کەبیرە نەکردووەتە مەرج؛ بۆیە شێخ ئەحمەدی (ابن حجر) فەرموویەتی: لە پاش بیستنی چاکە و پایە و خێری ئەم (صلاة التسبيح)ە. هەر کەس تەرکی بکا مەعنای وایە کە سست و بێ موبالاتە بە دینی خۆی.

ئەی خۆشەویستەکان! بزانن: لەبەر ئەوە من دەربارەی چاکە و خێر و ئاداب و موبتیلاتی نوێژ ئەم هەمووە نامەیەم نووسی کە لە باسی هیچ عیبادەتێکی ترا نەمنووسیوە، چونکە نوێژ لە گەورەترین عیبادەتی بەدەنییە، هیچ عیبادەتێ بەقەدەر نوێژ جۆر و بەشی نییە.

هەروەها یەکێك لە سوننەتەکان سوننەتی دەستنوێژە، کە دوو ڕکاتە و زۆرە، ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "من توضأ نحو وضوئي ثم ركع ركعتين لا يحدث فيهما نفسه الا بخير غفر له ما تقدم من ذنبه وما تأخر" واتە: کەسێ دەستنوێژ بگرێ وەك ئەو دەستنوێژەی من و، دوو ڕکات نوێژ بکا و، لە نوێژەکەیدا لەگەڵ نەفسی خۆیدا تەنیا قسەی خێر بکا، خوای گەورە لە گوناهی پێش ئەو دەستنوێژەی خۆش دەبێ. سوننەتە لە ڕکاتی یەکەمدا پاش سوورەتی فاتیحە ئەم ئایەتە بخوێنێ: "وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّاباً رَّحِيماً" وە لە ڕکاتی دووەمدا ئەم ئایەتە بخوێنی "وَمَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً".

سوننەتی تەوبەش یەکێکە لە نوێژە سوننەتەکان؛ حەزرەت (د.خ) بەشێوەی وەسیەت بۆ ئوممەتی خۆی فەرموویەتی: هەر کەس لە قەزاو قەدەر گوناهێکی گەورەی کرد و پەشیمان بووەوە لەو گوناهە، دوو ڕکات (صلاة التوبة) بکا بە هیوای عەفووی خوای گەورە، ئومێدە خوای گەورە لێی قبووڵ بکات و لەو گوناهەی ببوورێ. نوێژی ئیستیخارەیش سوننەتە؛ حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر کاتێ کارێکی دینی یا دنیاییتان هاتە بەردەم نوێژی ئیستیخارە بکەن. هەر کەس ئەم نوێژە بکا دەبێتە نیشانەی بەختیاری بۆی و، هەر کەس نەیکا ئەو نەکردنە نیشانەی بەدبەختییەتی.

یەکێکی تر لە نوێژە سوننەتەکان نوێژی سووککردنی گرانیی کاتی گیانەڵایە، جەلالەدینی سیووتی (ر.خ) دەگێڕێتەوە: هەر کەسێ دوو ڕکات نوێژ بکات لە بەینی نوێژی مەغریب و نوێژی عیشاداو، لە هەر ڕکاتێکدا پێنج جار سوورەتی (زلزال) بخوێنێ پاش سوورەتی فاتیحە، ئەوە لە کاتی سەرەمەرگدا گیانی بەئاسانی دەردەچێ و سزای گۆڕی سووك دەبێ و تێپەڕینی لەسەر پردەکەی ڕۆژی قیامەت ئاسان دەبێ.

یەکێکی تر لە نوێژە سوننەتەکان نوێژی پاراستنی ئیمانە، ئەم نوێژە وەك لە نامەی عیبادەتدا نووسیم زۆر بەسوودە.

یەکێکی تر نوێژی دۆزینەوەی شتی گومبووە، واتە ئەو کەسەی کە ماڵ یا شتێکی بەنرخ گوم بکا دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکا بەنیازی دەستکەوتنەوەی ئەو شتە گوم بووەو، لە پاش سەلامدانەوە سێ جار بڵێ: "اللهم هادي الضال وراد الضالة! اردد علي ضالتك بعزتك وسلطانك فانها من عطائك وفضلك" بەڵام پێویستە گەلێ جار ئەم نوێژە و ئەم دوعایە دووبارە بکاتەوە تا ئەو شتەی دەست دەکەوێتەوە.

یەکێکی تر نوێژی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزە. لە ئیمام عەلییەوە (ر.خ) ڕیوایەت کراوە: کە ڕۆژێ لای حەزرەت سکاڵای بێ حافیزەیی خۆی کرد بۆ ئەو شتانەی کە دەیانکاتەبەر، حەزرەت (د.خ) ئەمری فەرموو کە چوار ڕکات نوێژ بکات لە شەوی جومعەدا بەنیازی بەهێزبوونی حافیزە، ئەم نوێژە بە دوو سەلامدانەوە دەکرێ، واتە: هەر دوو ڕکاتی بە سەلامێك، لە ڕکاتی یەکەمدا پاش سوورەتی فاتیحە سوورەتی (یاسین)و، لە ڕکاتی دووەمدا (حامیمی دوخان)و، لە ڕکاتی سێیەمدا (الم سجده)ەو، لە ڕکاتی چوارەمدا سوورەتی (مولك) بخوێنێ و، پاش سەلامدانەوەش ئەو حەمد و سەناو تەسبیحات و سەڵەواتە کە لە پاش (صلاة الحاجة)وە دەخوێنران بخوێنێ و، لە پاشان

ئەم دوعایە بخوێنێ: "اللهم ارحمني بترك المعاصي ما ابقيتني وان اتكلف مالا يعنيني، وارزقني حسن النظر فيما يرضيك عني...، اللهم بديع السماوات والارض، ذا الجلال والاكرام والعزة التي لاترام، اسألك يا الله يا رحمان يا رحيم! بجلال وجهك ان تنور بكتابك بصري، وان تطلق به لساني، وان تفرج به قلبي وان تشرح به صدري، وان تستعمل به بدني، فانه لا يعينني على الحق غيرك، ولا يؤتيه الا انت، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم. هەر نوێژێ کە لە شەرعەکاندا کەم بێ بەدرێژی عەرزم کردن و، ئەوەی لە کتێبەکانی تردا زۆر باس کراون تەرکم کردن. یەکێکی تر لە نوێژە سوننەتەکان (صلاة القبور)ە، کە بریتییە لە دوو ڕکات نوێژ لە شەوی جومعەدا لە کاتی شەو نوێژدا، لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی (کافروون) و، لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (ئیخلاس) بخوێنێ و، لە پاش سەلامدانەوە خێری ئەم نوێژە بنێرێ بۆ گیانی پاکی حەزرەت (د.خ) و بۆ گیانی باوك و دایكی و هەر کەس لە مردووانی خۆی، درێژیی ئەم نوێژە لە باسی ئازاردانی دایك و باوکدا باس دەکەین.

هەندێ لە ئەولیای تەریقەتەکان چەند جۆرە نوێژێکیان ڕیوایەت کردووە، لەبەر ئەوە کە ئیسنادەکانیان لاواز بووە زانایانی شەریعەت لێیان وەرنەگرتوون؛ لەبەر ئەمە ئەو کەسەی ئەو نوێژانە بکا نییەتی سوننەتی موتڵەقیان لێ بهێنێ، هەتا لە لای زانایانی ئاینیش دروست بن و دابمەزرێن. ئەو کەسانەی ئەو نوێژانە دەکەن با ئەو ئادابە جێبەجێ بکەن کە ئەولیاکان فەرموویانە؛ هیوادارین ئەو مەقسوودەی بۆیان دەکرێن بێنەدی.

یەکێکی تر لە نوێژە سوننەتەکان نوێژی (استعاذه)یە، واتە: نوێژی بەخوا پەناگرتن لە فیتنەی شەیتان و خراپەکارانی ئینس و جن. ئەم نوێژە دوو ڕکاتە، لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی (فلق) و، لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (ناس) بخوێنرێ و، لە پاش سەلامدانەوە ئەم دوعایە بخوێنرێ: "اللهم اني اعوذ بك وباسمك الاعظم وكلماتك التامة من شر كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة. واعوذ بك وباسمك الاعظم وكلماتك التامات من شر (فلان وفلان... الخ)" و ناوی ئەو کەسانە بهێنێ کە بە نەیار و دوژمنیان دەزانێ، "واعوذ بك وباسمك الاعظم وبكلماتك التامات من سوء الخاتمة وسوء خاتمة كل اموري ومن عذاب القبر والحشر، واعوذ بك من شر ما يجري به الليل والنهار، ان ربي على صراط مستقيم، لا اله الا هو عليه توكلت وهو رب العرش العظيم"

یەکێکی تر لەو نوێژانە نوێژی [استحباب]ە، واتە: نوێژێ بۆ ئەوە دەکرێ کە یەکێك

نوێژەکەرەکەی خۆش بوێ چ بۆ ئەوەی قازانجی پێ بگەیەنێ، یا بۆ ئەوەی لە شەڕی پارێزراو بێ. ئەم نوێژە دوو ڕکاتە و، لە پاش سوورەتی فاتیحە لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی (واقعه) و، لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (اعلی) دەخوێنرێ، ئەم نوێژە زۆر بەسوودە، لە پاش سەلامدانەوە زۆر سەڵەوات لەسەر حەزرەتی پێغەمبەر بدا (د.خ) و لە نێو سەڵەواتەکانیدا با ئەم سەڵەواتەیش بخوێنێ: "اللهم صل وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه صلاة تكون لك رضاء ولحقه وحق اصحابه اداء ولقلبى من عدم محبة لائقة بعزتك وبرسولك شفاء، اللهم اجعل حبك احب الاشياء الي، وخشيتك اخوف الاشياء عندي، اللهم اذا اقررت عيون اهل الدنيا بدنياهم فأقر عيني برضائي لك ربا وبرسولك نبياً وبالتوفيق على طاعتك متلذذا بها، واقطع عني لذائذ الدنيا بالنسك والشوق الى لقائك، واجعل طاعتك في كل شيىء مني. اللهم ارزقني حبك وحب من تحبه وحب عمل يقربني الى حبك ورضاك واجعل اخلاصك احب الي من كل شيىء سواك يا ذا الجلال والاكرام، اللهم يا ودود، انت الذى اعلنت سر المحبة والمودة في قلوب اهل الاسرار، وانت الذي اكملت ذوات الطالبين بنور النوار وتجليت بالعز والنور القائم على الارواح فالفت الاشباح، اللهم يسر ودك وسريان حبك في قلوب اصفيائك وانبيائك. أسألك ان تلقي اخلاصك في قلبي، ثم تلقي ودي ومحبتي في قلب حبيبك محمد صلى الله عليه وسلم والسلام، كما القيت الوحي في قلب حبيبك محمد صلى الله عليه وسلم فالق حبي في قلبه وارضه عني، اللهم ثم سخر لي روحانية اسم فلان و فلان باسمك الاعظم وسائر الاسماء الحسنى وبحق حبيبك صاحب الامة، انك على كل شيىء قدير. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله واصحابه أجمعين آمين يارب العالمين.

یەکێکی تر لەو نوێژە سوننەتانە نوێژی شوکر و سوپاسە بۆ خوا، ئەم نوێژە دوو ڕکاتە، لە ڕکاتی یەکەم و دووەمدا لە پاش فاتیحە یەکجار ئایەتی "لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ " یەك جاریش سوورەتی (كوثر)و سێ جار سوورەتی (اخلاص) بخوێنێ و، لە پاش سەلامدانەوە ئەم دوعایە بخوێنێ: "الحمد لله على حلمه بعد علمه، وعلى عفوه بعد قدرته... اللهم اني احمدك واشكرك واثني عليك حمدا وشكرا وثناء يملأ الكون كله على ما اوليتني من النعم التي لا احصيها ولا استحقها الا بفضلك وكرمك، وعلى ما صرفت عني من النقم التي استحقها، صرفتها عني بفضلك وكرمك. اللهم لك الحمد حمدا كثيرا خالدا مع خلودك، ولك الحمد حمدا لا منتهى له دون عملك. ولك الحمد حمدا لا منتهى دون مشيئتك، ولك الحمد حمدا لا اجر لقائله الا رضاك، ولك الحمد عند كل

طرفة عين واقل من ذلك وتنفس كل ذي نفس واقل من ذلك، وارجو رحمتك فلا تكلني الى غيرك طرفة عين ولا أقل من ذلك. واصلح لي شأني كله بلا اله الا انت وحدك لا شريك لك، تب علي واغفر لي. اللهم لك الحمد واليك المشتكى وانت المستعان، وانت المستغاث، وعليك التكلان، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم".

ئەی خۆشەویستەکانم! بەوەدا کە داوای بەیانکردنی سوننەتەکانتان کردبوو، بۆم دەرکەوت کە چاکەویست و خێرخواهن؛ لەبەر ئەوە بەپێویستم زانی ئەو کردەوەیە کە لە حەدیسی پیرۆزدا بە (افضل) حسێب کراوە بەکورتی عەرزتان بکەم: لە پێش هەموو شتێکدا بزانن لە تاعەتدا ئەوەی کە واجیب بێ، وەکو نوێژی فەرز و ڕۆژوو و حەج و عەمرە و شتی تر، بەجێهێنانی خێری زۆرترە لە تاعەتی سوننەت. هەروەها شتێ کە حەرام بێ، وەك شەراب خواردن، دزی، بە هەرجۆر زیان بە خەڵك گەیاندن، نەکردنی خێری زۆرترە لە نەکردنی شتی (مکروه). پوختەی قسە: بەجێهێنانی واجیب و نەکردنی شتی حەرام خێر و سەوابیان لە هەموو کردەوەیەکی تر زۆرترە. بەڵێ کردنی واجیبەکان لە ناو خۆیاندا هەندێکیان لە هەندێکیان سەوابیان زۆرترە، هەروەها نەکردنی حەرامەکان هەندێکیان لە هەندێکیان سەوابیان زۆرترە. پاش ئەمانە ئەوەی کە بە سوننەت دانراوە و، لە فەرموودەی پێغەمبەردا بە (افضل) ناوبراوە، خێری لە سوننەتەکانی تر زۆرترە و، زۆرن و ژمارەیان ئاسان نییە.

لێرەدا دەرکەوت: مەبەس لەو کردەوەیە کە لە فەرموودەی حەزرەتدا (د.خ) بە (افضل) دانراوە ئەوەیە لە ناو ئەو تاعەتانە کە فەزلیان هەیە ئەوەیان (افضل)ەو (فضل)ی زۆرترە و، تەفسیل دانی مەوقووفە لەسەر بەیانی حەزرەت (د.خ) یا ئیستنبات و ئیستیراجی زانایانی ئاین بۆ ئەندازەی (فضل)و فەرق خستنیان لە بەینی کردەوەکاندا. بەلام بێ یەك و دوو لەناو هەموو خاوەن (فضل)ێکدا (معرفة الله) لە هەموو خاوەن (فضل)ێ گەورەترە، واتە: باوەڕکردن بە زاتی خوا و سیفەتەکانی خوا، ئەوانەی واجیبن بۆی و ئەوانەی محاڵن بۆی و، ئەو سیفەتانەی کە جائیزە ببن یا نەبن وەکو لە نامەی بیروباوەڕدا باسمان کرد. ئەمجار چاکترین کردەوە حەجی مەبروورە، واتە: ئەو حەجەی لەگەڵ شتی ناڕەوا تێکەڵ نەبوویێ و، هەموو ڕوکن و مەرج و ئادابی بەجێ هاتبێ، ئەمجار نوێژ لە سەرەتای وەختدا بە جەماعەت لەگەڵ ڕاوەستانی درێژ و لە خواترسی و ملکەچ کردن و ئاگاداریی دڵدا. پاش ئەمە ئەمر بە مەعرووف و ڕێگرتن لە خراپە و، جیهاد و، خزمەتکردنی دایك و باوك و دڵخۆش کردنی موسڵمانان و، ڕزگار کردنیان لە

قـەرزاری و، بـەجـێـهـێـنـانـی پـێـویـسـتـیـیـان. ئـەگـەر خـوا مـەیـلـی لـێ بـێ ئـەمـانـە لـە نـامـەی (جـێـبـەجـێ کـردنـی پـێـویـسـتـیـی مـوسـڵـمـانـان)دا بـاس دەکـەیـن، پـاش ئـەمـانـە نـانـدان بـە موسڵمانان، کە ئەمەش لە نامەی (سەخاوەت)دا بەیاد دەکەین. هەروەها گفتوگۆی شیرین و قسەی خۆش و نەرم لەگەڵ موسڵماناندا، چاوپۆشی و لێبووردن و خۆش خوویی لە گەڵیاندا؛ چونکە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: "الا ان حسن الخلق من اخلاق الله تعالی..." پاش ئەمانە سیلەی رەحم، واتە: بەجێهێنانی پێویستیی خزمایەتی بە وتار و بە کردەوە و بە ماڵ؛ چونکە ڕێگەی ڕەحم بڕین گوناهێکی گەورەیە، هەروەها گوزەشت کردن و بووردن لەو کەسانە کە نامەردییان لە گەڵتا کردووە، بەخشش بەو کەسانەی کە موحتاجی تۆن. ئەم بەخششە لە گەورەترین سەدەقاتە. ئەنجا دوورکەوتنەوە لە هەر شتێ کە حەرام بێ. هەروەها جیهاد و خوێن ڕژاندن لە ڕێگای خوادا، واتە: بۆ بەرزکردنەوەی کەلیمەی (توحید) و ئاینی پیرۆزی ئیسلام، چ دوژمنی ئاین بکوژی و چ دوژمنی ئاین بتکوژێ، هەروەها قوربانی کردن بە سەربڕینی هەر حەیوانێ کە زوو دڵت پێوەندیی پێوە هەبێ، وەکو مەڕ و بزن و گاو مانگای باش، چ سەریان ببڕی و، چ بیانبەخشی.

لە فەرموودەی حەزرەتدا هەیە: "افضل القراء الحال المرتحل" او کما قال." هاوڕێیەکانی عەرزیان کرد: (حاڵ) و (مرتحل) کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە کە قورئانی خەتم کردو گەیشتە دوایی گورج بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای قورئان و، لە وێوە دەست بکاتەوە بە خوێندنی.

زیکرو تەسبیح و تەهلیلە لە حەسەناتن. باسی ئەمانەم لە نامەیەکدا بۆ نووسیون. خێر کردن و ڕۆژووگرتن و بەندە ئازادکردن لە گەورەترین جۆرەکانی تاعەتە و باشترینی ئەوەیە بەندەی گران بەها ئازاد بکا. هەروەها کۆمەکیی موسڵمانان و چاکەکردن لەگەڵیاندا کردەوەی چاکن و خێریان زۆرە.

ئەوانەی کە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بە (فضل) ناوی بردوون ئەمانە بوون کە عەرزم کردن. والسلام علی من استمع الحق واتبعه.

نامەی حەڤدەیەم

## باسی ئاین فێرکردنی منالّە

بسم الله الرحمن الرحيم

بسم الله. والحمد لله. والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه الهداة الى دين الله.

وبعد! ئەی موسوڵمانە خاوەن بیروباوەڕە تەواوەکان! ڕەحم بە منالّی بچووکی خۆتان بکەن، ڕەحم بە ژێردەستەکانتان و برادەرانتان بکەن هەتا سەوابی زۆرتان دەست بکەوێ. خۆشەویستەکانم! بە نەسسی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ئەم نامەی منە لە هەموو دیارییەکی دنیایی باشترو بەسوودترە، تەنانەت لە دیاریی پاشا بۆ پاشا قازانجی زۆرترە؛ چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "ما اهدى مسلم لاخيه هدية افضل من كلمة يزيده الله بها هدى او يرده عن ردى" هەروەها حەزرەتی عومەر (ر.خ) هەموو کاتێ لە هاوڕێیەکانی پێغەمبەری دەپرسی (د.خ): عەیبم چییە پێم بلّێن، وە دەیفەرموو: "رحم الله امرء اهدى الي عيوبي" جا دەیفەرموو: ئەم جۆرە دۆستانە زۆر کەم و نایابن.

براکانم! بۆ خاتری ڕەزای خوا و پێغەمبەری خوا هەر کەس پەیوەندیی پێتانەوە هەیە، وەکو کوڕتان، کچتان، کوڕەزاو کچەزاتان، خوشکەزاتان، منالّی برادەران و دۆستانتان، هەتا منالّن و نەکەوتوونەتە ناو دنیا و کاروباری ژیانەوە، بە خۆتان یا بەهۆی زانایێکەوە ئادابی دین و قورئانی پیرۆزیان فێر بکەن و، بە هەموو جۆرێ لەم بارەوە هەوڵ بدەن و، هەرچەند ئەو منالانەش لە فێربوونی ئەو ئادابانە نەفرەت بکەن و لەسەر شانیان گران بێ، ئێوە هەرگیز لەم کارە پیرۆزە بەسوودە کۆڵ مەدەن و، لەبەر خاتری خوای گەورە خەریکی بن.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "علموا اولادكم سنتى وان كرهوا" واتە: ڕەفتار و گوفتاری من بە منالّەکانتان بلّێن و فێریان بکەن، هەرچەندە ئەو مندالانە پێیان ناخۆش بێ و لەسەر دلّیان گران بێ. بێگومان هەرکەس لە ئێوە کەموکورتی بکا

له فێرکردنی ئادابی ئایندا به منداڵانی موسڵمان ئەوە خەسارەتمەندە، هەرکەس لە وەرگرتنی تەعلیماتی ئاین عاجز و ماندوو بێ و لەسەر دڵی گران بێ، ئەوە باوەڕی بێ هێزە، چونکە لە حەدیثی پیرۆزی پێغەمبەردا هاتووە: کە گەورەترین خووڕەوشتی مرۆڤی موسڵمان ئەوەیە کە لە بیستنی کاروباری ئاینی هەرگیز تێر نەبێ. با ئەو کەسەی کە فێرکردنی ئاینی لەسەر شان گرانە بگری بۆ خۆی و، خۆی بە زیان لێکەوتوو بزانێ.

بە تایبەتی لە ناو هەموو ئادابی ئایندا ناسینی خوای گەورە و ناسینی پێغەمبەر و زانینی ئادابی نوێژی جەماعەت و نوێژی بەتەنیا زۆر مهمە، بۆیە ئەم شتانە زۆر بەبایەخەوە سەیر کراون.

ئێوە بیربکەنەوە هەر کەس لە ئێوە پیشەیەکی هەبێ ئەولادەکانتان فێری ئەو پیشەیە دەکەن، هەتا لە پاشەڕۆژدا بژین، ئەی بۆچی بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەگەر ئەولادەکانتان فێری ئادابی ئاین نەبن و بە عیبادەتەوە خوونەگرن لە پاشەڕۆژدا تەرکی هەموو ئادابی ئاین دەکەن و، گیرۆدەی سزای ڕۆژی قیامەت دەبن لەگەڵ ئەوەشدا کە دنیا ماوەی کورتە و دەبڕێتەوە و قیامەتیش هەرگیز نابڕێتەوە و، زۆرتر لە دنیا پێویستە بە گوێپێدان و تەماشاکردن. فەرموودەی حەزرەتە (د.خ): "ما مثل الدنيا في الآخرة الا كما يغمس احدكم اصبعه في البحر فانظر بم يرجع؟" واتە: نرخی دنیا لە چاو نرخی قیامەتدا وەکو ئەوەیە پەنجەیەك بکەیت بە دەریایەکدا و، دەری بێنیتەوە، تەماشا بکە ئەو پەنجەیە چەندێ لە ئاوی دەریاکە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە دەرەوە، دیارە ئەو ئاوە کە بە پەنجەکەوە دێتە دەرەوە شتێکی زۆر کەم و بێ بایەخە لە چاو دەریاکەدا، دنیاش لە چاو قیامەتدا وەها کەم و بێ نرخەو، بۆ ئەوە ناشێ کە ئینسان خۆی بۆ تەرخان بکا و خۆی بۆ ماندوو بکا.

براینە! ئەو گیانلەبەرانەی کە پێویستمان بە فێرکردنیان هەیە بۆئەوەی سوودیان لێ وەربگرین، پێویستە هەر بە منالّی و بچووکی ڕایان بهێنین و فێریان بکەین ئەگەرنا کاتێ گەورە بوون سوودیان لێ وەرناگیرێ؛ مەبەستم ئەوەیە بەقەدەر ئەو گیانلەبەرانە نرخ و بایەخ بۆ منالّەکانتان دابنێن و بۆ فێرکردن و تالیمدانیان تێ بکۆشن، هەتا لە پێویستەکانی سەر شانی خۆیان ئاگادار بن و، فەرز و سوننەتی خۆیان بزانن، لە دنیادا بە بەختیاری بژین و لە قیامەتدا بە سەربەرزی زیندوو ببنەوە. خۆشەویستەکانم! من لەم نامە بچووکەدا کەمێك لە ڕوکنەکانی ئیسلام و لقەکانی ئیمانتان پێ ڕادەگەیێنم و، کەمێ لە گەورەیی قورئانتان بۆ دەنووسم بە هیوای ئەوەی خوای گەورە لە قیامەتدا پایە

و پاداشی گەورەمان بۆ دابنێ. پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: "اذا حمل رجل كلمة من الله الى اخيه المسلم كان له خيرا من حجة وعمرة ومن عبادة سنة" واتە: یەکێ فەرموودەیەکی خوای گەورە ببات بۆ برای ئاینی و تێبیگەیەنێ بۆ ئەوەی بیکا بە بیروباوەڕ بۆی و لەسەری دای مەزرێنێ، تا ڕەفتاری پێ بکا، ئەوە پاداشی زۆرترە لە حەجێك و عومرەییەك و خواپەرستیی ساڵێك؛ چونکە زانیاری بە خەڵك گەیاندن خێرێکی بەردەوامە، شەخسەکە کە فێری دەبێ خۆی ڕەفتاری پێ دەکات و، هەر کەسیش لەوەوە فێری ببێ ڕەفتارێ پێ دەکا، هەروەها هەتا خوا مەیلی لەسەر بێ.

جا من بۆیە ئەمانەتان بۆ باس دەکەم هەتا برادەران هۆگری ئەم قازانجە بێ نیهایەتە بن بۆ خۆیان و بۆ ئەولادیان و بۆ نەوەیان. منداڵەکانتان فێر بکەن بەوەی کە هەرچی عالەم هەیە، عەرش و کورسی و هەر حەوت تەبەقەی ئاسمان و هەموو عەردو، بەهەشت و دۆزەخ و هەرچی لە نێو ئەواندا هەیە هەمووی خوا دروستی کردوون و، لە نەبوونەوە دەری کردوون بۆ بوون. هەروەکو دروستی کردوون بە هەموویان دەزانێ و، لە کەموزۆریان ئاگادارە و، هەموو لە ژێر زانین و ئاگاداریی خوادان و، خودای گەورە ئاگای لە جموجۆڵ و دامرکان و ئارامگرتنیان هەیە، ئاگای لە کردار و گفتار و هەناسە و خەیاڵاتی دەروونیانە، ئاگادارە لە هەرشتێ کە لە دڵی ئەواندایە، تەنانەت هەتا خوای گەورە هەناسە و جووڵانەوەی ئەوان دروست نەکا بۆیان پەیدا نابێ.

زانایەك کتێبێ دادەنێ لەو شتانە ئاگادارە کە لەو کتێبەدا نووسیویە؛ بێگومان خوای گەورە چاکتر لە جیهان ئاگادارەو، زانینی بە هەموو جیهاندا دەگات، چونکە زانینی خوا لەگەڵ زانینی یەکێك کە ئەو دروستی کردبێ، هەرگیز بەراورد ناکرێ. هەر گیایەك، هەر زەرەیەك لە نێو ڕووبارێکدا، یا لە دەریایەکدا، لە زەوی یا لە ئاسمان یا لە هەوادا هەموو ئەمانە بەچارێ لەبەر تیشکی زانینی خوادا ڕوون و ئاشکران و، هەرگیز نابێ بەقەدەر زەرەیەك شت هەبێ لە عیلمی خودادا نەبێ.

هەر ڕزق و ڕۆزی یەك بۆ هەر گیانلەبەرێ هەبێ، لە کەم هەتا زۆر، لە حەڵاڵ و حەرام، هەموو خاوەن هەناسەییەکە، هەر ڕۆزییەکی بۆ هەر نەوعێ بڕیارداوە، جۆرە تام و لەزەتێکی تێدا داناوە، هەتا ئەو خاوەن ڕۆزییە سوودی لێ وەربگرێ، هەموو خاوەن ڕۆزییەك بە ڕۆزیی خۆی دەگا و، کەس ناتوانێ ڕۆزیی کەس بخوا. تەنانەت بۆ هەموو دارو گیایەك ڕزقێك بڕیاردراوە. لە ئاو و غەیری ئاو، دیارە کاتێ ئەو ڕزقەی لێ بڕا وشك

دەبێت. هەروەها بۆ هەر جۆرێك لەوانە زیکر و تەسبیحێکی داناوە کە مانەوەی ئەو شتە لەسەر ئەو زیکر و تەسبیحە و هەر کاتێ ئەو زیکرەی نەما وشك دەبێ و، تا ئەو ذیکر و یادەی هەبێ کەس ناتوانێ بیبڕێ و هەرگیز وشك نابێ. ئا بەم جۆرە گەورەیی و پایە بەرزیی زیکری خودای گەورە دەردەکەوێ.

خوای گەورە هەرچی بیەوێ دەتوانێ بیکات و، هەر خوا دەتوانێ بەبێ سوود یا زیان بگەیەنێ بە هەر کەس و بە هەر شت و کەس ناتوانێ بە بێ خواستی خوا سوود بەکەس بگەیەنێ و زیان لە کەس بدا. هەموو جیهان ناتوانن باڵی مێشوولەیەك دروست بکەن و، بە بێ خواستی خوا و توانای ناتوانن باڵی مێشوولەیەك هەڵبکەنن.

خوای گەورە بێ وێنە و بێ هاوبەشە، واتە: هەر چەند ئینسان بیربکاتەوە کە خوا ئەمەیە یا ئەوەیە، ئەو بیرە بێ سوودە و بە خوا ناگات، چونکە بیروخەیاڵی تەنیا پێوەندیی بە جیسم و جیسمانییەوە هەیە و، هەر چی جیسمانی بێ دروست کراوە و لاوازە و خوا دوورە لەوانەوە. هەر لەبەر ئەمەیە زاناکان فەرموویانە :"کل ما خطر ببالك فالله بخلاف ذلك" واتە: هەرچی بەدڵتدا ڕادەبووڕێ، خوای گەورە ئەوە نییە.

خوا (قەدیم و باقی)یە، واتە: هەربووە و هەر دەبێ و دەمێنێتەوە و ئەو هەموو گیانلەبەرێ دەمرێنێ و، کەس ناتوانێ ئەو بمرێنێ. خوای گەورە (مەکانی نییە) واتە: جێگیر نییە لە شوێنێکدا، بەڵکو هەرچی کەون و مەکان هەیە، وەکو عەرد و ئاسمان، بە قودرەت و توانای ئەو ڕاوەستاوە، بە بێ ئەوەی لە جێگەیەکدا بێ یا لەسەر کۆڵەکەیەك ڕاوەستابێت، کەواتە مادام هەرچی جێگە و مەکانێ هەبێ خوا دروستی کردووە، سەیر نییە بڵێین: خوا جێگەو مەکانی نییە و نایەوێ؛ چونکە ئیحتیاجی تێکرا، نیشانە و سیفەتی داماوی و بێ هێزییە و، خوای گەورەش بە هیچ شت نیازمەند نییە و، بۆ هیچ شت دانەماوەو بەسەر هەموو شتێکدا دەستی دەڕوا، کەوابێ جیگەی ناوێ. هەرچی وا لە ئاسمان و عەرد و دەریا و ڕووبااردا هەموو خوا دروستی کردوون و ئاگاشی لە هەموویان هەیە و، لە هیچ شوێنێکدا نییە، ئەوەی کە خەڵك لە کاتی پاڕانەوە و نزادا دەست و ڕوو لە عاسمان بەرز دەکەنەوە مەعنای ئەوە نییە کە خوای گەورە لە عاسماندایە، خوای گەورە لە هیچ شوێنێکدا جێگیر نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەمری خوا و وەحی لە جیهانی مەلەکووتەوە دێ بۆ عەرد بۆ لای پێغەمبەران (د.خ)، هەروەها هەرچی خێرات پەیدا دەبێ وەکو با و باران و هەتاو، ئەو شتانەی کە هۆی ئاسایشی ئەهلی سەرعەردن،

لە لای بەرزییەوە دادەبەزێ و، بە بیروباوەڕی مرۆڤ بەرزی موناسبە بۆ پایەی خوای گەورە، واتە: بەپێی نەریت و عادەت بەرزی بۆ گەورەیە و نزمی بۆ بچووکە، ئەگینا خوای گەورە لە هەموو جێگەیەکدا حازرە و، پێویستی بە جێگە نییە، ئەی لە پێش دروستکردنی عەرش و کورسی و ئاسمان و زەویدا، لەو کاتەدا کە هیچ مەکانێکی دروست نەکردبوو، لە کوێ بوو؟ دیارە لە بناغەدا خوای گەورە پێویستی بە شوێن نەبووەو ئیستە و لەمەو پاشیش پێویستی پێی نییە.

لە لایەکی ترەوە عالەمی ئاسمان پاکە لە تاوان و تاوانباران و، ئەوانەی لە ئاسماندان بەقەدەر تۆزقاڵێك بێ گوێیی و نافەرمانیی خوای گەورە ناکەن، هەروەکو خوا دەربارەی فریشتەکان دەفەرموێ: "لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ" ئەم ئایەتە پیرۆزە دروشمی گەردەنکەچیی ئەوانە.

خوای گەورە بە هەموو شتێك دەزانێ و، تۆزقاڵێکی لێ ون نابێ. ئێمە کە بەندەیەکی بێ هێزین ئاگامان لە موڵك و ماڵی خۆمان هەیە، ئیتر چۆن خوای پەروەردگاری جیهان، ئاگای لەو شتانە نابێ کە خۆی دروستی کردوون؟ بێ زانیاری و بێ ئاگایی خەوش و کەمییە و بۆ پایەی خوای گەورە ناشێ.

خودای گەورە (قیوم) و ڕاگری جیهانە و، هەموو ئەرواح و ئەشباح و هەموو گیان و گیانداریێ خۆیان و پێوەندییان هەموو بە هێزی توانایی خوا ڕاگیراون و ڕاگیر دەبن و دەپارێزرێن.

خوا مالیك و خاوەنە ئێمە مەملووکین، بە گوێ کردن و فەرمانبەرداری لەسەر شانمان واجبە، پێویستە هەموو کات ئامادە و ملکەچ بین بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی ئەو خوای پەروەردگارە.

پێویستە بزانین: پێغەمبەری ئێمە، واتە: ئەو کەسەی کە خوا کردوویە بە ڕەهبەری ئێمە و، لە لایەن خواوە ئەمری پێ کراوە ڕاهنموونیمان بکا، ناوی (محەمەد)ە (د.خ) لە نەتەوەی عەرەبە و لە هۆزی قورەیشە، باوکی ناوی عەبدوڵڵایە و، دایکی ناوی (ئامینە)یەو، باپیری ناوی (عەبدولموتەلیب)ەو، باپیرە گەورەی ناوی (هاشم)ە. ئەمانە و ڕشتەی ئەمانە لە پیاوە گەورەکانی عەرەب بوون و، لە ناو هۆزی خۆیاندا سەربەرز بوون و، لەسەر یاسای نیکاح یانی ژن مارەکردن و بەجێهێنانی یاسای خانەدانە بەنرخەکان بوون.

ئەم پێغەمبەری ئێمە (د.خ) لە شاری مەککە لە دایك بووە، لە تەمەنی چلساڵیدا بووە بە پێغەمبەری خوا و ڕەوانەکراوە بۆ تەمێکردنی (انس) و (جن) واتە: بۆ ئەوەی کە ڕێگەی ئیسلام و خواناسی و خووڕەوشتی بەرزیان نیشان بدا. پاش ئەوەی کە بوو بە پێغەمبەر هەتا سیانزە ساڵ لە شاری مەککە مایەوە. جا لەسەر ئەمری خوا لە شاری مەککە دەرچوو کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، دە ساڵیش لە شاری مەدینەی مونەوەرە مایەوە، ئەنجا لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا لەم شارەدا کۆچی دوایی کرد و، هەر لەوێش کفن کراوەو قەبری پیرۆزی لەوێیە.

تا ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە عەرەبستاندا بڵاو نەبوویەوە، پێغەمبەر وەفاتی نەکرد و، کاتێ کە وەفاتی کرد ئاینی ئیسلام لە حیجاز و یەمەن بڵاو بووبوەوە، ئەنجا پاش وەفاتی ئەو، حەزرەتی ئەبووبەکری سیدیق کرا بە جێنشینی و، پاش وەفاتی حەزرەتی ئەبوبەکر حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب کرا بە جێنشین و، پاش شەهید بوونی حەزرەتی عومەر حەزرەتی عوثمانی کوڕی عەففان کرا بە جێنشین و، پاش شەهیدبوونی ئەویش حەزرەتی عەلیی کوڕی ئەبو طالیب بوو بە جێنشین و، لە پاش شەهیدبوونی حەزرەتی عەلی، حەزرەتی حەسەنی کوڕی حەزرەتی عەلیی بوو بە جێنشین. ئەم پێنج زاتانە خەلیفە و جێنشینی حەزرەتی پێغەمبەر بوون و(د.خ) و پێیان دەوترێ: "خولەفای ڕاشدین" (ر.خ).

پێویستە باوەڕتان وابێ، هەر چەند پێغەمبەر (د.خ) بە زاهیری وەفاتی کردووەو لە قەبرا کەفن کراوە، بەڵام حەزرەتی پێغەمبەری خۆمان و پێغەمبەرانی تر لە قەبردا زیندوون و جۆرە حەیاتێکیان هەیە کە تەنیا خوا چۆنیەتیی ئەو زیندوویەتییە دەزانێ. هەروەها پێغەمبەران لە قەبردا نوێژ دەکەن، تەنانەت هەندێ لە (ئەولیا) بە (موکاشەفەی قەلبی) لە کاتی نوێژدا دەنگی قامەتکردنی حەزرەتیان لە قەبردا بیستووە.ئەوەش بزانن: لە ڕۆژی قیامەتدا، کە ماوەی پێنجسەد ساڵ خەڵك لە سارای مەحشەردا ڕادەوەستن و، هیچ کەس لە ئینس و جن، گەورە و بچووك مەجالی حەسانەوەی نییە، بەڵێ لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خۆمان شەفاعەت دەکا و، بە شەفاعەت و تکای ئەو هەموو موکەللەفەکان بۆ مەیدانی لێپرسینەوە و دیوانی داوەریی خوای گەورە دەبرێن.

شایانی زانینە کە حەزرەتی محەمەد مستەفا (د.خ) لەگەڵ ئەوەدا کە بەندەی خوایە و عەبدێکی بێ دەستەڵاتە، لە پایەدا لە هەموو مەخلووقێکی خودا گەورەترە و پایەی

بەرزترە. پێغەمبەرە پێشووەکان هەر یەکە بۆ سەر قەوم و ئوممەتێك ڕەوانە کراوە و دینەکەی لە پاش خۆی بە هاتنی پێغەمبەرێکی تر نەسخ بووەتەوە. بەڵام پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی محەمەد مستەفا دروودی خودای لێ بێ، خوا ڕەوانەی کردووە بۆ سەر هەموو چین و هەموو نەتەوەیەك لە جیهاندا بۆ ئەهلی هەموو شار و لادێیەك. دینەکەی هەتا ڕۆژی قیامەت پایەدارەو، پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە ناوی پێغەمبەر (د.خ) ببیستێ ئیمانی پێ بهێنێ و، پەیڕەویی شەریعەت و ئاینەکەی بکا.

ئیمان و ئیسلام ئەوەیە کە بە دڵ باوەڕت ببێ بە هەرچی کە حەزرەتی محەمەد مستەفا لە لایەنی خواوە هێناویەتی بۆ ڕێنموونیی ئێمە و، بە زیان دوو ڕستەی شەهادەت بڵێیت: (اشهد ان لا اله الا الله، واشهد ان محمدا رسول الله) لەگەڵ بەجێهێنانی کردەوەی ئیسلام بە ئەندامە ئاشکراکانی لەش، بۆ نموونە: نوێژ بکەیت، ڕۆژوو بگریت، زەکات بدەیت، ئەگەر دەستت ڕۆیشت و توانای مالی و بەدەنیت هەبوو حەج بکەیت. هەروەها ئەوانەی کە خوای گەورە حەرامی کردوون، وەك پیاو کوشتن و زیناکردن و شەراب و عارەق خواردنەوە و ماڵی خەڵك داگیر کردن و حەرامەکانی تریش، تەرك بکەیت. پوختەی قسە: بەم سێ شتە (باوەڕ کردن بەوەی پێغەمبەر لای خواوە هێناویەتی و، وتنی دوو ڕستەی شەهادەت و، جێبەجێ کردنی کارەئاینییەکان بە لەش) ئیمان تەواو دەبێ. دیارە باوەڕکردن بەوەی حەزرەتی محەمەد (د.خ) لای خواوە هێناویەتی ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- باوەڕ بە مەلائیکە. واتە: باوەڕت ببێ کە لە عاسمان و عەرزدا گەلێ فریشتە هەن خەریکی بەجێهێنانی فەرمانی خوان و، هەمیشە لە یادی خوادان و تەسبیحاتی دەکەن و، لەم یاد و تەسبیحاتە هەرگیز تێر نابن.

ئەم مەلائیکانە جیسمیان نوورانییە و گوناهـ ناکەن و نێرو مێیان نییە و زاوزێ ناکەن.

٢- باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوا، لە حەزرەتی ئادەمەوە تا حەزرەتی محەمەد کە دواپێهێنراوی پێغەمبەرانە. لە ناو ئەو پێغەمبەرانەدا بە فەرموودەی حەزرەت (د•خ) (٣١٣)یان خاوەن شەریعەتن، واتە: ئەمریان پێ کراوە فەرمانی خوا بە خەڵك ڕاگەیەنن. لەم ژمارەیە (٢٦) لە قورئاندا باس کراون و ناوبراون: (ئادەم. ئیدریس. هوود. سالح. ئیبراهیم. لووت. ئیسماعیل. ئیسحاق. یەعقووب. یووسف. ئەییووب.

یوونس. ئیلیاس. ئەلیسەع. ذوولکیفل. شوعەیب. مووسا. هاروون. داوود. سولەیمان. زەکەریا. یەحیا. عوزەیر. عیسا. محەمەد مستەفا «صلى الله علیهم وسلم». ئەمانە هەموو خاوەن شەریعەتن.

٣- باوەڕ بەو کتێبانە کە خوای گەورە بە جیبرائیلدا بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، کە (١٠٤) کتێبن: (٣٠) بۆ ئیدریس (٥٠) بۆ "شیث" کە پێغەمبەر (د.خ) ناوی بردووە. (١٠) بۆ حەزرەتی ئیبراهیم. تەورات بۆ مووسا. زەبوور بۆ داوود. ئینجیل بۆ عیسا. قورئان بۆ حەزرەتی محەمەد مستەفا«علیهم الصلاة والسلام».

٤- باوەڕ بە ڕۆژی (قیامەت). لە جوملەی باوەڕ بە دینی پێغەمبەرە (د.خ) باوەڕ بە ئازار و سزای گۆڕ، واتە: مرۆڤ پاش مردن لە گۆڕدا بشاردرێتەوە یا لە دەریادا ون بێ یا بسووتێنرێ یا بدرێ بەدەم ئاوەوە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا ئەگەر لە ماوەی ژیانیدا مرۆڤێکی موسڵمان و کردەوە باش بووبێ، لە پاش مردن دەکەوێتە شادی و خۆشی و ڕابواردنی وەهاوە کە شایانی مرۆڤی باش بێ.

خۆ ئەگەر لە ماوەی ژیانیدا مرۆڤێکی بەدڕەفتار بووبێ ئەوە بەقەدەر ڕەفتارەکەی سزاو ئازار دەدرێ، مەگەر خوای گەورە لێی ببووری.

هەروەها باوەڕ بەوەی کە ئەم دنیایە نامێنێ و هەرچی بیەوێ هەموویان زیندوو دەکاتەوە و، لە شوێنێکدا هەموو کۆ دەکرێنەوە. زیندووبوونەوەکەیان لە عورفی شەرعدا پێی دەڵێن (بعث) و کۆبوونەوەکەیان پێی دەڵێن (حشر) و مەیدانی کۆبوونەوەکە پێی دەڵێن (محشر). ئەنجا خوای گەورە موحاسەبەی هەموو خاوەن عەقڵێك دەکا کە لە دنیادا دەنگوباسی دین و ئاینی پێ گەیشتبێ و کردەوەی چاك و خراپی بە تەرازووی کێشانەی خێر و شەڕ دەکێشرێ؛ جا ئەوانەی کە کافر بوون هەر لەوێوە دەنێررێن بۆ دۆزەخ و لەوێ هەتا هەتایە دەمێننەوە، ئەوانەش کە موسڵمانن تاوانبار و بێتاوان ئەمریان پێ دەکرێت کە بەسەر (سرات) دا گوزەر بکەن.

سیرات پردێکە بەسەر جەهەننەمدا ڕاکێشراوە لە موو باریکترە و لە ئەڵماس تیژ ترە. شوێن بازی هەموو موسڵمانانە، هەر کەسێ کردەوەی باش بووبێ بەپێی باشیی کردەوەکەی بەسەر ئەو پردەدا تێ دەپەڕێ، هەندێ وەکو برووسکە، هەندێکی تر وەك بای شەماڵ، هەندێکی تریش وەك سواری تیژڕەو یا سواری عادەتی بەسەریدا تێپەڕ دەکەن. ئەوانەش ڕەفتاریان بەد بووبێ ئەگەر عەفوو نەکرابن لە پردەکەوە دەکەونە خوار بۆ ناو

ئاگرەکە و بە قەدەر تاوانەکانیان سزا دەدرێن، پاش ئەوە لە دۆزەخ دەردەکرێن و دەنێردرێن بۆ بەهەشت.

هەر کەس لە دۆزەخ دەرچوو لە پێش ئەوەی بگاتە بەهەشت بە (حوض المورود) دەگا. ئەم حەوزە گۆلێکە لە دەرەوەی بەهەشتایە زۆر زۆر گوشاد و پانە، ئەوەندەی شەربە لە دەوروپشتیایە لە ژماردن نایەت، هەر کەس لەو ئاوە بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێ و لە بەهەشتدا هەر ئاوێك بخواتەوە تەنیا بۆ لەزەت وەرگرتنە و لەبەر تینوویەتی نییە. جا کە لە (حوض المورود) دەرچوو دەڕوا بۆ بەهەشت و هەمیشە لەسەر پایە و میزانی خۆی دەمێنێتەوە.

لە دەشتی مەحشەردا کاتێ کە خەڵك دەکەونە زەحمەتەوە پەنا بۆ هەر پێغەمبەرێ دەبەن بۆ تکاکردن کەس حازر نابێ تکایان بۆ بکات، کە دێنە خزمەتی حەزرەتی (محمد المصطفی) ئەو تکایان بۆ دەکات.

کە مرۆڤ ئیمانی هێنا بەوەی کە حەزرەت (د.خ) لای خواوە هێناویەتی بۆ بەرەی ئادەمیزاد، دەبێ باوەڕیشی بەوە هەبێت کە ئەرکانی ئیمان و ئیسلام ڕاستن و لە بناخەی ئاینی ئیسلامن، دەبێ باوەڕی ببێت بە واجیبێتیی پێنج فەرزەی نوێژ بەهەموو مەرج و ڕوکنەکانیانەوە، بەڕاستیش بیانکات. دەبێ باوەڕی بەواجیبێتیی ڕۆژووی ڕەمەزان ببێ بە هەموو مەرج و ڕوکنەکانییەوە، دوور لەو شتانەی کە بەتاڵی دەکەنەوە، دەبێ ئەم ڕۆژووەش بگرێت. دەبێ باوەڕی بە واجیبێتیی زەکات و سەرفیترە هەبێ و بە نییەتێکی خاوێن و بێگەرد بەجێی بهێنێ. هەروەها باوەڕ بە واجیبێتیی حەج و بەجێهێنانی بە هەموو ڕوکن و مەرجەکانییەوە بەشێکە لە ئیمان بەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) لای خواوە هێناویەتی.

لە هەموو ئەم واجیبانەدا بێجگە باوەڕ، باسی بەجێهێنانمان کرد؛ چونکە نیشانەی باوەڕبوون بەمانە ئەوەیە ئەو کەسە خاوەن ئیمانە جێبەجێیان بکا، کە ئینسانی موکەللەف واجیباتی بەجێ نەهێنا، ئەوە مەعنای وایە یا بە یە باوەڕی نییە، یا باوەڕەکەی ئەوەندە بێ هێز و لاوازە کە بە کەمترین شوبهە لادەچێت، ئەمەش یەکێکە لە هۆیەکانی سەلبی ئیمان لە کاتی تەنگ و چەڵەمەی سەرەمەرگدا، واتە: کابرا وەختی خۆی ئیمان و باوەڕی نەبووەو، تەنیا لە ناو خەڵکدا خۆی بە خاوەن ئیمان حسێب کردووە، دوایی لە سەرەمەرگدا باش دەرکەوتووە کە کابرا بێ ئیمان بووە، یا خۆ

باوەڕێکی لاواز و بێ نرخی بووە و، بەهۆی وەسوەسەی شەیتان ئەو باوەڕە کەمەیشی لە ناو چووەو لە ئەنجامدا بە بێ ئیمان مردووە، پەنا بە خوای گەورە.

هەر لەبەر ئەمەیە کە لە لای هەندێ لە پێشەواکانی ئاین، وەك (شافعی) خوای لێ ڕازی بێ، ئیمان و باوەڕ زیاد و کەم دەکا و، بەهێز و بێ هێز دەبێ. جا ئەو کەسە کە عەمەلی بە بەشێ لە ئیمان داناوە مەبەستی لە ئیمان، ئیمانی تەواوە، بینا لەسەر ئەوە کاتێ کە کردەوە نەبوو ئەسڵی باوەڕەکە دەمێنێ. هەندێ ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ: مادام کردەوە بەشێك بێ لە ئیمان کە کردەوە نەبوو، ئیمانیش نابێ، چونکە کە (جزء) فەوتا (کل)یش دەفەوتێ، واتە: ئینسان کە عەمەلی نەبوو بە کافر حسێب دەکرێ.

وەڵامی ئەم ڕەخنەیە ئەوەیە کە عەمەل بەشێکە لە ئیمانی(کامل) و تەواو، کە عەمەل فەوتا ئیمانی کامل دەفەوتێ نەك ئەسڵی ئیمان کە بریتییە لە تەسدیق و باوەڕ بەوەی حەزرەتی محەمەد (د.خ) لە لایەنی خواوە هێناویە.

لقەکانی ئیمان (٧٧)ن و، ئەنجامی ئەم لقانە قازانجی ژیانی دنیا و قیامەتە بۆ موسڵمان و، بەهۆی ئەمانەوە باوەڕی بەهێز و تەواو دەبێ و، بەم جۆرە موسڵمانە دەڵێن موسڵمانی تەواو.

پوختەی ئەم (٧٧)لقە باوەڕ بەحەق و ڕاستییە لە کردەوەدا. باوەڕ بەحەق (١٦) بەشی هەیە:

١- وەدەسهێنانی زانیارییە ئاینییەکان.

٢- ناسینی پەروەردگار.

٣- باوەڕ بە پاکیی ئەو پەروەردگارە لە هەموو کەموکوڕی و خەوشێك.

٤- باوەڕ بە بوونی خۆی و سیفەتەکانی کە (حەیات و عیلم و ئیرادە و قودرەت و سەمع و بەسەرو کەلام)ن.

٥- داننان و باوەڕکردن بە تاق و تەنیایی و بێ هاوتاییی خوای گەورە.

٦- داننان و باوەڕ بەوە کە هەرچی غەیری خوایە بوون و نەبوونی بە قەزاو قەدەری خوایە.

٧- باوەڕ بە بوونی فریشتەکان و باوەڕ بەوەی کە لە هەموو تاوانێ پاکن و، یەك دەقیقە لە یادی خوا غافڵ نین و، لە پەرستگاریی خوا کۆتایی ناکەن.

٨- باوەڕ بە هەموو پێغەمبەران و بە دوا پێغەمبەر کە حەزرەتی محەمەد مستەفایە (د.خ)، لەگەڵ دانـانـان بـەوەدا کـە هـەمـوو ئـادەمـزاد و پـەریـیـەك بـانگ کـراون بـۆ خواپەرستی لە لایەن ئەم پێغەمبەرەوە، واتە پێغەمبەرەکانی تر هەریەك ڕەوانە کراون بۆ ئوممەتێکی تایبەتی و دیاری، بەڵام حەزرەت (د.خ) بۆ هەموو عالەم نێرراوە بە پێغەمبەری بەبێ جیاوازی و، دەعوەتەکەی گشتییە.

٩- باوەڕ بەوە کە هەموو پێغەمبەرەکان خاوەن موعجیزە بوون.

١٠- دەبێ بیروباوەڕی دەربارەی گشت پێغەمبەران باش بێ، نەك وەك جوولەکە کە دوژمنی حەزرەتی عیسا و حەزرەتی (محەمەد مستەفا) بوون.

١١- ئیمان و باوەڕ بەوە کە هەرچی غەیری خوایە هەموو (حادث)ە واتە لە پێشدا نەبوون و، خوا لە نەبوونەوە دەری کردوون بۆ بوون دروستی کردوون.

١٢- ئیمان و باوەڕ بەوە کە خوای گەورە ئەم جیهانە لە ناو دەبا چونکە قیدەم و بەقا تەنیا شایستەی زاتی خوای گەورەن.

١٣- باوەڕ بەوەی کە گیانلەبەران لە پاش مردن و لە ناوچوون زیندوو دەبنەوە، چ ئینسان و چ غەیری ئینسان.

١٤- ئیمان و باوەڕ بە زیندووبوونەوەی ئینسان لە قەبردا، بە ژیانێکی بەرزەخی بۆ پاداش وەرگرتن یا خۆ بۆ سزا چەشتن.

١٥- ئیمان و باوەڕ بەو هەموو کارەساتە کە لە قیامەتدا ڕوودەدەن، وەك حیسابی کردەوە و کێشانەی کردەوەو پرد (سیرات) و شەفاعەت و تکا لای بارەگای خوای گەورە. (١٦) باوەڕ بەوەی کە بەهەشت شوێنی جەزای چاکەیە و جێگای وەرگرتنی پاداشی خوا پەرستییەو، دۆزەخیش جێگەی سزاو وەرگرتنی پاداشتی کوفر و گوناهـ و تاوانبارییە.

لقەکانی تر کە پێوەندییان بە کردەوە و ڕاستی لە کردەوەدا هەیە سێ بەشن. بەشی یەکەم پێوەندیی بە نەفسی موسڵمانانەوە هەیە پەیوەندییەکی باتنی، وەك پاککردنەوەی نەفس لە خووڕەوشتی بەد. جا پاککردنەوەی نەفس دە جۆرە.

١- پاککردنەوەی لە خووی نەوسنی و حەز لە خواردن کردن.

٢- پاككردنەوەی لە وتاری نارەوا.

٣- پاككردنەوەی لە خۆشویستنی ماڵ.

٤- پاككردنەوەی لە خۆشەویستی پایە و جێگاو رێگا.

٥- پاككردنەوەی لە بەخیلی.

٦- پاككردنەوەی لە خووی خۆ بە گەورە زانین.

٧- پاككردنەوەی لە حەسوودی، واتە: حەز كردن بە نەمانی نیعمەتی غەیر.

٨- پاككردنەوەی لە حیقد، واتە كینە لە دڵا ڕاگرتن.

٩- پاككردنەوەی لە (ڕیا) واتە چاكە كردن بۆ بەرچاویی خەڵك.

١٠- پاككردنەوەی لە عوجب، واتە لە خۆ ڕازیبوون.

یا وەك ڕازاندنەوەی نەفس بە خووورەوشتی بەرز كە یازدە خووە، یەكەم: پەشیمان بوونەوە لە تاوان. دووەم: ترس لە خوا. سێیەم: تكاو هیوای عەفووی خوا. چوارەم: بێ پەیوەندی بە دنیاوە، واتە ئەوەندە پێوەندییەكەی بەهێز نەبێ كە لە ئاینی خۆی غافڵ بێ. پێنجەم: شەرم، واتە شەرم لە كاری نارەواو ناشەرعی. شەشەم: شوكر و سوپاسی خوای گەورە لەسەر نیعمەت. حەوتەم: وەفا و چاودێریی مافی خوا و مافی خەڵك. هەشتەم: سەبر و خۆڕاگرتن لە گوناح، واتە كاتێ تاوانێك هاتە پێش گیرۆدەی نەبێت و تەركی بكات و لەبەر خاتری خوا نەیكات، یا سەبرو خۆگرتن لەسەر بەڵاو گیروگرفت، واتە گیرۆدەی نەخۆشییەك یا زیانێك بوو سەبر بكا و خۆی بگرێ و زیاد لە ئەندازە بێزاری دەرنەبڕێ، هەروەها سەبر و خۆگرتن خوا پەرستی، واتە هەرچەند تاعەتكردن و خواپەرستی لەسەر شان گران بێ هەر لەبەر ڕەزای خوای گەورە بەجێی بهێنێ. نۆیەم: ئیخلاس، واتە ڕاستی لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوا و موسوڵمانانیدا. دەیەم: «توكل» واتە پشت بە خودا بەستن. یازدەیەم: ڕازی بوون بە قەزاو قەدەر ، واتە بەقەزای خوای گەورە و ئەو كارانە كە ئەو دەیانكات ڕازی و خۆشحاڵ بێ و بێزاری دەرنەبڕێت.

بەشی دووەم یا پێوەندی بە زاهیر واتە دەری ئینسانەوە هەیە وەكو عیبادەت، ئەمانەش سیازدە لقن:

١- پاكیی لەش لە بێ دەستنوێژی و لەش پیسی و پیسی.

٢- بەجێهێنانی نوێژەكان.

٣- دانی زەکات و سەرفیترە بەوانەی کە پێیان ڕەوایە.

٤- بەجێهێنانی ئەو کارانەی کە فەرزی کیفایەن وەکو نوێژی جەنازە.

٥- بەجێهێنانی ڕۆژووی ڕەمەزان.

٦- ئیعتیکاف کردن لە مزگەوتدا.

٧- خوێندنی قورئانی پیرۆز، کە لە پایانی ئەم نامەدا هەندێ لە خێر و پاداشی قورئان خوێندنتان بۆ باس دەکەم.

٨- حەجی ماڵی خوا.

٩- عەمرە.

١٠- سەربڕینی قوربانی.

١١- بەجێ هێنانی نەزر.

١٢- ڕاگرتنی قەدری سوێن، واتە کاتێ سوێندەێکت لەسەر نەکردنی شتێك خوارد و وتت نایکەم، ئەگەر ئەو کارە واجیب یا سوننەت نەبێ، نابێ بیکەیت و سوێندەکەت بشکێنی.

١٣- بەجێهێنانی کەفارەت، واتە ئەگەر سوێندت کەوت یا بەهۆیەکی ترەوە کەفارەتت کەوتە سەر، ئەو کەفارەتە بدەی بەوانەی خێریان پێ ڕەوایە.

یاخۆ پێوەندی بە زاتی ئینسان خۆیەوە و بە عەلاقەو پێوەندییەوە هەیە وەك داوێن پاکی لە زینا، نیکاحی ڕاست و شەرعی، بەجێهێنانی مافەکانی نیکاح وەك مارەیی و هەستان بە نەفەقەی پێویست، چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایك و، بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم، واتە نەبڕینی پێوەندیی خوێشایەتی و چاکەکردن لەگەڵ خزم و کەسوکاردا، هەروەها بە گوێ کردنی گەورە و خاوەن فەرمانانی ئیسلام لە کاروباری ڕەواو پەسەنددا، واتە ئەگەر، بۆ نموونە، سەرباز بوو لە سوپای ئیسلامدا لەسەری پێویستە لە کاروباری ڕەواو شەرعیدا بێ گوێیی گەورەکەی نەکا، یارمەتیدانی موسڵمانان لە زیندوو کردنەوە و بووژاندنەوەی شیعاری ئیسلامدا. ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە. جیهادکردن دژی کافران لە پێناوی پاراستنی ئایندا. پاراستنی نەفس لە تاوانکاری. بەجێهێنانی مافەکانی جینایات لە ڕێگای قیساس وەرگرتنەوە لە تاوانبار. پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵك. بەجێهێنانی مافەکان و دوورکەوتنەوە لە زوڵم و زۆر. پاراستنی نەسەب لە ڕێگای نیکاحی شەرعی و

لە ڕێگای دوورکەوتنەوەوە لە داوێن پیسی. پاراستنی نامووسی موسڵمانان و ئەهلی زیممە لە ڕێگای بەجێهێنانی حەددی زیناوە بەو شێوەی لە ئایندا بڕیاردراوە، هەروەها لە ڕێگای بەجێهێنانی حەددی قەزفەوە، واتە حەددی ئەو کەسەی کە بوختان بە نامووسی خەڵك دەکا بەو شێوەی کە لە شەریعەتدا باس کراوە. پاراستنی عەقل و هۆش بەهۆی مەنعکردنی خۆت و خەڵکی تر لە بەکارهێنانی ئەو شتانەی ئینسان مەست و سەرخۆش دەکەن.

براکانم! لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە تا کاتی باڵغ بوون منداڵەکانتان فێری سوورەتی (فاتیحە) بکەن؛ هەتا کە باڵغ بوون و دەستیان دایە نوێژکردن نوێژەکانیان ڕاست و ڕەوان بێ و خێرەکەیتان پێ بگا، چونکە بە یەك جار خوێندنی سوورەتی فاتیحە بەقەدەر سوورەتی بەقەرە خەیری هەیە، کە سوورەتی بەقەرە (٢٤) پەڕ دەبێ، خۆ ئەگەر پازدە جار سوورەتی فاتیحە بخوێنی ئەوە بەقەدەر سی جوزئەی قورئان خێر و سەوابی هەیە، بەڵکو زیاتریش، دیارە ئەگەر منداڵەکانتان فێر نەکەن، ئەم نیعمەتە گەورەتان لە دەست دەردەچێ. ئەمەش زیانێکی زۆر گەورەیە.

ئیمامی غەزالی (ر.خ) تەرتیبی ویردی فاتیحەی وا داناوە کە لە پاش نوێژی سبەینان (٢٥) جار و، لە پاش هەریەك لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر (٢٥) جار و، لە پاش نوێژی مەغریب (١٠) جار و، لە پاش نوێژی عیشا (١٥) جار بەم جۆرە ڕۆژی دەبێتە سەد جار، واتە: هەموو ڕۆژێ بە قەدەر دوو هەزار و چوار سەد پەڕە قورئان سەوابی هەیە. بەخ بەخ لەم سامان و نیعمەتە، بەدبەختن ئەوانەی خۆیان و منداڵەکانیان لەم سامانە گەورەیە ناهومێد دەکەن، شتێکی ناڕەوایە هەندێ لە مامۆستایانی قوتابییان کە سەبارەت بەفێرکردنی منالانی موسڵمانان کەمتەرخەمی دەکەن، لە ماوەی دوو ساڵدا یەك جوزء بەو منالانە دەخوێنن کە گوێ ڕاگری لێیان، ئەو جوزئەش نازانن کە بەناو خوێندوویانە، ئەنجا بە ناچاری خاوەن منالەکان لە قوتابخانە دەریان دەهێنن و لای وەستای ئیشی عادەتی وەك بەرگدروو و ئاسنگەر و دارتاش... تاد دایان دەنێن تا فێری کارێك ببن. جا هەروەك بۆم باس کردن بە هەر جۆر بووە دەبێ منالەکانتان فێری سوورەتی فاتیحە بکەن، ئەگینا خۆتان گوناهبار دەبن و لە خێری فاتیحەی ئەوانیش بێ بەش دەبن.

فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) کاتێ کە خوای گەورە ڕقی هەستێ فریشتەکان لە ترسی ئەو دەست بە تەسبیح و تەقدیسی خوای گەورە دەکەن، لەوکاتی ڕق و قینەدا خوای گەورە

که تەماشای قوتابخانەکانی سەر عەرد دەکا خەریکی خوێندنی دەرسی قورئانن ئەو ڕق و قینەی نامێنێ و تاوانبارەکان عەفوو دەکا و، فریشتەکانیش لەو ترس و بیمە ڕزگار دەبن.

فەرموودەی پێغەمبەرە (د.خ) هەر کاتێ یەکێك لە ئێوە حەزبکا لەگەڵ زاتی خوای گەورە قسە بکات با دەس بکا بە قورئان خوێندن. هەروەها لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: هەر کەسێ هەمووی بخوێنێتەوە لەو کاتەدا (٦٠) هەزار مەلائیکە حازر دەبن و دوعای خێر بۆ ئەو کەسە دەکەن کە قورئانەکەی خەتم کردوە. لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: لەگەڵ هەموو خەتمێکی قورئاندا دوعایەکی قبوولکراو هەیە، کەوابێ زۆر ناڕەوایە ئینسان تێ نەکۆشێ بۆئەوەی کوڕەکەی فێری قورئان خوێندن ببێ و خەتمی قورئان بکا و دوعای عەفوی باوك و دایکی بکا بەڵکو خوا گوناهی ببەخشێ. لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی:- سێ کۆمەڵ هەن لە گەورەکانی ئوممەتی من دەژمێردرێن:

١- ئەوانەی کە قورئانیان لەبەرە.

٢- ئەوانەی کە هاوڕێی قورئانن، واتە هەر ڕۆژی چەند جوزئێ لە قورئان دەخوێنن دە جوزء یا کەمترو، هەرگیز بە بێ عوزرێکی شەرعی تەرکی ناکەن.

٣- ئەوانەی کە شەونوێژ بەردەوام دەکەن و بە بێ عوزرێکی ڕەوا تەرکی ناکەن، ئەمانە لە گەورەکانی ئوممەتی پێغەمبەرن، تەنانەت لەسەر حەدیسی پێغەمبەر (د.خ) ئەوانەی کە قورئان زۆرتر دەخوێنن بە خواپەرستتر حیساب دەکرێن و مەشهوورن.

هەروەها لە حەدیسدایە کە فەرموویەتی: بەشی چاوتان بدەن لە عیبادەت کردن. ئەم عیبادەت کردنی چاوەش بریتییە لە دەورکردنەوەی قورئان و، بەکارهێنانی چاو لە خوێندنەوەیدا. فەرموودەی پێغەمبەرە: سینەی لە قورئان خاڵی وەك خانووی وێران وایە. هەروەها لە حەدیسدا هەیە: ئەهلی قورئان ئەهلی خوا و دۆستی تایبەتی خوان. دیسان حەدیسە: "خيركم من تعلم القرآن وعلمه" واتە چاکترتان ئەو کەسەیە کە فێری قورئان دەبێ و خەڵکیش فێری قورئان دەکا.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی فێربوونی یەك ئایەت لە قورئان خێر و پاداشی سەد ڕکات نوێژی هەیە. هەروەها فەرموویەتی خوێندنی قورئان لە ناو قورئاندا لە گەورەترین خواپەرستییەکانی ئوممەتی منە. دیسان فەرموویەتی تەماشاکردنی ئایەتی قورئان

خواپەرستییە وەکو تەماشاکردنی (کەعبە)ی خوا. لە فەرموودەی پێغەمبەرە کە خوێندنی قورئان لە نوێژا گەورەترە لە خوێندنی قورئان لە دەرەوەی نوێژدا، هەروەها خوێندنی قورئان لە دەرەوەی نوێژدا پایەی گەورەترە لە تەسبیح و تەکبیر و، تەسبیح و تەکبیر لە ڕۆژووی سوننەت گەورەترە، ئەگەرچی ڕۆژوو قەڵغانە لە ڕووی ئاگری دۆزەخدا. لە حەدیسدایە کە قورئان شەفیع و تکاکارە بۆ خاوەنەکەی و تکاکەشی مەقبووڵە و، قورئان سامان و دەوڵەتێکە کە هەژاری و بێنەوایی بەدوادا نایەت و، هیچ سامانێ نییە لە قورئان زیاتر بێ.

براکانم شێت و دێوانە کەسێکە کە ئەم سامانە گەورەیە بە منداڵی خۆی نەگەیەنێ. جا کە خوا یارمەتی دان و منداڵەکانتان قورئانیان تەواو کرد، چاودێرییان بکەن و با فێری هەندێ کتێبی پەند و ئامۆژگاری ببن، وەك (گولستان)ی شێخی سەعدی بێجگە لە هەندێ کتێبی شەریعەت. هەروەها ئەوەی خوێندوویەتی چاودێری بکا و خۆی تێدا بەهێز بکا نەبادا لە بیری بچێتەوە. بێگومان ئەو کەسانەی کە بەتەنیا خوێندنی قورئانی پیرۆز واز لە منداڵەکانیان دەهێنن و فێری خوێندنی پەند و ئامۆژگاری و شەریعەتیان ناکەن و، بۆ ئەم مەبەستە ڕێگایان بۆ ساز ناکەن، زۆری پێ ناچی، منداڵەکانیان بە کاروپیشەی دنیاییەوە خەریك دەبن و قورئانەکەیان لە بیر دەچێتەوە و ناچار دەبن جارێکی تر لە قوتابخانە فێری ببن. بۆیە زۆر تکاتان لێ دەکەم کە لەم دەوڵەتە گەورەیە خۆتان و ئەولادتان بەشدار بکەن، تا لە پاش مردنیشتان خێر و پاداشتی چاکەتان پێ بگا و لە سزاو ئازار ڕزگارببن.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "القرآن هو النور المبين والذكر الحكيم والسراط المستقيم" واتە: قورئان بەڕاستی ڕووناکی و ڕۆشنایییەکی ئاشکرایە و زیکری پڕ حیکمەتی خوایە و ڕێگەییەکی ڕاستی بێ جەفایە. هەروەها فەرموویەتی "القرآن هو الدواء" واتە: قورئان دەرمانی تاریکیی دەروونە وە چارەی گومڕاهیی ماوەی ژینە، وە فەرموویەتی هەر کەسێ گوێ ڕابگرێ لە کەسێ کە قورئان بخوێنێ ئەوە بەقەدەر ئەو قورئان خوێنە خێر و سەوابی هەیە. جا مادام وایە ئەی برای خۆشەویستم منداڵەکەت بکە بە قورئان خوێن و، لە کاتێکدا دەوری قورئان دەکاتەوە گوێی لێ ڕابگرە هەتا بەقەدەر ئەو خێر و پاداشت بۆ بنووسرێ، وەك ئەوەی کە خۆت قورئانەکەت خوێندبێ.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی کەسێ خوا تەوفیقی بدا بۆ ئەوەی قورئان لەبەر بکا و، وا گومان بەرێت کە یەکێك هەیە خوا نیعمەتی لەوە زیاتری پێ داوە، ئەوە بەهەڵەدا چووە،

واتە: چونکە پایەی کەس ناگاتە پایەی ئەوەی کە قورئانی لەبەرە، مەگەر یەکێك ئەویش قورئانی لەبەر بێ. هەروەها فەرموویەتی: هەر کەسێ لە نێو قورئاندا دەوری قورئان بکاتەوە و بخوێنێ لە کاتی پیریدا گیرۆدەی خەرەف نابێ، واتە بەهۆی پیرۆزیی قورئانەوە لە دەردی خەڵەفان دەپارێزرێ. لە حەدیسێکی تردا فەرموویە: هەر حەرفێ لە قورئان بۆ ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوە بەرامبەری دە چاکەیە. دیسان فەرموویەتی قورئان هەزار و بیست و حەوت هەزار حەرفە و، لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو ئینسانێکی نەخۆش و ڕەنگ زەرد دێ بۆ لای ئەو کەسە کە لە دنیادا خوێندوویەتیەوە و دەوری کردووەتەوە پێی دەڵێ من ئەو قورئانەم کە تۆ لە دنیادا دەتخوێندمەوە ئیستە بۆیە ڕەنگم گۆڕاوە دەترسم تووشی بەڵایەك بووبێ، من ئەو قورئانەم کە تۆ لە شەواندا خەوت لە خۆت حەرام دەکرد و دەوری منت دەکردەوەو، لە ڕۆژدا بەهۆی خوێندنەوەی منەوە تینووت دەبوو، واتە مادام من لە دنیادا بووبووم بەهۆی ئازاری تۆ پێویستە لە قیامەتدا ببمە هۆی ئاسایش و ئیسراحەتت، ئەنجا بانگ دەکا دەڵێ: وەرن خەڵاتی ئەم هاوڕێی منە بکەن و، لێی ڕازی بن، خوای گەورەش خەڵاتی دەکات و لێی ڕازی دەبێت. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی حەسەد، واتە بەخیلی بە خەڵك بردن حەرامە مەگەر بەخیلی بە یەکێك کە خوای گەورە تەوفیقی دابێت و وای لێ هاتبێ شەوو ڕۆژ بەقورئانەوە خەریك بێت، یا بە یەکێك خوا ماڵێکی زۆری پێ دابێ و شەو و ڕۆژ ئەو ماڵە لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا بەخت بکا.

لە فەرموودەییەکی حەزرەتەوە دەردەکەوێ کەسێ قورئان خوێن و پیاو چاك بێ کە چووە بەهەشت تکا دەکا بۆ دە کەسی وەها کە موستەحەققی سزان بە ئاگری دۆزەخ و، تکاکەشی لێ قبوڵ دەکرێ و، لە ڕۆژی قیامەتدا تاجی شەرەف دەنێتە سەری باوك و دایکی، واتە بە جۆرە خەڵاتێ خەڵاتی باوك و دایکی دەکا کە پرشنگی لە پرشنگی ڕۆژ زۆرترە. ئەم فەرموودەی حەزرەتە درێژە و، حەزرەت زۆر ستایشی قورئان دەکا تێداو، دەفەرموێ هەرگیز بە هۆی دووبارەکردنەوەوە لای موسڵمان کۆن نابێ و، پێویستە هەر کاتێ کە قورئانەکە خەتم بکا لەسەرەوە دەس پێ بکاتەوە، هەتا دەربکەوێ کە لە قورئان خوێندن دەست بەردان نەبووە.

دەگێڕنەوە حەزرەت فەرموویەتی: ئەی عەلی! قورئان فێر ببە و، بە خەڵکیشی فێر بکە، لە باتی هەر حەرفێ دە چاکەت بۆ دەنووسرێ و، کاتی مردنیش بە شەهیدی دەمریت. ئەی عەلی! قورئان فێر ببە و بە خەڵکیشی فێر بکە. کاتێ کە مردی فریشتەکان زیارەتی

قەبرەکەت دەکەن و بە دەوریا دەسووڕێنەوە، وەك چۆن ئادەمیزادی موسڵمان حەجی ماڵی خوا دەکا. هەروەها ڕیوایەت کراوە هەر کەس لەبەر ڕەزای خوای گەورە بەخۆڕایی قورئان فێری خەڵك بکا لە ڕۆژی قیامەتدا فریشتەکان بە پێکەنینەوە دێن بە پیرییەوە. هەروەها ڕیوایەت کراوە هەر کەس قورئان فێری مناڵەکانی خۆی بکا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت گەردن بەندێکی پێ دەدا کە هەموو عالەم سەریان لێی سووڕ دەمێنێ ئەوەندە جوان و نایابە.

ڕیوایەت کراوە ئەگەر موسوڵمان دەوام بکا لەسەر تەماشاکردنی قورئان خوای گەورە بینایی چاوی ئەو کەسە دەپارێزێ تا ماوە لە دنیادا.

لە فەرموودەیەکی حەزرەتەوە (د.خ) دەردەکەوێ هەر کەسێ بە درێژایی تەمەنی هەر ڕۆژێ لە دوو سەد ئایەتی قورئان کەمتر نەخوێنێ، ئەوە لە قەبرا شەفاعەتی مردووانی حەوت قەبر دەکا بە دەوروبەری خۆیدا و، ئەگەر باوك و دایکی ئەهلی سزا بن خوا سزاکەیان سووك دەکا. هەروەها ڕیوایەت کراوە هەر ماڵێ قورئانی تێدا بخوێنرێ فریشتە دێن بۆ ئەو ماڵە و، شەیتانی لێ دوور دەخەنەوە و، ئەو خانووە دەبێتە هۆی خۆشی و شادی بۆ خاوەنەکەی و خێری زۆر دەبێ و شەڕی کەم دەبێ.

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە هەر خانوویەك قورئانی تێدا نەخوێنرێ شەیتانی لێ نزیك دەبنەوە و، لەسەر ئەهلەکەی تەنگ دەبێ و فریشتەی لێی دووردەکەونەوە و خێری کەم دەبێ و شەڕی زۆر دەبێ.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) فەرمووی بە مەعاذی کوڕی جەبەل، خوای لێ ڕازی بێ. ئەی مەعاز ئەگەر تالبی ژینی بەختیارانەیت و دەتەوێ وەك شەهیدان بمریت و، لە ڕۆژی قیامەت دا ڕزگار بیت و، لە ڕۆژی ترس ئەمین بێت و بگەیت بە خێرو خۆشی و دوور بیت لە ناخۆشی و، لە تاریکی دەرچیت و، لە گەرمای ڕۆژی قیامەتدا بچیتە ژێر سێبەری میهرەبانیی خودا، ئەگەر دەتەوێ لە کاتی تینوویەتی جیهاندا تێرا و بیت، ئەگەر دەتەوێ کێشانەی کردەوەی باشت قورس بێ و، لە کاتی ڕێ ون کردندا شارەزا بیت، بەڵێ ئەگەر ئەمانە هەمووت دەوێ قورئان بخوێنە و، دەوام بکە لەسەر خوێندنەوە و دەورکردنەوەی، چونکە قورئان خوێندن زیکری ڕەحمانە و دووری لە شەیتانەو هۆی قورسی تای چاکەیە لە ڕۆژی قیامەتدا. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە قورئان خوێندن هۆی نوورانیەتی دڵی موسڵمانانە.

براکانم! یەکێ لە پیاوانی خوا وتی: ئەحمەدی محەمەد ئاغام لە خەودا چاو پێ کەوت کە لە حاڵی گیان کەنشتدا بوو ئێوەش لە دەوری بوون، تەماشام کرد نورێ لە نینۆکی پێیەوە لە بەینی پیست و گۆشتدا هات تا گەیشتە ئەژنۆی، لەو کاتەدا ئەحمەدی محەمەد ئاغا وتی: کاك ئەحمەد! ئەوە نووری قورئانە لە پێش رۆحمەوە هاتووە، ئەنجا نوورەکە گەڕایەوە بۆ نینۆکی پێی، دیسان بانگی کرد: کاك ئەحمەد ئەوا نووری قورئان گەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی، پاش ئەمە نوورەکە سەر کەوتەوە، دیسان بانگی کردەوە: کاك ئەحمەد! وا نووری قورئان سەرکەوت، هات لە پێش رۆحمەوە، هەر بەم دەستوورە ئەو نوورە بە هەر جێگایەك دەگەیشت بانگی دەکردە کاك ئەحمەد و پێی دەگوت نوورەکە گەیشتووەتە ئەو شوێنە لە پێش رۆحمەوە، هەتا ئەو نوورە گەیشتە سینەی. ئەم جار ئەو نوورە وەها زۆر بوو هەموو سینەی داگرت، ئەنجا بانگی کرد: کاك ئەحمەد وا نووری قورئان لە پێش رۆحمەوە هات ئەو نوورە لە دەمیەوە دەرچوو، ئیتر ئەحمەد ئاغا وەفاتی کرد. بەم حاڵەوە کە نووری قورئان لەگەڵ رۆحانیەتیدا بوو، رۆحی بە هەر شوێنی دەگەیشت ئەو نوورەی لەگەڵدا بوو، ئەی براکانم! ئەم ئەحمەد ئاغایە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، تەوبەی کرد و قورئانی کردەبەر و لە خانەقادا گۆشەنشین بوو تا کۆچی دوایی کرد.

براکانم! زۆریی ناوی هەر شتێ نیشانەی گەورەیی ئەو شتەیە. لە قورئانی پیرۆزدا لە (٥٤) جێگەدا ناوی قورئان بە ناوی جیا جیا باس کراوە وەك: قرآن. فرقان. کتاب. وحي. نور. سبیل. روح. ذکر. شفاء. هدی. موعظة. رحمة. بیان. مهیمن. حبل. عهد. صراط مستقیم. حکیم. قیم. مبین. مبارك. حکمة. حدیث. حق. تذکرة. برهان. تفصیل. کلام عظیم. مەعنای هەریەك لەم ناوانە لە تەفسیردا لە شوێنی خۆیدا دیاری و باس کراوە، هەریەکەی جۆرە ستایش و پیاهەڵدانێکی قورئانە.

براکانم! پاش ئەم بەیاناتانەی من و بیستنی ئێوەیە ئیتر بێ مویالاتی لەگەڵ قورئاندا نیشانەی نائومێدییە لە رەحمەتی خوا و، نیشانەی بێ هێزیی ئیمانە. رجا دەکەم لەمەو پاش لە فێر بوونی قورئان و خوێندنیدا هەوڵ بدەن و منالەکانتان فێربکەن، بەڵکو ببێتە هۆی بەختیاریتان لە هەردوو دنیادا ان شاء الله. والسلام علی من رحم نفسه فاطاع الله ورسوله صلي الله علیه وسلم تسلیما.

## نامەی هەژدەیەم

# بۆ عەشرەتی جاف

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله، والصلاة والسلام علي رسول الله، وعلي الة وصحبه المجاهدين لاعلاء كلمة الله.

پاش ئەمانە براکانم! نامەکانی دوستی خۆتان، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر گەورەترین دیارییەکە دۆست بۆ دۆستی ڕەوانە کردبێ، ئەوەتا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ [ما اهدى مسلم لاخيه هدية افضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى او يردە بها عن ردى] کەواتە هەروەك بە دیاری دنیایی دڵخۆش و دڵشاد دەبن پێویستە بە دیاریی ئاینی خودایی باشتر دڵشاد ببن، وە لە کاتی خوێندنەوەی نامەکانمدا بەهۆی درێژییانەوە مەلوول و دڵ پەریشان نەبن، ئەمەش نیشانەی بەهێزیی ئیمانتانە؛ چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی گەورەترین خووڕەوشتی ئینسانی موسڵمان ئەوەیە کە لە بیستنی قسەی خێری ئاینی تێر نەبێ.

نامەی تەعلیمی گوناهەکانیش بۆ تەرك کردنیان دیارییەکی گەورەیە؛ ئیمامی عومەر (د.خ) کە کاروباری موسڵمانانی گرتە دەست و بوو بە خەلیفە بە هاوڕێیەکانی پێغەمبەری دەفەرموو: هەر عەیبێکم هەیە پێم بڵێن تا تەرکی بکەم و وازی لێ بهێنم، هەروەها دەیفەرموو: [رحم الله امرء اهدى الي عيوبي] واتە ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ عەیبەکانی خۆمم بە دیاری بۆ بێنێ و چی کاری نارەوام هەیە بێ شەرم پێم بڵێ، بەڵام دۆستی وەها نایابەو، ئەم دۆستەی خۆتان لەو دۆستە نایابانەیە.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "اذا حمل الرجل كلمة من الله الى اخيه المسلم كان خيرا له من حجة وعمرة ومن عبادة سنة" واتە ئەگەر ئینسان قسەیەکی خێر لای خواوە بۆ برای موسڵمانی بەرێ ئەوە خێری لە حەجێك و عەمرەیەك و خواپەرستی ساڵێك چاکترە. لەبەر ئەمە عەرزتان دەکەم مەرتەبە و پایەکانی موسوڵمان زۆرن، کەمترین پایەی

موسڵمانی ئەوەیە ئەو موسڵمانە چەند بایەخ بە پێویستیی دنیایی دەدا ئەوەندەش بایەخ بە پێویستیی قیامەتی بدات و، چەند بەو دڵخۆش دەبێ بەمیش وەها دڵخۆش بێ. لە عورفی کوردانا بەم جۆرە موسڵمانە دەڵێن (پۆخڵ موسڵمان) دەلیلی ئەمەش ئەوەیە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی [لا اله الا الله] رق و قینی خودا لە هەموو بەندەکانی خوا لادەدا هەتا ئەوان لەناو خۆیاندا قازانجی دنیا بەسەر قازانجی دیندا پەسەند نەکەن، بەڵام کاتێ ئیختیاری سوود و قازانجی دنیایان کرد بەسەر قازانجی دینا، واتە: بۆ دنیا نوێژ و ڕۆژوو عیبادەتیان زایە کردو، فەرقی حەرام و حەڵاڵیان نەکرد ئەوسا ئەگەر (لا اله الا الله)یش بکەن، خوای گەورە شەڕیان لێ دوور ناخاتەوە و، دەفەرموێ ئەمانە درۆ دەکەن، هەر بە دەم و زمان ناوی من دەبەن و، دڵیان لای من نییە.

براکان! من وادەزانم ئێوە ڕاست ناکەن؛ چونکە تا ئێستە چەند نامەم بۆ ناردوون و هیچ گوێتان پێ نەداوە، وادیارە لەمەو پاش هەر گوێی پێ نادەن، کەچی بەدیاریی دنیایی کەیف خۆش دەبن.

ئەی دەشت نشینان چەند جار تکام لێ کردن و بۆم نووسین و تەرغیبم کردن لەسەر زیندوو کردنەوەی ئادابی ئیسلامی کە بانگ و نوێژی جەماعەت و مزگەوتی پاك و خاوێنە، دەوارێك یا چادرێکی حەڵاڵ و تازەی چوار هەسوونییە لەگەڵ خادمێکی دەم و چاو پاکی نوێژکەری ڕۆژووگر و بانگدەرێکی دەنگ خۆشە، کەچی ئێوە، لەگەڵ ئەو هەمووە دەستەڵاتە و لەگەڵ ئەو مەڕوماڵاتەی کە خودا پێی داون، گوێتان پێ نەدا، تەنانەت خۆتان نەگەیاندە کەمترین پایەی موسڵمانی. ئیتر من نازانم چی بکەم و چی بڵێم.

ئیمام فەخرەدینی ڕازی و هەندێ لە پیاوانی ڕێبازی (تەسەوف) فەرموویانە: مەعنای حەدیسی (من عرف نفسه فقد عرف ربه) ئەوەیە هەر کەسێ نەفسی خۆی بناسێ بەو سیفەتەی کە خوا دروستی کردووەو بە خوای خۆی موحتاجە و بەبێ یارمەتیی ئەو ناتوانێ هیچ شتێك بکا ئەوە بە ڕاستی خوای خۆی ناسیوە. براکان! مەعنای خۆناسین ئەوە نییە کە ئینسان بڵێ من جیسمم و گۆشت و پێست و ئێسقانم و دڵ و سك و هێزی ئارەزوو، هێزی ڕق گرتن و، مەیلی خواردن و خواردنەوەم تێدا هەیە؛ چونکە ئەم جۆرە خۆناسینە لە حەیوانیشدا بەشێوەیەکی گشتی هەیە، هەروەها ئینسانییەت بە قسەکردن و بە ڕیش و بە گیانداری نییە چونکە (تووتی)ش قسە دەکا، بزنیش ڕیشی هەیە، حەیوانی

بێ شعووریش گیانی هەیە، بەڵکو لە خۆناسیندا پێویستە ئینسان بە ڕاستی خۆی لە گیانلەبەرە بێ شعوورەکان جیابکاتەوە، ئەوە بزانێ کە خودای گەورە بۆیە عەقڵ و هۆشی پێ داوە هەتا بیریکاتەوە لەوەی کە لەمەوپێش نەبووەو خوا دروستی کردوە، لە سکی دایکیا پەروەردەی کردوەو، هێناویەتە دەرەوە تا بە هۆی هێزی ڕووناکیی عەقڵەوە، بزانێ پەروەردگارێکی زانا و توانای خاوەن خواست، دروستی کردووە، بێجگە لەوەی کە عەقڵ و هۆشی پێ بەخشیوە، ڕەهبەرێکی دەم و دڵپاك و خووڕەوشت بەرزیشی بە پێغەمبەری ناردووەتە سەر، ئەم ڕەهبەرە دەستووری ئاینی پێ گەیاندووەو، هەتا ئەم ئینسانە بە هۆی عەقڵ و هۆش و لەبەر ڕووناکیی تەمێ و ئامۆژگاریی ئەم ڕەهبەرە پایەبەرزەدا ڕێگای بەختیاری بگرێتە بەر و لەسەری بمێنێتەوە هەتا بە سەربەرزی بژی، وە بە پاکی بڕواتە حوزوری خوای گەورە. لەم بەیانییەوە دەردەکەوێ کە ئادەمیزاد وەکو باقیی حەیوانات نییە، چونکە بەختیاریی حەیوانات لەوەدایە کە زۆر بخون و قەڵەو بن و مەینەت و کارو بارکێشانیان نەبێ کە وانەبوو دەفەوتێن، بەڵام بەختیاریی ئادەمیزاد لەوەدایە کە بیروباوەڕی پاك و بەجێی بێ، خووڕەوشتی جوان و پەسەندی بێ و، بەقەدەر توانا لەو ڕێ و شوێنەوە بڕوات کە ڕەهبەری گەورە پیشانی داوە، خزمەتی خۆی و باقیی ئادەمیزاد بکا، هەتا ئاکامی دێ و بە سەربەرزی دەمرێ. خۆ ئەگەر هەمیشە خوو بداتە خەیاڵاتی دنیا و ئارەزووی نەفس ئەوە خووی حەیوانات دەگرێ و لەسەر حاڵی ئولفەت گرتن بە حەیوانەوە دەمرێ. وەکو بیستوومە هەندێ شوان لە کاتی گیانەڵادا لەباتی دوو کەلیمەی شەهادەت (هەوهەو)ی کردووە بۆ لێخوڕینی حەیوانەکانی و (هەڕهەڕ)ی کردووە بۆ مەنعیان، (بۆرەبۆرە)ی کردوە بۆ بانگکردنی سەگەکەی؛ چونکە لە کاتی ژیانیدا لەگەڵ ئەمانەدا ژیاوەو ئولفەتی پێیانەوە بوەو هەر خەریکی ئەمانە بووە، دیارە لە کاتی مردنیشدا هەر بەو حاڵەوە گیانی دەرچووە [پەنا بەخوا لە حاڵی خراپ]. حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: "کما تحیون تموتون وکما تموتون تبعثون" واتە لە کاتی ژیاندا چۆن ژیاون و لەگەڵ کێ بوون بەو جۆرە دەمرن، هەر چۆنیش بمرن لە ڕۆژی قیامەتدا بەو جۆرە زیندوو دەکرێنەوە.

بەنرخترین دەرز و ئامۆژگارییەك کە لە ڕەهبەی گەورەوە، وەرمان گرتووە ئیمان و عەقیدە و بیرو باوەڕی باشە، واتە باوەڕ بە خودای گەورە کە پەروەردگاری جیهانە؛ باوەڕ بە فریشتەکانی خوای مەزن، باوەڕ بەو پێغەمبەرانەی خوا ناردوونی بۆ سەر بەرەی ئادەمیزاد و پەری، باوەڕ بەو کتێبانەی کە خوای گەورە بە فریشتەی ئەمین

(جوبرەئیل)دا، درووودی خوای لیٚ بیٚ، ناردوونی بۆ پێغەمبەران، باوەڕ بەوەی هەرچی لە جیهاندا روودەدا هەمووی خوای گەورە دەیکا، هەروەها ئەم جیهانە نەبووە و خوا دروستی کردووە، باوەڕ بەوەی کە ئەم جیهانە نامێنیٚ و گیانلەبەران هەموو دەمرن و لەپاشاندا خوا زیندوویان دەکاتەوە و حیسابی کردەوەیان لەگەڵ دەکا، جا باشەکان و رەفتار چاکەکان رەوانەی بەهەشت دەکاو هەتا هەتایە لەویٚ دەمێننەوە، بەدرەفتارەکانیش ئەگەر موسڵمان و خاوەن ئیمان بووبن یا عەفوو دەکریٚن یا بەقەدەر تاوانەکانیان لە دۆزەخدا ئازار دەدریٚن، ئەوسا لە دۆزەخ دەردەچن و بە حورمەت رەوانەی بەهەشت دەکریٚن و لەویٚدا هەمیشە دەمێننەوە. کافرە بیٚ باوەڕەکانیش دەخرێنە دۆزەخ و لەویٚدا هەمیشە دەمێننەوە؛ چونکە پاداشی باوەڕی نارەوای بیٚ دوایی سزای نەبڕاوەی بیٚ دواییە.

دەبیٚ بزانن ئەم بیر و باوەڕە باشانە وەکو دارێکی بۆنخۆشی گەورەی وەهان کە ڕەگ و ریشەی چووبێتە خوارەوە بە عەرزا و لقەکانی بەرز بووبنەوە بۆ ئاسمان، کردەوەی باشیش وەکو ئاوە بۆ درێژ بوون و گەشەکردن و مانەوەی ئەم دارە گەورەیە، بەقیمەتترین کردەوەیەك کە ئاوی ئەم داری ئیمانەی پیٚ بدریٚ نوێژە بە مەرجێك کە بە ساغی و موافیقی شەرع، لەگەڵ شەرت و رووکنەکانیداو بە ئیخلاسی دڵ جێبەجیٚ بکریٚن. جا لەبەر ئەوەی کە بە زۆری نوێژ لە مزگەوتدا دەکریٚ و جەماعەتیش لە نوێژدا زۆر بەنرخە، هەندیٚ فەرموودەی حەزرەتتان پیٚ دەگەیەنم (د.خ) دەربارەی نوێژی جەماعەت و گەورەیی مزگەوت، هەتا بە یارمەتی و تەوفیقی خوا بێتە هۆی مەیلی ئێوە بۆ بەختیاریی دین و دنیاتان و بەم حاڵە جوانەوە بگەن بە حوزووری خوای گەورە.

لە حەدیسێکدا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی نوێژێکی جەماعەت کە بە دوو کەس بکریٚ و یەکیٚ لەو دووانە ئیمامەکە بیٚ پاداشی زۆرترە لە (٢٧) نوێژی تەنیا. وە فەرموویەتی: هەر کەسیٚ ڕووی کردە مزگەوت هەر هەنگاویٚ بنیٚ دەبێتە هۆی ئەوەی پایەی بەرز بێتەوە و گوناهی لەسەر لا ببریٚ و، خێرێکی بۆ دەنووسریٚ. هەروەها فەرموویەتی هەر کەسیٚ رۆیشتە ناو مزگەوتەوە ئەوە وەها بڕیار دەدریٚ کە لە نوێژکردندایە و بەردەوام خێری بۆ دەنووسریٚ هەتا لەو مزگەوتەدا بەنیازی نوێژکردن بمێنێتەوە. لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ مەلائیکە سەڵەوات لەو کەسە دەدەن کە لە مزگەوتدایە هەتا لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، دەڵیٚ خوایا ئەم ئینسانە عەفوو بکە و ڕەحمی پیٚ بکە و تەوبەی لیٚ قبووڵ بکە. ئەم چاکەیە هەر بەردەوام دەبیٚ مەگەر ئەو ئینسانە ئازاری یەکێك بدات یا قسەیەکی

نارەوا بکا، کە ئەمانەی کرد ئەو خێرو چاکەی نامێنێ.

ڕیوایەت کراوە: کە هەر مزگەوتێ چەند مەلائیکە دەرگاوانیەتی، چەند مەلائیکەش نێردراون بۆ ئەوەی لە خودای گەورە داوای عەفوو و میهرەبانی بۆ ئەو کەسانە بکەن کە دەڕۆن بۆ مزگەوت، چەند مەلائیکەش مەئمووری ئەوەن بانگ لە موسڵمانان بکەن بێن بۆ نوێژی جەماعەت لە مزگەوتدا و دەڵێن ئەی موسوڵمانەکان زوو بە زوو خۆتان ئامادە بکەن و بێن بۆ نوێژی جەماعەت، بێن بۆ ئەو خێراتەی کە خوای گەورە بۆ ئەهلی مزگەوتی بڕیارداوە، بەپەلە بێن و بگەن بە عەفووی خوای گەورەدا، جا هەر کەس زوو بگاتە مزگەوت هەزار حەسەناتی بۆ دەنووسرێ، بەڵام کاتی لە مزگەوت دەرچوون هەر کەس زووتر لە مزگەوت دەرچێ خەیری کەمتری بۆ دەنووسرێ و، ئەو کەسەش لە دوای هەموو کەسەوە بچێتە دەرەوە گەلێك جەزای بۆ دەنووسرێ، مەبەست ئەوەیە کە پەیوەندی بە مزگەوتەوە، دەبێتە هۆی عەفووی خوا و، دەبێتە هۆی سەربەرزیی موسڵمان لە ڕۆژی قیامەتدا.

لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی بەجێهێنانی نوێژی جەماعەتی عیشا بەقەدەر زیندووکردنەوەی نیوەی شەو و، جەماعەتی نوێژی سبەینێ بەقەدەر زیندووکردنەوەی نیوەکەی تری خێر و پاداشی چاکەی هەیە، واتە: کەسێك نوێژی عیشا و نوێژی بەیانییان بە جەماعەت بکا وەکو، ئەوەیە کە بەدرێژاییی شەو خواپەرستیی کردبی، لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ شەیتان گورگی ئینسانە، واتە وەك چۆن گورگ مەڕ و بزن هەڵدەدڕێ و دەیانخوا. شەیتانیش وەها ئادەمیزاد لە دین دەردەکا و بێ خەیری دەکات، هەروەك گورگ ناتوانێ زیان لە حەیوانێك بدا کە لە ناو ڕاندا بێ و لەبەر چاوی شوانا بێ، شەیتانیش زاڵ نابێ بەسەر ئینسانێکدا کە لە ناو جەماعەتدا بێ و لەبەر چاودێریی پێشەوادا بێ. هەروەها لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: [علیکم بالجماعة والمسجد] واتە: هەمیشە لە ناو گەلی موسڵمانان و مزگەوتدا بن و، لە کاتی عیبادەتدا لە مزگەوتدا بن. هەروەها لە حەدیثێکی تردا فەرموویەتی: ئەوانەی کە زۆر دەڕۆن بۆ مزگەوت لە تاریکیدا ئەوانەن کە زۆر کەوتوونەتە ناو ڕەحمەتی خوداوە.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ موژدە بدەن بە ئوممەتی من، ئەوانەیان کە بە تاریکی دەڕۆن بۆ مزگەوت، لە ڕۆژی قیامەتدا خوا نوور و ڕووناکیی فراوانیان پێ دەدا. دیسان لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: هەر کەس بەیانی و ئێوارە ڕووی لە مزگەوت بێ، ئەوە

بە میوانی خوا دادەنرێ و خوا ڕێزی لێ دەگرێ، واتە ئەگەر ڕۆژی (١٠٠) جار بڕواتە مزگەوتەوە هەموو جارێ لەو جارانە دەگاتە خێر و میهرەبانیی خوای گەورە.

لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: هەر کەسێ چل ڕۆژ لەسەر یەك نوێژی جەماعەت بکاو بگات بە تەکبیری تەحەڕومی ئیمامدا، واتە لەو کاتەدا کە ئیمام (الله اکبر) دەکا، حازربێ و فریای بکەوێ ئەوە زوو بەرائەتی بۆ دەنووسرێ، واتە ڕزگار دەبێ لە دوو شت: یەکەم لە نیفاق، واتە بە هۆی نوێژکردنیەوە لەم جەماعەتەدا ئیمانی دەپارێزرێ و بە موسڵمانی دەمرێ. دووەم ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ. لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: ئەی (بنی سلمة)! ئا ئێوە حسێبی نیشانە و شوێن پێی خۆتان ناکەن لە کاتی ڕۆیشتنتاندا بۆ مزگەوت وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: "ونكتب ما قدموا وآثارهم" واتە ئێمە ئەو کردەوە باشانە کە موسوڵمانان کردوویانن و خستوویانن پێش خۆیانەوە، دەیان نووسین لەگەڵ ژمارەی شوێنی پێیان لە کاتی ڕۆیشتنیاندا بۆ نوێژ بۆ مزگەوت.

لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: خوای گەورە خۆشی دێ لە نوێژی جەماعەت، تەنانەت لەو کاتەدا کە نوێژکەرەکان لە مزگەوتدا ڕیز دەبەستن بۆ نوێژکردن. من بەهۆی ئەوانەوە شانازی بەسەر فریشتەکاندا دەکەم. هەروەها لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: هەر کەسێ چل ڕۆژ بە ڕکاتی یەکەمی نوێژی جەماعەتدا بگا خوای گەورە لە سزای دۆزەخ ئازادی دەکا و بە ئاگری جەهەننەم نایسووتێنێ.

لە حەدیثێکی تردا فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا دەبارێتە سەر ئەهلی مزگەوت. هەروەها لە حەدیثێکی تردا فەرموویەتی: هەر کەس لە عومری خۆیدا نوێژەکانی هەموو بە جەماعەت بکا، واتە جەماعەتی پێنج فەرزە نەفەوتێنێ لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ تاقمی یەکەمدا بەسەر پرددا ڕادەبوورێ کە ئەو تاقمە وەکو برووسکە بەسەر پرددا تێ دەپەڕن. شایانی زانینە کە پرد (سیرات) حەوت پلەی هەیە کە هەر کام لەو حەوت پلانە هەزار ساڵ ڕێ بەرەو ژوورکەو، هەزار ساڵ ڕاستەڕێ و هەزار ساڵ بەرەو خوارکەی هەیە، واتە: ئەو تاقمە یەکەمە کە وەکو برووسکە بەسەر ئەو پردەدا تێ دەپەڕن ماوەی بیست و یەك هەزار ساڵ ڕێگە وەك برووسکە دەبڕن و بە ماوەیەکی زۆر کەم لێی تیپەڕ دەکەن.

لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: هەر کەسێ دەستنوێژ بگرێ و بڕواتە مزگەوت بە نیازی نوێژ و عیبادەت ئەوە بۆ زیارەتی خوای گەورە ڕۆیشتوە، دیارە هەر کەسێ بۆ زیارەتی خوای گەورە بڕوات ئیکرام و ڕێزلێگرتنی لە لایەنی خواوە ڕاستە. دیسان لە

حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێ: ئەوە دراوسێکانی من لە کوێن؟ فریشتەکانیش بە سەرسامییەکەوە عەرزی دەکەن و دەڵێن: خودای گەورە! کێ شانی ئەوەی هەیە دراوسێی تۆ بێ؟ خودا دەفەرمووێ: ئەو کەسانەی کە مزگەوتەکانیان بە خودا پەرستی ئاوەدان کردوەتەوە ئەوانە دراوسێی منن. وەکو خودای گەورە فەرموویەتی: "إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ...

ڕیوایەت کراوە کە هەموو شەوێ مەلائیکە بانگ دەکەن: ئەی ئەهلی گۆڕستان ئیستە خۆزگە بە کێ دەخوازن؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: خۆزگە بە ئەهلی مزگەوت دەخوازین. ئەوان نوێژ دەکەن و ئێمە نوێژمان نەدەکرد، ئەوان ذیکری خودا دەکەن و ئێمە نەمان دەکرد. ئیمامی عەلی (ر.خ) فەرموویەتی: مەعنای ئایەتی «سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاء وَالْأَرْضِ» ئەمەیە کە تێبکۆشین لە پێش خەڵکدا بڕۆینە ناو مزگەوتەکان و لە پاش ئەوان بێینە دەرەوە لە مزگەوت هەتا بەر عەفوی خودا بکەوین. هەروەها لە حەدیثێکی تردا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ: خودای گەورە دەفەرمووێ کاتێ کە قەومێ شایانی سزای من دەبن کە دەبینم هەندێ لەوانە لەبەر ڕەزای من دێن بۆ مزگەوت، لەبەر ڕەزای من یەکتریان خۆش دەوێ، لەبەر ڕەزای من لە بەرەبەیاندا دەپاڕێنەوە لە من و داوای لێبووردن و عەفوم لێ دەکەن، بە هۆی ئەمانەوە ئەو سزایەیان لێ لا دەدەم و چاوپۆشییان لێ دەکەم.

لە حەدیثێکی تردا دەفەرمووێ: مزگەوتەکان بازاڕی قیامەتن، واتە: وەکو لە دنیادا بازاڕ هەیە و ژیانی ئەهلی دنیا بە شتومەکی بازاڕە، مزگەوتەکانیش کە خودا پەرستییان تیا دەکرێت وەك بازاڕی قیامەتن، بەهۆی مزگەوت و ئەهلی مزگەوتەوە و بە هۆی خودا پەرستی لە مزگەوتدا ئەوەی کە هۆی ئاسایش و بەختیاریی ئینسان بێ لە قیامەتا دەست دەکەوێ، ئەو بازاڕەی قیامەت کە مزگەوتە هی خودایە و ماڵی خودایە و، هەر کەس بڕواتە ناویان بە میوانی خوا حسێب دەکرێ و، میوانی خودایش پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ. لە جوملەی ئەو ڕێزەیە ئەمە کە بە هۆی پیرۆزیی کردەوەی ئەوانەوە خودا میهرەبانی و کەرەم لەگەڵ ئەهلی زەویدا بکا.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ ئەوانەی کە ئەهلی مزگەوتن و عیبادەت دەکەن لە مزگەوتدا وەکو ئەرکانی مزگەوتن، واتە: مزگەوت بە هۆی ئەوانەوە بە ئاوەدانی دەمێنێتەوە، ئەو مەلائیکەتانە کە وان لە مزگەوتدا هاوڕێ و هاودەمی ئەوانن، ئەگەر

یەکێ لەو نوێژکەرانە نەخۆش بکەوێ دەڕۆن بۆ لای دوعای خێری بۆ دەکەن، وە ئەگەر کەوتە نێو ئیشێکەوە یارمەتی دەدەن هەتا بە ئاسانی لەو ئیشە ڕزگار ببێ. لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: بەجێهێنانی موسڵمان بۆ نوێژی فەرز بە جەماعەت لە ڕۆژووی سوننەتی ڕۆژێك و نەنووستن و عیبادەتی شەوێك خێری زۆرترە و لای خوا خۆشەویستترە.

ئەی براینە ئەوە بزانن کە هەر دێیەك مزگەوتی نەبێ و جەماعەتی تێدا نەکرێ لەم هەمووە خێراتە بێ بەش دەبێ، جا ئیتر لێکی بدەنەوە ئاخۆ بێ موبالاتی بە دین ئا بەم رادەیە لایقە بۆ یەکێ کە خۆی بە موسڵمان بزانێ، ئایا بە پیاوی موسوڵمان ڕەوایە خۆی لەم هەمووە خێر و پاداشە بێ بەش بکا؟ فەرموودەکانی پێغەمبەر سەبارەت بە خێر و پاداشی نوێژی جەماعەت زۆرن، ئەگەر کەسێ ڕەحم بە خۆی بکا ئەم ئەندازەیە کە نووسیمان بۆتان بەسە، خۆزگا کاغەز زۆرتر بووایە و، شەویش درێژتر تا باسی سزاو ئازاری ئەوانە کە جەماعەت ناکەن، بە تەواوی بمنووسیایە، بەڵام وتووێژ بێ سوودە لەگەڵ ئەوانەی کە نامەی درێژی ئێمە ناخوێننەوە و تاقەتیان لێی نییە، بەڵام تاقەتی ئەوەیان هەیە کە شەو و ڕۆژ قسەی بێ هوودە و بێ سوود بکەن! ئایا نازانن ئەگەر ئەو قسە درێژانە باسی شتی حەرام و باسی گوناهکردن بێ، دەبێتە مایەی سزای قیامەت، وە ئەگەر باسی شتی حەڵاڵیش بێ، دەبێتە هۆی عیتاب و سەرزەنشت لە ڕۆژی قیامەتدا، کە بۆچی کاتی ئەو قسە بێ سوودانەتان لە خوا پەرستیدا سەرف نەکرد؟ بۆچی عومری خۆتان بە خۆڕایی لە کیس دا؟

(ابو مدين)ی مەغریبی (ر. خ) کە یەکێکە لە زانا گەورەکان لە حەزرەتەوە (د. خ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی هەر موسڵمانێ نوێژ بکا ئەوەندەی بۆ دەنووسرێ لە نوێژەکەی کە تێی بگا و دڵی ئاگای لێ بێ. لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ کە سەوابی نوێژی ئینسانێك کە بە تەنیا نوێژ بکا بە قەدەر ئاگاداریی دڵی ئەو کەسەیە، نوێژی جەماعەتیش ئەگەر جەماعەتەکەی گەورە نەبێ ئەویش وەکو نوێژی تەنیا وەهایە، بەڵام ئەگەر جەماعەت گەورە بێ و قەرەباڵغی نوێژکەر زۆر بێ، ئەوە هەرچەند ئینسانی نوێژکەر غافڵ و بێ ئاگا بێ و فیکری لای نوێژەکەی نەبێ هەر سەوابی زۆری بۆ دەنووسرێ.

هەندێ لە زاناکانی ئاین فەرموویانە غافڵ بوونی دڵ تەنیا بۆ نوێژکەری بە تەنیا

زیانی هەیە، بەڵام ئەگەر بە جەماعەت نوێژ بکا سەوابی بۆ دەنووسرێ چ ئاگای دڵی ببێ یا نەیبێ، لەم ڕووەوە ئەو حەدیسە کە فەرموویەتی ئینسانی نوێژکەری غافڵ خێری بۆ نانووسرێ مەعناکەیان بڕیوە بە سەر نوێژکەری بە تەنیادا. هەروەها لە ئیشارەتی هەندێ حەدیسەوە وا دەردەکەوێ کە خوای گەورە بە هۆی حزووری دڵی یەك ئینسانی موسڵمانەوە نوێژی غافڵەکانیش بە تەواو دەنووسێ، چونکە نوێژی هەموو ئەهلی جەماعەت بە یەك نوێژ دادەنرێ کە تاقە ئینسانێ بیکات، چونکە جەماعەتەکە بەستراوە بە پێشەواییەکەوە بۆ نوێژکەرەکان هەموویان.

هەندێ لە زانا ئاینییە پێشووەکان فەرموویانە هەر کاتێ ئیمام و مەئموومەکان نوێژی جەماعەتیان دابەست خوای گەورە تەماشای دڵی ئیمامەکە دەکا، ئەگەر خێر لە دڵیدا بێ، خوا بەهۆی بەرەکەت و یومنی ئەو ئیمامەوە لە هەموو مەئموومییەکان ڕازی دەبێ و، نوێژەکانیان لێ قبووڵ دەکات و هەموویان عەفوو دەکا، وە ئەگەر خێر لە دڵی ئیمامەکەدا نەبوو تەماشای دڵی مەئموومییەکان دەکا، ئەگەر خێر لە دڵی یەکێ لەواندا ببێ بە بەرەکەتی ئەویەکەوە خوای گەورە لە مەئموومەکانی ترو لە ئیمامەکە ڕازی دەبێ و نوێژەکەیان قبووڵ دەکا و گوناهیان عەفو دەکا، خۆ ئەگەر هەموویان غافڵ بوون، واتە ئیمام و مەئموومەکان وەك یەك بێ ئاگا بوون، خوای گەورە هەر ڕیعایەتی ئەوە دەکات کە ئەو کۆمەڵە میوانی ئەون و هاتوون بۆ مزگەوت کە ماڵی ئەوەو، بەم بۆنەیەوە لە گوناهی هەموویان چاوپۆشی دەکا و دەفەرمووێ لایقی کەرەمی من ئەوەیە کە ئەم میوانانە هەموویان عەفوو بکەم.

براینە! پاش بیستنی ئەم هەموو میهرەبانی و کەرەمی خوایە لەگەڵ ئەهلی جەماعەتدا موناسبی حاڵی ئەهلی جەماعەت ئەوەیە کە شاد و دڵخۆش بن بە ڕەحمەتی خوا، ئەوانەش کە جەماعەت تەرك دەکەن موناسبی حاڵیان یا تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوەیە و، لە باقیماندەی عومریاندا دەس بە نوێژی جەماعەت بکەن، یا لە داخ و حەسرەتدا بۆ خۆیان بمرن، چونکە لەم هەموو خێراتە بێ بەش بوون.

پێویستە بزانن ئەوانەی دەربارەی جەماعەت کەمتەرخەمن دڵیان لە نووری ڕەحمەتی خوا دوورە، بەڵام ئەوانەی لەسەر جەماعەت بەردەوامن دڵیان بە نووری ڕەحمەتی خوای گەورە ڕووناکە، بێگومان تەرکی جەماعەت نیشانەی منافقی و لاوازیی ئیمانە؛ چونکە عیززەت و گەورەیی ئینسان لە دنیا و قیامەتدا لە بەجێهێنانی عیبادەتدایە، لەوەدایە کە

ئینسان بەرامبەر بە مافەکانی خوای پەروەردگار بە وەفا بێ. ئەو کەسانەی کە جەماعەتیان کردووە بە عادەتی خۆیان دڵیان دێتە سەر ئەوەی کە خزمەتی مزگەوت بکەن و فەرش و چراو بەرماڵ و باقیی پێویستییەکانی تری مزگەوت ئامادە بکەن، ئەمانەش لە جوملەی خێراتی دەوامدارن، یەکەم بە هۆی ئەم شتانەوە کە بە مزگەوتیان دەدەن، دووەم بە هۆی ئەوەوە کە دەبنە پێشەواو نموونە بۆ باقیی ئەهلی چاکە و، خەڵکی چاویان لێ دەکەن.

لە حەدیسدا هەیە هەر کەسێ چرایێ لە مزگەوتدا دابگیرسێنێ، واتە ڕووناکی بخاتە مزگەوتەوە حەفتا هەزار مەلائیکە دوعای خێری بۆ دەکەن، هەتا ئەو ڕووناکییە بەردەوام بێ. وە ئەگەر فەرش بخاتە مزگەوتەوە هەتا ئەو فەرشە بمێنێ حەفتا هەزار مەلائیکە لە خوای گەورە داوا دەکەن لە تاوانی ئەو موسڵمانە ببوورێ. هەروەها لە حەدیسێکدا دەفەرمووێ هەر کەس دەیەوێ ئەلحەدی قەبری ڕووناك بێ با مزگەوت ڕووناك بکاتەوە. لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی هەر کەس مزگەوتێ دروست بکا، هەرچەند لە هێلانەی (کورکورە)یش بچێ، واتە لە شێوەدا بچووك و نامەحکەم بێ، خوا لە باتیی ئەو مزگەوتە لە بەهەشتدا کۆشکێکی پێ دەبەخشێت، جا ئیتر خۆتان لێکی بدەنەوە دەبێ کۆشکی بەهەشت چەند جوان و نایاب بێ، وەکو لە باسی بەهەشتدا باسی دەکەین. ئەی براینە! ئەگەر مزگەوت نەبێ و عیبادەت کردن لە مزگەوتدا نەبێ ئەم خێرانەتان دەست ناکەوێ. حەزرەت (د.خ) تەرکی جەماعەتی بە نیشانەی منافقی حسێب کردووە و، مەبەست لە حەدیسەکە ئەوەیە هەر کەسێ تەرکی جەماعەت بکا، منافقە و ئیمان لە دڵیدا دانەمەزراوە، دیارە کەسێ کە حەزرەت (د.خ) پێی بفەرموێ (منافق) ئەوە بە هیلاك دەچێ.

لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: دەمەوێ بڕۆمە سەر ئەو کەسانەی کە نایێن بۆ جەماعەت، خانووەکانیان بسووتێنم. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی موسڵمان لە مزگەوتدا وەکو ماسی وایە لە دەریادا (واتە هەمیشە بە خۆشی تیا دەمێنێتەوە) بەڵام منافق لە مزگەوتدا وەکو پەلەوەرە لە نێو قەفەسدا. دیسان لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: لە هەر شوێنێکدا سێ خانوو گرد ببنەوە چ دەوارنشین و کۆچەری، مادام جەماعەت نەکەن شەیتان بە سەریاندا زاڵ دەبێ، واتە: هەموو ئینسانێ گەورە و بچووك فریشتەیەك و شەیتانێك بۆ دڵی ڕەوانە کراوە، جا ئەگەر ئەو خاوەن دڵە خەریکی یادی خوا بوو، تەرکی مزگەوت و جومعە و جەماعەتی نەکرد، ئەوە هێزی فریشتەکە پەرە دەسێنێ بە سەر شەیتانەکەدا و ئەو ئینسانە دەگۆڕێ و دەسەڵاتی

شەیتانەکە دەشکێنێ تا نەتوانێ ئەو ئینسانە گومڕا بکا، خۆ ئەگەر ئەو خاوەن دڵە خەریکی زکری خودا نەبێ ئەوا دڵی تاریك دەبێ و هێزی مەلائیکە کەم دەبێ و، هەتا ئەم کابرایە پەشیمان نەبێتەوە و تەوبە نەکا ئەو شەیتانە دەستبەرداری نابێ و گومڕای دەکات و، ڕۆژ بە ڕۆژ لە ڕزگاری دوور دەکەوێتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: "يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ[٤٢] خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ" واتە لە ڕۆژێکدا خەڵك دەکەونە ناڕەحەتییەوە و ئادەمیزادەکان بانگ دەکرێن، بۆ سوجدەبردن بۆ خوا و لەو پایە بەرزە پڕ مایە نائومێد دەبن، لەو کاتەدا بە چاوشۆڕی دەمێننەوە و شەرمەزاری داگیریان دەکا. ئەم حاڵە ناڕەوایەش لەبەر ئەوە دێ بەسەریاندا چونکە وەختی خۆی بانگ کراون بۆ ئیمان هێنان بە خوا و پێغەمبەری خوا و بۆ نوێژکردن و سوجدە بردن بۆ خوا، کە لەو حاڵەدا ساغ و سەلامەت و تەندروست بوون، کەچی لەبەر ملهوڕیی خۆیان ئیمانیان نەهێنا و سوجدەیان نەبرد، جا ئیستەش لە پاداشی ئەو ملهوڕییەدا دەبێ نائومێد بکرێن لە پایەی سوجدەبردن لە خوای گەورە. جا وەکو وتمان ئەم ئایەتە موبارەکە دەربارەی کافرەکان هاتووەتە خوارەوە، بەڵام هەندێ لە زانا (مفسر)ەکانی قورئانی پیرۆز فەرموویانە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو کەسانە هاتووەتە خوار کە لە دنیادا ڕۆژی پێنج جار بە هۆی بانگەوە (مؤذن) بانگی کردوون بە حي على الصلاة وحي على الفلاح بۆ ئەوەی بێن بۆ مزگەوت و نوێژەکەیان بە جەماعەت بکەن کەچی نەهاتوون بۆ جەماعەت و، هیچ عوزرێکی شەرعیشیان نەبووە، ئەمانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتێکدا کە موسڵمانان بانگ دەکرێن بۆ ئەوەی سوجدەی تەعزیم بۆ خوای گەورە ببەن و، موسڵمانە باشەکان دەڕۆن و سوجدە بۆ خوا دەبەن و، بەو پایەی لیقای تەجەلیاتە دەگەن، ئەوان پشتیان دەبێ بە تەختە و ناتوانن سوجدە ببەن بۆ خودای گەورە و لەو پایە بەرزە بێ بەش دەبن، جا لەو کاتەدا فریشتەکان پێیان دەڵێن: لە دنیادا ئێوە بانگ کرابوون بۆ سوجدەبردن بۆ خوا لە مزگەوتدا و لەگەڵ جەماعەتدا، بەڵام ئێوە موبالاتتان نەکرد، بۆیە وا ئیستە لەو بەش و بەهرەیە بێ بەش بوون.

لە عەبدوڵڵا ی کوڕی عەباسەوە دەگێڕنەوە (ر.خ) کە کابرایەك تا ماوەی مانگێ پرسیاری لێ دەکرد لە حاڵی کەسێ کە بە ڕۆژدا بە ڕۆژووەو بە شەودا نوێژ دەکات، بەڵام ناڕوات بۆ جەماعەت لە نوێژەکانیداو بە تەنیا نوێژەکانی دەکا، ئەویش وەڵامی دەدایەوە و دەیفەرموو "هو في النار". هەندێ کەس دەڵێن ئەم پرسیار و وەڵامە تا ساڵێ دەوامی

کرد و ئیبنو عەباس لەسەر وەڵامەکەی خۆی مایەوە.

دەگێڕنەوە کە لە شاری کووفە پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو نەدەرۆیشتە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، جارێ لە جاران ئەو پیاوە مێوانداریيەکی گەورەی سازدا و خەڵکی بانگ کرد بۆ سەر خوان، لە موسڵمانان کەس حازری سەر ئەو دەعوەتە نەبوو، دەیانوت: ئەو بە گوێی دەعوەتی خوای نەکرد بە "حي على الصلاة" و "حي على الفلاح" بانگی کرد، ئێمەش بە گوێی دەعوەتی ئەو ناکەین.

دەگێڕنەوە ئینسانێکی موسڵمانی گەورە هەبوو، ناوی (بيعي خثعمي) بوو، تووشی نەخۆشیی ئیفلیجی بوو، هەموو جار ئەمری دەکرد دوو کەس باڵیان دەگرت و دەیانبرد بۆ مزگەوت بۆ جێبەجێ کردنی نوێژی جەماعەت، کە عەرزیان کرد تۆ عوزرت هەیە بۆچی ئازاری خۆت دەدەی و دەڕۆیت بۆ مزگەوت؟ دەیفەرموو چۆن ئینسان دەتوانێ دەعوەتی خوا بە لەفزی (حي على الصلاة، وحي على الفلاح) ڕەد بکاتەوەو بە گوێی نەکا؟

لە حەدیثێکدا حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر جوملەیەك کە بانگدەر دەیڵێ خوای گەورە پاش ئەو جوملە دەفەرموێ (صدق عبدي)، کاتێ گەیشتە (حي على الفلاح) دەفەرموێ (صدق عبدي) و ئەمە دەبێتە وەعدە لەلایەن خواوە بەوەی هەر کەس بڕوا بەدەم ئەو بانگەوە خوای گەورە ڕزگاری دەکا و، لە سزاو ئازاری قیامەت ئازادی دەکا.

(ابو هريره) خوای لێ ڕازی بێ، دەفەرموێ: لەسەر فەرموودەی حەزرەت (د.خ) ئەو کەسەی کە تەرکی جەماعەتی کردووە بە عادەت بۆ خۆی و، هەرگیز نەچووە بۆ جەماعەت بەهەر شوێنێکدا بڕوات مەلائیکە نەفرینی لێ دەکا و لەعنەتی لێ دەکا. ڕیوایەت کراوە ئەو کەسەی کە نوێژی عیشا بە جەماعەت دەکا و، لە پاش هەموو خەڵکەکە لە مزگەوت دێتە دەرەوەو دەڕواتەوە بۆ ماڵ، مەلائیکەکان ئاڵای نوورین لەپێش دەمیەوە هەڵدەگرن و لەگەڵیدا دەڕۆنە ماڵەوەو، ئەو ئاڵایە لای سەریەوە دادەچەقێنن، وە لە بەرەبەیاندا کاتێ هاتە دەرەوە هەمان کۆمەڵە مەلائیکە ئاڵاکە هەڵدەگرن و، لە پێش دەمیەوە دەڕۆنەوە بۆ مزگەوت، ئەمە هەموو لەبەر ڕێزلێگرتنی ئەم شەخسەیە لە ناو مەلائیکەکاندا. جا ئەگەر هات و ئەم نوێژ کەرە لە پاش نوێژی سبەینێ لە مزگەوت نەیەتەدەر و خەریکی ذیکر بێ هەتا ڕۆژ هەڵدێ، ئەنجا دوو ڕکات نوێژی (سنة الاشراق) بکا، ئەوسا بێتە دەرەوە و بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی، ئەوا ئەم دوو ڕکاتەی بەقەدەر حەجێکی سوننەت سەواب و قازانجی تێدایە، ئەم باسەم لە نامەی عیبادەتدا نووسیوە.

بەڵێ ئەگەر ئەم برایە ئەو نوێژی عیشا و سبەینێیە بە جەماعەت نەکا، یا پاش نوێژ زیکر نەکا، ئەم پاداشە زۆرانەی دەست ناکەوێ هەر چەند لە پاش سوننەتی ئیشراقیش لە مزگەوت بێتە دەرەوە.

دەگێڕنەوە پیاوێکی کوێر هەبوو بەردەوام لە کاتی خۆیدا دەڕۆیشت بۆ مزگەوت جەماعەتی دەکرد، تەنانەت لە کاتی باران و سەرمایشدا هەروابوو، خێزانەکەی سەرزەنشتی دەکرد و پێی دەوت تۆ خوا مەعزووری کردووی، بۆچ وا خۆت ئازار دەدەی؟ ئەویش دەیوت تا شوکرانە بژێریی خوا بەجێ بێنم کە دەست و پێی ساغ و سەلامەتی پێ داوم، شەوێ زۆر بە نارەحەتی گەیشتە مزگەوت و نوێژی بە جەماعەت کرد و هاتەوە، ئەو شەوە نووست، بۆ سبەینێ کە لە خەو هەستا هەردوو چاوی ڕووناك بووبوونەوە و دەیانبینی، ئەویش وتی بە ژنەکەی ئەمە جەزای ئەو شوکرە بوو کە دەمکرد.

لە تەفسیری (منیر)دا هاتووە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتی ڕابواردن بەسەر سیراتدا قەرەباڵغییەکی زۆر ماتڵ دەبن و ناوێرن بەسەر ئەو پردەدا ڕابوورن، مەلائیکەکان لێیان دەپرسن ئایا ئێوە لە دنیادا لە مزگەوتدا نوێژتان کردووە بە جەماعەت، ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، جا مەلائیکەکان پێیان دەڵێن: خوا ئەو مزگەوتانەتان بۆ دەکا بە وێنەی کەشتی و، هەرچۆن کەشتی دەبێ بەهۆی ڕابووردن بە دەریادا ئێوەش وەها لە ناو مزگەوتەکانتاندا ڕادەبوورن بەسەر (سیرات)دا.

دەگێڕنەوە کە ئینسان لە پاش مردن کردەوەی دەبڕێتەوە لە سێ ڕێگەوە نەبێ، یەکێ لەوانە سەدەقەی نەبڕاوەیە وەك دروست کردنی مزگەوت، هەروەها دەگێڕنەوە کە موسوڵمان سێ شووورای هەیە مەنعی ئاگری جەهەننەمی لێ بکا، یەکەم زیکری خوا، دووەم خوێندنی قورئان، سێیەم چوونە ناو مزگەوت، تەنانەت لە ڕۆژێکدا کە دەجال دێتە رووی دنیا هەر کەس بڕواتە مزگەوت لە ئاشوویی دەجال پارێزراو دەبێ.

لە حەدیسێکی تردا هەیە کە نووری سەر عەرز لە مزگەوتەکانەوەیە و نووری مزگەوتەکان لە (کعبة الله)وەیە. هەروەها ڕیوایەت کراوە هەر کەس خوو بگرێ بە چوونە ناو مزگەوتەوە بۆ جەماعەت و قورئان خوێندن و ذیکر کردن، خوای گەورە پێنج بەهرەی پێ دەبەخشێ، یەکەم ڕزق و ڕۆزیی زۆر دەکا، دووەم لە سزای دۆزەخ پارێزراو دەبێ، سێیەم نامەی کرداری لای ڕاستەوە پێ دەدرێ. چوارەم وەك برووسکە بەسەر سیراتدا ڕادەبوورێ، پێنجەم بەبێ حیساب دەچێتە بەهەشت.

نامەی نۆزدەیەم

# باسی ئەحکامی مزگەوتە

بسم الله الرحمن الرحيم

پاش ئەمە برا خۆشەویستەکانم! لەم عەریزەدا باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کە موسڵمانان بەهۆی قسەی بێ سوود و پڕ و پووچەوە لە مزگەوتدا گیرۆدەی گەلێ تاوان دەبن، لە شوێنێکدا کە حەق وایە موسڵمان بە بار خێرات و حەسەناتی تێدا وەربگرێ. هەروەها کەمێك لە خێر و چاکە و پاداشی ئەوانەش باس دەکەم کە دڵیان بە مزگەوتەوە بەسراوەو، حەز دەکەن هەمیشە مزگەوتەکان بە عیبادەت و خواپەرستی ئاوەدان بکەنەوە؛ چونکە لەسەر فەرموودەی حەزرەت (د.خ) ئەو کەسەی بە دڵ حەز بکا بڕوا بۆ مزگەوت و لەوێ خەریکی خواپەرستی ببێ ئەوە لەو کەسانەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە سێبەری عەرشی خوادا جێیان دەکەنەوە و، هەر هەنگاوێ کە دای دەنێ لە ڕێی ڕۆیشتنیدا بۆ مزگەوت خوای گەورە بەوە گوناهێکی لەسەر لادەبا و چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا وەعدەی داوە بەو کەسانەی دەڕۆن بۆ مزگەوت بۆ خوا پەرستی کە هەنگاوەکانیان دەنووسێ و جەزایان بەخێرات لەسەر دادەنێ، وەکو فەرموویەتی: "وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ" وە لە باتی یەك هەنگاو دە دەوڵەت و پایەی قیامەتی بۆ دەنووسرێ. وەئەگەر سەواب و پایەی ئەهلی مزگەوت و ئەوانەی دەڕۆن بۆ مزگەوت بۆ خواپەرستی و، خەریکی عیبادەت دەبن و بە ئەدەب دادەنیشن، بنووسم لە دوو شت دەترسم، یەکەم دەترسم من بەم حاڵەوە نەتوانم هەموو ئەو سەوابە و ئەو ڕیوایەتانە کە بە تەواوی وارید بوون لە خێراتی ئەهلی مزگەوتدا تەواو بکەم. دووەم دەترسم هەندێ کەس بەهۆی بێ هێزیی باوەڕەوە بکەونە ناو زیانی ئینکار و بڵێن چۆن بەرامبەر بە چوونە مزگەوت ئەم خێر و سەوابە بۆ ئینسان بڕیار دەدرێ.

برا خۆشەویستەکانم! هەروەك باوەڕ دەکەن بەوەی کە خوای گەورە بەرامبەر ئیمان و کردەوەی چاکە بە بەهەشتی نەبڕاوە دەدا بە موسوڵمانان، ئەگەرچی ئیمان و کردەوەی

موسڵمان لە چاو بەهەشتدا وەك قەترە بەدەر یایە، وەهاش باوەڕ بکەن کە خودای گەورە بەئیحسان و کەرەمی خۆی بەرامبەر پەیوەندیی موسڵمان لەگەڵ مزگەوتدا و بەرامبەر بە نوێژکردن و ناوی خوا هێنان و قورئان خوێندن و ئیعتیکاف و خێرەکانی تر لە ناو مزگەوتدا ئەوەندە پاداشی چاکە بەو موسڵمانە دەدا کە بە ئاسانی حسێب نەکرێ.

ڕیوایەت کراوە لە هەموو شەوێکدا مەلائیکەکان بانگ لە ئەهلی گۆڕستان دەکەن و پێیان دەڵێن: خۆزگە بە کێ دەخوازن لە ئەهلی دنیا؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: خۆزگە بە ئەهلی مزگەوتەکان دەخوازین، ئەوان نوێژ دەکەن و زیکری خوا دەکەن، بەڵام ئێمە حاڵی ئەوانەمان نییە. براکان! خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا مەدحی ئوممەتی حەزرەتی محەمەدی کردووە (د.خ)و فەرموویەتی "في بيوت اذن الله ان ترفع ويذكر فيها اسمه يسبح له فيها بالغدو والآصال رجال لا تلهيهم تجارة ولا بيع عن ذكر الله واقام الصلاة وايتاء الزكوة". جوملەی "اذن الله ان ترفع" باسی گەورەیی پایەی مزگەوتەکانەو، بەوە مەدحیان دەکات کە ناوی خودایان تیا دەبرێ و عەرزی ڕاز و سکاڵاو داماوییان تیا دەکرێت لە بارەگای خودای گەورەداو، نوێژی فەرز و سوننەتیان تیدا دەکرێ، هەروەها ئەوانەی نوێژیان فەوتاوە قەزای نوێژەکانی خۆیانیان تیدادەکەنەوە بەم مەرجە ئەگەر قورئان خوێن نەبن بڕۆنە لای زانایەکی باش فاتیحەکەیان فێر ببن و، تەحییات و واجیباتەکانی تر ڕەوان بکەن، خۆ ئەگەر قورئان خوێن و زانا بن هەر بە خۆیان قەناعەت بکەن، وە لە پاش بەجێهێنانی واجیبات و سوننەتەکان دەس بکەن بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و بە قەدەر توانا قورئان بخوێنن.

براکان خوێندنی یەك جاریی سوورەتی فاتیحە بە قەدەر خوێندنی درێژترین سوورەت لە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز خێر و پاداشی هەیە، خۆ ئەگەر پازدە جار بخوێنرێ ئەوە بە قەدەر سی جوزئەی قورئان سەوابی هەیە. وە ئەگەر صەد جار بخوێنرێ ئەوە بە قەدەر خوێندنی دووهەزار و چوارسەد پەڕە لە قورئان خێری هەیە، ئەمەش لە گەورەیی و میهرەبانیی خوداوەیە.

شێخ ئەحمەدی ئیبنو حەجەر، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە شەرحی کتێبی (عوباب)دا فەرموویەتی: سوننەتە لە ناو مزگەوت ئەڵقەی زیکر ببەسترێ و، ئەڵقەی دەرزی عیلم دامەزرێ بە مەرجێ کە نەبنە هۆی سەرلێ تێکدانی نوێژکەرەکان و، وەزعێکی وەها پەیدا

نەبێ لە مزگەوتدا کە شێوەی بێ قەدری بدا بەو مزگەوتە. هەروەها فەرموویەتی: سوننەتە ئینسانی موسڵمان لە مزگەوتدا بمێنێتەوە؛ چونکە فەرموودەی حەزرەتە "المساجد بیوت المتقین، فمن یکن المسجد بیته یضمن الله له الروح والرحمة والجواز علی الصراط الی الجنة والنجاة من النیران" واتە: مزگەوتەکان ماڵی خاوەن تاعەتەکانن و، هەر کەس مزگەوت بکا بەماڵی خۆی، خوای گەورە ئاسایش و میهرەبانی و تێپەڕینی بە سەر پردی سیراتدا بۆ بەهەشت و ڕزگار بوونی لە ئاگری دۆزەخ بۆ مسۆگەر دەکا.

دەگێڕنەوە ڕۆژێ حەزرەت (د.خ) تەشریفی برد بۆ مزگەوت تەماشای کرد لە مزگەوتدا دوو هەڵقە دامەزراوە لە یەکێکیاندا زیکری خوا دەکەن و لە یەکێکیاندا خەریکی باسی زانیاریی ئاین، واتە باسی ئیمان و ئیسلام و ئەحکامی ئاین دەکەن، لەوێدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی دوو هەڵقە هەر دوو خاوەن فەزل و بەنرخن، بەڵام هەڵقەی عیلمەکەیان گەورەترە، وە لەگەڵ کۆمەڵی باسی عیلم و دیندا دانیشت. باسی گەورەیی زیکر و سەڵەواتم لە نامەیەکی تایبەتیدا نووسیوە.

وەك وتمان جوملەی (اذن الله ان ترفع) ئیشارەیە بۆ لای پایە و قەدەری مزگەوتەکان، لەم خوسووسەوە زاناکانی دین فەرموویانە: لەم تەعزیمەوە دەردەکەوێ کە واجیبە ئینسانی موسڵمان لە مزگەوتدا خۆی بپارێزێ لە کردەوەی حەرام و ناڕەواو لە وتاری ناشیرین و لە شتی بێهوودە و بێ سوود. هەر لەم بابەتەوە ئیمام "فخر الدین"ی ڕازی لە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی: مەبەست لە جوملەی (ان ترفع) بە گەورە زانینی مزگەوتەکان و پاك ڕاگرتنیانە لە پیسی و پاراستنیانە لە کردار و وتاری بێهوودە و ناڕەوا. هەروەها جەلالەدین سیوتییش یش لە تەفسیری (الدر المنثور)دا فەرموویەتی مەبەست لە (ان ترفع) بە گەورەدانانی مزگەوت و پاك ڕاگرتنیەتی لە هەموو کردار و وتارێکی ناشیرین و ناپەسەند. دیارە وتاری حەرام و ناڕەوا وەکو غەیبەت واتە: قسەی خراپی پاش ملە، یا نەمیمە، واتە دوو زبانی و قسەهێنان و قسە بردن، یا بوختان واتە بە درۆ کردار و وتاری ناشیرین بدەی بەسەر یەکێکدا، یا جنێودان و ئاژاوە هەڵگیرساندن و شەڕنانەوە، یا گاڵتە بە هەژار و داماوان یا دەربڕینی حەسوودی و کینەی دڵ لەگەڵ خەڵکدا و فرۆفێڵ کردن و گوناهە گەورەکانی تر کە لە نامەی (کبائر)دا نووسراون. کردەوەی حەرامیش زۆرن، بۆ نموونە وەك ئەوەی یەکێك کەوشی پیس یا داری پیس یا عاسای پیس بباتە ناو مزگەوتەوە یا وەکو بردنی سووتەمەنی پیس بۆ مزگەوت و بۆ مەبەستی گەرمکردنی

مزگەت لەویٚ بیسووتیٚنیٚ وەکو تەپاڵە و پشقل، بەڵام ئەمە بە مەرجیٚ حەرامە کە تەڕبن و مزگەوت پیس بکەن، واتە: ئەگەر وشك بن سووتاندنیان لە مزگەوتدا حەرام نییە، تەنیا کەراهەتی هەیە. وە ئەگەر چرای ڕۆنی پاك نەبوو دروستە بە ڕۆنی پیس چرا هەڵبگیرسیٚنن لە مزگەوتدا بە شەرتیٚ مزگەوتەکە پیس نەکا. هەروەها غافڵ بوون لە خوا لە مزگەوتدا و پیٚکەنین بە دەنگی بەرز و پەنجە تەقاندن و زیاد لە عادەت دەنگ بەرزکردنەوە لە مزگەوتدا ناپەسەند و نارەوان، بەڵام تەنیا مەکرووهن و حەرام نین. تف و بەڵغەم و چڵم فڕیٚ دان بۆ دیواری مزگەوت و حیکایەت کردنی بیٚ سوودو بەرەڵڵاکردنی شیٚت یا منالی بیٚ تەمییز و، خواردن و خواردنەوە لە مزگەوتدا بە جۆریٚ کە کاریکاتە دابونەریت و ئادابی مزگەوت ئەمانە هەموویان بە فیعلی حەرام حسیٚب دەکریٚن و، پیٚویستە موسڵمان ئاگای لیٚیان بیٚ. تەنانەت لای ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، خوای لیٚ ڕازی بیٚ، تیٚکڕا خواردن لە مزگەوتدا حەرامە، بەڵام لای ئیمامی شافیعی، خوای لیٚ ڕازی بیٚ، خواردن لە مزگەوتدا حەرام نییە ئەگەر مزگەوتەکە تەڕ و پیس نەکا.

قال فی شرح العباب: ویباح الجلوس في المسجد مع الحدث بلا كراهة والنوم فيه بلا كراهة اتفاقا، سواء الغريب والاعزب وغيرهما، والاكل مع بسط سفرة بشرط ان لا يتأذى به اى باحد الاشياء الثلاثة من النوم وما بعده احد من الناس او من غيرهم كالملائكة ان لم تتلوث به ارض المسجد او حصره او لم يتلوث بما يتولد منه نحو قشر المأكول او نواه او عظمه، والا حرم. قال ابن العماد واتفق الاصحاب على حرمة تلويثه بالطعام وعلى حل الاكل فيه ان لم يحصل منه ايذاء واستقذار كما هو ظاهر مع التأذي، والاولى ترك ذلك.. انتهى.

براکان! بەم جۆرە وتار و کردەوانە کە باسمان کردن پایە و حورمەتی مزگەوت دەشکیٚ و خوای گەورە ڕیٚگای پیٚ نەداوین بەو شیٚوە نابارە بڕۆینە مزگەوت، بەڵکو لەگەڵ ئەو وەزعەدا ئەگەر نویٚژیٚکیش بکەین، خیٚری نویٚژەکەمان مەحو دەبیٚتەوە، سەرباری ئەوەش بە گوناهباری لە مزگەوت دەردەچین. پیٚویستە بۆ قسەی غەیری زیکری خوای گەورە ئەگەر قسەیەکی پیٚویست بوو، بچینە دەری مزگەوت و لەویٚ قسەکە بکەین، ئەگەرنا لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو قسەیە، ئەگەر حەڵاڵ بیٚ حیساب هەیەو، ئەگەر حەرام بیٚ عەزاب هەیە.

برایانە! ئەگەرچی لە شەرعی (عباب) دا فەرموویەتی قسەی حەڵاڵ لە مزگەوتدا دروستە، چونکە حەدیسێ هەیە ئیمامی (مسلم) ڕیوایەتی کردووە کە حەزرەت (د.خ) کە نوێژی بەیانییانی دەکرد لە مزگەوت دەرنەدەچوو هەتا هەتاو دەکەوت، ئەسحابەکانیش باسی قسەی زەمـانـی (جـاهـلـیـیـەت)یـان دەگـێڕایـەوە و، جـاربـەجـاریش حـەزرەت (د.خ) زەردەخەنەیەکی دەکرد، بەڵام ئەم شێوە بۆ ئێمە دەس نادا، چونکە حیکایەتەکانی هەموو چووەتەوە سەر زەممی جاهیلییەت و مەدحی زەمانی ئیسلام و سەعادەت و، بووە بە هۆی هێزی ئیمان، بەڵام بۆ ئێمە وا نییە بەڵکو قسەکردنی حەڵاڵیش دەکێشینەوە سەر شتی بێهوودە، کەواتە بۆ ئێمە با دروستیش بێ هەر کەراهەتی هەیە. ئەگەر یەکێ بە بێ سەبەب شتێکی بۆنداری وەك سیر و پیاز و تووری خوارد، ئەوە حەرامە بچێتە ناو مزگەوتەوە، چونکە ئەزیەتی موسڵمانان و مەلائیکە دەدا، تەنانەت ئەگەر مزگەوتەکەش کەسی تیدا نەبێ هەر حەرامە لەبەر ئیحترامی مەلائیکەکانی مزگەوت. بەڵام ئەگەر بۆ دەرمان خواردی ئەوە نە حەرامە و نە مەکرووهە و، دەبێتە عوزر بۆ تەرکی جەماعەت، واتە ئەگەر نەڕوا بۆ جەماعەت قەیناکا.

براکانم! خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی "وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ" واتە: هەر کەسێ بە قەدرو حورمەتەوە تەماشای ئەو شتانە بکا کە خوا حورمەتی پێ داون ئەوە باشترە بۆی. ئاشکرایە ئەمانەی کە لە پێشەوە مەنعمان کردن، لەو شتانە کە موناسبی مزگەوت نەبوون هەموو شتێکن کە هەتکی حورمەتی مزگەوت دەکەن. کەوابێ پێویستە ئاگادار بن. تەنانەت حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی "لا تعظموني في المسجد" واتە: لە مزگەوتدا زیادەڕێزم لێ مەگرن، لە ڕیوایەتێکی تردا "لا تفضلوني في المسجد" واتە بۆ نموونە: کە هاتمە مزگەوت لەبەرم هەڵمەسن؛ چونکە مزگەوت جێگەی تەعظیمی خوایە، جێگەی تاعەت و لە خواترسییە، جێگەی ئەوە نییە خەریکی ئیش و کاری عادەتی بن مەگەر بە سودفە هەڵبکەوێ.

دەگێڕنەوە پیاوێکی پیاو چاك و ڕەفتارپاك جارێ ویستی مەنعی کۆمەڵێك بکا لە مزگەوتدا خەریکی گاڵتە و گەپ بوون، یەکێکیان بێ شەرم بوو، چوو، بە گژی ئەو پیاوە باشەدا. شەو پیاوە باشەکە لە خەودا چاوی پێ کەوت ئەو کەسە کە بێ حەیایی لەگەڵ ئەوا کردبوو خوا شێوەی گۆڕیوە بە شێوەی سەگ و، پێیان وت لەبەر ئەوەی لەگەڵ تۆدا بێ حەیایی کرد، خوا شێوەی ئەو ئینسانەی مەسح کردووە.

ریوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) رۆژێ فەرمووی بە ئەسحابەکان: ئەو کەسانەتان پیشان دەم کە نە دەستنوێژ و نەنوێژ و نە ڕۆژوو نە زەکات و نە حەج قەبووڵ ناکرێ لێیان؟ ئەسحابەکان عەرزیان کرد: بەڵێ یارەسوڵڵا پێمان نیشان بدە، فەرمووی ئەو کەسانەن کە دەستنوێژ دەگرن و دەڕۆن بۆ مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی سووك دەکەن، ئەنجا پشت لە قیبلەی مزگەوت دەکەن و دەس بە قسەی دنیایی ڕووت دەکەن، قەسەم بە خودا مەلائیکەکان بەوانە دەڵێن: ئەی دوژمنەکانی خوا بێ دەنگ بن، بڕۆنەوە بۆماڵی خۆتان لەگەڵ عاجزبوونی خوا لێتان. یەکێك لە ئەصحابەکان عەرزی کرد ئێمە لە ماڵی خۆمان دێینە دەرەوەو دەگەین بە برادەر و دۆستەکانمان، چۆن لە مزگەوتدا قسەیان لەگەڵ نەکەین؟ ئەویش فەرمووی خوا فەرموویەتی: "فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ" واتە بڕۆن بۆ زیکری خوا، نەیفەرمووە (فاسعوا الی ذکر الدنیا).

لە حەزرەتی عەلییەوە (د.خ) ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی: خوای گەورە وەحیی کرد بۆ حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم، (علی نبینا وعلیه الصلاة والسلام)، کە خەبەر بدە بە بەنی ئیسرائیل با نەڕۆنە هیچ خانوویەك لە خانووەکانی من، بە دڵێکی پاك و خاوێن و نەفسێکی لە خوا ترس و چاوێکی داخراو و دەستێکی پاکەوە نەبێ. براکان! مزگەوت وەکو مەجلیسی خوا وایە، هەر موسڵمانێك لە مزگەوتدا بێ، هاومەجلیسی خوای گەورەیە، حەیفە بۆ کەسێ کە هاومەجلیسی خوا بێ بە ئەدەب نەبێ و ڕێز لە هاومەجلیسەکەی نەگرێ، جا کەسێ ئەم ئەدەبەی نەزانی ئەوە خوای گەورە ئیهانەی دەکا و سووکی دەکا.

ئەنەسی کوڕی مالیك، خوای لێ ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: من احب الله فلیحبني ومن احبني فلیحب اصحابي، ومن احب اصحابي فلیحب القرآن، ومن احب القرآن فلیحب المساجد افنیتها وابنیتها. اذن الله في رفعها وبارك فیها ومیمونة ومیمون اهلها، محفوظة محفوظ اهلها، مزینة مزین اهلها، وهم في صلاة الله والله یقضي حوائجهم وهم في مساجد الله والله من ورائهم.

واتە کەسێ کە خوای گەورەی خۆش بوێ، پێویستە منیشی خۆش بوێ و، کەسێ کە منی خۆش بوێ، پێویستە قورئانی پیرۆزی خۆش بوێ و، کەسێ کە قورئانی خۆش بوێ، پێویستە مزگەوتی خۆش بوێ، چ بینای خانووەکانی و چ دەورووبەری. خوای گەورە ڕێگای داوە بەرز بکرێنەوە و بەرەکەت و پیرۆزی پێ داون، خۆیان موبارەك و ئەهلەکانیشیان موبارەکن، خۆیان لە شەیتانەکانی ئینس و جن پارێزراون و،

ئەهلەکانیشیان پارێزراون، بە ئیمان و باوەڕ ڕازاونەتەوە، لەو کاتەدا کە ئەوان خەریکی نوێژن خوای گەورە پێویستیی ئەوان جێبەجێ دەکا، لەو کاتەدا ئەوان لە مزگەوتدان خوای گەورە لە پشتیانەوەیەو دەیانپارێزێ.

ڕیوایەت کراوە غەریب لە جیهاندا چوار جۆرن: قورئان لە دەروونی پیاوی ستەمکاردا، مزگەوت لە ناو گەلی نوێژنەکەران و ڕۆژوونەگراندا، قورئانی پیرۆز لە ماڵێکدا کە نەخوێنرێتەوە و دەورنەکرێتەوە، ئینسانی چاك و کردارباش لە ناو گەلی فاسقان و لە ڕێ لادەراندا.

ڕیوایەت کراوە حەزرەت (د.خ) لە باسی زەممی گوناهباراندا فەرموویەتی: لە ئاخر زەماندا هەندێ لە ئوممەتی من دەڕۆنە مزگەوت و هەڵقە هەڵقە دادەنیشن، زیکریان هەر دنیا و خۆشەویستیی دنیایە، لەگەڵ ئەوانە لە مزگەوتدا دامەنیشن.

ڕیوایەت کراوە جارێ مزگەوتێ لە مزگەوتەکان بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان لە بارەگای خوادا شکات لە ئەهلی مزگەوتەکە بکا لەسەر ئەوەی کاتێ کە دێن بۆ مزگەوت لە باتی ناوی خوا زیکرکردن وتاری حەرام و بێهوودە دێ بە دەمیاندا، لە ئاسماندا کۆمەڵێ مەلائیکە هاتن بە پیریی ئەو مزگەوتەوەو پێیان وت شکاتی تۆ پێویست نییە، ئێمە مەئموورین بۆ سەر ئەو قەومە و دەیانفەوتێنین. ئەی برادەران ئەم ڕیوایەتە لەسەر ئەوە دامەزراوە کە حەقیقەتی هەموو شتێ زانستێك و هەستێك و تەسبیحێکی بۆ دانراوە، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرمووێ "سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ" کەوابێ ئەگەر حەقیقەتی مزگەوت شکات لە قەومی خراپ بکا لە بارەگای خوادا جێگەی (تعجب) نییە، چونکە حەقیقەتی مزگەوت دار و بەرد نییە.

شایانی باسە کە ئادابی مزگەوت لە حەقدە زۆرترن، یەکێکیان ئەوەیە کە ئینسان ڕۆیشتە مزگەوت پێی ڕاستی پێش بخا و کە هاتە دەرەوە پێی چەپی پێش بخا. دەگێڕنەوە: ئەحمەدی بەسری کە پیاوێکی چاك بووە جارێ لە چوونە مزگەوتدا پێی چەپی پێش خست، لە کەفارەتی ئەم خیلاف سوننەتەدا بەندەییەکی بوو ئازادی کرد.

سوفیانی سەوری (د.خ) جارێك لە چوونە مزگەوتدا پێی چەپی خستە پێش، لەوێدا هاتیفێ بانگی کرد (یا ثور) واتە (گا) ئیشارەیە بۆ ئەوە کە بە بێ عەقڵی پێی چەپی پێش خستووە. براکانم! ئەو پیاوە ساڵحە لەسەر ئەو خیلاف سوننەتە لێی زویر بوون و بە گاجووت بانگیان کردووە.

برا خۆشەویستەکانم! کاتێ دەتانەوێ برۆنە ناو مزگەوت تەماشای پێڵاوەکانتان بکەن، ئەگەر شتێکی پیسیان پێوە بوو، بە قەدەر توانا تێ کۆشن پاکیان بکەنەوە با پێڵاوەکانتان مزگەوتەکە پیس نەکا، وە ئەگەر دیتان شوێنێ لە مزگەوت پیس بوو بوو واجیبە لە سەرتان ئەو پیسییە لابەن، هەروەها سوننەتە شتێکی بۆن خۆش لەو شوێنە بدەن هەتا بۆنی خۆش بکاو، ئەهلی مزگەوت لە باتی ئەو شتە پیسە بە بۆنی خۆشی شتە بۆن خۆشەکە کەیف خۆش ببن.

دەگێڕنەوە ڕۆژێ شەخسێ ڕۆیشتە مزگەوتەوەو کەوشەکانی خۆی کوتا بە عەرزی مزگەوتەکەدا، ئیمامی ئەعزەم (ر.خ) لەو شوێنەدا بوو فەرمووی ئەگەر ئەو کابرایە کەوشەکانی بە ڕووی مندا بگرتایە پێم خۆشتر دەبوو لەوەی کە کوتای بە عەرزی مزگەوتەکەدا.

براکان! خوای گەورە مزگەوتی خۆش دەوێ و ڕێز و پایەی پێ داوە، واجیبە ئێمەش حورمەتی بگرین، هەر کەس مزگەوت بێ حورمەت بکا خوای گەورەش ئەو کەسە بێ حورمەت دەکا. کاتێ چوونە مزگەوتەوە وەها بڕۆن بە پێی خۆتان ئازاری کەس مەدەن، سەلام بکەن لە حازرانی مزگەوت، ئەگەر لە نوێژدا نەبوون، خۆ ئەگەر لە نوێژدا بوون ئەوا سەلامیان لێ مەکەن و بەس بڵێن "سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم" ئەگەر خوا مەیلی بێ ئەمە لە جێگەی ئەو دوو ڕکاتە نوێژەی دیاری مزگەوتدا دادەنیشێ هەر چەند ئەمە قەولێکی مەرجووحە.

مسوڵمان کە ڕۆیشتە مزگەوتەوە، دەبێ بیری ئەوە بکاتەوە کە میوانی خوایە و خوا زۆر گەورەیە، میوانی خۆی دەرناکا و حورمەتی دەگرێ و، میوانداریی خوا بۆ عەبدی خۆی عەفوکردنی گوناهـ و بەرزکردنەوەی پایەیەتی.

لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە کە مزگەوتەکان بازاڕی قیامەتن لەو بازاڕەدا پێویستیی ڕۆژی قیامەت دەس دەکەوێ کە تاعەت و عیبادەتە، کەواتە برای خۆشەویست! پێویستە ئینسان لە مزگەوتدا بە ئەدەب دابنیشێ چونکە میوانی خوایە و میوان دەبێ ڕێز لە خاوەن مەنزڵ بگرێ و تەماشای پایە و شانی بکا.

ڕیوایەت کراوە کە لە زەمانی بەنی ئیسرائیل دوو کەس ڕۆیشتن بۆ عیبادەتخانەیەك، کاتێ گەیشتنە دەرگاکەی یەکێکیان ڕۆیشتە ماڵەوە، ئەویتریان هەر لە دەرگای عیبادەتخانەکەدا کەوت و دەستی کرد بە گریان و وتی من زۆر تاوانبارم و بێ گوێیی

خاوەنی ئەم شوێنەم زۆر کردووەو رووم نییە بڕۆمە ژوورەوە. زۆر گریا تا بوورایەوە و گیانی بە خوا سپارد، ئەنجا خوای گەورە وەحیی کرد بۆ پێغەمبەری ئەو سەردەمە: ئەو شەخسەی کە لەبەر شەرم و حەیای خۆی لە هۆش چوو مرد، من هەموو گوناهەکانم عەفوو کرد و، لە ریزی (صدیقان)دا نووسیم.

براکانم! خۆ خەریککردن بە کڕین و فرۆشتنەوە لە مزگەوتدا مەکرووهە، ئەگەر سەر لە نوێژکەران نەشێوێنی و، ئەگەر شێواندی ئەوە حەرامە، مەگەر زۆر پێویست بێ و ببێتە هۆی رزق و بژێوی منداڵەکانی، یا بۆ مارە برین بێ، چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەرە (اعلنوا النكاح في المسجد). هەروەها دەرکردنی بای سك لە مزگەوتدا (خلاف الاولی)یە، ئەگەر لە ڕاگرتنیدا زیان نەبێ، خۆ ئەگەر زیانی تێدا دەبوو واتە: تووشی ئازاری ڕیخۆڵە و ناو سکی دەبوو ئەوە بەرەڵلاکردنی دروستە، بەڵکو واجیبە.

بۆ کەسێ کە شتی گوم بووبێ، دروست نییە لە مزگەوتدا پرسیار بکا بە تایبەتی ئەگەر بە دەنگی بەرز قسە بکا، سوننەتە لە جوابی ئینسانی وەها پیاو بڵێ: یاخوا نەیدۆزیتەوە، ئەگەر ئەم شت گوم بووە زۆر ناچارە با بڕواتە دەرەوەو لە حەوشەکەدا پرسیار بکا؛ چونکە مزگەوت جێگەی دەنگ بەرزکردنەوە نییە مەگەر بۆ زیکری خودای گەورە.

دەگێڕنەوە ئەعرابییەك وشتری گوم کردبوو، بە دەنگی بەرز لە مزگەوتدا بانگی کرد کێ وشترەکەی منی چاوپێکەوتووە، لەوێدا حەزرەت (د.خ) فەرمووی خوا وشترەکەت پێ نەداتەوە، بینای مزگەوت بۆ ئەمانە نییە بۆ زیکری خوای گەورەیە.

خۆشەویستەکانم! ئەگەر بانگێکی بەرز بۆ دۆزینەوەی شتێکی ونبوو ئاوا بێ، دەبێ گۆرانی وتن و لە هەموو لەعب و گۆرەوی بازی و چەقەچەقی خەڵکی چۆن بێ، بێگومان تاوانی ئەمانە لای خوا زۆر زۆرە. هەروەها ئەگەر کەسێ کۆکەی لێ بێ، پێویستە هەتا بۆی دەلوێ بە دەنگی نزم بکۆکێ و بەڵغەمەکەی لە پارچە دەستەسڕێکدا داپۆشێ تا دەڕواتە دەرەوە، مزگەوت مەجلیسی ئەوانەیە کە لەگەڵ خوای خۆیاندا موناجات دەکەن، داوای عەفووی تاوان و گوناهی لێ دەکەن، هەتا ئینسان بە ئەدەبتر بێ باشترە. هەروەها پێویستە ئینسان لە مزگەوتدا دووربکەوێتەوە لە بێ ئەدەبیی زاهیری، پێویستە لە خووڕەوشتی ناشیرین وەك ڕیا و حەسوودی و کینە و فیز و خۆ بە زل زانین خۆی بپارێزێ. ئەم سیفەتانە لە پیسیی زاهیری نابارترن؛ چونکە دڵ جێگەی عیبادەتەو، کە ئەم صیفەتانەی تێدابوو ئیتر جێی عیبادەت و خوداپەرستیی تێدا نابێتەوە. پێویستە لە

قسەی بێ سوودیش زۆر دووربکەوێتەوە چونکە ئەو کەسە کە لە مزگەوتدایە با لە نوێژیشدا نەبێ وەك ئەوەیە کە لە نوێژا بێ، جا هەروەکو قسەکردن لە نوێژا نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە هەروەها قسەی بێ سوودیش خێری دانیشتنی مزگەوت بەتاڵ دەکاتەوە، کەوابوو دەبێ ئینسانی موسوڵمان کاتێ کە ڕۆیشتە مزگەوتەوە خەریکی عیبادەت بێ، وەکو نوێژی (تحیة المسجد) یا نوێژی سوننەتی پاش و پێشی نوێژە فەرزەکان، وە لە پاش نوێژەکان خەریکی خوێندنی (آیة الکرسی)و تەسبیحات و حەمد و تەکبیری خوا بێ، پاش ئەمانە ئەگەر قورئان خوێن بێ خەریکی خوێندنی قورئان بێ، ئەگەرنا بە دەنگێکی نزم و نەرم بۆ خۆی خەریکی (لا اله الا الله) کردن یا سەڵەواتدان بێ، خۆ ئەگەر شتێکی دینی بپرسێ لە ئیمام و ئەویش بە نەرمی فێری بکات ئەوە خێری گەلێ زۆرە.

بە هەرحاڵ موسڵمان کە چووە مزگەوت وەك ئەوەیە کە لە بەردەستی خودای گەورەدا بێ، دیارە حوزووری خوای گەورە لەگەڵ هەڵگرتنی پیسی زاهیری یا مەعنەویدا ڕێك ناکەوێ و ناگونجێ، کەوابێ پێویستە لە مزگەوتدا بە ذیکرو فیکرەوە دابنیشین، ئەگەر وابن لە لایەنی زاتی خواوە گەلێ جۆر ڕێز و پایەتان دەست دەکەوێ و ئینشائەڵڵا مورادی دڵتان جێبەجێ دەبێ، ئەگەر نا ئینسانی بێ ئەدەب هەمیشە سووك و نائومێد دەبێ و خێرێکی ئاخر خێری دەس ناکەوێ. دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "یاتي على الناس زمان یکون حدیثهم في مساجدهم في امور دنیاهم، فلا تجالسوهم فلیس لله فیهم حاجة" واتە زەمانێ دێ بەسەر خەڵکدا کە قسەو باسی دنیایی خۆیان لە مزگەوتەکانا دەکەن، کە ئەوانەتان دی لەگەڵیاندا دامەنیشن خوای گەورە پێوەندیی بەوانەوە نییە و ئیشی پێیان نییە.

شایانی زانینە هەتا چل ماڵ لە چواردەوری مزگەوتدا بە دراوسێی مزگەوت حسێب دەکرێن، وە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی هەر کەسێ دراوسێی مزگەوت بێ و بە بێ بەهانە نوێژەکەی لە ماڵی خۆیا بکا و نەڕوا بۆ جەماعەت بۆ مزگەوت ئەوە نوێژەکەی ناقیس و ناتەواوە. دیارە جوملەی (حي على الصلاة) لە بانگدا دەعوەتی موسڵمانان دەکا بۆ مزگەوت بۆ نوێژکردن، هەروەها جوملەی (حي على الفلاح) دەعوەتی موسڵمانان دەکا کە بێن بۆ ڕزگاربوون لە سزاو مەینەتی قیامەت، بێگومان هەر کەس هات بە دەنگی ئەم دەعوەتانەوە ئەوە قبووڵکراوی خوایە و جێگەی لە قیامەتدا بە هەشتی ئەبەدیی هەتا هەتاییە. خوای گەورە دەفەرموێ "وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا". جا هەرچەند ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو کافرانە نازڵ بووە کە مەنعی

موسڵمانانیان دەکرد لە عیبادەتی خوا لە مزگەوتی (مسجد الحرام) لە مەککەی موبارەك، بەڵام حوکمەکە عامە بۆ هەر کەسێ کە ببێ بە هۆی مەنعی مزگەوت لە موسڵمانان، چ بە زۆری دەست مەنعیان بکا یاخۆ بە هۆی بێ شەرمی و بێ حەیاییەوە مزگەوت سووك بکات و، کارێکی وەها بکا کە موسوڵمانان عیبادەتیان بە باشی بۆ نەکرێ لەو مزگەوتانەدا. دیارە زاڵمیی کافرەکان لەبەر ئەوەیە ماوەی موسڵمانەکانیان نەداوە بۆ عیبادەت کردن. هەر لەبەر ئەم سەبەبە ئەو موسڵمانانەش کە مزگەوت بە ڕزق و شتومەکی خۆیان مەشغووڵ دەکەن و مەنعی خەڵك دەکەن لە عیبادەت یا ئەو سەردارانە کە لەشکر لە مزگەوتەکاندا دادەنێن و، ئەو بێ شەرمانە کە مزگەوت دەکەن بە شوێنی گەپ و گاڵتە و لەهوو هەموو ئەمانە لای خوای گەورە بە زاڵمێکی زۆر زاڵم حسێب دەکرێن و بەرامبەر بە تێکدانی ئوسووڵی مزگەوت بە پێی ئاینی ئیسلام گیرۆدەی گوناهی گەورە دەبن. هەروەها ئەو (متولی)یانە کە ئەوقافی مزگەوت لە دەستیاندایە ئەگەر ماڵی مزگەوت بخۆن و فەرش و سووتەمەنی و چرا و پێویستییەکانی مزگەوت جێبەجێ نەکەن، یا ئەو کەسانە کە نازرو بەردەستی (متولی) ئەوقافن، ئەوانیش ئەگەر لەو ماڵە وەقفەی کە لە بەردەستیاندایە قسوور بکەن لە جێبەجێ کردنی پێویستییەکانی مزگەوتدا و، بێ فەرش و چرای بکەن، ئەوانەش هەموو بەپێی مەعنای ئەو ئایەتە بە زاڵمێکی زۆر زاڵم و بە ستەمکارێکی نابار دەناسرێن.

من دەڵێم لە جوملەی (وسعی فی خرابها) دەردەکەوێ ئەوانەی کە تێ دەکۆشن بۆ وێرانکردنی مزگەوت با خۆیان حازر کەن بۆ ئەوەی خوایش ماڵی ئەوان وێران بکا؛ چونکە مزگەوت ماڵی خوایە و، مەنعی وەقفی مزگەوت وەکو وێرانکردنی مزگەوتەکەیە. بە بەراوردێکی پەنجا ساڵیی خۆم و لەسەر بەراوردی پێشینانیش بۆم دەرکەوتووە ئەوانەی ئەوقافیان لە ژێر دەستا بووەو، بەپێی بڕیاری واقف خزمەتی مزگەوت یا مەدرەسەیان نەکردووە، ماڵیان وێران بووە و گەلێ زیانی نابارییان بەسەرا هاتووە، خوا پەنامان بدا.

براکانم! گەورەیی مزگەوت و ئەهلی مزگەوت لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا بە ئاشکرایی دەردەکەوێ، بەڵام بەو مەرجەی کە خەڵکەکە بە ئیحترامەوە بڕۆنە ناو مزگەوتەوە و لە مزگەوتدا خەریکی خوا پەرستی بن و بێجگە زیکر و فیکر و تاعەت قسەی تێدا نەکەن، قسەیەك نەبێ کە مەسڵەحەت و قازانجی موسڵمانانی تیابێ، یا بۆ دڵخۆشکردنی میوانێ بێ کە ڕووی لە خوا بێ، هیوای ئەوەی بێ کە ڕوویکاتە خوا. پیاوە

باشەکانی پێشینان لەو کاتەدا کە لە مزگەوتدا بوون ئەگەر شتێکی پێویست بە قسە ڕووی دابێ، چوونەتە دەرەوە قسەکەیانْ کردووە، جا پاش قسەکەیان هاتوونەتەوە مزگەوت.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە "الضحك في المسجد ظلمة في القبر" واتە پێکەنین لە مزگەوتدا دەبێتە هۆی تاریکی بۆ گۆڕی ئینسان، تەنانەت لای هەندێ لە ئیمامەکان پێکەنین بە قاقا دەسنوێژ دەشکێنێ، بۆیە بە ڕای ئیمامی شافیعی (ر.خ) سوننەتە بۆ کەسێ بە قاقا پێ بکەنێ دەسنوێژەکەی تازە بکاتەوە. جا هەروەکو قاقای پێکەنین هۆی تاریکیی قەبرە شەو نوێژ کردنیش هۆی ڕووناکیی قەبرە. شایانی زانینە هەر کەس لە مزگەوتدا قسەی بێهوودە بکا لە ئەنجامدا لات و گەدا دەکەوێ و لە دینیشدا هەر هەژار و بێ دەسەڵات دەبێ.

مزگەوت جێگەی پاڕانەوەیە لە خوا، جێگای داواکردنی ڕەحمەت و کەرەمە لە خوا، جێگەی شتی بێ سوود نییە. دەگێڕنەوە لە سەردەمی خەلیفەی دووەم حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب هەژارێ خۆی کرد بە مزگەوتداو داوای شتی لە خەڵکەکە کرد، ئیمامی عومەر بە پەلە هەستا و ڕۆیشت و پێی وت تۆ لە مزگەوت داوای شت لە غەیری خوا دەکەی؟ واتە: داواکردن بۆ گەداو نەدارا قەی ناکا بەڵام لە مزگەوتدا پێویستە پیاو هەر لە خوا داوای شت بکات.

براکان! ئەو بێ قەدرییە کە لەگەڵ مزگەوتەکانی وڵاتی ئێمەدا دەکرێ لە هیچ وڵاتێکدا چاوم پێی نەکەوتووە، تەماشا دەکەی لە کاتی شادی و شیوەندا قەرەباڵغ لە ناو مزگەوتدا کۆدەبنەوەو نان و چێشت دەخۆن و، بە چەوری و چێشتی ڕژاو و ئاو و توێکڵی میوە و غەیری ئەمانە ناو مزگەوتەکە پیس دەکەن، فەرشی مزگەوت دەبەن بۆ ماڵان ساوەری لەسەر وشك دەکەنەوە، زۆر جار کە لە مزگەوتدا دەنوون فەرشی مزگەوت بەکاردێنن، بەم جۆرە هەڵسوکەوتانە مزگەوت سووك دەبێ و زیانی لێ دەکەوێ. ئەگەر یەکێ بڵێ: ئەی بۆچی لە زەمانی حەزرەتدا (د.خ) ئەسحابی (صفه) لە مزگەوتدا نووستوون و فەرشی مزگەوتیان بەکارهێناوەو حەزرەتیش (د.خ) دەستی نەهێناوەتە ڕێیان؟ لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین: ئەو ئەسحابانە خاوەن عیبادەت و ڕیازەت بوون و، هەرگیز لە مزگەوتدا بێ ئەدەبییان لێ دەرنەکەوتووە، بۆیە حەزرەت (د.خ) ڕازی بووە. ئێمە وەکو ئەوان نین بەڵکو نووستنی ئێمە لە مزگەوتدا کەراهەتی هەیە.

ئەگەر کەسێ لە مزگەوتدا ئیحتیلامی بوو واجیبە گورج بڕواتە دەرەوە، مەگەر ترسی

سەرمایەكی توندی هەبێ، یاخود لەوە بترسێ كە لە دەرەوە پاسەوان بیگرن و تەوقیفی بكەن، یا ترسی لە كیسچوونی ماڵ یا زیان بە ناموس گەیشتنی هەبێ و لەو دەوروپشتەشدا ئاو نەبێ یا هەبێ بەڵام ترسی ئەوەی هەبێ ئەگەر خۆی بشۆرێ نەخۆش بكەوێ، خۆڵی پاكیش نەبێ تەیەمموم بكا، لەم حاڵەتانەدا دروستە بە لەش پیسییەوە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، ئەگەرنا گوناهێكی گەورەیە.

براكانم! قەرەباڵغی شادی و خەتەنەسووران و هاوچەشنی ئەمانە ئەگەر لە مزگەوتدا دابنیشن و نان بخۆن دەبێتە هۆی فەوتان و عەیبداربوونی فەرشی مزگەوت و دەبێتە هۆی مەنعی خەڵك لە نوێژكردن لەسەر فەرشە وەقف كراوەكە، هەروەها دەبێتە هۆی زیانی دینی و دنیایی ئەو خاوەن شادییەش كە بووەتە هۆی ئەم كارەساتە، بە تایبەتی ئەو كەسە كە زیان لە ماڵێ دەدا كە وەقف كراوە بۆ مزگەوت.

ئەی براینە! خوای گەورە زوربەی حەقی زوڵم لێكراوان دەخاتە ڕۆژی قیامەت، چونكە ئەمە بۆ زوڵم لێ كراوەكە زۆر قازانجی هەیە، زوڵم لێكراو لە دنیادا بە هەر جۆر بێ، گوزەران دەكا، بەڵام ئەو زۆردارە نامەردە لە ڕۆژی قیامەتدا وەها گیرۆدە دەبی خوا نەبێ كەس بە حاڵی نازانێ، تەنانەت ئەگەر بە قەدەر حەفتا پیاوی چاك كردەوەی چاكەی هەبێ هەمووی دەدرێ بە زوڵم لێكراوەكان و ئەم زاڵمە ستەمكارە خۆی بە ڕووتی و قووتی بێ خێر و چاكە و پاداش دەمێنێتەوە، چونكە هەموو خێرەكەی دەچێ بۆ زوڵم لێكراوەكە. لەو كاتەدا ئەهلی قیامەت خۆزگە دەخوازن و دەڵێن خۆزگە ئێمە لە دنیادا زوڵمان لێ كرابایە هەتا لەم كاتەدا ئەم هەموو خێر و پاداشەمان دەست بكەوتایە. بەڵام حەقی خانەی خوا هەر لە دنیادا لەو كەسە دەسەنرێ كە زوڵمەكەی لێ كردووە؛ چونكە خوا ئیحتیاجی بە سەوابی ڕۆژی قیامەت نییە، خوا پاك و بێ نیازە و هیچ جۆرە ئیحتاجییەكی نییە، بۆیە لە دنیادا بەو جۆرە گیرۆدەی دەكا و تووشی ئەنواعی دەرد و فەلاكەتی دەكا، بە سووكی و ڕەزیلی دەمرێ و، ئەگەر هەڵكەوێ بە ڕەزیلی نەمرێ و دەوڵەمەند بێ، خوا دنیای وەها لێ تەنگ دەكا كە لە ڕەزیل خراپتر عومری خۆی بە سەربەرێ و خێروخۆشی لەو دەوڵەت و ماڵەی نابینێ، وەك چۆن مزگەوت خێری لە وەقفەكانی نەبینی، هەق بە هەق. بێجگە لەمانەش سزایەك دەدرێ مەگەر هەر خوا بزانێ.

ڕیوایەت كراوە هەر كەسێ فەرشێ بخاتە مزگەوتەوە یا بە چرایێ ڕووناكی بكاتەوە. هەتا ئەو فەرشە یا ئەو چرایە بمێنێتەوە حەفتا هەزار مەلائیكە دوعای خێر دەكەن بۆ

خاوەنەکەیان. لە پیاوێکی باوەڕ پێکراوم بیست وتی: مەلای فلانە دێ بۆی گێڕامەوە، ئەهلی دێ بە نۆبە داریان دەهێنا بۆ سووتەمەنیی مزگەوت، بەڵام من نەمدەهێنا تا شەوێ لە خەوا چاوم پێ کەوت کە لەو ماڵانەوە داریان بۆ مزگەوت هێناوە نوور بەرز دەبووەوە بۆ ئاسمان، تەنیا لە ماڵی ئێمەوە نوور بەرز نەدەبوویەوە، پرسیارم کرد ئەم نوورە چ نوورێکە؟ وتیان نووری نۆبە دارە، وتم ئەی بۆچی نوور لە ماڵی ئێمەوە بەرز نابێتەوە، وتیان تۆ نۆبە دار نادەی. منیش لەوکاتەوە بڕیارم دا کە نۆبەدار بکەم و، لە نۆبەی خۆمدا دار بدەم بە مزگەوت. پوختەی قسە مزگەوت لە هەر شوێنێکدا ببێ دەبێتە هۆی پیرۆزی و دەوڵەتێکی نەبڕاوە لە دنیا و لە قەبراو لە قیامەتدا بۆ ئەهلی ئەو شوێنە بە مەرجێ کە حورمەتی مزگەوتەکەیان ڕابگرن و بە قسەی بێهوودەی دنیایی و بێ ئەدەبی ئەو دەوڵەتە نەبڕاوە لە دەستی خۆیان دەرنەکەن و، ئەو ئاسایشی قەبر و قیامەتەی خۆیان لە دەست نەدەن.

لە شەرحی (عەقائیدی نەسەفی)دا کە بە فارسی دانراوە، ڕیوایەت کراوە هەر کەسێ قسەی دنیایی لە مزگەوتدا بکا ئەو مەلائیکانەی مزگەوت ئاوەدان دەکەنەوە لە ترسی بۆنی پیسی دەمی ئەو کەسە لە مزگەوتەکە دەڕۆنە دەرەوە و دەڵێن خودایا عەبدەکانی تۆ ئێمەیان لە ماڵی تۆ دەرکرد، خوای گەورەش لە وەڵامی مەلائیکەکاندا دەفەرموێ بە عیززەت و جەلالی خۆم قەسەم لە پاداشی ئەو کردەوە خراپە و ئەو قسە بێهوودانەدا کەسانێکیان بە سەرا زاڵ دەکەم کە ئەوانیش لە ماڵی خۆیانیان دەربکەن، وەك ئەوان ئێوەیان لە مزگەوت کردە دەرەوە. جالەماڵ کردنە دەرەوە دوو جۆرە، یەکەم ئەوەیە کە خوا دووچاری کۆچکردن و لە وڵات دەرچوونیان دەکا، دووەم گیرۆدەی تەنگی و کەم گوزەرانی دەبن و لە ماڵ بێزار دەبن و، لەو شوێنە دەردەچن. دەگێڕنەوە قسەی خراپ کردن لە مزگەوتدا عیبادەتی حەفتا ساڵی کابرا لادەبا.

ئەی برادەرینە! دەخیلتان بم نەکا شەیتان تەفرەتان بداو پێتان بڵێ و بیخاتە دڵتانەوە مادام قسەی خراپ لە مزگەوتدا ئەوەندە جەزاکەی قورسە چاك وایە ئیتر نەڕۆینە مزگەوت و لە ماڵی خۆماندا نوێژ بکەین! ئەمە فێڵی شەیتانە بە گوێی مەکەن، بەڵکو بە دڵێکی پاك تەوبە بکەن و لەو قسە خراپانە کە لەمەو پێش لە مزگەوتدا کردووتانن پەشیمان بنەوە و بڕیاربدەن لەمەو پاش دووبارەیان نەکەنەوەو بە ئیحتیرام لە مزگەوتدا دانیشن و حورمەتی مزگەوت بگرن و هەر عیبادەتی تیدا بکەن. هەتا بە میهرەبانیی خوا بەو هەمووە سەواب و پاداشە بگەن. والسلام علیکم.

## نامەی بیستەم

# باسی ڕۆژووە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله سيدنا محمد وعلى آله وصحبه المجاهدين في سبيل الله.

پاش ئەمانە سەلامێکتان لێ دەکەم کە ببێتە هۆی سەلامەتیی ئیمان و گیانی خۆتان و ئەولادەکانتان.

بزانن هەرچەند هەموو کەس بە قەدەر حاڵی خۆی ئیشی چاك و خراپ دەزانێ، دەزانێ چاك کامەیە و خراپ کامەیە، بەڵام بیستنی وەعز و ئامۆژگاری لە واعیزانەوە کار لە دڵی موسڵمان دەکا و قازانجی زۆرە. خەڵکی بە ئامۆژگاریی زانایان زۆر بێدار و ئاگادار دەبنەوە. لەبەر ئەمە لە بابەتی گەورەیی ڕۆژووی ڕەمەزان و تاوانی نەگرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان بە قەدەر ماوە عەریزەیەکتان پێشکەش دەکەم کە تەرجەمەی فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر بێ (د.خ). ئەم عەریزەیە لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) لە گەورەترین خێر و سەدەقە دەژمێررێ، مادام وایە پێویستە ئێوەش لە خوێندنەوەی نامەکانی من کەمتەرخەمی نەکەن، بە تایبەتی فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) هیچ موسڵمانێ دیارییەکی نەناردووە بۆ برای ئاینیی خۆی گەورەتر و بە سوودتر بێ لە وتارێکی خێر کە شارەزای ڕێی چاکەی بکا یا لە تاوانێکی دووربخاتەوە. ئەی برادەران وەکو عادەتە لە ناو خۆتاندا بە دیاریی دۆستانی خۆتان دڵشاد دەبن و، دیاری وەردەگرن و ڕەدی ناکەنەوە. پێویستە نامەکانی دۆستی خۆیشتان وەربگرن و ڕەدیان نەکەنەوە و پێیان دڵ شاد ببن و لە خوێندنەوەی مەلوول و دڵ پەرێشان نەبن. فەرموودەی حەزرەتە(د.خ): لە گەورەترین خوو ڕەوشتی ئینسانی موسڵمانە کە هەرگیز لە بیستنی ئامۆژگاریی ئاینی تێر نەبێ. کەوابێ ئەگەر گوێ ڕانەگرێ بۆی ئەوە بە تاوان لە سەری دەنووسرێ و دەبێتە هۆی ڕقی خوا لێی، بە پێچەوانەوە ئەگەر قبوڵی بکا دەبێتە هۆی

زیادە نیعمەت و کەسبی کەرەم و میهرەبانیی خودای گەورە؛ چونکە فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) "ایما عبد جاءته موعظة من الله في دينه فانه نعمة من الله سيقت اليه. فان قلبها بشكر زاده الله نعما اخرى، والا كانت حجة من الله عليه... الى ان قال ويزداد بها سخطا". جا کە وەرگرتنی نامەکانی من هۆی زۆربوونی نیعمەتی خوا بێ ڕەتکردنەوەیان هۆی تووڕەبوونی خوای گەورەبێ، وەرنەگرتنیان دەبێتە عەینی شێتی و بێ سەلیقەیی، بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە دەتوانن بیانخوێننەوە و نایانخوێننەوە چونکە فەرموودەی حەزرەتە (د.خ) "اذا حمل الرجل كلمة من الله الى اخيه المسلم كان خيرا له من حجة وعمرة وعبادة سنة" واتە کاتێ پیاوێ وتارێ لە لایەن خوای گەورەوە بەرێ بۆ لای برای موسڵمانی خۆی ئەوە ئەو وتارە لە لای خوای گەورە لە حەجێك و عەمرەییەك و عیبادەتی ساڵێ چاترە و سەوابی زۆرترە. جا هەر کەس ڕەحم بە خۆی بکا بەم جۆرە عیبادەتە توێشووی سەفەری ڕۆژی قیامەت بۆ خۆی پەیدا دەکات، چونکە خودای گەورە ئەم دنیایەی کردووە بە جێگەی کشتوکاڵ بۆ توێشووی ئەو دنیا، ئەم دنیا ڕێ گوزەرە یا وەکو جێگەیەکە بۆ موسافیرانی قیامەت ئامادەکرابێ، کە ماوەییەکی کەم تێدا دەمێننەوە و، ئیتر دەکەونەڕێ بۆ ماواو مەنزڵی دەوامدارو هەمیشەیی. بێگومان پاش (توحيد) خوا بەیەك زانین و، پاش پێنج فەرزی نوێژ، گەورەترین توێشووی قیامەت، بەجێهێنانی باقیی ئەرکانی ئیسلامەو کە یەکێك لەوانە ڕۆژووە بە هەموو جۆرەکانییەوە، فەرز یا سوننەت، کە ئەو جەزایە بۆ ئەم دانراوە بۆ عیبادەتی تر نییە.

مەبەس لەم نامەیە بەیانی گەورەیی ڕۆژووەو بەیانی ئەوەیە ئەو کەسانە کە ڕۆژووی ڕەمەزان ناگرن تا چ ئەندازەیەك گوناهبار دەبن و چەند تووشی زیان دەبن لە نەگرتنی ئەو ڕۆژووە.

براکانم! پێویستە بزانن خوای گەورە بۆ هەر یەکێ لە موسڵمانان لە سەرەتای باڵغ بوونیەوە دوو فریشتەی لەسەر شانی ڕاست و شانی چەپی داناوە هەتا کردەوەی چاکە و خراپەی بنووسێ، فریشتەی شانی ڕاست چاکە و فریشتەی شانی چەپی خراپە دەنووسێ. هەروەها خوا ئەمری فەرمووە بە فریشتەی لای ڕاست هەر کاتێ ئەم عەبدی منە بە دڵ نیازی کردەوەیەکی باشی کرد یا نیازی قسەیەکی باشی کرد، با ئەو کردەوە و قسەش بەجێ نەهێنێ، گورج خێر و چاکەکەی بۆ بنوسە. خۆ ئەگەر هات و بەجێی هێنان ئەوە یەك بە دە هەتا یەك بە حەوت سەد جەزای بۆ بنووسەو، لە دەفتەری کرداری چاکەیدا بۆی

بنووسە، تەنانەت ئەگەر بە ڕاستی نییەتی ئەوەی هەبێ ئەگەر قیمەتی پەنجا هەزار کیسە دارایی و دەستەڵاتی هەبێ، دەیدا لە ڕێگای خوادا ئەوە بە تەنیا ئەو نییەتە ساغە هەموو جەزاکەی بۆ بنووسە، ئەگەرچی لە پاش ئەو کاتەش لەو نییەتە پەشیمان بێتەوە.

دەگێڕنەوە خواپەرستێ هەبووە لە بەنی ئیسرائیلەکان لە ساڵێکی قاتی و گرانیدا بە لای کۆگایەکی گەورەی لمدا ڕابوورد، ئەویش بە دڵ تەمەنای ئەوەی کرد کە ئەم کۆمەڵە لمە ئارد بووایەو هی ئەویش بووایە بۆ ئەوەی هەمووی لە ڕێگەی خوادا بدایە بە گەداو داماوەکان. خوای گەورە وەحیی کرد بۆ پێغەمبەری ئەو چەرخە کە بڵێ بە فلان خواپەرست کە بە ڕاستی ثەواب و خێری ئەوەندەی ئەو لمە، کە ئارد بێ و بیکات بە خێر بۆ موسڵمانان، بۆم نووسی، ئەمەیش هەر لەبەر ئەوە بووە کە کابرا بە ساغی و لە کانگای دڵیەوە نییەتی بووە کە ئەگەر بە قەدەر ئەو لمە ئاردی ببوایە لە ڕێگەی خوا سەرفی دەکرد. بەڵام مەلائیکەی سەر شانی چەپ کە مەئمووری نووسینی کردەوەی خراپە، ئەوە نییەتی کاری خراپ نانووسێ، هەتا کابرا نەیکا بە کردەوە و دەری نەبڕێ، ئەوسا هەر کارێکی خراپ یا هەر وتارێکی خراپ بە تاقە یەکێ دەنووسێ. جا بۆ هەندێ ئینسان هەتا سێ سەعات سەبر دەکا، واتە ئەگەر لەو ماوەدا لەو ئیشە نارەوایە پەشیمان نەبوویەوە ئەوسا لە سەری دەنووسێ. بۆ هەندێ ئینسانیش هەتا نۆ ڕۆژ سەبر دەکا ئەوسا بە ئەمری مەلائیکەی شانی ڕاست لە سەری دەنووسێ؛ چونکە مەلائیکەی شانی چەپ وا لە ژێر دەستی مەلائیکەی شانی ڕاستدا.

دەگێڕنەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا یەکێ نامەی کردەوەکانی دەدرێتە دەست، کاتێ تەماشای دەکات حەج و عەمرە و جیهاد و سەدەقە و خێراتی تێدا نووسراوە، ئەویش بانگ دەکا و دەڵێ ئەم دەفتەرە دەفتەری من نییە، من ئەم کردەوانەم نەکردووە، جا مەلائیکە جوابی دەدەنەوە و دەڵێن دەفتەری خۆتە، لە کاتی خۆیدا لە دنیادا بە دڵێکی ساغ نییەتی ئەم کردەوانەت بووە، کە ئەگەر بۆت بکرێ بیانکەی و، خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی لەسەر نییەتەکەت بە تەواوی هەمووی بۆ نووسیوی.

ڕیوایەت کراوە هەر کەسێ سبەینان ڕۆژی لێ بوویەوەو لە دڵیدا نییەتی تەواوی هەبوو ئەوەندە خێر و خودا پەرستی بکا بۆ خوا، ئەوە خوای گەورە هەموو ئەو خێراتەی لە سبەینێوە بۆ دەنووسێ چ بۆی ڕێ بکەوێ ئەو ڕۆژە بەجێیان بێنێ یا نا، ئەمە هەمووی لەبەر زۆری ڕەحمەت و کەرەم و میهرەبانیی خوایە لەگەڵ ئەو عەبدانەی کە دڵیان ساغە

و نییەتیان لەسەر کردەوەی باشە. فەرموودەی پێغەمبەرە. "نیة المرء خیر من عمله" واتە: نییەتی چاکی ئینسان لە کردەوەکەی چاکترە، لەبەر دوو شت، یەکەم بە گوێرەی نییەتەکەی مادام خوا پاداشی بۆ دەنووسێ ئەو پاداشە زۆرترە لە پاداشی کردەوەکە. چونکە کردەوە نییە خاڵی بێ لە عەیب. دووەم لە نییەتدا هیچ ڕیاو بەرچاوێنی نییە، بەڵام کردەوە کەم هەڵدەکەوێ کە بە تەواوی لە ڕیاو لە خۆڕازی بوون و خووە خراپەکانی تر پاك بێ، مادام وەهابوو نییەتی ساغی ئینسانی موسوڵمان سوودی لە کردەوەکەی زۆرترە.

ئەی براینە! تەماشا بکەن ڕەحمەت و کەرەمی خوا دەربارەی بەندەی خۆی چەند زۆرە، نافەرمانی و بێ شەرمی و تاوانباریی بەندەکانیش بەرامبەر بە خوای گەورە چەند لە ئەندازە دەرچووە.

ڕیوایەت کراوە: کە موسڵمانێ ڕۆژووی ڕەمەزانی گرت، مەلائیکەی کردەوە نووس عەرزی بارەگای زاتی حەق دەکا: لە پاداشی ئەم ڕۆژووەدا چی بۆ بنووسم؟ خوای گەورە دەفەرموێ بنووسە: فلان کەس ڕۆژووی ڕەمەزانی گرتووەو ڕۆژووەکەی بۆ من بووە و من پاداشی دەدەمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، واتە غەیری خوای گەورە کەس نازانێ ئەندازەی پاداشی ئەو ڕۆژووە چەندێکەو ناشتوانێ بینووسێ. جا ئەمە پاداشی ڕۆژووی ڕۆژێ بێ لە ڕەمەزان دەبێ پاداشی ڕۆژووی هەموو مانگەکە چەند بێ؟ لە حەدیسی قودسیدا هەیە: هەموو کردەوەییەکی خێر قابلە بە غەیر بدرێ لە کەفارەتی گوناهداو لە تۆڵەی تاوانا ڕۆژوو نەبێ ئەوە بە تایبەتی هەر بۆ خاوەن ڕۆژووەکە دادەنرێ، واتە ئەو کەسەی کە ڕۆژووی گرتووە ئەگەر حەقی کەسێکی لەسەر بێ خوای گەورە لە خەزێنەی ئیحسانی خۆی جێبەجێی دەکا و، پاداشی ڕۆژووەکە بە تەواوی بۆ خاوەنەکەی دەمێنێتەوە و، بە هۆی پاداشی ئەو ڕۆژووەوە دەنێررێ بۆ بە هەشت و لە کۆشکێکی پایەداردا دادەمەزرێ. جا لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ هەموو ئینسانێکی بە ڕۆژوو دوو شادمانیی هەیە، یەکێکیان ئێواران کە بەربانگ دەکاتەوە، دووەمیان لە ڕۆژی قیامەتدا لەو کاتەدا کە دەگا بە خوای گەورە، دیارە یەکەمیان لەبەر ئەوەیە کە لە ڕۆژدا تینوو برسی و ماندوو بووە، خوایش زووبەزوو بەرامبەر بە زەحمەتی ئەو ڕۆژە لە کاتی بەربانگدا شادمانیی پێ دەبەخشێ. دووەمیان لەسەر ئەو ئەساسەیە ئەگەر کابرای بە ڕۆژوو مافی خەڵکی لەسەر بێ، خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی لە باتی ئەو جێبەجێی

دەکا و پاداشی ڕۆژووەکەی بە ساغی دەمێنێتەوە، ئەمەیش کەم نییە. خۆ ئەگەر مافی خەڵکی لەسەر نەبێ ئەوە مەگەر هەر خوا بزانێ وەزعی ئەو ڕۆژووەوانە چۆن دەبێ و لە چ پایەیەکی بەرزدا دای دەمەزرێنێ؟ پوختەی قسە ئەوەیە خوای گەورە پاداشی هەموو کردەوەیەکی باش بە گوێرەی پایەی کردەوەکە دادەنێ، بەڵام پاداشی ڕۆژوو لەسەر پایەی ئیحسان و میهرەبانیی خوا خۆیەتی و بەو پێیە پاداشی دەداتەوە. هەروەها ڕیوایەت کراوە: کە پاداشی ڕۆژووی سوننەت ئەوەندە زۆرە ئەگەر خوای گەورە پڕ بەم عەرزە ئاڵتوون بدا بە کابرای بەڕۆژوو پێی ڕازی نابێ و هەڵی دەگرێ هەتا لە قیامەتدا خوای گەورە پاداشی ئەو ڕۆژوەی بداتەوە.

براکانم! لە حەدیسی شەریفدا هەیە کە یەك ڕۆژ ڕۆژووی فەرز بە حەفتا ڕۆژ ڕۆژووی سوننەت بەرامبەرە، جا لەبەر ڕووناکیی حەدیسە پێشووەکەدا دەردەکەوێ کە حەفتا جار عەرز پڕ بکرێ لە ئاڵتوون و بدرێ بە خاوەنی ڕۆژێ ڕۆژووی فەرز پێی ڕازی نابێ و، پاداشەکەی دەبێ لە قیامەتدا لە خەزێنەی ڕەحمەتی خوادا جێبەجێ بکرێ. ئەم مەبەستە بەو حەدیسە شەریفە ڕووناك دەبێتەوە کە دەفەرمووێ ئەندازەی جەزا و پاداشی ڕۆژوو خودا نەبێ کەس نایزانێ، بۆیە مەلائیکەی نووسەری کردەوە ناتوانێ پاداشی ڕۆژوو بنووسێ.

ڕیوایەت کراوە: هەر موسڵمانێ ڕۆژێ ڕۆژوو بگرێ و بێجگە لە خوا کەس پێی نەزانێ ئەوە جەزاکەی بەهەشتە. هەروەها ڕیوایەت کراوە: کە ڕۆژووی ڕۆژووەوان ئەوەندە قازانجی زۆرە، تەنانەت نووستنی ئینسانە بە ڕۆژووەکە عیبادەتە، بێ دەنگ بوونی وەك تەسبیحات کردنە، هەموو کردەوەیەکی چاکی دوو قاتە، واتە نوێژێکی بە دوو نوێژ و دیرهەمێ خێری بە دوو دیرهەمە و، دوعای قبووڵە و گوناھ و تاوانی عەفوو کراوە، چ ئەو ڕۆژووە فەرز بێ و چ سوننەت.

لە حەدیسێکی درێژی تردا ڕیوایەت کراوە: کاتێ کە حەزرەت (د.خ) بە ڕۆژوو بوو لە کاتی بەربانگدا لە یەکەم ڕۆژی ڕەمەزاندا خوای گەورە پیاڵەیەك (شراباً طهور)ی بە جوبرەئیلدا بۆ نارد، کە هێنایە خزمەتی حەزرەت (د.خ) فەرمووی من بە بێ ئوممەتەکەم ئەم شەرابەم ناوێ و نایخۆمەوە، ئەنجا خوای گەورە فەرمووی وا بەشی ئەوانیشم قبووڵ کرد، ئەوسا حەزرەت (د.خ) بە هەندێ لەو پیاڵەیە بەربانگی کردەوە، لە بارەی ئەو ئەندازەیەش کە لە پیاڵەدا مابوویەوە ئەمر دەرچووکە حەزرەتی جوبرەئیل بڕوا و

تەماشای ماڵی باقیی ڕۆژووگرەکان بکا و، بە هەر خانوویەك لەو خانووانە دڵۆپێ لەو (شرابا طهورا)ە بدا بەومەرجەی ئەو ماڵە شەرابی تیا نەبێ، وێنەی حەرامی تیا نەبێ، ئەسبابی لەهوو لەعبی تیا نەبێ، غەیبەتی تیانەبێ، ئینسانی دوو زمانی تیانەبێ، پیاو و ژنی زیناکردووی تیانەبێ، ئەهلی ئیحتکاری تیانەبێ، واتە ئەوانەی کە دەغڵ و دان و ڕزق هەڵدەگرن و دەیشارنەوە هەتا بە نرخی زیاد لە نرخی ڕۆژ بیفرۆشن، هەروەها زەکات نەدەری تیانەبێ، هەتیو ئازاردەری تیانەبێ، ئازاردەری باوك و دایكی تیانەبێ: چونکە ئەو ماڵانە تا ئەو فەسادەیان تیا بمێنێ لەم ڕەحمەتە دوور دەبن و لە (شرابا طهورا) بێ بەش دەبن. لەم حەدیسە شەریفەوە دەردەکەوێ کە لە ڕەمەزاندا خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت و میهرەبانییەوە سەیری ڕۆژووگران دەکا، بۆیە لە هەموو ڕەمەزانێکدا ڕزقی هەموو کەس گوشادتر و فراوانترە لە غەیری ڕەمەزان.

ڕیوایەت کراوە: کە ڕۆژوو دەبێتە سپێر لە ئاگری دۆزەخ، واتە لە کاتێکدا بلێسەی ئاگری دۆزەخ شاڵاو دێنێ بۆ سەر ئەهلی مەحشەر و، هەندێکیان دەگرێ و دەرفێنێ، یا لە هەندێ شوێندا لە کاتی حەشرا کە شووڕای ئاگرێ گەمارۆی دەو خەڵقە دەدا خوای گەورە ڕۆژووی ئینسانەکە دەکاتە سپێر و ئاگری دۆزەخی پێ مەنع دەکات. یاخۆ مەبەست لەو فەرموودە موبارەکە ئەوەیە کە وەك چۆن قەڵغان ڕێ لە شمشێری دوژمنی ئینسان دەگرێ و ڕێگای نادا بگاتە گوشتی لەش و برینداری بکا بەو جۆرە پەروەردەی ڕۆژوو پاداشتی ڕۆژوو دەبێتە هۆی لادانی سزای دۆزەخ لەو ئینسانەوە مادامێ لۆژیکی ئەو سزایە ببێ.

ڕیوایەت کراوە: کە ڕۆژوو دەبێتە سپێر بەو مەرجەی بە هۆی درۆ و غەیبەتەوە نەدڕێ و بێ سوود نەبێ، واتە هەروەکو کە سپێر لەت لەت کرا ببێ بە کاری ئەوە نایە دەفعی شمشێری دوژمن لە ئینسان بکا ڕۆژووش کە لەگەڵ غەیبەت کردن و درۆ و گەزافدا بێ بێ سوود دەردەچێ و بە کار نایەت.

ڕیوایەت کراوە کە خودای گەورە فەرموویەتی بە حەزرەتی موسا (علی نبینا وعلیه السلام) کە دوو نوورم داوە بە (ئوممەتی محەممەدی مستەفا) هەتا دوو تاریکی زیانیان پێ نەگەیەنێ، ئەویش عەرزی کرد خوایا ئەو دوو نوورە کامەن و ئەو دوو تاریکییە چین؟ خوای گەورە فەرمووی دوو نوورەکە یەکێکیان نووری ڕەمەزان و ئەویتریان نووری قورئانە، دوو تاریکییەکەش بریتین لە تاریکیی قەبر و تاریکیی ڕۆژی قیامەت؛ چونکە ڕیوایەت کراوە ساڵی ڕەمەزان و قورئانی پیرۆز هەردووکیان لە ڕۆژی قیامەتدا

و چوارده و پانزەی مانگ، ئەم ڕۆژووە گەلێ پاداشی خێری هەیە. ڕیوایەت کراوە: کە جوبرەئیل عەرزی حەزرەتی کردووە فەرموویەتی موژدە بدە، بەوانەی کە لە (أيام البيض)دا بە ڕۆژوو دەبن، خوا لە دنیادا ڕوویان سپی و دڵیان نوورانی دەکاو، لە قیامەتیشدا پاداشیان دەداتەوە. هەروەها ڕیوایەت کراوە کە ڕۆژووی (أيام البيض) ڕق و حەسەد و کینە لە دڵی ڕۆژووەوانەکەدا ناهێڵێ، واتە خوای گەورە دڵی نوورانی دەکا، جا کە دڵی نوورانی بوو، ئەم خووڕەوشتە ناشیرینانەی تێدا نامێنێ.

دووەم: ڕۆژووی دووشەممە و پێنج شەممەیە. فەرموودەی پێغەمبەرە هەر موسوڵمانێ ڕۆژووی ئەم دوو ڕۆژە بگرێ، خوای گەورە کردەوەی لێ قبووڵ دەکا و تاوانی دەبەخشێ؛ هەروەها فەرموویەتی پێم خۆشە لەم ڕۆژانەدا بە ڕۆژوو بم؛ چونکە لەم ڕۆژانەدا کردەوەی ئینسان دەخرێتە بەردەمی خوای گەورە.

نەوعی سێیەم: ڕۆژووی سەرەتای مانگی (ذی الحجه)یە، واتە مانگی قوربان، ئەم ڕۆژانەی سەرەتای مانگ لە یەکیەوە تا هەشتەمی، یەکی بە ساڵێ حسێب دەکرێ، بەڵام ڕۆژووی ڕۆژی نۆیەم کە ڕۆژی (عەرفە)یە بە دوو ساڵ حسێب دەکرێ، واتە دەبێتە کەفارەت و گوناهی ساڵی پێشوو ساڵی دوایی دادەپۆشی ئەگەر گوناهی هەبێ، ئەگەرنا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پایەی ئەو موسڵمانە، بەڵام ئەم گوناهانە دەبێ (حق الله) بن، چونکە (حق الناس) پێویستی بە دانەوە هەیە یا بە گەردن ئازادکردنی لە لایەنی خاوەن حەقەکەوە. ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی کاتێ مانگی ڕەمەزان هات، خوای گەورە بە هۆی پیرۆزیی ئەم مانگەوەو بە هۆی پیرۆزیی ڕۆژووەوە بە ڕەحمەت و بەرەکەت ئێوە دادەپۆشێ و ڕەحمەتتان بۆ دەنێرێ و گوناهتان لێ دادەوەرێنێ و نزاو پاڕانەوەتان لێ وەردەگرێ، ئەمانە هەموو لەبەر کۆشش و هەوڵی ئێوەیە بۆ تاعەت کردن و ڕۆژوو گرتن. هەروەها خودای گەورە لە مانگی ڕەمەزاندا بە هۆی ئێوەوە شانازی بە سەر مەلائیکەکاندا دەکا و دەفەرموێت: تەماشاکەن لەگەڵ زەحمەتی کار و کاسبی و هێز و تاوی گەرما و سەرما ئەم عەبدانی منە چەندێ ساغ و دڵسۆزن و چۆن بەردەوامن لەسەر عیبادەت و خۆیان لەبەر نارەحەتی برسێتیدا دەگرن.

براکانم! لەم مانگە پیرۆزەدا بە خواپەرستی خۆتان نیشانی خوای گەورە بدەن، هەتا ڕەحمەتتان بۆ ڕەوانە بکا، لە ڕاستیدا ئینسانی بەدبەخت و کلۆڵ ئەو کەسەیە کە لەم مانگەدا بە بێ عوزر خۆی لەم هەمووە ڕەحمەتەی خوا بێ بەش دەکا.

ڕیوایەت کراوە: کە لە هەموو ڕۆژێ لە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزاندا لە کاتی بەربانگدا خوای گەورە شەش سەد هەزار لە ئوممەتی پێغەمبەر عەفوو دەکا لە ئادەمیزادە لە پەری و، لە دواشەوی ڕەمەزاندا بە قەدەر ژمارەی عەفوو کراوانی هەموو ڕۆژانی ڕەمەزان، گوناهبار عەفوو دەکات.

براکانم! هەر کەس بە بێ بەهانەیەکی شەرعی ڕەمەزان بکوژێ واتە مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو نەبێ، یا بە ڕۆژوو بێ و تەرکی گوناه نەکات و، لە شەو و ڕۆژی ڕەمەزاندا خەریکی فیسق و فجوور و بێ ڕەزایی خوا بێ ئەوە بێگومان لەم خێر و بەرەکەتەی مانگی ڕەمەزان بێ بەش دەبێ. لەم بابەتەوە ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر بتانزانیایە چەند خێر و بەرەکەت ڕوودەکاتە ئینسانی خاوێنی بە ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا بە دڵ داواتان لە خوا دەکرد کە هەموو مانگەکانی ساڵ، ڕەمەزان بوونایە.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ لە مانگی ڕەمەزاندا هەر ڕۆژێ حەوت جار بڵێت "اللهم اجرني من النار" واتە: خوایا پەنام بدە لە ئاگری دۆزەخ، ئەوە دۆزەخ عەرزی بارەگای خوای گەورە دەکا و دەڵێ: خوایا ئەو بەندەیەت لە ئاگری من دوور بخەرەوە. هەروەها هەر کەس ڕۆژی هەشت جار بڵێ: "اللهم ادخلني الجنة" واتە: خوایا بمخەرە بەهەشت، ئەوە بەهەشت دەڵێ خوایا ئەو بەندەیەت ئارەزووی هەیە بێتە ناو من، بە میهرەبانیی خۆت بیگەیێنە بە من.

ڕیوایەت کراوە: کە هەموو ڕەمەزان هەتا دەرکەوتنی بەیان مەلائیکەیەك بانگ دەکا "یا طالب الخير اقبل ويا داعي الشر اقصر" واتە ئەی ئەو کەسەی کە تالبی خێر و پاداشی وەرە حازر و ئامادە بە، ئەی ئەو کەسەی کە مەیلت لەسەر گوناه کردنە دەستبەردار بە و وازبێنە لە گوناه و ئاگات لە ئیشی خۆت بێ، ئاخۆ کەسێ هەیە کە دوعا بکا هەتا دوعاکەی لێ قبووڵ بکەم، کەس هەیە مراز و مەبەستێکی هەبێ هەتا بۆی جێبەجێ بکەم.

ڕیوایەت کراوە: کە لە زەمانی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (د.خ) حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) حەدیسێکی حەزرەتی پێغەمبەری (د.خ) گێڕایەوە بۆی و فەرمووی بیستوومە لە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی:لە لای ڕاستی عەرشەوە جێگایەك هەیە ناوی (خطيرة القدس)ە پڕە لە نوورو، ئەوەندە مەلائیکەی تیایە خوا نەبێ کەس حیسابیان

هۆیبیەکە: یا لەبەر شەرەفی زەمانە وەکو عیبادەتی (لیلة القدر) و باقیی مانگی ڕەمەزان و شەو و ڕۆژی جومعە، یا لەبەر شەرەفی شوێنە وەکو نوێژ و خوداپەرستی لە (مسجد الحرام) واتە (بیت الله)دا کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی نوێژێ لە (مسجد الحرام)دا بە سەدهەزار نوێژە، وە نوێژێ لە مزگەوتی مەدینەی نوورانی بە هەزار نوێژە لە شوێنی تردا، وە نوێژێ لە مزگەوتی قودسی شەریفدا بە پێنجسەد نوێژە لە شوێنی تردا. وە یا بەهۆی شەرەفی خاوەن عیبادەتەکەیە واتە بە هۆی زۆری ترسی لە خوا، ڕیوایەت کراوە کە دوو ڕکات نوێژ لە ئینسانێکی خاوەن وەرعەوە لە هەزار ڕکاتی ئینسانی بێ تەقوا باشترە، جا مەعنای ئەوە کە (لیلة القدر) لە هەزار مانگ چاکترە، ئەوەیە کە ڕکاتێ نوێژی شەوی (لیلة القدر) لە (٣٠) هەزار ڕکات نوێژ لە غەیری ئەو مانگەدا خێری زۆرترە، هەروەها خوێندنی جوزئێ قورئان لەو شەوەدا لە سی هەزار جوزئی قورئان لە شەوانی تردا خێری زۆرترە. هەروەها یەك دینار بدەی بە فەقیرێ لە سی هەزار دینار لە شەوانی تردا خێری زۆرترە، دیسان یەك کەلیمە لە حەمدو تەسبیح و تەهلیلە لەو شەوەدا لە سی هەزار چەندانەی وەختی تر خێری زۆرترە والله اعلم. دیارە کەسێ خوا تەوفیقی بدا لە ماوەی شەوی (لیلة القدر)دا ئەوەندە عیبادەت دەکا کە بە عومری سێسەد ساڵی ئوممەتە پێشووەکان ئەو ئەندازەیە مومکین نەبووە، بەڵام ئەگەر لەو شەوەدا کۆشش نەکا و، هەر بە عادەتی بڕوا بەڕێداو تەنیا واجیباتی ئەو شەوە بەجێ بێنێ، ئەوە ئەوشەوەی بە هەشتا ساڵە کە غالبی عومرە یا زیاترە لە غالبی عومر. خۆ ئەگەر ئەو شەوە بە تاعەت و خوا پەرستی زیندوو بکاتەوە، ئەوە پاداشی لە ژماردن نایەت، جا کاتێ کە پێغەمبەر (د. خ) ئەم سوورەتە و ئەم ئایەتەی بۆ هات دڵشاد بوو پەریشانیی خاتری نەماو دڵی موبارەکی ئارام بوو، لە سایەی لوتف و میهرەبانیی خواوە ئەم عومرە کورتەی ئوممەتی لە عومری درێژی ئوممەتەکانی تری پێشوو درێژتر بوو. حیکمەتی کورتیی عومری ئەم ئوممەتەیش ئەوەیە ئەگەر لەم ئاخر زەمانەدا عومری ئەمانەیش درێژ بووایە وەك هی ئوممەتە پێشووەکان، بە بێ حیساب (شداد) و (نمرود) و (فرعون) لە ناویانا پەیدا دەبوون، دیارە ئینسانێکی لە خۆبایی بوو کاتێ بزانێ عومری دەگاتە هەشتسەد ساڵ یا نۆسەد ساڵ مەگەر هەر خوا بزانێ چ جۆرە خراپییەك دەکا، پەنا بە خوا.

ڕیوایەت کراوە: کە خوای گەورە (جل جلالە) لە شەوی (لیلة القدر)دا ئەمر دەکا بە جوبرەئیل (د.خ) لەگەڵ کۆمەڵێ مەلائیکە بە ئالایەکی سەوزەوە دادەبەزن بۆ سەر عەرز و،

ئالاَّکەیان لەسەر بانی (کعبة الله) دادەمەزرێنن و، جوبرەئیل باڵەکانی خۆی دەکاتەوەو، ئەمر دەکا بە مەلائیکەکان برۆن بۆ ناو ئەو کەسانە کە بە ڕۆژوون لە ئوممەتی حەزرەت (د.خ) و سەلام بکەن لە هەر کەس پێی گەیشتن لە ئەهلی شەونوێژ و ڕۆژوو زیکر و خوداپەرستی و دەس بخەنە ناو دەسیان و، کاتێ کە دوعایان کرد ئامینیان بۆ بکەن، هەتا دوعاکەیان قبووڵ بێ، ئەو مەلائیکانەش چۆن ئەمریان پێ کراوە وەها ڕەفتار دەکەن لەگەڵ ئەم ئوممەتەدا ئەوانەی کە بەختیار بن و لەم مانگە پیرۆزەدا مەشغوولی خوا پەرستی و تاعەت بن. دیارە نیشانەی گەیشتنی موسڵمان بە مەلائیکە ئەوەیە ئەو کەسانە کە مەلائیکە سەلامی لێ کردوون و دەستی خستووەتە دەستیان لەو ساڵەدا دڵیان بە نووری خوا ڕووناك و پاك دەبێتەوە و، خووڕەوشتیان بەرەو باشی دەگۆڕێ و، ڕوو دەکەنە چاکە لە ساڵان باشتر. سەر لە بەیانی جوبرەئیل بانگی (الرحيل الرحيل) دەدا بەگوێی ئەو مەلائیکانەدا، واتە بینەوە بڕۆینەوە بۆ ئاسمان، کە مەلائیکەکان دەگەنە خزمەتی جوبرەئیل و پرسیاری لێ دەکەن ئایا خوای گەورە چی دەکا و چی کرد لەگەڵ ئەم ئوممەتەدا کە بە ڕۆژ ڕۆژوو دەگرن و بە شەو نوێژو خواپەرستی دەکەن؟ جوبرەئیل وەڵامیان دەداتەوە کە خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت سەیری ئەوانی کردووەو، کەس لەم ڕەحمەتە بێ بەش نەبووە چوار تاقم نەبێ، یەکەم: شەراب خۆر. دووەم: ئەوانەی دڵی دایك و باوك دەرەنجێنن و لەگەڵیاندا بێ حوقووق و بێ ئەدەبن. سێیەم: ئەوانەی کە پێوەندیی خوێشایەتی دەپچڕن. چوارەم: ئەوانەی کە کینەو ڕق لە دڵیاندا ڕادەگرن بەرامبەر بە موسڵمانان.

ڕیوایەت کراوە شەوی جەژنی ڕەمەزان ناوی (ليلة الجائزه)یە، واتە شەوی بەخشش، وە هەر کە شەوی جەژن هات خوای گەورە تا شەبەق مەلائیکە ڕەوانەی دەکا بە هەموو وڵاتی موسوڵمانانداو، ئەمریان پێ دەکا کە لە هەموو سەر کۆڵان و ڕێگایەکدا ڕاوەستن و بانگ لە موسڵمانان دەکەن بە ئاوازێ کە هەموو سەر کۆڵان و ڕێگایەکدا ڕاوەستن و ڕۆژەوەوانەکان بانگ بکەن، ئەوانیش بەو شێوە ڕادەوەستن و بانگ لە موسڵمانان دەکەن بە ئاوازێ کە هەموو گیانلەبەرێ دەیبیسێ جن و ئینس نەبێ، دەڵێن ئەی ئوممەتی محەمەد! (د.خ) لە ماڵی خۆتان بێنە دەرەوە بۆ خزمەتی ئەو خوایە کە خاوەن کەرەم و خاوەن بەخششەو گوناهی گەورە دەبەخشێ، جا کاتێ کە خەڵکەکە هاتن بۆ مزگەوت خوای گەورە لە مەلائیکەکان دەپرسێ: جەزای کەسێ کە بە کرێ گیرابێ چییە؟

مەلائیکەکان جواب دەدەنەوەو، دەڵێن: یا ربنا ویا الاهنا وسیدنا جەزایان ئەوەیە کە کرییەکەیان بە تەواوی تەسلیم بکەی، جا خوای گەورە دەفەرمووێ مەلائیکەکان! ئێوە بە شاهد بن کەوا بڕیارم دا جەزای ئەم موسوڵمانانە کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیان گرتووەو شەویش تاعەتیان کردووە ئەوەیە کە هەمووم عەفوکردن و لە هەموویان ڕازی بووم، جا پاش ئەمەیشە خوای گەورە بە نەزەری ڕەحمەت ڕوودەکاتە هەموو بە ڕۆژووەکان و پێیان دەفەرمووێ: ئەی عەبدەکانی من مەبەستی خۆتان دەربڕن و داوای بکەن، بە گەورەیی خۆم قەسەم هەرچی لە خێراتی قیامەت داوابکەن، پێتان دەدەم، وە هەرچی لە شتی دنیایی داوابکەن من تەماشای دەکەم خێری تیابوو، بۆتان پێتانی دەدەم، ئەگەرنا پێتان نادەم، بە عیززەت و جەلالی خۆم قەسەم عەیب و عارو هەڵەی ئێوە دادەپۆشم مادام ئێوە تەماشای حوقووقی من بکەن، بە عیزەت و جەلالی خۆم قەسەم ئێوە سووك و مەهتووك ناکەم مادام لە دائیرەی فەرمانی من دەرنەچن، دەی بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆتان بە عەفووکراوی و تاوان پۆشراوی، وا بە هۆی پیرۆزیی ڕۆژووی ڕەمەزانەوە لە ئێوە ڕازی بووم.

براکانم! ئەو هەمووە میهرەبانی و کەرەمی خوایە بە مەرجێکە لە ڕەمەزاندا بە هۆی نەزانی و بێ موبالاتیی خۆتانەوە ئەو شتانە ڕوونەدەن کە ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە، وەکو خواردن و خواردنەوەو جیماع لەگەڵ حەلاڵ و خۆڕشاندنەوە، هەروەها ئەو شتانە ڕوونەدەن کە خێر و پاداشی ڕۆژوو لادەبەن وەکو غەیبەت کردنی خەڵك و بوختان و جنێوو کینە لەگەڵ موسڵمان ناگاتە ئەو پایەی کە وتمان. حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر موسڵمانێکی بەڕۆژوو تەرکی درۆو کردەوەی خراپ نەکا، خوای گەورە موحتاجی ڕۆژووی ئەو نییە، چونکە نەخواردن و نەخواردنەوە لەگەڵ فەسادیدا نرخی نییە و نابێ، بەڵام ئەگەر ڕۆژوو بە نییەتی ساغ و بەجێهێنانی ئاداب و ئەرکەکانەوە بێ، بۆ ئەو چوار تاقمە نەبێ کە باسمان کردن، بۆ هەموو کەس دەبێتە هۆی عەفووی تاوان و دەستکەوتنی پایەی بەرزو ڕەحمەتی خوا لە قیامەتدا بە تایبەتی گەیشتن بە خوای گەورە (جل جلاله).

براکانم! جا کە خوا بۆی کردن لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو بوون و، عیبادەتی خواتان کرد لە شەو و ڕۆژداو، بەر نیگای میهرەبانیی خوای گەورە کەوتن، ئیتر ڕجاتان لێ دەکەم لە پاش جەژنی ڕەمەزان دووبارە دەس نەکەنەوە بە گوناهکردن و هاوڕێیەتیی نەفس و

شەیتان و، ئەو وەزعە جوانەی خۆتان تێك مەدەن، ئەگەرنا ئیتر گلەیی لە خۆتان بکەن و گلەیی لە ڕەمەزان مەکەن؛ ئینسان ڕۆژی دە جار خۆی بشۆرێ کە خۆی بخاتەوە ناو پیسی دیسان پیس دەبێتەوە. هەندێ لە زاناکان فەرموویانە: ڕۆژوو سێ بەشە ڕۆژووی ڕۆح، ڕۆژووی عەقڵ، ڕۆژووی نەفس. ڕۆژووی ڕۆح بریتییە لەوەی کە ئینسان هەموو هیوایەك ببڕێ و دووری بخاتەوە لە خۆی بێجگە لە هیوا بە خوای گەورە. ڕۆژووی عەقڵ ئەوەیە کە ئینسان بڕوا بە گژی هەوای نەفسی خۆیدا. ڕۆژووی نەفس ئەوەیە کە ئینسان وازبێنێ لە هەرشتێ کە ڕۆژوو دەشکێنێ وەك خواردن و خواردنەوە و هاوچەشنیان. جا ئەگەر دەتوانن وەها بە ڕۆژوو بن ئەوە زۆر هۆی بەختیارییە. ئەگینا با عەقڵ و نەفستان بە ڕۆژوو بێ، ئەگەر ئەمەش ناتوانن واجیبە نەفستان بە ڕۆژوو بێ و، لەو شتانە کە بە زاهیری شەرع ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە دووربکەونەوە، هەروەها خۆتان بپارێزن لەو شتانەش کە پایە و پاداشی ڕۆژووەکانتان دەهێننە خوار وەك غەیبەت و بوختان و فیتنەیی و سوێندی درۆو درۆکردن و تەماشاکردنی نامەحرەم و باقیی گوناهەکان. شایانی باسە ئەم گوناهە ناشیرینانە با ئینسان خۆی نەیانکا مادام بە ئارەزوو حەزی خۆی لەگەڵ یەکێکدا دابنیشێ کە ئەو گوناهەکە بکا هەر دەبێتە هۆی بێ نرخیی ڕۆژووەکەی چونکە بە گوناه ڕازی بوون خۆی گوناهە. هەر لەم ڕووەوە لای خواناسە تایبەتییەکان ڕۆژوو ئەوەیە ڕۆژووی ڕۆح و عەقڵ و نەفس و پێنج حاسەکەو هەموو ئەندامی لەش بێ، هەرچەند هەمووی دێتەوە سەر دڵ، ڕۆژووی دڵیش ئەوەیە تەنانەت لە نیازی گوناهیش خۆی بپارێزێ، هەروەها ڕۆژووی گوێچکە ئەوەیە واتەی حەرام نەبیسێ، ڕۆژووی چاو ئەوەیە تەماشای حەرام نەکا، ڕۆژووی زمان ئەوەیە بە حەرام نەدوێ، ڕۆژووی دەم ئەوەیە شتی حەرام نەجوێ، ڕۆژووی دەست ئەوەیە ئازاری کەس نەدات و یارمەتیی کردەوەی خراپی کەس نەدا، ڕۆژووی پێ ئەوەیە کە نەجووڵێ و نەکەوێتە ڕێ بۆ کردەوەی خراپ، ڕۆژووی ئەندامەکانی تری لەشیش ئەوەیە کە لە شتی گوناهدا بەکار نەهێنرێن، بێگومان ئەو کەسەی کە لە عەقڵ و هۆشی ئاینی بێ بەش نەبێ، هەموو ئەمانە وەردەگرێ و دەزانێ ئەمانەی کە وتمان ڕاستن.

براکانم! مانگی ڕەمەزان لە قورئانی پیرۆزدا و لە حەدیسی قودسی و حەدیسی پێغەمبەردا (د.خ) گەلێ مەدح و سەنای کراوە، ئەوەی کە دەستم کەوتوون کۆم کردوونەتەوە و تەرجەمەم کردوون: مانگی ئیحسان، مانگی خوێندنەوەی قورئان، مانگی ڕەزای خوا، مانگی عەفووی تاوان، مانگی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت و

داخستنی دەرگاکانی دۆزەخ، مانگی گوشادیی ڕزق و ڕۆزی لەسەر خێزان و میوان، مانگی ئەمن و ئەمان، مانگی زۆری خێرات، مانگی زۆریی نەفەقات، مانگی چەندقات بوونەوەی حەسەنات، مانگی بەرزیی دەرەجات، مانگی لاچوونی (سیئات)، مانگی ئازادیی گەردن لە ئاگری دۆزەخ، مانگی زۆرکردنی پاداش، مانگی هاتنە خوارەوەی جوبرەئیل، مانگی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز، مانگی عەفووکردنی گوناهی کەموزۆر.

ڕیوایەت کراوە: کەسێ کە بە ڕۆژوو بێ لە خواردن و خواردنەوە بە بێ تەماشای حەرام و حەڵاڵ ئەوە ڕۆژووەکەی عادەتە، وە هەرکەس بە ڕۆژوو بێ لە حەرام و، بەریانگ بکاتەوە لەسەر حەڵاڵ، ئەوە ڕۆژوەکەی عیبادەتە، وە هەرکەس بە ڕۆژوو بێ لە هەموو گوناهێ و ڕۆژوو بشکێنێ لەسەر بیروباوەڕو کردار و وتاری باش ئەوە ڕۆژوەکەی پارێزگاری لە خوا ترسییە، وە هەرکەس بە ڕۆژوو بێ لە گوناهـ، واتە پەشیمان بێتەوە لە گوناهـ و، لەسەر تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا بەریانگ بکاتەوە ئەوە ڕۆژوەوانێکی پاك و خاوێنە، وە هەرکەس بە ڕۆژوو بێ لە خووورەوشتی ناپەسەند و ڕیاو بەرچاوێنی و، لەسەر دڵسۆزی و دڵسافی و دەروون پاکی بەریانگ بکاتەوە ئەوە ڕۆژوەوانێکی سالمە، وە کەسێ بە ڕۆژوو بێ لە بە گوێ کردنی ئارەزووی نەفس و، لەسەر خوانی بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژو ئەنجام و پەیداکردنی ڕەزامەندیی خوا بەریانگ بکاتەوە ئەوە بەقازانج و دەوڵەتی خۆی گەیشتووە لە دنیادا. وەهەرکەس بە ڕۆژوو بێ لە تەماع و ئەمەل درێژی و، لەسەر حاڵی چاوەڕوانیی ئەجەل و ئاکام بەریانگ بکاتەوە، ئەوە ڕۆژوەوانێکی دوور لە دنیایە.

براکانم! ئەم فەرموودانە هەریەکی لەسەر پایەی جۆرە ئینسانێك باس کراوە، پوختەی قسە ئەوەیە ڕۆژوەوان پێویستە ڕۆژووەکەی بە نیازی خواپەرستی و دڵسۆزی بێ و، لەگەڵ بەجێهێنانی ئەرکان و ئادابدا بێ و، لەگەڵ ترس و ئومێدا بێ، ئەنجا دەبێتە خواپەرستییەك کە لە ناو خوداپەرستییەکاندا جێگای ببێتەوە. هەر لەم ڕووەوە ڕیوایەت کراوە: کەسێ بە ڕۆژوو بێ لەسەر بناغەی باوەڕ بە خوای گەورە و بە تایبەتی لەبەر جێبەجێ کردنی ئەمری خوا و وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو بێ ئەوە خودای گەورە چاوپۆشی دەکا لە گوناهەکانی.

دیارە بەشێکە لە باوەڕ بە خواو دڵسۆزی بۆ خوا ئەمە کە ڕۆژوەوان بە یەقین و

باوەڕێکی ساغەوە بە ڕۆژوو بێ و حەزی لە پاداشی ڕۆژوەکەی بێت کە لای خواوەیە، هەروەها لە کاتی هاتنی مانگی ڕەمەزاندا نەفسی شاد بێ و، بە هۆی هاتنی ئەم مانگی عیبادەتەوە شادمان بێ، چونکە مانگی عیبادەتە و دەبێتە هۆی بەخشینی گوناه و پایەبەرزی لای خوا، هەروەها نەفسیەتی وەها بێ کە درێژیی ڕۆژوەکانی بە تاڵان بزانێ و وەها بزانێ هەتا کاتەکان دەوام بکەن ئەو خێراتی زیاد دەبێ. ئەو کەسە ئەم ڕۆژووی ڕەمەزانەی بۆ دەبێ بە کەفارەتی گوناه و بە مایەی پایەی بەرز لای خوای گەورە.

براکانم! باش بزانن نزیکبوونەوە لە خوای گەورە تەنیا بە ڕۆژووی ڕەمەزان و نەخواردن و نەخواردنەوە نابێ، بەڵکو پێویستە تەرکی کردەوەی حەرام و زوڵم و بوختان و نامووس شکاندنی خەڵك و ئازاردانی دراوسێیش بکات، ئەگەر موسڵمان لەبەر خوا بەڕۆژوو بێ، دەبێ ئاوها بە ڕۆژوو بێ؛ بۆیە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی گەلێ ڕۆژوەوان بەشیان لە ڕۆژوەکەیان تەنیا تینوویەتی و برسییەتییە و بەس.

براکان! ئەگەر کەمێ بیربکەنەوە لە سڕی ئەمە حاڵی دەبن و حیکمەتەکەیتان بۆ ڕوون دەبێتەوە؛ چونکە ڕۆژوو خۆنزیك کردنەوەیە لە خوا وە، خۆنزیك کردنەوە لە خودا هەرچەند بە تەرکی خواردن و خواردنەوە بێ، بەڵام مادام لەگەڵ کردەوەی ناشەرعیدا بوو مەعنای وای لێ دێ کە ئینسان بە کردەوەی حەرام نزیك بێتەوە لە خوا، یاخۆ بە شتێ کە نیوەی حەڵاڵ بێ و نیوەی حەرام بێ، دیارە شتی تێکەڵ لە حەڵاڵ و حەرامیش نابێ بە هۆی نزیك بوونەوە لە خوای گەورەو، نزیك بوونەوەی وەها مەحاڵە. وە ئەگەر یەکێ ڕۆژوویەکی وەهای گرت، واتە لەگەڵ کردەوەی حەرامدا بوو وەکو خواردنی حەرام و غەیبەت و گوناهەکانی تر هەرچەند بەزاهیر ڕۆژوەکەی دروستە و قەزاکردنەوەی ناوێ بەڵام هیچ پاداشی نییە.

ڕیوایەت کراوە: کە سیفەتی (سەبر) کە لە قورئان و حەدیسی شەریفدا گەلێ جار مەدح کراوە، سێ جۆرە، یەکەم صەبر لەسەر بەڵا و موسیبەت. دووەم سەبر لەسەر بەجێهێنانی تاعەت. سێیەم سەبر لە گوناه و تاوان بە مەرجێ کە ببێ بە خووڕەوشتی خاوەنەکەی، جا لە حەدیسی شەریفدا هەیە ئەو کەسانەی سەبر دەکەن لەسەر بەڵاو موسیبەت وەکو زیانی نەفس و زیانی ماڵ و سامان سێسەد دەرەجەیان هەیە مابەینی هەر دوو دەرەجە لەوانە وەکو مابەینی عەرز و عاسمانە. هەروەها سەبر لەسەر تاعەت واتە خۆگرتن لە بەجێهێنانی عیبادەتدا وەکو نوێژ و ڕۆژوو لە گەرما و سەرما و خۆشی و ناخۆشیدا

سێسەد دەرەجەی لەسەر نووسراوە مابەینی هەردوو دەرەجە لەوانە وەکو مابەینی ئەرز و ژووری عاسمانەکانە. بەڵام سەبر لەسەر گوناه کە بوویێ بە خوو لە خاوەنەکەیدا سێسەد دەرەجەی بۆ دانراوە کە مابەینی هەردوو دەرەجەیان بە قەدەر دوو جار مابەینی ئەرز و نیهایەتی عەرشە.

براکانم! لە ڕۆژوودا ئەم سێ جۆرە سەبرە هەیە و ئینسانی بە ڕۆژوو بە هەر سێ پایەکان دەگا؛ چونکە صەبر لەسەر موسیبەتی تێدایە کە سەبرە لەسەر برسیەتی و تێنویتی و بێ هێزی، صەبر لەسەر تاعەتیشی تێدایە چونکە ڕۆژوو خۆی عیبادەتە و ڕۆژەوان خۆی دەگرێ لە سەری. هەروەها سەبر لە گوناهیشی تێدایە، چونکە بە هۆی ڕۆژووی تەواو و ڕەساوە، ئینسانی زۆر پاك خۆی دوور دەخاتەوە لە تەماشای نامەحرەم و غەیبەت و ئارەزووەکانی تری نەفس کە حەرام و ناڕەوا بن، بۆیە لە فەرموودەی خوا لە حەدیسی قودسیدا هەیە کەوا کەس قیمەتی ڕۆژوو نازانێ مەگەر خوای گەورە، ڕۆژوو بۆ ئەوەو ئەو جەزای دەداتەوە.

ڕیوایەت کراوە: کە ڕۆژووی ڕەمەزان بە (معلق)ی دەمێنێتەوە و مەلائیکە نایخەنە ڕوو بۆ قبووڵ هەتا ئەو ئینسانە بە ڕۆژوە سەرفیترە نەدا بە موستەحەق، کە سەر فیترەی دا بە موستەحەق ئەوجا ڕۆژوەکەی وەردەگیرێ. بێگومان زۆر نەفامی و بێ مەعنابییە کە ئینسان خۆی لەو هەمووە خێر و پاداشە بێ بەش بکا بۆ شتێکی کەمی وەك سەرفیترە کە بریتییە لە سێ ئیزرەم گەنم.

جا ئەمجار با کەمێ لە حاڵی ئەوانیش بزانین کە ڕەمەزان دەکوژن و بە بێ عوزرێکی شەرعی ڕۆژووی ڕەمەزان دەفەوتێنن، بێگومان کەسێ کە حاڵی وابێ ڕۆژووی فەرزی مانگی ڕەمەزانی موبارەك بە بێ عوزر بفەوتێنێ، ڕۆژووی سوننەتیش ناگرێ و، لە خێر و پاداشی ڕۆژووی دووشەممە و پێنج شەممە و ڕۆژانی (ایام البیض)و نۆ ڕۆژەی یەکەمی مانگی قوربان بە تایبەتی ڕۆژی نۆهەمی کە عەرەفەیە، بێ بەش و نائومێد دەبێ، جا کە حاڵی ئینسانی موسڵمان بگاتە ڕادەیەك کە ئەم هەموو خێرە لە کیسەی خۆی بدا وا باشە کە بۆ حاڵی خۆی بگرێ.

ڕیوایەت کراوە: کەسێ کە ڕۆژووی ڕەمەزان بێ عوزری شەرعی تەرك بکا، ئەگەر تەواوی ساڵ بە ڕۆژوو بێ، قەزای ئەو مانگەی بۆ ناکرێتەوە بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو خێر و پاداشەی دەست ناکەوێ کە لە ڕۆژوە حازرەکەوە دەستی دەکەوێ. هەروەها ئەگەر

کەسێ مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو نەبوو قەزایشی نەکردەوە هەتا ڕەمەزانی تر، هات ئەوە زیاد لەوە کە قەزای ڕۆژووی ئەو مانگە فەوتاوە واجیبە لەسەری بۆ هەموو ڕۆژێکیش (مد)ی قووت واجیب دەبێ لەسەری بیدا بە هەژاران لە جۆری ئەو سەرفیترەی کە دەدرێ بە هەژار، خۆ ئەگەر تا دوو ساڵ قەزای نەکردەوە ئەوە زیاد لە قەزای ڕۆژووەکە، دەبێ بۆ هەموو ڕۆژی دوو (مد) قووت بدا بە فەقیر لە کەفارەتدا. هەروەها بە زیادبوونی هەر ساڵێ هەموو ڕۆژێ (مد)ێ زیاد دەکا. خۆ ئەگەر ئەو ئینسانە مردو قەزای نەکردەوەو فیدیەکەیشی نەدا ئەوا لەسەر ئەو قەولەی کە دەڵێ دروستە قەزای ڕۆژوەکەی لەلایەن کەسێکەوە بۆ بکرێتەوە واجیبە ڕۆژوەکەی بگێرێتەوەو (مد)ە[1] کەفارەتەکەش لە قووتی سەردەم بدرێ بە فەقیر وەکو باسمان کرد، بەڵام لەسەر ئەو قەولە کە دەڵێ دروست نییە قەزای ڕۆژوەکەی بۆ بکرێتەوە ئەوە واجیبە لە ماڵی خۆی لەباتی هەر ڕۆژێکی فەوتاو (مد)ێ بدرێ و، لەباتی دواخستنەکەش کە تا ساڵێ دوای خستووە بۆ هەموو ڕۆژێ (مد)ێك و، بۆ یەك ساڵ دواخستن لە باتی ڕۆژی (مد)ێك و بۆ دووساڵ دواخستن دوو (مد)ە تاد..

ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی لە خەودا چاوم بە دووکەس کەوت هاتن بردمیان بۆ کێوێکی سەخت و ناهەموار، وتیان پێم سەرکەوە، وتم بەڕاستی لە توانامدا نییە و ناتوانم، وتیان نەخێر سەرکەوتن بۆ تۆ ئاسانە. سەرکەوتین تا گەیشتمە ناوەڕاستی کێوەکە لەوێدا دەنگ و ئاوازێکی زۆر ناهەموارم بیست، پرسیم ئەو ئاوازە ناهەموارە چییە؟ وتیان ئەوە دەنگی ئەهلی دۆزەخە، ئەنجا ڕۆیشتین لە ڕێگەدا کۆمەڵێکم هاتە پێش چاو بە ئێسکی سینگیاندا هەڵواسرابوون و، هەردوو لەغاوەی دەمیان هەڵدڕابوو، پرسیارم کرد ئەی ئەمانە کێن؟ وتیان ئەمانە ئەو کەسانەن کە بە نەفامی و سەرکەشی لە پێش ئەوەی بانگی مەغریب ببێ ڕۆژووەکەیان دەشکێنن و ڕۆژووەکەی خۆیان بەتاڵ دەکەنەوەو خەڵکیش دوایان دەکەون و ئەوانیش ڕۆژوەکەیان بەتاڵ دەبێتەوە.

خۆم لە کتێبدا نەمدیوە بەڵام بیستوومە ڕیوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا یەکێ لە ئوممەتی من دەبەن بۆ دۆزەخ ئەویش هاوارم لێ دەکا کە فریای کەوم، منیش دەڕۆم بەهاوارییەوەو دەڵێم بە زەبانییەکانی دۆزەخ ئەم

(١) موددێك کەمێك لە نیوکیلۆ زیاترە.

شەخسە لە نوممەتی منە، ئەوانیش دەڵێن یا ڕەسووڵڵا ناتوانین دەسبەرداری ببین ئەمە دوژمنێکی بەهێزی هەیە، دەپرسم لێیان دوژمنەکەی کێیە؟ ئەوانیش دەڵێن دوژمنەکەی ڕەمەزانە، واتە: ئەم شەخسە ڕەمەزانی کوشتووە، کە ئەوە دەبیستم منیش دەگەڕێمەوەو تکای بۆ ناکەم. براکانم! لەم باسەدا فەرموودەی حەزرەت (د.خ) زۆرن، بەڵام بۆ ئێوە ئەم ئەندازەیە بەسە. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

ئەو ڕۆژانەی کە خێر و پاداشیان گەورەیە ئەگەر تیایدا بە ڕۆژوو ببی ئەمانەن:

١- ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بە دەمانگە خێرەکەی ٦ی شەوالیش بە دوو مانگ ئەوە ساڵەك (صائم الدهر).

٢- ڕۆژووی ١٣، ١٤، ١٥ی هەموو مانگ؛ چونکە لەم ڕۆژانە مانگ دونیا زۆر ڕووناك دەکا وە بەم ڕۆژووانە دەڵێن ڕۆژووی "أيام البيض"

٣- ڕۆژی دووشەممە و پێنج شەممە چونکە لەم ڕۆژەدا دەفتەری ئینسان دەنێررێ بۆ لای خوای گەورەو میهرەبان جا دەفتەرمان لای خوای گەورە بێ و ئێمەش لەو کاتەدا بە ڕۆژوو بین واتە لەو ڕۆژە سەیری دەفتەرمان بکرێ وە خوای گەورەش غەفوور و ڕەحیمە...!

٤- ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩،ی ذو الحجه ئەگەر ڕۆژانە بە ڕۆژوویی، واتە هەموو ساڵ بە ڕۆژوویوی و واتە ١٢ مانگی ساڵ وەك ئەو کەسەی کە یەك ساڵ بە ڕۆژوو ببێ "صائم الدهر"ی پێ دەوترێ.

٥- ٣ ڕۆژ لە مانگی ڕەجەب و نیوەی شەعبان و یەکی موحەڕەم.

## نامەی بیست و یەکەم

# باسی سەرفیترەی ڕەمەزانە

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده، وعلى آله وصحبه أجمعين.

براکانم! خوای گەورە بتانگەیێنێ بە دەوڵەتی دنیا و قیامەت ئامین.

ئەم نامانەی من بەپێی فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ) گەورەترین دیارییەکن کە دۆستان ڕەوانەی بکەن بۆ دۆستانی خۆیان، چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: (ما أهدى مسلم لاخيه هدية افضل من كلمة يزيده الله بها هدى أو يرده بها عن ردى). هەروەها حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (د.خ) هەموو کات لە ئەسحابەکانی دەپرسی لە خوورەوشتی من کامەیان عەیبە؟ هەروەها دەیفەرموو (رحم الله امرء اهدى الي عيوبي)، بەڵام ئەو دۆستانە نایابن و خۆشەویستتان لەو دۆستە نایابانەیە. تکاتان لێ دەکەم گوێ لە فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) بگرن. بەپێی فەرموودەی خۆی دەگەن بە خێر و خۆشی و، ئەگەر گوێیان پێ نەدەن گیرۆدەی زیان دەبن و خوای گەورەتان لێ دەرەنجێ، فەرموودەکە ئەمەیە: "أيما عبد جاءته موعظة من الله في دينه فانها نعمة من الله سيقت اليه فان قبلها بشكر زاده الله بها نعما اخرى، والا كانت حجة من الله عليه". هەتا دەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێ "ويزداد بها عليه سخطا". بێ گومان گەیاندنی ئەم جۆرە نامانە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر گەلێ خێر و پاداشی هەیە؛ ڕیوایەت کراوە: "اذا حمل الرجل كلمة من الله الى اخيه المسلم كان خيرا له من حجة وعمرة ومن عبادة سنة". هەروەها لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی فێرکردن و فێربوونی مەسەلەیەکی ئاینی خێر و پاداشی هەزار ڕکات نوێژی سوننەتی هەیە، جا کەسێ ئەم خێر و پاداشانە بزانێ و ڕەحم بە موسڵمانانی نەزان نەکا ئەوە بێ موبالات و کەمتەرخەمە لە بابەتی ئاینەوە. لەم ڕۆژانەدا گیرۆدەی بەڵای نەبارینی باران بووین. حەزرەت (د.خ) سەبەبی بێ بارانی بەیان کردووە هەتا ئوممەتی ئەو لەو گوناهانە تەوبە

بکەن و، نەبنە هۆی سووتان و فەوتانی خۆیان و خەڵکی تریش. یەکێ لە هۆیەکانی بێ بارانی نەدانی زەکات و سەرفیترەیە. ئێمە لەسەر ڕێڕەوی ئیمامی شافیعین، خوای لێ ڕازی بێ، کە لای ئەو زەکاتی گەنم گەنمە و هی جۆ جۆیەو، زەکاتی مەڕ و بزن مەڕو بزنە و، هی گاو مانگاش گاو مانگایە. بەڵام مەئموورەکان لەسەر ڕێڕەوی ئیمامی ئەعزەم ئیمام ئەبوو حەنیفە (ر.خ) لە زەکاتی هەموو ئەمانەدا پارە وەرگرن، چونکە لای ئەو دروستە لە باتی ئەو شتانە کە زەکاتیان تێدا هەیە، نرخی شتەکە بدرێ، واتە: ئەوەی دەدرێ بە زەکات لە شتەکە نییە بەڵکو قیمەتەکەیەتی، کەوابێ لەسەرتان واجبە لە مەسەلەی زەکاتدا، تەقلیدی ئیمام ئەبوو حەنیفە بکەن، ئەوسا پارە بدەن لە زەکاتدا، ئەگەرنا زەکاتەکەتان لە کۆڵ ناکەوێ. زەکاتی سەر فیترە لە زۆر شوێنا هەر نادرێ، چونکە وەکیلی بیت المال داوای ناکا و خەڵکەکەش لە خۆیانەوە نایدەن، یاخۆ کەمێکی دەدەن بە فەقیر و بە ڕووگیری گەردنی خۆیانی لە باقییەکەی پێ ئازاد دەکەن. براکانم! حیکمەتی واجیب بوونی سەرفیترە چوار شتە: یەکەم: ئەوەیە کە ئینسان لەبەر ڕەزای خوای خۆی زیانێکی ماڵی ئیختیار بکا وە ئەمە لە مەعنادا تاقیکردنەوەیە بۆ ئینسان ئایا دەتوانێ ڕەگی دنیا پەرستی و ماڵخواهی ببڕێ لەبەر ئەمری خوا یانا، تەنانەت هەندێ لە زاناکان فەرموویانە ماڵپەرستی دەردێکی خراپە و ئینسان دەفەوتێنێ، هەروەها زەکاتدان دەرمانە بۆ ڕزگاری لەو دەردە، وە بەهۆی زەکاتدانەوە نەفسی ئینسان لەو نەخۆشییە ڕزگار دەبێ. حیکمەتی دووەم گەیشتنی خاوەن ماڵە بە پاداشێکی زۆر؛ چونکە پاداشی زەکات و سەرفیترە یەك بەحەفتایە، واتە: کەسێ درەمێ بدا بە داماوێ لە زەکاتدا خوا بە حەفتا درەم بۆی دەنووسێ و، مەنێ گەنم بە حەفتا مەن و سێ ئیزرەم سەرفیترە بە دوو سەدو دە ئیزرەم گەنم دەنووسرێ. حیکمەتی سێیەم ئەوەیە کە داماو و لێقەوماو لە دارایی و ماڵی دەوڵەمەند سوود وەربگرن، ماڵێ نەفسێکی پێ تێر بێ، یا ڕووتێکی پێ پۆشتە ببێتەوە، گەلێ قیمەتی زۆرترە لە ماڵێ کە بە بێ سوود سەرف بکرێ و زایە ببێ. حیکمەتی چوارەم ئەوەیە موسڵمانان لە دینی ئیسلامدا هەموو برای یەکن و، پێویستە لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوڕێی یەکتر بن، جا مادام جەژن کاتی دڵشادی و کەیف خۆشیی موسڵمانانە پێویستە فەقیرەکانیش وەکو دەوڵەمەندەکان دڵشاد بن، دیارە بە هۆی سەرفیترەکەوە حاڵیان خۆش دەبێ.

سەبارەت بە زەکات، مادام ماڵی دنیا تا سەر بەردەوام نابێ بۆ کەس، ئیمڕۆ بۆ ئەحمەدەو سبەی بۆ مەحموود، پێویستە بەم ماڵە بە شێوەی دەستەوام ئەم دەوڵەمەندە

ئەمڕۆ یارمەتی ئەو گەدا بدا، هەتا سبەینێ ئەویش یارمەتی ئەم بداتەوە. بێجگە لەمە گەدا چاوەڕوانی میهرەبانیی دەوڵەمەند دەکات، جا ئەگەر دەوڵەمەند بەشی فەقیر نەدا ئەوا فەقیرەکە دەبێتە دوژمنی و پێوەندیی چاك نابێ لەگەڵیدا، بەڵام ئەگەر بەشی بدا ئەوا بە چاوی دۆستی و برایی و خۆشەویستییەوە بۆی دەڕوانێ و پێوەندییان بەهێز دەبێ، دیارە ئەگەر کابرای زەکاتدەر یا سەرفیترەدەر بە تەواوی نەیاندا یا بە زاهیری بیاندا، بەڵام بە ڕووگیری لە کابرای وەریگرێتەوە مەگەر کەمێکی نەبێ یا گەردنی خۆی پێ ئازاد بکا، ئەوە لە ڕاستیدا ئەو زەکات و سەرفیترەیەی نەداوە.

براکان! بزانن ئێوە بە مەرجێ زیممەتان لەم واجیبی زەکات و سەرفیترەیە بەری دەبێ کە تەقلید بکەن، واتە: بە دڵ و زمان بڵێن ئێمە ڕازین بە فەرموودەی ئەو زانا ئاینییە بەرزانە کە فتوایان داوە دروستە لە ناو ئەو هەشت جەماعەتەدا کە خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی زەکات و سەرفیترەیان پێ دەدرێ، دروستە بدرێ بە سێ جەماعەت یا بە سێ کەس لە یەك جەماعەت یا تاقە کەسێ لە یەك جەماعەت وەکو لە کتێبە ئاینییەکاندا نووسراوە. هەشت جەماعەتەکەش ئەمانەن:

١- (فقیر) ئەوەی هیچی نەبێ.

٢- (مسکین) ئەوەی کەسبێ یاماڵێکی هەبێ، بەڵام بە قەدەر پێویستیی نەبێ.

٣- (عاملین) ئەوانەی لە لایەن دەوڵەتی ئیسلامەوە دێن و زەکاتەکە وەردەگرن یا کۆی دەکەنەوەو حیسابی دەکەن.

٤- (مؤلفة القلوب) ئەوانەی کە دەوڵەتی ئیسلامی لەبەر شان و شکۆیە یا لەبەر بێ هێزیی ئیمانیان و بە تەمای بەهێزبوونی خزمەتیان دەکا.

٥- (وفي الرقاب) واتە: ئەوانەی بە ماڵ ئازاد دەکرێن و موحتاجی یارمەتین و، کە زەکاتیان پێ بدرێ بەو زەکاتە خۆیان ئازاد دەکەن.

٦- (والغارمین) ئەوانەی کە قەرزارن و قەرزارییەکەیان لە ڕێگای گوناهدا نەبێ، یا تەوبەیان کردبێ، یا لەپێناوی ئاشتکردنەوەی خەڵکدا قەرزار بووبن و نەیانبێ قەرزەکە بدەنەوە.

٧- (وفي سبیل الله) واتە ئەو موسڵمانانەی لە ڕێی خوادا غەزا دەکەن و لای دەوڵەتەوە مەعاشیان نییە.

٨- (وابن السبيل) واتە ئەو موسافیرانەی کە لە ڕێگەی حەڵاڵدا بەبێ خەرجی داماون.

ئەگەر سەرفیترە بە کوێرێکی داماو بدرێ و بە یەکجار سەرفیترەی هەموو ئەندامەکانی خێزانی پێ درا، ئەوە دروستە، بەڵام ئەگەر هەر بەشی یەك سەر گەنم حازر بوو، پێویستی بەوە دەکرد کە ئەو میقدارە بە کڕین یا بە قەرز لە نێوان سەرفیترە دەرو کوێرەکەدا جێبەجێ بکرێ و ئەوە پێویستە ئەو کوێرە وەکیلێ بگرێ کە گەنمەکەی بۆ بفرۆشێ و بۆی وەربگرێ، چونکە ئینسانی بێ چاو خرید و فرۆشی خۆی دروست نییە، پێویستە وەکیل بگرێ. ئەگەر سەرفیترە بە هەتیو بدرێ ئەگەر (وصي)ی هەبوو چاودێریی بکا پێویستە سەرفیترەکە تەسلیمی (وصي)یەکە بکرێ، خۆ ئەگەر (وصي)ی نەبوو بەڵکو لە لایەن قازی شەرعەوە چاودێری لەسەر هەتیوەکە دانرابوو، ئەوە سەرفیترەکە تەسلیمی ئەو چاودێرە دەکرێ، بەڵام ئەگەر لای قازییەوە چاودێر دانەنرابوو، یا هەبوو، بەڵام دوور بوو بە زەحمەت پێی دەگەیشتن ئەوە ئەگەر هەتیوەکە دایکی هەبوو لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی دروستە ئەو سەرفیترەیە تەسلیمی دایکی بکرێ، ئەگەرنا پێویستە دەمڕاستی ئەو شوێنە یەکێ بکەن بە چاودێری ئەو هەتیوەو سەرفیترەکە یا زەکاتەکەی بۆ وەربگرێ، ئەگەرنا بە بێ شێوەیەك لەم شێوانە کە باسمان کردن ئەگەر هەروەها سەربەخۆ ئەو سەرفیترەو زەکاتە بدرێ بە هەتیوەکە، دروست نییەو جێگەی زەکات و سەرفیترە ناگرێ، چونکە دان و وەرگرتنی نابالغ بێ ئیعتیبارە، جا دەبێ سەر لە زانایانی ئاین بدەن و پرسیاریان پێ بکەن و ئەم باسە بە باشی حاڵی ببن.

ڕیوایەت کراوە: حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: هەر قەومێ زەکات و سەرفیترە نەدەن خوای گەورە لە وەختی باران پێویستیدا، مەنعی بارانیان لێ دەکات، بێگومان حەزرەت ڕاستگۆ و باوەڕ پێ کراوە، جا ئەمە کە وتمان زیانی گشتی بوو، زیانە تایبەتییەکەیش ئەوەیە کە ئینسان زەکات و سەرفیترە نەدا ڕوکنێ لە ڕوکنەکانی ئیسلامەتیی خۆی ڕووخاندووە؛ چونکە ئەرکانی ئیسلام پێنج شتن، یەکەم دوو کەلیمەی شەهادەت (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) دووەم پێنج فەرزی نوێژە لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا. سێیەم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە لە هەموو ساڵێکدا. چوارەم زەکات و سەرفیترەیە. پێنجەم حەجی (بیت الله)یە بۆ کەسێ کە دەستی بڕوات. بەم پێنج شتە خانووی ئیسلام تەواو دەبێ بە هەر چوار دیوار و سەرمیچەکەیەوە، دیارە هەر کام لەمانە نەبوو ئەوە یەکێ لە پێنج ڕوکنەکانی دەفەوتێ، بێگومان ئینسانی هوشیار لە خانووی بێ سەرمیچ یان بێ دیواردا ناژی، هەروەها موسڵمانیش بە نەمانی یەکێ لەو

پێنج ڕوكنـانـەی ئیسلام موسڵمـانـەتییەكەی بـە ساغی نـامێنێتـەوەو، بـەرامبـەر بـەو كەموكورتییە لە ڕۆژی قیامەتدا سزا دەدرێ.

دیارە كە ڕۆژی قیامـەت ڕۆژێكە منداڵان پیر دەكات یانی ئەوەندە درێژە كە منـاڵ تێیدا پیر دەبێ، یاخۆ لەبەر ترس و سامناكی لەو ڕۆژەدا منـاڵ سەری سپی دەبێ..

ئە وەرن بەراوردێ بكەن ئەگەر خاوەن كوڕراوێ پیاو كوژەكە بگرێ و ئەم پیاوكوژە دڵنیابێ لەوەی كە دەكوژرێتەوەو گیانی دەردەچێ هێشتا ترس وای لێ ناكا كە سەری سپی ببێ، كەواتە دەبێ ڕۆژی قیامەت چەند سامناك بێ و، دەبێ ئەو ترسەی چ جۆرە ترسێ بێ كە مووی سەری منـاڵ سپی بكات؟

ڕۆژی قیامـەت ڕۆژێكە ماوەی پەنجا هەزار ساڵ درێژە، وەكو خوای گەورە فەرموویەتی: "في يوم كان مقداره خمسين الف سنة"، واتە: ڕۆژی قیامـەت پەنجا هەزار ساڵ ماوەی هەیە و، لەم ماوەدا پەنجا ڕاوەستان هەیە، هەر ڕاوەستانێ بۆ سزای جۆرە گوناهێكە و ماوەی هەزار ساڵە مەگەر یەكێ خوای گەورە ڕەحمی پێ بكات و ڕزگاری بفەرمووێ.

ئەو ماڵە زەكاتی تیا واجیب بێ و لێی دەرنەكرێ لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە پارچە پشكۆیەكی زۆر بەتین و سۆزندەو دەنرێ بە ناوچاوان و تەنیشت و پشتی ئەو خاوەن ماڵانەدا كە زەكاتیان لێ دەرنەكردووەو نەیانداوە بە موستەحەقان هەروەكو لە سوورەتی (توبة)دا دەفەرموێ: "يوم يحمى عليها فى نار جهنم فتكوى بها جباهم وظهورهم، هذا ما كنزتم لا نفسكم فذوقوا ما كنتم تكنزون" جا ئەوەندەی لە لای خواوە بڕیاردرابێ بەم جۆرە سزا دەدرێن و، لە كاتی تردا ئەو پارچە ئاگرینانە خوای گەورە دەیانكات بە مار و دەیانئاڵێنێ بە دەوری ملیاندا و، بە ئەمری خوا پێیانەوە دەدەن هەتا ئەوەندەی خواستی خوای لەسەر بێ..

براكانم! بە نەدانی زەكات و سەرفیترە ئەم هەموو زیانە پەیدا دەبێ: یەكەم نەبارینی باران، دووەم نەمانی ڕوكنێ لە ڕوكنەكانی ئیسلام، سێیەم ئەو دوو جۆرە سزایە كە باسمان كرد، چوارەم لەكیس چوونی پاداشی یەك بە حەفتا، پێنجەم بێ بەش بوون لە پاداشی گەورەی ڕۆژووی ڕەمەزان، كە وەكو باسمان كرد، مەگەر هەر خوای گەورە بزانێ چەندێكە.

ڕیوایەت كراوە: كە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: بە زەكات شوورا بۆ ماڵ و سامانتان بكەن، بە خێرو سەدەقە دەرمانی نەخۆشیی خۆتان بكەن.

براکانم! لای هەندێ لە ئیمامانی موجتەهیدین ئەو کەسانە کە تەرکی بەجێهێنانی ڕوکنێ لە ئەرکانی ئیسلام دەکەن وەکو زەکات و سەرفیترە کافر دەبن، بەڵام کوفرێکی سووك، چونکە کوفر، پەنا بەخوا، دوو جۆرە، یەکەم کوفری سووك وەك جێبەجێ نەکردنی هەندێ لە ئەرکان و واجیباتی ئیسلام، دووەم کوفری گران وەك باوەڕنەکردن بە یەکێ لە ڕوکنەکانی ئیسلام. جا هەرکەس لە برایان ئەرکانی ئیسلامی بە ڕاستی بەجێ هێناو نوێژ و ڕۆژووی بەساغی کرد و، زەکات و سەرفیترەی بە تەواوی دا بە موستەحەقەکان ئەوە پێویستە لە سەری زۆر سوپاسی خوای گەورە بکا کە تەوفیقی داوە بۆ گەیشتن بەو نیعمەتە گەورەیە و بۆ خۆپاراستن لە سزاو مەینەتی ڕۆژی قیامەت، خۆ ئەگەر خوانە خواستە وەها نەبوو ئەوە واجیبە بزانێ کە زەرەری کردووەو، گورج پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ بەجێهێنانی هەموو واجیباتی سەر شانی بەڵکو خوای گەورە لە ئازاری قیامەت بپارێزێ و نەشبێت بە هۆی مەنعی باران لە موسڵمانان و زیانی گشتیی ئۆمەت.

براکانم! بابەتێکی تر هەیە دەمەوێ بۆتانی ڕوون بکەمەوە ئەویش مەسەلەی (تخمین)ی ڕەزەکانە. وا دەردەکەوێ ئەو باغە ڕەزانە بە موافیقی شەرع تەخمین ناکرێن، چونکە ئەو کەسە کە دێ بۆ تەخمینی باغەکان پێویستە پیاوێکی زانا بێ بە بەری باغی مێو و عادڵ و دادپەروەر بێ و تەماشای هەموو بنە مێوەکان بکا ئەوجا میقداری ترێ ئەگەر بە تەڕی بفرۆشرێ یا میقداری مێوژ ئەگەر بکرێ بە مێوژ، بکاتە ماڵ لەسەر خاوەن باغەکەو، خاوەن باغەکە بەو تەخمینە ڕازی بێ ئەو کاتە حەقی زەکاتەکە لە عەینی بەرەکە لادەچێ و دەچێتە گەردن و ئەستۆی خاوەنەکەی، لەبەرئەوە خاوەن باغ دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی دەستکاریی باغەکەی بکا بە لێ خواردن و بە فرۆشتن... تاد، کەچی ئەم جۆرەی کەوتمان لە کەم شوێندا جێبەجێ دەکرێ، بۆیە هەموو بەرەکە مافی زەکاتی پێوە دەمێنێ و هەرکەس خاوەن (ورع) بێ و خۆی بپارێزێ لە شتی شوبهەدار ناتوانێ لەو ترێی بازاڕە بکرێ بۆ خۆی و خێزان و میوانی، کەوابێ چاك وایە زوو بەزوو تەقلیدی ئیمام ئەبوو حەنیفە بکەن و قیمەتی میقداری زەکاتی واجیب بە موستەحەقەکان بدەن تا هەموو لایەك لە گوناهـ ڕزگار ببن و خوای گەورەش ڕەحمەتی خۆی برژێنێ بە سەرماندا.

براکانم! ئێمە هەموومان تاوانبارین، بەڵام حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: نەدانی زەکات و سەرفیترە و غەشوغەل کردن لە کێشانەو پێوانەداو ستەمکردنی کاربەدەستان لە خەڵکی ژێر دەست دەبنە هۆی نەبارینی باران، واتە: هەر کاتێ دەوڵەمەندەکان زەکاتیان نەداو، ئەوانە کە زیاد لە مەسرەفی شەو و ڕۆژی جەژنیان هەیە سەرفیترەیان نەدا و، ئەو

کەسانە کە خەریکی کڕین و فرۆشتنن بۆ خۆیان کێشانە و پێوانەی تەواویان کردو، بۆ خەڵك کەموکورتییان کرد، هەروەها کاتێ خاوەن دەستەڵاتەکان ستەمیان لە خەڵك کرد، ئەو کاتە ئاسمان مەنع دەکرێ لە باران، ئاو کەم دەبێ لە کارێز و ڕووباران، گیا ناڕوێ لە دەشت و کۆساران، کشتوکاڵ بێ بارەو بەرەکەت دەبێ، گرانی پەیدا دەبێ لە لادێ و شاران، ڕەحم و میهرەبانی و بەزەیی نامێنێ لە دڵی خانەدانەکان و دەسەڵاتداراندا. بێگومان چاری ئەمانە هەموو تەوبەو پەشیمان بوونەوەی تاوانبارەکانە، هەرکەس لەو گوناهەی کە کردوویەتی. خوای گەورە بە زمانی حەزرەتی نووحەوە (د.خ) دەفەرمووێ "فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً[١٠] يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَاراً[١١] وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَاراً" چونکە کەم بوونەوەی خێراتی ئاسمان و ڕزق و ڕۆزیی گیانلەبەران و، ئاسایشی جیهان هەموو ئەنجامی تاوانباری و بێ شەرمییە لەگەڵ خوای گەورەدا، بە تایبەتی بەخیلی و ڕژدیی دەوڵەمەند لە خێر کردن، وەك حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "ما محق الاسلام محق الشح شيء" واتە: هیچ شتێ ئیسلام مەحو ناکاتەوە وەکو پەستیی ڕەوشت و بەخیلی و ڕژدی لە جێبەجێ کردنی واجیباتدا.

ئەگەر یەکێ لە زەکاتداندا پەلەی کرد، بۆ نموونە: پێش ساڵ تەواو بوون لە زەکاتی چل سەر حەیواندا سەرێ حەیوانی دا، بە فەقیرێ ئەوە دروستە بە شەرتێك ئەو فەقیرە لە کاتی تەواوبوونی ساڵەکەدا هەر بە فەقیری و موستەحەقی بمێنێتەوە، واتە: ئەگەر تا ئاخری ساڵ ئەو کەسە دەوڵەمەند بوو واجیبە لەسەری ئەو زەکاتە بداتە دواوە بۆ زەکاتدەرەکە هەتا لەو کاتەدا بیدات بە فەقیرێ. هەروەها واجیبە لەسەر ئەو کەسەی لەپێش تەواوبوونی ساڵدا زەکاتی وەرگرتووە کە لە ئاخری ساڵدا بێتەوە بۆ ئەو شوێنەی زەکاتەکەی تێدا وەرگرتووە هەتا بە فەقیری وڵاتی کابرای دەوڵەمەند حسێب بکرێ، جا ئەگەر لە ئاخری ساڵدا وەکیل بنێرێ بۆ ئەو شوێنە ئەوە بێ سوودە چونکە وەکیل فەرعی ئەسیلە کە ئەسیل لەو شوێنەدا نەبووە بە موستەحەقی ئەو وڵاتە نەناسراوەو تەوکیل بێ فائیدەیە. هەروەها ئەگەر لە پێش تەواوبوونی ساڵدا وەکیلێ بگرێ و لەو شوێنەدا دای بنێ هەر بێ سوودە، بەڵام ئەگەر کابرای دەوڵەمەند تەقلیدی ئەو زانایانەی کرد کە دەڵێن دروستە زەکات نەقل بکرێ ئەوە کابرای زەکات پێدراو بە موستەحەقی خارجی دەناسرێ و زەکاتەکە جێی خۆی دەگرێ. ئەم مەسەلە پەنهانە و پێویستە ئاگاتان لێی بێ.

نبهني الله واياكم من نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين آمين.

## نامەی بیست و دووەم

# باسی زەکاتە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله سيدنا محمد وعلى آله وصحبه المجاهدين في سبيل الله.

پاش ئەمە لە خوا دەپارێمەوە، وەکو چۆن ئارەزووی نەفس لەسەر بیستنی واتەی بێهوودەیە، خوا بە میهرەبانیی خۆی دڵی ئێوە بە بیستنی فەرموودە پیرۆزەکانی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) مویارەك و ڕووناك بكا، هەتا بە باشی گوێ ڕاگرن بۆ تەرجەمەی ئەو فەرموودە موبارەکانە کە پێشکەشتانی دەکەم، جا لەم ڕووەوە پێویستە بزانن بێ مویالاتی و نەبیستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر نیشانەی ناتەواوی و نارەسایی ئیمانە، چونکە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر گەورەترین خورەوشتی ئینسانی موسڵمان ئەوەیە کە هەرگیز لە بیستنی ئاین تێر نەبێ، بێگومان ئەگەر ئینسانی موسڵمان بە پێچەوانەی ئەمە بوو ئەوە واتە: ئیمان و باوەڕی لاوازە. لەبەرئەمە، ئەی براینە! پێویستە لەبەر ناتەواوی و ناپاکیی ئەحواڵی خۆتان بگرین و، پەنا بەخوا، لە ئەنجامی خۆتان بترسن، مادام خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەری خۆتان ئەوەندە نەبێ زیاد بێ بەسەر عەلاقەو پێوەندیی خۆتاندا، حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: "لا يؤمن احدكم حتى يكون الله ورسوله أحب اليه مما سواهما" واتە: ئیمان و باوەڕی هیچ کەس لە ئێوە تەواو نابێ، هەتا حاڵی وەها نەبێ کە خوا و پێغەمبەری خوا لە لای ئەو خۆشەویستتر بن لە هەموو شتێکی تر لە ئەولاد، لە سامان، لە پایە، لە نەفس .. تاد. بێگومان لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ کە خۆشویستنی خوا و پێغەمبەر نیشانەی ئیمانە و، یەکێ لە نیشانەکانی ئەم خۆشویستنە ئەوەیە ماڵ و دارایی دنیا کە خۆشەویستی ئینسانە لە ڕێگەی مەحەبەتی خواو پێغەمبەری خوادا بە دڵ سەرفی بکا، ئیتر ئەو سەرفکردنە چ بۆ جێبەجێ کردنی واجباتی ئیسلام بێ وەکو زەکاتی ماڵ و کەفارەتی سوێندی درۆو نەزر،

یاخو بۆ جێ بەجێکردنی سوننەت بێ وەك نان بە هەژاران دان و سەدەقە و بەخشش بە موسڵمانانی موحتاج.

براکانم! من لەبەر ئاگادارکردنەوەی ئێوە چەند ئایەت و چەند حەدیسێ کە لە بابەتی زەکاتەوە وارد بوون بۆتان بەیان دەکەم و بۆتان ڕوون دەکەمەوە هەتا بەباشی لەم واجیبە حاڵی ببن، ئەگەرچی هەندێ خەڵك لەم عەرز و بەیاناتەی من مەلوول و دڵگران ببن، چونکە حەزرەت (د.خ) دەفەرموێ "علموا الناس سنتي وان كرهوا" واتە سوننەت و کردەوەو وتاری من بە خەڵك نیشان بدەن با حەزیشی پێ نەکەن و بەلایانەوە ناخۆش بێ.

ڕیوایەت کراوە: هەر کەسێ نەسیحەت و ئامۆژگارییەکی لە لایەنی خواوە بۆ هات ئەگەر بە دڵ وەری بگرێ و سوپاسی خوای لەسەر بکا، ئەوا خوا نیعمەتی بۆ زیاد دەکا، ئەگەرنا ئەوە دەبێ بە شاهید لە سەری لە ڕۆژی قیامەتدا و، دەبێتە هۆی نارەزاییی خودا لەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەم فەرموودە پیرۆزە بەشێکی موژدەی خۆشەو بەشێکی هەڕەشەیە و ناخۆشە، بۆیە دوعام کرد بۆتان کە خوا دڵتان باش بکا بۆ ئەوەی گوێ ڕابگرن لە تەرجەمەی ئەو ئایەت و حەدیثانە کە دەیخەمە پێش چاوتان هەتا لە نەگبەتی نارەزاییی خوا پارێزراو بن.

یەکێ لەو ئایەتانە دەفەرموێ "وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْراً لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ" واتە: هەرگیز گومان مەبە ئەو کەسانەی کە ڕژدی دەکەن لە دانی زەکاتدا ئەو ڕژدییەیان چاك بێ بۆیان بەڵکو ئەوە شەڕو شووم و نەگبەتییە لەسەریان لە ڕۆژی قیامەتداو، بەهۆی ئەو ڕژدییەوە دەکەونە سزا، جاربەجار ئەو ماڵە دەبێتە مارو دەئاڵێتە گەردنیان و، بەدرێژاییی کات پێیانەوە دەدا و دەبێتە هۆی سزاو ئازاریان، جارجاریش ئەو ماڵی زەکاتە دەبێتە پشکۆی زۆر بەتین و ناوچاوان و تەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەکرێ، مەلائیکەکان لە کاتی ئازاردانیاندا پێیان دەڵێن ئەمە ئەو ماڵەیە کە کۆتان کردبووەوەو هەڵتان گرتبوو بۆ خۆتان، واجیب بوو بۆ هەژاران و داماوانی سەرف بکەن، کەچی سەرفتان نەکرد، دەی تاڵاو و ئازاری ئەوە بچێژن کە ڕاتان گرتبوو.

جا ئەم ئایەتە گەورە هەرچەند دەربارەی زەکات هاتبێ، بەڵام هەموو مەسرەفێکی واجیبی سەرشانی ئادەمیزاد دەگرێتەوە، کەوابێ ئەگەر کەسێ بە قەدەر حاڵ مەصرەف بۆ خۆی و ژن و منداڵی نەکا، چ لە خواردەمەنی و چ لە بەرگ و پۆشاك و ڕایەخ و نوێندا،

یاخود سەرفی نەکا لە حەجی ماڵی خودادا یا لە غەزایەکدا ڕووی کردبێتە موسوڵمانان و پێویستی بە ماڵ ببێ، یا سەرفی نەکا لە خواردەمەنی و پۆشاکی گەدا و داماواندا لە ساڵە گرانیدا، یاخۆ سەرفی نەکا بۆ میوانی ڕێبواری بێ خەرجی کە سەفەرەکەی حەلاڵ بێ، یا سەرفی نەکا بۆ هەتیوان و لێقەوماوان لە گەڕەك یا لە لادێدا، یا سەرفی نەکا لە ڕێگای فێربوونی ئەحکام و ئادابی دینا لە واجباتەکەیدا وەك فێربوونی بیرو باوەڕی ئیسلامی و فێربوونی نوێژ و دەسنوێژ و ڕوکنەکانی نوێژ و ئەوانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوەو سوننەتەکانی نوێژو واجیبەکانی تر لای زاناکان، یا سەرفی نەکا لە خزمەتی ئەو قوتابییانەی کە دەرزی دین دەخوێنن یا سەرفی نەکا بۆ مامۆستاکانیان، یا سەرفی نەکا لە دەرمانکردنی نەخۆشی داماودا، یا سەرفی نەکا لە شۆردن و کفن و دفنی مردووی فەقیری بێ ماڵدا، تاوانبارە. هەرکەس خاوەن دەسەلات بێ و سامان و دارایی هەبێ و بەقەدەر حاڵ لە کاتی پێویستدا شانبەشانی موسڵمانەکان نەڕوا بەرێداو لەم مەسرەفە واجیبانە خۆی بخاتە دواوە ئەوە بەپێی ی زاهیری ئەم ئایەتە گەورەیە سزا دەدرێ، پەنا بە خوا. جا ئەو سزا ناباره، ئەو ئازاری ئاگر و مارە بۆ ئەو زەکات نەدەرە پایەدارە، هەتا حوکم دەدرێ بە سەر عیبادا جا یا عەفوو دەکرێ و ڕەوانەی بەهەشت دەکرێ، یا عەفوو ناکرێ و ڕەوانەی دۆزەخ دەکرێ.

هۆی داغکردنی ناوچاو و تەنیشت و پشتی زەکات نەدەر ئەوەیە کە ئینسانی داماو و هەژار لە وەختی خۆیدا کە داوای زەکاتی لێ کردووە ڕووی لێ گرژ کردووە، یا پشتی لێ کردووە، یاخۆ تەنیشتی تێ کردووە.

بەهێزترین ئایەتی هەڕەشە لە زەکات نەدەر ئایەتی "وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ[٦] الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ"ە واتە: وەیل و سزای سەخت بۆ ئەو کافرانەیە کە شەریك و هاویەش بۆ خوا دادەنێن و زەکاتی ماڵ نادەن بە موستەحەقەکان، تەماشا بکەن خوای گەورە لەم ئایەتەدا زەکات نەدەری بە موشریك ناوبردووە، ئەڵبەت لەبەر ئەوەیە کابرا ئەوەندە بە ماڵەکەی پشت ئەستوورە کە بە ڕازقی خۆی داناوەو بە شەریکی خوای داناوە، پەنا بە خوا.

ئیمام ئەبوبەکری سیدیق خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەر (د.خ) بە دەلیلی ئەم ئایەتە شەڕی کردووە لەگەڵ زەکاتنەدەراندا، هەندێ لە زانایان فەرموویانە عورف لەسەر ئەوەیە کەسێ کە گوناهێکی گەورەی ببێ و گوناهی بچووکیشی ببێ ئەوە بە گوناهە گەورەکە زەمی دەکرێ و باسی گوناهە بچووکەکانی ناکرێ، جا لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا ئەگەر

مەبەستی خوای گەورە لەم ئایەتەدا کافری موشریك بوایە باسی سیفەتی (لا یؤتون الزکاة)ی نەدەکرد کەوابێ دەبێ هەر مەبەستی زەکات نەدەرێ بێ کە بە هۆی زەکات نەدانەکەیەوە بە عینوانی موشریك ناوبراوە.

پوختەی قسە: زەکات ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام، دیارە زەکات نەدان هۆی رووخاندنی ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام، هەروەك زەکاتدان دەبێتە هۆی هێزدان بە ئیسلام، جا ئیتر ئەم ئەندازە بەسە بۆ کەسێ هۆشیار بێ و ئاگای لە ڕۆژی قیامەتی خۆی بێ. ریوایەت کراوە: کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی زەکات بکەن بە شوورای ماڵی خۆتان و، بە سەدەقە دەرمانی نەخۆشتان بکەن.

دەگێڕنەوە کاتێ کە حەزرەت (د.خ) ئەم فەرموودەی فەرموو گاورێك بیستی و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆی و وتی بە خێزانەکەی من قسەیەکی وەهام بیستووە، وا من ئەو ماڵەم کە شەراکەتەو، شەریکەکەم بردوویە بۆ میسر بۆ بازرگانی زەکاتەکەی دەدەم، جا ئەگەر (محەمەد) قسەکەی ڕاست دەرچوو ماڵەکەم بە سەلامەتی هاتەوە ئەوا دەڕۆم ئیمان بە (محەمەد) دێنم و ئاینی ئیسلام قبووڵ دەکەم، خۆ ئەگەر ماڵەکەم فەوتا ئەوە هەر کاتێ بۆم هەڵکەوت (محەمەد) دەکوژم. چەند ڕۆژێ لەم وادە ڕابوورد ئەهلی قافڵەکە نامەیان هات کە لە ڕێگەدا تالان کراون و هیچیان بۆ نەماوەتەوە، کابرای گاور شیری هەڵگرت و ڕۆیشت بۆ نزیکی حوجرەی حەزرەت (د.خ) بەڵکو فرسەتی لێ بێنێ و بیکوژێ. هێشتا لە ڕێگەدا بوو نامەی شەریکەکەی پێ گەیشت نووسیبووی: دڵگران مەبە لە ڕۆژی ئەو تالانەدا لەبەرئەوەی کە وشترەکەم لاواز بوو من کەوتبوومە دواوەو لە کاروانەکەدا نەبووم و لەو تالانە ڕزگار بووم و هەموو ماڵەکەمان بە سەلامەتی دەرچوو، جا گاورەکە دڵی شاد بوو، وتی دیارە ئەو زاتە ڕاستی فەرمووە و ڕاستە، زوو ڕۆیشتە خزمەتی و موسڵمان بوو.

ساڵی هەزار و دووسەدو هەشتاو شەشی هیجری بیستم قافڵەیەکی گەورە لە شاری مووسڵەوە ڕوو بە شاری حەڵەب ڕۆیشت بۆ بازرگانی، یەکێ لە بازرگانەکانی مووسڵ بارێ لیرەی لەو قافڵەدا ناردبوو بۆ تیجارەت لە ڕێگەدا جەردە دایان لەو قافڵە گەورەیە و هەموویان بە تالان برد، کە ئەم هەواڵە گەیشتە شاری مووسڵ هەموو بازرگانەکان عاجز و خەمبار بوون، بەڵام بازرگانی خاوەن بارە لیرە، هیچ عاجز نەبوو، هاوکارەکانی لێیان پرسی تۆ چۆن هیچ عاجز نی و خەم ناخۆی؟ وتی ماڵی من نافەوتێ، چونکە

زەکاتم بە تەواوی داوە. پاش چەند ڕۆژێ ئەهلی قافڵەکە هاتنەوەو دەرکەوت کە ماڵی خاوەن لیرەکە خوا پاراستوویەتی و، لە کاتی تالانەکەدا کەس دەستی بۆ نەبردووە.

ریوایەت کراوە: هەرکەس زەکات نەدا، نوێژەکانیشی وەك نەبوو وایە، چونکە خوای گەورە لە گەلێ ئایەتی قورئاندا زەکات و نوێژی بە یەکەوە باس کردووەو ئەو دوو ڕوکنە وەك یەك ڕوکنیان لێ هاتووە جا ئەگەر کەسێ یەکێکیان نەکا، ئەوە وەکو ئەوەیە کە هیچیانی نەکردبێ. ئەمەش دەردێکی ترە لەسەر ئینسانی زەکات نەدەر، وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی "ما محق الاسلام شئ محق الشح" واتە هیچ شتێ ئیسلام مەحو ناکاتەوە بە قەد بەخیلی و پیسکەیی.

هەندێ لە زاناکان فەرموویانە کەلیمەی (شح) بریتییە لە بەخیلی کردن و سستی لە جێبەجێ کردنی واجیبە مالییەکاندا، گەورەترین واجیبی ماڵییش زەکات و سەرفیترەیە، هەروەها بە گوێرەی زاهیری فەرمودەی پێشوو ئەو کەسە کە زەکات نەدا، نوێژەکەشی قبووڵ ناکرێ، جا ئەگبەتی لەمە گەورەتر چییە بۆ سەر شانی موسڵمان کە بە جارێ دوو ڕوکن لە ئەرکانی ئیسلامی لە کیس بچێ، یەکەم زەکات و دووەم نوێژ، کە لەسەر فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) کە دەفەرمووێ "الصلاة خير موضوع" نوێژ چاکترین عیبادەتێکە کە بۆ ئینسانی موسڵمان دانراوە. تەماشا بکەن هەرکەس لە ئێوە ئەگەر خانوویەکی ببێ و دوو دیواری بڕووخێ چۆن لەو خانووەدا دادەنیشێ و چۆن دەژی؟

دەگێڕنەوە کە حەسەنی بەسری فەرموویەتی ئەو کەسەی کە زەکاتی ماڵی خۆی بدا لە ئاسمانی یەکەمدا ناوی (سەخی)یەو، لە دووەمدا ناوی (جواد)ەو، لە سێیەم و چوارەمدا ناوی (کریم)ە و، لە پێنجەمدا ناوی (مبارك)ە و، لە ئاسمانی شەشەم و حەوتەمدا ناوی (مغفور)ە، واتە خوالێخۆشبوو عەفوکراو.

یەکێ لە تابیعییەکان فەرموویەتی لە کاتی سەرەمەرگدا بۆ ئینسان دوو موسیبەت ڕوو دەدەن، یەکەم، ئەو ماڵەی کە بە خوێنی جگەری خۆی پەیدای کردووە دەکەوێتە دەس میراتبەر و ئەو لەو ماڵە بێ بەش دەبێ. دووەم ئەوەیە کە پرسیاری ئەو ماڵەش لەو دەکرێ، لێی دەپرسن ئەو ماڵەی چۆن پەیدا کردووە لە حەرام یا لە حەڵاڵ؟، هەروەها لەوەیشی کە سەرفی کردووە لە چیدا صەرفی کردووە، لە مەسرەفی حەڵاڵ و بێ عەیبدا سەرفی کردووە، بۆ نموونە وەکو بەرگ و پۆشاکی خۆی و خێزانی، یاخۆ لە حەرامدا خەرجی کردووە، وەکو عارەق خواردنەوەو کردەوەی ناشیرین و ناڕەوا و ناشەرعی؟

له فەرموودەی حەزرەته (د.خ) "الويل لمن ترك عياله بخير وقدم على ربه بشر" واته: نەگبەتی بۆ ئەو کەسە کە کاتێ مرد خێزانەکەی بە گوزەرانی باشەوە، بەجێ دێڵێ و، بە کردەوەی خراپەوە دەگاتە خوای خۆی، واتە: زەکاتی ماڵی دەرنەکردووە، سەرفیترەی نەداوە، ماڵی خەڵکی بە ناحەق خواردووە، غەش و خیانەتی لەگەڵ خەڵکدا کردووە.. تاد.

حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: ئەوانەی کە زەکاتی ماڵیان دەرناکەن لە کاتێکدا پێویستییان بە باران بێ خوای گەورە مەنعی بارانیان لێ دەکات و، ئەگەر حەیوانی بێ زوبان نەبووایە هەرگیز بارانیان لێ نەدەباری. هەروەها ڕیوایەت کراوە: ئەو کەسانەی کە ماڵیان حەڵاڵەو زەکاتی لێ دەردەکەن ئەوە لە پاش مردنیان کە میراتبەرەکانیان لەو ماڵە خەرج بکەن بۆ خۆیان، خوای گەورە پاداش بۆ ئەوانیش، واتە بۆ مردووەکانیش دەنووسی، بەخ بەخ لەم میهرەبانییەی خوا کە تەنانەت پاش مردنی زەکاتدەریش هەر خێری بۆ دەنووسێ.

ڕیوایەت کراوە: لە حەزرەت (د.خ) چوار کەس هەن کە لە ڕۆژی حەشردا لە قەبر دەرچوون حیسابیان لەگەڵ ناکرێ و بە بێ پرسیار ڕەوانەی دۆزەخ دەکرێن، یەکەم کەسێکە لە سبەینێدا دەنوێ و بەتایبەتی نوێژەکەی دەفەوتێنێ، دووەم کەسێکە زەکاتی ماڵی خۆی نادا، سێیەم کەسێکە هەمیشە وا بە دوای فیسق و فجوور و ئارەزوو پەرستییەوە، چوارەم کەسێکە گوێ ناداتە نوێژی عیشا و تەرکی دەکا.

ڕیوایەت کراوە: کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتی هەیبەتی خواو ڕاکێشانی خەڵکدا بۆ مەیدانی لێپرسینەوە حەزرەت (د.خ) نەفرین و بێزاری دەردەبڕێ لەو کەسانەی کە زەکاتیان نەداوەو لەو ڕۆژەدا گیرۆدە دەبن. هەروەها ڕیوایەت کراوە: لە حەزرەت کە فەرموویەتی لە شەوی میعراجدا چاوم کەوت بە کۆمەڵێ کە مەلائیکە سزایان دەدان، ئەو کۆمەڵە لە دەشتێکدا بوون پڕبوو لە بەردی گەرمی بە ئاگر سوورکراوەو، بەو بەردانە داخ دەکران و، ناوبەناو زەقوومیان دەکرد بە قورگیانداو، بێجگە پێش و پاشیان کە بە پارچە بەردێك داپۆشرابوون، هەموو لەشیان ڕووت بوو، حەزرەت دەفەرمووێ لە جوبرەئیلم پرسی ئەمانە کێن؟ فەرمووی ئەوانەن کە زەکات نادەن. براینە! خوای گەورە ئاگادارەو زانایە بە حاڵی هەموو کەس لە دنیاو لە قیامەتدا، جا خوای گەورە وێنەی پاشە ڕۆژ (قیامەت) بە پێغەمبەری خۆی نیشان دەدا لە دنیادا، واتە: ئەم سوورەتانە کە حەزرەت (د.خ) چاوی پێ کەوتوون صوورەتی ڕۆژی قیامەتیانەو، هەر لە ئیستەوە خوای گەورە

بە پێغەمبەری نیشان داوە، هەتا بیگێڕێتەوە بۆ ئوممەتەکەی و، ئەوانیش پەندی لێ وەربگرن و خۆیان لە گوناح بپارێزن.

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا زەکات بریتییە لە دەیەك یا بیست یەك یا چل یەك، وەکو لە کتێبی شەرعدا بەیان کراوە، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئەم ئوممەتە ئیشیان ئاسان بێ، وەکو حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی "بعثت بدين سهل" واتە لەلای خواوە بە دین و ئاینێکی ئاسانەوە ڕەوانە کراوم بۆ سەر خەڵق.

براکانم! ئەم ماڵی دنیایە کە ئێوە هەتانە ڕاستە بە ڕەنج و مەینەت پەیداتان کردووە، بەڵام ئەگەر باش لێی ورد ببنەوە ماڵی هەموومان ماڵی خوایە و، هەر خوا بە خواستی خۆی و لەسەر حیکمەتی خۆی بەشی دەکاتەوە بەسەرماندا، ئەگەرنا دەوڵەمەندی بە عەقڵ نییە، گەلێ عاقڵ بێ ماڵەو، گەلێ ئینسانی بێ عەقڵ دەوڵەمەندە، دەوڵەمەندی بە ڕەنج و تێکۆشانی زۆریش نییە، گەلێ کەسی ڕەنجکێش بێ مایەیە، گەلێکیش لە لایەکەوە ماڵێ پەیدا دەکات کەچی لە چەند لاوە تووشی زیان دەبێ، کەوابێ لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوڵەمەندی عەقڵ و تێکۆشان و هەوڵی دەوێ، ڕاستەکەی ئەوەیە کە لەسەر تەوفیق و یارمەتیی خودا ڕاوەستاوە، بۆیە پێویستە ئینسان ماڵەکەی خۆی بە ماڵی خۆی نەزانێ و، ئەوەی خودا لەسەری واجیب کردووە بیدا بە موستەحەقەکان، هەروەها پێویستە لە تەماشاکردنی فەقیراندا تەماشای قازانجی دنیایی خۆتان نەکەن و تەماشای شۆرەت و ناوبانگ نەکەن نە بۆ خۆتان، نە بۆ ئەو کەسانە کە پێیان دەدەن.

ئەگەر خزم و خوێشی خۆتان وەکو برا و برازا و خوشك و خوشکەزا و خزمانی تر، یا لە دراوسێکانتان، یا خەڵکی گەڕەك فەقیریان تیابوو زەکاتیان پێ بدەن.

ئەگەر کەسێ بە شەرعی حەقی زەکات وەرگرتنی نەبێ و بێ بە زۆر ماڵتان لێ بسێنێ ئەوە ئەگەرچی نییەتی زەکاتیشی لێ بێنن بە شەرع بە زەکات حسێب ناکرێ و، زەکاتەکەتان لەسەر دەمێنێ، بەڵام ئەگەر زەکاتیان پێ دەشیا ئەوە مادام بە ناوی زەکاتەوە داوای بکا و، خاوەن ماڵیش نییەتی زەکاتی لێ بهێنێ، ئەوە بە زەکات حسێب دەکرێ.

چۆنییەتی دەرکردنی زەکات لە باغی ڕەز ئەوەیە هەر لە سەرەتای پێ گەیشتنیەوە بە هۆی ئینسانی عادڵی ژیری زانا بە چەن و چۆنییەتیی میوەی باغات ئەو باغە تەخمین

بکرێ بە ئەندازەیەك و بخرێتە ئەستۆی خاوەن باغەکە لەگەڵ ئەندازەی زەکاتی پێویست و خاوەن باغەکەش ئەم خستنە ئەستۆیە قبووڵ بکات، ئەوسا بۆ خاوەن باغ دروستە بە ئارەزووی خۆی دەست بخاتە بەرهەمی ئەو باغە بە فرۆشتن و بەخشین و خواردن... تاد. چونکە میقداری زەکاتەکە دیارییەو، لە ئەستۆی خاوەن باغدا کراوە بە ماڵ.

پێویستە ئەو کەسە تەخمینەکە دەکا بزانێ تەخمین بکا و، تەماشای هەموو بنە مێوەکان یا دار خورماکان بکا. دیارە ئەم تەخمین کردنە سوننەتەو واجیب نییە؛ خاوەن ماڵ ئارەزووی خۆیەتی یا تەخمینی میوەکەی بکات و یا خۆ سەبر بکات و تەسەڕوفی تیا نەکا تا بە تەواوی میوەکەی پێ دەگا و، بە ڕاستی حەقی خوای لێ دەربکا.

شایانی باسە ئەم کاروباری تەخمینە، واتە تەخمین کردن و قبووڵی تەخمین دەبێ لای زانایەکی ئاینی فێریان ببن. جا لەبەرئەوەی ئەمانە بەپێی شەرع نایەنە جێ کابرای خاوەن ماڵ مادام لەو باغە دەخوات دەبێتە حەرام خۆر، هەروەها کڕین و فرۆشتنی ئەو میوەش حەرامە، چونکە بەشی موستەحەقی تێدایە، مەگەر تەقلیدی فەرموودەی ئەو ئیمامانە بکا کە فەرموویانە حەقی زەکات لە گەردنی خاوەن ماڵدایە و لە عەینی ماڵەکەدا نییە، لە پاش ئەو تەقلیدە تەسەڕوف دروستە، بەڵام پێویستە ئاگای لە دانی حەقی زەکات بێ هەتا قەرزار نەبێ، یا تەقلیدی فەرموودەی ئەبوو حەنیفە (ئیمامی ئەعزەم) بکا کە فەرموویەتی دروستە لە باتی زەکات قیمەتەکەی بدرێ و، هەر میقدارێ دەیەوێ تەسەڕڕوفی تیا بکات قیمەتی میقداری زەکاتەکەی بدا بە موستەحەقەکان. لە حەدیسی شەریفدا هەیە هیچ ماڵێ لە کیس ناچێ لەسەر وشکانی یا لە دەریا مەگەر بە هۆی نەدانی زەکاتەوەو، زەکات نەدەر لە قیامەتدا وا لە ناو ئاگری دۆزەخدا. هەروەها لە حەدیسێکی تردا فەرموویەتی: گەلێ کەس کەسابەتێکی پاك و خاوێن دەکەن، بەڵام لە دواییدا لەبەر نەدانی زەکات ماڵەکەیان پیس دەکەن.

براکانم! هەموو ماڵی من بە قوربانی ئێوە بێ، تەماشای میهرەبانیی خوا بکەن کە فەرموویەتی: ئەی عەبدەکانی من لەو ماڵی خۆمە کە لای ئێوەیە میقدارێکی بدەن بە من بەقەرز، بە مەرجێ بیدەن بە من کە سبەینێ لە قیامەتدا من یەك بە دە، تا یەك بە حەفتا، تا یەك بە حەوسەدو زیاتریش بیدەمەوە بە ئێوە. ئەوەش بزانن کە خوای گەورە داوای ماڵ بۆ خۆی ناکا، خوا بێ نیازە لە ئێوەو لە ماڵی ئێوە، بەڵکو داوای ئەوە دەکات ئەو ماڵە بدەن بە برا داماوەکانی خۆتان لە موسڵمانان (انما المؤمنون اخوة) بە ڕاستی

موسڵمانان برای یەکترن؛ حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی "الدنیا جیفة وطلابها کلاب" واتە: دنیا وەك لاشەی مردارەو ئەوانەش دەکەونە شوێنی و لێی کۆدەبنەوە وەك سەگ وەهان، کەوابێ هەرکەس دنیای خۆش بوێ و کۆی بکاتەوەو حەقی خودای لێ دەرنەکاو نەیدا بە داماوان ئەوە لە چینی سەگان حسێب دەکرێ. بەڵام ئەگەر نەکەونە دوای ئارەزووی نەفس و حەقی خوای لێ دەربکەن ئەوە خوای گەورە لە خۆتان ڕازی دەکەن. هەر لەم بابەتەرە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی "نعمت الدار الدنیا لمن تزود منها للآخرة" واتە: چاك خانوو مەنزڵێکە ئەم مەنزڵی دنیایە بەو مەرجەی ئینسان تۆشەی قیامەتی تیا هەڵبگرێ "وبئست الدار الدنیا لمن صدته عن آخرته وقصرت به عن رضا ربه" واتە خراپ خانوو مەنزڵێکە دنیا بۆ کەسێ کە مەنعی بکا لە تەماشاکردنی قیامەتی خۆی و دەستی کۆتا بکا لە ڕەزامەندیی خوای خۆی.

ژیرەکانی ئاین فەرموویانە، هەموو شتێ زەکاتێکی لەسەرەو زەکاتی خانوو ئەوەیە کە هۆدەیەکی وەهای تیابێ میوان بتوانێ تێدا بحەسێتەوە، زەکاتی پایەو شان ئەوەیە کە ئینسان بگاتە فریای ئەو کەسانە کە پەنایان پێ هێناوە، زەکاتی زانست ئەوەیە کە خاوەنەکەی ئامۆژگاری نەزانان بکا، زەکاتی ماڵ و دەغڵ و دان و میوەو حەیوانات دیارە.

دەگێڕنەوە کە ڕۆژێ شەیتانی لەعین گەیشت بە حەزرەتی خزر (د.خ) و یەکێ لە قسەکانی لەگەڵیدا ئەمە بوو کە پێی وت ئەی خزر من دەڕۆم چوار گۆشەی دڵی دەوڵەمەند دەگرم و تێدا دادەنیشم و هەوڵ دەدەم ترسی هەژاری دەخەمە دڵیەوە، لەگەڵ مەحەببەتی دەوڵەمەندی هەتا زەکاتی ماڵی خۆی نەداو ئەو مافی خوایە بەسەرەوە بمێنێ هەتا بەیەکەوە لەگەڵ مندا بمانخەنە دۆزەخەوە و بەیەکەوە بسووتێین.

براکانم! شەیتان زۆر زانا بوو، پێش ئەوەی بەر نەفرینی خوا بکەوێ دەرزی بە فریشتەکان دەوت، بەڵام لەبەر خۆ بەزلزانین بێ گوێیی خوای گەورەی کردو، خوای گەورەش لەعنەتی لێ کردو لە قاپی ڕەحمەتی خۆی دەری کرد، ئیتر بوو بە دوژمنی نەتەوەی حەزرەتی ئادەم (د.خ)و، لەبەرئەوەی شارەزای هەموو گوناهەکانە دەزانێ بەکام گوناه بیانفەوتێنێ و، دەزانێ کە زەکات نەدان گوناهێکی زۆر گەورەیەو، دەبێتە هۆی ماڵوێرانیی دەوڵەمەندان! بۆیە دەڕواتە ناو دڵیانەوەو ئەو گوناحەیان پێ دەکا، جا ئاگاتان لە خۆتان بێ نەوەك بتانخەڵەتێنێ.

حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: کە لە وەختی پێویستدا باران نەباری ئەوە

نیشانەی ئەوەیە کە ئەهلی ئەو ولاتە زەکاتیان نەداوە، هەروەها کە تاعوون و ناساغیی خراپ کەوتە ناو ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە زینا زۆر دەکرێ.

ڕیوایەت کراوە: جارێ حەزرەتی مووسا (د.خ) بە لای جوانێکدا ڕابوورد کە نوێژێکی زۆر باشی دەکرد، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو (ماشاء الله)ی لێ کرد، خوای گەورە فەرمووی یا مووسا! زەکات و نوێژ وەکو منداڵی دوانە وان، هەر کامیان لەویان جیابووەوە من قبووڵی ناکەم و، ئەم جوانە زەکات نادا کەوابێ نوێژەکەیشی لێ قبووڵ ناکەم.

ڕیوایەت کراوە: کە ئیبنو عەباس (د.خ) فەرمووی هەر کەسێ ماڵی هەبوو حەجی پێ کرد، بەڵام زەکاتی ماڵی خۆی نەدا، ئەوە لە پاش مردن کە ئاگادار دەبێ بە سەر سزای خۆیدا لەسەر تەرکی زەکات لە خوا دەپاڕێتەوە کە زیندووی بکاتەوەو بڕواتەوە دنیا بۆ ئەوەی کە زەکاتی ماڵەکەی بدا، لەوێدا چەند کەس حازر بوون ئینکاری قسەکەیان کرد و وتیان بێجگە کافرەکان کەس داوای گەڕانەوە بۆ دنیا ناکات، ئەنجا ئیبنو عەبباس فەرمووی مادام ئێوە وا دەڵێن با من ئایەتی خواتان بەسەردا بخوێنمەوە کە زەکات نەدریش لە ترسی سزای خۆی داوای گەڕانەوە بۆ دنیا دەکا، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرمووێ. "وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ" واتە: لە ڕێگەی خوادا حەقی موستەحەقەکان بدەن و زەکاتی ماڵتان دەربکەن لە پێش ئەوەدا کە مردن یەخەی هەر یەکێ لە ئێوە بگرێ و بیکوژێ و ئەویش هاوار لە خوا بکا و بڵێ خوایا بۆچی بۆ ماوەیەکی کەم مردنمت دوانەخست هەتا زەکاتی ماڵەکەم دەربکردایە و لە جوملەی بەندەکاندا داخڵ بکرایام و، بە سالح ناوم بنووسرایە؟.

ڕیوایەت کراوە: کاتێ ئینسان لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر سیراتدا ڕادەبوورێ ئەگەر لە دنیادا زەکاتی نەدابێ پردەکە لار دەبێتەوە هەتا کابرا بکەوێتە خوارەوە بۆ دۆزەخ، ئەنجا زەکاتەکەی لە شێوەی ئینسانێکدا بانگی دەکات: خوا بتکوژێ، دەربارەی من قسوورت نەکردایە هەتا ئێستە ڕزگار ببوویتایە.

براکانم! لەم بابەتەدا حەدیس زۆرە، بەڵام ئەم میقدارە بەسە بۆ کەسێ کە بە دڵ ئاگادار بێ. والسلام.

## نامەی بیست و سێیەم

# باسی واجباتە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله سيدنا محمد وعلى آله وصحبه المجاهدين لاعلاء كلمة الله.

پاش ئەمە بزانن هەر شتێ کە خوا واجیبی کردبێ لەسەر هەر موسڵمانێ واجیبە لەسەر ئەو موسڵمانە ئەو شتە فێر ببێ و ئاداب و ئەرکانی حاڵی ببێ ئەمجا باوەڕیشی ببێ کە ئەو شتە واجبە لەسەری پاش ئەوە عەمەلی پێ بکاو بە موافیقی شەرع جێبەجێی بکا، ئەمە سێ واجیب بوو لەسەر موسڵمانان بەرامبەر بە هەموو واجیبێ. ئیتر هەرکەس بەمانە نەزانێ ئەوە عوزری نییە لە قیامەتداو تاوانبارە.

براکانم! تاقیم کردووەتەوە کە ئەهلی ئەم زەمانە گوێ نادەنە ئامۆژگاریی درێژ! بۆیە بە شێوەیەکی کورت واجیباتیان بۆ باس دەکەم، جا ئەگەر گوێ بەم شێوە کورتەش نەدەن ئەوە بەوە حسێب دەکرێن کە سستن لە ئایندا، ئەم حاڵەیان دەبێتە هۆی نارەزایی خودای گەورە، بەڵام ئەگەر بەدڵ گوێیان گرت و مەیلیان هاتە سەر ئیطاعەی حەق ئەوە خوا لێیان ڕازی دەبێ و نیعمەتیان زیاد دەکا بە بەڵگەی ئەم حەدیسە پیرۆزە "ايما عبد جاءته موعظة من الله في دينه فانها نعمة من الله سيقت اليه، فان قلبها بشكر زاده الله تعالى نعما اخرى، والا كانت حجة من الله عليه (الى ان قال) ويزداد عليه سخطا".

جا پێویستە بزانن یەکەم واجیبات ناسینی خوای گەورەیە بە قەدەر تاقەت و توانای ئادەمیزاد، باوەڕ بە تەنیایی خوا، باوەڕ بە صیفاتی سەلبی و سبوتی وەکو لە نامەی بیروباوەڕدا باسمان کرد؛ کە خوای گەورە (مەوجوودە) واتە: هەیە، (قەدیمە) واتە ئەووەڵی بۆ نییە، (باقییە) واتە نەبوونی بۆ نییە و دوایی نایەت، (موخالیفی حەوادیسە) واتە لە هیچ شتێ ناچێ، (قائم بيلزات)ە، واتە ئیحتیاج و پێویستیی بە هیچ شتێ نییە. صیفەتی (وجود) پێی دەڵێن سیفەتی نەفسیەو، ئەم پێنج سیفەتە پێیان دەڵێن سفاتی سەلبیە.

هەروەها خوای گەورە خاوەن حەیاتە یانی زیندووە، خاوەن عیلمە یانی زانایە بە هەموو شتێ، خاوەن ئیرادەیە یانی خواستی هەیە و، خواستی لەسەر هەر شتێ ببێ دەبێ و خواستی لەسەر هەر شتێ نەبێ نابێ، خاوەن قودرەتە، واتە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە کە مومکین بێ، خاوەن کەلامە واتە گفتوگۆی کردووە لەگەڵ پێغەمبەرانداو بە فریشتەی گەورە (جوبرەئیل)دا دەستووری بۆ ناردوون، خاوەن سەمعە واتە هەموو شتێك و هەموو دەنگێ دەبیسێ، تەنانەت ئەگەر مێروولەیەك بە سەر عەرزا بڕوا بە ڕێگەدا خوای گەورە دەنگی ئەو مێروولەیە دەبیسێ، خاوەن بەسەرە واتە هەموو شت دەبینێ، جا ئەم صیفەتانە پێیان دەڵێن سیفاتی ثبووتیە، چونکە لە مەعناکانیاندا نەبوون نییە، هەروەها گەلێ شتی تریش لە کاروباری بیروباوەڕ بەو کتێبانەی خوا ناردوونی بۆیان و ئیمان بە ڕۆژی قیامەت و ئیمان بە قەزاو قەدەر، واتە هەرچی ڕوویدا لە جیهاندا هەمووی لەسەر زانست و خواست و توانای خودایە، جا ئەمانە هەموو کۆدەبنەوە لە ژێر ناوی ئیمان بەوەی کە حەزرەت لای خوواوە هێناویەتی کە حەقیقەتی ئیمانە، وەکو زاناکانی ئوسووڵی دین فەرموویانە: "الایمان هو التصدیق بما جاء به النبي (ص) مما علم من الدین بالضرورة اجمالا في ماعلم اجمالا وتفصیلا فیما علم تفصیلا" واتە ئیمان باوەڕکردنە بەو حوکمانە کە پێغەمبەری ڕەهبەر (د.خ) لە لای خواوە هێناونی لەوانەی کە بە ئاشکرا زانراون لە ئاین و یاسای ئاین، بە کورتی لەوانەی کە بە کورتی زانراون و، بە درێژی لەوانەی کە بە درێژی زانراون، بۆ نموونە وەکو باوەڕ بە پێغەمبەرایەتی هەموو پێغەمبەرەکان بە تایبەتی پێغەمبەری خۆمان کە حەزرەتی (محەمەد)ە (د.خ).

لە بارەی باوەڕ بە پێغەمبەری خۆمانەوە پێویستە بزانین محەمەد (د.خ) کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عبدالمطلب)ی کوڕی هاشمە، دایکی ئامینەی کچی (وەهبی کوڕی (زهرە)یە. هەروەها پێویستە ئیمانمان ببێ بەوەی هەموو پێغەمبەران مەعسووم و بێ گوناه بوون. پێویستە ئیمان بە سزا و ناخۆشی قەبر بۆ هەندێ کەس و، ئیمان بە ڕزگاری و خۆشحاڵیی هەندێ کەسی تر لە قەبردا. ئیمان بەوە کە ئەم جیهانە وێران دەبێ و هەموو گیانداریٌ هەرچی مردووە زیندوویان دەکاتەوەو، فەرمان دەدا بە فریشتەکان کە بیاندەنە بەر بۆ مەیدانی حیساب، لەوێدا بە هۆی تەرازووی کێشانەی کردارەوە خێر و شەڕی هەموو کەس دەردەکەوێ، ئەمجا بە ئەمری خوای گەورە دەبێ هەموو بڕۆن بەسەر سیراتدا، کە پردێکە لە موو باریکترە و لە ئەڵماس تیژتر، دیارە ئەوانەی کە خوا ڕەحمی پێ کردوون بە ئاسانی بە سەریدا ڕادەبوورن، بەڵام ئەوانەی شایانی سزا و ئازارن لە

پردەكەوە دادەكەون بۆ ناو دۆزەخ، جا هەركەس لەو دۆزەخییانە خاوەن ئیمان بێ، بە قەدەر تاوانەكەی سزا دەدرێ و لە پاشان دەكرێتە دەرەوە بۆ بەهەشت، ئەوانەش كە ئیمانیان نەبووە، هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێننەوە، ئەو كەسانەش كە لە دۆزەخ دەردەچن لە پێش ئەوەدا بگەنە بەهەشت لەسەر (حوض المورود) كۆدەبنەوە، ئەو حەوزە بە قەدەر مانگە رێگایەك گوشاد و گەورەیە و، ئەوەندە گۆزەڵەی بە دەورایە مەگەر خودا بزانێ، ئیتر هەركەس ناو لەو حەوزە بخواتەوە قەت تینووی نابێ و، بۆ لەزەت نەبێ، ناو ناخواتەوە، پاش ئەوە دەڕۆن بۆ بەهەشتی پایەدار و هەتا هەتایە تێدا دەمێننەوە.

هەروەها واجیبە لەسەر هەموو موسڵمانێكی باڵغی عاقڵ كە ئادابی دەسنوێژ و خۆشۆردنی لەش پیسی و تەیەموم و ئادابی ڕۆژوو زەكات و سەرفیترە و حەج و بەجێهێنانی، ئەگەر دەستی ڕۆیشت و، غەزاكردن لە رێگای خزمەتی ئاینی ئیسلامدا بزانێ. دیارە فێربوونی ئەمانە یا بە دەرزخوێندنە بە منداڵی یا گەورەیی لە لای زاناكان، یا بە دانیشتنە لە مەجلیسی زاناكان و پرسیار لێ كردنیان هەتا باش حاڵی ببێ. هەروەها دەبێ ئەسبابی دۆزینەوەی قیبلە بزانێ و بۆ نموونە: لە وڵاتی شارەزووردا ئینسان كاتێ ڕاوەستا بە جۆرێ كە لە كاتی لاكردنەوە بەلای ڕاستدا ئەستێرەی قوتب ببینێ ئەوە ڕووی لە قیبلەیە. شایانی باسە ئەستێرەی قوتب ناوی (جەدییە)یەو یەكێكە لەو حەوتە كە پێیان دەڵێن حەوتەوانان، ئەم جەدییە بچووكەكەیانەو كەوتووەتە لای (شمال) باكوورەوە، لە وڵاتی ئێمەدا بە ئەندازەی بیست و چوار دەرەجە بەرزی هەیە لە ئوفوق لە لای باكورەوە.

واجیبە لەسەر ئینسان هەر وەعدەیەكی دا بە یەكێ، مادام وەعدەكەی خێر بێ بەجێی بهێنێ و بە بێ عوزری شەرعی هەرگیز خیلاف وەعدە نەكا. واجبە هەر عیبادەتێ كە دەیكاو هەر ئیشێكی چاكە كە دەیكا بە ئیخلاس بیكا، واتە: هەر بۆ ڕەزای خودا بیكا، هەروەها ئەگەر تەركی گوناهیشی كرد لەبەر خوا تەركی بكا نەك لەبەر زیانی ماڵ یا لە ترسی نەخۆشی یا لە ترسی یەكێ لە خاوەن دەستەڵاتەكان.

واجیبە هەموو موسڵمانێ ئیتاعەی ئەمری خوا و پێغەمبەری خوا بكا، هەروەها واجیبە ئیتاعەی ئەمری خاوەن ئەمری موسڵمان بكا، مادام ئەمر بكات بە شتێ كە شەرعی و موافیقی ڕاستی و حەق بێ. واجیبە لەسەر هەموو موسڵمانێ ئەمر بكا بە چاكە و نەهی بكا لە خراپە، وەكو لە نامەی تایبەتیدا نووسیومە. واجیبە ئینسان باوەڕی ببێ بە

وەعدەی خوا لەگەڵ وەعیدی دا، واتە: خوا هەر بەڵێنێکی دابێ بە ئەهلی تاعەت کە پاداشی چاکەیان دەداتەوە لە قیامەتدا، یا هەر هەڕەشەیەکی کردبێ لە تاوانباران کە لە قیامەتدا حەقیان لێ دەستێنێ و سزایان دەدا هەموو ڕاستە و هەر واش دەبێ.

واجیبە ئینسان هەر کەسی خۆش دەوێ لەبەر خوا خۆشی بوێ و، لە هەرکەس عاجز بێ پێویستە لەبەر خوا لێی عاجر بێ. هەروەها واجیبە ئینسان تێ بکۆشێ بۆ لابردنی خووی خراپی نەفس وەك کینە و حەسوودی و خۆ بە زل زانین و بەخیلی و لەخۆباییبوون و خۆ بە باش زانین و خووڕەوشتی خراپی تریش. لەگەڵ ئەمەشدا واجبە لەسەر هەموو کەس تێبکۆشێ بۆ ئەوەی ئەخلاقی خۆی باش بکاو سیفەتی سەخاوەت و غیرەت لەسەر دین و خۆشویستنی پیاوچاکان کەسب بکا. واجیبە هەمیشە لە بەینی ترس و ئومێدا بێ و، لە قەهری خوا ئەمین نەبێ و لە ڕەحمەت و میهرەبانیشی نائومێد نەبێ. واجیبە بە قەدەر توانا لەبەر بەلا و ناڕەحەتیدا خۆگر بێ و، پشت بە خوا ببەستێ و، هەمیشە بە قەزای خوا ڕازی بێ. واجیبە عەورەتی خۆی داپۆشێ، واتە ئەگەر پیاوە ناویەینی ناوك و ئەژنۆی دەرنەخا بۆ نامەحرەم و، ئەگەر ژنە هیچ شوێنێکی لەشی دەرنەخا بۆ نامەحرەم. واجبە لەسەر نیعمەت شوکر و سوپاسی خوا بکا و، لە یادی خوا فەرامۆش نەبێ و، زیکری خودای گەورە بکات و، لای کەمی لە هەموو سبەینێ و ئێوارەیەکدا بڵێ: "اللهم انی احمدك واشكرك واثني عليك حمدا وشكرا وثناء بملأ كل منها الكون كله على ما اوليتني من النعم التي لا احصيها ولا استحقها الا بفضلك وكرمك، وعلى ما صرفت عني بفضلك وكرمك من النقم التی استحقها، صرفتها عني بفضلك ورحمتك". هەروەها هەر کەس هەر خواردەمەنییەك دەخوا واجیبە هەر لە سەرەتاوە ئەوە بخاتە دڵی خۆیەوە کە ئەمە نیعمەتی خوایە، ئەم مەسەلە پەنهانە و هەموو کەس نایزانێ و کەم هەڵدەکەوێ ئینسانی موسڵمان ئەم یادەی ببێ، ئەم عالەمە کە شەو و ڕۆژ لە خوا غافڵن چۆن ئەوە دەهێننە دڵیانەوە کە ئەم نیعمەتە نیعمەتی خوایە.

واجیبە لەسەر ئینسان هەر ئەمانەتێ کە درایە دەستی خیانەتی تێدا نەکات و بیگەیێنێتەوە بە خاوەنی خۆی. هەروەها واجیبە کاتێ زیانێکی لێ کەوت زۆر خەمی بۆ نەخواو، کاتێ شتێکی دەست کەوت پێی بایی و شادمان نەبێ، واتە واجیبە بە زیانی دنیایی زۆر دڵگران نەبێ و بە قازانجی دنیاییش زۆر بایی نەبێ؛ چونکە دنیا دەوامێکی زۆری نییە و هەر بە فەنادا دەچێ، گوناحە ئەوەندە ئینسان باوەشی پیابکا کە

تەنگەنەفەسی بكا، ئەم مەسەلەش هەروەها پەنهانە. واجیبە دنیا لە بەرچاوی ئینسانی موسڵمان سووك بێ؛ ئەم دنیایە داوی ئیبلیسە و گەلێ كەسی پێ گیرۆدە دەبێ. واجبە ئینسان هەرگیز بە هۆی دنیاوە شانازی نەكا بەسەر خەڵكداو خۆی بە گەورەتر نەزانی لە خەڵك؛ چونكە ئەم خۆ بە گەورەزانینە گوناهی گەورەیە. واجیبە ئینسان پەند و عیبرەت لە مەخلووقات و ڕووداوەكانی جیهان وەربگرێ، واتە كاتێ كە ئینسانێكی بەدكرداری دی تووشی دەردێ هات ئەوە بكا بە سەرمەشق بۆ خۆی و پارێز بكا لەو جۆرە تاوانبارییە. واجیبە ئینسان بیر بكاتەوە لە نیشانە و ئاساری دەستەڵات و توانای خوای گەورە كە چۆن ئاسمان و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەكانی دروست كردووە كە هەر كام لەوانە لەسەر خەتێكی تایبەتی هاتوچۆ دەكا و دەسووڕێتەوە، چۆن ئەم زەوی و كەژ و كۆسار و گیا و دار و درەختەی دروست كردووە، چۆن ئەم دەریا گەورە گەورانەی لەگەڵ عەرزا ڕێك خستووە كە پڕن لە گیانلەبەری جۆراوجۆر، هەتا دڵی ڕووناك بێتەوە، بەمە كە ئەم جیهانە جوانە ڕازاوەیە پەروەردگارێكی خاوەن زانست و توانای هەیە، خواستی لەسەر هەر شتێ هەبێ دەبێ و خواستی لەسەری نەبوو نابێ. لەم بابەتەوە ڕیوایەت كراوە كە بیركردنەوەی سەعاتێ لە عیبادەتی ساڵێ گەورەترەو، لە ڕیوایەتێكی تردا لە عیبادەتی شەست ساڵ چاترە.زاناكانی ئاین فەرموویانە تاوان دوو جۆرە بچووك و گەورە؛ تاوانە گەورەكان وەكو كوفر، پەنا بە خوا، وە پیاوكوشتن و زیناكردن و دەسبردن بۆ ماڵ یان نامووسی خەڵك، وە شەراب خواردن، وە فیتنەو ئاژاوە دروستكردن لە بەینی خەڵكدا، وە تێكدانی تاوبەینی هەموو موسڵمانێ هەموو ئەوانە تەرك بكا؛ واتە هەر كەسێ گوناهێكی گەورە بكاو زوو تەوبەی لێ نەكا ئەوە وەك ئەوەیە چەند گوناهێكی كردبێ، یەكەم ئەو گوناهەی كردووە، دووەم لێی پەشیمان نەبووەتەوەو، هەتا پەشیمان بوونەوەكەی دوابخا گوناهەكە لەسەری گەورەتر دەبێ.

هەروەها واجیبە لەسەر هەموو موسڵمانێ، وەك جەلالەدینی سیوتی فەرموویەتی، پارێزگاری تەندروستی خۆی بكا، واتە بە قەدەر حاڵ پێویستە بزانێ چ خواردەمەنییەك قازانجی هەیە و كامەیان زیانی هەیە، پاش ئەوە كە ئەمەی زانی لە هەرچی خراپە خۆی بپارێزێ، وەك واجیبە دڵی خۆی بپارێزی لە نەخۆشیی نەفسی.

واجیبە ئاگادار بێ لە نەخۆشیی ڕیاكردن و كینەڕاگرتن لە دڵداو لەخۆبایی بوون و پارەپیسی و ڕژدی و پیسكەیی و خۆ زل كردن بە سەر خەڵكداو بە سووكی تەماشاكردنی

خەڵكی و، جاسووسیەت كردن لەسەر خەڵك واتە گەڕان بە دوای دۆزینەوەی عەیب و خەوشی خەڵكداو وێنەی ئەمانەش. هەروەها واجیبە لەسەر ئینسانی باڵغی عاقڵ كە لە نەفەقەی خۆی و خێزانیدا وەكو ژن و منداڵی قسوور نەكاو، بە قەدەر دەستەڵاتی خۆی مەسرەفیان بۆ بكات و كەموكوڕكردنی گوزەران لەسەر خۆی و خێزانی حەرامە، بەڵێ ئەگەر بۆ نەفسی خۆی لەبەر ریازەتی نەفس و بەشێوەی زوهدو تەركی دنیا گوزەرانی خۆی كەم بكاتەوە ئەوە قەی ناكا.

واجیبە لەسەر ئینسان ئەگەر گیانلەبەرێكی لە بەردەستدا بوو، مەسرەفی خواردن و ئاو و هەرچی پێویستە بۆی بكا یا بیفرۆشێ، هەروەها ئەگەر داماوێ هات بۆ لای ئینسان واجیبە بە قەدەر حاڵ و توانا مەسرەفی بۆ بكاو لەو هیلاكەتە ڕزگاری بكا. هەر وەكو واجیبە لەسەر موسڵمان بە قەدەر حاڵ و دەستەڵات ماڵ صەرف بكات لە پێناوی هەر واجیبێكی ئیسلامیدا كە ڕوودەدا وەكو لە نامە پێشووەكاندا باسمان كردن.

بۆ نموونە: نوێژی جەماعەت لە دێهات و شار و گەڕەدییەكاندا فەرزی كیفایەیە، دیارە هەتا ماڵ سەرف نەكرێ بۆ مزگەوت و پێویستییەكانی مزگەوت ئەم جەماعەتە جێبەجێ ناكرێ، جا لێرەدا هەروەكو جەماعەتەكە فەرزی كیفایەیە، سەرفی ماڵیش بۆ دروستكردنی مزگەوت و كڕینی ڕایەخ و بەرماڵ و چرا و سووتەمەنی و پێویستییەكانی تریش بۆ مزگەوت وەك ئاو و ئاودەسخانە، هەروەها سەرفی ماڵ بۆ ڕاگرتنی كەسێ كە خزمەتی مزگەوتەكە بكا، یا بۆ ئەو كەسەی كە ڕێ و شوێنی بیروباوەڕی ئیسلامی و ئەحكامی نوێژ و ڕۆژوو حەج و زەكات و ئەحكامەكانی تر بە موسڵمانان فێربكا، فەرزی كیفایەیە. ئەم جۆرە كەسە ئەمڕۆ پێی دەڵێن ئیمامی دێ یا ئیمامی مزگەوت كە ئادابی ئاین بەبێ ئەو جۆرە كەسانە جێبەجێ ناكرێن، هەروەها سەرفكردنی ماڵ لە پێناوی حەج و عومرەداو، سەرفی ماڵ لە پێناوی بەخێوكردنی هەتیوی بێ حاڵ ماڵداو، بۆ كفن و دفن كردنی مردووی بێ كەس واجیبە.

بەخت كردنی ماڵ و تێكۆشان بۆ چاركردنی تاوانی تاوانباران، بە هەر شێوەیەك ئاسان بێ، واجیبە، ئیتر چ بە ئامۆژگاری و چ بە پەنابردنە لای فەرمانڕەوای ڕۆژ بێ. ئامۆژگاری كردنی موسڵمانان واجیبە بۆ لابردنی شەرابخانە و فەسادخانەكان كە هەموو وەكو داوی شەیتانن و بۆ گیرۆدەكردنی موسڵمانان ئامادە كراون، دەبێ ئەوەش بزانین كە هەروەكو چاركردنی ئەم جۆرە شتانە واجیبە، ئەوەش واجیبە كە چاركردنەكە

بە شێوەیەك بێ، فیتنەو ئاشوویی لێ پەیدا نەبێ، هەتا نەبێتە چاری زیان بە زیانێکی گەورەتر. ئەوەش بزانن کە سەرفکردنی ماڵ لە ڕێگەی چاری تاواندا بە قەدەر سێ حەجی ماڵی خودای گەورە پاداشی هەیە.

هەروەها واجیبە سەرفی ماڵ بۆ دەفع و لابردنی ئەو کەسانەی دەیانەوێ بە زۆر ماڵی موسڵمانان داگیر بکەن و دەستدرێژی بکەنە سەر کەرامەت و شەرافەتیان. ئەوانەی ڕێ لە خەڵك و لە کاروان دەگرن و ڕووتیان دەکەنەوە واجیبە بە هەموو جۆرێ لاببرێن و دەفع بکرێن چ بە ئامۆژگاری یا بە هێزی فەرماندار، بە تایبەتی ئەم ئینسانە خراپانە کە زۆر و هێزیان پەیداکرد دنیا وێران دەکەن، کەوابێ چارکردن و بەرگریکردنیان واجیبە.

ئەوەی لە بابەتی واجبات کەوتەوە بیرم، نووسیم، جا هەرکەس بێجگە لەمانە واجیبێکی تر دەزانێ با بیخاتە سەر ئەمانە، خوا پاداشی چاکی بداتەوە. والسلام على من اتبع الهدى.

## نامەی بیست و چوارەم

# باسی حەجە

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله وحده، والصلاة والسلام علی من لا نبي بعده، وعلی آله وصحبه واتباعه باحسان الی یوم الدین

براکانم! فەرموودەی پێغەمبەرە هەر کەسێ توانای حەجکردنی بوو بەجێی نەهێنا، ئەوە کە مرد دەیەوێ وەکو جوولەکە یا وەکو گاور بمرێ، با بمرێ. ئیمامی عومەر، خوای لێ ڕازی بێ، لە سەردەمی جێگەنشینیی خۆیدا ویستی مەئموور بنێرێ بۆ وڵاتەکانی ئیسلام تا هەرکەسێ کە حەجی لەسەر واجیبە و بە ئارەزوو حەجەکەی نەکردووە سەرانەی جوولەکەی لێ بستێنرێ، واتە وەکو جوولەکە موعامەلەی لەگەڵدا بکەن، بەڵام ئەسحابەکان مەنعیان کرد و، ئەویش وازی لەوە هێنا.

براکانم! بزانن ئەم واجیبە کە ناوی حەجە چەند ڕوکن و شەرت و واجیب و موحەڕەمات و (فدیە) واتە: کەفارەت بە حەیوان سەربڕین و چەند سوننەتی هەیە کە من بەڕیز بۆتان باس دەکەم تا سوودی لێ وەربگرن و حەج و عومرەکەتان بەتاڵ نەبێ، چونکە ئەگەر حاجی لەپێش وادەی حەجکردندا ئەوانە نەزانێ کاتێ کە بەو شوێنە پیرۆزە گەیشت سەرگەردان دەبێ، مەگەر یەکێ لەگەڵ حەجاجی زانادا بڕواو حەج فێر ببێ.

براکانم! شەرتی دروست بوونی موتلەقی حەج و عومرە ئیسلامییەتە، واتە کەسێ موسڵمان نەبێ حەجی دروست نییە.

شەرتی ئەوەش کە ئینسان ئادابی حەج بەجێ بێنێ پێنج شتە، ئیسلامییەت، تەمییز، هاتنی وەخت، زانینی ئادابەکانی حەج، زانینی چۆنییەتیی کردنی. جا ئەگەر ئینسانێکی نابالغ و خاوەن تەمییز ئەو شەرتانەی تێدا بێتە جێ و حەج بکا ئەوە حەجەکەی دروستە، بەڵام کاتێ کە بالغ بوو حەجی لەسەر واجیب بوو پێویستە حەجەکەی بکاتەوە.

شەرتی بەجێهێنانی حەجی نەزری شەشە: ئیسلام، بلووغ، عەقڵ، هاتنی وەخت،

زانینی چۆنیەتیی حەج، زانینی ئادابی حەج.

شەرتی بەجێهێنانی حەجی واجیب، کە ڕوکنێکە لە پێنج ڕوکنی ئیسلام، حەوتن: ئیسلام، بلووغ، عەقڵ، هاتنی وەخت، زانینی چۆنییەتیی حەج، زانینی ئادابی حەج، ئازادی واتە: بەندە نەبێ، واتە ئەگەر بەندەیەك حەجێکی کرد و، پاش ئەوە ئازادکرا ئەوە واجیبە لەسەری حەجەکەی بکاتەوە ئەگەر توانای هەبوو.

شەرتی واجیب بوونی حەج پێنج شتە: ئیسلام، بلووغ، عەقڵ، ئازادی، ئیستیتاعە، واتە توانای کردنی حەج. هەروەها شەرتی ئیستیتاعەی نەفسی خۆی حەوت شتە: بوونی زاد، واتە گوزەرانی شەو و ڕۆژ، تەنانەت زەرف و تۆشەبەرە بۆ ئەوەی پێویستییە بە قەدەر ئەو ڕۆژانەی دەڕواو دێتەوە بۆ شوێنی خۆی و، پێویستە زیادیش بێ لە ژیواری ئەوانەی کە ژیانیان لەسەری واجیبە. دووەم: بوونی وڵاخی سواری. سێیەم: ئەمینیی ڕێگەوبان. چوارەم: بوونی هۆی ژیانی وڵاخەکان لەو شوێنانەدا کە بەعادەت مەنزڵی تێدا دەگرن. هەروەها پێویستە لەو شوێنانەدا حەماڵ و خاوەن وڵاخ و غەیری ئەوانیش کە زەخیرەکەیان بڕابەوە بە کڕین و بە نرخی عادەتی دەستیان بکەوێ. پێنجەم: ئەوەیە کە کات بە بەریەوە بێ واتە: ئینسان لەو ماوەدا بگاتە (مەککە)و ئەرزی (عەرەفات). شەشەم: توانای سواربوونی ببێ، سواربوونی کەشتی یا حەیوانی سواری، ئەگەر لەوانە بوو کە لە کەژاوەدا بڕوا بە سەر وڵاخەوە دەبێ ئەو لاکەیشی ئینسانی تیابێ.. خۆ ئەگەر (معضوب) بوو واتە لێکەوتوو شلەپەتکە بوو مادام دارا بێ، واجیبە نائیبێ بگرێ بۆ خۆی کە بڕوا حەجی بۆ بکات، بەڵام مادام خۆی بتوانێ حەج بکا ئەوە دروست نییە جێگەدار بگرێ حەجی بۆ بکات. حەوتەم: ئەگەر ژن ڕۆیشت بۆ حەج پێویستە پیاوێکی مەحرەمی دەسکەوێ کە لەگەڵیدا بێ، وەکو مێردی یا باوکی یا برای یا کوڕی یا مامی یا خاڵی، ئەگەرچی لای ئیمامی شافیعی (ر.خ) بۆ ژن دروستە لەگەڵ کۆمەڵە ژنێکی بە حورمەتدا بڕوا بۆ حەجی واجیب. جا کاتێ کە ئەم شەرتانە لە ئینساندا هاتنەدی، واجیبە ئینسانەکە کردەوە و ڕوکنەکانی حەج فێر ببێ و بیانزانێ. ئەنجا بزانن ئەرکانی حەج شەشن، یەکەم نییەت، واتە بە دڵ قەست بکا و بڵێ وا قەسدی حەجم کردو ئیحرامم بەست بۆ حەج بۆ خودای گەورە. دووەم ڕاوەستان لە ئەرزی (عەرەفە)دا ئەگەرچی لە پاش زەوالی[1] ڕۆژی نۆی مانگی قوربان بێ، چونکە وادەی ڕاوەستانی عەرەفە پاش زەواڵە، و هەرچەند یەك دەقیقە پاش زەوال ڕاوەستێ، ئیتر هەتا شەبەقی ڕۆژی جەژن، کە ڕۆژی

(١) زەوال: کاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان.

دەیەمی قوربانە، ماوەی ڕاوەستانی عەرەفە دەمێنێ، بەڵام یاسای حەج وەهایە کە پاش ڕۆژاوابوونی ڕۆژی عەرەفە هەموو حاجییەکان لە عەرەفەوە دەڕۆن بۆ ئەرزی (موزدەلیفە)، ئەگەر کەسێ درەنگ بگا و شەو لە عەرەفە ڕاوەستێ ئەوەش دروستە.

سێیەم سووڕانەوەی دەوری کەعبەیە. چوارەم سەعییە لە بەینی سەفا و مەروەدا کە دوو شوێنن لە نزیکی کەعبەدا. پێنجەم تاشینی مووی سەر یا هەڵپاچینی واتە کورتکردنەوەی مووی سەرە لە پاش (ڕەمی) واتە بەرد فڕێ دان بۆ کۆگای (جمرة العقبة) لە ڕۆژی جەژندا. سەرتاشین و کورتکردنەوەی موو لە ئەرزی (مینا) یا مەککەی پیرۆز یا لە شوێنێکی تردا لە ئەرزی حەرەم یا غەیری حەرەمدا دروستە، بەڵام لە ئەرزی (مینا)دا خێری زۆرترەو، نابێ لە سێ موو کەمتر بتاشێ یا هەڵپاچێ، ئەگەر لەوە کەمتر بێ بە سەرتاشین و کورتکردنەوەی مووی سەر حسێب ناکرێ. شەشەم تەرتیبە لە بەینی زۆربەی ئەم ڕوکنانەدا، واتە: نییەتی ئیحرام لە پێش هەموو ڕوکنەکاندا بێ، ڕاوەستانی (عەرەفە) لە پێش تەوافی ڕوکندا بێ، تەوافی ڕوکن لە پێش سەعیکردنی بەینی سەفاو مەروەدا بێ، بە مەرجێ کە لە پاش (طواف القدوم) سەعیی نەکردبێ، بەڵام دروستە کە سەرتاشین بکەوێتە پاش تەوافی ڕوکن و، پاش سەعیی بەینی سەفاو مەروە بێ. دیارە ئەگەر یەکێ لەم ڕوکنانە تەرك بکرێ، یا بە ناڕەوایی جێبەجێ بکرێ ئەوە حەجەکە بەتاڵە، بەتاڵیی حەجیش دوو جۆرە، یەکەم ئەوەیە حەجەکەی فەوتاوە، ئەمەش وەکو تەرکی نییەتی ئیحرامەکەی، یا نییەتی ئیحرام هێنان لە پاش ڕاوەستانی عەرەفە، یاخۆ ڕاوەستانی عەرەفەی لە کاتی خۆیدا لەدەس دەریچێ، لەم حاڵانەدا حەجەکە لە گەردنی ئەم کەسەدا دەمێنێ و لەسەری واجیبە لە ساڵی ئایندەدا حەجەکە بکاتەوە. خۆ ئەگەر حەجەکەی بە جیماعکردن بەتاڵ بوویەوە، ئەوا لەگەڵ ئەوەدا کە واجیبە لە ساڵی داهاتوودا حەجەکەی قەزا بکاتەوە دەبێ فیدیەکەشی بدات وەکو باسی دەکەین. خۆ ئەگەر وڵاتەکەی دوور بوو لە (مەککە)ی پیرۆزو لە توانایدا نەبوو ساڵی داهاتوو بێتەوە بۆ (مەککە) ئەوە واجیبە هەر لە شاری مەککە دابنیشێ تا ساڵی داهاتوو حەجەکەی قەزا دەکاتەوە.

دووەم جۆری بەتاڵبوونەوەی حەج ئەوەیە کە حەجەکەی ناقیس بێ، بۆ نموونە تەرکی (طواف الافاضە) یا سەعیی بەینی سەفا و مەروەی کردبێ، یا تەرکی سەرتاشین یا هەڵپاچین، یا تەرکی تەرتیبی کردبێ لە بەینی زۆربەی ڕوکنەکاندا، لە هەموو ئەم شێوانەدا واجیبە لەسەری ئەو ڕوکنەی تەرکی کردووە بیکاتەوە، وە ئەگەر سێ ڕوکنی

تەرك كردبوو یا هەر لە ئیحرامدا بمێنێتەوە هەتا ئەوەی كە تەركی كردووە دەیكاتەوە. مادام لە ئیحرامدا بمێنێتەوە، كاتی كردنەوەیان فراوانە، هەر كاتێ بێ دروستە.

ئەركانی عومرە پێنج شتە، یەكەم عومرە واتە ئیحرام بەستن بە نییەتی عومرە، دووەم تەوافی كەعبەی پیرۆز، سێیەم سەعیی بەینی سەفا و مەروە، چوارەم سەرتاشین یا كورتكردنەوەی وەكو لە پێشەوە باسمان كرد. پێنجەم تەرتیب. یەكێ لەم ڕوكنانە كە تەوافە حەوت واجیبی هەیە: پاكیی لەش و پۆشاك لە بێ دەستنوێژی و لەش پیسی و لە هەر پیسییەك كە عەفووی لێ نەدرابێ، هەروەها پێویستە تەماشای بەرپێی خۆی بكا لە كاتی هاتوچۆدا نەوەك پیس ببێ. خۆ ئەگەر لەبەر زۆری قەرەباڵغیی حاجییەكان پیسی زۆر بوو، مادام بەعەمدی پێ دانەنێ بەسەریدا عەفوەو قەی ناكات بەومەرجەی پیسییەكە تەڕ نەبێ، ئەگەرنا پێویستە گورج پێی بشۆرێ و بێتەوە بۆ جێگەی تەواف، جا ئەگەر ئەمە بەینی زۆر نەبوو ئەوا لەسەر ئەو تەوافانەوە كە كردوویەتی تەوافەكانی تەواو بكا، ئەگەرنا پێویستە هەر لە ئەوەڵەوە دەست بكاتەوە بە تەواف و حەوت جارەكە بەجێ بێنێ.

یەكێ لە واجیبەكانی تەواف داپۆشینی عەورەتە، چ پیاو و چ ژن، واتە: ئەگەر بەقەدەر نینۆكێ لە ئەندامی عەورەتی دەركەوت، كە بۆ پیاو مابەینی ناوك و ئەژنۆیەتی و، بۆ ژن هەموو لەشیەتی بێجگە دەم و چاو دوو دەستەكانی هەتا مووچ، یا فۆتەی ئیحرامەكەی ئەوەندە تەنك و ناسك بوو كە مەنعی بینینی عەورەتی نەدەكرد ئەوە تەوافەكەی بەتاڵە.

لە واجیبەكانی تەوافە كە سەرەتاكەی لە بەرامبەری (حجر الاسود)ەوە دەست پێ بكا بەجۆرێ كە هەموو ئەندامەكانی لای چەپی لەگەڵ هەمووی (حجر الاسود)دا یا لەگەڵ هەندێكیدا بەرامبەر بن و، لەو كاتەدا نییەتی تەواف بهێنێ. بێ گومان ئەم بەرامبەرییە لەگەڵ (حجر الاسود)دا بەهۆی قەرەباڵغییەوە زۆر گرانە و پێویستی بە هەوڵ و تێكۆشان هەیەو، دەبێ حەوت جار بەتەواوی تەوافەكان بەجێ بێنێ، ئەگەر كەوتە گومانەوە كە حەوت جار یا شەش جار تەوافی كردووە لای كەم حسێب بكات و لەسەر ئەو كەمە تەوافەكەی تەواو بكا تا بەیەقین ژمارەكەی تەواو بێ، هەروەها پێویستە لەم تەوافانەدا لای چەپی خۆی لە كەعبە لانەدا، ئەگەر لای دا پێویستە گورج بێتەوە سەر باری واجب و لای چەپی بكاتە لای كەعبە و تەوافەكەی بكا.

گەلێ حاجی ئادابی تەواف نازانن پێویستە فێری ببن تا حەجەكەیان دروست بێ. ماچكردنی (حجر الاسود) لە قەرەباڵغیدا گرانە باشتر ئەوەیە هەر لە دوورەوە بە پەنجە

ئیشارەی بۆ بکاو ئەنجا پەنجەکەی خۆی ماچ بکات، کە ماچی کرد لەو کاتەدا هەنگاو دانەهێنێ، چونکە لەو حاڵەدا ڕووی لە کەعبەیە نەك لای چەپی، واتە کە ماچی کرد پێویستە لای چەپی بکاتەوە کەعبەو تەواف بکا.

ئاگادار بن لە کاتی تەوافدا بەسەر (شازروان)ی دیواری کەعبەدا نەڕۆن و، چاکی فۆتەکانتان نەکەوێتە سەری، چونکە واجیبە ئێمە تەوافی ماڵی کەعبە بکەین، ئەو (شازروان)ە زیادە دیوارێکی کورتە کە لە دیواری کەعبە دزراوەتەوەو، بە قەدەر دوو تا سێ بست بەرزو لکاوە بە دیوارەکەوەو، دەبێ تەوافەکەمان بە دەوری ئەویشدا بێ. وە ئەگەر لە کاتی تەوافدا گەیشت بە ژنێ، یا هێرشی حاجییەکانی بەسەردا هات، ئەویش ویستی لە ژنەکە یا لەو هێرشە دوورکەوێتەوە، ئەوە ئەو چەند هەنگاوەی بۆ حسێب ناکرێ بە طەواف چونکە بە نیازی تەواف هەنگاوی نەناوە، بەڵکو بەقەستی دوورکەوتنەوە لە ژن یا لە قەرەباڵغ بووەو، لەو کاتەشدا لای چەپی لە کەعبە لای داوە، کەوابێ بە دوو سەبەب ئەو ئەندازە تەوافەی بەتاڵە، یەکەم: لای چەپی ڕوو لە کەعبە نەبووە، دووەم: هەنگاوی بە قەستی دوور کەوتنەوە بووە لە ژنەکە یا لە قەرەباڵغییەکە، نەك لەبەر تەواف.

هەروەها ئەگەر پیسییەك لەبەر پێیدا بوو، ئەویش خۆی لەو شتە لاداو، بەهۆی ئەو خولانەوە لای چەپی لە کەعبە ترازا، یا هەر بۆ دوورکەوتنەوە هەنگاوی نا ئەویش لە تەواف حسێب ناکرێ، جا ئەگەر لە شوێنی لادانەکەیەوە تەوافەکە تازە نەکاتەوە ئەوە تەوافی لەو ئەندازەدا بەتاڵە بەو دەلیلانەی کە پێش نەختێ باسمان کردن.

ئەو ژنانە کە تەواف دەکەن پارێزیان نییە کەوابێ کاتێ ژنی تەوافکەر دەستی کەوت لە پیاوێ یا بە هۆیەکی تر دەستنوێژی شکا ئەگەر زۆری پێ نەچوو ئەوا لەو شوێنەوە کە طەوافەکەی بەتاڵ بووە دەس پێ بکاتەوە، ئەگەرنا هەر لەسەرەوە دەس بکاتەوە بە طەواف و بە تەواوی بیکا.

کە تەوافکەر گەیشتە (حجری اسماعیل) با نەڕواتە ناو (حجر)ەوە، چونکە (حجری اسماعیل) داخڵی کەعبەیەو، لە کاتی تەعمیرکردنەوەی کەعبەدا حەجاجی کوڕی یووسف لە خانووی کەعبەی دەرکردووە، هەندێ دەڵێن ئەندازەی دوو گەزی لە کەعبەیە، جا کاتێ لە دەوری (حجر)ەوە تەوافی کرد با لای چەپی خۆی بکاتە لای (حجر)ەوە وەك لە تەوافدا باسمان کرد. شایانی باسە دەبێ لە هەر حەوت جاری تەوافەکەدا وەك باسمان کرد ئاگاداری مەرجەکانی دروست بوونی تەواف بێ، ئیتر چ ئەو تەوافە تەوافی ڕوکن بێ، یا

تەوافی قدووم و گەیشتن بە مەککە، یا تەوافی وەداع و ماڵئاوایی. ئەنجا پاش تەواف دوو ڕکات سوننەتی نوێژی تەواف بەجێ بێنێ یا لە مەقامی ئیبراهیم یا لە نزیکیی کەعبە لە هەر شوێنێکیدا بێ یا لە (مسجد الحرام)، بڵێ نییەتمە دوو ڕکات سوننەتی نوێژی تەواف دەکەم الله اکبر.

واجیباتی ڕوکنی سەعیی بەینی سەفا و مەروە چوارن: یەکەم ئەوەیە کە ئەم سەعییە لە پاش تەوافی ڕوکنی تەواو بێ، ئەگەر لە پاش تەوافی قودووم سەعیی نەکردبێ، بەڵام ئەگەر لە پاش تەوافی قودووم سەعیی کردبێ، ئیتر لە پاش تەوافی ڕوکن سەعیکردن نە ڕوکنەو نە شەرطە. دووەم پێویستە ئەووەڵی سەعییەکەی لە سەفاوە بێ بۆ مەروە. کە لە سەفاوە گەیشتە مەروە، ئەمە جارێکە لە حەوت جارەکان و، کە لە مەروەوە گەیشتەوە بە صەفا دەبێتە دووجار، بەم جۆرە ڕۆیشتن لە صەفاوە بۆ مەروە جارێك و گەڕانەوەی لە مەروەوە بۆ سەفا جارێکە، هەتا هەر حەوت جارەکە تەواو دەبن.

سێیەم پێویستە لەو شوێنەدا کە دیاری کراوە بۆ هاتوچۆ ڕابووورێ، واتە لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدا بێ و برواو بگەڕێتەوە، نەوەك لە (مسعی) دەرچێ. چوارەم دەبێ هەموو هەنگاوەکانی بە نییەتی سەعی بێ، هەروەکو لە طەوافدا دەبێ بە قەستی تەواف بێ، وە بە هەموو ئەو شوێنەدا هاتوچۆ بکا هەتا پەنجەکانی پێی و پاژنەی بە دیواری تەرەفی سەفا و مەروە بگا، تەنانەت ئەگەر بە سواری سەعی بکا پێویستە سمی وڵاغەکەی بگات بە دیواری هەردووولاکان ئەگینا ئەو جارەی بۆ حسێب ناکرێ، ئەم مەسەلە کەم کەس ڕەفتاری پێ دەکا. ئەمە تا ئیستا واجیباتی دوو ڕوکن لە شەش ڕوکنەکانی حەجم بۆ باس کردن بە باشی وەریان بگرن، بەڵام واجیباتی حەج پێنجن. یەکەم ئەوەیە کە ئیحرامی بەست بۆ حەج یا بۆ عومرە با لە میقاتی خۆیەوە بێ و بەسەر میقاتدا بەرەو مەککەی موکەڕەمە لانەدا، ئیحرامی پاش لە میقات لادان دروستە، بەڵام ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ میقات و لەوێوە ئیحرام نەبەستێ پێویستە حەیوانێ سەر ببڕێ بۆ فیدیە کە وەکو حەیوانی قوربانی بێ. دووەم واجیبی حەج ئەوەیە کە بەشێ لە شەوی جەژن لە موزدەلیفە بێ، بەڵام ئەم مانەوەیە لە نیوەی دووەمی شەودا بێ، واتە مانەوەی لە نیوەی یەکەمی شەوەکەدا کافی نییەو، مانەوەی لە هەموو شەوەکەدا سوننەتەو واجیب نییە. سێیەم مانەوەی شەوەکانی (ایام التشریق) لە ئەرزی (مینا)دا، ئەگەرچی تەنیا دوو شەو بێت. چوارەم: ڕەمیی جیمارە، واتە بەردفڕێدان بۆ ئەو سێ کۆگایە کە دیاری کراون. پێنجەم واجیبی حەج ئەوەیە کە هەرچی لەکاتی ئیحرامدا حەرام بێ نەیکات. لەمەوپاش،

ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ، باسی ئەو شتانەتان بۆ دەکەم کە لە ئیحرامدا حەرامن.

تەوافی وەداع لە واجیباتی حەج نییە بەڵام لە واجیباتی وەداعە، واتە ئەگەر حاجی لە مەککە بمێنێتەوە ئەو تەوافەی لەسەر نییە، جا ئەگەر کەسێ بە قەدەر مەسافەی قەسر لە مەککەی موکەڕەمە دەرچوو یا گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، ئەگەرچی مەسافەی قەسریش نەبێ، پێویستە ئەم تەوافی وەداعە بکات، ئەگەر نەیکرد فیدیەی لەسەر واجیب دەبێ و پێویستە حەیوانێکی وەك حەیوانی قوربانی بۆ هەژارانی حەرەم سەرببڕێ.

شەرتەکانی دروست بوونی (رمی) بەردفڕێدان، کە واجیبێکە لە واجیبەکانی حەج، هەشتن، یەکەم تەرتیب واتە لەپێشدا بەرد فڕێ بدات بۆ کۆگای یەکەم، دوای ئەوە بۆ کۆگای ناوەڕاست ئەنجا بۆ کۆگای (عقبە). جا ئەگەر لە ڕۆژی یەکەمدا ڕەمیی نەکردو سبەینێ هات بۆ ڕەمی، ئەوە پێویستە لە پێشدا ڕەمیی ڕۆژی یەکەم قەزا بکاتەوە ئەنجا ڕەمیی ڕۆژی دووەم بکا. شەرتی دووەم ئەوەیە کە حەوت بەرد لە وردە بەردی وا کە لە نۆك گەورەتر بێ فڕێ بدا بۆ ناو کۆگاکە. سێیەهەم ئەوەیە لەگەڵ قەسدا بێ، واتە بە دڵ نیازی ئەوەی ببێ کە بەرد فڕێ دەدات. چوارەم دەبێ ئەوەی فڕێی دەدا بەرد بێ. پێنجەم فڕێدانەکە عادەتی بێت واتە: بۆ نموونە بە پێ فڕەی نەدات. شەشەم ئەوەیە بەردەکان یەکە یەکە فڕێ بدا. حەوتەم ئەوەیە بە قەستی ئەو کۆگایە ڕەمی بکا بۆ ئەدای واجیب. هەشتەم ئەوەیە لە ڕۆژی یەکەمدا بۆ هەرسێ کۆگاکان بەرد فڕێ بدا هەروا لە ڕۆژەکانی تریشدا. بەڵام لە ڕۆژی جەژندا تەنیا بەرد بۆ ئەو کۆگایە فڕێ بدات کە ناوی (جمرة العقبة)یە ئەنجا پاش ئەو بەرد فڕیدانە سەری بتاشێ یا کورتی بکاتەوە، بەم دوو کردەوەیە (تحلل)ی یەکەمی بۆ جێبەجێ دەبێ و، بێجگە جیماع و عەقدی نیکاح هەرچی لێی حەرام بووە بۆی حەڵاڵ دەبێ. جا پاش ئەوە کە ڕۆژی یەکەم و دووەم لە پاش ڕۆژی جەژن حاجییەکان ڕەجمی هەرسێ کۆگاکانیان کرد، زوریەیان دەگەڕێنەوە بۆ مەککەی موکەڕوەمە. ئەم گەڕانەوە پێی دەڵێن (نفری اول) واتە دەرچوونی یەکەم لە خاکی مینا، وە ئەگەر لە ڕۆژی جەژندا نەچووبوون بۆ مەککە بۆ تەوافی کەعبە و سەعیی بەینی سەفا و مەروە کە لە میناوە دەرچوون با بڕۆن تەوافی کەعبە و سەعیی بەینی صەفا و مەروە بکەن، بەڵام زۆربەی حاجییەکان هەر لە ڕۆژی جەژندا تەوافی کەعبە و سەعیی بەینی سەفاو مەروە دەکەن.

شەرتەکانی دەرچوونی یەکەم هەشتن، یەکەم ئەوەیە ئەو دەرچوونە لە ڕۆژی دووەمی

(ایام التشریق)دا بێ نەك لە ڕۆژی یەکەمدا. دووەم ئەوەیە ئەو دەرچوونە لە پاش زەوال بێ، واتە پاش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان. سێیەم ئەوەیە کە ڕەمییەکانی ڕۆژی دووەمی تەواو کردبێ، جا پاش ئەوە دەربچێ. چوارەم ئەوەیە کە لەو دوو شەوی (ایام التشریق)ەدا لە مینا بووبێ، مەگەر بەهانەیەکی شەرعیی ببێ، کە بە ناچاری چووبێ بۆ دەرەوەی مینا. پێنجەم ئەوەیە کە نییەتی (نفر) دەرچوونی ببێ. شەشەم ئەوەیە کە نییەتی دەرچوونەکەی لەگەڵ دەرچوونەکەیدا هاوشان و ڕێك بێ. جا کە ڕەمیی کۆگای (عقبە)ی تەواو کرد با بگەڕێتەوە بۆ عەرزی میناو لە میناوە دەرچێ و بگەڕێتەوە بۆ مەککە. بەڵام لەلای کۆگای (عقبە)وە بگەڕێتەوە بۆ مەککە؛ بەبێ ئەوەی بڕواتەوە بۆ مینا، ئەوە دەرچوونەکەی دروست نییە؛ چونکە کۆگای (عقبە) لە دەری عەرزی مینایەو، پێویستە لە خاکی میناوە دەرچوونی یەکەم دەست پێ بکرێ. هەندێ حاجی هەر لە پاش ڕەمیی کۆگای (عقبە) لەوێوە دەڕۆنەوە بۆ مەککە، ئەم دەرچوونە دروست نییە. حەوتەم ئەمەیە کە دەرچوونەکە لە پێش ڕۆژ ئاوابوون بێ و لە پاش زەوالی ڕۆژی دووەمی (ایام التشریق) بێ. هەشتەم ئەوەیە کە قەصدی هاتنەوەی ئەرزی مینا دەکا واتە: بڵێ ئەم شەوی سێیەمە دەگەڕێمەوە بۆ میناو لە پاش ئەوە لە مینا دەردەچم؛ چونکە ئەگەر ئەم قەستەی هەبوو و هاتەوە بۆ مینا پێویستە شەو لە مینا بێ و ڕۆژی سێیەم هەر سێ کۆگاکە بەردباران بکا.

**ئەو شتانەی بەهۆی ئیحرامەوە حەرام دەبن:**

ئەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرامەوە لەسەر حاجی یا خاوەن عومرە حەرام دەبن دە شتن، یەکەم: داپۆشینی لەش و سەر بە لیباس و کەوش لە پێ کردن، بەڵێ دروستە نەعل یا شتی وەکو نەعل لە پێ بکا، چەتر یا سێبەری کەژاوە بەدا پۆشینی سەر حسێب ناکرێ و زیانی نییە. دووەم بۆن خۆشکردنی لەش یا بەرگ و پۆشاك، بەڵێ لە پێش ئیحرام بەستن بۆن خۆشکردنی لەش و چاوڕشتن سوننەتە، یا ئەگەر شتێکی بۆن خۆش بخوا یا لە مەرەکەبی نووسیندا بۆنی خۆش بەکاربێنێ ئەوە زیانی نییە. سێیەم چەورکردنی مووی سەرو ڕیش و سمێڵ و برۆیە، بەڵام چەورکردنی ئەندامەکانی تری لەش زیانی نییە. چوارەم لابردنی مووی سەر و غەیری سەر بە تاشین و کورت کردنەوەو ڕنینەوە. جا ئەگەر تاقە موویەك لاببا ئەوە حەرامە و پێویستە (مد)ێ قووت بدا بە هەژارو، ئەگەر دوو موو لاببا دوو (مد)و ئەگەر سێ موو بوو ئەوە پێویستە حەیوانێ سەرببڕێ کە بۆ قوربانی بشێ. پێنجەم بڕینی نینۆکی پەنجەی دەستی یا پێی، جا بە بڕینی یەك نینۆك (مد)ێ

قووت و بە هی دوو نینۆك دوو (مد)و بە برینی سێ نینۆك حەیوانێك واجیب دەبێ. شەشەم مارەبڕینە لە ماوەی ئیحرامدا چ ژن بێنێ یا ژن بدا بە شوو. حەوتەم جیماعە، هەروەها موقەدیماتی جیماعیش حەرامە بە شەرتێ لەگەڵ ئارەزووی نەفسدا بێ. ئیستیمنایش حەرامە: واتە ئاوهێنانەوەی خۆی. هەشتەم ڕاوکردن و نێچیرگرتن و نێچیر کوشتن لە حەرەمی مەککە یا لە غەیری حەرەمی مەککەدا، هەروەها خواردنی گوشتی نێچیری حەرەم یا غەیری حەرەم، با یەکێکی تریش ئەو نێچیرەی کوشتبێ. نۆیەم: بڕینی دار و گیای حەرەمی مەککەی موکەڕەمە یا حەرەمی مەدینەی مونەوەرە، جا ئەمە وەکو بۆ موحریم بۆ غەیری موحریمیش هەر حەرامە. دەیەم هەڵکەندنی دار و گیای حەرەمی مەککە و مەدینە، ئەمەش وەکو بۆ موحریم حەرامە بۆ غەیری موحریمیش حەرامە، بەڵام دار و گیای مەدینەی مونەوەرە فیدیەی لەسەر نییە. جا بە کردنی هەریەك لەم دە کردەوەیە فیدیە واجیب دەبێ، بەڵام عەقدی نیکاح تەنیا حەرامە و فیدیەی لەسەر نییە.

بۆ خوێنی فیدیە بیست و یەك سەبەب هەیەو، هەموو فیدیەکان چوار جۆرن. یەکەم جۆر مورەتتەب و موقەددەرە، مورەتتەب واتە: هەتا عاجز نەبی لە فیدیەی یەکەم ناچی بۆ فیدیەی دووەم. موقەددەریش واتە: کە عاجز بووی لە دانی یەکەم شت، شەرع بەدەڵ و جێگەداری بۆ داناوە، بۆ نموونە: ئەگەر نەتتوانی حەیوان سەرببڕی شەرع دە ڕۆژ ڕۆژووی بڕیارداوە.

هۆیەکانی حەیوان سەربڕین دە شتن، یەکەم (تمتع) یا (قران) لە حەجدا. (تمتع) ئەوەیە کە لە میقاتی حەجدا ئیحرام دەبەستێ بۆ عومرەو دەڕوا بۆ تەوافی کەعبەو سەعیی بەینی سەفاو مەروە دەکا و، (تحلل) دەکا و بەرگ و پۆشاکی خۆی لەبەر دەکا و، لە پاشاندا هەر لە مەککەوە ئیحرام دەبەستێ بۆ حەج و لەگەڵ حاجییەکاندا حەج دەکا. (قران)یش ئەوەیە کە لە میقاتدا بە جارێ ئیحرام دەبەستێ بۆ حەج و عومرە بەیەکەوە و مەناسیکەکان تەواو دەکا، لەم دوو شێوەی (تمتع) و (قران)ەدا واجیبە حەیوانێك سەرببڕێ کە بۆ قوربانی بەکاربێ، بێ گومان ئەم قیران و تەمەتتوعە بۆ خەڵکی هەرەمە گرانە و، چاك وایە بە شێوەی (افراد) ئیحرام ببەستێ، واتە: لە ئەووەڵەوە ئیحرام ببەستێ بۆ حەج و پاش ئەوە حەجەکەی تەواو کرد بڕوا لە نزیکترین جێگەی حەل ئیحرام ببەستێ بۆ عومرەو عومرەیشی بەجێ بێنێ.

یەکێکی تر لە هۆیەکانی فیدیە نەکردنی ڕەمیە، یا تەرکی شەومانەوە لە موزدەلیفە، یا

تەرکی شەومانەوە لە مینا، یا تەرکی ئیحرام بەستن لە میقاتدا، واتە میقات لابداو ئەنجا ئیحرام ببەستێ، یاخۆ حەجەکەی فەوتابێ بە هۆی نەگەیشتن بە ڕاوەستانی عەرەفەدا، یا تەرکی تەوافی وەداع، یا موخالەفەی نەزر بکا، بۆ نموونە نەزری کردبێ لەسەر خۆی کە بە پیادە حەج بکا کەچی بە سواری بڕوا بۆ حەج. لە هەموو ئەم حاڵانەدا واجیبە حەیوانێك سەر ببڕێ کە بۆ قوربانی بشێ، ئەگەر ئەمەی نەتوانی با دە ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ، سێ ڕۆژ لە مەککەو حەوت ڕۆژ کە گەڕایەوە بۆ ماڵ. ئەگەر لە ڕۆژانی حەجدا مومکین نەبوو ئەو سێ ڕۆژە بە ڕۆژوو بێ با لەپاش (ایام التشریق) بە نییەتی قەزای ئەو ڕۆژانە بە ڕۆژوو بێ.

دووەم جۆری فیدیە لەگەڵ تەرتیب و تەعدیلدایە، مەعنای تەرتیب ڕابوورد، تەعدیلیش ئەوەیە کە لە کڕینی وشتری (بدنە) عاجز بوو، بۆی هەڵ نەسووڕا، دەتوانێ گایەك سەرببڕێ، ئەگەر ئەمەشی بۆنەکرا، حەوت مەڕ سەرببڕێ، ئەگەر ئەمەشی بۆ نەکرا، نرخی وشتری (بدنە)کە هەرچەند بوو بیدا بە قووت وەکو گەنم و بیدا بە هەژارانی حەرەم. ئەم جۆرە فیدیەیە دوو سەبەبی هەیە، یەکەم جیماع کە حەج بەتاڵ دەکاتەوە، جا فیدیەکەی وەك باسمان کرد وشترێکی (بدنە)یە، ئەگەر وشتر نەبوو گا، ئەگەر گا نەبوو حەوت سەر مەڕ، ئەگەر ئەمەش نەبوو، نرخی وشترەکە بدا بە قووت، ئەمەشی بۆ نەکرا بەقەدەر ژمارەی (مدە) قووتەکان لەباتی هەر موددێ ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێ. دووەم سەبەب (احصار)ە، واتە: مەنع بکرێ لە تەواوکردنی حەج لەم حاڵەدا پێویستە (تحلل) بکا بە سەربڕینی حەیوانێ واتە: مەڕێ یا بزنێ کە بۆ قوربانی بشێ، ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا نرخی مەڕەکە بکات بە قووت و لەباتی هەر مودێ ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێ.

سێیەم جۆری فیدیە لەگەڵ تەخییر و تەعدیلدایە، مەعنای تەعدیلمان باس کرد، تەخییریش ئەوەیە کە حاجییەکە ئارەزووی خۆیەتی یا حەیوانێ سەربڕێ یا بایی نرخی ئەو حەیوانە قووت بکرێ و، لەباتی هەر موددێ ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێ، ئەمەش دوو سەبەبی هەیە، ڕاوکردن یان بڕین و هەڵکەندنی درەخت و گیای ئەرزی حەرەم.

بەشی چوارەم فیدیەی تەخییر و تەقدیرە کە مەعنای هەردووکیان ڕابردوون، ئەمەش لە حاجییە هەرەمەکانەوە ڕوودەدا، پێویستە ئەم مەسەلە باش تێ بگەن. جا ئەم خوێن ڕژاندنە هەشت سەبەبی هەیە: لابردنی موو، نینووك کردن کە بەم دوو سەبەبە فیدیە واجب دەبێ، لەبەرکردنی بەرگ و پۆشاك، چەورکردنی مووی سەر و ڕیش و سمێڵ، خۆ بۆن خۆش کردن، موقەددیماتی جیماع و جیماع کردن، دیارە لە پاش جیماع کردنی

جاری یەکەم کە حەجەکەی پێ فاسید دەبێ، پێویستە حەجەکەی تەواو بکا، جیماعی مابەینی تەحەللولی یەکەم و تەحەللولی دووەم.

شەرتی واجب بوونی فیدیە لەم هەشت ئەسبابەدا ئەوەیە کە ئەو کەسە ئەمانە دەکا بزانێ ئەمانە حەرامن و بەعەمدی بیانکا، واتە ئەگەر نەیدەزانی کە حەرامە یا لە بیری چوو و کردی ئەوە فیدیە واجب نابێ مەگەر لە لابردنی موو و نینۆك کردندا کە بە هەموو حاڵ فیدیەیان تیا واجیبە بەو شەرتە کە ئینسانێکی (ممیز) بێ، سوود و زیانی خۆی بفامێ، بەڵێ ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەو کەسەی کە مووەکانی لا دەبا لەبەر عوزرێك بێ، بۆ نموونە لە ترسی ئاڵۆشی لەشی یا لەترسی ئەسپێ و ڕشك، یا ئەو کەسەی کە نینۆکی دەکرد لەبەرئەوە دەیکرد کە لەشی بریندارەو ئەگەر نینۆکی ببێ زامەکانی دەکولێنێتەوە، ئەوە هەرچەند فیدیەیان تیا واجیبە بەڵام گوناهی ناگات. لە هەر یەك لەم هەشت ئەسبابانەدا حاجی ئارەزووی خۆیەتی یا مەڕێ سەرببڕێ یا سێ(صاع)[1] قووت بدا بە شەش مسکێن یەکی نیو (صاع)، یا سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ. شایانی باسە بە هیچ کام لەم شتانە کە بە هۆی ئیحرامەوە حەرام دەبن، حەج فاسید نابێ بە جیماع نەبێ وەك باسمان کرد.

## سوننەتەکانی حەج:

سوننەتەکانی حەج زۆرن ئەگەر عەوام یا زانا ئەوانە نەکا، حەجەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام هەندێ لەوانە کردنیان ئاسانە، وەکو غوسڵە سوننەتەکان. ئەمانە وەکو زیکر و ویردەکان نین کە فێربوونیان گران بێت، چونکە ئەو ئەوردانە هەرچەند فێریان ببن مەعنایان نازانن کەوابێ خۆیان بەوانەوە خەریك نەکەن، لە باتی ئەوانە با هەر بڵێن خوایا عەفووم بکە، خوایا حەجەکەم قبووڵ بکە، خوایا خۆم و ئیمانم سەلامەت بکە، خوایا ئەولادەکانم ساڵح بکە، خوایا خۆم و ئەولادم داماو و موحتاج مەکە، خوایا لەم بەندەی خۆتە ڕازی بە، خوایا بەهەشتم پێ ببەخشە و لە دۆزەخ بمپارێزە؛ ئەمانە ئاسان و بەسوودن و لە ناو ذیکرەکاندا فێری (لبیك لبیك) ببێ و بیخوێنێ و، لە ماوەی ئیحرامدا (لبیك) خوێندن سوننەتە هەتا دەگاتە کاتی بەرد فڕێدان بۆ کۆگای (عقبە) لەو کاتەدا (الله اکبر) سوننەتەو، لەگەڵ هەر بەردێکدا کە فڕێی دەدا یەك جار بڵێ (اللّه اکبر). ئەمەش شێوەی مەشرووعی تەلبیەکەیە: "لبیك اللهم لبیك لا شریك لك لبیك ان الحمد والنعمة والملك لك لا شریك لك" ئەم لەفزانە سێ جار بخوێنێتەوەو لەپاشاندا سەڵەوات لەسەر

---

(١) صاع: نزیکەی دوو کیلۆ و نیوە.

حەزرەت بداو داوای ڕەزای خوا و بەهەشت بکاو لە ئاگری دۆزەخ داوای پەنا بکاو.

لە ماوەی حەجدا لە دە جێگەدا خۆشۆردن سوننەتە: لە بەستنی ئیحرامدا، کاتی چوونە ناو شاری مەککە، لە کاتی ڕاوەستانی عەرەفەدا، لە کاتی ڕاوەستانی عەرەفەدا، لە کاتی مانەوە لە موزدەلیفەدا، ئەگەر بۆ چوونە عەرەفات خۆی نەشۆردبوو، هەروەها لە سێ ڕۆژەی میناداو، نەك بۆ تەوافی ڕوکن.

نووسینی ئەزکارم تەرك کرد، چونکە نامەیە بۆ خەڵکی هەرەمە نووسراوەو، ئەزکار بۆ خەڵکی نەخوێنەوار گرانە، بەڵێ ئەگەر یەکێك لە پێش حەجدا فێریان ببێ ئەوە زۆر باشە، هەروەها ئەگەر بتوانرێ وێنەی کەعبەیان بۆ بکێشرێ هەتا بزانن ڕوکنەکانی چۆن ڕێ کەوتوون و، بە خەیاڵ چەند جار تەوافی کەعبە بکا پێش ئەوەی بڕوا بۆ حەج.

لە کاتێکدا کە باران دەبارێ خۆیان نەخەنە ژێر (میزاب الرحمة)وە، چونکە لەسەرەوە هێلانەی کۆترەو پڕە لە ریقنەی کۆترو ئاوی بارانەکە پیس دەکات و کە بێ بە سەریاندا لەش و بەرگ و پۆشاکیان پیس دەکا و نوێژ و تەوافیان بەتاڵ دەبێتەوە.

من وەختێ لەو شوێنە مویارەکەدا بووم لای والی جیددە شکاتم کرد و داوای ئەوەم کرد هەندێ لەوح ببەستن بە دەوری ئەو میزابەدا هەتا ئاوەکەی پیس نەبێ و نوێژی موسڵمانان بەتاڵ نەبێتەوە، ئەویش فەرمانی دا وای لێ بکەن، پاش هاتنەوەمان خەبەر هات کە چاکیان کردووە، جا ئەگەر ئەم خەبەرە ڕاست بێ و ئاوی پلووسکەکە بە پاکی بێتە خوار، باشە حاجی خۆی بداتەبەر ئەو ئاوە کە بە پلووسکی (میزاب الرحمة)دا دێتە خوارەوە.

براکانم! ئامۆژگاریتان دەکەم دەخیلتان بم لە ڕێگەی حیجازدا خۆتان لە خواردنی خواردەمەنی ناموافیق بپارێزن، وەکو گۆشتی وشتر. شەکر و جاترەو پیاز و سماق و ترشی سماق، لەگەڵ خۆتان بەرن، بە تایبەتی ئەگەر سکەنجەبین دەست بکەوێ، هەموو وەختێ ئاوی سکەنجەبین بخۆنەوە کە بە لەزەتتر و سالمترە.

من کە بە کورتی ئەم ڕێ و شوێنی حەجەم کۆکردوەتەوە سەید ئەحمەدی کوڕی سەید مەعرووفی نۆدێییم و، ئەم نامەیەم بۆ برادەرانی عەوامی خۆمان کۆکردووەتەوە، ئەگەرنا زاناکان پێویستیان بەم جۆرە کتێبانە نییە، من بۆیە ناوی خۆمم برد کە موسڵمانان بە دوعای خێر یادم بکەن.

لە نامەیەکی تردا بە زمانی عەرەبی باسی هەندێ لەو ئەزیەت و ئازارەم نووسیوە کە لە لایەن کاربەدەستان و ناو کێشان و خاوەن وشترانی وڵاتەکەوە بە حاجییە کوردەکان

دەگەیشت، هەر کەس ئەو نامەیە بخوێنێتەوە قازانجی لێ وەردەگرێ، واتە دەتوانێ تا ئەندازەیەك ئاگای لە خۆی بێ و خۆی بپارێزێ. لەبەرئەوەی چاودێری کورتی ئەم نامەیەم کرد، هەموو مەسەلەکانی حەجم بەیان نەکرد، لێم ببوورن، چونکە درێژە پێدان لەگەڵ کورتخوازی یەك ناکەوێ.

هذا آخر ما اردنا جمعه والله اسأل ان يعم للعاملين به نفعه آمين آمين يا مجيب السائلين والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

## نامەی بیست و پێنجەم

# نامەی مرققە(١)

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه الحماة لدين الله.

پاش ئەمانە براکانم! ئەم نامە پیرۆزانە کە من دەیاننێرم بۆ خزمەتی ئێوە و ئێوەیان پێ عاجز دەکەم و داوێنگیری ئێوە دەبم، هۆی ئەمەیە کە عەرزتان دەکەم: یەکەم هەموو کەس پێی خۆشە دیارییەکی زۆر بە نرخ بۆ برای گەورەی خۆی یا بۆ دۆستێکی ڕاستەقینەی بنێرێ. من خۆم بە خزمەتکاری ئوممەتی حەزرەتی باپیرم دەزانم (د.خ)و، زۆرم پێ خۆشە دیاری بنێرم بۆتان و، هەتا توانایشم ببێ ئەم دیارییانە هەر دەنێرم بۆتان. دووەم: فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەرە (د.خ) "ما اهدى مسلم لاخيه هدية افضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدي او يرده بها عن ردى" واتە: هیچ موسڵمانێ دیارییەکی نەناردووە بۆ برای خۆی باشتر بێ لە کەلیمەیەکی زانیاری و ژیری ببێتە هۆی ئەوەی کە خوای گەورە بەهۆی ئەو کەلیمەوە وشیاری و شارەزاییی ڕێگای ڕاستی زیاد بکا یاخۆ لە گومڕاهی و لە ناوچوونی لابداو بیپارێزێ.

تەماشا دەکەم ئێوە بە دیاریی دنیایی زۆر دڵشاد دەبن و سوپاسگوزاری خاوەنەکەی دەبن، بەڵام من کە ئەم دیارییانەتان بۆ ڕەوانە دەکەم خۆم مەمنوون و دڵشاد دەبم ئەگەر ئێوە وەری بگرن و بیخوێننەوە، یا کاتێ کە خوێنرایەوە بۆتان بە دڵ گوێیان لێ ڕابگرن و مەعناکەیان حاڵی ببن و ڕەفتاریان پێ بکەن؛ چونکە هەر یەکێ لەم نامانەی من گەلێ مەسەلەی ئاینیی تێدایە.

لە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەردا هەیە کە فێربوونی یەك مەسەلەی ئاینی و فێرکردنی بە خەڵك ئەوەندەی هەزار ڕکات نوێژی سوننەت پاداشی هەیە؛ من لەبەر ئەمانە زۆر داوێنتان دەگرم و دەخیلتان دەبم کە تالبی خوێندنەوەی عەریزەکانی من

(١) واتە: نامەی هەندێ نەرمە ئامۆژگاری.

ببن؛ چونکه وەکو زاناکانی ئاین فەرموویانە ئەگەر کەسێکی زانا نەبێ دین بە خەڵك بڵێ ئەم کۆمەڵە وەکو کوێر دەمێننەوە نازانن ڕوو لە چ لایە بکەن. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ئەم نامانە کە دۆستی خۆتان بۆتان دەنێرێ، نیعمەتی خوای گەورەن کە بۆ ئێوەی دیاری کردوون و قبووڵ کردنیان دەبێتە هۆی ئەوە کە خوا نیعمەتی زۆریان بۆ ڕەوانە بکات و قبووڵ دەبێتە هۆی ڕق و نارەزایی خوا لە ئێوە، جا برا خۆشەویستەکانم! هەر لەبەر پاراستنی خۆتان لە نارەزاییی خوا ئومێدەوارم لەم نامانەی من عاجز و دڵپەرێشان نەبن، کە عاجز نەبن موژدەبێ لە ئێوە کە پشت بە خوا ئیمانتان دامەزراوە؛ چونکە لە حەدیسی پێغەمبەردا هەیە کەوا یەکێ لە گەورەترین ئەخلاقی موسڵمان ئەوەیە کە لە بیستنی خێری ئاینی تێر نەبێ.

براکان! لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە هەر کاتێ کۆڕێك دەست بکەن بە زیکری خوا یا باسی خوای گەورە بکەن لە دەوروپشتی ئەوانەوە فریشتەکان لە دەوروبەری ئەواندا چین لەسەر چین ڕیز دەبەستن و، هەموو ئەو فریشتانە دوعای خێر بۆ ئەهلی ئەو کۆڕە دەکەن و خوای گەورە دوعاکەیان قبووڵ دەکا و ڕەحمەت بە سەر ئەو کۆڕەدا دەبارێ. بەخ بەخ لەو کۆمەڵە موسڵمانە کە هوشیار و ئاگادار بن و لە خوای خۆیان غافڵ نەبن و فریشتەکان دوعایان بۆ بکەن و، ڕەحمەت بباریێ بە سەریاندا، ئەمە چ حاڵێکی خۆشە و چ وەزعێکی پیرۆزە، پێویستە ئینسان شوکری خوای لەسەر بکا کە بەرامبەر بە ئەهلی زیکر و یادی خوا ئەم جۆرە ڕەحمەتەی هەیە.

براکان! دەخیلتان بم هەموو شەوێ هەشت نۆ دەقیقەیەك گوێ ڕابگرن بۆ نامەی ئەم براتانە کە ئێوەی خۆش دەوێ و قازانجی دین و دنیا بۆ ئێوە لە خوای گەورە داوا دەکا. ئێوە کە دەڕۆن بۆ شوێنی کۆمەڵەی غافلان کە هەندێ کتێبی وەکو شاهنامە دەخوێننەوە پارەش دەدەن و وەختیشتان لە کیس دەچێ و هیچ سوودیشتان دەس ناکەوێ، بەڵام من هیچم لە ئێوە ناوێ ئەوەنەبێ کە لەو نامانەی بۆتانیان دەنێرم سوود وەربگرن، وە ئەگەر زۆر لەسەر ئەمە بڕۆم و پێی لێ داگرم سەرزەنشتم مەکەن؛ چونکە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی "علموا الناس سنتي وان كرهوا" واتە ڕەفتار و وتاری من بە موسڵمانان ڕابگەیەنن هەرچەند ئەوان پێیان ناخۆش بێ. من بەش بە حاڵی خۆم مەبەستم ئەوەیە کە بەرامبەر بەم زەحمەتە خوا رەحمم پێ بکات و خۆشمی بوێ، چونکە لە حەدیثی قودسیدا هەیە "ما خلقت في السموات والارضين خلقا احب الي ممن ذكرني الناس" واتە: لە عەرز و ئاسمانا مەخلووقێکم دروست نەکردووە. خۆشەویستتر بێ لام لەو کەسەی کە

من بخاتەوە بیری خەڵك، واتە ئەوەندە باسی من بكات كە خەڵكی بكەونە ذیكر و یادی من. جا لەم حەدیسی قودسییەوە هەر وەكو قەدر و قیمەتی یادی خوای گەورە دەردەكەوێ هەروەها موسیبەتی لە خوا غافڵ بوونیش دەردەكەوێ، واتە ئەوكەسەیش كە خۆی لە خودا غافڵ بێ و بشبێ بە هۆی غافڵ بوونی خەڵك ئەوە لە لای خوا گەلێ بەدچارە و ناشیرینە.

جا من لەبەرئەوە ئەم نامانە دەنێرم بۆ خزمەتی ئێوە كە لە خودا غافڵ نەبن و خواتان بكەوێتەوە بیرو بیپەرستن، چونكە مادام نامەكانی منتان خوێندەوە ئاگادار دەبن لەسەر ئادابی ئاینی خۆتان و، ئەو ئادابە بە ئەهل و خێزانی خۆتان نیشان دەدەن، هەروەها بە دۆستانی خۆتانی دەڵێن.

ڕیوایەت كراوە كاتێ پیاوێ وتارێكی ئاینی لە لایەنی خوای گەورەوە بە برای موسڵمانی خۆی بگەیەنێ ئەوە لە حەج و عەمرەیەكی سوننەت و لە عیبادەتی ساڵێ خێری زۆرترە، بەخ بەخ لەم بەشە گەورە! فێركردنی یەك مەسەلەی ئاینی تەنانەت بە خێزانی خۆت ئەوەندە پاداشی هەیە.

ڕیوایەت كراوە دوو عەرەبی بەدو هاتن بۆ خزمەتی حەزرەتی (د.خ) مەدحی تایەفەیەكی عەرەبیان كرد كە گەورەیان ئامۆژگارییان دەكا و ئادابی ئاینیان پێ دەڵێ، هۆزەكەیشی هەموو گوێی بۆ ڕادەگرن و، فێری ئەو ئادابە دەبن، هەروەها زەممی تایەفەیەكی تری عەرەبیان كردو وتیان گەورەكەیان گوێ بە دین نادات و ئامۆژگاریی عەشرەتەكەی ناكا و، ئەگەر بە هەڵكەوت جارێ ئامۆژگارییان بكا ئەوان گوێی بۆ ڕاناگرن، كاتێ حەزرەت (د.خ) ئەم باسەی لەوان بیست فەرمووی: یا دەبێ ئەم كۆمەڵە بێ مویالات بەدینە دەستبەرداری ئەم ببن و ڕوویكەنە دین و گەورەكەیان ئامۆژگارییان بكا و عەشرەتەكەی گوێی بۆ ڕاگرن، یا دەبێ خوای گەورە زووبەزوو سزایان بۆ بنێرێ و تۆڵەیان لێ بسێنێ.

براكانم! بەسایەی پیرۆزیی پایەی حەزرەتی محەمەدی مستەفاوە (د.خ) خوای گەورە (مسخ) واتە شێوە گۆڕان، (خسف) واتە: عەرز ڕۆچوون و (صاعقە) واتە هەورەتریشقەی، كە هۆی ئازاردانی ئوممەتە پێشووەكان بوون، لەسەر ئەم ئوممەتە لابردووە، هەر عەزابێ كە موستەحەق بن دوای خستووە بۆیان، بۆ ڕۆژی قیامەت، بەڵام گەلێ سزای تری داوە بەسەریاندا وەكو هەڵگرتنی بەرەكەت لەسەر عەرزو كورتكردنی عومریان و، بە

ستەمی زۆرداران سزایان دەدا. هەروەها فیتنەو ئاشووب و کوشتنی بێ سەبەب لەناو خەڵکدا پەیدا بووەو، بێجگە لە شارەکان خەڵکی دێهات لەدەست پیاو خراپ پەرێشان بوون. وەکو زانیومانە لە وەرزی بەهارەوە هەتا پایز لە ناحیەی سووورداش پەنجا کەس لە موسڵمانان کوژراون بەبێ ئەوەی کە هۆیەکی شەرعیی هەبێ بۆ ئەو کوشتنانە، ئەم ڕووداوانە هەمووی لەبەر ناپاکیی مەخلووقەو، لەبەر ئەوەیە پشتیان لە ئاین کردووەو فەرمانی خوای گەورەیان خستووەتە پشتگوێ. جا من لەبەر ئەوە داوێنگیری ئێوە دەبم و، تا ئێستا حەفتاوهەشت نامەم بۆ نووسیون کە لای کەمی هەموو شەوێکی جومعە ئەمر بکەن، یەکێك لەو نامانە بخوێنرێتەوەو گوێی لێ ڕابگرن، بەڵکو ئەو کەسە کە ئادابی ئاین نازانێ فێری ببێ و، ئەو کەسەیش دەیزانێ بیربکاتەوە، هەمووتان بە یارمەتی یەك کارێ بکەن کە مەخلووق لە کاری ناشەرعی لابدەن و لە خودا بترسن و چاودێریی ئەحکامی خوا بکەن.

لە حەدیسی پیرۆزدایە موسڵمان وەکو ئەندامەکانی لەشن، ئینسان ئەگەر ئەندامێکی لەشی ئێش بکات ئەندامەکانی تری لەشی دەس دەکەن بە ئێش، موسڵمانیش بۆ برای موسڵمانی دەبێ وابێ، واتە هەرکام لەوان بە دەردێ گیرۆدە بوو، ئەوانی تر پێویستە دڵگران ببن بۆی و ئەو گیرۆدەبوونە بە گیرۆدەبوونی خۆیان حسێب کەن. بەخوا قەسەم من هەمیشە لە بیری ئەوەدام بۆچی بیرناکەنەوە لەوە کە غەیبەت کردنی یەکتری و غەش کردن لە مامەڵەداو گوێنەدان بە حەرام و حەڵاڵ و حەسوودی بە یەکتر بردن و، گوێ بەکاروباری یەکتری نەدان گوناهی گەورەن و سزایان لەدوایە، بێگومان خوای گەورە هەرچەند مۆڵەتی ئینسان بدا تا ماوەیەك، بەڵام هیچ شتێ لە ئاگاداری و زانستی ئەو دەرناچێ و، هەرکاتێ ئینسانی گرت توند دەیگرێ و حەقی بەرو دوای لێ دەسێنێ.

لە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەرە (د.خ) هەر کەس ڕۆژی لێ بوویەوەو گوێی بە کاروباری موسڵمانان نەدا ئەوە لە موسڵمانان حسێب ناکرێ، بۆ نموونە: گوێی نەدەدا بە دراوسێی لێقەوماوی، بە داماوی بێ دەس و بێ کەس، بە ماڵ ڕووخاو، یا ماڵ سووتاو و قەرزار و هەتیوبارو نەخۆش و مردوو، بەقەدەر حاڵ و بەقەدەر دەستەڵات بەماڵ، بە دەست، بە زوبان، بە حورمەت و پایەی ناو کۆمەڵ بە دەمیانەوە نەبوو، ئەو کەسە وەك ئەوەیە کە موسڵمان نەبێ. بەپێی شەریعەتی ئیسلام گوێ نەدان بە منداڵ و بە نەزان گوناهی گەورەیە و، واجیبە بە هەر وەسیلەیەك بووە ئادابی ئاینیان تێ بگەیەنن.

براکان! ئەم جیهانە جێگەی کشتوکاڵی خێرە بۆ پاشە ڕۆژی قیامەت و، هەموو زانایەك دەزانێ مانەوەی لە دنیادا ماوەیەکە و لە پاشا دەمرێ و ڕووداوەکاتە بازاڕی حیسابی جیهانی قیامەت، هەموو کەس دەزانێ کە لە دنیادا تا ئەندازەیەك تێکۆشان پێویستە بۆ ژیوارێکی بەرز و بەنرخ، بەڵام واجیبە ئەوەش بزانێ کە سەعادەت و پیرۆزی وا لە بەختیاریی پایەدار و نەبڕاوەدا، ژیانی ئەم جیهانە لەبەرئەوەی دەبڕێتەوە هەر بەقەدەر پێویستیی خۆی تێکۆشانی دەوێ، دنیایەك کە هەر دنیای ڕووت بێ و لەگەڵ غافڵ بوون بێ لە خودا بە قەدەر تۆزقاڵێ نرخی نییە، لە حەدیسی پێغەمبەردا هەیە ئەگەر ئەم دنیا بە قەدەر باڵی مێشوولەیەك لای خودا قەدری بوویبووایە یەك قوم ئاوی لێ نەدەدا بەو کافرانە، چونکە دوژمنی خوان.

براکانم! لەم فەرموودەوە دەردەکەوێ ئەوەی لای خوا حورمەتی هەبێ هەر ئاینەو پێویستە ئاگاداری ئاینی خۆتان بن. تکاکارم بە من نەفەرموون تۆ بڕۆ خەریکی ئیشی خۆت بەو ئامۆژگاریی خۆت بکە، چ عەلاقەیەکت بە ئێمەوە هەیە؟ چونکە بە فەرموودەی حەزرەت (د.خ) ئەم قسە لای خوا زۆر ناشیرینە، ئەوەتا دەفەرمووێ "ابغض الكلام الى الله ان يقول الرجل للرجل اتق الله، فيقول عليك بنفسك" واتە ناشیرینترین قسە لای خوای گەورە ئەوەیە کە لە کاتێکدا موسڵمانێ بە موسوڵمانێکی وت لە خوا بترسە، لە وەڵامدا پێی بڵێ تۆ بڕۆ خەریکی نەفسی خۆت بەو حەقت بە سەر ئێمەوە نەبێ.

ئێمەمانان، کە داوێنگیری ئێوە دەبین، ئەگەر واز لە ئامۆژگاری کردن بێنین بە فەرموودەی قورئان گوناهبار دەبین و، دەبینە یارمەتیدەرتان لەسەر گوناه، چۆن دەبێ موسڵمان موسڵمانێ ببینێ کە چاوی نەبینێ و نزیك بێ بکەوێتە بیرێکەوە یا بکەوێتە ئاگرێکەوە خەبەرداری نەکاو ڕزگاری نەکا لە زیانی ئەو بیرو ئاگرە؟ ئێوەش کە لە دین غافڵ بن و لە فەوتان و هیلاکەت نزیك بن، لەسەر ئێمە واجیبە ئاگادارتان بکەین و ڕێگەی ڕزگاریتان نیشان بدەین و، کارێ نەکەین کە لەسەر ئەو غەفڵەتە دەوام بکەن. خوای گەورە فەرموویەتی "وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ".

جا لەبەر ئەمانە ئێمە ناچارین دەبێ بەقەدەر دەسەڵات هەوڵ بدەین بۆئەوەی ئەحکامی ئاینتان پێ بگەیێنین و ئادابی ئاینتان لێ نەشارینەوە؛ خوای گەورە هەڕەشەی کردووە لەو کەسانەی کە زانان و ئادابی ئاین دەزانن، بەڵام لە خەڵکی

دەشارنەوەو پێیان ناگەیەنن، فەرموویەتی: ئەوانە خوا لەعنەت و نەفرینیان لێ دەکا، هەروەها پێغەمبەران و پیاوچاکانی ئوممەتیش لەعنەتیان لێ دەکەن.

لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە ئەو کەسەی ئامۆژگاریی موسڵمانان دەکا و ئەمر و نەهیی خوایان پێ دەگەیەنێ، ئەو کەسە بەردەوام لەسەر زەویدا خەلیفەی خوایە و خەلیفەی پێغەمبەری خواو خەلیفەی قورئانە. لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە کە دوو خەصڵەت هەن لەوانە گەورەتر نییە، یەکەم باوەڕهێنان بە خوا، دووەم قازانج گەیاندن بەبەندەکانی خوا. براکانم قازانجی کە بەڕاستی بە قازانج بناسرێ ئاین فێرکردن و گەیاندنی ئەحکامی خوایە. جا لەبەر ئەمەیە کە بەم نامانە خزمەتی ئێوە دەکەم، خوا ئەم خزمەتەم بە میهرەبانیی خۆی لە کیس نەداو لێمی قبووڵ بکا.

براکان! من هەژارم، موحتاجی ئێوەم، نابینن هەر ساڵێ تا سێ هەزار قران شتومەك لە ئێوە بە قەرز وەردەگرم، لە حەدیسا دەفەرموێ "جزاء الغني من الفقير النصيحة" واتە پاداشی دەوڵەمەند لە لایەن هەژارەوە دڵسۆزی و خێرخوازییە، من ناچارم دەبێ پاداشی ئێوە بدەمەوە بە ئامۆژگاری کردنتان و، پێویستە ئێوەش نەسیحەتەکانی من وەربگرن و نامەکانم بخوێننەوەو، ئادابی ئاینیان لێ وەربگرن، جا کە بەتەواوی گوێیان پێ بدەن لە دینی خۆتان خەبەردار دەبن و، دەزانن چۆن یارمەتیی ئاین و ئەهلی ئاین بدەن، دیارە لەسەر وەعدەی قورئان و حەدیس هەرکەسێ یارمەتیی ئاین بدا خوای گەورە یارمەتیی دەدا، وەکو فەرموویەتی "وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ" واتە: بەڕاستی خودا یارمەتیی ئەو کەسانە دەدا کە یارمەتیی ئاینی خوا دەدەن، جا باسی ئەو کەسانەی کردووە بەم ئایەتە "الذين ان مكناهم اقاموا الصلاة وامروا بالمعروف ونهوا عن المنكر" واتە ئەو کەسانە کە یارمەتیی خوا دەدەن ئەوانەن ئەگەر دەستمان پێ دان و لەعەرزا دامانمەزراندن نوێژەکانیان بە ساغی و ڕەسایی دەکەن و، فەرمان دەدەن بە ڕەفتار و گوفتاری باش و مەنعی خەڵك دەکەن لە ڕەفتار و گوفتاری خراپ. چەند خۆشە ئینسان یارمەتیی ئاینی ئیسلام بداو، خوایش بە میهرەبانیی خۆی یارمەتیی ئەو بدا لەسەر ناحەزانی ناحەق کار، ئەمە زۆر جێگەی سوپاسی خوایە. براکانم! من ناچارم کە داوێن گیرتان بم؛ خوا فەرموویەتی پێویستە هەمیشە کۆمەڵێ لەم موسڵمانانە ئامادە بن و موسڵمانان بۆ خێر بانگ بکەن؛ ئەمریان پێ بکەن بە چاکەو نەهییان لێ بکەن لە خراپە. دەلیل زۆرە لەسەر ئەوەی ئەم ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە واجیبە لەسەر ئێمەو لقێکە لە دین؛ چونکە لە حەدیسدا هەیە کە ئیمان لقی زۆرە لاژووروەکەی کەلیمەی تەوحیدە "لا اله الا الله" و،

ئاخیرەکەی ئەوەیە شتێ کە ببێ بە هۆی ئازاری خەڵك لەسەر ڕێگا لای دەی، لە بەینی ئەم دوو لقەدا لقی تر زۆرەو، یەکێ لەو لقە گەورانە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەیە.

لە حەدیسی شەریفدا هەیە، حەزرەتی مووسا (د.خ) عەرزی خوای گەورەی کرد: خوایا کام بەندەت لا خۆشەویستترە؟ فەرمووی ئەوەیان کاتێ بێ گوێیی من بکرێ، لەبەر خاتری دینی من، لە تاوانباران تووڕە ببێ.

براکانم! من دۆستی ئێوەم، دۆستی ڕاست ئەوەیە کە مەنعی دۆستی خۆی بکا لە خراپە؛ چونکە فەرموودەی پێغەمبەرە "من احبك نهاك ومن ابغضك اغراك" واتە ئەوی تۆی خۆش بووێ مەنعت دەکا لە خراپە و، هەر کەس ڕقی لە تۆ بێ هانت دەدا بۆ خراپە. براکانم! من لەبەر خوا دەمەوێ کە هەمووتان لە من بێزار بن، کەچی هەموو کەس دەیەوێ هەموو کەسێ دۆستی بێ. وەك تاقی کراوەتەوە، هەر کەس ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکا دۆستی بۆ نامێنێتەوە، جا من قازانجی ئێوەم دەوێ، ئیتر قەی ناکا با زیان بە من بگا.

براکانم! ئەگەر ئێوە لە ئادابی ئاینی خۆتان ئاگادار نەبن، زیان بە ئێمە دەگا؛ چونکە هەر ئینسانێ بە تەواوی لە ئاینی خۆی حاڵی نەبێ، هیچ کردەوەیەکی وای لێ ناوەشێتەوە کە سوودی هەبێ، بەڵام ئەگەر بەتەواوی لە ئادابی ئاینی خۆی گەیشت و لە سوودی خواپەرستی و زیانی گوناهـ حاڵی بوو، ئیتر ئەو ئاگادارییە ڕای دەکێشێ بۆ خوداپەرستی و دووری دەخاتەوە لە گوناهـ و، هەر پاداشی چاکەیەك بەو کەسە بگا ئەوەی ڕێ بەدێیی کردووەو پێشانی داوە لەو پاداشەیدا هاوبەش دەبێ، دیارە ئەگەر ئێمە بە تەواوی ئێوە شارەزا نەکەین بۆ خێرو شەڕ بۆ تاعەت و مەعسیەت خۆمان زیانبار دەبین؛ چونکە ئێوە نەخەینە خێرەوە نە بۆ ئێوەو نە بۆ ئێمە خێر پەیدا نابێ. بێگومان ئەو کەسەی بە باشی لە پاداشی خوداپەرستی بگا، هەوڵ دەدا بۆ خواپەرستی، ئەوەی لە پاداشی گوناهـ و سزای ڕۆژی قیامەت ئاگادار بێ، گوناهـ ناکات، خۆ ئەگەر بە هەوای نەفسی بەدخوا تووشی گوناهـ بوو ئەوا گورج لەو گوناهە پەشیمان دەبێتەوە؛ کەوابێ ئاگاداریی لە دین خێری زۆرە.

براکانم! گوناهکردن سەرەنجامی ناشیرینە، لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە "جزاء المعصية ثلاث الوهن في الطاعة والضنك في المعيشة والتعس في اللذة، قالوا وما التعس في اللذة؟ قال لاينال شهوة الا ويأتيه ما ينغصها، او كما قال" واتە پاداش و تۆڵەی گوناهکردن سێ شتە، یەکەم سستیی لەش لە خوا پەرستیدا، واتە یەکێ گیرۆدەی گوناهـ بوو دڵی ڕەش

دەبێ و لە نوور دوور دەکەوێتەوە، جا کاتێ دڵ بێ نوور بوو، ئەندامی لەش ئەو گورج و گۆڵییەی نابێ کە بکەوێتە تاعەتکردنی خوای گەورە. دووەم تەنگیی گوزەران و کەمیی رزق و رۆزییە. سێیەم هەر کاتێ گەیشت بە ئارەزووی خۆی و شتێکی دڵخوازی دەسکەوت بە خۆشیی لێی نارِوا و شتێکی ناباری لێ پەیدا دەبێ خۆشییەکەی لێ تێك دەدا و لەزەتەکە دەکاتە قوزەڵقورت. سەبارەت بە ئەنجامی گوناهکردن حەزرەتی عائیشە (ر.خ) ریوایەتی کردووە کە رۆژێ حەزرەت (د.خ) لەسەر مینبەر ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد، بە پێچەوانەی عادەتی لەوە پێشی کە لەگەڵێ بابەتەوە قسەی دەفەرموو، ئەمجارە هەر دەیفەرموو: ئەی ئادەمیزاد پێویستە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن ئەگەرنا خوای گەورە زاڵمەکان بەردەداتە گیانتان و زوڵمتان لێ دەکەن و، پیاوە چاکەکانتان دوعا دەکەن و خوای گەورە دوعاکەیان قبووڵ ناکا، لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ئەگەرنا بە نەگبەتی ئەمر نەکردن بە چاکەو نەهی نەکردن لە خراپە هەر دوعایە کە ئێوە دەیکەن خوا قبووڵی ناکاو، داوای عەفوو دەکەن خوا عەفوتان ناکا، داوای سەرکەوتن بە سەر دوژمنانتان دەکەن خوا سەرتان ناخا. ئەنجا حەزرەتی عائیشە، خوای لێ رازی بێ، دەفەرمووێ ئەوەندە ئەم کەلیمانەی لا گرینگ بوو هەتا لە مینبەرەکە هاتە خوارەوە هەر دەیوتنەوەو دووبارەی دەکردنەوە.

براکانم! ئەم بەڵایانە کە حەزرەت (د.خ) باسی کردوون هەموویان لە تەرکی ئامۆژگارییەوە پەیدابوون، یا لە گوێ نەدان بە ئامۆژگارییەوە، جا ئیتر بەڵا لەمانە گەورەتر بۆ موسڵمان مەگەر ئەوە بێ کە بە تەواوی لە دین دەرچێ؛ لەبەر ئەمە تکاتان لێ دەکەم هەموو کاتێ رێگەمان پێ بدەن تا ئامۆژگاریتان بکەین بۆ ئەوەی کە هەردوولامان گوناهبار نەبین و، لە رۆژی قیامەتدا گیرۆدەی سزا دەبین، چونکە بەپێی ئایەتی قورئانی پیرۆز ئەو کەسانەی بێ دەنگ دادەنیشن و مەنعی ستەمکاران ناکەن لە زوڵم و بێدادی ئەوانیش هاوبەشی ستەمکارەکانن لە گوناهدا. خوای گەورە دەفەرمووێ "وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً" پوختەی مەعناکەی ئەوەیە: ئەو کەسانەش کە گوناه ناکەن لەبەرئەوەی کە مەنعی گوناهبار ناکەن و لەگەڵیدا هەڵدەستن و دادەنیشن و نان دەخۆن و موجامەلەیان لەگەڵ دەکەن، ئەوانیش وەکو گوناهبارەکان سزایان دەدرێ و لە رۆژی قیامەتدا سزا دەدرێن، هەروەها لە دنیایشدا تووشی ئازار و زیان دەبن، کەوابێ پێویستە لەسەرتان کە زۆرمان لێ بکەن هەتا ئێمە ئەم خزمەتە گەورە بەجێ بێنین و، لە هەموو شەو و رۆژێکدا، کە بیست و چوار سەعاتە، سەعاتێك

دابنێن بۆ ئەم سوودە گەورە کە ئامۆژگاریی ئێمەیە. هەروەها لە هەر ولاتێکداو لە هەر کاتێکدا کۆمەڵی موسڵمانان کۆببنەوەو زانایەك لەو شوێنەدا هەبێ واجیبە داوێنگیری ئەو زانایە ببن کە ئامۆژگارییان بکا، جا ئەگەر زاناکان حازر نەبوون دەتوانن شکاتیان لێ بکەن لای خاوەن دەستەلات لە ولاتەکەدا هەتا زاناکان ئامۆژگاریتان بکەن.

لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە ئەگەر ئێمە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە نەکەین، لە ڕۆژی قیامەتدا موسوولمانە نەخوێنەوارەکان لای خوا شکاتمان لێ دەکەن و دەڵێن: خوایا ئێمە نەزان و نەفام بووین و زاناکانی ئێمە فلان کەس و فیسار کەس مەنعیان نەدەکردین لە گوناه هەتا بە هیلاکدا چووین.

لە حەدیسی پیرۆزدا هەیە «ان الرجل یتعلق بالرجل یوم القیامة وهو لا یعرفه فیقول مالك علي وما بیني وبینك معرفة» واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هی وا هەیە دەنووسێ، بە یەکێکەوەو لە کۆڵی نابێتەوە تا دەیباتە دۆزەخ ئەویش پێی دەڵێ تۆ حەقت چییە بە سەر منەوە، لە نێوان من و تۆدا هیچ ناسراوییەك نییە! ئەویش لە وەلامدا دەڵێ: وەختی خۆی چاوت بە من کەوت لە گوناهدا بووم و مەنعت نەکردم، بەم جۆرە لە ڕۆژی قیامەتدا هەردووکیان سزا دەدرێن، یەکێکیان لەبەر تاوانباری، ئەویشیان لەبەرئەوە کە مەنعی تاوانبارەکەی نەکردووە، وەکو یەکێ بیەوێ ئیهانەی یەکێ بکا و بیخاتە حەوزەوە یەکەکەش خۆی بنووسێنێ بە بازووی ستەمکارەکەوەو لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ ناو حەوزەکەو هەردوولایان تەڕ ببن.

براکانم! حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب، خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویەتی هەر کاتێ برایەکی ئاینیی خۆتان چاوپێ کەوت کەوتە تاوانێکەوە ئێوە ڕاستی بکەنەوەو هێزی پێ بدەن و، لە خوا بپاڕێنەوە کە عەفووی بکاو تەوبەی لێ قبووڵ بکا، ئێوەش زیاتر دڵی سارد مەکەنەوەو مەبن بە یارمەتیدەری شەیتان لەسەر ئەو شەخسە لێ قەوماوە.

براکانم! سوێندتان دەدەم بە خوا لەسەر ئەوە لۆمەم مەکەن کە زۆر داوێنگیری ئێوە دەبم و، داواتان لێ دەکەم کە لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا نیو سەعات گوێ بدەن بە نامەکانی من، بە خوا سوێندتان دەدەم ئەگەر من خۆم ئامادە نەبووم بۆ ئامۆژگاریی ئێوە، وەرن زۆرم لی بکەن و بە زۆر بمبەن بۆ لای خۆتان و ناچارم بکەن هەتا ئادابی نوێژ و ڕۆژوو و ئەحکامەکانیترتان نیشان بدەم.

له حەدیشدایە ئەو کەسانە کە دەستەڵاتیان هەیە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن و، بە بێ عوزر تەرکی دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا کە لە قەبر دێنە دەرەوە خوا شێوەیان دەکا بە شێوەی بەراز و مەیموون، جا ئەگەر ئارەزووتان هەیە لە خەوی غافڵی ئاگادارتان بکەینەوە ڕێگام بدەن با هەموو شەوێکی جومعەی موبارەك زەحمەتتان بدەم و بێم بۆ خزمەتتان هەتا دەربارەی ئەحکامی ئاین ئامۆژگاریتان بکەم. من چاوەڕوانی وەڵامی ئێوەم بە «بەڵێ» یا «نا». شەوی پایز و زستان درێژن و، ئێوە لە خانووی خۆتاندا شوێنی چاکتان هەیە، جێگەی گەرم و ڕووناك و پۆشاك و ڕایەخ نەرم و چاك، ئێوە وەك ئەهلی لادێ نەماون، کە لە زستاندا کراسەکانیان لەبەر چڵك ڕەش دەبن و، چۆخەی زبر لەبەر دەکەن و، خانووەکانیان پڕ دەبن لە دووکەڵی داری تەڕو سمێڵ و ڕیشیان بە دووکەڵ زەرد دەبێ و، چاویان بە هۆی دووکەڵەوە ئاو دەکات وەك ئینسانی ڕۆڵەمردوو، ئەگەر لەشیان پیس ببێ لەبەر ساردیی ئاوەکە ناتوانن لەش پیسیی خۆیان دەرکەن، سا هەزار سوپاس و شوکری خواتان لەسەرە، خانووی گەرم و خۆش، فەرش و بەرگ و پۆشاکی گەرم و نەرم، ئاوی خۆشۆردن و دەستنوێژگرتن مولائیم و گەرمە و لەبەر دەستتاندا حازرە، تەنانەت دەتوانم بڵێم پینەچیی ناوشار لە دەوڵەمەندی لادێ گوزەرانی خۆشترە، لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو گوێ نادەنە خواپەرستی و مافەکانی خواتان فەرامۆش دەکەن و، واجبات بەدی ناهێنن و، خۆیشتان بە ئەهلی شوکر و سوپاسی خوا دەزانن. خوا دەفەرمووێ: "لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ". پەنا بەخوا لە سزای خوای گەورە، کە کەس ناتوانێ خۆی لەبەر بگرێ.

براکان! تۆزێ تەماشای دەورووپشتتان بکەن، گرانی و قاتی و لاتیی ولاّتی ئێزانتان نەبیستووە، کە ئەمساڵ لە (ئاردەلاّن) باب لە ئەولادو ئەولاد لە بابی خۆی نەپرسیوە، ئەی لە ئەوزاعی ولاّتی (ئەنەدۆڵ) ئاگادار نین کە چۆن بووەو موسووڵمانان لەو ولاّتەدا چۆن گیرۆدەی قاتی و گرانی بوون. ئێمە تا ئێستا لە میهرەبانیی خواوە لەم مەینەتانە پارێزراو بووین و ئەگەر تەماشای واجباتی سەرشانمان بکەین و بەجێیان بهێنین هەر پارێزراو دەبین.

براکانم! واجیبە لەسەرتان کە لە خوا غافڵ نەبن و هەموو سبەینێیەك دە جار بڵێن خوایا پەنا دەگرین بە تۆ لە شەیتان و لە شەڕی نەفسی خۆمان و، لە قاتەساڵی و تاعوون، جا ئەگەر هەموو ئەهلی شار لەسەر ئەمە دەوام بکەن، هیوام وایە کە بە دەردو بەلاّی نابار گیرۆدە نەبن.

براكانم! ئەهلی بازاڕ موحتاجن بە نەزەری مەرحەمەتی حەزرەتی فەخری عالەم (د.خ). هەر کاتێ ڕۆیشتنە ناو بازاڕەوە دە جار بڵێن (بسم الله) خوایا لە تۆ داوادەکەم خێری ئەم بازاڕەو ئەهلی بازاڕ، پەنادەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەم بازاڕەو ئەهلی بازاڕ، پەنادەگرم بە تۆ لە سوێندی درۆ و لە مامەڵەی زیان بەخش چ لە کڕیندا و چ لە فرۆشتندا، هەر کاتێکیش لە بازاڕ چوونە دەرەوە هەمیسان ئەم دوعایە بکەن ئینشاڵڵا زیان ناکەن و تووشی خێر و بەرەکەت دەبن.

# پێڕست